# مُعالم السُّنَّة النبوية

## نیڤشکێ فەرموودەیێت پێغەمبەری

نیڤشکێ «١٤» چواردە ژێدەرێت سەرەکینە یێت فەرموودەیان

کۆمکرن

شێخ صالح أحمد الشامی

کرمانجیکرن

ب دەستویریا شێخ صالح أحمد الشامی

دکتۆر إسماعیل سگێری

بەرگێ سێیێ

جزیری

# مَعَالِمُ السُّنَّةِ النَّبَوِيَّةِ

## نیشکێ فەرموودەیێت پێغەمبەری

نیشکێ ﴿١٤﴾ چواردە ژێدەرێت سەرەکینە ییێت فەرموودەیان

**کۆمکرن**

شێخ صالح أحمد الشامي

**وەرگێران**

ب دەستویریا شێخ صالح أحمد الشامي

دکتۆر ئیسماعیل سگێری

# بەرگێ سێیێ

١٤٤٥ ٢٠٢٤

زنجیرا تێگەهشتنەکا باشتر ١١٢

ناڤێ پەرتووکێ: نیڤشکێ فەرموودەییێت پێغەمبەری

کۆمکرن: شێخ صالح أحمد الشامي

وەرگێران: ب دەستویریا (شێخ صالح أحمد الشامي)
(دکتۆر ئیسماعیل سگێری)

دیزاینا بەرگی: مللەت موحەممەد

رێکخستنا ناڤەرۆکێ: دلۆڤان عەساف

سەرپەرشتێ چاپێ: ئەواب ئەحمەد جزیری

سالا چاپکرنێ: ٢٠٢٤

تیراژ: ١٠٠٠

هژمارا سپاردنێ: D-\٢٦٨٠\٢٣

## الفصل الأول: المرضى

## پشکا ئێکێ: نەساخان.

### ١. باب: الصحة نعمة من الله تعالى.

### بابەتێ: ساخلەمی نیعمەتەکە ژ خودایێ پاك و بلند.

٢٨٤٨ – عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ خُبَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمِّهِ، قَالَ: كُنَّا فِي مَجْلِسٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَعَلَى رَأْسِهِ أَثَرُ مَاءٍ، فَقَالَ لَهُ بَعْضُنَا: نَرَاكَ الْيَوْمَ طَيِّبَ النَّفْسِ، فَقَالَ: (**أَجَلْ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ**). ثُمَّ أَفَاضَ الْقَوْمُ فِي ذِكْرِ الْغِنَى فَقَالَ: (**لاَ بَأْسَ بِالْغِنَى لِمَنِ اتَّقَى، وَالصِّحَّةُ لِمَنِ اتَّقَى خَيْرٌ مِنَ الْغِنَى، وَطِيبُ النَّفْسِ مِنَ النَّعِيمِ**). [جه٢١٤١].

* صحيح.

[وانظر: ٣٢٧٧، ٣٣٢٤].

**ژ مەعازێ کورێ عەبدوللایێ کورێ خوبەیبی (رضي الله عنه) ژ بابێ وی ژ مامێ وی، گۆت: ئەم ل دیوانەکێ بووین پێغەمبەر (ﷺ) هات و نیشانێت ئاڤێ ل سەر سەرێ وی بوون، ئینا هندەکا ژ مە گۆتێ ئەم تە ئەڤرۆکە زیرەك و لەشسڤك و دلخۆش دبینین، ئینا گۆت: (بەلێ و سوپاس بۆ خودێ)، پاشی خەلکی بەحسێ زەنگینییێ کر، ئینا گۆت: (زەنگینی بۆ مرۆڤێ پارێزکار خراب نینە، بەلێ ساخلەمی بۆ مرۆڤێ پارێزکار ژ زەنگینییێ باشترە و لەشسڤکی و دلخۆشی ژ نیعمەتانە).**

### ٢. باب: ثواب المؤمن فيما يصيبه.

### بابەتێ: خێرا موسلمانی ژ وێ یا دگەهیتێ.

٢٨٤٩ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ، وَلاَ وَصَبٍ، وَلاَ هَمٍّ، وَلاَ حَزَنٍ، وَلاَ أَذًى، وَلاَ غَمٍّ، حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا؛ إِلاَّ كَفَّرَ اللهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ**). [خ٥٦٤١/ م٢٥٧٣].

**ژ ئەبی سەعید و ئەبی هورەیرە خودێ ژ هەردووان رازی بیت، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (چو وەستیان و چو نەساخی و چو خەم و چو دلتەنگی و چو ئەزیەت**

**ناگەهنە موسلمانی هەتا سترییەك بچیتە د لەشیڕا هەکە خودێ گونەهێت وی پێ ژێ نەبەت)[1].**

٢٨٥٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾[النساء:١٢٣] بَلَغَتْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مَبْلَغاً شَدِيداً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، فَفِي كُلِّ مَا يُصَابُ بِهِ الْمُسْلِمُ كَفَّارَةٌ، حَتَّى النَّكْبَةِ يُنْكَبُهَا، أَوِ الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا**). [م٢٥٧٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت، دەمێ ئەڤ ئایەتە هاتییە خوارێ** ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ [النساء:١٢٣] **موسلمان زێدە دلنەرەحەتبوون و ل سەر وان گران بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د کار و بارێت خۆدا ناڤنجی و دورستیخواز بن، بێی کێمکرن و زێدەکرن، و خۆ راگرن و بمینن، هەر تشتێ بگەهیتە موسلمانی گونە هژێبرن تێدا هەیە هەتا هەلنگفتنا دهەلنگڤیت یان سترێك دچیتە د لەشیدا).**

٢٨٥١ - عَنْ أُمِّ الْعَلاَءِ قَالَتْ: عَادَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَنَا مَرِيضَةٌ فَقَالَ: (**أَبْشِرِي يَا أُمَّ الْعَلاَءِ! فَإِنَّ مَرَضَ الْمُسْلِمِ يُذْهِبُ اللهُ بِهِ خَطَايَاهُ، كَمَا تُذْهِبُ النَّارُ خَبَثَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ**). [د٣٠٩٢].

* صحيح.

**ژ دایکا عەلائی (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرا من دا و ئەز یا نەساخ بووم، ئینا گۆت: (دلخۆش ببە ئەی دایکا عەلائی، ب راستی خودێ ب نەساخییا موسلمانی گونەهێت وی دبەت کا چاوا ئاگر قرێژا زێرێ و زیڤی دبەت).**

٢٨٥٢ - عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) طَرَقَهُ وَجَعٌ، فَجَعَلَ يَشْتَكِي وَيَتَقَلَّبُ عَلَى فِرَاشِهِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لَوْ صَنَعَ هَذَا بَعْضُنَا لَوَجِدْتَ عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّ الصَّالِحِينَ يُشَدَّدُ عَلَيْهِمْ، وَإِنَّهُ لاَ يُصِيبُ مُؤْمِناً نَكْبَةٌ مِنْ شَوْكَةٍ فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ؛ إِلاَّ حُطَّتْ بِهِ عَنْهُ خَطِيئَةٌ وَرُفِعَ بِهَا دَرَجَةً**). [حم٢٥٢٦٤، ٢٥٨٠٤].

---

(١) هەم و حوزن و غەم، زانا دبێژن: هەمی ب رامانا خەم دهێن، بەلێ هەر ئێك ژ تشتەکییە، هەم ئەو خەمە یا ژ ترسا چێبوونا تشتەکی بگەهیتە مرۆڤی، و حوزن: ئەو خەمە یا ژ بەرزەبوونا تشتەکی عەزیز بگەهیتە مرۆڤی، و غەم: ئەو خەمە یا ژ نەخۆشییەکا چێبووی بگەهیتە مرۆڤی.

* إسناده صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئێ شانەك گەهـ شتە پێغەمـ بەرێ خودێ (ﷺ) ئـێ نـا دەستهاڤێتێ پێئاخفت و خۆ ل سەر جهێ خۆ وەرگێڕا، ئینا عائیشایێ گۆت: ئەگەر ئەڤە ئێکی ژ مە وەکربا دا زێ تۆڕەبی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ بەلایێ ل سەر چاکان گران دکەت، و ب راستی چو بەلا ناگەهنە موسلمانی ژ ستری بگرە و سلالتر ئەگەر خودێ گونەهەکێ پێ ژێ نەبەت و پلەیەکێ پێ بلند نەکەت).**

## ٣ . باب: يكتب للمريض ما كان يعمل.

## بابەتێ: ئەو خێر بۆ نەساخی دهێتە نڤیسین یا وی دکر.

٢٨٥٣ - (خ) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ، أَوْ سَافَرَ، كُتِبَ لَهُ مِثْلُ ما كَانَ يَعْمَلُ مُقِيماً صَحِيحاً)**. [خ٢٩٩٦].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری، (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەکە بەندە نەساخ بوو، یان وەغەر کر، ئەو کارێ دەمێ ل مال و یێ ب سلامەت دکر بۆ هاتە نڤیسین).**

## ٤ . باب: ثواب الصبر على المرض.

## بابەتێ: خێرا بێنفرەهییا ل سەر نەساخییێ.

٢٨٥٤ - (ق) عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ: أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ؟ قُلْتُ: بَلَى، قالَ: هذِهِ المَرْأَةُ السَّوْدَاءُ، أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللهَ لِي. قَالَ: **(إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَكِ)**، فَقَالَتْ: أَصْبِرُ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللهَ لِي أَنْ لاَ أَتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا. [خ٥٦٥٢/ م٢٥٧٦].

**ژ عەتائێ کوڕێ ئەبی ڕەباحی گۆت: ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) گۆتە من: ئەز ژنەکا ژ خەلکێ بەحەشتێ نیشا تە نەدەم؟ من گۆت: بەلێ. گۆت: ئەڤ ژنا ڕەش، هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: تەب دهێتە من، و جلکێ من ژ سەر من دچیت، دوعا بۆ من بکە. گۆت: (هەکە تە بڤێت سەبری بکێشە و بەحەشت بۆ تە، و هەکە تە بڤێت دێ دوعا**

**ژ خودێ کەم تە سلامەت کەت)، گۆت: دێ سەبرێ کێشم، پاشی گۆت: جلکێت من ژ سەر من دچن دوعا بکە بێ ستارە نەبم، دوعا بۆ کرن.**

٥ . باب: ثواب من ذهب بصره.

**بابەتێ: خێرا وی یێ چاڤێت وی چۆین.**

٢٨٥٥ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ، عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الجَنَّةَ**). يُرِيدُ: عَيْنَيْهِ. [خ٥٦٥٣].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) دبێژیت: من گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) بوو د گۆت: (خودایێ مەزن گۆت: هەکە من بەندەیێ خۆ ب برنا هەردو چاڤێت وی جەربا ند و تاقی کر، و سەبر کێشا، ئەز دێ بەحەشتێ شوینا وان دەمێ).**

٦ . باب: عيادة المريض والدعاء له.

**بابەتێ: سەرەدانا نەساخی و دوعا بۆ کرن. (رضي الله عنه).**

٢٨٥٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا أَتَى مَرِيضاً أَوْ أُتِيَ بِهِ، قَالَ: (**أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ، اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي، لاَ شِفَاءَ إِلاَّ شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَماً**). [خ٥٦٧٥/ م٢١٩١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر سەرا نەساخەکی دا با یان نەساخەك ئینابا دەڤ، دگۆت: (خودانێ مرۆڤان، نەساخییێ ببە، و سلامەت بکە، تویی سلامەتکەر، چو سلامەتی نینن سلامەتییا تە نەبیت، سلامەتییەکا وەسا چو نەساخییان نەهێلیت).**

٢٨٥٧ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ غُلاَمٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُمُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَمَرِضَ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ (ﷺ) يَعُودُهُ، فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَقَالَ لَهُ: (**أَسْلِمْ**)، فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ وَهُوَ عِنْدَهُ، فَقَالَ لَهُ: أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ (ﷺ) فَأَسْلَمَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَهُوَ يَقُولُ: (**الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ**). [خ١٣٥٦].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: لاوەکێ جوهی ل دەڤ پێغەمبەری بوو (ﷺ) خزمەتا وی دکر، نەساخ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) هات سەرا وی دا، ل دەڤ سەرێ وی روینشتە خوارێ و گۆتێ: (موسلمان ببە)، بەرێ خۆ دا بابێ خۆ ل دەڤ وی بوو؟ گۆتێ: گوهێ خۆ بدە بابێ**

**قاسمی ( ئانکو: پێغەمبەری (ﷺ) ئینا موسلمان بوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەفت و وی دگۆت: (شوکر بۆ خودایێ ئەو ژ ئاگری رزگار کری).**

٢٨٥٨ - (م) عَنْ ثَوْبَانَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا عَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَرْجِعَ**). [م٢٥٦٨].

وفِي رواية: (**مَنْ عَادَ مَرِيضاً، لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ**). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا خُرْفَةُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: (**جَنَاهَا**).

**ژ سەوبانی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی هەکە موسلمانی سەرا موسلمانی دا بەردەوام ئەو یێ د ناڤ فێقییێ جنی یێ بەحەشتێدا، هەتا دزڤریتەڤە).**

**و د ڤەگێرەکێدا: (یێ سەرا نەساخەکی بدەت، بەردەوام ئەو یێ د ناڤ فێقییێ جنی یێ بەحەشتێدا) گۆتنێ: فێقییێ بەحەشتێ چییە؟ گۆت: (یێ ژێ چنییە).**

٢٨٥٩ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ عَادَ مَرِيضاً لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ، فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مِرَارٍ: أَسْأَلُ اللهَ الْعَظِيمَ، رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ؛ إِلاَّ عَافَاهُ اللهُ مِنْ ذَلِكَ الْمَرَضِ**).

[د٣١٠٦/ ت٢٠٨٣].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ سەرا نەساخەکی بدەت هێژ ئەجەلا وی نەهاتی و حەفت جاران ل دەڤ وی بێژیت: ئەز ژ خودایێ مەزن خودانێ عەرشێ مەزن دخوازم تە سلامەت کەت، خودێ دێ وی سلامەت کەت).**

## ٧ ـ باب: كراهة تمني الموت.

## بابەتێ: نەباشییا داخوازکرنا مرنێ.

٢٨٦٠ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ مِنْ ضُرٍّ أَصَابَهُ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ! أَحْيِنِي ما كَانَتِ الحَيَاةُ خَيْراً لِي، وَتَوَفَّنِي إِذا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي**). [خ٥٦٧١، م٢٦٨٠].

**ژ ئەنەسی (ﭬ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە خۆزییا مرنێ نەكەت، و هەكە هەر دێ كەت بلا بێژیت: یا خودێ من ساخ بهێلە، هندی ژیان بۆ من ب خێرتر بیت، و من بمرینە هەكە مرن بۆ من ب خێرتر بیت).**

٢٨٦١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ، وَلاَ يَدْعُ بِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَهُ، إِنَّهُ إِذَا مَاتَ أَحَدُكُمُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ، وَإِنَّهُ لاَ يَزِيدُ الْمُؤْمِنَ عُمْرُهُ إِلاَّ خَيْرًا).[م٢٦٨٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە خۆزییا مرنێ نەكەت، و بلا نەخوازیت بەری ئەو بهێت، ب راستی ئەو ب خۆ هەكە مر، كریارێت وی هاتنە برین، و ب راستی ئەو ب خۆ ژییێ باوەریداری زێدە نابیت بۆ خێرێ نەبیت).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

## الفصل الثاني: الطب والرقى والسحر.

## پشکا دووێ: نوژداری و پێڤەخواندن و سێربەندی.

### ١ . باب: لكل داء دواء.

### بابەتێ: هەر دەردەکی دەرمانەکێ هەی.

٢٨٦٢ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (**مَا أَنْزَلَ اللهُ دَاءً؛ إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً**). [خ٥٦٧٨]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خودێ چو نەساخی نەئینا نە خوارێ ئەگەر دەرمانەك بۆ نەئینابیتە خوارێ).**

٢٨٦٣ - (م) عَنْ جَابِرٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ؛ بَرَأَ بِإِذْنِ اللهِ عزّ وجل**). [م٢٢٠٤].

**ژ جابری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر نەساخییەکێ دەرمانەکێ هەی، ڤێجا ئەگەر دەرمان ب نەساخییێ کەفت ئەو ب ئانەهییا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ب سلامەت کەفت).**

٢٨٦٤ - عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، وَأَصْحَابُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُؤُوسِهِمُ الطَّيْرُ، فَسَلَّمْتُ ثُمَّ قَعَدْتُ، فَجَاءَ الْأَعْرَابُ مِنْ هَاهُنَا وَهَاهُنَا فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَتَدَاوَى؟ فَقَالَ: (**تَدَاوَوْا، فَإِنَّ اللهَ عزّ وجل لَمْ يَضَعْ دَاءً؛ إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً، غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ: الْهَرَمُ**).[د٣٨٥٥/ ت٢٠٣٨/ جه٣٤٣٦].

وفي رواية لأحمد: (**إِلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً، عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ، وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ**). [حم١٨٤٥٦].

* صحيح.

**ژ ئوسامەیێ کورێ شەریکی گۆت: ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤالێت وی هەروەکی بالندە یێ ل سەر سەرێ وان، من سلاڤ کر پاشی ئەز روینشتم، کۆچەرە عەرەب ل ڤێرێ و ل ڤێرێ هاتن و گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دەرمانان وەرگرین؟ ئینا گۆت: (دەرمانان، ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن چو دەرد نەدایە ئەگەر دەرمان بۆ نەدابن، دەردەك تنێ نەبیت: پیراتی).**

و د ڤەگێرا ئەحمددا: **(ئەگەر سلامەتی بۆ نەئینابیتە خوارێ، ئەوێ دزانیت وی زانییە و ئەوێ نەزانیت وی نەزانییە)**[1].

٢ـ باب: الشفاء في ثلاث.

**بابەتێ: سلامەتی یا د سێیاندا.**

٢٨٦٥ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (الشِّفَاءُ فِي ثَلَاثَةٍ: فِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةِ عَسَلٍ، أَوْ كَيَّةٍ بِنَارٍ، وَأَنَا أَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ). [خ٥٦٨١ (٥٦٨٠)].

**ژ ئیبن عەباسی ( خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ( سلامەتییا د سێیاندا: د ئامویرێ خوینبەرداندێدا (مەبەست پێ حوجامە یە)، یان د ڤەخوارنا هنگڤینیدا، یان د داخەکێدا ب ئاگری، و ئەز پاشڤەلێدانا ئوممەتا خۆ ژ داخکرنێ دکەم).**

٣ـ باب: التداوي بالعسل.

**بابەتێ: چارەسەری ب هنگڤینی.**

٢٨٦٦ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: أَخِي يَشْتَكِي بَطْنَهُ، فَقَالَ: (اسْقِهِ عَسَلاً)، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ، فَقَالَ: (اسْقِهِ عَسَلاً)، ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: (اسْقِهِ عَسَلاً). ثُمَّ أَتَاهُ فَقَالَ: قَدْ فَعَلْتُ؟ فَقَالَ: (صَدَقَ اللهُ، وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ، اسْقِهِ عَسَلاً). فَسَقَاهُ، فَبَرَأَ.[خ٥٦٨٤/ م٢٢١٧].

**ژ ئەبی سەعیدی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: برایێ من زکێ وی دئێشیت، ئینا گۆت: (هنگڤینی بدەیێ) پاشی بۆ جارا دووێ هاتە دەڤ، ئینا گۆت: (هنگڤینی بدەیێ) پاشی بۆ جارا سێیێ هاتە دەڤ، ئینا گۆت: (هنگڤینی بدەیێ) پاشی هاتە دەڤ گۆت من وەکر؟ ئینا گۆت: (خودێ راست گۆت و زکێ برایێ تە درەو کر، هنگڤینی بدەیێ) هنگڤین دایێ سلامەت کەفت.**

(١) ئانکو: کار دمینیتە ل سەر زانینێ، هەکە وەکی دی چو دەرد بێ دەرمان نینن، یێ زانی دێ دەرمانی دورست دەستنیشان کەت، و یێ نەزانیت ب نەزانین دێ دەستنیشان کەت.

## ٤ . باب: التداوي بالحجامة.

## بابەتێ: چارەسەری ب حوجامەیێ.

٢٨٦٧ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَجْرِ الحَجَّامِ، فَقَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، وَأَعْطَاهُ صَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ، وَكَلَّمَ مَوَالِيَهُ فَخَفَّفُوا عَنْهُ، وَقَالَ: (إِنَّ أَمْثَلَ ما تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ، وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ)، وَقَالَ: (لاَ تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ). [خ٥٦٩٦ (٢١٠٢)/ م١٥٧٧].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) پر سیارا کرێ یا حوجا مەکاری ژێ ها تە کرن، ئی نا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) حوجامە چێ کر، و ئەبو تیبە بۆ چێ کر، و دو مدێت خوارنێ دانێ و د گەل سەمیانێ وی ئاخفت ل سەر وی سڤك کرن و گۆت: (باشترین تشت هوین خۆ پێ دەرمان بکەن حوجامە و دارکێت هندییە). و گۆت: (زارۆکێت خۆ ب تلبر نا د گەرییێدا ئێزا نەدەن ژ کولبوونا چچکێت گەرییێ و دارکێ هندی ب کار بینن).**

٢٨٦٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِمَّا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ خَيْرٌ، فَالْحِجَامَةُ). [د٣٨٥٧/ جه٣٤٧٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر باشییەك د ئێك ژ وان تشتاندا ئەوێت هوین خۆ پێ چارەسەر دکەن هەبیت ئەو حوجامەیە).**

## ٥ . باب: التداوي بالكي.

## بابەتێ: چارەسەرکرن ب داخکرنێ.

٢٨٦٩ - (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أَبَا طَلْحَةَ وَأَنَسَ بْنَ النَّضْرِ كَوَيَاهُ، وَكَوَاهُ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِهِ.[خ٥٧١٩].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: ئەبو تەلحە و ئەنەسێ کورێ نەزری ئەو داخ کر و ئەبو تەلحەیی ب دەستێ خۆ ئەو داخ کر.**

٢٨٧٠ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ طَبِيباً، فَقَطَعَ مِنْهُ عِرْقاً، ثُمَّ كَوَاهُ عَلَيْهِ. [م٢٢٠٧].

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نوژدارەك بۆ ئوبەیێ كوڕێ كەعبی هنارت ئینا رهەك ژ وی بڕی، پاشی ل سەر داخ كر.**

٢٨٧١ - عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَنِ الْكَيِّ، فَاكْتَوَيْنَا، فَمَا أَفْلَحْنَا وَلاَ أَنْجَحْنَا. [د٣٨٦٥/ ت٢٠٤٩/ جه٣٤٩٠]

* صحيح.

**ژ عیمرانێ كوڕێ (حصين)ی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پا شڤەلێدانا ژ داخكر نێ كری و مە داخ كرن د كر، ڤێ جا نە ئەم پێ سەرفەراز بووین و نە پێ سەركەفتین.**

**٦ ـ باب: التداوي بالحبة السوداء.**

**بابەتێ: چارەسەركرن ب رەشڕەشكێ.**

٢٨٧٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ؛ إِلاَّ السَّامَ**).

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَالسَّامُ: الْمَوْتُ، وَالْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ: الشُّونِيزُ. [خ٥٦٨٨، م٢٢١٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (چارەسەری ژ هەمی نەخۆشییان یا د رەشڕەشكێدا هەی، مرن تێ نەبیت).**

**ئیبن شیهاب دبێژیت: سام: مرنە و رەشڕەشك شونیزە.**

**٧ ـ باب: التداوي بالعود الهندي.**

**بابەتێ: چارەسەركرن ب داركێ هندی.**

٢٨٧٣ - (ق) عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ. وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الأُوَلِ اللاَّتِي بَايَعْنَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، وَهِيَ أُخْتُ عُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ. أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بِابْنٍ لَهَا قَدْ عَلَّقَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، فَقَالَ: (**اتَّقُوا اللهَ عَلَى مَا تَدْغَرْنَ أَوْلاَدَكُنَّ بِهَذِهِ الأَعْلاَقِ، عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ**).

يُرِيدُ الْكُسْتَ؛ يَعْنِي: الْقُسْطَ. وَهِيَ لُغَةٌ. [خ٥٧١٨ (٥٦٩٢)/ م٢٢١٤].

وفي رواية لهما: قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ، فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ: يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ، وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ). [خ٥٦٩٢].

ژ ئوم قەیسا کچا میحسەنی ـ و ئەو ئێك ژ وان مشەختیێت ئێکێ بوو ئەوێت پەیمان داینە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو خویشکا عوکاشەیێ کورێ میحسەنییە، وێ کورەکێ خۆ ئینا دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و چچکێ گەریا وی یێ کول ب تلا خۆ چارەسەر کربوو، ئینا گۆت: **(ژ خودێ بترسن ل سەر وێ دەستبرنا گەریا بچویکێت خۆ ژ بەر کولبوونا چچکێت گەریا وان، و دارکێ هندی ب کار بینن، و ب راستی حەفت چارەسەری پێت تێدا، ژ وان: کولبوونا پەردا سیهێ)**[1].

و د ڤەگێرەکا واندا: گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەڤێ دارکا هندی ب کار بینن، ب راستی حەفت چارەسەری پێت تێدا، کولبوونا چچکێ گەرییێ پێ دهێتە چارەسەرکرن، و ب رەخێ دەڤیدا دهێتە کرن ژ کولبوونا پەردا سیهێ)**.

٨ ـ باب: ماء الكمأة شفاء للعين.

**بابەتێ: کڤارك بۆ چاڤی چارەسەرییە.**

٢٨٧٤ – (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ). [خ٤٤٧٨/م٢٠٤٩].

ژ سەعیدێ کورێ زەیدی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(کڤارك ژ مەنەتا خودێیە[2]، و ئاڤا وێ دەرمانێ چاڤییە)**.

٢٨٧٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الْعَجْوَةُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَفِيهَا شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ، وَالْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ، وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ). [ت٢٠٦٦/ مي٢٨٨٢].

* حسن صحيح.

---

(١) تەنشت کولبوون: ئەوە دۆرماندۆرێت سیهێ کول ببن و ببیتە ئەگەرێ بێهنتەنگییێ.

(٢) چونکی ئەو ب خۆ شین دبیت بێی دەستکاری.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ڤەسپا عەجوە ژ بەحەشتێیە و سلامەتییا ژ ژەهرێ تێدایە، و كڤارك ژ منەتا خودێیە و ئاڤا وێ دەرمانێ چاڤییە).**

٩ . باب: تحريم التداوي بالخمر والنجاسات.

**بابەتێ: حەرامكرنا چارەسەرییێ ب عەرەقێ و تشتێ هەرمی.**

٢٨٧٦ - (م) عَنْ طَارِقِ بْنِ سُوَيْدٍ الْجُعْفِيِّ: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنِ الْخَمْرِ؟ فَنَهَاهُ، أَوْ كَرِهَ أَنْ يَصْنَعَهَا، فَقَالَ: إِنَّمَا أَصْنَعُهَا لِلدَّوَاءِ، فَقَالَ: (**إِنَّهُ لَيْسَ بِدَوَاءٍ، وَلكِنَّهُ دَاءٌ**). [م١٩٨٤].

**ژ تارقێ كوڕێ سوومیدێ جوعفی (رضي الله عنه)، وی پرسیارا عەرەقێ ژ پێغەمبەری (ﷺ) كر؟ وی ژێ ئەو پاشڤەلێدا یان نەڤیا ئەو دورست بكەت، ئینا گۆت: ئەز بۆ دەرمانی ب تنێ دورست دكەم، ئینا گۆت: (ب راستی ئەو نەدەرمانە بەلێ ئەو دەردە).**

١٠ . باب: الحمى من فيح جهنم.

**بابەتێ: تا ژ دژوارییا گوڕییا جەهنەمێیە.**

٢٨٧٧ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْحُمَّى مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَابْرُدُوهَا بِالْمَاءِ**). [خ٣٢٦٤/ م٢٢٠٩].

**ژ ئیبن عومەری ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (رضي الله عنه) گۆت: (تا ژ دژوارییا گوڕییا جەهنەمێیە ب ئاڤێ سار بكەن[1]).**

١١ . باب: الطاعون.

**بابەتێ: تاعوونێ.**

٢٨٧٨ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه خَرَجَ إِلَى الشَّامِ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِسَرْغَ لَقِيَهُ أُمَرَاءُ الأَجْنَادِ، أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ وَأَصْحَابُهُ، فَأَخْبَرُوهُ: أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِأَرْضِ الشَّامِ.

---

(١) مەخسەد پێ نە هەمی رەنگێت تایێنە هەروەكی ئیبن قەیم دبێژیت بەلكی مەخسەد پێ بارا پتر، چونكی بارا پتر ژ تایێت حیجازێ ب ڤی رەنگی بوون.

قالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَالَ عُمَرُ: ادْعُ لِي المهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ، فَدَعَاهُمْ، فاسْتَشَارَهُمْ، وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَاءَ قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، فاخْتَلَفُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لأَمْرٍ، وَلاَ نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ، وَقَالَ: بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَلاَ نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هذَا الْوَبَاءِ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي. ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي الأَنْصَارَ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ المهَاجِرِينَ، وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلاَفِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي. ثُمَّ قالَ: ادْعُ لِي مَن كَانَ هَاهُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ، فَدَعَوْتُهُمْ، فَلَمْ يَخْتَلِفْ مِنْهُمْ عَلَيْهِ رَجُلاَنِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ وَلاَ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هذا الوْبَاءِ. فَنَادَى عُمَرُ فِي النَّاسِ: إِنِّي مُصَبِّحٌ عَلَى ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ.

قال أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ: أَفِرَاراً مِنْ قَدَرِ اللهِ؟ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قالَهَا يا أَبَا عُبَيْدَةَ؟ نَعَمْ، نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ إِلَى قَدَرِ اللهِ، أَرَأَيْتَ إنْ كَانَتْ لَكَ إِبِلٌ هَبَطَتْ وَادِياً لَهُ عُدْوَتَانِ: إِحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ، وَالأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ، وَإِنْ رَعَيْتَ الجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللهِ؟

قالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ عَوْفٍ، وَكَانَ مُتَغَيِّباً فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي فِي هذَا عِلْماً، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ، فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ)**. قَالَ: فَحَمِدَ اللهَ عُمَرُ، ثُمَّ انْصَرَفَ. [خ٥٧٢٩/ م٢٢١٩].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەبا سی، ( خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: عو مەرێ کوڕێ خەتتابی دەر کەفت چۆ شامێ هەتا گەهشتییە سەرغێ (جهێ ڤۆنا غا حەجییان) سەرداریێت لەشکەری ئەبو عوبەیدەیێ کوڕێ جەراحی و هەڤالێت وی گەهشتنێ، و گۆتنێ تاعوون یا کەتییە شامێ.**

**ئیبن عەباسی گۆت: عومەری گۆتە من: بۆ من گازی مشەختێت ئێکێ بکە، من گازی وان کر، و مشێورەتا وان کر و گۆتە وان تاعوون یا کەتییە شامێ، ژێك جودا بوون، هندەکان گۆت: تو بۆ کارەکی یێ دەر کەفتی و ئەم نابینین تو لێ ڤەبی و بز ڤڕی، و هندەکان گۆت: خەلکێ دی و هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێت د گەل تە، و ئەم نابینین تو بەری وان بکەڤی بەرێ وان بدەیە ڤێ تاعوونێ، گۆت: هلۆن ژ دەڤ من رابن، پاشی گۆت: بۆ من گازی ئەنساران خەلکێ مەدینێ بکە، من گازی وان کر، و مشێورەتا وان کر، وان ژی رێکا مشەختان گرتن، و وەکی جودابوونا وان جودا بوون، گۆت: هلۆن ژ دەڤ من رابن، پاشی گۆت: بۆ من کا کی ل ڤێرێیە ژ رویسپییێت قورەیشییان ژ وان یێت پشتی**

**فەتحا مەكەهێ موسلمان بووین گازیكە، من گازیكرن، دو زەلام ژی ژ وان د گەلێك جودا نەبوون، گۆتن: ئەم دبینین تو بخەلكیڤە بز ڤری و بەرێ وان نەدە یە ڤێ تاعوونێ. عومەری (ﷺ) گازی خەلكی كر: ئەز سپێدێ یێ ل سەر وەغەرێ هوین ژی سپێدێ وەغەرێ بكەن.**

**ئەبو عوبە یدەیێ كورێ جەراحی گۆت: دێ ژ قەدەرا خودێ رە ڤی؟ عو مەری (ﷺ) گۆت: هەكە ئێكێ دی وەگۆتبا یا ئەبو عوبە یدە!! (و عو مەری نەدڤیا جوداهیا وی بێتە كرن) بەلێ دێ ژ قەدەرەكا خودێ بۆ قەدەرەكا دی یا خودێ رەڤین، بێژە من هەكە تە حێشتر هەبن و بچنە نهالەكێ دو رەخ هەبن رەخەكێ ڤەلەو بیت و یێ دی یێ رویت بیت، ما نە هەكە تە رەخێ ڤەلەو چەراند تە ب قەدەرا خودێ چەراند و هەكە تە رەخێ رویت چەراند تە ب قەدەرا خودێ چەراند؟**

**عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی (ﷺ)، هات و ئەو ژ بەر كارەكی خۆ ئا مادە نەبوو گۆت: ب راستی من زانینا ل سەر ڤێ هەی، من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەكە هەوە گوه لێ بوو ل عەردەكی یێ هەی نەچنە وێرێ، و هەكە كەفتە عەردەكی و هوین ل وێرێ بن، ژێ نەدەركەڤن ژێ برەڤن). عومەری (ﷺ) حەمدا خودێ كر و چۆ.**

٢٨٧٩ - (ق) عَنْ عامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ سَمِعَهُ يَسْأَلُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ: ماذَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي الطَّاعُونِ؟ فَقَالَ أُسَامَةُ: قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الطَّاعُونُ رِجْسٌ، أُرْسِلَ عَلَى طَائِفَةٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ. أَوْ: عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ. فَإِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ؛ فَلاَ تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا؛ فَلاَ تَخْرُجُوا فِرَاراً مِنْهُ**). [خ٣٤٧٣/ م٢٢١٨].

**ژ عامرێ كورێ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی ( خودێ ژ وان رازی بیت) ژ بابێ خۆ: وی گوه ل وی بوو پرسیار ژ ئوسامەیێ كورێ زەیدی دكر: تە چ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د تاعوونێدا گوه لێ بوویە؟ ئینا ئوسامەیی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە هەوە گوه ل تاعوونێ بوو ل عەردەكی، نەچنە وێرێ، و هەكە كەفتە عەردەكی و هوین ل وێرێ بن، ژێ نەدەركەڤن).**

٢٨٨٠ – (خ) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنِ الطَّاعُونِ، فَأَخْبَرَنِي أَنَّهُ: (عَذَابٌ يَبْعَثُهُ اللهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ، وَأَنَّ اللهَ جَعَلَهُ رَحْمَةً لِلْمُؤْمِنِينَ، لَيْسَ مِنْ أَحَدٍ يَقَعُ الطَّاعُونُ، فَيَمْكُثُ فِي بَلَدِهِ صَابِراً مُحْتَسِباً، يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ يُصِيبُهُ إِلاَّ مَا كَتَبَ اللهُ لَهُ؛ إِلاَّ كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ شَهِيدٍ). [خ٣٤٧٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) هە ڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: من پر سیارا تاعوونێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر، ئینا گۆتە من ئەو: (ئەو ئیزا بوو، خودایێ مەزن، ب سەر واندا دهنارت یێ ڤیابا، بەلێ خودێ بۆ خودان باوەران یا کرییە دلۆڤانی و رەحمەت، نینە بەندەیەك بکەڤیتە د تاعووذیێدا، و ل باژێرێ خۆ بمینیت سەبرێ خۆ بکێشیت و ب قەدەرا خودێ یێ رازی بیت، و بزانیت چو ناگەهیتێ ئەو نەبیت یا خودێ بۆ نڤیسی هەکە خودێ خێرا شەهیدی نەدەتێ).**

١٢ ـ باب: اجتناب المجذوم.

**بابەتێ: دویرکەفتن ژ خلتەیی.**

٢٨٨١ – (م) عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ الثَّقَفِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ فِي وَفْدِ ثَقِيفٍ رَجُلٌ مَجْذُومٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ): (إِنَّا قَدْ بَايَعْنَاكَ، فَارْجِعْ). [م٢٢٣١].

**ژ عەمرێ کورێ شەریدێ کورێ سووەیدێ سەقەفی (رضي الله عنه) ژ بابێ خۆ گۆت: زەلامەکێ خلتەیی د گەل شاندێ سەقیف هەبوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گەهاندێ: (ب راستی مە سۆز و پەیمانا تە ژ تە قەبوول کر، ڤێجا بزڤرە ڤە).**

٢٨٨٢ – (خـ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَلاَ هَامَةَ، وَلاَ صَفَرَ، وَفِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ كَمَا تَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ). [خ. ٥٧٠٧معلق].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەساخی ب خۆ (بێی حەزکرنا خودێ) ناڤەگریت و بێوەغەری نەدورستە و بێوەغەری ژ بومێ نەدورستە**

**و کوشتن ب کرمێ زکی ناهێت ب خودێ نەبیت [1] و ژ خلتەیی برەڤە هەروەکی ژ شێری درەڤی).**

٢٨٨٣ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تُدِيمُوا النَّظَرَ إِلَى الْمَجْذُومِينَ**).[جه٣٥٤٣].

* حسن صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ز ێدە بەرێ خۆ نەدەنە خلتەی)[2]**

## ١٣ ـ باب: العين حق.

## بابەتێ: چاڤهاڤێتن راستییە.

٢٨٨٤ – (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ؛ فَاغْسِلُوا**). [م٢١٨٨].

ژ ئیبن عەبا سی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) ژ پێغەم بەری (ﷺ) گۆت: **( چاڤهاڤێتن راستییە و ئەگەر تشتەکی د بەری قەدەرێڕا کربا دا چاڤهاڤێتن بیت، و ئەگەر خۆشویشتن ژ هەوە هاتە داخوازکرن خۆ بشۆن)[1].**

---

(١) لا طيرة: عەرەبان بێوەغەرییا خۆ ژ هندەك تشتان ددیت، وەکی: ئەگەر نێك دەرکەڤتبا و بالندە دیتبا بۆ لایێ چەپێ فڕی دا زڤریت، و ددیت خێر د وێ سەفەرێدا نینە، و ئەگەر دیتبا بۆ لایێ راستێ فڕی دا وەغەرا خۆ ب دلخۆشی کەت، ئیسلامێ دیار کر ئەڤ بێوەغەرییە نەیا دورستە، و (لا هامة: دو رامان یێت بۆ هەین، ئێك: عەرەبان هزر دکر ئەگەر ئێك ژ وان بێتە کوشتن دێ بالندەك ژ کولوڤانکا سەرێ وی هێتە دەر و ل سەر گۆڕێ وی گازی کەت: من ئاڤدەن، و بێدەنگ نابیت هەتا تۆلا وی دهێتە ڤەکرن، یان ژی بێوەغەرییا خۆ ژ توکێ (بومێ) ددیت، ئەگەر ل مالا ئێکی دیار ببا دا بێژن ئێك ژ ڤێ مالێ دێ مریت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ هەردو باوەرییە نەدورست دانان و (لا صفر): دیسا دو رامان یێت هەین، ئێك: عەرەبان هزر دکر کرمەك یێ د زکێ مرۆڤیدا هەی هەر گاڤا برسی بوو دێ مرۆڤی کوژیت و ئەو ژ گڕیاتییێ خرابتر ددانا بۆ ڤەگرتنێ، و یا دی ئەڤەیە: ئەگەر وان ڤیابا شەڕی د هەیڤا موحەڕەمێدا بکەن دا هەیڤا سەفەرێ شوینێ کەنە موحەڕەم و یا وان دڤیا دا د موحەڕەمێدا کەن، ڤێجا پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤ هەردو باوەرییە نەدورست دانان و گۆت: (ولا صفر).

(٢) دا د چاڤێت تەدا کێم نەبیت و بکەڤییە د گونەهێدا، و دا دلێ وی ژی نەهێلی و هەستێ وی برینداد نەکەی.

٢٨٨٥ - عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ يُؤْمَرُ الْعَائِنُ، فَيَتَوَضَّأُ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ الْمَعِينُ. [د٣٨٨٠].

* صحيح الإسناد.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: فەرمانا چاڤهاڤێژی دهاتە كرن دا دەستنڤێژێ گریت پاشی چاڤهنگافتی خۆ پێ دشویشت.**

## ١٤ . باب: رقية النبي (ﷺ).

## بابەتێ: پێڤەخواندنا پێغەمبەری (ﷺ).

٢٨٨٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كانَ يَقُولُ لِلْمَرِيضِ: **(بِاسْمِ الله، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا)**. [خ٥٧٤٥/ م٢١٩٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب تلا خۆ هۆسا د گۆت، دگۆتە نەساخی: (ب هاریكاری و ناڤێ خودێ ئەز دەرمان دكەم، ئاخا عەردێ مە، یا تێكەل ب تڤا هندەكان ژ مە، نەساخێ مە پێ ساخ دبیت ب دەستویریا خودایێ مە)[٢].**

٢٨٨٧ - (خ) عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ قالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَثَابِتٌ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، فَقَالَ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ اشْتَكَيْتُ، فَقَالَ أَنَسٌ: أَلاَ أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ قالَ: بَلَى، قالَ: **(اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، مُذْهِبَ الْبَاسِ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لاَ شَافِيَ إِلاَّ أَنْتَ، شِفَاءً لاَ يُغَادِرُ سَقَماً)**.[خ٥٧٤٢].

**ژ عەبدولعەزیزێ كوڕێ سوهەیبی (رحمه الله) گۆت: ئەز و سابت چۆینە دەڤ ئەنەسێ كوڕێ مالكی، سابتی گۆت ئەی بابێ حەمزەی ئەز یێ نەساخ بوویم، ئینا ئەنەسی گۆتێ: ئەز پێڤەخواندنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب تە ڤە نەخوینم؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ( یا**

---

(١) رێكا شویشتنێ ئەڤەیە: ئامانەك بهێتە ئامادەكرن و ئێك بۆتە ئاڤێ لێ بكەت و ئاڤچاڤ تێدا بهێنە شویشتن و ئاڤ د دەڤی بهێتە وەردان و هەردو ئەنیشك بهێنە شویشتن، و هەردو چۆك و ڕەخێ هەردو پێیان و گۆزەكان و جلكێ بن ئاڤتەنگێ ئەو جهێ دكەڤیتە سەر كێلەكان ژ ئاڤدا و ئەڤ ئاڤە هەمی بكەڤیتە د ئامانیدا و وێ ئاڤێ ل پاتكا چاڤهنگافتیدا بكەن.

(٢) و د ڤەگێرەكێدا دگۆت: هەكە مرۆڤی تشتەك ژێ ئێشابا یان كولكەك یان برینەك لێبا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب تلا خۆ هۆسا دگۆت، و سوفیانێ كوڕێ عویەینە یێ ڤەگێر تلا خۆ یا شەهدێ دانا سەر عەردی و راكر و گۆت: (و تامامیا فەرموودەیێ).

**خودێ خودانێ مرۆڤان، یا نەساخی بر، سلامەت بکە، تویی سلامەتکەر، چو سلامەتکەر نینن تو نەبی، سلامەتیيەکا وەسا چو نەساخییان نەهێلیت).**

٢٨٨٨ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُعَوِّذُ الحَسَنَ وَالحُسَيْنَ، وَيَقُولُ: (إِنَّ أَبَاكُمَا كَانَ يُعَوِّذُ بِهَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَةِ، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لاَمَّةٍ). [خ٣٣٧١].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاراستن بۆ حەسەنی و حوسەینی ژ خودێ دخواست، دگۆت: (ئەز هەوە هەردوکان ب پەیڤێت خودێ یێت تمام و بێ کێماسی دپارێزم ژ هەمی شەیتان و ژەهرکوژەکان و ژ هەمی چاڤێت چاڤهاڤێژ).**

١٥ - باب: رقية جبريل عليه السلام.

**بابەتێ: پێڤەخواندنا جبریلی سلاڤ ل سەر بن.**

٢٨٨٩ - (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ: أَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ فَقَالَ: (نَعَمْ)، قَالَ: بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنِ حَاسِدٍ اللهُ يَشْفِيكَ، بِاسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ. [م٢١٨٦].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: جبریل هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆتێ: یا موحەممەد هەروەکی تو یێ نەساخی و تو پێ دئێشی؟ گۆت: (بەلێ)، گۆت: (ئەز ب ناڤێ خودێ داخوازا سلامەتییێ دکەم، و ب ناڤێ خودێ ئەز ب تە ڤە دخوینم و تە دپارێزم ژ هەر تشتەکێ تە ئەزیەت بدەت، و ژ خرابییا هەر جانەکی یان هەر چاڤێ حەسویدکەرەکی، خودێ دێ تە سلامەت کەت، ئەز ب ناڤێ خودێ داخوازا سلامەتییێ دکەم، و ب ناڤێ خودێ ئەز ب تەڤە دخوینم و تە دپارێزم).**

### ١٦ ـ باب: الدعاء ووضع اليد على موضع الألم.

### بابەتێ: دوعاكرن و دەستدانانا ل سەر جهێ ئێشێ.

٢٨٩٠ – (م) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ الثَّقَفِيِّ: أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَجَعاً، يَجِدُهُ فِي جَسَدِهِ مُنْذُ أَسْلَمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ، وَقُلْ: بِاسْمِ اللهِ، ثَلَاثاً، وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أَعُوذُ بِاللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ). [م٢٢٠٢].

**ژ عوسمانێ كورێ ئەبی عاسێ سەقەفی (رضي الله عنه) وی گازندا خۆ گەها ندە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ بەر ئێشەكێ ژ لەشێ خۆ ددیت پشتی موسلمان بووی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (دەستێ خۆ دانە سەر وی جهێ دئێشیت ژ لەشێ خۆ و بێژە: ئەز ب ناڤێ خودێ داخوازا سلامەتییێ دكەم، سێ جاران، و حەفت جاران بێژە: ئەز خۆ ب مەزناتی و هێزا خودێ و ب شیانا وی دپارێزم ژ خرابییا ئەز دبینم و خۆ ژێ دپارێزم).**

### ١٧ ـ باب: الرقية بالمعوذات.

### بابەتێ: پێڤەخواندن ب موعەویزاتان.

٢٨٩١ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا اشْتَكَى نَفَثَ عَلَى نَفْسِهِ بِالمعوِّذَاتِ، وَمَسَحَ عَنْهُ بِيَدِهِ، فَلَمَّا اشْتكى وَجعَهُ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، طَفِقْتُ أَنْفُثُ عَلَى نَفْسِهِ بِالمعَوِّذَاتِ الَّتِي كَانَ يَنْفُثُ، وَأَمْسَحُ بِيَدِ النَّبِيِّ (ﷺ) عِنْهُ. [خ٤٤٣٩/ م٢١٩٢].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ د چۆ سەر نڤینێت خۆ، مەعویزات (سۆرەتێت ئیخلاس و فەلەق و ناس) دخواندن و پف دكرە دەستێت خۆ لە شێ خۆ پێ ڤەدمالی. ڤێجا دەمێ نەساخییا تێدا مری نەساخ بووی من دەستهاڤێتێ ب موعەویزاتان پف دكرە وی و من ب دەستێ وی ئەو ڤەدمالی[1].**

٢٨٩٢ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَتَعَوَّذُ مِنَ الْجَانِّ، وَعَيْنِ الْإِنْسَانِ، حَتَّى نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ، فَلَمَّا نَزَلَتَا أَخَذَ بِهِمَا، وَتَرَكَ مَا سِوَاهُمَا. [ت٢٠٥٨/ ن٥٥٠٩/ جه٣٥١١].

* صحيح.

(١) چونكی دەستێ وی پیرۆزترە.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ب ئاوایێ خۆ، ب خودێ خۆ ژ جناوەر و چاڤێ مرۆڤان دپاراست[١] هەتا سۆرەتا فەلەق و سۆرەتا ناس هاتینە خوارێ، ڤێجا دەمێ هاتینە خوارێ، ئەو گرتن و یێت دی هێلان.**

### ١٨ . باب: الرقية بفاتحة الكتاب.

### بابەتێ: پێڤەخواندنا ب فاتیحەیێ.

٢٨٩٣ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ نَفَراً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) مَرُّوا بِمَاءٍ، فِيهِمْ لَدِيغٌ أَوْ سَلِيمٌ، فَعَرَضَ لَهُمْ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الماءِ، فَقَالَ: هَلْ فِيكُمْ مِنْ رَاقٍ؟ إِنَّ في الماءِ رَجُلاً لَدِيغاً أَوْ سَلِيماً. فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ عَلى شَاءٍ فَبَرَأَ، فَجَاءَ بِالشَّاءِ إِلَى أَصْحَابِهِ، فَكَرِهُوا ذلِكَ وَقالُوا: أَخَذْتَ عَلَى كِتَابِ الله أَجْراً! حَتَّى قَدِمُوا المدِينَةَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ الله، أَخَذَ عَلَى كِتَابِ الله أَجْراً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ أَحَقَّ ما أَخَذْتُمْ عَلَيْهِ أَجْراً كِتَابُ الله). [خ٥٧٣٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: چەند کەسەك ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) د بەر هندەك کەسانڕا بۆرین ل سەر ئاڤەکێ بوون، و ئێکێ مارپێڤەدایی[٢] لێ بوو، زەلامەکی ژ خەلکێ وێ ئاڤێ ل وان دیار بوو، گۆت: دەرمانکەرەك د گەل هەوە هەیە؟ زەلامەکی مارپێڤەدایی یێ ل جهێ ڤێ ئاڤێ هەی، زەلامەك ژ وان دەرکەفت و چۆ و دەستپێکا قورئانێ فاتیحە بەرامبەر هندەك پەزی پێڤە خواند، سلامەت کەفت، ئینا ئەو پەز ئینا دەڤ هەڤالێت خۆ، و وان ئەڤە پێ خۆش نەبوو و گۆتن: تە کرێ ل سەر کتێبا خودێ وەرگرت، هەتا هاتینە مەدینەیێ، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کرێ بەرامبەر کتێبا خودێ وەرگرت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی هێژاترین تشت هوین کرێ ل سەر وەربگرن کتێبا خودێیە).**

---

(١) نانکو دگۆت: یا خودێ من ژ جانەوەر و چاڤێ مرۆڤان بپارێزە.

(٢) لەدیغ و سەلیم: ئێك رامانە.

## ١٩ ـ باب: رقية العين.

## بابەتێ: پێڤەخواندنا چاڤهاڤێتنێ.

٢٨٩٤ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) . أَوْ أَمَرَ . أَنْ يُسْتَرْقَى مِنَ الْعَيْنِ. [خ٥٧٣٨/م٢١٩٥]

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمانا من كر یان فەرمان كر داخوازا پێڤەخواندنێ ژ چاڤهاڤێتنێ بهێتە كرن.**

٢٨٩٥ – عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ وَلَدَ جَعْفَرٍ تُسْرِعُ إِلَيْهِمُ العَيْنُ، أَفَأَسْتَرْقِي لَهُمْ؟ فَقَالَ: (نَعَمْ، فَإِنَّهُ لَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ). [ت٢٠٥٩/ جه٣٥١٠].

* صحيح.

**ژ ئەسمائا كچا عومەیسی (ﷺ) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی چاڤ زوی زارۆكێت جەعفەری دهنگێڤن، ئەرێ ئەز دا خوازا پێڤەخوا ندنێ بۆ بكەم؟ ئینا گۆت: (بەلێ ، ب راستی ئەگەر تشتەكی د بەری قەدەرێ را كربا دا چاڤهاڤێتن د بەرپڕا كەت).**

## ٢٠ ـ باب: الرقية من الحمة وغيرها.

## بابەتێ: پێڤەخواندن ژ ژەهرێ و تشتێ دیتر.

٢٨٩٦ – (ق) عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عائِشَةَ عَنِ الرُّقْيَةِ مِنَ الحُمَةِ، فَقَالَتْ: رَخَّصَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ. [خ٥٧٤١/ م٢١٩٣].

ولفظ مسلم: رَخَّصَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ.

**ژ ئەسوەدی (ﷺ) گۆت: من پرسیار ژ عائیشایێ ژ پێڤەخواندنا ژەهرێ كر[1]، ئینا گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دەستویرییا پێڤەخواندنێ ژ هەر ژەهردارەكی كر.**

**و ب پەیڤا مو سلمی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رێك دا خەلكێ مالەكێ ژ خەلكێ مەدینەیێ پێڤەخواندنێ ژ هەر ژەهردارەكی بكەن.**

٢٨٩٧ – (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي الرُّقْيَةِ مِنَ الْعَيْنِ، وَالْحُمَةِ، وَالنَّمْلَةِ.[م٢١٩٦].

---

**(١) پێڤەدانا دوپشكی و وەكی وی.**

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستویری ب پێڤەخواندنێ ژ چاڤهاڤێتنێ و ژ پێڤەدانا ژەهرداران و ژ کولکێت تەنشتێ دهێن دا.**

٢٨٩٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ قَالَ حِينَ يُمْسِي ثَلاَثَ مَرَّاتٍ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ حُمَةٌ تِلْكَ اللَّيْلَةَ**). [ت ملحق٣٦٧٥].

* صحيح.

**ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ لێ بوو ئێڤار و سێ جاران بێژیت: (ئەز خۆ ب پەیڤێت خودێ یێت تمام و بێ کێماسی دپارێزم ژ خرابییا تشێ وی دایی، د وێ شەڤێدا چو ژەهردار (وەکی دووپشکی و ماران) زیانێ ناگەهیننێ).**

## ٢١ ـ باب: لا بأس بالرقى ما لم تكن شركاً.

## بابەتێ: پێڤەخواندن خراب نینە ئەگەر شیرك نەبیت.

٢٨٩٩ – (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: كُنَّا نَرْقِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ تَرَى فِي ذلِكَ؟ فَقَالَ: (**اعْرِضُوا عَلَيَّ رُقَاكُمْ، لاَ بَأْسَ بِالرُّقَى مَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ شِرْكٌ**). [م٢٢٠٠].

**ژ عەوفێ کورێ مالکێ ئەشجەعی (ﷺ) گۆت: مە د نەزانینێدا پێڤەخواندن دکر، ئینا مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تو ڤێ چاوا دبینی؟ ئینا گۆت: (کا پێڤەخواندنێت خۆ بۆ من بێژن، پێڤەخوداندن خراب نینە ئەگەر شیرك تێدا نەبیت).**

## ٢٢ ـ باب: لا عدوى ولا طيرة ولا هامة ولا صفر.

## بابەتێ: ڤەگرتن بێی ڤەدەرا خودێ نینە و بێومغەری ژ تشتی و بومێ و سەفەرێ نەدورستە.

٢٩٠٠ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ عَدْوَى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَلاَ هَامَةَ، وَلاَ صَفَرَ**). [خ٥٧٥٧ (٥٧٠٧)/ م٢٢٢٠].

وفي رواية لهما: قَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ، فَمَا بَالُ إِبِلِي تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ، فَيَأْتِي الْبَعِيرُ الأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ بَيْنَهَا فَيُجْرِبُهَا؟ فَقَالَ: (**فَمَنْ أَعْدَى الأَوَّلَ**) ؟! [خ٥٧١٧].

[وانظر: ٢٨٨٢].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نەساخی ب خۆ (بێی حەزکرنا خودێ) نافەگریت و بێومغەری نەدورستە و بێومغەری ژ توکێ (بومێ) نەدورستە و کوشتن ب کرمێ زکی ناهێت ب خودێ نەبیت[1])**.

و د ڤەگێرەکا واندا: کۆچەرە عەرەبەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ پا حێشترێت من خێرە ل سەر خیزی دبێژی خەزالن و دێ حێشترەکا گوڕی هێتە د ناڤدا و دێ وان گوڕی کەت؟ ئینا گۆت: **(و کێ یا ئێکێ گوڕی کر)**.

## ٢٣ ـ باب: الفأل والشؤم

## بابەتێ: گەشبینی و بێومغەری.

٢٩٠١ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ الصَّالِحُ: الكَلِمَةُ الحَسَنَةُ)**. [خ٥٧٥٦/ م٢٢٢٤].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: نەساخی ب خۆ (بێی حەزکرنا خودێ) نا ڤەگریت، و بێوە غەری نەدور ستە و ئەز حەژ گە شبینییا خۆش د کەم، (گەشبینییا خۆش): ئاخفتنا خێرێ و خۆشە.**

٢٩٠٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ طِيَرَةَ، وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ)**. قَالُوا: وَما الْفَأْلُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ)**. [خ٥٧٥٥ (٥٧٥٤)/ م٢٢٢٣].

---

(١) لا طيرة: عەرەبان بێومغەرییا خۆ ژ هندەك تشتان ددیت، وەکی ئەگەر ئێك دەرکەفتبا و بالندە دیتبا بۆ لایێ چەپێ فڕی دا زڤریت و ددیت خێر د وێ سەفەرێدا نینە، و ئەگەر دیتبا بۆ لایێ ڕاستێ فڕی دا وەغەرا خۆ ب دلخۆشی کەت، ئیسلامێ دیار کر ئەڤ بێومغەرییە نەیا دورستە، و (لا هامة: دو ڕامان یێت بۆ هەین، ئێك: عەرەبان هزر دکر ئەگەر ئێك ژ وان هاتبا کوشتن دێ بالندەك ژ کولوفانکا سەرێ وی هێتە دەر و ل سەر گۆڕێ وی گازی کەت: من ئاڤدەن و بێدەنگ نابیت هەتا تۆلا وی نەهێتە ڤەکرن، یان ژی بێومغەرییا خۆ ژ توکێ (بومێ) ددیت، ئەگەر ل مالا ئێکی دیار ببا دا بێژن: ئێك ژ ڤێ مالێ دێ مریت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤ هەردو باوەرییە نەدورست دانان، و (لا صفر): دیسا دو ڕامانێت هەین، ئێك: عەربان هزر دکر کرمەك یێ د زکێ مرۆڤیدا هەی هەر گاڤا برسی بوو دێ مرۆڤی کوژیت، و ئەو ژ گوریاتییێ خرابتر ددانا بۆ ڤەگرتنێ، و یا دی ئەڤەیە ئەگەر وان ڤیابا شەڕی د هەیڤا موحەڕەمێدا بکەن دا هەیڤا سەفەرێ شوینێ کەنە موحەڕەم و یا وان دڤیا دا د موحەڕەمێدا کەن، ڤێجا پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤ هەردو باوەرییە نەدورست دانان و گۆت: (ولا صفر).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: نەساخی ب خۆ (بێی حەزکرنا خودێ) نا ڤەگریت، و ژ وێ چێتر گەشبینییە، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ گەشبینی چییە؟ گۆت: ئاخفتنا خۆش و خێرێیە ئێك ژ هەوە گوه لێ دبیت.**

٢٩٠٣ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ فَفِي: المَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ، وَالمَسْكَنِ**). [خ٢٨٥٩/ م٢٢٢٦]

- زاد في رواية مسلم: يعني: الشُّؤْمَ.

**ژ سەهلێ کوڕێ سەعدێ ساعدی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە (بێومغەری) د تشتەکیدا هەبا، دا د ژن و هەسپ و خانیدا بیت، بەلێ نینە)[1].**

- **د ڤەگێرا موسلمیدا زێدە کرییە: ئانکو: (بێومغەری و رەشبینی).**

٢٩٠٤ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يُعْجِبُهُ إِذَا خَرَجَ لِحَاجَةٍ أَنْ يَسْمَعَ: يَا رَاشِدُ! يَا نَجِيحُ!. [ت١٦١٦].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر بۆ هەوجەییەکێ دەرکەفتبا پێ خۆش بوو گوه لێ ببا ئەی راستەرێکری و ئەی هەوجە قەتیایی.**

٢٩٠٥ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا كُنَّا فِي دَارٍ، كَثِيرٌ فِيهَا عَدَدُنَا، وَكَثِيرٌ فِيهَا أَمْوَالُنَا، فَتَحَوَّلْنَا إِلَى دَارٍ أُخْرَى، فَقَلَّ فِيهَا عَدَدُنَا، وَقَلَّتْ فِيهَا أَمْوَالُنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**ذَرُوهَا ذَمِيمَةً**). [د٣٩٢٤].

* حسن.

**ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم ل خانییەکی بووین هژمارا مە تێدا گەلەك بوو، و مالێ مە تێدا گەلەك بوو، و مە خۆ ڤەگوهازتە خانییەکێ دی هژمارا مە تێدا کێم بوو، و مالێ مە تێدا کێم بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وی خانی بهێلن مادەم هوین وی خانی چونە دبینن)[2].**

---

(١) چونکی گەلەك گرفت و ئالۆزی د ڤاندا پەیدا دبن د گەل هندێ ژی دڤێت ئەم بێومغەرییێ ژێ نەهەلگرین.

(٢) ئەو ب خۆ نە خانی نەگەرە، بەلێ دا ئەو هزر د سەرێ واندا نەمینیت و ل دەڤ وان یا بەردەوام نەبیت، فەرمانا وان کر بچنە خانییەکێ دی.

٢٩٠٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَتَفَاءَلُ وَلاَ يَتَطَيَّرُ، وَيُعْجِبُهُ الاِسْمُ الْحَسَنُ. [حم٢٣٢٨].

* حسن لغيره.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گەشبینی دكر و رەشبینی نەدكر و حەژ ناڤێ خۆش دكر.**

## ٢٤ . باب: لا يورد الممرض على المصح

## بابەتێ: نەساخان تێكەلی ساخان نەكەن.

٢٩٠٧ – (ق) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ: سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ)**. وَأَنْكَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ الْحَدِيثَ الأَوَّلَ، قُلْنَا: أَلَمْ تُحَدِّثْ أَنَّهُ: **(لاَ عَدْوَى)**، فَرَطَنَ بِالْحَبَشِيَّةِ، قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: فَمَا رَأَيْتُهُ نَسِيَ حَدِيثاً غَيْرَهُ. [خ٥٧٧١/ م٢٢٢١]

**ژ ئەبی سەلەمەیی (رضي الله عنه) وی گوه ل ئەبو هورەیرە بوو دگۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بلا خودانێ حێشترێت نەساخ حێشترێت خۆ نەكەتە د گەل خودانێ حێشترێت ساخ) و بیرا ئەبو هورەیرە نەهاتە حەدیسا ئێكێ، مە گۆتێ ما تە نەدگۆت: (نەساخی ڤەگرتن نینە)[1] ئاخفتنەكا تێنەگەهشتی گۆت، ئەبو سەلەمەیی گۆت: من ئەو نەدیتییە فەرموودەیەك ژ بلی ڤێ ژبیر كربیت.**

## ٢٥ . باب: ما جاء في الحمية.

## بابەتێ: ئەوا د راستا پارێزێدا هاتی.

٢٩٠٨ – عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ بِنْتِ قَيْسٍ الْأَنْصَارِيَّةِ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَمَعَهُ عَلِيٌّ عليه السلام، وَعَلِيٌّ نَاقِهٌ، وَلَنَا دَوَالِي مُعَلَّقَةٌ، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَأْكُلُ مِنْهَا، وَقَامَ عَلِيٌّ لِيَأْكُلَ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ لِعَلِيٍّ: **(مَهْ! إِنَّكَ نَاقِهٌ)**، حَتَّى كَفَّ عَلِيٌّ عليه السلام.

---

(١) زانا دبێژن: هەردو فەرمووده دورستن، یا ئێكێ مەبەست پێ ئەوه نەساخی ب خۆ ناهێتە ڤەگوهاستن ئەگەر ب حەزا خودێ نەبیت، و نەساخی ب خۆ بێی حەزكرنا خودێ ناڤەگریت، و ئەڤە دورستكرنەك بوو بۆ باوەرییەكا نەزانینێ وەسا ددانا بێی حەزكرنا خودێ نەساخی ڤەدگریت، و یا دووێ حێشترێت نەساخ و ساخ نەكەنە د گەلێك دا ئەڤە نەبیتە ئەگەرێ ڤەگرتنا نەساخییێ.

قَالَتْ: وَصَنَعْتُ شَعِيراً وَسِلْقاً، فَجِئْتُ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(يَا عَلِيُّ، أَصِبْ مِنْ هَذَا، فَهُوَ أَنْفَعُ لَكَ).** [د٣٨٥٦/ ت٢٠٣٧/ جه٣٤٤٢]

* حسن.

**ژ دایکا مونزری کچا قەیسێ ئەنساری (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ من و عەلی سلاڤ ل سەر بن د گەل بوو، و عەلی ژ نوی ژ نەساخییێ رابوو و مە ئویشیییێت کەسك یێت قەسپان هەلاویستبوون، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو ژێ بخۆت، و عەلی ژی رابوو دا بخۆت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستهاڤێتێ گۆتێ: (نە خۆ تو ژ نوی یێ رابووی و ب سلامەت کەفتی) هەتا عەلی راوەستایی.**

**دایکا مونزری دبێژیت: من جەهـ و بەقلی لێنان و من ئینان، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە عەلی: (ئەی عەلی ڤێ بخۆ ئەڤە بۆ تە باشترە).**

٢٩٠٩ - عَنْ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا أَحَبَّ اللهُ عَبْداً حَمَاهُ الدُّنْيَا، كَمَا يَظَلُّ أَحَدُكُمْ يَحْمِي سَقِيمَهُ الْمَاءَ).** [ت٢٠٣٦].

* صحيح.

**ژ قەتادەیێ کورێ نوعمانی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر خودێ بەندەیەك ڤیا دێ ژ دنیایێ پارێزیت کا چاوا ئێك ژ هەوە بەردەوام نەساخێ خۆ ژ ئاڤێ دپارێزیت[1]).**

## ٢٦ . باب: طعام المريض.

## **بابەتێ: خوارنا نەساخی.**

٢٩١٠ - عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ، فَإِنَّ اللهَ يُطْعِمُهُمْ وَيَسْقِيهِمْ).** [ت٢٠٤٠/ جه٣٤٤٤].

* حسن.

---

(١) هەلبەت مەبەست پێ هندە نەساخینە ئەوێت ئاڤ بۆ ب زیان د گەل کو دل ل سەر ئاڤێیە و دخوازیت بەلێ ژ بەر حەژێکرنا مە بۆ وی ئەم ئاڤێ نادەینێ، هۆسا ئەگەر خودێ حەژ بەندەیەکی کر ژ دنیایێ دپارێزیت و زەرەر و زیان ناگەهیتێ و ژێ ددەتە پاش.

- زد ابن ماجه: (والشَّرابِ).

**ژ عوقبەیێ كورێ عامرێ جو هەنی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خورتییێ ل نەساخێت خۆ ل سەر خوارنێ نەكەن، ب راستی خودێ خوارنێ و ڤەخوارنێ ددەتە وان).**

- **و ئیبن ماجه زێدە كرییە: (و ڤەخوارنێ).**

٢٧ ـ باب: دواء عرق النسا.

**بابەتێ: دەرمانێ (عیرڤا نیسا) هینكا پێی.**

٢٩١١ ـ عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (شِفَاءُ عِرْقِ النَّسَا، أَلْيَةُ شَاةٍ أَعْرَابِيَّةٍ تُذَابُ، ثُمَّ تُجَزَّأُ ثَلَاثَةَ أَجْزَاءٍ، ثُمَّ يُشْرَبُ عَلَى الرِّيقِ فِي كُلِّ يَوْمٍ جُزْءٌ). [جه٣٤٦٣].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (چارەسەرییا هینكا پێی دوینگێ میها عەرەبانە، بهێتە حەلكرن، و پاشی بهێتە سێ پشككرن، پاشی بەری تێشتێ هەر رۆژ پشكەكێ ڤەخۆت).**

٢٨ ـ باب: التمائم.

**بابەتێ: نڤشتۆكان.**

٢٩١٢ ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ تَعَلَّقَ تَمِيمَةً؛ فَلاَ أَتَمَّ اللهُ لَهُ، وَمَنْ تَعَلَّقَ وَدَعَةً؛ فَلاَ وَدَعَ اللهُ لَهُ). [حم١٧٤٠٤].

* حديث حسن.

**ژ عوقبەیێ كورێ عامری (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر كەسێ نڤشتییەكێ ب خۆڤە بهەلاویسیت خودێ كارێ وی بۆ تمام نەكەت، و هەر كەسێ وەدەعەكێ[1] ب خۆڤە بهەلاویسیت خودێ دلتەناهییێ نەدەتێ).**

(١) تشتەكە ژ دەریایێ دەردكەڤیت وەكی سەدەفێیە بۆ چاڤپارستنێ خەلكەك ب ستۆیێ خۆڤە دكەت.

### ٢٩ ـ باب: تحريم الكهانة.

### بابەتێ: حەرامکرنا خێڤزانکییێ.

٢٩١٣ – (م) عَنْ صَفِيَّةَ، عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ أَتى عَرَّافاً فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً**). [م٢٢٣٠].

**ژ سەفییا کچا ئەبی عوبە یدی (رضي الله عنها)، ژ هندە ژنێت پێغەمبەری (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ بێتە دەڤ خێڤزانکەکی پرسیارا تشتەکی ژێ بکەت و باوەر ژێ بکەت چل رۆژان نڤێژ ژێ ناهێتە قەبویلکرن).**

### ٣٠ ـ باب: تحريم السحر.

### بابەتێ: حەرامکرنا سێربەندییێ.

٢٩١٤ – (خـ) وَقَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: رَجُلٌ بِهِ طِبٌّ، أَوْ يُؤَخَّذُ عَنِ امْرَأَتِهِ، أَيُحَلُّ عَنْهُ أَوْ يُنَشَّرُ؟ قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ، إِنَّمَا يُرِيدُونَ بِهِ الْإِصْلاَحَ، فَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَلَمْ يُنْهَ عَنْهُ.

[خ. الطب، باب ٤٩].

**ژ قەتادەیی (رحمه الله) گۆت: من گۆتە سەعیدێ کورێ موسەییەبی: زەلامەکی سێر لێ هاتبیتە کرن یان نەشێت بچیتە دەڤ ژنا خۆ، ئەرێ ئەڤە لێ دهێتە ڤەکرن یان ئەو ژێڤە دبیت؟ گۆت چو خرابی تێدا نینە، چونکی وان چاکی دڤێت، ئەو تشتێ مفای دگەهینیتە خەلکی پاشڤەدان لێ نەهاتییە کرن.**

٢٩١٥ – عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ قَالَ: سَحَرَ النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، فَاشْتَكَى لِذَلِكَ أَيَّاماً، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عليه السلام فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ سَحَرَكَ، عَقَدَ لَكَ عُقَداً فِي بِئْرِ كَذَا وَكَذَا، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَاسْتَخْرَجُوهَا، فَجِيءَ بِهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) كَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ، فَمَا ذَكَرَ ذَلِكَ لِذَلِكَ الْيَهُودِيِّ، وَلاَ رَآهُ فِي وَجْهِهِ قَطُّ. [ن٤٠٩١].

* صحيح الإسناد.

[وانظر: ٣٣٤٠]

**ژ زەیدێ کورێ ئەرقەمی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەکی ژ جوهیان سێر ل پێغەمبەرێ خودێ کر، لەوا چەند رۆژان نەساخ بوو، جبریل سلاڤ ل سەر بن هاتە دەڤ ئینا گۆت: زەلامەکی ژ جوهیان سێر یا ل تە کری و گرێك یێت بۆ تە گرێدان د فلان و فلان بیرێدا،**

ئینا پێغەمبەری (ﷺ) هندەك هنارتن و ئەو دەرئێخستن و ئینان، ڤێجا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو هەروەکی ئەو ژ گرێدانەکێ رزگار بوو، و ئەڤە بۆ وی جوهی نەگۆت و نەدا روییێ وی ژی.

**٣١ . باب: مسؤولية الطبيب.**

**بابەتێ: بەرپرساتییا نوژداری.**

٢٩١٦ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ تَطَبَّبَ، وَلاَ يُعْلَمُ مِنْهُ طِبٌّ قَبْلَ ذلِكَ، فَهُوَ ضَامِنٌ)**. [د٤٥٨٦/ ن٤٨٤٥/ جه٣٤٦٦].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ کارێ نوژدارییێ بکەت و بەری هینگێ نوژداری ژێ نەهاتبیتە زانین ئەو دەستەبەرکارە)[1].**

**٣٢ . باب: وصايا صحية عامة.**

**بابەتێ: شیرەتێت گشتی ل سەر ساخلەمییێ.**

[انظر في الإغتسال كل سبعة ايام: ٩٨٨.

وانظر في المضمضة من الطعام: ٩٥٢.

وانظر في غسل اليدين قبل الطعام: ٢٦٦٤.

وانظر في النهي عن التخلي في الطرق والظلال والماء الراكد: ٨٧٨، ٨٧٩، ٩٨٩.

وانظر في نظافة البدن: ٣١٧١].

(١) ئانکو: ئەو بەرپرسیارە ژ هەر زیانەکا بگەهیتە نەساخی، و دڤێت دەستبەری وێ زیانێ بیت یا دگەهیتە نەساخی.

## الفصل الثالث:الرؤيا

## پشكا سێیێ: خەون.

### ١ . باب: الرؤيا الصالحة جزء من النبوة

### بابەتێ: خەونا باش و راست پشكەكە ژ پێغەمبەراتییێ.

٢٩١٧ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ**). [خ٦٩٨٨/ م٢٢٦٣].

وفي رواية للبخاري: (**إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ، لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ تَكْذِبُ، وَرُؤيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ**). [خ٧٠١٧].

[وانظر: ١٢٣٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (خەونێت خودان باوەری پشكەكن ژ چل و شەش پشكان ژ پێغەمبەراتییێ).**

**و د ڤەگێڕەكا بوخاریدا: (هەكە دویماهییا دنیایێ نێزیك بوو، نێزیكە خەونێت خودان باوەری درەو نەدەركەڤن، و خەونێت خودان باوەری پشكەكن ژ چل و شەش پشكان ژ پێغەمبەراتییێ).**

### ٢ . باب: من رأى النبي (ﷺ) في المنام.

### بابەتێ: یێ پێغەمبەری (ﷺ) د خەونێدا ببینیت.

٢٩١٨ – (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ: سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَكَوَّنُنِي**). [خ٦٩٩٧].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر كەسێ ئەز د خەونێدا دیتم، وی ب دورستی ئەز دیتم، شەیتان نەشێت خۆ بینیتە سەر رەنگێ من).**

٢٩١٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ بِي**). [ت٢٢٧٦/ جه٣٩٠٠/ مي٢١٨٥].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ ئەز د خەونێدا دیتم، وی ئەز دیتم، (یان هەروەکی وی ئەز هشیاری دیتیم)، شەیتان نەشێت خۆ بینیتە سەر خولکێ من).**

### ٣ . باب: إذا رأى ما يكره.

### بابەتێ: ئەگەر خەونەك دیت بۆ نەخۆش بیت.

٢٩٢٠ - (ق) عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَمَنْ رَأَى شَيْئاً يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ شِمَالِهِ ثَلاَثاً، وَلْيَتَعَوَّذْ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ).** [خ٦٩٩٥ (٣٢٩٢)/ م٢٢٦١]

ژ ئەبی قەتادەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خەونا دورست و خۆش ژ خودێیە، و خەونا نەخۆش (کرێت) ژ شەیتانییە، هەر کەسێ خەونەکا نەخۆش دیت، بلا سێ جاران تفکەتە رەخێ خۆ یێ چەپێ، و بلا خۆ ب خودێ ژ شەیتانی بپارێزیت، ب راستی هینگێ زیانێ ناگەهینیتێ).**

٢٩٢١ - (م) عَنْ جَابِرٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: **(إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا؛ فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثاً، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلاَثاً، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ).** [م٢٢٦٢].

ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەکە ئێکی ژ هەوە خەونەکا پێ نەخۆش دیت بلا سێ جاران تفکەتە رەخێ خۆ یێ چەپێ، و بلا سێ جاران خۆ ب خودێ ژ شەیتانی بپارێزیت، و بلا خۆ ل سەر تەنشتا ئەو ل سەر بگوهۆریت).**

### ٤ . باب: المبشرات.

### بابەتێ: مزگینییان.

٢٩٢٢ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الْمُبَشِّرَاتُ)**، قَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: **(الرُّؤْيَا الصَّالِحَةِ).** [خ٦٩٩٠].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: **(ژ مزگینییان پێڤەتر ژ پێغەمبەراتییێ نەمایە). گۆتن: مزگینی چنە؟ گۆت: (خەونێت باش و راستن).**

٥ ـ باب: من كذب في حلمه.

**بابەتێ: ئێك درەوێ د خەونا خۆدا بكەت.**

٢٩٢٣ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلُمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ، وَلَنْ يَفْعَلَ، وَمَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ، وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، أَو يَفِرُّونَ مِنْهُ، صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ صَوَّرَ صُورَةً عُذِّبَ، وَكُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ). [خ٧٠٤٢].

ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ خەونەكا نەدیتی ب خۆ بدەتە دیتن، دێ ژێ هێتە خواستن ئەو دو دندكێت جەهی پێكڤە گرێدەت و ئەو نەشێت، و هەر كەسێ گوهدانا هندە كەسان بكەت و ئەو د پێ نەخۆش بن رۆژا قیامەتێ سفرێ حەلاندی دێ رێژنە د گوهێت ویدا، و هەر كەسێ وێنەكێ (ڤ شتەكێ خودان رح و پەیكەر) چێكەت، دێ هێتە ئیزادان و دێ ژێ هێتە خواستن ئەو رحێ بدەتێ و ئەو نەشێت رحێ بدەتێ).**

٢٩٢٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ مِنْ أَفْرَى الْفِرَى أَنْ يُرِيَ عَيْنَهُ مَا لَمْ تَرَ). [خ٧٠٤٣].

ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی درەوا ژ هەمیان مەزنتر ژ درەوێت كرێت، ئەوە ژ درەوڤە بێژیت من ئەڤە یا د خەونا خۆدا دیتی).**

٦ ـ باب: رؤى النبي (ﷺ).

**بابەتێ: خەونێت پێغەمبەری (ﷺ).**

٢٩٢٥ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى ـ أُرَاهُ ـ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى أَنَّهَا الْيَمَامَةُ أَوْ هَجَرُ، فَإِذَا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ، وَرَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ هذِهِ: أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفاً فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ مَا أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ بِأُخْرَى

فَعَادَ أَحْسَنَ ما كَانَ، فَإِذَا هُوَ ما جاءَ اللهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ، وَرَأَيْتُ فِيهَا بَقَراً، وَاللهُ خَيْرٌ، فَإِذَا هُمُ الْمُؤمِنُونَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ ما جاءَ اللهُ بِهِ مِنَ الْخَيْرِ وَثَوَابِ الصِّدْقِ الَّذِي آتَانَا اللهُ بَعْدَ يَوْمِ بَدْرٍ). [خ٣٦٢٢/ م٢٢٧٢].

ژ ئەبی مووسا ـ وەکی ئەز دبینم ـ ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(من د خەونێدا دیت: ئەز ژ مەکەهێ مەشەخت دبووم بۆ جهەکێ دارقەسپ لێ، من هزر کر یەمامەیە یان هەجەرە، ئەو باژێر دەرکەفت مەدینە، و من د ڤێ خەونا خۆدا دیت ئەز یێ شیرەکی دهەژینم و دەستکێ وی ڤەتیا، و ئەو نەخۆشییا رۆژا ئوحودێ گەهەشتییە باوەریداران، پاشی من هەژاندەڤە باشتر ژ وەکی خۆ زڤریڤە، و ئەو سەرکەفتنا خودێ دایی ژ ڤەکرنا مەکەهێ و کۆمبوونا باوەریداران، و من چێل تێدا دیتن و ـ من تێدا گوە لێ بوو ـ و خێرا خودێ چێترە، و ئەو باوەریدار بوون ل رۆژا ئوحودێ و ئەو خێر ژی ئەو خێر بوو یا خودێ ئینایی ژ خێر و خەلاتێ راستگۆیییێ ئەوا خودێ پشتی بەدرێ دایە مە).**

٢٩٢٦ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (رَأَيْتُ كَأَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ، خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ، حَتَّى قامَتْ بِمَهْيَعَةَ ـ وَهِيَ الْجُحْفَةُ ـ فَأَوَّلْتُ أَنَّ وَبَاءَ الْمَدِينَةِ نُقِلَ إِلَيْهَا). [خ٧٠٣٨].

[وانظر: ٢١٣١، ٣٧٠١].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(من ژنەکا رەش و سەر ڤژەڤژ دیت ژ مەدینێ دەرکەفت هەتا ل مەهیەعەیێ ـ جهەکە ل جوحفەیێ ـ راوەستای، من راڤە کر ئەو تایا مەدینەیێیە بۆ وی جهی هاتە ڤەگوهازتن).**

٧ ـ باب: إذا عبرت الرؤيا وقعت.

**بابەتێ: ئەگەر تە خەون راڤە کر دێ وەسا چێ بیت.**

٢٩٢٧ - عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الرُّؤْيَا عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ تُعَبَّرْ، فَإِذَا عُبِّرَتْ وَقَعَتْ)، قَالَ: ـ وَأَحْسِبُهُ قَالَ: (وَلاَ تَقُصَّهَا إِلاَّ عَلَى وَادٍّ، أَوْ ذِي رَأْيٍ). [د٥٠٢٠].

* صحيح.

ژ ئەبی رەزینێ عوقەیلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خەون یا هەلاویستییە هندی نەهێتە راڤەكرن، و ئەگەر هاتە راڤەكرن دێ وەكی خۆ هێت)، و** گۆت: و ئەز هزر دكەم دگۆت: **(و بۆ كەسێ نەڤەگێرە بۆ وی نەبیت حەژێكرن بۆ تە هەبیت یان خودان هزر بیت).**

٨ ـ باب: رؤية الرب تعالى في النوم

**بابەتێ: دیتنا خودایێ مەزن د خەونێدا.**

٢٩٢٨ – عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَائِشٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(رَأَيْتُ رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ، قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلَأُ الْأَعْلَى؟ فَقُلْتُ: أَنْتَ أَعْلَمُ يَا رَبِّ! قَالَ: فَوَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ، فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ، فَعَلِمْتُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ،** وَتَلاَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ﴾ [الأنعام]. [مي٢١٩٥].

* إسناده صحيح.

[وانظر: ٢٢٩٢].

ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ عائیشی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) گۆت: **(شەڤێ من خودایێ خۆ د جوانترین رەنگدا دیت، گۆت: تو دزانی بانێ بلند هەڤڕكییێ د چ دا دكەن؟ گۆت من گۆت: تو زاناتری ئەی خودایێ من، گۆت: ئینا دەستێ خۆ دانا د ناڤبەرا هەردو ملێت مندا هەتا من هەست ب تەزیاتییا وێ د ناڤبەرا چچكێت خۆدا كری، ڤێجا ژ بەر وێ ئەوا د عەرد و عەسمانا ندا هەی من زانی و ئەڤە خواند** ﴿وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ﴾.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

# الكتاب الرابع

## ما جاء في البيوت

## كتێبا چوارێ

## ئەوا د راستا مالاندا هاتی.

الفصل الأول: الإستئذان.

## پشكا ئێكێ: دەستویرخواستن.

### ١ ـ باب: الاستئذان من أجل البصر.

### بابەتێ: دەستویرخواستن ژ بەر دیتنێ.

٢٩٢٩ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ جُحْرٍ فِي دَارِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَالنَّبِيُّ (ﷺ) يَحُكُّ رَأْسَهُ بِالْمِدْرَى، فَقَالَ: (**لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ تَنْظُرُ، لَطَعَنْتُ بِهَا فِي عَيْنِكَ، إِنَّمَا جُعِلَ الإِذْنُ مِنْ قِبَلِ الإِبْصَارِ**). [خ٥٩٢٤/ م٢١٥٦].

**ژ سەهلێ كورێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەكی د كونەكا د خانییێ پێغەمبەریدا (ﷺ) بەرێ خۆ دداییێ و پێغەمبەری (ﷺ) سەرێ خۆ ب شەی دخوراند، ئینا (ﷺ) گۆت: (ئەگەر من زانیبا تو یێ بەرێ خۆ ددەی، دا ڤی شەی ل چاڤێ تە دەم، هندیكە دەستویرخواستنە ژ بەر بەرێخۆدانێ یا هاتییە دانان).**

٢٩٣٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ): (**لَوْ أَنَّ امْرَأً اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ، فَحَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ، فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ جُنَاحٌ**). [خ٦٩٠٢ (٦٨٨٨)/ م٢١٥٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: بابێ قاسمی (ﷺ) گۆت: (ئەگەر كەسەك بێی دەستویریا تە بەرێ خۆ بدەتە تە[1] و تە بەركەك هاڤێتێ و تە چاڤێ وی پەقاند چو گونەه ل سەر تە نینە).**

### ٢ ـ باب: الاستئذان ثلاثاً.

### بابەتێ: دەستویرخواستن سێ جاران.

٢٩٣١ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ قَالَ: كُنْتُ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ الأَنْصَارِ، إِذْ جَاءَ أَبُو مُوسى كَأَنَّهُ مَذْعُورٌ، فَقَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى عُمَرَ ثَلاَثاً، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي فَرَجَعْتُ، فَقَالَ: ما مَنَعَكَ؟ قُلْتُ: اسْتَأْذَنْتُ ثَلاَثاً فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي فَرَجَعْتُ، وَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ ثَلاَثاً، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ؛ فَلْيَرْجِعْ**). فَقَالَ: وَاللهِ لَتُقِيمَنَّ عَلَيْهِ بَيِّنَةً، أَمِنْكُمْ أَحَدٌ سَمِعَهُ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ فَقَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ:

---

**(١) هەلبەت مەبەست پێ د مالا تەدا نە ژ دەرڤە.**

وَاللهِ لاَ يَقُومُ مَعَكَ إِلاَّ أَصْغَرُ الْقَوْمِ، فَكُنْتُ أَصْغَرَ الْقَوْمِ، فَقُمْتُ مَعَهُ، فَأَخْبَرْتُ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ ذَلِكَ. [خ٦٢٤٥ (٢٠٦٢)/ م٢١٥٣].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل دیوانەكێ بووم ژ دیوانێت خەلكێ مەدینەیێ، من هند دیت ئەبو مووسا هات و هەروەكی یێ ب ترسە، ئینا گۆت: من سێ جاران دەستویری ژ عومەری خواست، و دەستویری نەدا من، و ئەز ڤەگەریام، ئینا گۆت: چ رێگری ل تە كر؟ من گۆت: من سێ جاران دەستویری خواست و دەستویری ب من نەهاتە دان، ئینا ئەز ز ڤریم، و پێغەمبەر (ﷺ) دبێژیت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە سێ جاران دەستویری خواست و دەستویری نەدایێ بلا بزڤریت)، ئینا گۆت: ئەز ب خودێ كەم دڤێت تو بەلگەیی ل سەر بینی، ئەرێ ئێك د ناڤ هەوەدا هەیە ئەڤە چەندە گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ ببیت (ﷺ)؟ ئینا ئوبەیێ كورێ كەعبی گۆتێ: ئەز ب خودێ كەمە یێ ژ هەمیا بچوكتر نەبیت د گەل تە نارابیت، و ئەز ژ وان هەمیان بچویكتر بووم، ئەز د گەل وی رابووم، من گۆتە عومەری پێغەمبەری (ﷺ) ئەو یا گۆتی.**

٣ ـ باب: كراهة قول المستأذن «أنا»

**بابەتێ: نەباشییا دەستویرخوازی بێژیت: (ئەزم).**

٢٩٣٢ – (ق) عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فِي دَيْنٍ كَانَ عَلَى أَبِي، فَدَقَقْتُ الْبَابَ، فَقَالَ: (مَنْ ذَا) ؟ فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ: (أَنَا، أَنَا)، كَأَنَّهُ كَرِهَهَا. [خ٦٢٥٠ (٢١٢٧)/ م٢١٥٥].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، ژ بەر دەینەكی ل سەر بابێ من بوو، من دەرگەهـ قوتا، گۆت: (ئەو كییە)؟ من گۆت: ئەزم، گۆت: (ئەزم ئەزم) هەروەكی پێ نەخۆش بوو.**

٤ ـ باب: جعل الإذن رفع الحجاب

**بابەتێ: دەستویری راكرنا پەردێیە.**

٢٩٣٣ – (م) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِذْنُكَ عَلَيَّ أَنْ يُرْفَعَ الْحِجَابُ، وَأَنْ تَسْتَمِعَ سِوَادِي، حَتَّى أَنْهَاكَ)**. [م٢١٦٩].

ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆتە من: (دەستویرییا تە ئەوە پەردە یا راکری بیت و تە گوه ل پستپستا من ببیت هەتا ئەز نەهیا تە دکەم)[1].

٥ ـ باب: نظر الفجأة.

**بابەتێ: بەرێخۆدانا خافلەتی و نەیا مەبەستدار.**

٢٩٣٤ – (م) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ نَظَرِ الْفُجَاءَةِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَصْرِفَ بَصَرِي. [م٢١٥٩].

**ژ جەریرێ کورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه)، گۆت: من پرسیارا بەرێخۆدانا دەملدەست و بێ مەخسەد ژ پێغەمبەرێ خودێ کر (صلى الله عليه وسلم) گۆت: چاڤێ خۆ وەرگێرە.**

٢٩٣٥ – عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِعَلِيٍّ: (**يَا عَلِيُّ، لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ، فَإِنَّ لَكَ الْأُولَى، وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ**). [د٢١٤٩/ ت٢٧٧٧].

* حسن.

**ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆ تە عەلی: ( ئەی عەلی بەریخۆدانێ د دویڤ بەریخۆدانێدا نەکە، ب راستی یا ئێکێ بۆ تە یە[2] و یا دووێ ل سەر تەیە)[3].**

٦ ـ باب: کیف یستأذن.

**بابەتێ: چەوا دێ دەستویرییێ خوازیت.**

٢٩٣٦ – عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ قَالَ: حَدَّثَنَا رَجُلٌ مَنْ بَنِي عَامِرٍ: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَهُوَ فِي بَيْتٍ، فَقَالَ: أَلِجُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِخَادِمِهِ: (**اخْرُجْ إِلَى هَذَا، فَعَلِّمْهُ الاِسْتِئْذَانَ، فَقُلْ لَهُ: قُلْ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ**) ؟ فَسَمِعَهُ الرَّجُلُ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ، فَأَذِنَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَدَخَلَ. [د٥١٧٧ ـ ٥١٧٩].

---

(١) هەتا ئەز دبێژمە تە نەهێی، و ئەڤە تایبەتمەندییەك بوو بۆ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) هەر گاڤا دیتبا پەردە یا راکرییە یان گوه ل ئاخفتنا نزم یا پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) ببا ئەو یێ دەستویردای بوو چۆبا دەڤ، هندی هند وی خزمەتا پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دکر.

(٢) ئانکو: بۆ تە گونەه ناهێتە نڤیسین.

(٣) ئانکو: بۆ تە گونەهە.

* صحيح.

**ژ ربعییێ كورێ حەراشی گۆت: زەلامەكی ژ بەنی عامر گۆتە مە: وی دەستویری خواست ب چیتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو ل مال بوو، گۆت: ئەرێ بێمە ژۆر؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە خزمەتكارێ خۆ: هەرە دەڤ ڤێ دەستویرخواستنێ نیشا بدە، بێژێ بێژیت: السلام عليكم، بێمە ژۆر؟ وی زەلامی گوه لێ بوو، گۆت: السلام عليكم، بێمە ژۆر؟ پێغەمبەری (ﷺ) دەستویرییا وی دا و هاتە ژۆر.**

٢٩٣٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا أَتَى بَابَ قَوْمٍ لَمْ يَسْتَقْبِلِ الْبَابَ مِنْ تِلْقَاءِ وَجْهِهِ، وَلَكِنْ مِنْ رُكْنِهِ الْأَيْمَنِ أَوْ الْأَيْسَرِ، وَيَقُولُ: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ)، وَذَلِكَ أَنَّ الدُّورَ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا يَوْمَئِذٍ سُتُورٌ. [د٥١٨٦].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ بوسری (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتبا بەر دەرگەهێ ئێكی راست و راست بەرێ خۆ نەددا دەرگەهێ وان، بەلێ دا خۆ دەتە رەخێ وی یێ راستێ یان یێ چەپێ و دگۆت: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ) و ئەڤە ژ بەر هندێ خانییا هینگێ پەردە ل بەر دەرگەهێت وان نەبوون.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

الفصل الثاني: بناء البيوت وفرشها وسلامتها.

**پشكا دووێ: ئاڤاكرنا مالان و رائێخا وان و سلامەتیيا وان.**

١ . باب: ما جاء في البناء.

**بابەتێ: ئەوا د راستا ئاڤاهيدا هاتى.**

٢٩٣٨ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُنِي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بَنَيْتُ بِيَدِي بَيْتاً يُكِنُّنِي مِنَ المطَرِ، وَيُظِلُّنِي مِنَ الشَّمْسِ، ما أَعانَنِي عَلَيْهِ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللهِ. [خ٦٣٠٢].

**ژ ئيبن عومەرى ( خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: من خۆ د گەل پێغەمبەرى (ﷺ) ديت، ب دەستێت خۆ من خانييەك ئاڤا كر، من ژ بارانێ بپارێزيت و ژ رۆژێ سيبەرێ ل من بكەت، و كەسێ ژ چێكرييێت خودێ هاريكاريیا من ل سەر نەكر.**

٢ . باب: البناء لغير حاجة.

**بابەتێ: ئاڤاهيكرن بێ هەوجەيى.**

٢٩٣٩ - (خ) عَنْ قيسِ بْنِ أَبِي حازِمٍ قَالَ: أَتَيْتُ خَبَّاباً، وَهُوَ يَبْنِي حائِطاً لَهُ، فَقَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا الَّذِينَ مَضَوْا لَمْ تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيَا شَيْئاً، وَإِنَّا أَصَبْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ شَيْئاً، لاَ نَجِدُ لَهُ مَوْضِعاً إِلاَّ التُّرَابَ. [خ٦٤٣١ (٥٦٧٢)].

- وفي رواية: قال: إِنَّ المسْلِمَ لَيُؤْجَرُ فِي كُلِّ شَيْءٍ يُنْفِقُهُ؛ إِلاَّ فِي شَيْءٍ يَجْعَلُهُ فِي هَذَا التُّرَابِ. [خ٥٦٧٢].
- وعند الترمذي وابن ماجه: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ الْعَبْدَ لَيُؤْجَرُ فِي نَفَقَتِهِ كُلِّهَا؛ إِلاَّ فِي التُّرَابِ**)، أَوْ قَالَ: (فِي الْبِنَاءِ). [ت٢٤٨٣/ جه٤١٦٣].

**ژ قەيسێ كورێ ئەبى حازمى (رحمه الله) گۆت: ئەز هاتمە دەڤ خەببابى، وى ديوارەك ئاڤا دكر، ئينا گۆت: ب راستى هەڤالێت مە يێت پێشيیا مە چۆن و دنيايێ چو ژ وان كێم نەكر، و پشتى وان هند گەهشتە مە ئەم چو جهان بۆ نابينين ژ دزيیێ بپارێزين ئاخ نەبيت.**

- **و د ڤەگێرەكێدا: ب راستى خێر بۆ موسلمان دهێتە نڤيسين ل سەر هەر تشتەكێ بمەزێخيت ئەو نەبيت بكەتە د ڤێ ئاخێدا[1].**

(١) مەبەست پێ ئاڤاهيیێ زێدەيە يان يێ بۆ خۆمەزنكرنێيە.

**و ل دەڤ ترمزی و ئیبن ماجەی: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی موسلمان خودان خێر دبیت د مەزاختنا خۆ هەمییێدا ئەو نەبیت ئەوا دکەتە د ئاخێدا)[1].**

۳ ـ باب: النهي عن افتراش الحرير.

**بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ رائێخستنا ئارمویشی.**

٢٩٤٠ – (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (لاَ تَلْبَسُوا الحَرِيرَ، وَلاَ الدِّيباجَ، وَلاَ تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلاَ تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا، وَلَنَا فِي الآخِرَةِ).

[خ٥٤٢٦/ م٢٠٦٧].

ژ ئەبی حوزەیفەی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) **دگۆت: (جلکێ ئارمویشی و کراسێ بەر و بەتەن ئارمویش نەکەنە بەر خۆ، و ب ئامانێ زێری و زیڤی نە ڤەخۆن، و د سێنیکێت واندا نەخۆن، ئەو د دنیایێدا بۆ وانن و د ئاخرەتێدا بۆ مەنە).**

٤ ـ باب: النهي عن آنية الذهب والفضة.

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ کارئینانا ئامانێت زێری و زیڤی.**

٢٩٤١ – (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ـ زَوجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ، إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ). [خ٥٦٣٤/ م٢٠٦٥].

فِي رواية لمسلم: (مَنْ شَرِبَ فِي إِنَاءٍ مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ..).

ژ ئوم سەلەمە (رضي الله عنها) هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەوێ ب ئامانێ زیڤی ڤەدخۆت ب راستی ئەو ئاگرێ جەهنەمێ دهاڤێژیتە د زکێ خۆدا).**

**د ریوایەتەکا موسلمیدا: (هەر کەسێ ب ئامانێ زێری و زیڤی .....).**

---

(١) ئانکو: د ئاڤاهییێ زێدەدا و هەوجەیی بۆ نەی و ئارمانج ژێ خۆمەزنکرن.

## ٥ ـ باب: الحلية بغير الذهب والفضة.

## بابەتێ: نەخشكرنێ نە ب زێری و ب زیڤی.

٢٩٤٢ – (خ) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: لَقَدْ فَتَحَ الْفُتُوحَ قَوْمٌ، ما كَانَتْ حِلْيَةُ سُيُوفِهِمُ الذَّهَبَ وَلاَ الْفِضَّةَ، إِنَّمَا كانَتْ حِلْيَتُهُمُ الْعَلاَبِيَّ وَالآنُكَ وَالحَدِيدَ. [خ٢٩٠٩].

**ژ ئەبی ئومامەیی (ﷺ) گۆت: هندە كەسان ڤەكرن ڤەكرن، نەخشێ شیرێت وان نە زێر بوو و نە زیڤ، بەلێ نەخشێ شیرێت وان چەرمێ نەگەماركری و رساس و ئاسن بوو.**

## ٦ ـ باب: كراهة ما زاد عن الحاجة من الأثاث.

## بابەتێ: نەباشییا ئەوێ زێدە ژ هەوجەیێ ژ ناڤمالییێ.

٢٩٤٣ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَن رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ لَهُ: (**فِرَاشٌ لِلرَّجُلِ، وَفِرَاشٌ لاِمْرَأَتِهِ، وَالثَّالِثُ لِلضَّيْفِ، وَالرَّابِعُ لِلشَّيْطَانِ**). [م٢٠٨٤].

[وانظر قوله (ﷺ): (**إن الله لم يأمرنا أن نكسو الحجارة والطين**. **خودێ فەرمان ل مە نەكرییە ئەم جلكی بكەینە بەر كەڤری و تەڤنێ**): ٢٩٥٩.

وانظر: ٣٧٤٧.

وانظر في فراشه (ﷺ): ٣٧٥٦].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نڤینەك بۆ زەلامی و نڤینەك بۆ ژنا وی و یێ سێیێ بۆ مێڤانی، و یا چوارێ بۆ شەیتانی).**

## ٧ ـ باب: اتخاذ الأنماط

## بابەتێ: راێخستنا مەحفویرێت ب رویشەك.

٢٩٤٤ – (ق) عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**هَلْ لَكُمْ مِنْ أَنْمَاطٍ**) ؟ قُلْتُ: وَأَنَّى يَكُونُ لَنَا الأَنْمَاطُ؟ قَالَ: (**أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ لَكُمُ الأَنْمَاطُ**)، فَأَنَا أَقُولُ لَهَا ـ يَعْنِي: امْرَأَتَهُ ـ: أَخِّرِي عَنِّي أَنْمَاطَكِ، فَتَقُولُ: أَلَمْ يَقُلِ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّهَا سَتَكُونُ لَكُمُ الأَنْمَاطُ**). فأَدَعُهَا. [خ٣٦٣١/ م٢٠٨٣].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەرێ هەوە مەحفویرێت ب رویشەك[1] هەنە)؟ من گۆت: ما دێ مە ژ كیڤە مەحفویرێت ب رویشەك**

---

(١) و هندەك دبێژن (أنماط) روییێ دۆشەكانە یێت ماقویل.

**هەبن؟ گۆت: (بزانە دێ هەوە مەحفویرێت ب رویشەك هەبن)، ڤێجا ئەز دبێژمێ ـ مەبەست هەڤژینا ویە ـ : کا مەحفویرێت خۆ بێت ب رویشەك ژ مە وێڤە ببە، ئەو دبێژیت: ما پێغەمبەری (ﷺ) نەگۆت: (دێ هەوە مەحفویرێت ب رویشەك هەبن) ڤێجا ئەز ژی دهێلم.**

٢٩٤٥ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَتَى فَاطِمَةَ رضي الله عنها فَوَجَدَ عَلَى بَابِهَا سِتْرًا، فَلَمْ يَدْخُلْ، قَالَ: وَقَلَّمَا كَانَ يَدْخُلُ إِلاَّ بَدَأَ بِهَا، فَجَاءَ عَلِيٌّ رضي الله عنه فَرَآهَا مُهْتَمَّةً، فَقَالَ: مَا لَكِ؟ قَالَتْ: جَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيَّ فَلَمْ يَدْخُلْ، فَأَتَاهُ عَلِيٌّ رضي الله عنه فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ فَاطِمَةَ اشْتَدَّ عَلَيْهَا أَنَّكَ جِئْتَهَا فَلَمْ تَدْخُلْ عَلَيْهَا، قَالَ: **(وَمَا أَنَا وَالدُّنْيَا؟ وَمَا أَنَا وَالرَّقْمَ)** ؟ فَذَهَبَ إِلَى فَاطِمَةَ فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: قُلْ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَا يَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ: **(قُلْ لَهَا: فَلْتُرْسِلْ بِهِ إِلَى بَنِي فُلاَنٍ)**. [د٤١٤٩، ٤١٥٠].

* صحيح.

- زاد في رواية: وَكَانَ سِتْرًا مَوْشِيًّا.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ فاتیمایێ (رضي الله عنها) ئینا پەردەك ل بەر دەرگەهێ وان دیت، ئینا نەچۆ ژۆر، و گۆت: ئەگەر هاتبا مەکەهێ کێم جاران نەبا ئیللا دا بەری چیتە مالا وێ، ئینا عەلی (رضي الله عنه) هات و دیت ئەو یا بخەمە، گۆتێ: تە خێرە؟ گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ من و نەهاتە د ژۆرڤە، ئینا عەلی هاتە دەڤ و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی فاتیمایێ ل سەر گران بوو تو هاتیە دەڤ و نەچۆیە د ژۆرڤە، گۆت: (ما من و دنیایێ چ ژێکە، ما من و پەردێت نەخشکری چ ژێکە)؟ ئینا چۆ دەڤ فاتیمایێ گۆتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ ڤەگێرا، ئینا گۆت: بێژە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو چ فەرمانا من پێ دکەت؟ گۆت: (بێژێ: بلا بۆ فلان بنەمالێ بهنێریت).**

- **و د ڤەگێرەکێدا زێدە کرییە: و ئەو پەردەکا نەخشکری بوو.**

٨ ـ باب: اتخاذ وسائل السلامة في البيوت.

**بابەتێ: وەرگرتنا رێكێت سلامەتییێ د مالاندا.**

٢٩٤٦ - (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قال: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا كانَ جُنْحُ اللَّيْلِ ـ أَوْ أَمْسَيْتُمْ ـ فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَحُلُّوهُمْ، فَأَغْلِقُوا الأَبْوَابَ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَاباً مُغْلَقاً، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئاً، وَأَطْفِئُوا مَصَابِيحَكُمْ). [خ٥٦٢٣ (٣٢٨٠)/ م٢٠١٢].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر بوو تاری ـ یان ئێڤار ل وە بوو (شەڤ) ـ بچویكێت خۆ بگرن نەهێلن بچنە دەرڤە، ب راستی هینگێ شەیتان بەلاڤ دبن، ڤێجا ئەگەر دەمەك ژ شەڤێ بۆری وان بهێلن، و دەرگەهان بگرن و ناڤێ خودێ بینن، شەیتان دەرگەهەكێ گرتی ڤەناكەت، و مەشكێت خۆ گرێدەن، و ناڤێ خودێ بینن و ئامانێت خۆ بنخێڤن و ناڤێ خودێ بینن، خۆ ئەگەر هوین تشتەكی داننە سەر، و چرایێت خۆ ڤەمرینن).**

٩ ـ باب: المحافظة على الأَولاد عند الغروب.

**بابەتێ: پارێزگاری ل سەر بچویكان دەمێ رۆژئاڤبوونێ.**

٢٩٤٧ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تُرْسِلُوا فَوَاشِيَكُمْ وَصِبْيَانَكُمْ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ حَتَّى تَذهَبَ فَحْمَةُ الْعِشَاءِ؛ فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْبَعِثُ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ حَتَّى تَذْهَبَ فَحْمَةُ الْعِشَاءِ). [م٢٠١٣].

ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر رۆژ ئاڤا بوو گیانەوەر و زارۆكێت خۆ نەبەردەن هەتا تاریاتییا عەیشا دچیت، چونكی ب راستی ئەگەر رۆژ ئاڤا بوو شەیتان دهێنە هنارتن و بەلاڤ دبن هەتا رەشاتییا عەیشا دچیت).**

١٠ـ باب: إطفاء النار عند النوم.

## بابەتێ: ڤەمراندنا ئاگری دەمێ نڤستنێ.

٢٩٤٨ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ**). [خ٦٢٩٣/ م٢٠١٥]

**ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئاگری د مالێت خۆڤە نەهێلنە هەلکری دەمێ هوین دنڤن).**

٢٩٤٩ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ بِالْمَدِينَةِ عَلَى أَهْلِهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَحُدِّثَ بِشَأْنِهِمُ النَّبِيُّ (ﷺ)، قَالَ: (**إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ؛ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ**). [خ٦٢٩٤/ م٢٠١٦].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: مالەك ل مەدینەیێ ب شەڤ ب سەر خودانێ خۆدا سۆت، وەختێ سوحبەتا وان بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتییە کرن، گۆت: (ئەڤ ئاگرە دژمنێ هەوەیە، ڤێجا هەکە هوین نڤستن، ژ خۆ بڤەمرینن).**

١١ـ باب: في جلود النمور والسباع.

## بابەتێ: کەڤلێت پلنگ و دورندەیان.

٢٩٥٠ – عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَرْكَبُوا الْخَزَّ وَلاَ النِّمَارَ**).

[د٤١٢٩/ جه٣٦٥٦].

ولفظ ابن ماجه: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَنْهَى عَنْ رُكُوبِ النُّمُورِ.

* صحيح.

**ژ موعاوییەی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ل سەر زینێ ب ئارمویشی کراسکری و ل سەر کەڤلێ پلنگی نەسویاربن).**

**و بێژەیا ئیبن ماجەیی: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان ژ سواربوونا سەر کەڤلێ پلنگان کرییە.**

## ١٢ . باب: النوم على سطح غير محجر.

## بابەتێ: نڤستن ل سەر بانێ نەدیوارکری.

٢٩٥١ – عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ بَاتَ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَيْسَ لَهُ حِجَارٌ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ**). [د٥٠٤١].

* صحيح.

**ژ عەلییێ کورێ شەیبانی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ ل سەر بانەکێ نەدیوارکری بنڤیت و ئەو بمریت وی گیانێ خۆ ب هەروە دا).**

## ١٣ . باب: سعة المجلس.

## بابەتێ: مالا بەرفرەھ.

٢٩٥٢ – عَنْ نَافِعِ بْنِ عَبْدِ الْحَارِثِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مِنْ سَعَادَةِ الْمَرْءِ: الْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ، وَالْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ**). [حم١٥٣٧٢].

* حديث صحيح لغيره.

**ژ نافعێ کورێ عەبدی حارس (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژ بەختەوەرییا مرۆڤی یە: جیرا نێ باش و ئامویرە تەکێ سواربوونێ یێ خۆش و مالا بەرفرەھ).**

## ١٤ . باب: نظافة البيوت.

## بابەتێ: پاقژییا مالان.

٢٩٥٣ – عن صالح بن أبي حسان قال: سمعت سعيد بن المسيب يقول: إنَّ اللَّهَ طيِّبٌ يحبُّ الطَّيِّبَ، نظيفٌ يحبُّ النَّظافةَ، كريمٌ يحبُّ الكرمَ جوادٌ يحبُّ الجودَ فنظِّفوا أُراهُ قالَ أفنيتَكُم ولا تشبَّهوا باليَهودِ.

قال: فذكرت ذلك لمهاجر بن مسمار فقال: حدثنيه عامر بن سعيد بن أبي وصال، عن أبيه، عن النبيّ (ﷺ) مثله، إلا أنه قال: (نظِّفوا أفنيتَكُم). [ت٢٧٩٩].

* ضعيف إلا قوله: (إن الله جواد...).

ژ سالحێ كوڕێ ئەبی حەسانی (رحمه الله) گۆت: من گوه ل سەعیدێ كوڕێ موسەیيەبی بوو دگۆت: (خودێ یێ پاك و پاقژە ژ هەمی كێماسییان و حەژ پاكی و پاقژییێ د كار و كریار و گۆتنا ندا دكەت، و خودێ یێ پاقژە و حەژ پاقژییا دەرڤە و ناڤدا دكەت، و بەخشندەیە و حەژ بەخشندەیێ دكەت، و یێ مەردە و حەژ مەردینییێ دكەت، ڤێجا پاك و پاقژكەن، ئەز هزر دكەم گۆت: حەوشێت خۆ، و وەكی جوهییان نەبن.

گۆت: من ئەڤە بۆ موهاجرێ كوڕێ میسماری ڤەگێڕا، ئینا گۆت: عامرێ كوڕێ سەعیدێ كوڕێ ئەبی ویسالی ژ بابێ خۆ ژ پێغەمبەری (ﷺ) وەكی ڤێ ڤەگێڕا، بەلێ گۆت: (حەوشێت خۆ پاقژ بكەن).

٢٩٥٣ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِبِنَاءِ المسَاجِدِ فِي الدُّورِ، وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ. [د٤٥٥/ ت٥٩٤/ جه٧٥٨]

* صحيح.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان كر، مزگەفت د ناڤ مالانرا بهێنە ئاڤاكرن، و بهێنە پاقژكرن و بێهنخۆشكرن.

## ١٥ . باب: من باع دارا فليشتر مثلها.

## بابەتێ: یێ خانییەكێ بفرۆشیت بلا ئێكێ وەكی وی بكڕیت.

٢٩٥٤ – عن صعيد بن حُريث قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: **(من باع دارًا أو عقارًا فلم يجعَلْ ثمَنه في مِثلِه، كانَ قمِنًا أن لاَ يبارَكَ فيه)**[1]. [جه٢٤٩٠/ مي٢٦٦٧].

---

(١) شیخ سالح شامی ئەڤ فەرموودەیە د مالپەرێ خۆدا ب ڤێ هەژمارێ ئینایە:

٢٩٥٤ - عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ سَمُرَةَ، عَنْ أَبِيهِ سَمُرَةَ، أَنَّهُ كَتَبَ إِلَى ابْنِهِ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يَأْمُرُنَا بِالمسَاجِدِ أَنْ نَصْنَعَهَا فِي دِيَارِنَا، وَنُصْلِحَ صَنْعَتَهَا، وَنُطَهِّرَهَا. [د٤٥٦].

* صحيح.

[وانظر: ٣١٧١، ٣٣٧٣، ٣٣٧٥ في نظافة المدن].

* صحيح، وفي (الزوائد): ضعيف.

**ژ (صعید)ێ کوڕێ حورەیسی: گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (هەر کەسێ خانییەکی یان عەردەکی بفرۆشیت و بهایێ وی نەکەتە د تشتەکێ وەکی ویدا هەژییە بەرکەت بۆ نەکەڤیتێ).**

❀❀❀❀❀❀❀❀❀❀

---

ژ سولەیمانێ کوڕێ سەمورەیی ژ بابێ خۆ سەمورەیی ئەوی بۆ کوڕێ خۆ نڤیسی: و پشتی ڤێ: ب راستی هندی پێغەمبەرێ خودێیە (ﷺ) فەرمانا مە ب مزگەفتان دکر ئەم جهێت خۆ ئاڤا بکەین و رێك و پێك ئاڤا بکەین و پاقژ بکەین.

الفصل الثالث: تزيين البيوت والأثاث بالصور.

**پشکا سێیێ: خەملاندنا مالان و ناڤمالییان ب وێنەیان.**

١ ـ باب: لا تدخل الملائكة بيتاً فيه صورة.

**بابەتێ: ملیاکەت ناچنە د خانییەکیڤە پەیکەرەك تێڤە بیت.**

٢٩٥٥ – (ق) عَنْ أَبِي طَلْحَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لاَ تَدْخُلُ المَلاَئِكَةُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ تَصَاوِيرُ). [خ٥٩٤٩ (٣٢٢٥)/ م٢١٠٦].

**ژ ئەبی تەلحەی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ملیاکەت ناچنە د مالەکێڤە سە و پەیکەر تێڤەبن).**

٢٩٥٦ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتاً فِيهِ تَمَاثِيلُ أَوْ تَصَاوِيرُ). [م٢١١٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ملیاکەت ناچنە د مالەکێڤە پەیکەر یان وێنەیێت سیبەر هەین تێڤەبن).**

٢ ـ باب: عذاب المصورين

**بابەتێ: ئەشکەنجەیا پەیکەرسازان.**

٢٩٥٧ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ الَّذِينَ يَصْنَعُونَ هذِهِ الصُّوَرَ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا ما خَلَقْتُمْ). [خ٥٩٥١/ م٢١٠٨].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ئەوێت ڤان پەیکەران چێ دکەن رۆژا قیامەتێ دێ بێژنە وان، وان ساخکەن ئەوێت هەوە چێکرین).**

٢٩٥٨ – (ق) عَنْ أَبِي زُرْعَةَ قالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ دَاراً بِالمدِينَةِ، فَرَأَى أَعْلاَهَا مُصَوِّراً يُصَوِّرُ، قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي، فَلْيَخْلُقُوا حَبَّةً، وَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً). [خ٥٩٥٣/ م٢١١١].

**ژ ئەبی زەرعە (ﷺ) گۆت: ل مەدینەیێ ئەز د گەل ئەبو هورەیرە چۆمە د خانییەکێ ڤە، ل سەرێ وی وێ نەگرەك د یت وێ نەیان چێ د کەت، گۆت: من گوه ل**

**پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ـ خودایێ مەزن گۆت ـ : كەس ژ وی ستەمكارتر نینە یێ وەكی چێكرییێ من چێ دكەت، بلا دندكەكا دانی چێكەن، بلا مێرییەكا بچویك چێكەن).**

### ٣ ـ باب: اتخاذ الوسائد المزينة بالصور

### بابەتێ: ب كارئینانا بالیفكێت ب وێنەیان نەخشاندی .

٢٩٥٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنْ سَفَرٍ، وَقَدْ سَتَرْتُ بِقِرَامٍ لِي عَلَى سَهْوَةٍ لِي فِيهَا تَمَاثِيلُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) هَتَكَهُ وَقَالَ: (**أَشَدُّ النَّاسِ عَذَاباً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللهِ**) قالَتْ: فَجَعَلْنَاهُ وِسَادَةً أَوْ وِسَادَتَيْنِ. [خ٥٩٥٤ (٢٤٧٩)/ م٢١٠٧].

- وفي رواية لهما: فَاتَّخَذَتْ مِنْهُ نُمْرُقَتَيْنِ، فَكَانَتَا فِي الْبَيْتِ يَجْلِسُ عَلَيْهِمَا. [خ٢٤٧٩].
- ولمسلم: (إِنَّ اللهَ لَمْ يَأْمُرْنَا أَنْ نَكْسُوَ الحِجَارَةَ وَالطِّينَ).

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ وەغەرەكێ زڤری و من كولەكا خۆ یان خانیكەكێ بچویك ب پەردەكا تەنك ستارە كربوو، هندە وێنێت مرۆڤان ل سەر بوون، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیتی ژێڤە كر، و رەنگێ وی گوهۆری و گۆت: **(ئەی عائیشا ژ مرۆڤان یێ ئێزایا وی رۆژا قیامەتێ دەڤ خودێ یا ژ هەمیان گرانتر ئەون ئەوێت تشتێ ئەو چێ دكەن وەكی وی لێ دكەن یێ خودێ چێ كری).** گۆت: ئینا مە كرە بالیفكەك یان دو بالیفك.

- و د ڤەگێرەكا واندا: من كرە دو بالیفكێت بچویك و ئەو ل مال بوون ل سەر هەردوكان دروینشتە خوارێ.
- و د ڤەگێرا موسلمیدا: **(ب راستی خودێ فەرمان ل مە نەكرییە ئەم جلكی بكەینە بەر كەڤرا و تەڤنێ)**[1].

---

(١) شێخ شامی خودێ ساخلەمییێ بدەتێ ئەڤە د چاپا ئێكێدا نەئینایە و د مالپەرێ خۆدا زێدە كرییە.

## ٤ ـ باب: تصوير غير ذوات الأرواح.

## بابەتێ: وێنەكرنا تشتێ بێ رح.

٢٩٦٠ – (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الحَسَنِ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: إِذْ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبَّاسٍ! إِنِّي إِنْسَانٌ، إِنَّمَا مَعِيشَتِي مِنْ صَنْعَةِ يَدِي، وَإِنِّي أَصْنَعُ هذِهِ التَّصَاوِيرَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لاَ أُحَدِّثُكَ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: **(مَنْ صَوَّرَ صُورَةً فَإِنَّ اللهَ مُعَذِّبُهُ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا الرُّوحَ، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا أَبَداً)**. فَرَبَا الرَّجُلُ رَبْوَةً شَدِيدَةً وَاصْفَرَّ وَجْهُهُ، فَقَالَ: وَيْحَكَ! إِنْ أَبَيْتَ إِلاَّ أَنْ تَصْنَعَ، فَعَلَيْكَ بِهذَا الشَّجَرِ، كُلِّ شَيْءٍ لَيْسَ فِيهِ رُوحٌ. [خ٢٢٢٥/ م٢١١٠].

**ژ سەعیدێ كورێ ئەبی حەسەنی (رحمه الله) گۆت: ئەز ل دەڤ ئیبن عەباسی بووم، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: ئینا گۆت: ئەی ئیبن عەباس ئەز مرۆڤم و ژیارا من ژ كارێ دەستێ منە و ئەز ڤان وێنەیان چێ دكەم، ئینا ئیبن عەباسی گۆت: ئەز چو بۆ تە نابێژم ئەو نەبیت یا من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بوویی، دبێژیت: (هەر كەسێ وێنەكێ (تشتەكێ خودان رح و پەیكەر) چێكەت، دێ هێتە ئیزادان و دێ ژێ هێتە خواستن ئەو رحێ بدەتێ و ئەو ڤەت نەشێت رحێ بدەتێ)، ئینا تەنگە نەفەسەكا دژوار زەلامی گرت و سەروچاڤێت وی زەر بوون، ئینا گۆتێ: وەی بۆ تە ئەگەر هەر دێ چێكەی ڤان داران چێكە، هەر تشتەكێ بێ رح بیت.**

## ٥ ـ باب: نقض الصور والتصاليب.

## بابەتێ: شكاندنا پەیكەر و خاچان.

٢٩٦١ – (خ) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَكُنْ يَتْرُكُ فِي بَيْتِهِ شَيْئاً فِيهِ تَصَالِيبُ إِلاَّ نَقَضَهُ. [خ٥٩٥٢]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) تشتەك د مالا خۆڤە نەدهێلا رەنگێ خاچێ ل سەر با ئەگەر نەشكاندبا و نەتێكدابا.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

الفصل الرابع: حكم حيوانات البيوت وحشراتها.

## پشكا چوارێ: فەرمانا گیانەوەرێت مالان و خشۆكێت وان

١ ـ باب: النهي عن اتخاذ الكلاب والأَجراس.

### بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ سە و زەنگلان.

٢٩٦٢ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ، وَلاَ جَرَسٌ). [م٢١١٣]

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ملیا كەت هەڤالینییا هندە هەڤالان ناكەن سە یان زەنگل د گەل وان بیت).**

٢٩٦٣ – (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (الْجَرَسُ مَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ). [م٢١١٤].

**و ژ وی، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەنگل زڕنا شەیتانییە)(١).**

٢ ـ باب: كراهة الوتر في رقبة البعير.

### بابەتێ: نەباشییا هەلاویستنا بەندكێ كڤانی ل ستۆیێ حێشترێ.

٢٩٦٤ – (ق) عَنْ أَبِي بَشِيرٍ الأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه: أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ ـ قَالَ عَبْدُ اللهِ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ ـ وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) رَسُولاً: (أَنْ لاَ يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلاَدَةٌ مِنْ وَتَرٍ ـ أَوْ قِلاَدَةٌ ـ إِلاَّ قُطِعَتْ). [خ٣٠٠٥/ م٢١١٥].

- زاد مسلم وأبو داود: قَالَ مَالِكٌ: أُرَى ذَلِكَ مِنَ الْعَيْنِ.

**ژ ئەبی بەشیرێ ئەنساری (رضي الله عنه) ئەو د گەل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د هندە وەغەرێت ویدا ـ عەبدوللایی گۆت: ئەز هزر دكەم گۆت: خەلك ل جهێ خۆ یێ شەڤینێ بوون، ئینا پێغەمبەری هنارتییەك هنارت: (بلا چو رستك ژ بەنكێ كڤانی یان هەما رستك د ستۆیێ چو حێشترانڤە نەمینیت ئەگەر نەهێتە ڤەتاندن).**

- **موسلمی و ئەبو داوودی زێدە كرییە: مالكی گۆت: ئەز دبینم ئەو ژ بەر چاڤهاڤێتنێ ب ستۆیێ وانڤە دكرن.**

---

(١) دبیت ژ بەر قەرەبالغا ژ زەنگلێ چێ دبیت.

**٣ ـ باب: النهي عن وسم الحيوان في وجهه.**

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ درویکرنا ناڤچاڤێت گیانەوەری.**

٢٩٦٥ – (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الضَّرْبِ فِي الْوَجْهِ، وَعَنِ الْوَسْمِ فِي الْوَجْهِ. [م٢١١٦]

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهیا ژ قوتانا ناڤچاڤان کری و ژ درویکرنا ناڤچاڤان.**

٢٩٦٦ – (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وَرَأَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِمَاراً مَوْسُومَ الْوَجْهِ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ، قَالَ: (**فَوَاللهِ! لاَ أَسِمُهُ إِلاَّ فِي أَقْصَى شَيْءٍ مِنَ الْوَجْهِ**). فَأَمَرَ بِحِمَارٍ لَهُ فَكُوِيَ فِي جَاعِرَتَيْهِ، فَهُوَ أَوَّلُ مَنْ كَوَى الْجَاعِرَتَيْنِ. [م٢١١٨].

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) کەرەك دیت ناڤچاڤێت درویکری، نەرازیبوونا خۆ ئاشکرا کر، و گۆت: (ب خودێ ئەز درووی ناکەم جهەکێ دویری ناڤچاڤان نەبیت)، و ئەمرێ کەرێ خۆ کر ئینا و تلکێت وی درووی کرن، و ئەو یێ ئێکێ بوو هەردو تلك درووی کرین.**

**٤ ـ باب: قتل الحيات.**

**بابەتێ: کوشتنا ماران.**

٢٩٦٧ – (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: (**اقْتُلُوا الحَيَّاتِ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَطْمِسَانِ البَصَرَ، وَيَسْتَسْقِطَانِ الحَبَلَ**).

قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَبَيْنَا أَنَا أُطَارِدُ حَيَّةً لِأَقْتُلَهَا، فَنَادَانِي أَبُو لُبَابَةَ: لاَ تَقْتُلْهَا، فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَدْ أَمَرَ بِقَتْلِ الحَيَّاتِ. قَالَ: إِنَّهُ نَهى بَعْدَ ذلِكَ عَنْ ذَوَاتِ البُيُوتِ، وَهْيَ الْعَوَامِرُ. [خ٣٢٩٧، ٣٢٩٨/ م٢٢٣٣].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) وی ژ پێغەمبەرێ خودێ گوه لێ بوو (ﷺ) ل سەر مینبەرێ خوتبە دخواند و دگۆت: (ماران بکوژن و وان مارێت دو خەت ل پشتا وان بکوژن و دیسا یێت کوری قوت، ب راستی ئەو چاڤی کۆرە دکەن، و بچویکێ ژنێ ژ بەر دبەن).**

**عەبدوللایی گۆت: ئەز ل دویف مارەکی دچۆم دا بکوژم، ئینا ئەبو لوبابەیی گازی من کر: نەکوژە: من گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان یا ب کوشتنا ماران کری. گۆت:**

**ب راستی وی پشتی هینگێ پاشڤەلێدانا ژ کوشتنا مارێت مالان کری، و ئەو ئەون یێت درێژ دمیننە د مالاندا.**

٢٩٦٨ - عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ كُلَّهُنَّ، فَمَنْ خَافَ ثَأْرَهُنَّ، فَلَيْسَ مِنِّي**). [د٥٢٤٩/ ن٣١٩٣]

* صحيح.

**ژ ئیبن مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ماران هەمیان بکوژن، و یێ ژ تۆلا وان بترسیت ئەو نە ژ منە).**

## ٥ ـ باب: قتل الوزغ.

## بابەتێ: کوشتنا کمکمەی.

٢٩٦٩ - (ق) عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَمَرَهَا بِقَتْلِ الأَوْزَاغِ. [خ٣٣٠٧/ م٢٢٣٧].

- وزاد في رواية للبخاري: وقال (ﷺ): (**كَانَ يَنْفُخُ عَلَى إِبْرَاهِيمَ عليه السلام**). [خ٣٣٥٩].

**ژ دایکا شەریکی (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەمرێ وێ ب کوشتنا کمکمان کر.**

- **و د ڤەگێرا بۆخاریدا زێدە کرییە: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وی پف دکرە ئاگرێ ئیبراهیمی).**

٢٩٧٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ قَتَلَ وَزَغَةً فِي أَوَّلِ ضَرْبَةٍ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، وَمَنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّانِيَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، لِدُونِ الأُوْلَى، وَإِنْ قَتَلَهَا فِي الضَّرْبَةِ الثَّالِثَةِ فَلَهُ كَذَا وَكَذَا حَسَنَةً، لِدُونِ الثَّانِيَةِ**).[م٢٢٤٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ دربێ ئێکێ کمکمەی بکوژیت هندە و هندە خێر بۆ وینە، و هەر کەسێ ب دربێ دووێ بکوژیت هندە هندە خێر کێمتر ژ یێ ئێکێ بۆ وینە، و هەر کەسێ ب دربێ سێیێ بکوژیت هندە هندە خێر بۆ وینە).**

٦ ـ باب: الإحسان إلى الدواب والبهائم.

**بابەتێ: باشیكرن د گەل دەوار و گیانەوەران.**

٢٩٧١ – عَنْ سَهْلِ ابْنِ الْحَنْظَلِيَّةِ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِبَعِيرٍ قَدْ لَحِقَ ظَهْرُهُ بِبَطْنِهِ، فَقَالَ: (**اتَّقُوا اللهَ فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ الْمُعْجَمَةِ، فَارْكَبُوهَا صَالِحَةً، وَكُلُوهَا صَالِحَةً**). [د٢٥٤٨].

* صحيح.

**ژ سەهلێ كورێ حەنزە لەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر حێشترەكێرا بۆری زكێ وێ ب پشتا وێڤە مابوو، ئینا گۆت: (تەقوا خودێ بكەن د راستا ڤان جانەوەرێت بێ ئەزماندا، لێ سویار بن ئەو كێر بێن و بخۆن ئەو كێر بێن).**

٢٩٧٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِيَّاكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا ظُهُورَ دَوَابِّكُمْ مَنَابِرَ، فَإِنَّ اللهَ إِنَّمَا سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُبَلِّغَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنْفُسِ، وَجَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ، فَعَلَيْهَا فَاقْضُوا حَاجَتَكُمْ**). [د٢٥٦٧].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هشیار بن پشتا دەوارێت خۆ نەكەنە مینبەر[1]، چونكی ب راستی خودێ ئەو بۆ هەوە یێت نەرم كرین دا هوین پێ بگەهنە باژێرەكی كو هوین نەدگەهشتنێ ب زەحمەتەكا زەحمەت نەبایە، و عەرد بۆ هەوە نەرم كرییە ڤێجا ل سەر وێ هەوجەیێت خۆ بقەتینن).**

٢٩٧٣ – عَنِ الشَّعْبِيِّ يَرْفَعُ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**مَنْ تَرَكَ دَابَّةً بِمَهْلَكٍ، فَأَحْيَاهَا رَجُلٌ، فَهِيَ لِمَنْ أَحْيَاهَا**). [د٣٥٢٥].

* حسن.

**ژ شەعبی (ﷺ) و ئەو فەرموودەیێ بلند دكەتە پێغەمبەری (ﷺ) وی گۆت: (هەر كەسێ گیانەوەرەكی ل جهەكێ تێچوونێ بهێلت و زەلامەك وێ خودان بكەت و چاڤێ خۆ بدەتێ ئەو بۆ وییە یێ خودان كری و چاڤێ خۆ دایێ).**

---

(١) ل سەر راوەستن و خوتبە و گۆتاران ل سەر بخوینن، چونكی ئەڤە دوەستینیت و ئیزای بۆ دورست دكەت.

٧ ـ باب: ما نُهي عن قتله.

**بابەتێ: ئەو گیانەوەرێت پاشڤەلێدان ژ كوشتنا وان هاتییە كرن.**

٢٩٧٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ: النَّمْلَةُ، وَالنَّحْلَةُ، وَالْهُدْهُدُ، وَالصُّرَدُ. [د٥٢٦٧/ جه٣٢٢٤/ مي٢٠٤٢].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدان یا ژ كوشتنا چوار گیانەوەران كری: مێری و مێشا هنگڤینی و هودهودەی (تەیركێ سولەیمانی) و چویچكا گابەلەك.**

٨ ـ باب: ما جاء في أصوات البهائم.

**بابەتێ: ئەوا د راستا دەنگێ هندە گیانەوەراندا هاتی.**

٢٩٧٥ – عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَسُبُّوا الدِّيكَ، فَإِنَّهُ يُوقِظُ لِلصَّلاَةِ**). [د٥١٠١].

* صحيح.

**ژ یەزیدێ كورێ خالدێ جوهەنی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەبەرا نەبێژنە دیكلی، ب راستی ئەو (مرۆڤی) بۆ نڤێژێ هشیار دكەت).**

٢٩٧٦ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) (**إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلاَبِ وَنَهِيقَ الْحُمُرِ بِاللَّيْلِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ، فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لاَ تَرَوْنَ**). [د٥١٠٣].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هەوە رەوینا سا و حرحرا كەران ب شەڤ گوه لێ بوو، خۆ ب خودێ ژ خرابی بپارێزن، ئەو وێ دبینن یا هوین نەبینن).**

٩ ـ باب: لا تنزى الحمر على الخيل.

**بابەتێ: کەری ناهاڤێژنە سەر ماهینێ.**

٢٩٧٧ – عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) بَغْلَةٌ فَرَكِبَهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لَوْ حَمَلْنَا الْحَمِيرَ عَلَى الْخَيْلِ، فَكَانَتْ لَنَا مِثْلُ هَذِهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ**). [د٢٥٦٥/ ن٣٥٨٢].

* صحيح.

**ژ عەلییێ کورێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) گۆت: من هێسترەك بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کرە دیاری، لێ سویار بوو، ئینا عەلی گۆت: ئەگەر مە کەر هاڤێتبانە سەر ماهینا دا مە وەکی ڤێ هەبان، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی بەس ئەوێت نەزان وی کاری دکەن)[1].**

١٠ ـ باب: الرجل أحق بصدر دابته.

**بابەتێ: خودان ب سینگێ دەوارێ خۆ هەژیترە.**

٢٩٧٨ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: قَضَى النَّبِيُّ (ﷺ) أَنَّ صَاحِبَ الدَّابَّةِ أَحَقُّ بِصَدْرِهَا. [حم١١٩]

* حسن لشواهده.

**ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان کر خودانێ دەواری ب سینگێ دەوارێ خۆ هەژیترە بۆ سویاربوونێ.**

(١) زانا دبێژن ئەڤە رامانا حەرامییێ نادەت، و ئەگەر یا حەرامبا پێغەمبەر (ﷺ) ل هێسترێ سویار نەدبوو، بەلێ رامان ئەوە ئەوێت نەزانن خێرا هەسپی و جیهادێ چەندە وێ دکەن، چونکی ئەگەر کەر بەردانە سەر ماهینان دێ ب ڤێ چەندێ هەسپ کێم بن، و ئەم هەمی دزانین رۆلێ هەسپان دجیهادێدا چەندە، ڤێجا رامان ژ فەرموودەیێ ئەوە یێت نەزانن کا هەسپ د جیهادێدا چەند د فەرن و گرنگن وێ دکەن.

## ١ ـ باب: الأمن حاجة ضرورية.

## بابەتێ: ئێمناهی هەوجەییەكا پێدڤییە.

٢٩٧٩ – عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مِحْصَنٍ الْخَطْمِيِّ ـ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ ـ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِناً فِي سِرْبِهِ، مُعَافًى فِي جَسَدِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ؛ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا**).
[ت٢٣٤٦/ جه٤١٤١].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ كورێ میحسەنێ خەتمی، ـ و وی هەڤالینی هەبوو ـ (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ژ هەوە سپێدە لێ بوو و ئەو د خۆدا (یان د ملەتێ خۆدا) یێ ئێمن، و د لەشێ خۆدا یێ ساخلەم، و خوارنا خۆ یا رۆژا خۆ ل دەڤ، هەروەكی دنیا هەمی بۆ هاتییە كۆمكرن و گەهشتییێ).**

## ٢ ـ باب: حرمة البيوت.

## بابەتێ: حورمەتا مالان.

٢٩٨٠ – عَن عُبادة بن الصّامت: أن رسولَ اللهِ (ﷺ) قال: (**الدارُ حَرَمٌ، فمن دخل عليك حَرَمَكَ؛ فاقتلْهُ**). [حم٢٢٧٧٢][1].

إسناده ضعيف.

[وانظر (لا يحل لمسلم أن يروع مسلماً): ٣٤٣٧.

وانظر في الاستئذان: ٢٩٢٩ وما بعده] .

**ژ عوبادەیێ كورێ سامتی (رضي الله عنه) گۆت: (مالا تە پاوانێ تەیە، هەر كەسێ (بێی دەستویری) هاتە دەڤ تە د پاوانێ تەڤە بكوژە).**

---

**(١) شێخ سالحێ شامی خودێ ژیێ وی درێژكەت د مالپەرێ خۆدا ئەڤ فەرموودە شوینا ڤێ ئینایە و هەر ب وێ هەژمارێ:**

٢٩٨٠ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رسولُ الله (ﷺ): (**مَنِ اطَّلَعَ فِي بَيْتِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ، فَقَدْ حَلَّ لَهُمْ أَنْ يَفْقَؤُوا عَيْنَهُ**) .[م٢١٥٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ بێی دەستویری بەرێ خۆ بدەتە مالەكێ، بۆ وان دورست بوو ئەو چاڤێ وی بپەڤینن).**

هەوجەییّت پیّدڤی

# الكتاب السادس
# الحاجات الأساسية المشتركة
# كتیّبا شەشیّ
# هەوجەییّت سەرەكی و هەڤپشك

## ١ ـ باب: الحاجات الأساسية لا يمتلكها الأفراد.

## بابەتێ: تشتێ گشتی و سەرەكی نەبێت تاكەكەسانن

٢٩٨١ – عَنْ أَبِي خِدَاشٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ثَلاَثاً أَسْمَعُهُ يَقُولُ: (**الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلاَثٍ: فِي الْكَلإِ، وَالْمَاءِ، وَالنَّارِ**). [د٣٤٧٧].

* صحيح.

**ژ ئەبی خیداشی (رضي الله عنه) ژ زەلامەكی ژ مشەختییان ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: سێ خەزا من د گەل پێغەمبەری (ﷺ) كرینە، من ژ وی گوه لێ دبوو دگۆت: (موسلمان د سێیاندا هەڤپشكن: د چەرە و ئاڤێ و ئاگریدا).**

٢٩٨٢ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**ثَلاَثٌ لاَ يُمْنَعْنَ: الْمَاءُ، وَالْكَلأُ، وَالنَّارُ**). [جه٢٤٧٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێ تشتان رێگری لێ ناهێتە كرن: ئاڤ و چەرە و ئاگر).**

٢٩٨٣ – عَنْ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ: أَنَّهُ اسْتَقْطَعَ الْمِلْحَ الَّذِي يُقَالُ لَهُ: مِلْحُ شَذاً بِمَأْرِبٍ، فَأَقْطَعَهُ لَهُ، ثُمَّ إِنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ التَّمِيمِيَّ أَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي قَدْ وَرَدْتُ الْمِلْحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَهُوَ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مَاءٌ، وَمَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ، وَهُوَ مِثْلُ الْمَاءِ الْعِدِّ.

فَاسْتَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَبْيَضَ بْنَ حَمَّالٍ فِي قَطِيعَتِهِ فِي الْمِلْحِ، فَقَالَ: قَدْ أَقَلْتُكَ مِنْهُ عَلَى أَنْ تَجْعَلَهُ مِنِّي صَدَقَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**هُوَ مِنْكَ صَدَقَةٌ، وَهُوَ مِثْلُ الْمَاءِ الْعِدِّ، مَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ**).

قَالَ فَرَجٌ: وَهُوَ الْيَوْمَ عَلَى ذَلِكَ: مَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ.

قَالَ: فَقَطَعَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) أَرْضاً وَغِيلاً بِالْجَوْفِ، جَوْفِ مُرَادٍ، مَكَانَهُ حِينَ أَقَالَهُ مِنْهُ. لفظ ابن ماجه. [د٣٠٦٤/ت١٣٨٠/جه٢٤٧٥/مي٢٦٥٠]

* حسن.

وفي لفظ أبي داود: عَنْ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ: أَنَّهُ وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَاسْتَقْطَعَهُ الْمِلْحَ الَّذِي بِمَأْرِبَ، فَقَطَعَهُ لَهُ.

ژ ئەبیەزێ کورێ حەممالی (رضي الله عنه) وی داخواز کر وێ خوێ بدەنە وی یا دبێژنێ: خوێیا شەزا ل مەئربێ، پاشی ئەقرەعێ کورێ حابسێ تەمیمی هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ د نەزانینێدا ئەز هاتمە سەر خوێیەکێ و ئەو یا ل عەردەکی ئاڤ لێ نینە، و یێ بهێتە سەر بۆ خۆ رادکەت و وەکی ئاڤا ب رێژ و بەردەوامە[1].

ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەو تایبەتمەندیکرنا خوێ بۆ ئەبیەزێ کورێ حەممالی ژێ خواستی بزڤرینیتەڤە، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەو ژ تە سەدەقەیە و ئەو وەکی ئاڤا ب رێژە و یێ بهێتە سەر دێ بۆ خۆ راکەت).**

فەرەج دبێژیت: و ئەو ژ وێ رۆژێ وەرە یا هۆساییە، یێ بهێتە سەر دێ بۆ خۆ راکەت.

گۆت: ئینا پێغەمبەری (ﷺ) عەردەك و جهەکێ پڕ دار ل جەوفا مراد، جهێ وێ داییێ دەمێ ژێ ستاندی. و ئەڤە بێژەیا ئیبن ماجەیە.

و د بێژەیا ئەبی داوودیدا: ژ ئەبیەزێ کورێ حەممالی: ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو خوێیا مەئرب ژێ خواست بۆ بێخیت ئینا بۆ ئێخست.

٢٩٨٤ – عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، عَنْ جَدِّهِ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) بِفِضَّةٍ فَقَالَ: هَذِهِ مِنْ مَعْدِنٍ لَنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**سَتَكُونُ مَعَادِنُ يَحْضرُهَا شِرَارُ النَّاسِ**). [حم٢٣٦٤٥].

* حسن لغيره.

[وانظر ما جاء بشأن العمل الجماعي: ٩٤٥. وانظر بشأن المعادن: ٣٠٨٤] .

ژ زەیدێ کورێ ئەسلەمی (رحمه الله) ژ زەلامەکی ژ بەنی سولەیمی ژ باپیرێ وی، ئەوی زیڤ ئینا دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەڤە ژ کانزاییێ مەیە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دێ کانزا هەبن خرابێت خەلکی دێ بەرهەڤکەن یان خرابێت خەلکی دێ ل دەڤ ئاکنجی بن).**

---

(١) کا چاوا ئاڤ بێ زەحمەت دەردکەڤیت هۆسا ئەڤ خوێیە ژی بێ زەحمەت دەردکەڤیت، و تو چەندێ راکەی هند دهێتە شوینێ.

## ١ . باب: الحلال بيّن والحرام بيّن.

## بابەتێ: حەلال و حەرام د ئاشکەرانە.

٢٩٨٥ - (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (الْحَلاَلُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ: كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ. أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمىً، أَلاَ إِنَّ حِمَى اللهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً: إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ). [خ٥٢/ م١٥٩٩].

ژ نوعمانێ کوڕێ بەشیری (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ب راستی حەلال یێ ئاشکرایە و حرام یێ ئاشکرایە، و هندە کارێت حەلال و حەرام ژێ نەدیار د مابەینا واندا یێت هەین، گەلەك خەلك چو ژێ نوزانن، ڤێجا هەر کەسێ خۆ ژ کارێت حەلال و حەرام ژێ نەدیار پاراست، وی ساخلەمی بۆ دینێ خۆ و نامویسا خۆ خواست یان ب دەست خۆڤە ئینا[1]، و یێ کەفتە د کارێت حەلال و حەرام ژێ نەدیاردا، ئەو کەفتە د حەرامیدا، وەکی شڤانی دۆرما ندۆر پاوانی بچەرینیت، زوی دێ کەڤیت د پاوانیدا. بزانن ب راستی هەر شاهەکی پاوانەك یێ هەی، بزانن ب راستی پاوانێ خودێ حەرامکرییێت وینە، و بزانن ب راستی پارچەکا د لەشیدا هەی هەکە باش بوو، ئەڤە لەش هەمی باش بوو، و هەکە خراب بوو ئەڤە لەش هەمی خراب بوو، بزانن ئەو پارچە دلە).**

٢٩٨٦ - عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ: مَا حَفِظْتَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) (دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ). [ت٢٥١٨/ ن٥٧٢٧/ مي٢٥٧٤].

زاد الترمذي: (فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ، وَإِنَّ الْكَذِبَ رِيبَةٌ).

* صحيح.

**ژ ئەبی حەورائێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: من گۆتە حەسەنێ کوڕێ عەلی تە چ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژبەر کرییە؟ گۆت: من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژبەر کر**

---

(١) ئانکو: ساخلەم بوو ژ خەلەتیا د دینیدا و ساخلەم بوو ژ نەکامییا خەلکی ژێ.

**(تشتێ تو د دورستی و حەلالییا ویدا یێ ب شك و گۆمان بهێلە، وەرە تشتێ تو د دورستی و حەلالییا ویدا نەیێ ب شك).**

و ترمزی زێدە کرییە: **(و ب راستی راستگۆیی دلتەناییە[1] و درەو دودلییە[2]).**

٢٩٨٧ – عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْقُوبَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: لاَ يَبِعْ فِي سُوقِنَا؛ إِلاَّ مَنْ قَدْ تَفَقَّهَ فِي الدِّينِ. [ت٤٨٧].

* حسن الإسناد.

[وانظر في طلب الحلال: ٢٢٢٧، ٣١٩٦] .

[وانظر في البعد عن الشبهات: ١٧٩٨، ٣٣٥٢] .

**ژ عەلائێ کوڕێ عەبدولرەحمانێ کوڕێ یەعقووبی ژ بابێ خۆ ژ باپیرێ خۆ (رضي الله عنه) گۆت: عومەرێ کوڕێ خەتتابی گۆت: بلا کەس فرۆتنێ د بازارێ مەدا نەکەت، ئەو نەبیت یێ د دینی گەهشتبیت.**

٢ ـ باب: من لم يبال من حيث كسب المال.

**بابەتێ: یێ بۆ خەم نەبیت کا ب چ رێك پارەی ب دەست خۆڤە دئینیت.**

٢٩٨٨ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، لاَ يُبَالِي الْمَرْءُ بِمَا أَخَذَ الْمَالَ، أَمِنْ حَلاَلٍ أَمْ مِنْ حَرَامٍ).** [خ٢٠٨٣ (٢٠٥٩)].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی دێ دەمەك ب سەر خەلکیدا هێت مرۆڤی خەم نینە ب چ مال وەرگرت، ئەرێ ژ حەلالییە یان ژ حەرامییە).**

٢٩٨٩ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(يَا كَعْبُ بْنَ عُجْرَةَ، إِنَّهُ لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ).** [مي٢٨١٨].

* إسناد قوي.

---

**(١) جهێ دلرەحەتی و تەناهییێیە.**

**(٢) جهێ دل نەرەحەتییێیە.**

ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەی کەعبێ کوڕێ عوجرەیی ب راستی گۆشتەك ب حەرامی راببیت ناچیتە بەحەشتێ).**

٣ ـ باب: فضل كسب الرجل وعمله بيده

**بابەتێ: خێرا کارێ مرۆڤی و ب دەستێ خۆ کار بکەت.**

٢٩٩٠ - (خ) عَنِ الْمِقْدَامِ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَا أَكَلَ أَحَدٌ طَعَاماً قَطُّ، خَيْراً مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَإِنَّ نَبِيَّ اللهِ دَاوُدَ عليه السلام كَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ**).[خ٢٠٧٢].

ژ مید قدامی(رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(کە سێ خوار نەك نەخوارییە چێتر ژ وێ ئەوا ئەو ژ کارێ دەستێ خۆ بخوەت، و پێغەمبەرێ خودێ داوودی (عليه السلام) ژ کارێ دەستێ خۆ دخوار).**

٢٩٩١ - عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَيُّ الْكَسْبِ أَطْيَبُ؟ قَالَ: (**عَمَلُ الرَّجُلِ بِيَدِهِ، وَكُلُّ بَيْعٍ مَبْرُورٍ**). [حم١٧٢٦٥].

* حسن لغيره.

ژ رافعێ کوڕێ خەدیجی (رضي الله عنه) گۆت: هاتە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کیژ کار پاکتر و باشترە؟ گۆت: **(کارێ مرۆڤ ب دەستێ خۆ بکەت، و هەمی فرۆتنا حەلال و راست و دورست).**

٤ ـ باب: ثبوت خيار المجلس للمتبايعين.

**بابەتێ: بنەجهکرنا مافێ هەلبژارتنێ بۆ فرۆشیاری و بکڕی.**

٢٩٩٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُول اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**الْمُتَبَايِعَانِ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ عَلَى صَاحِبِهِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا؛ إِلاَّ بَيْعَ الخِيَارِ**). [خ٢١١١ (٢١٠٧)/ م١٥٣١].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(فرۆشیار و بکڕ بۆ هەر ئێك ژ وان مافێ پەشێمانییێ ل سەر هەڤالێ خۆ**

**هەیە هندی ژێكڤە نەبن[1]، ئەو فرۆتن نەبیت یا مەرجێ هەلبژارتنێ بۆ هاتبیتە دانان)[2].**

٢٩٩٣ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يَفْتَرِقَنَّ اثْنَانِ، إِلاَّ عَنْ تَرَاضٍ**).

[د٣٤٥٨/ ت١٢٤٨].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (فرۆشیار و بكڕ ژێكڤە نەبن هەتا رێك دكەڤن و ژ ئێكدو رازی بن)[3].**

٥ ـ باب: من يُخْدع في البيع.

**بابەتێ: یێ د فرۆتنێدا دهێتە خاپاندن.**

٢٩٩٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً ذَكَرَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ، فَقَالَ: (**إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ: لاَ خِلاَبَةَ**).　　[خ٢١١٧/ م١٥٣٣].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەكی بەحسێ خۆ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، كو حیلە د كڕین و فرۆتنێدا لێ دهێتە كرن؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ تو ژێ دكڕی بێژێ بێ حیلە و خاپاندن).**

٦ ـ باب: الصدق والنصح في البيع

**بابەتێ: ڕاستگۆیی و شیرەت د فرۆتنێدا.**

٢٩٩٥ - (ق) عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا ـ أَوْ قَالَ: حَتَّى يَتَفَرَّقَا ـ فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَتَما وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا**).　　[خ٢٠٧٩/ م١٥٣٢].

---

(١) هندی ژ دەڤ ئێك نەچن و ب لەشێ خۆ لێكڤەنەبن.

(٢) بۆ نموونە: ئێك بێژیتە هەڤالێ خۆ هەتا سێ رۆژان ئەز مۆلەتێ ددەمە تە یان ئەز مەرج دكەم سێ رۆژان مۆلەتێ بدەیە من، یان مە هەردوكان بۆ سێ رۆژا مافێ لێڤەبوون و پەشێمانی و خۆڤەكێشانێ هەیە، هینگێ ئەگەر ژێكڤە ببن ژی ئەو ماف بۆ سێ رۆژان هەر دێ مینیت.

(٣) ئانكو: دڤێت ژێك جودا نەبن هەتا ل سەر بها و جەوانییا وەرگرتنێ و جوینێ كەلوپەلی پێك دهێن و رێك دكەڤن دا نەبیتە ئەگەرێ دلان و دلگرانی و ژێكڤەبوونێ.

**ژ حەكیمێ كوڕێ حیزامی، (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (فرۆشكار و بكڕ (د كڕین و فرۆتنا خۆدا لێڤە ببن یان نە) یێت ب كەیفا خۆنە هندی ژێكڤە نەبن، ڤێجا هەكە راستی (د كڕین و فرۆتنا خۆدا) گۆتن و (كێماسی و تشتێ هەردو هەوجە) ئاشكرا كرن، ئەڤە بەرەكەت كەفتە د كڕین و فرۆتنا واندا، و هەكە (د كڕین و فرۆتنا خۆدا) كێماسی ڤەشارتن و درەو كرن، بەرەكەتا كڕین و فرۆتنا وان چۆ).**

٧ . باب: السماحة في البيع والشراء.

**بابەتێ: ساناهیاتی و لێبۆرین د كڕین و فرۆتنێدا.**

٢٩٩٦ - (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (رَحِمَ اللهُ رَجُلاً سَمْحاً إِذَا بَاعَ، وَإِذَا اشْتَرَى، وَإِذَا اقْتَضى). [خ٢٠٧٦].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( خودێ دلۆڤانییێ ب زەلامەكێ ساناهی ببەت؛ دەمێ دكڕیت و دەمێ دفرۆشیت و دەمێ دەینی دخوازیت).**

٨ . باب: ما يكره من الحلف في البيع

**بابەتێ: پاشڤەلێدانا سویندێ د فرۆتنێدا.**

٢٩٩٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (الحَلِفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلْعَةِ، مَمْحَقَةٌ لِلْبَرَكَةِ). [خ٢٠٨٧/ م١٦٠٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (سویند متا دفرۆشیت، و بەرەكەتێ د فایدەیدا ناهێلیت).**

٢٩٩٨ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً أَقَامَ سِلْعَةً، وَهُوَ فِي السُّوقِ، فَحَلَفَ بِاللهِ لَقَدْ أُعْطِيَ بِهَا مَا لَمْ يُعْطَ، لِيُوقِعَ فِيهَا رَجُلاً مِنَ المسْلِمِينَ، فَنَزَلَتْ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾[آل عمران:٧٧] . [خ٢٠٨٨].

[وانظر: ٢٧٣١] .

**ژ عەبدوللایێ کورێ ئەبی ئەوفا (ﷺ) گۆت: زەلامەکی ل سویکێ متایەك بەربازار کر و سویند خوار ئەو یا پێ هاتییە دان یا پێ نەدەن، دا زەلامەکی ژ موسلمانان تێ بێخیت، ئینا ئەڤە هاتە خوارێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا﴾[1].**

## ٩ . باب: بيع الطعام بالطعام

## بابەتێ: فرۆتنا خوارنێ ب خوارنێ.

٢٩٩٩ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) اسْتَعْمَلَ رَجُلاً عَلَى خَيْبَرَ، فَجَاءَهُ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا)**. قَالَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّا لَنَأْخُذُ الصَّاعَ مِنْ هَذَا بِالصَّاعَيْنِ، وَالصَّاعَيْنِ بِالثَّلاَثَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَفْعَلْ، بِعِ الجَمْعَ بِالدَّرَاهِمِ، ثُمَّ ابْتَعْ بِالدَّرَاهِمِ جَنِيباً)**. [خ٢٢٠١/ م١٥٩٣].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری و ژ ئەبی هورەیرە (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەك ل سەر خەیبەرێ کرە بەرپرس، ئینا وی قەسپێت باش و بەرکەفتی ئینان، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ هەمی قەسپێت خەیبەرێ د هۆسانە)؟ گۆت: نە، ب خودێ، ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئەم ب راستی منەکا ڤان ب دو منان و دو منان ب سێ منان دکرین، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وەنەکە، قەسپێت نەباش ب دەرهەمان بفرۆشە و ب دەرهەمان قەسپێت باش بکرە).**

٣٠٠٠ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَ بِلاَلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): **(مِنْ أَيْنَ هَذَا)** ؟. قَالَ بِلاَلٌ: كَانَ عِنْدَنَا تَمْرٌ رَدِيٌّ، فَبِعْتُ مِنْهُ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ، لِنُطْعِمَ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) عِنْدَ ذلِكَ: **(أَوَّهْ أَوَّهْ، عَيْنُ الرِّبَا عَيْنُ الرِّبَا، لاَ تَفْعَلْ، وَلكِنْ إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَشْتَرِيَ، فَبِعِ التَّمْرَ بِبَيْعٍ آخَرَ، ثُمَّ اشْتَرِ بِهِ)**. [خ٢٣١٢/ م١٥٩٤].

**ژ ئەبی سەعدیێ خودری (ﷺ) گۆت: بیلالی هندە قەسپێت بەرنی[2] بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینان، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: (ئەڤە یێت کیرێنە)؟ بیلالی**

---

(١) رامانا ئایەتێ ب کورتی: ب راستی ئەو کەسێت سۆز و پەیمانێت داینە خودێ و سویندێت خۆ ئەرزان دفرۆشن، ئەڤان چو بار و پشك د ناخرەتێدا نینە، و خودێ ب دلۆڤانی وان نائاخێڤیت، و رۆژا قیامەتێ بەرێ خۆ نادەتە وان، و گونەهێت وان ژێ نابەت، و ئیزایەکا دژوار دێ دەتە بەر وان.

(٢) جوینەکێ زێدە باشە.

**گۆت: مە هندە قەسپێت خراب هەبوون من دو من ب منەكێ فرۆتن، دا بۆ پێغەمبەری (ﷺ) بینم، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) د وێ چەندێدا گۆت: (ئوه ئوه ئەڤە سەلەف ب خۆیە و ئەڤە سەلەف ب خۆیە، وەنەكە، بەلێ ئەگەر تە ڤیا بكری قەسپێت خۆ یێت خراب ب فرۆتنەكا دی بفرۆشە پاشی وان پێ بكرە).**

٣٠٠١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (التَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْحِنْطَةُ بِالْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرُ بالشَّعِيرِ، وَالْمِلْحُ بالْمِلْحِ، مِثْلاً بِمِثْلٍ، يَداً بِيَدٍ، فَمَنْ زَادَ أَوِ اسْتَزَادَ؛ فَقَدْ أَرْبَى؛ إِلاَّ مَا اخْتَلَفَتْ أَلْوَانُهُ). [م١٥٨٨].

ژ ئەبی هورەیرە گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(قەسپ ب قەسپێ و گەنم ب گەنمی و جەهـ ب جەهی و خوێ ب خوێ وەكی ئێك دەست ب دەستی، هەر كەسێ زێدە بكەت یان داخوازا زێدەبوونێ بكەت ئەڤە وی سەلەف (ریبا) كر، ئەو نەبیت رەنگەزێ وان ژێك جودا بن)**[1].

## ١٠ . باب: الربا والصرف.

## بابەتێ: سەلەف و پارەگوهۆرینێ.

٣٠٠٢ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ؛ إِلاَّ مِثلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ؛ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَلاَ تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلاَ تَبِيعُوا مِنْهَا غَائِباً بِنَاجِزٍ). [خ٢١٧٧ (٢١٧٦)/ م١٥٨٤].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(زێری ب زێری نەفرۆشن سەر بە سەر نەبیت و هندەكێ ب هندەكێ دی ب زێدەیی نەدەن، و زیڤی ب زیڤی نەفرۆشن سەر ب سەر نەبیت، و هندەكێ ب هندەكێ دی ب زێدەیی نەدەن، و زێر و زیڤێ نەئامادە و نەبەردەست ب یێ ئامادە و بەردەست نەفرۆشن).**

٣٠٠٣ - (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَالْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ إِلاَّ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، وَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالْفِضَّةِ، وَالْفِضَّةَ بِالذَّهَبِ، كَيْفَ شِئْتُمْ). [خ٢١٧٥/ م١٥٩٠].

---

(١) وەكی قەسپ ب گەنمی و خوێ ب قەسپان و زێر ب زیڤی و هۆسا.

**ژ ئەبی بەکرەتە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زێری ب زێری نەفرۆشن سەر بە سەر نەبیت و هندەکێ ب هندەکێ دی ب زێدەیی نەدەن، و زیڤی ب زیڤی نەفرۆشن سەر ب سەر نەبیت، و زێری ب زیڤی و زیڤی ب زێری بفرۆشن چاوا هەوە بڤێت).**

٣٠٠٤ - (ق) عَنْ أَبِي صَالِحٍ الزَّيَّاتِ: أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ رضي الله عنه يَقُولُ: الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، فَقُلْتُ لَهُ: فَإِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ لاَ يَقُولُهُ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَأَلْتُهُ، فَقُلْتُ: سَمِعْتَهُ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ)، أَوْ وَجَدْتَهُ فِي كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: كُلَّ ذلِكَ لاَ أَقُولُ، وَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنِّي، وَلكِنْ أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ رِباً إِلاَّ فِي النَّسِيئَةِ)**. [خ٢١٧٨/ م١٥٩٦].

**ژ ئەبی سالحێ زەیات (ﷺ) وی گوه ل ئەبی سەعیدێ خودری بوو (ﷺ) دگۆت: دینار ب دیناری و دەرهەم ب دەرهەمی، من گۆتێ: ئیبن عەباس وەنابێژیت: ئینا ئەبو سەعیدی گۆت: من پرسیارا وی کر، و من گۆت: تە ئەڤە گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) بوویە یان تە د کتێبا خودێدا دیتییە؟ گۆت: ئەز چو ژ وان نابێژم، و هوین ب پێغەمبەرێ خودێ ژ من زاناترن، بەلێ ئوسامەیی گۆتە من، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو سەلەف نینە ئەو نەبیت یا د پاشئێخستنێدا)[1].**

٣٠٠٥ - (ق) عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ: أَنَّهُ الْتَمَسَ صَرْفاً بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَدَعَانِي طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللهِ، فَتَرَاوَضْنَا حَتَّى اصْطَرَفَ مِنِّي، فَأَخَذَ الذَّهَبَ يُقَلِّبُهَا فِي يَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: حَتَّى يَأْتِيَ خَازِنِي مِنَ الغَابَةِ، وَعُمَرُ يَسْمَعُ ذلِكَ، فَقَالَ: وَاللهِ! لاَ تُفَارِقُهُ حَتَّى تَأْخُذَ مِنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِباً إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ)**. [خ٢١٧٤ (٢١٣٤)/ م١٥٨٦].

**ژ مالکێ کورێ ئەوسی (ﷺ) ئەو لێ دگەریا سەد دینارا بگوهۆریت و بفرۆشیت، تەلحەیێ کورێ عوبەیدیلایی گازی من کر، مە بازار کر هەتا ژ من کرین، و زێر هەلگرت و ناڤ دەستێ خۆدا وەرگێران، پاشی گۆت: هەتا گەنجینەدارێ من ژ دارستانێ دزڤریت، عومەری ئەڤە گوه لێ بوو و گۆت: نە، ب خودێ تو وی ناهێلی هەتا تو نەوەرگری،**

---

(١) ئانکو: ئەو ب تنێ ریبایە ئەوا زێدە دچیتە سەر بەرامبەر پاشئێخستن و گیرۆکرنێ.

**پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زێر ب زێری سەلەفە ئەو نەبیت هانێ و هانێ[1] و گەنم ب گەنمی سەلەفە ئەو نەبیت هانێ و هانێ و جەھ ب جەھی سەلەفە، ئەو نەبیت هانێ و هانێ، و قەسپ ب قەسپێ سەلەفە، ئەو نەبیت هانێ و هانێ).**

١١ ـ باب: بيع القلادة فيها خرز وذهب.

**بابەتێ: فرۆتنا رستكا بەرێت تایبەت و زێر پێڤە بیت.**

٣٠٠٦ – (م) عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَهُوَ بِخَيْبَرَ، بِقِلاَدَةٍ فِيهَا خَرَزٌ وَذَهَبٌ، وَهِيَ مِنَ الْمَغَانِمِ تُبَاعُ. فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالذَّهَبِ الَّذِي فِي الْقِلاَدَةِ فَنُزِعَ وَحْدَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَزْناً بِوَزْنٍ**). [م١٥٩١].

**ژ فوزالەیێ كورێ عوبەیدێ ئەنساری (رضي الله عنه) گۆت: ستڤانكەكێ ب بەرێت بهادار و زێری ئینانە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو ل خەیبەرێ بوو، و ئەو ستڤانك ژ دەستكەفتان بوو، دفرۆت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان كر زێر ب تنێ ژ ستڤانكێ بێتە دەرئێخستن، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە وان: (زێر ب زێری كێش ب كێشێ)[2].**

١٢ ـ باب: لعن آكل الربا وموكله.

**بابەتێ: نەفرەت ل سەلەف وەرگر و سەلەف دەهی هاتینە كرن.**

٣٠٠٧ – (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَشَاهِدَيْهِ، وَقَالَ: هُمْ سَوَاءٌ. [م١٥٩٨]

**ژ جابری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لەعنەت یێت ل سەلەف خۆری و سەلەف دەهی و نڤیسەرێ وێ و هەردو شاهدێت وێ یێت كرین و گۆت: ئەو وەكی ئێكن.**

٣٠٠٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الرِّبَا ثَلاَثَةٌ وَسَبْعُونَ بَاباً**). [جه٢٢٧٥].

* صحيح.

---

**(١) ئانكو: فرۆشیار تشتی بدەتەڤ بكڕی و بكڕ پارەی بدەتەڤ فرۆشیاری.**

**(٢) ئانكو: دڤێت كێشا وان هندی ئێك بیت، كێشا ڤێ چەندە یا دی ژی دڤێت هند بیت.**

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(سەلەف حەفتێ و سێ دەرگەهن)**[1].

١٣ . باب: النهي عن الاحتكار والغش.

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ ڤەشارتنا متای و سەختەییێ.**

٣٠٠٩ - (م) عَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يَحْتَكِرُ إِلاَّ خَاطِئٌ)**.[م١٦٠٥].

ژ مەعمەرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(كەس متای نافەشێریت گونەهكار نەبیت).**

٣٠١٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلاً، فَقَالَ: **(مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ)** ؟ قَالَ: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(أَفَلاَ جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ النَّاسُ؟ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي)**. [م١٠٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر كۆمەكا خوارنێرا بۆری دەستێ خۆ كرە تێدا دەستێ وی تەڕ بوو، ئینا گۆت: **(ئەڤە چییە یا خودانێ خوارنێ)؟** گۆت: بارانێ یێ گرتی یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(بۆچی تە نەدئینا سەرڤە دا خەلك ببینیت؟، هەر كەسێ حیلێ بكەت ئەو نە ژ منە).**

١٤ . باب: لا يبيع ما اشترى من الطعام قبل القبض.

**بابەتێ: ئەو خوارنا كڕی نافرۆشیت بەری وەرگریت.**

٣٠١١ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنِ ابْتَاعَ طَعَاماً، فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ)**. [خ٢١٢٦ (٢١٢٤)/ م١٥٢٦].

- وفي رواية لهما: (حَتَّى يَقْبِضَهُ). [خ٢١٣٦].

ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ خوارنەك كڕی بلا نەفرۆشیت هەتا كێشان یان پیڤانا وێ تمام دكەت و وەردگریت).**

- و د ڤەگێرەكا واندا: **(هەتا وەردگریت).**

(١) ئانكو: گونەها وێ نە ئێكە و حەفتێ و سێ دەرەجەنە.

٣٠١٢ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنِ اشْتَرَى طَعَاماً فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَكْتَالَهُ). [م١٥٢٨].

**ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( هەر كە سێ خوارنەك كڕى بلا نەفرۆشيت هەتا دپيڤيت).**

١٥ ـ باب: من باع نخلاً عليها ثمر.

**بابەتێ: يێ دارقەسپا بفرۆشيت و قەسپ پێڤە بن.**

٣٠١٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ بَاعَ نَخْلاً قَدْ أُبِرَتْ فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ، إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ). [خ٢٢٠٤ (٢٢٠٣)/ م١٥٤٣].

**ژ عەبدوللايێ كوڕێ عومەرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (يێ دارقەسپا بكريت و هاتبنە پەترومەكرن (تەلقيحكرن) بەرێ وان بۆ فرۆشكارييە ئەو نەبيت بكڕى مەرج كربيت).**

١٦ ـ باب: لا تباع الثمار قبل بدوِّ صلاحها وحكم الجوائح

**بابەتێ: بەر و فێقى بەرى گەهشتنا وان ئاشكرا ببيت ناهێنە فرۆتن و فەرمانا ئاتافان.**

٣٠١٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا، نَهَى البَائِعَ وَالمُبْتَاعَ. [خ٢١٩٤ (١٤٨٦)/ م١٥٣٤].

**ژ عەبدوللايێ كوڕێ عومەرى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان ژ فرۆتنا فێقى كر هەتا گەهشتنا وى ديار دبيت، پاشڤەلێدانا فرۆشكارى و بكڕى كر.**

٣٠١٥ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى تُزْهِيَ، فَقِيلَ لَهُ: وَمَا تُزْهِي؟ قَالَ: حَتَّى تَحْمَرَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَرَأَيْتَ إِذَا مَنَعَ اللهُ الثَّمَرَةَ، بِمَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ). [خ٢١٩٨ (١٤٨٨)/ م١٥٥٥].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان كر ژ فرۆتنا فێقى هەتا دخەمليت، گۆتن: خەملين چ تشتە؟ گۆت: هەتا سۆر دبيت،**

**پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ بێژنە من ئەگەر خودێ بەر و بەرهەم نەدا ئێك ژ هەوە ب چ ماف دێ پارێ برایێ خۆ وەرگریت).**

١٧ . باب: النهي عن المزابنة والمحاقلة والمخابرة.

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ موزابەنێ و موحاقەلێ و موخابەرێ[1].

٣٠١٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ المُزَابَنَةِ: أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ إِنْ كَانَ نَخْلاً بِتَمْرٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ كَرْماً أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلاً، أَوْ كَانَ زَرْعاً، أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ، وَنَهَى عَنْ ذٰلِكَ كُلِّهِ. [خ٢٢٠٥ (٢١٧١)/ م١٥٤٢].

- وفي رواية لهما: قال: والمُزَابَنَةُ: أَنْ يَبِيعَ الثَّمَرَ بِكَيْلٍ: إِنْ زَادَ فَلِي، وَإِنْ نَقَصَ فَعَلَيَّ. [خ٢١٧٢].
- وزاد في رواية لمسلم: وَعَنْ كُلِّ ثَمَرٍ بِخَرْصِهِ..

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا كری: ژ موزابەنەیێ: ئەو ژی ئەڤەیە روتەب و بەرێ بیستانێ خۆ ب قەسپان ب پیڤان بفرۆشیت، و ئەگەر بیستان مێو بیت ئەو تری ب مێویژان ب پیڤان بفرۆشیت، یان ژی دەرامەت بیت ئەو ب پێڤان ب دەرامەتێ نە د گولیێدا بفرۆشیت، و پاشڤەلێدانا ژ ڤێ هەمییێ كری.**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: گۆت: موزابەنە: فێقی ب پیڤانێ بهێتە فرۆتن: ئەگەر زێدە كرن بۆ منن و ئەگەر كێم كرن ئەو ل سەر منە.**
- **و د ڤەگێرا موسلمیدا زێدە كرییە: و ژ هەر فێقییەكێ ب تەقدیرا وێ بهێتە فرۆتن.**

---

(١) موزابەنە: ئەڤەیە مرۆڤ قەسپێت هشك ب روتەبان بفرۆشیت و مێویژان ب تری بفرۆشیت، ئەگەرێ پاشڤەلێدانێ ژی ئەڤەیە: مێویژ و قەسپێت هشك چو ئاڤ د گەل نینە یان یا كێمە و یێت دی بەروڤاژی ئاڤ یا د گەل و دیار نابیت كو هەردو هندی ئێكن.

موحاقەلە: ئەڤەیە گەنم د گولیاندا بهێتە فرۆتن ب گەنمێ سافی و بێی گولی، ئەگەرێ پاشڤەلێدانێ ژی ئەڤەیە تو نوزانی ئەوێ د ناڤ گولیاندا چەندە و یێ چاوایە و بەرزەیی یا تێدا.

موخابەرە: ئەوە خودانێ عەردی عەردێ خۆ بدەتەڤ ئێكی شین بكەت و تۆڤ ژی ل سەر كاركەری بیت بەرامبەر پشكەكا ئاشكەرا، ژ بەرێ زەڤییێ هەر ئەگەر ژی ئەوی جوداهی یا هەی.

٣٠١٧ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ، وَرَخَّصَ فِي الْعَرِيَّةِ أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا، يَأْكُلُهَا أَهْلُهَا رُطَباً. [خ٢١٩١/ م١٥٤٠].

**ژ سەهلێ کوڕێ ئەبی حەسمەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا کری ژ فرۆتنا روتەبان ب قەسپان و دەستویرییا ب فرۆتنا عەرییە[1] دایی ب هندی خۆ بهێنە فرۆتن، خودانێن وان روتەب بخۆن.**

٣٠١٨ - (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَنِ الْمُخَابَرَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ، وَعَنِ المُزَابَنَةِ، وَعَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهَا، وَأَنْ لاَ تُبَاعَ إِلاَّ بِالدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ إِلاَّ الْعَرَايَا.

[خ٢٣٨١ (١٤٨٧)/ م١٥٣٦ (٨١، ٨٢)].

زاد في رواية لمسلم: قَالَ عَطَاءٌ: فَسَّرَ لَنَا جَابِرٌ قَالَ: أَمَّا المخَابَرَةُ: فَالأَرْضُ الْبَيْضَاءُ يَدْفَعُهَا الرَّجُلِ إِلى الرَّجُلِ فَيُنْفِقُ فِيهَا، ثُمَّ يَأْخُذُ مِنَ الثَّمَرِ. وَزَعَمَ أَنَّ الْمُزَابَنَةَ: بَيْعُ الرُّطَبِ فِي النَّخْلِ بِالتَّمْرِ كَيْلاً. وَالْمُحَاقَلَةُ فِي الزَّرْعِ عَلَى نَحْوِ ذَلِكَ، يَبِيعُ الزَّرْعَ الْقَائِمَ بِالْحَبِّ كَيْلاً.

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان ژ موخابەرەیێ[2] و موحاقەلەیێ[3] و ژ موزابەنەیێ یا کری[4]، و ژ فرۆتنا فێقی هەتا گەهشتنا وی ئاشکەرا دبیت، و ب زێدەیی د ناڤبەرا ئێکدا نەهێتە فرۆتن ب دینار و دەرهەمان نەبیت، فرۆتنا عەرایا نەبیت.**

**و د ڤەگێرەکا موسلمیدا زێدە کرییە: عەتائی گۆت: جابری بۆ مە راڤە کر و گۆت: هندیکە موخابەرەیە: عەردێ شێڤە زەلام بدەتەڤ زەلامی و مەسرەفی لێ بکەت و پاشی**

---

(١) فرۆتنا عەرایا رەنگەکێ فرۆتنایە و ژ شەنگستێ گشتی دەرئێخستییە و دەستویری پێ دایە ژ بەر هەوجەیییێ، ئەو ژی ئەڤ رەنگەیە: ئێك پشتی روتەب ل سەر دارقەسپێ دیار ببن و بگەهن، و ب قەسپان ل سەر عەردی بفرۆشیتە مرۆڤەکێ هەوجەیی بۆ روتەبان هەی، و هەر دەمێ وی بڤێت دێ روتەبێت خۆ چنیت، و دبێژنە ڤێ عەرایا، چونکی ئەو فێقییێ دارقەسپێ ددەتە هەڤالێ خۆ و دارقەسپ هەر یا وییە، بەلێ دڤێت بهێتە تەخمینکرن ب پیڤانێ یان ب کێشانێ.

(٢) موخابەرە: ئەوە خودانێ عەردی عەردێ خۆ بدەتەڤ ئێکی شین بکەت و تۆڤ ژی ل سەر کارکەری بیت بەرامبەر پشکەکا ئاشکەرا ژ بەرێ زەڤییێ.

(٣) موحاقەلە: ئەڤەیە گەنم د گولیاندا بهێتە فرۆتن ب گەنمێ سافی و بێ گولی.

(٤) مزابەنە: ئەڤەیە مرۆڤ قەسپێت هشك ب روتەبان بفرۆشیت و مێویژان ب تری بفرۆشیت.

**ئەو بەرهەمى وەرگريت، و بۆ موزابەنەيێ گۆت: فرۆتنا روتەبان ب دارێڤە ب قەسپان و ب پيڤان، و موحاقەلە د دەرامەتيدا وەكى وێيە، دەرامەت د گوليێدا ب دەرامەتێ سافى ب پيڤان بهێتە فرۆتن.**

٣٠١٩ - قَالَ ثَابِتِ بْنِ الحَجَّاجِ، عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنِ الْمُخَابَرَةِ. قُلْتُ: وَمَا الْمُخَابَرَةُ؟ قَالَ: أَنْ تَأْخُذَ الْأَرْضَ بِنِصْفٍ، أَوْ ثُلُثٍ، أَوْ رُبْعٍ. [د٣٤٠٧].

* صحيح.

**سابتێ بن حەجاجى (رضي الله عنه) ژ زەيدێ كورێ سابتى گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهى يا ژ موخابەرەيێ كرى، من گۆت: و موخابەرەيە چ تشتە؟ گۆت: تو عەردى ب نيڤا بەرهەمى يان ب سێكا وى يان ب چارێكا وى وەرگرى.**

## ١٨ ـ باب: الترخيص في العرايا

## بابەتێ: دەستويريدان د عەرايايندا[1].

٣٠٢٠ - (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا أَنْ تُبَاعَ بِخَرْصِهَا كَيْلاً. [خ٢١٩٢ (٢١٧٣)/ م١٥٣٩/ ٦٤]

- وفي رواية لهما: أن رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَخَّصَ بَعْدَ ذلِكَ فِي بَيْعِ الْعَرِيَّةِ بِالرُّطَبِ أَوْ بِالتَّمْرِ، وَلَمْ يُرَخِّصْ فِي غَيْرِهِ. [خ٢١٨٤]

**ژ زەيدێ كورێ سابتى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستويرييا ب عەرايا دايى ب هندى خۆ ب پيڤان بهێتە فرۆتن.**

**و د ڤەگێرەكا واندا: پشتى ڤێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستويرى ب فرۆتنا عەرييە دا ب روتەبان يان ب قەسپان و ب ڤێ نەبيت دستويرى ب چو تشتێ دى نەدا.**

---

(١) فرۆتنا عەرايا رەنگەكێ فرۆتنايە و ژ شەنگستێ گشتى دەرئێخستييە و دەستويرى پێ دايە ژ بەر هەوجەيييێ، ئەو ژى ئەڤ رەنگەيە: ئێك پشتى روتەب ل سەر دارقەسپێ ديار ببن و بگەهن، و ب قەسپان ل سەر عەردى بفرۆشيتە مرۆڤەكێ هەوجەيى بۆ روتەبان هەى، و هەر دەمێ وى بڤێت دێ روتەبێت خۆ چنيت، و دبێژنە ڤێ عەرايا، چونكى ئەو ڤێقييێ دارقەسپێ ددەتە هەڤالێ خۆ و دارقەسپ هەر يا وييە، بەلێ دڤێت بهێتە تەخمينكرن ب پيڤانێ يان ب كێشانێ.

٣٠٢١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: رَخَّصَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا مِنَ التَّمْرِ، فِيما دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، أَوْ فِي خَمْسَةِ أَوْسُقٍ. شَكَّ دَاوُدُ فِي ذلِكَ. [خ٢٣٨٢ (٢١٩٠)/ م١٥٤١].

**ژ ئەبى هورەيرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرى (ﷺ) دەستويرى ب فرۆتنا عەرايا[١] دا ب هندى خۆ ژ قەسپان، بەلێ ژ پێنج وسقان[٢] كيمتر يان د پێنج وسقاندا بن، داوود د ڤێدا گۆمان بۆ چێ بوويە.**

## ١٩ ـ باب: تحريم بيع الخمر والميتة والخنزير

## بابەتێ: حەرامكرنا فرۆتنا عەرەقێ و مرارى و بەرازى.

٣٠٢٢ - (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ عامَ الْفَتْحِ، وَهُوَ بِمَكَّةَ: (**إِنَّ اللهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الخَمْرِ وَالمَيْتَةِ وَالخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ**). فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَرَأَيْتَ شُحُومَ المَيْتَةِ، فَإِنَّهَا يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: (**لاَ، هُوَ حَرَامٌ**). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عِنْدَ ذلِكَ: (**قاتَلَ اللهُ الْيَهُودَ! إِنَّ اللهَ لَمَّا حَرَّمَ شُحُومَهَا جَمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ**). [خ٢٢٣٦/ م١٥٨١].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللايى (ﷺ) وى ل سالا ڤەكرنا مەكەهێ و ئەو ل مەكەهێ بوو، گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستى خودێ و پێغەمبەرێ وى فرۆتنا عەرەقێ و مرارى و بەرازى و بوتان حەرام كرييە)، ئێكى گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ تو چ دبێژى بۆ دوهنێ مرارى ب راستى گەميان پێ دهنين و كەڤل پێ دهێنە دوهنكرن، و خەلك دكەنە چرايان بۆ ئاگرى؟ ئينا گۆت: (نەخێر ئەو حەرامە) پاشى پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ڤێ چەندێدا گۆت: (خودێ جوهييان بكوژيت (يان لەعنەتان**

---

(١) عارييە نەڤەيە: ئێك پشتى روتەب ل سەر دارقەسپێ ديار ببن و بگەهن، و ب قەسپان ل سەر عەردى بفرۆشيتە مرۆڤەكێ هەوجەيى بۆ روتەبان هەى، و هەر دەمێ وى بڤێت دێ روتەبێت خۆ چنيت، و دبێژنە ڤێ عەرايا، چونكى ئەو ڤێقيێ دارقەسپێ ددەتە هەڤالێ خۆ و دارقەسپ هەر يا وييە، بەلێ دڤێت بهێتە تەخمينكرن ب پيڤانێ يان ب كێشانێ، ئەڤە ژى هاتە دەستويردان و دەرئێخستن ژ فرۆتنا موزابەنەيێ، مێويژ ب ترى يان روبەب ب قەسپان، ژبەر هەوجەييا خەلكى، چونكى دبيت هندەكان قەسپ هەبن و روتەب نەبن و پارە نەبن روتەبان بكرن و دلێ وان بچيتە روتەبان، ئەڤە ب ڤان مەرجان پێغەمبەرى (ﷺ) بۆ دورست كر.

(٢) هەر وسقەك بارەكە، و هەر وسقەك ب كێشا سەردەم دبيتە (١٣٠,٥) كغم و پێكڤە دبنە (٦٥٣) كغم.

**لێ بکەت) دەمێ خودێ بەزێ گیانەوەران ل سەر وان حەرام کری وان حەلاند و پاشی فرۆت و بهایێ وی خوار.**

٣٠٢٣ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَخْطُبُ بِالْمَدِينَةِ قَالَ: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّ اللهَ تَعَالَى يُعَرِّضُ بِالْخَمْرِ. وَلَعَلَّ اللهَ سَيُنْزِلُ فِيهَا أَمْراً، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهَا شَيْءٌ؛ فَلْيَبِعْهُ، وَلْيَنْتَفِعْ بِهِ)**. قَالَ: فَمَا لَبِثْنَا إِلاَّ يَسِيراً حَتَّى قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ تَعَالَى حَرَّمَ الْخَمْرَ، فَمَنْ أَدْرَكَتْهُ هَذِهِ الآيَةُ وَعِنْدَهُ مِنْهَا شَيْءٌ، فَلاَ يَشْرَب وَلاَ يَبِعْ)**. قَالَ: فَاسْتَقْبَلَ النَّاسُ بِمَا كَانَ عِنْدَهُ مِنْهَا، فِي طَرِيقِ الْمَدِينَةِ، فَسَفَكُوهَا. [م١٥٧٨].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) ل مەدینەیێ خوتبە دخواند، گۆت: (گەلی خەلکی ب راستی خودێ بەحسێ عەرەقێ کر و حەرامی و حەلالیا وێ دیار نەکر[1]، و هیڤییە نێزیك خودێ فەرمانەکێ د راستا وێدا بینیتە خوارێ، هەر ئێکێ تشتەك ژێ ل دەڤ مابیت بلا بفرۆشیت و مفای ژێ ببینیت) گۆت: ئەم چو نەماین کێمەك نەبیت هەتا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ عەرەق حەرام کر، هەر کەسێ دەمێ ئەڤ ئایەتە[2] هاتییە خوارێ یێ ساخ بیت، و تشتەك ژێ مابیتە دەڤ بلا نەڤەخۆت و نەفرۆشیت)، گۆت: خەلکی بەرێ یا ل دەڤ وان مایی دا کۆلانێت مەدینەیێ و رێتن.**

٣٠٢٤ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: كَانَ عِنْدَنَا خَمْرٌ لِيَتِيمٍ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الْمَائِدَةُ، سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنْهُ، وَقُلْتُ: إِنَّهُ لِيَتِيمٍ، فَقَالَ: **(أَهْرِيقُوهُ)**. [ت١٢٦٣].

* صحيح.

---

(١) **بەحسێ ڤێ ئایەتێیە یا د سۆرەتا بەقەرەدا** ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾، **دیسا یا د سۆرەتا نیسائدا:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾.

(٢) **مەبەست یێ ئەڤ ئایەتەیە:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾.

**ژ ئەبی سەعیدی (ﷺ) گۆت: هندە عەرەڤا ئێتیمەکی ل دەڤ مە بوو، ڤێجا دەمێ سۆرەتا مائیدە هاتییە خوار، مە پرسیارا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژێ کر، و من گۆت: ب راستی ئەو یا ئێتیمەکییە گۆت: (برێژن).**

## ٢٠ . باب: النهي عن ثمن الكلب ومهر البغي وحلوان الكاهن

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ بهایێ سەی و کرێیا لەشفرۆشییێ و شرینییا خێڤزانکی.

٣٠٢٥ - (ق) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه: أن رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ. [خ٢٢٣٧/ م١٥٦٧].

**ژ ئەبی مەسعودێ بەدری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەر خودێ (ﷺ) نەهیا ژ بهایێ سەی و کرێیا دەهمەنپیسێ و شرینییا خێڤزانکی کری.**

٣٠٢٦ - (م) عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِراً عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَالسِّنَّوْرِ؟ قَالَ: زَجَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ ذَلِكَ. [م١٥٦٩]

**ژ ئەبی زوبەیر (ﷺ) گۆت: من پرسیارا بهایێ سەی و کتکێ ژ جابری کر؟ گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دانەپاشا ژ هندێ کری.**

## ٢١ . باب: النهي عن بيع الملامسة والمنابذة والحصاة

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ کرین و فرۆتنا (مولامەسە و مونابەزە و حەسات).

٣٠٢٧ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ لِبْسَتَيْنِ وَعَنْ بَيْعَتَيْنِ، نَهى عَنِ الْمُلاَمَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ. وَالْمُلاَمَسَةُ: لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الآخَرِ بِيَدِهِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ، وَلاَ يُقَلِّبُهُ إِلاَّ بِذلِكَ. وَالْمُنَابَذَةُ: أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ ثَوْبَهُ، وَيَكُونَ ذلِكَ بَيْعَهُمَا عَنْ غَيْرِ نَظَرٍ وَلاَ تَرَاضٍ. [خ٥٨٢٠ (٣٦٧)/ م١٥١٢].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ دو جلکان[1] و دو فرۆتنان کری، پاشڤەلێدانا کری ژ فرۆتنا دەستکرنا ب دەستی ب تنێ و**

(١) جلکێ ئێکێ ئەوە: جلکی د خۆ بئالینیت و دۆرماندۆرێت خۆ بگریت و چو جهان نەهێلیت دەستێت وی ژێ دەرکەڤن، نەڤە جوهییان وەدکر. و یێ دووێ ئەوە (خۆ ژ بن بکەت): زەلام دەستێت خۆ یان هەر تشتێ دی بدەتە چۆکێت خۆ و چۆکان بێخیتە زکێ خۆ و پالا خۆ ڤەدەت و جلکەك ب تنێ ل بەر بیت و چو ل سەر شەرمگەها وی نەبیت.

**جلكى باڤێژنە بەرێك. و مولامەسە ئەڤەيە: زەلام دەستێ خۆ بكەتە جلكێ يێ دى ب شەڤ يان ب رۆژ بيت و ب هندێ نەبيت سەر و بن ناكەت، و مونابەزە ئەوە: زەلام جلكێ خۆ باڤێژيتە بەر هەڤالێ خۆ و يێ دى ژى جلكێ خۆ باڤێژيتە بەر، و ئەڤە د ناڤبەرا واندا فرۆتنە بێى بەرێخۆدان و ديتن و بێى رازيبوون.**

٣٠٢٨ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ بَيْعِ الْحَصَاةِ ، وَعَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ.[م١٥١٣].

**ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ فرۆتنا بەرك هاڤێتنێ[1] و ژ فرۆتنا نەزانين تێدا[2] كرى.**

## ٢٢ ـ باب: بيع المزايدة.

## بابەتێ: فرۆتنا سەرزێدەكرن تێدا.

٣٠٢٩ - (خ) وَقَالَ عَطَاءٌ: أَدْرَكْتُ النَّاسَ لاَ يَرَوْنَ بَأْساً بِبَيْعِ الْمَغَانِمِ فِيمَنْ يَزِيدُ. [البيوع، باب ٥٩]. [انظر: ٢٤٣٢] .

**عەتائى (رحمه الله) گۆت: ئەز گەهشتمە خەلكى وان گونەهـ نەدديت دەسكەفتان بفرۆشنە وى يێ زێدەتر پێ ددەت.**

## ٢٣ ـ باب: تحريم بيع حبل الحبلة.

## بابەتێ: فرۆتنا تێژكا تێژكێ.

٣٠٣٠ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الحَبَلَةِ ، وَكَانَ بَيْعاً يَتَبَايَعُهُ أَهْلُ الجَاهِلِيَّةِ، كَانَ الرَّجُلُ يَبْتَاعُ الجَزُورَ إِلَى أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ، ثُمَّ تُنْتَجُ الَّتِي فِي بَطْنِهَا. [خ٢١٤٣/ م١٥١٤].

---

**(١) فرۆتنا بەرك هاڤێتنێ، ئەڤەيە: فرۆشكار بێژيتە بكرى ئەڤە من بەر هاڤێتن هەر تشتێ بەر ڤێ كەفت يان كەفتە سەر ئەو من فرۆتە تە، يان بێژيت: ئەڤ بەرە من هاڤێت كا گەهشتە كيرێ هند ئەرد من فرۆتە تە.**

**(٢) ئانكو: ئەو فرۆتنا دويماهييا وێ بەرزە و نەديار وەكى فرۆتنا ماسى د ئاڤێدا و فرۆتنا ڤێقى بەرى بگەهيت و فرۆتنا شيرى د گوهانيدا و فرۆتنا كاركى و بەرخێ د زكێ ماكێدا و هەر فرۆتنەكا مەترسى تێدا ژ بەر وێ نەزانينا تێدا.**

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ فرۆتنا تێژکا تێژکێ کری، و ئەڤە د نەزانینێدا فرۆتنەك بوو و کار پێ دهاتە کرن، زەلامی حێشترا مێ دکڕی هەتا یا د زکیدا دبیت و پاشی ئەو بهێتە بەری و یا د زکێ وێدا ببیت.**

٢٤ ـ باب: بيوع منهي عنها (تلقّي الركبان، بيع حاضر لباد، النجش، المصراة، بيع الرجل على بيع أخيه..)

**بابەتێ: فرۆتنێت پاشڤەلێدان ژێ کری: چۆنا بەراهییا فرۆشکاران و فرۆتنا باژێری بۆ گوندی، و سەرێك زێدەکرن ب ئنیەتا تێخستنێ و شیر د گهانان هێلان بۆ خاپاندنێ، و کڕینا ل سەر کڕینا برایێ خۆ.**

٣٠٣١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَن رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لاَ تَلَقَّوْا الرُّكْبَانَ، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، وَلاَ تُصَرُّوا الْغَنَمَ، وَمَنِ ابْتَاعَهَا فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْتَلِبَهَا: إِنْ رَضِيَهَا أَمْسَكَهَا، وَإِنْ سَخِطَهَا رَدَّهَا وَصَاعاً مِنْ تَمْرٍ).

[خ٢١٥٠ (٢١٤٠)/ م١٥١٥/(١١)].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نەچنە بەراهییا سویاران[١] و بلا مرۆڤ کڕین و فرۆتنێ ل سەر کڕین و فرۆتنا برایێ خۆ نەکەت، و ل سەر ئێکدو زێدە نەکن ب ئنیەتا تێئێخستنێ و خوسارەتییا هەڤالێ خۆ، و خەلکێ باژێری بۆ خەلکێ دەشتێ نەفرۆشیت[٢] و شیری بۆ خاپاندنێ د گوهانێ کەوالیدا نەهێلن، و ئەگەر ئێکی ئەو گیانەوەر کڕی و پشتی وی دۆتی ئەو یێ د ناڤبەرا یا باشتر ژ ئێك ژ ڤان دووان دبینیت، ئەگەر رازی بوو دێ لا یێ خۆ هێلیت، و ئەگەر نەڤیا دێ زڤرینیت و د گەل منەکا قەسپان).**

(١) بەری بگەهنە بازاری دا هێژ زوی ژێ بکڕن ب بهایەکێ ئەرزان و پاشی ل سەر خەلکی گران بکەن.

(٢) مەخسەد ئەوە نەچیتە بەریکێ و بێژیتێ نەفرۆشە بهێلە دەڤ من ئەز دێ بۆ تە ب بهایەکێ باش فرۆشم، و ب مەرجەکی ئەو متا ئەو بیت یێ کو خەلکێ هەوجەیی پێ و هەکە هەوجەیی بۆ نەبیت چو نینە.

٣٠٣٢ - (م) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ، دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقِ اللهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ**).[م١٥٢٢].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەلکێ باژێری بۆ خەلکێ دەشتێ نەفرۆشیت[1] بێهلن خودێ رزقێ هندەکان ب هندەکان بدەت).**

## ٢٥ . باب: الشروط في البيع وأمر العرف

### بابەتێ: مەرج د کڕین و فرۆتنێدا و فەرمانکرن ب تشتێ دورست.

٣٠٣٣ - (ق) عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ كانَ يَسِيرُ عَلَى جَمَلٍ لَهُ قَدْ أَعْيَا، فَمَرَّ النَّبِيُّ (ﷺ) فَضَرَبَهُ، فَدَعا لَهُ، فَسَارَ بِسَيْرٍ لَيْسَ يَسِيرُ مِثْلَهُ، ثُمَّ قَالَ: (**بِعْنِيهِ بِأُوقِيَّةٍ**) ، قُلْتُ: لاَ، ثُمَّ قَالَ: (**بِعْنِيهِ بِأُوقِيَّةٍ**) ؛ فَبِعْتُهُ، فَاسْتَثْنَيْتُ حُمْلاَنَهُ إِلَى أَهْلِي. فَلَمَّا قَدِمْنَا أَتَيْتُهُ بِالجَمَلِ وَنَقَدَنِي ثَمَنَهُ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ، فَأَرْسَلَ عَلَى إِثْرِي قَالَ: (**ما كُنْتُ لآخُذَ جَمَلَكَ، فَخُذْ جَمَلَكَ ذَلِكَ، فَهُوَ مالُكَ**).

[خ٢٧١٨ (٤٤٣)/ م. المساقاة: ٧١٥ (١٠٩)].

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) ئەو ل حێشترەکا خۆ یا وەستیای یێ سویار بوو دچۆ، پێغەمبەر (ﷺ) د بەرڕا بۆری و تشتەك ل حێشترێ دا و دوعا بۆ کرن، ئینا حێشتر وەسا خۆش چۆ چو وەکی وێ خۆش نەچۆین، پاشی گۆت: (ب ئوقییەکێ بفرۆشە من)، من گۆت: نەخێر، پاشی گۆت: (ب ئوقییەکێ بفرۆشە من)، ئینا من فرۆتێ، بەلێ من کرە مەرج لێ سویاربم هەتا پێ دگەهمە مال، ڤێجا دەمێ ئەم هاتین من حێشتر بۆ ئینا، و پارێ من دەست ب دەست دا من، پاشی ئەز چۆم، ئینا ڤرێکرە دویڤ منرا، گۆت: (من نەدڤیا حێشترا تە ژ تە وەرگرم، حێشترا خۆ واهە ببە، ئەو مالێ تەیە).**

٣٠٣٤ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: جاءَتْ بَرِيرَةُ فَقَالَتْ: إِنِّي كاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، فِي كُلِّ عامٍ أُوقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي، فَقَالَتْ عائِشَةُ: إِنْ أَحَبَّ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً وَأُعْتِقَكِ فَعَلْتُ، وَيَكُونُ وَلاَؤُكِ لِي. فَذَهَبَتْ إِلَى أَهْلِهَا، فَأَبَوْا ذلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ عَرَضْتُ ذلِكَ عَلَيْهِمْ،

---

(١) مەخسەد ئەوە نەچیتە بەریکێ و بێژیتێ نەفرۆشە بهێلە دەڤ من ئەز دێ بۆ تە ب بهایەکێ باش فرۆشم و ب مەرجەکێ ئەو متا ئەو بیت یێ کو خەلکێ هەوجەیی پێ و هەکە هەوجەیی بۆ نەبیت چونینە.

فَأَبَوْا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ الْوَلاَءُ لَهُمْ. فَسَمِعَ بِذلِكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَسَأَلَنِي فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (**خُذِيهَا فَأَعْتِقِيهَا، وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلاَءَ، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ**).

قالَتْ عائِشَةُ: فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي النَّاسِ فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ رِجالٍ مِنْكُمْ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطاً لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللهِ، فَأَيُّمَا شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كانَ مِائَةَ شَرْطٍ، فَقَضَاءُ اللهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللهِ أَوْثَقُ. مَا بَالُ رِجَالٍ مِنْكُمْ يَقُولُ أَحَدُهُمْ: أَعْتِقْ يَا فُلاَنُ وَلِيَ الْوَلاَءُ، إِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ**). [خ٢٥٦٣ (٤٥٦)/ م١٥٠٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: بەریرە هات و گۆت: من ل سەر نەهـ ئوقییا گرێبەستا ئازاكرنێ یا د گەل خودانێت خۆ كری، هەر سالەكێ ئوقییەكێ بدەم، ڤێجا هاریكارییا من بكە، عائیشایێ گۆت: ئەگەر خودانێت تە بڤێت دێ ل سەرێك دەمێ و دێ تە ئازاكەم و پشتەڤانییا تە بۆ منە، ئینا چۆ دەڤ خودانێت خۆ وان ئەو ژێ قەبویل نەكر، گۆت: من ئەڤە گۆتە وان بەلێ وان قەبویل نەكر ژ بلی كو پشتەڤانی بۆ وان بیت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە گوهـ لێ بوو، ئینا پرسیارا من كر من بۆ ڤەگێرا، ئینا گۆت: (ببە و ئازا بكە و پشتەڤانییا وێ بۆ وان بكە مەرج، ب راستی پشتەڤانی بۆ وییە یێ ئازا كری).**

**عائیشایێ گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤ خەلكێدا راوەستا و سوپاسی و پەسنا خودێ كر و پاشی گۆت: (ئەڤە و پاشی، هندە زەلامان ژ هەوە خێرە مەرجان مەرج دگرن نە د كتێبا خودێدا، بزانن هەر مەرجەكێ د كتێبا خودێدا نەبیت ئەو یێ پویچە، خۆ ئەگەر سەد مەرج بن، فەرمانا خودێ پێشتر و هەژیترە و مەرجێ خودێ موكمترە، هندە زەلامان ژ هەوە خێرە ئێك ژ وان دبێژیت: فلانی ئازا بكە و پشتەڤانییا وی بۆ منە، بەلكی ب راستی پشتەڤانی بۆ وییە یێ ئازا دكەت).**

## ٢٦ ـ باب: السَّلم.

## بابەتێ: سەلەمێ[1]

٣٠٣٥ – (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) المدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ بِالتَّمْرِ السَّنَتَيْنِ وَالثَّلَاثَ، فَقَالَ: (**مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَفِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ**).

[خ٢٢٤٠ (٢٢٣٩)/ م١٦٠٤].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینەیێ و وان سەلەم ب قەسپان دکر بۆ دو سال و سێ سالان ئینا گۆت: (یێ سەلەم د تشتەکیدا کر بلا د پیڤانەکا ئاشکرادا بیت و د کێشانەکا ئاشکرادا بیت و بۆ دەمەکێ ئاشکرا بیت).**

٣٠٣٦ – (خ) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي الْمُجالِدِ قَالَ: اخْتَلَفَ عَبْدُ اللهِ بْنُ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ وَأَبُو بُرْدَةَ فِي السَّلَفِ، فَبَعَثُونِي إِلَى ابْنِ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنه فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا نُسْلِفُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: فِي الْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ وَالزَّبِيبِ وَالتَّمْرِ. وَسَأَلْتُ ابْنَ أَبْزَى، فَقَالَ مِثْلَ ذلِكَ.

[خ٢٢٤٢، ٢٢٤٣].

**ژ موحەممەدێ کورێ ئەبی موجالیدی گۆت: عەبدوللایێ کورێ شەددادێ کورێ هادی و ئەبو بوردە د سەلەمێدا جودا چۆن، ئینا ئەز هنارتمە دەڤ کورێ ئەبی ئەوفایی (ﷺ) من پرسیار ژێ کر، ئینا گۆت: مە سەلەم ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبی بەکری و عومەری د دەخلی و جەهی و مێویژ و قەسپاندا دکر و من پرسیارا ئیبن ئەبزەیی کر هەر ئەو گۆت.**

٣٠٣٧ – عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ السلف فِي الحَيَوان. [ك٢٣٤١].

* قال الذهبي: صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ سەلەمێ د گیانەوەراندا کری.**

٣٠٣٨ – عَنْ ابْنِ عُمَر رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِي (ﷺ): أَنَّهُ نَهَى عَنْ بَيْعِ الكالئ بالكالئ. [ك٢٣٤٢]

---

(١) سەلەم ئەوە: تشتێ سالۆخەتکری د بن گەردەنا ئێکیدا بهێتە فرۆتن و پارە بێتە وەرگرتن هێژ کەلوپەلێ سالۆخەتکری نەهاتییە وەرگرتن، و ئەڤە ژ شەنگستێ گشتی دەرێخستییە دا ل سەر مە گران نەبیت.

* قال الذهبي: على شرط مسلم.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پاشفەلێدانا ژ فرۆتنا دەینی ب دەینی کری.**

٣٠٣٩ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ خُلَيْدَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنِ السَّلَفِ، قُلْتُ: إِنَّا نُسْلِفُ فَنَقُولُ: إِنْ أُعْطِينَا بُرّاً فَبِكَذا، وَإِنْ أُعْطِينَا تَمْراً فَبِكَذا.

قَالَ: أَسْلِمْ فِي كُلِّ صِنْفٍ وَرِقاً مَعْلُومَةً، فَإِنْ أَعْطَاكَهُ، وَإِلاَّ فَخُذْ رَأْسَ مَالِكَ، وَلا تَرُدَّه فِي سِلْعَةٍ أُخْرَى. [هق٦/٣٠].

**ژ موحەممەدێ کوڕێ زەیدی کوڕێ خولەیدەیی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گۆت: من پرسیارا سەلەمێ ژ ئیبن عومەری کر: من گۆت: ئەم سەلەمێ دکەین و ئەم دبێژین: ئەگەر گەنم دا مە ب هندێیە و ئەگەر قەسپ دانە مە ب هندێیە.**

**گۆت: د هەمی جوناندا سەلەمێ ب پارەیەکێ ئاشکەرا بکە، و ئەگەر ئەو دا تە باشە و ئەگەر نە سەرێ مالێ خۆ وەربگرە، و نەکە د تشتەکێ دیدا.**

## ٢٧ . باب: الشفعة

## بابەتێ: مجێورییێ.

٣٠٤٠ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قالَ: قَضى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ مَالٍ لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الحُدُودُ، وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ، فَلاَ شُفْعَةَ. [خ٢٢١٤ (٢٢١٣)/ م١٦٠٨].

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ب مجێورییێ کر د هەر مالەکێ نەهاتییە لێکفەکرن، ئەگەر تخویب هاتنە دانان و رێك هاتنە جوداکرن و برن، مجێوری نینە.**

٣٠٤١ - عَنْ سَمُرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (جَارُ الدَّارِ أَحَقُّ بِدَارِ الْجَارِ، أَوْ الْأَرْضِ).

[د٣٥١٧/ ت١٣٦٨].

ولم يذكر الترمذي الأَرْضِ.

* صحيح.

**ژ سەمورەیی (خودێ ژێ رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (جیرانێ خانی ب خانی یان ب عەردی هەژیترە).**

و ترمزی بەحسێ عەردی نەكرییە.

٣٠٤٢ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِهِ، يُنْتَظَرُ بِهَا، وَإِنْ كَانَ غَائِباً، إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِداً). [د٣٥١٨/ ت١٣٦٩/ جه٢٤٩٤/ مي٢٦٦٩]

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (جیران ب مجێورییا جیرانێ خۆ هەژیترە، دێ چاڤەرێكرنا وی هێتە كرن ئەگەر نەیێ ئامادە بیت، و ئەگەر رێكا وان ئێك بیت).**

## ٢٨ ـ باب: الرهن

## بابەتێ: گەرەوێ.

٣٠٤٣ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اشْتَرَى طَعَاماً مِنْ يَهُودِيٍّ إِلَى أَجَلٍ، وَرَهَنَهُ دِرْعاً مِنْ حَدِيدٍ. [خ٢٠٦٨/ م١٦٠٣].

وفي رواية للبخاري: قالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ، بِثَلَاثِينَ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ. [خ٢٩١٦].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) خوارنەك هەتا دەمەكی ژ جوهییەكی كڕی و مەتالەك ژ ئاسنی ل دەڤ وی كرە گەرەو.**

**و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مر و مەتالێ وی ل دەڤ جوهی ب سێ منێت جەهی گەرەوكری بوو.**

٣٠٤٤ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الظَّهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُوناً، وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ بِنَفَقَتِهِ إِذَا كَانَ مَرْهُوناً، وَعَلَى الَّذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ النَّفَقَةُ).

[خ٢٥١٢ (٢٥١١)].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ل پشتا دەواری سویار دبن بەرامبەر مەزاختنا ل سەر دهێتە كرن، ئەگەر یێ گەرەوكری بیت، و شیرێ د گهانا دهێتە ڤەخوارن بەرامبەر مەزاختنا ل سەر دهێتە كرن، ئەگەر یێ گەرەوكری بیت، و مەزاختن ل سەر وییە یێ سویار دبیت و ڤەدخۆت).**

## ٢٩ . باب: الشركة

## بابەتێ: هەڤپشكییێ.

٣٠٤٥ – عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ: خَرَجَ عَبْدُ اللهِ وَعُبَيْدُ اللهِ ابْنَا عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فِي جَيْشٍ إِلَى الْعِرَاقِ، فَلَمَّا قَفَلاَ، مَرَّا عَلَى أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ـ وَهُوَ أَمِيرُ الْبَصْرَةِ ـ فَرَحَّبَ بِهِمَا وَسَهَّلَ، ثُمَّ قَالَ: لَوْ أَقْدِرُ لَكُمَا عَلَى أَمْرٍ أَنْفَعُكُمَا بِهِ لَفَعَلْتُ، ثُمَّ قَالَ: بَلَى، هَاهُنَا مَالٌ مِنْ مَالِ اللهِ، أُرِيدُ أَنْ أَبْعَثَ بِهِ إِلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، فَأُسْلِفُكُمَاهُ، فَتَبْتَاعَانِ بِهِ مَتَاعاً مِنْ مَتَاعِ الْعِرَاقِ، ثُمَّ تَبِيعَانِهِ بِالْمَدِينَةِ، فَتُؤَدِّيَانِ رَأْسَ الْمَالِ إِلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيَكُونُ الرِّبْحُ لَكُمَا، فَقَالاَ: وَدِدْنَا ذَلِكَ.

فَفَعَلَ، وَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ أَنْ يَأْخُذَ مِنْهُمَا الْمَالَ، فَلَمَّا قَدِمَا، بَاعَا، فَأُرْبِحَا، فَلَمَّا دَفَعَا ذَلِكَ إِلَى عُمَرَ، قَالَ: أَكُلُّ الْجَيْشِ أَسْلَفَهُ مِثْلَ مَا أَسْلَفَكُمَا؟ قَالاَ: لاَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: ابْنَا أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ فَأَسْلَفَكُمَا، أَدِّيَا الْمَالَ وَرِبْحَهُ. فَأَمَّا عَبْدُ اللهِ فَسَكَتَ، وَأَمَّا عُبَيْدُ اللهِ فَقَالَ: مَا يَنْبَغِي لَكَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ هَذَا، لَوْ نَقَصَ هَذَا الْمَالُ، أَوْ هَلَكَ لَضَمِنَّاهُ! فَقَالَ عُمَرُ: أَدِّيَاهُ. فَسَكَتَ عَبْدُ اللهِ، وَرَاجَعَهُ عُبَيْدُ اللهِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ جُلَسَاءِ عُمَرَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ جَعَلْتَهُ قِرَاضاً، فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ جَعَلْتُهُ قِرَاضاً، فَأَخَذَ عُمَرُ رَأْسَ الْمَالِ وَنِصْفَ رِبْحِهِ، وَأَخَذَ عَبْدُ اللهِ وَعُبَيْدُ اللهِ ابْنَا عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ نِصْفَ رِبْحِ الْمَالِ. [ط١٣٩٦].

* إسناده صحيح.

**ژ زەیدێ كورێ ئەسلەمی (رحمه الله) ژ بابێ خۆ، گۆت: عەبدوللاه و عوبەیدوللاه د گەل لەشكەری بۆ عیراقێ دەركەفتن، ڤێجا دەمێ ڤەگەریاین د دەڤ ئەبی مووسایێ ئەشعەریڕا هاتن، و ئەو میرێ بەسرە بوو، خێرهاتن و خۆشهاتن ب وان كر، و پاشی گۆتە وان: ئەگەر ئەز شیابام ب تشتەكی مفایی بگەهینمە هەوە، دا كەم، پاشی گۆت: هندە مالێ خودێ یێ ل ڤێرێ من دڤێت بۆ میرێ باوەریداران بهنێرم، ئەز دێ ب ڤەر دەمە هەوە، هوین تشتێ عیراقێ پێ بكڕن و پاشی وان ل مەدینەیێ بفرۆشن، و سەرێ مالی بدەنەڤ میرێ باوەریداران و فایدە بۆ هەوە هەردووان، ئینا گۆتن: مە ئەو پێخۆشە.**

**ئەو كر، و بۆ عومەرێ كورێ خەتتابی نڤیسی ئەو وی مالی ژ وان وەرگریت، ڤێجا دەمێ زڤرین، فرۆتن و فایدە كرن، ڤێجا دەمێ ئەو پارە داینەڤ عومەری، گۆت: ئەرێ هەمی لەشكەری ئەو ڤەر داییێ؟ گۆتن: نەخێر، ئینا عومەرێ كورێ خەتتابی گۆت:**

چونکی هوین کورێت میرێ باوەریدارانە ئەو ڤەر دا هەوە، وی پارەی و فایدێ وی هەردووان بینن، هندیکە عەبدوللاه بوو بێدەنگ بوو، و هندیکە عوبەیدوللاه بوو گۆت: ئەڤە بۆ تە نابیت ئەی میرێ باوەریداران، ئەگەر ئەڤ پارە کێم ببا یان نەمابا دا د ستۆیێ مەدا بیت، هەر عومەری گۆت: بینن، دیسا عەبدوللاه بێدەنگ بوو و عوبەیدوللاه لێ ڤەگێڕا، ئینا زەلامەکی ژ خەلکێ دیوانا وی گۆت: ئەگەر تە کربا موزارەبە[1] ئەی مێرێ باوەریداران، ئینا عومەری گۆت: ئەڤە کرە موزارەبە، ئینا عومەری سەرێ مالی و نیڤا فایدەی وەرگرت، و عەبدوللایی و عوبەیدوللایی نیڤا فایدێ مالی وەرگرت.

٣٠ . باب: النهي عن بيع العينة.

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ فرۆتنا عینەیێ[2].**

٣٠٤٦ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ، وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمُ الجِهَادَ، سَلَّطَ اللهُ عَلَيْكُمْ ذُلاًّ لاَ يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ). [د٣٤٦٢].

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەگەر هەوە کڕین و فرۆتن ب عینەیێ کر، و هەوە کورییێت چێلا گرتن[3]، و هوین ب چاندنێ رازی بوون[4]، و هەوە جیهاد هێلا، خودێ دێ شکاندن و رەزیلییێ ل سەر هەوە زال کەت، و ب سەر هەوەدا نابەت هەتا هوین دزڤرنە دینێ خۆ).**

٣٠٤٧ - عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَبَّاسٍ وَرَجُلٌ يَسْأَلُهُ عَنْ رَجُلٍ سَلَّفَ فِي سَبَائِبَ ، فَأَرَادَ بَيْعَهَا قَبْلَ أَنْ يَقْبِضَهَا، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تِلْكَ الْوَرِقُ بِالْوَرِقِ، وَكَرِهَ ذَلِكَ.[ط١٣٦٥].

* إسناده صحيح.

---

(١) موزارەبە ئەوە: ئێك پارا بدەتەڤ ئێکی بازرگانییێ و شۆلی پێ بکەت و فایدە د ناڤبەرا واندا هەڤپشك بیت.

(٢) کرین و فرۆتنا عەینە ئەڤەیە: تو تشتەکی ب بهایەکێ پاشتیحستی بفرۆشی و بکەیە ڤەر ل سەر وی، و پاشی هەر وی تشتی ب بهایەکێ کێمتر ژ وی بکڕی پێ تە فرۆتییێ.

(٣) ئانکو: هوین مانە ب کێلان و جۆتیارییێڤە.

(٤) ئانکو: چاندن بوو خەما هەوە یا ئێکێ.

**ژ قاسمێ کوڕێ موحەممەدی (ﷺ) وی گۆت: من گوه ل عەبدوللایێ کوڕێ عەباسی بوو و زەلامەکی پرسیارا زەلامەکی ژێ کر، سەلەما د هندە جلك (یان پەڕۆکێت) تەنکدا کڕی[1]، و دڤێت بفرۆشیت بەری ئەو وەرگریت، ئینا ئیبن عەباسی گۆت: ئەو فرۆتنا زیڤی ب زیڤییە و ئەو دورست نەدانا.**

**٣١ ـ باب: النهي عن بيعتين في بيعة**

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ دو فرۆتنان د فرۆتنەکێدا[2].**

٣٠٤٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (مَنْ بَاعَ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ فَلَهُ أَوْكَسُهُمَا، أَوْ الرِّبَا). [د٣٤٦١/ ت١٢٣١/ ن٤٦٤٦]

* حسن.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ دو فرۆتنان د ئێك فرۆتندا بکەت کێمترین بها بۆ وییە[3] یان سەلەف و ریبا).**

٣٠٤٩ - عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَجُلٍ: ابْتَعْ لِي هَذَا الْبَعِيرَ بِنَقْدٍ حَتَّى أَبْتَاعَهُ مِنْكَ إِلَى أَجَلٍ، فَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، فَكَرِهَهُ، وَنَهَى عَنْهُ. [ط١٣٦٨].

**ژ مالکی (ﷺ) گەهشتییە وی: زەلامەکی گۆتە زەلامەکی: ئەڤێ حێشترێ ب پارێ ئامادە ژ من بکڕە دا ئەز ب قەر ژ تە بکڕمەڤە، پرسیارا ڤێ ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری هاتە کرن نەڤیا و پاشڤەلێدان لێ کر.**

٣٠٥٠ - عَنْ مَالِكٍ أَنَّهُ بَلَغَهُ: أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ اشْتَرَى سِلْعَةً بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ نَقْداً، أَوْ بِخَمْسَةَ عَشَرَ دِينَاراً إِلَى أَجَلٍ، فَكَرِهَ ذَلِكَ، وَنَهَى عَنْهُ. [ط١٣٦٩].

[وانظر: ٣٠٥٢].

---

(١) سەلەم ئەوە: تشتێ سالۆخەتکری د بن گەردەنا ئێکیدا بهێتە فرۆتن و پارە بێتە وەرگرتن هێژ کەلوپەلێ سالۆخەتکری نەهاتییە وەرگرتن.

(٢) دو فرۆتن د فرۆتنەکێدا ئەڤەیە: تشتی ب بهایەکێ پاشئێخستی بفرۆشی پاشی هەر وی تشتی ب بهایەکێ ئامادە و کێمتر ژ یێ پاشئێخستی بکڕییەڤە.

(٣) ئانکو: دڤێت بهایێ کێمتر وەرگریت، و ئەگەر یێ زێدەتر وەرگرت ئەو کەفتە د ریبایێدا.

ژ مالكی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت) گەهشتییە وی: پرسیارا زەلامەكی ژ قاسمێ كوڕێ موحەممەدی هاتە كرن وی متایەك ب دەه دینارێت رادەستكری بكڕیت یان ب پازدە دیناران بۆ دەمەكی، ئەو نەڤیا و پاشڤەلێدان لێ كر.

## ٣٢ . باب: لا يبيع ما ليس عنده

## بابەتێ: فرۆتنا تشتێ تە نەی نابیت.

٣٠٥١ - عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! يَأْتِينِي الرَّجُلُ فَيُرِيدُ مِنِّي الْبَيْعَ لَيْسَ عِنْدِي، أَفَأَبْتَاعُهُ لَهُ مِنَ السُّوقِ؟ فَقَالَ: (**لاَ تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ**). [د٣٥٠٣/ ت١٢٣٢/ ن٤٦٢٧/ جه٢١٨٧].

* صحيح.

**ژ حەكیمێ كوڕێ حیزامی (ڕەزایا خودێ لێ بیت) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ زەلام دهێتە دەڤ من، دڤێت تشتی بفرۆشمێ و من نینە، ئەرێ ئەز بفرۆشمێ و ل بازاری بۆ بكرم؟ ئینا گۆت: (تشتێ تە نەبیت نەفرۆشە).**

٣٠٥٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يَحِلُّ سَلَفٌ وَبَيْعٌ، وَلاَ شَرْطَانِ فِي بَيْعٍ، وَلاَ رِبْحُ مَا لَمْ تَضْمَنْ، وَلاَ بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ**).[د٣٥٠٤/ ت١٢٣٤/ ن٤٦٢٥/ جه٢١٨٨/ مي٢٦٠٢].

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قەرەك و فرۆتنەك پێكڤە دورست نینە[1]، دو مەرج د فرۆتنەكێدا دورست نینە[2]، و فایدە نەدورستە ئەگەر رادەستكرنێ ب ستۆیێ خۆڤە نەگری، و فرۆتنا تشتێ تە نەی نەدورستە).**

(١) وەكی تو قەرەكی ب (١٠٠) دیناران بۆ سالەكێ بدەیە ئێكی پاشی تشتەكێ ب (٥٠) دیناران ب (١٠٠) دیناران بدەیێ، دەستپێكێ تە دەین گیرۆكری دایێ، پاشی تە تشتەكێ نامادە ب گرانی دایێ.

(٢) وەكی ڤی تشتی بفرۆشییە من ب (١٥) دیناران ب بهایەكێ پاشنێخستی و ڤێ گاڤێ ژ من بكڕییڤە ب (١٠) دینارێت نامادە، كو دبیتە فرۆتنا عەینە.

## ٣٣ ـ باب: بيع العربون.

## بابەتێ: فرۆتنا ب دەستبەعی.

٣٠٥٣ – عَنْ عبد الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ.[د٣٥٠٢/ جه٢١٩٢].

* ضعيف.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدا ژ فرۆتنا ب دەستبەعی کری[١].**

## ٣٤ ـ باب: بيع العنب للعصير

## بابەتێ: فرۆتنا تری بۆ عەرەقێ.

٣٠٥٤ – عَنْ عَبْدِ الْوَاحِدِ الْبُنَانِيِّ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنِّي أَشْتَرِي هَذِهِ الْحِيطَانَ تَكُونُ فِيهَا الْأَعْنَابُ، فَلاَ نَسْتَطِيعُ أَنْ نَبِيعَهَا كُلَّهَا عِنَباً حَتَّى نَعْصِرَهُ، قَالَ: فَعَنْ ثَمَنِ الْخَمْرِ تَسْأَلُنِي؟ سَأُحَدِّثُكَ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): كُنَّا جُلُوساً مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِذْ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، ثُمَّ أَكَبَّ وَنَكَتَ فِي الْأَرْضِ، وَقَالَ: (**الْوَيْلُ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ**) ! فَقَالَ عُمَرُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، لَقَدْ أَفْزَعَنَا قَوْلُكَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقَالَ: (**لَيْسَ عَلَيْكُمْ مِنْ ذَلِكَ بَأْسٌ، إِنَّهُمْ لَمَّا حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ فَتَوَاطَؤُوهُ، فَيَبِيعُونَهُ، فَيَأْكُلُونَ ثَمَنَهُ، وَكَذَلِكَ ثَمَنُ الْخَمْرِ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ**). [حم٥٩٨٢].

* إسناده حسن.

**ژ عەبدلواحدێ بونانی (رحمه الله) گۆت: ئەز د گەل ئیبن عومەری بووم، زەلامەك هاتە دەڤ و گۆت: ئەی بابێ عەبدلرەحمانی، ئەز ڤان بیستانان دکڕم و مێو یێت د ناڤدا، و ئەم نەشێین هەمییێ ب تری بفرۆشین هەتا عەرەقێ ژێ دورست نەکەین، گۆت: تو پرسیارا بهایێ عەرەقێ ژ من دکەی؟ ئەز دێ فەرموودەیەکێ بۆ تە بێژم من یا ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهـ لێ بووی، ئەم ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) د روینشتی بووین مە هند دیت بەرێ خۆ دا عەسمانی، پاشی بەرێ خۆ وەرگێرا دا عەردی و دەستێ خۆ ل ئاخێ دا ئینا و بر و گۆت: (ئێزا و نەخۆشی بۆ ئیسرائیلییان بیت) ئینا عومەری گۆت: ئەی**

---

**(١) دەستبەعی ئەوە تو تشتەکی بکڕی و هندەك ژ بهایی بدەی و هەمییێ نە، دا کڕینێ پشتراست بکەی و فرۆشکار بهێلیت و نەفرۆشیت، هەتا تو بهایی هەمییێ بۆ دئینی، ئەگەر تە ئینا نەڤە ئەو تشتێ تە کڕی یێ تەیە، و ئەگەر تە نەئینا ئەو پارێ تە دەستبەعی دایی ئەو بۆ فرۆشکاری ما.**

پێغەمبەرێ خودێ ئەڤ ئاخفتنا تە گۆتييە ئيسرائيليان ئەم ترساندين، ئينا گۆت: (چو نەخۆشى ژ وێ ل سەر هەوە نينە، ب راستى ئەوان دەمێ بەز ل سەر وان هاتييە حەرامكرن، ئەو رێككەفتن بفرۆشن و بهايێ وێ بخۆن، و هەر هۆسا بهايێ عەرەقێ ل سەر هەوە حەرامە).

٣٥ ـ باب: بيان العيب

**بابەتێ: دياركرنا كێماسييێ.**

٣٠٥٥ – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، ولاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ بَاعَ مِنْ أَخِيهِ بَيْعاً فِيهِ عَيْبٌ، إلاَّ بَيَّنَهُ لَهُ). [جه٢٢٤٦].

* صحيح.

ژ عوقبەيێ كورێ عامرى (ﷺ)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (موسلمان برايێ موسلمانييە، و بۆ چو موسلمانان دورست نينە ئەو تشتەكێ ب كێماسى بفرۆشيتە برايێ خۆ، ئەو نەبيت بۆ ئاشكەرا بكەت).

٣٦ ـ باب: البيع عن تراض

**بابەتێ: فرۆتن ب ژێك رازيبوون.**

٣٠٥٦ – عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّمَا الْبَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ). [جه٢١٨٥].

* صحيح.

ژ ئەبى سەعيدێ خودرى (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستى فرۆتن ب هەڤرازيبوونێيە)[1].

٣٧ ـ باب: الإقالة

**بابەتێ: لێڤەبوون قەبويلكرنێ.**

٣٠٥٧ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ أَقَالَ مُسْلِماً أَقَالَهُ اللهُ عَثْرَتَهُ)[د٣٤٦٠/ جه٢١٩٩].

* صحيح.

■ زاد ابن ماجه: (يَوْمَ الْقِيَامَةِ).

---

(١) ئانكو: بكڕ و فرۆشكار هەردو د رازى بن.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(یێ فرۆتنا موسلمانکی بۆ بزڤرینیت خودێ دێ ل هەلنگفتنا وی بۆریت)**[1].

- ئیبن ماجە زێدە کرییە: (رۆژا قیامەتێ).

٣٨ ـ باب: اللغو والكذب في التجارة

**بابەتێ: ئاخفتنا پویچ و درەو د بازرگانییێدا.**

٣٠٥٨ - عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ قَالَ: كُنَّا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ، فَمَرَّ بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ، فَقَالَ: **(يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ! إِنَّ الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ اللَّغْوُ وَالْحَلْفُ، فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ)**.

- وفي رواية: **(يَحْضُرُهُ الْكَذِبُ وَالْحَلْفُ)**.وفي أخرى:**(اللَّغْوُ وَالْكَذِبُ)**. [د٣٣٢٦/ ت١٢٠٨/ ن٣٨٠٦/ جه٢١٤٥]

* صحيح.

ژ قەیسێ کورێ ئەبی غەرزەیی (ﷺ) گۆت: ئەم ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) دگۆتنە مە دەلال، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر مەڕا بۆری و ب ناڤەکێ باشتر ژ وی ئەم ناڤکرین، ئینا گۆت: **(گەلی بازرگانان ب راستی ئاخفتنا پویچ و سویند دکەڤنە د گەل فرۆتنێ، ڤێجا ژ بەر هندێ ب سەدەقەیێ تێکەل بکەن)**.

- و د ڤەگێرەکێدا: **(درەو و سویند دکەڤنە د گەل)** و د ئێکا دیدا **(ئاخفتنا پویچ و درەو)**.

٣٠٥٩ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ التُّجَّارَ هُمُ الْفُجَّارُ)** قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَوَلَيْسَ قَدْ أَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ؟ قَالَ: **(بَلَى، وَلَكِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ فَيَكْذِبُونَ، وَيَحْلِفُونَ وَيَأْثَمُونَ)**. [حم١٥٥٣٠].

* حديث صحيح، وإسناده قوي.

ژ عەبدولرەحمانێ کورێ شیبلی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی بازرگان رەوشت خرابن)** گۆت: هاتە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ ما خودێ کرین و فرۆتن حەلال نەکرییە؟! گۆت: **(بەلێ، بەلێ ئەو دئاخڤن و درەوان دکەن و سویندا دخۆن و گونەهکار دبن)**.

---

(١) ئانکو: خودێ دێ کەتنا وی و ژ گونەها وی بۆریت و گونەهێت وی ژێ بەت.

## ٣٩ ـ باب: الاقتصاد في طلب المعيشة

### بابەتێ: نافنجیخوازی د داخوازییا ژیارێدا.

٣٠٦٠ – عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَجْمِلُوا فِي طَلَبِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ كُلاًّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ**). [جه٢١٤٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی حومەیدێ ساعدی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نافنجیخوازبن د دنیا خوازیێدا، ب راستی هەر ئێك ژ هەوە یێ فەرسەت دایە بۆ وی تشتێ بۆ هاتییە چێكرن).**

## ٤٠ ـ باب: الوزن

### بابەتێ: كێشانێ.

٣٠٦١ – عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَفَةُ الْعَبْدِيُّ بَزّاً مِنْ هَجَرَ، فَأَتَيْنَا بِهِ مَكَّةَ، فَجَاءَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَمْشِي، فَسَاوَمَنَا بِسَرَاوِيلَ، فَبِعْنَاهُ، وَثَمَّ رَجُلٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**زِنْ وَأَرْجِحْ**). [د٣٣٣٦/ ت١٣٠٥/ ن٤٦٠٦/ جه٢٢٢٠]

* صحيح.

**ژ سوویدێ كوڕێ قەیسی (ﷺ) گۆت: من و مەخرەفەیێ عەبدی جلك ژ هەجەر ئینانە مەكەهێ، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب پێیان دهات و هاتە دەڤ مە، بازارێ شەلوالان د گەل مە كر، و مە فرۆتنێ، و زەلامەك ل وێرێ بوو ب كرێ كێشان دكر[1]، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (بكێشە و زێدەتر بدەیێ).**

٣٠٦٢ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا وَزَنْتُمْ فَأَرْجِحُوا**). [جه٢٢٢٢].

* صحيح.

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هەوە كێشان كر داگێرن).**

---

(١) ئانكو: پارە ب ترازییێ دكێشان، و هەروەكی وان پارە هۆسا ددان نە ب هەژمار.

## ٤١ ـ باب: في التسعير

## بابەتێ: دانانا بهای

٣٠٦٣ – ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! سَعِّرْ، فَقَالَ: (**بَلْ أَدْعُو**) ، ثُمَّ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! سَعِّرْ، فَقَالَ: (**بَلْ اللهُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللهَ، وَلَيْسَ لِأَحَدٍ عِنْدِي مَظْلَمَةٌ**). [د٣٤٥٠].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: زەلامەك هات گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بهای دانە، ئینا گۆت: (بەلکی دێ دوعا کەم) پاشی هاتەڤە دەڤ و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بهای دانە، ئینا گۆت: (بەلکی خودێ رزقی بەرتەنگ دکەت و بەرفرەهـ دکەت، و ب راستی ئەز هیڤی دکەم بگەهمە خودێ و مافێ کەسەکێ ل دەڤ من نەبیت).**

٣٠٦٤ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّاسُ: يَا رَسُولَ اللهِ! غَلاَ السِّعْرُ، فَسَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ اللهَ هُوَ الْمُسَعِّرُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى اللهَ، وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يُطَالِبُنِي بِمَظْلَمَةٍ فِي دَمٍ وَلاَ مَالٍ**). [د٣٤٥١/ ت١٣١٤/ جه٢٢٠٠].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: خەلکی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بها بلند بوون، ڤێجا بۆ مە بهای دانە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ بهادانەرە و رزقی بەرتەنگ دکەت و بەرفرەهـ دکەت، و ب راستی ئەز هیڤی دکەم بگەهمە خودێ و کەس داخوازا مافخوارنەکێ ژ من نەکەت نە د خوینێدا و نە د مالیدا).**

## ٤٢ . باب: بيع الصكوك

## بابەتێ: فرۆتنا چەكان (سەكان).

٣٠٦٥ – عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ: أَنَّ عَبْدَ الله بْنَ الزُّبَيْرِ كَانَ يَأْخُذُ مِنْ قَوْمٍ بِمَكَّةَ دَرَاهِمَ، ثُمَّ يَكْتُبُ بِهَا إِلَى مُصْعَبِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِالعِرَاقِ فَيَأْخُذُونَهَا مِنْهُ، فَسُئِلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ ذَلِكَ فَلَمْ يَرَ بِهِ بَأْساً، فَقِيلَ لَهُ: إِنْ أَخَذُوا أَفْضَلَ مِنْ دَرَاهِمِهِمْ قَالَ: لاَ بَأْسَ إِذَا أَخَذُوا بِوَزْنِ دَرَاهِمِهِمْ. [هق٥/٣٥٢].

[وانظر ما جاء في الأسواق: ١٠٧٨] .

**ژ عەتائێ كوڕێ رەباحی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ زوبەیری ل مەكەهێ دەرهەم ژ خەلكی وەردگرت پاشی بۆ موسعەبێ كوڕێ عومەیری ل عیراقێ دنڤیسی دەرهەمێت خۆ ژ وی وەردگرتن، پرسیارا ڤێ ژ ئیبن عەباسی هاتە كرن؟ چ گونەهـ تێدا نەدیت، گۆتنە وی: پا ئەگەر ژ دەرهەمێت خۆ باشتر وەرگرتن؟ گۆت: چو تێدا نینە ئەگەر ئەو كێشا دەرهەمێت خۆ وەربگرن.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

**١ ـ باب: حفظ الأموال وعدم إتلافها**

**بابەتێ: پاراستنا مالی و نەپویچكرنا وی.**

٣٠٦٦ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ أَدَاءَهَا أَدَّى اللهُ عَنْهُ، وَمَنْ أَخَذَ يُرِيدُ إِتْلاَفَهَا أَتْلَفَهُ اللهُ)**. [خ٢٣٨٧].

[وانظر عدم إضاعة المال: ٢٦٢٠، ٣٣٣٣.

وانظر في أداء الدين: ٣٠٩٢، ٣٠٩٣] .

**ژ ئەبی هورەیره (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ مالێ خەلكەكی (ب هەر رێكەكا هەبیت) وەرگریت و ژ دل دڤێت بۆ بزڤرینیت خودێ دێ بۆ ساناهی كەت بدەت، و هەر كەسێ مالێ خەلكی وەرگریت و ژ دل دڤێت پویچ بكەت، خودێ دێ وی مالی بەرئاتاف كەت و بەرەكەتێ تێدا ناهێلیت).**

**٢ ـ باب: رصد المال لأداء الدين**

**بابەتێ: هەلگرتن و دانانا مالی بۆ دانا قەری.**

٣٠٦٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لَوْ كانَ لِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَباً، ما يَسُرُّنِي أَنْ لاَ يَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاَثٌ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ، إِلاَّ شَيْءٌ أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ)**.[خ٢٣٨٩/م٩٩١].

**ژ ئەبی هورەیره (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر من هندی چیایێ ئوحودێ زێر هەبن كەیفا من نائێنیت و سێ رۆژ د سەر منرا ببۆرن و دینارەك ژێ من مابیت، تشتەك نەبیت ئەز بۆ دەینەكی دانم و بهێلم).**

**٣ ـ باب: فضل إنظار المعسر**

**بابەتێ: خێرا خۆلێگرتنا دەستتەنگی.**

٣٠٦٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(كَانَ تَاجِرٌ يُدَايِنُ النَّاسَ، فَإِذَا رَأَى مُعْسِراً قَالَ لِفِتْيَانِهِ: تَجَاوَزُوا عَنْهُ، لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَتَجَاوَزَ عَنَّا، فَتَجَاوَزَ اللهُ عَنْهُ)**.[خ٢٠٧٨/ م١٥٦٢].

**و ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (زەلا مەکی دەهین د گەل خەلکی دکرن، و دگۆتە خزمەتکارێ خۆ: هەکە تو هاتییە دەڤ دەستکورتەکی لێ ببۆرە، بەلکی خودێ ژی ل مە ببۆریت، گەهشتە خودێ و خودێ لێ بۆری).**

٣٠٦٩ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ طَلَبَ غَرِيماً لَهُ فَتَوَارَى عَنْهُ، ثُم وَجَدَهُ، فَقَالَ: إِنِّي مُعْسِرٌ. فَقَالَ: آللهِ؟ قَالَ: أَللهِ. قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: **(مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ، أَوْ يَضَعْ عَنْهُ).** [م١٥٦٣].

**ژ عەبدوللایێ کورێ ئەبی قەتادەیی (رضي الله عنه)، گۆت: ئەبا قەتادەیی دەینداره‌کێ خۆ گازی کر خۆ لێ بەرزە کر، پاشی دیت، ئینا گۆت: ب راستی ئەز یێ دەستکورتم، ئینا گۆتێ تو و خودێ؟ گۆت: ئەز ب خودێ کەمە، ئینا گۆت: ب راستی من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (صلى الله عليه وسلم) دگۆت: (هەر کەسێ پێخۆش بیت خودێ وی ژ تەنگافییێت قیامەتێ رزگار کەت بلا ل سەر دەستکورتەکی ساناهی بکەت یان پێ بهێلیت).**

٣٠٧٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): **(مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ لَهُ، أَظَلَّهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ).** [ت١٣٠٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) گۆت: (هەر کەسێ خۆ ل دەست کورتەکی بگریت یان پێ بهێلیت خودێ رۆژا قیامەتێ دێ ئێخیتە بن سیبەرا خۆڤە رۆژا چو سیبەر نەبن سیبەرا وی نەبیت).**

## ٤ . باب: حسن القضاء

## بابەتێ: جوانخوازییا قەردانێ.

٣٠٧١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَتَقَاضَاهُ، فَأَغْلَظَ، فَهَمَّ بِهِ أَصحَابُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم): **(دَعُوهُ، فَإِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً).** ثُمَّ قَالَ: **(أَعْطُوهُ سِنّاً مِثْلَ سِنِّهِ).** قَالوا: يَا رَسُولَ اللهِ! لا نَجِدُ إِلاَّ أَمْثَلَ مِنْ سِنِّهِ، فَقَالَ: **(أَعْطُوهُ، فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ قَضَاءً).** [خ٢٣٠٦ (٢٣٠٥)/ م١٦٠١].

- وفي رواية للبخاري: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) سِنٌّ مِنَ الْإِبِلِ، فَجَاءَهُ يَتَقَاضَاهُ.. فَقَالَ: (**أَعْطُوهُ**) ، فَقَالَ: أَوْفَيْتَنِي، أَوْفَى اللهُ بِكَ. [خ٢٣٠٥].

**ژ ئەبی هورەیره (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاته دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) دەینێ خۆ خواست و زڤر د گەل ئاخفت، نێزیك بوو هەڤالێت وی رابنێ، بەلێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بهێلن خودانێ دەینی حەقێ دەینخواستنێ یێ هەی)، پاشی گۆت: حێشترەکا هندی حێشترا وی بدەنێ، گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ ئەم نابینین ژ یا وی چێتر نەبیت، گۆت: (بدەنێ، ب راستی باشترینێ هەوە ئەوە یێ باشتر دەینی ددەت).**

- **و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: زەلامەکی حێشترەك ل سەر پێغەمبەری بوو (ﷺ) هاتە دەڤ داخوازا وێ بکەت، ئینا گۆت: (بدەنێ) ئینا گۆت: تە مافێ من ب دورستی دا من، خودێ جزایێ تە ب دورستی بدەتە تە.**

٣٠٧٢ – عَنْ مُجَاهِدٍ أَنَّهُ قَالَ: اسْتَسْلَفَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ مِنْ رَجُلٍ دَرَاهِمَ، ثُمَّ قَضَاهُ دَرَاهِمَ خَيْراً مِنْهَا، فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ! هَذِهِ خَيْرٌ مِنْ دَرَاهِمِي الَّتِي أَسْلَفْتُكَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: قَدْ عَلِمْتُ، وَلَكِنْ نَفْسِي بِذَلِكَ طَيِّبَةٌ. [ط١٣٨٥].

* إسناده قوي.

**ژ موجاهدی (ﷺ) ئەوی گۆت: عەبدوللایێ کوڕێ عومەری هندە دەرهەم ژ زەلامەکی قەرکرن، پاشی هندە دەرهەمێت باشتر پێشڤە دانێ، ئینا وی زەلامی گۆت: ئەڤە ژ وان دەرهەمان باشترن ئەوێت من ب قەر داینە تە، ئینا عەبدوللایێ کوڕێ عومەری گۆت: بەلێ، بەلێ دلێ من ب ڤێ خۆشە.**

## ٥ ـ باب: استحباب الوضع من الدين وهبته

## بابەتێ: باشدانانا قەر کێمکرنێ یان بکەتە دیاری.

٣٠٧٣ – (ق) عَنْ كَعْبِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْناً كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي المَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا، حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ، فَنَادَى: (**يَا كَعْبُ**) ! قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**ضَعْ مِنْ دَيْنِكَ هَذَا**) ، وَأَوْمَأَ إِلَيْهِ: أَيِ الشَّطْرَ، قَالَ: لَقَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: (**قُمْ فَاقْضِهِ**). [خ٤٥٧/ م١٥٥٨]

ژ کەعبێ کوڕێ مالکی (ﷺ) وی ل مزگەفتێ داخوازا قەرەکێ خۆ ژ ئیبن ئەبی حەدرەدی کر، ئینا دەنگێت وان بلند بوون هەتا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو ل مالا خۆ گوهـ ل دەنگێ وان بووی، بۆ وان هاتە دەرڤە هەتا پەردا خانییێ خۆ بلند کری و گازی کر (**ئەی کەعب**) گۆت: بەلێ فەرمانێ بکە ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (**ڤێ ژ قەرێ خۆ بهێلە**) و نیشان کرە وی، ئانکو: نیڤێ، گۆت: من ئەو کر ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (**رابە قەرێ وی بدەیێ**).

### ٦ ـ باب: الشفاعة في تأجيل الدين

### بابەتێ: مەهدەر د پاشئێخستنا قەریدا.

٣٠٧٤ - (خ) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ أَبَاهُ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ عَلَيْهِ ثَلاَثِينَ وَسْقاً لِرَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَاسْتَنْظَرَهُ جابِرٌ، فَأَبَى أَنْ يُنْظِرَهُ، فَكَلَّمَ جابِرٌ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لِيَشْفَعَ لَهُ إِلَيْهِ، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَكَلَّمَ الْيَهُودِيَّ لِيَأْخُذَ ثَمَرَ نَخْلِهِ بِالَّذِي لَهُ، فَأَبَى، فَدَخَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) النَّخْلَ فَمَشَى فِيهَا، ثُمَّ قَالَ لِجَابِرٍ: (**جُدَّ لَهُ، فَأَوْفِ لَهُ الَّذِي لَهُ**). فَجَدَّهُ بَعْدَمَا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَأَوْفَاهُ ثَلاَثِينَ وَسْقاً، وَفَضَلَتْ لَهُ سَبْعَةَ عَشَرَ وَسْقاً، فَجَاءَ جابِرٌ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لِيُخْبِرَهُ بِالَّذِي كانَ، فَوَجَدَهُ يُصَلِّي الْعَصْرَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَخْبَرَهُ بِالْفَضْلِ، فَقَالَ: (**أَخْبِرْ ذلِكَ ابْنَ الخَطَّابِ**). فَذَهَبَ جابِرٌ إِلى عُمَرَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ عَلِمْتُ حِينَ مَشَى فِيهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لَيُبَارَكَنَّ فِيهَا. [خ٢٣٩٦ (٢١٢٧)].

ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (ﷺ) گۆت: بابێ وی وەغەر کر و سیهـ وسقێت (بار) قەسپان یێت زەلامەکێ جوهی ل سەر وی هێلان، جابری داخوازا گیرۆکرنێ ژێ کر، ئەو رازی نەبوو گیرۆ بکەت، ئینا جابر د گەل پێغەمبەرێ خودێ ئاخفت دا بەرەڤانییێ بۆ بکەت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هات و د گەل جوهی ئاخفت دا قەرێ خۆ ب قەسپێت وی هەین راکەت، رازی نەبوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ د ناڤ قەسپاندا و د ناڤدا هات و چۆ، پاشی گۆتە جابری: (**بۆ بچنە و ئەو مافێ هەی ب دورستی بدەیێ**)، ئینا بۆ چنین، پشتی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زڤری سیهـ بارێت قەسپان دانێ و هەڤدە بار بۆ مان ژی، ئینا جابر هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دا ئەوا چێبوویی بێژیتێ، دیت یێ نڤێژا ئێڤاری دکەت، ڤێجا دەمێ ژ نڤێژێ دەرکەفتی ئەوا زێدە کری گۆتێ، ئینا گۆت: (**هەرە ڤێ بۆ کوڕێ خەتتابی بێژە**)، ئینا جابر چۆ دەڤ عومەری و گۆتێ، ئینا عومەری

**گۆت: ب سويند دەمێ من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ديتی مايێ خۆ تێ كری من زانی خودێ دێ بەرەكەتێ ئێخيتێ.**

## ٧ ـ باب: من مات وعليه دين

## بابەتێ: يێ بمريت و قەرەك ل سەر بيت.

٣٠٧٥ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ المُتَوَفَّى، عَلَيْهِ الدَّيْنُ فَيَسْأَلُ: (**هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ فَضْلاً**) ؟. فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ لِدَيْنِهِ وَفَاءً صَلَّى؛ وَإِلاَّ قَالَ لِلْمُسْلِمِينَ: (**صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ**). فَلَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ الْفُتُوحَ، قَالَ: (**أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ مِنَ المُؤْمِنِينَ فَتَرَكَ دَيْناً فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مالاً فَلِوَرَثَتِهِ**). [خ٢٢٩٨/ م١٦١٩].

**ژ ئەبی هورەيرە (ﷺ) گۆت: دا زەلامێ مری و قەردار ئينانە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دا پرسيارا وی كەت: (ئەرێ تشتەكێ زێدە بۆ قەرێ خۆ هێلا يە)؟ ئەگەر گۆت بانێ هندی هێلا يی دەينێ وی بهێتە دان، نڤێژ ل سەر دكر و ئەگەر نە دگۆتە موسلمانان: (نڤێژێ ل سەر هەڤالێ خۆ بكەن) ڤێجا دەمێ خودێ دەرگەه بۆ فەكرين گۆت: (ئەز ژ هەمی باوەريدان بۆ وان نێزيكترم، هەر كەسێ ژ باوەريدان بمريت و قەرەك پاش خۆ هێلا بيت دانا قەرێ وی ل سەر منە، هەر كەسێ مالەك پاش خۆ هێلا بيت ئەو بۆ ميراتخۆرێت وييە).**

٣٠٧٦ – عَنْ سَمُرَةَ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِي فُلاَنٍ**) ؟ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَ: (**هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِي فُلاَنٍ**) ؟ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ قَالَ: (**هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ بَنِي فُلاَنٍ**) ؟ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ! فَقَالَ (ﷺ): (**مَا مَنَعَكَ أَنْ تُجِيبَنِي فِي الْمَرَّتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ؟ إِنِّي لَمْ أُنَوِّهْ بِكُمْ إِلاَّ خَيْراً، إِنَّ صَاحِبَكُمْ مَأْسُورٌ بِدَيْنِهِ**)، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ أُدِّيَ عَنْهُ حَتَّى مَا أَحَدٌ يَطْلُبُهُ بِشَيْءٍ. [د٣٣٤١/ ن٤٦٩٩].

* حسن.

**ژ سەمورەيی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ د گەل مە ئاخفت و گۆت: (ئەرێ ئها ل ڤێرێ ئێك ژ فلان بنەمالێ هەيە)؟ كەسێ بەرسڤا وی نەدا، جارەكا دی گۆت: (ئەرێ ئها ل ڤێرێ ئێك ژ فلان بنەمالێ هەيە)؟ كەسێ بەرسڤا وی نەدا، پاشی گۆت: (ئەرێ ئها ل ڤێرێ ئێك ژ فلان بنەمالێ هەيە)؟ ئينا زەلامەك رابوو و گۆت: ئەز ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئينا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (چ رێگری ل تە كر تو بەرسڤا من ل هەردو جارێت**

**ئێكێ نەدەی؟ ب راستى من نافێ هەوە نەئينايە بۆ خێرێ نەبيت، ب راستى هەڤالێ هەوە ب قەرێ خۆڤە يێ ئاسێكرييە)[1]. ڤەگێر دبێژيت: ب راستى من ديت قەرێ وى پێشڤە هاتە دان هەتا كەسێ چو نەمايە سەر تشتەكى ژێ بخوازيت.**

٣٠٧٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ، حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ**). [ت١٠٧٨/ جه٢٤١٣/ مي٢٦٣٣]

* صحيح.

**ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رحا خودان باوەرى ژ بەر قەرێ خۆ يا ئاسێكرييە هەتا پێشڤە دهێتە دان).**

## ٨ ـ باب: تحمل دين الميت

## بابەتێ: ب ستۆخۆڤەگرتنا قەرێ مرى.

٣٠٧٨ - (خ) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِذْ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ، فَقَالُوا: صَلِّ عَلَيْهَا، فَقَالَ: (**هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ**) ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: (**فَهَلْ تَرَكَ شَيْئاً**) ؟ قَالُوا: لاَ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. ثُمَّ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ أُخْرَى، فَقَالوا: يَا رَسُولَ اللهِ، صَلِّ عَلَيْهَا، قَالَ: (**هَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ**) ؟ قِيلَ: نَعَمْ، قَالَ: (**فَهَلْ تَرَكَ شَيْئاً**) ؟ قالُوا: ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ، فَصَلَّى عَلَيْهَا. ثُمَّ أُتِيَ بِالثَّالِثَةِ، فَقَالُوا: صَلِّ عَلَيْهَا، قالَ: (**هَلْ تَرَكَ شَيْئاً**) ؟ قالُوا: لاَ، قالَ: (**فَهَلْ عَلَيْهِ دَيْنٌ**) ؟ قالُوا: ثَلاَثَةُ دَنَانِيرَ، قالَ: (**صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ**).

قالَ أَبُو قَتَادَةَ: صَلِّ عَلَيْهِ يَا رَسُولَ اللهِ وَعَلَيَّ دَيْنُهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ. [خ٢٢٨٩].

**ژ سەلەمیێ كورێ ئەكوەعى (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د روينشتى بووين، مە هند ديت تەرمەك ئينا، گۆتن: نڤێژێ ل سەر بكە، ئينا گۆت: (ئەرێ قەرەك ل سەر هەيە)؟ گۆتن: نەخێر، گۆت: (يا تشتەك پاش خۆ هێلايە)؟ گۆتن: نەخێر، ئينا نڤێژ ل سەر كر، پاشى تەرمەكێ دى ئينان، و گۆتن: ئەى پێغەمبەرێ خودێ نڤێژێ ل سەر بكە، گۆت: (قەرەك ل سەر هەيە)؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: (يا تشتەك پاش خۆ هێلايە)؟ گۆتن: سێ دينار، ئينا نڤێژ ل سەر كر، پاشى يێ سێيێ ئينان، گۆتن: نڤێژێ ل**

---

(١) ئانكو: رێ لێ گرتييە و قەر ناهێليت ئەو بچيتە بەحەشتێ.

**سەر بکە، گۆت: (تشتەك پاش خۆ هێلایە)؟ گۆتن: نەخێر، گۆت: (یا قەرەك ل سەر هەیە)؟ گۆتن: سێ دینار، گۆت: (نڤێژێ ل سەر هەڤالێ خۆ بکەن).**

**ئەبو قەتادەیی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ نڤێژێ ل سەر بکە و قەرێ وی ل سەر منە، ئینا نڤێژ ل سەر کر.**

## ٩ ـ باب: المفلس

## بابەتێ: رەپەرویتی.

٣٠٧٩ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، أَوْ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ أَدْرَكَ مالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ، أَوْ إِنْسَانٍ، قَدْ أَفْلَسَ فَهْوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ**). [خ٢٤٠٢/ م١٥٥٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: یان ژی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر کەسێ بگەهیتە مالێ خۆ ب خۆ ل دەڤ زەلامەکی یان مرۆڤەکێ رەپەرویت بوویی ببیت ئەو ب وی مالی ژ ئێکێ دی هەژیترە).**

٣٠٨٠ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا، فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ**) ، فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِغُرَمَائِهِ: (**خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ، وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ**). [م١٥٥٦].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئاتافەك ب سەری هات د فێقییەکیدا کڕی بوو، ژ بەر هندێ قەرێت وی بوونە گەلەك، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خێرێ د گەل بکەن)، خەلکی خێر د گەل کر، بەلێ هند نەبوو تێرا قەرێت وی بکەت و پێ بهێنە دان، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە خزدانێت قەرێت وی: (ئەوا هوین دبینن ببەن، و ژ ڤێ پێڤتر چو دی بۆ هەوە نینە).**

٣٠٨١ – عَنْ كَعْبِ بنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَجرَ عَلى مُعَاذٍ مَالَهُ وَبَاعَهُ بِدَيْنٍ كَانَ عَلَيْهِ. [ك٧٠٦٠].

* قال الذهبي: على شرطهما.

ژ کەعبێ کوڕێ مالکی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رێکا دەستکاریکرنێ ژ مەعازی د مالێ ویدا گرت، و فرۆت ب قەرەکی ل سەر بوو.

١٠ ـ باب: مطل الغني ظلم

**بابەتێ: گیرۆکرنا زەنگینی یا قەری ستەمە.**

٣٠٨٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (**مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، فَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ، فَلْيَتْبَعْ**). [خ٢٢٨٧/ م١٥٦٤].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(گیرۆکرنا زەنگینی یا قەری ستەمە، و هەکە ئێك بۆ زەنگینەکی هاتە ڤەگوهاستن (دا دەینێ خۆ ژ وی وەرگریت) بلا بچیت).**

١١ ـ باب: الحوالة

**بابەتێ: ڤەگوهاستنێ[1].**

٣٠٨٣ - (خ) وَقَالَ الْحَسَنُ وَقَتَادَةُ: إِذَا كَانَ يَوْمَ أَحَالَ عَلَيْهِ مَلِيّاً، جَازَ.

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: يَتَخَارَجُ الشَّرِيكَانِ وَأَهْلُ الْمِيرَاثِ، فَيَأْخُذُ هَذَا عَيْناً، وَهَذَا دَيْناً، فَإِنْ تَوِيَ لِأَحَدِهِمَا لَمْ يَرْجِعْ عَلَى صَاحِبِهِ. [الحوالة، باب ١]

[وانظر: الباب قبله] .

**حەسەنی و قەتادەیی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: ئەگەر رۆژا ئەو بۆ دهێتە ڤەگوهاستن یێ زەنگین بیت دورستە.**

**و ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەردو هەڤپشك و خودانێت میراتی، بۆ ئێکی ژ وان هەیە یێ دی دەربێخیت[2]، ئەڤە پشکەکا ئاشکەرا راکەت، و یێ دی قەرەکی راکەت، ئەگەر پشکا ئێکی ژ وان تێ چۆ ئەو نازڤریتە هەڤالێ خۆ.**

---

(١) ئانکو: ڤەگوهاستنا قەری ژ ستۆیەکی بۆ ستۆیەکێ دی و ژ گەردەنەکێ بۆ گەردەنەکا دی.

(٢) ئانکو: هەر ئێك تشتەکی راکەت و یێ دەینی بۆ خۆ بەرامبەر وی تشتی راکەت، یان نەڤە پشکا وی بکڕیت بلا یا دیار ژی نەبیت بەلێ ب رازیبوونا هەردووان، هەردو هەڤپشکان یان میراتخۆران.

## ١٢ ـ باب: الكفالة

## بابەتێ: کەفالەتێ[1].

٣٠٨٤ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَجُلاً لَزِمَ غَرِيماً لَهُ بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، فَقَالَ: وَاللهِ لاَ أُفَارِقُكَ حَتَّى تَقْضِيَنِي أَوْ تَأْتِيَنِي بِحَمِيلٍ. فَتَحَمَّلَ بِهَا النَّبِيُّ (ﷺ)، فَأَتَاهُ بِقَدْرِ مَا وَعَدَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): **(مِنْ أَيْنَ أَصَبْتَ هَذَا الذَّهَبَ)** ؟ قَالَ: مِنْ مَعْدِنٍ، قَالَ: **(لاَ حَاجَةَ لَنَا فِيهَا، لَيْسَ فِيهَا خَيْرٌ)** ، فَقَضَاهَا عَنْهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [د٣٣٢٨/ جه٢٤٠٦].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (رضي الله عنهما) گۆت: زەلامەك ما ب قەردارەکێ خۆڤە دەھ دینار قەر ل سەر بوون، و گۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەز تە بەرنادەم ھەتا قەرێ من نەدەیە من یان تو کەفیلەکی بینی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەو قەر ب ستۆیێ خۆڤە گرت، قەرداری بھایێ ژڤان پێ دایی ئینا، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: (تە ئەڤ زێرە ژ کیرێ ئینایە)؟ گۆت: ژ کانزایی[2]، گۆت: (مە ھەوجەیی پێ نینە، ھەوجەیێ ناقەتینیت)[3]، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پێش ویڤە قەرێ وی دا.**

٣٠٨٥ – عَنْ سُلَيْمَانَ الشَّيْبَانِي قَالَ: سَمِعْتُ حَبِيباً الَّذِي كَانَ يُقَدِّمُ الْخُصُومَ إِلَى شُرَيْحٍ، قَالَ: خَاصَمَ رَجُلٌ ابْناً لِشُرَيْحٍ إِلَى شُرَيْحٍ كَفِلَ لَهُ بِرَجُلٍ عَلَيْهِ دَيْنٌ فَحَبَسَهُ شُرَيْحٌ، فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ قَالَ: اذْهَبْ إِلَى عَبْدِ اللهِ بِفِرَاشٍ وَطَعَامٍ، وَكَانَ ابْنُهُ يُسَمَّى عَبْدَ اللهِ. [هق٦/٧٧].

[وانظر: ٣٠٨٧] .

**ژ سولەیمانێ شەیبانی (رحمه الله) گۆت: من گوھ ل حەبیبی بوو ئەوێ ھەڤرك دئینانە دەڤ شورەیحی، گۆت: زەلامەکی ھەڤرکییا کوڕەکێ شورەیحی برە دەڤ وی بۆ وی کەفیلاتییا زەلامەکی کربوو قەر ل سەر بوو، ئینا شورەیحی کوڕێ خۆ زیندان کر، ڤێجا دەمێ بوویە**

---

(١) کەفالەت: زەمانکرن و ستۆخۆڤەگرتنە.

(٢) ھەر تشتێ ژ عەردی دەردکەڤیت دبێژنێ مەعدەن و کانزا.

(٣) چونکی ئەو زێرێ نەپارەکری بوو و پارچێت زێری بوون و بھایێ وان دەھ دیناران بوو و خودانێ قەری دیناڕێت خۆ دڤیان ژ بەر ھندێ پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ ھەوجەیی پێ ناقەتییێت.

شەڤ شورەیحی گۆت: هەرە خوارنێ و نڤینا بۆ عەبدوللایی ببە و ناڤێ کوڕێ وی عەبدوللاە بوو.

## ١٣ ـ باب: الوكالة

## بابەتێ: وەکیلاتییێ(١).

٣٠٨٦ – (خ) وَقَدْ وَكَّلَ عُمَرُ وَابْنُ عُمَرَ فِي الصَّرْفِ.[الوكالة، باب ٣].

وَكَتَبَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عَمْرٍو إِلَى قَهْرَمَانِهِ، وَهُوَ غَائِبٌ عَنْهُ، أَنْ يُزَكِّيَ عَنْ أَهْلِهِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ. [الوكالة، باب ٥].

**عومەری و ئیبن عومەری وەکیل د کڕین و فرۆتنا پاراندا گرتبوون.**

**و عەبدوللایێ کوڕێ عەمری بۆ گەنجینەدارێ (وەکیلێ) خۆ نڤیسی و ئەو ل دەڤ نەبوو، ئەو پێش مالا ویڤە بێت بچویك و مەزن زەکاتا فترەیێ بدەت.**

## ١٤ ـ باب: العارية

## بابەتێ: عارییێ (هاریکارییێ)(٢).

٣٠٨٧ – عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ فِي الْخُطْبَةِ، عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ: (**الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالزَّعِيمُ غَارِمٌ ، وَالدَّيْنُ مَقْضِيٌّ**). [د٣٥٦٥/ ت١٢٦٥/ جه٢٣٩٨].

* صحيح.

**ژ ئەبی ئومامەیی (رضي الله عنه) گۆت: من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) ل سالا حەجا خاترخواستنێ و د خوتبێدا دگۆت: (عارییە دڤێت بهێتە زڤراندن، و کەفیل دەستەبەرە، و قەر دڤێت بهێتە دان).**

٣٠٨٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ الْمَاعُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَارِيَةَ الدَّلْوِ وَالْقِدْرِ. [د١٦٥٧]

* حسن.

---

(١) وەکالەت نەڤەیە: کارەك ب هیڤیا کەسەکیڤە بهێتە هێلان پێش ویڤە بکەت، د وان تشتاندا یێت دورست پێشڤە بهێنە کرن، یان مرۆڤ کارێ خۆ بهێلیتە ب هیڤیا ئێکێدیڤە و مافی بدەتێ دەستکارییێ بکەت.

(٢) عارییە: داخوازکرنا تشتییە و مفاوەرگرتنە ژێ و پاراستنا سەرێ تشتی و ڤەگەراندنا وی جارەکا دی.

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: هەوجەیێت ناڤمالان دۆلك و قازان ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) مە عارییە (هاریكاری) ددانا.

٣٠٨٩ - عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) اسْتَعَارَ مِنْهُ أَدْرَاعاً يَوْمَ حُنَيْنٍ، فَقَالَ: أَغَصْبٌ يَا مُحَمَّدُ؟ فَقَالَ: (لاَ، بَلْ عَارِيَةٌ مَضْمُونَةٌ). [د٣٥٦٢].

* صحيح.

ژ سەفوانێ كورێ ئومەییە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هندە مەتال رۆژا حونەینێ وەك عارییە هاریكاری ژێ خواستن، ئینا گۆت: ژێ ستاندنە ئەی موحەممەد ئینا گۆت: (نەخێر، بەلكی هاریكارییەكا دەستەبەركرییە).

١٥ ـ باب: ما جاء في الوديعة

بابەتێ: ئەوا د ئەمانەتیدا هاتی.

٣٠٩٠ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ أُودِعَ وَدِيعَةً، فَلاَ ضَمَانَ عَلَيْهِ). [جه٢٤٠١].

* حسن.

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ئەمانەتەك ل دەڤ وی هاتە دانان دەستەبەری ل سەر نینە).

٣٠٩١ - عَنْ عَائِشَةَ فِي هِجْرَةِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: وَأَمَرَ ـ تَعْنِي رَسُولَ الله (ﷺ) ـ عَلِيّاً رضي الله عنه أَنْ يَتَخَلَّفَ عَنْهُ بِمَكَّة حَتَّى يُؤَدِّي عَنْ رَسُولِ الله (ﷺ) الْوَدَائِعَ الَّتِي كَانَتْ عِنْدَهُ لِلنَّاسِ. [هق ٦/٢٨٩]. [وانظر: ٣٤٠٢، ٣٤٠٤] .

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) د مشەختبوونا پێغەمبەریدا (ﷺ) گۆت: فەرمان ـ مەخسەدا وێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ـ ل عەلی (رضي الله عنه) كر ئەو ل شوینا وی ل مەكەهێ بمینیت، دا پێش پێغەمبەرێ خودێڤە (ﷺ) وان ئەمانەتێت ل دەڤ بۆ خەلكی بزڤرینیت.

١٦ ـ باب: القرض (الدين).

بابەتێ: قەران.

٣٠٩٢ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ قَالَ: اسْتَقْرَضَ مِنِّي النَّبِيُّ (ﷺ) أَرْبَعِينَ أَلْفاً، فَجَاءَهُ مَالٌ فَدَفَعَهُ إِلَيَّ، وَقَالَ: (بَارَكَ اللهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ: الْحَمْدُ وَالْأَدَاءُ).[ن٤٦٩٧/ جه٢٤٢٤].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ ئەبی رەبیعەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چل هزار ژ من قەرکرن، مالەك بۆ هات بۆ من زڤراندن و گۆت: (خودێ بەرەکەتێ بێخیتە د ناڤ مالا تەدا و مالێ تەدا، ب راستی خەلاتێ دەینی: سوپاسیکرن و زڤراندنە).**

٣٠٩٣ – عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ مَيْمُونَةَ ـ زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ اسْتَدَانَتْ، فَقِيلَ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، تَسْتَدِينِينَ، وَلَيْسَ عِنْدَكِ وَفَاءٌ؟ قَالَتْ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ أَخَذَ دَيْناً وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُؤَدِّيَهُ، أَعَانَهُ اللهُ عزّ وجل** ). [ن٤٧٠١].

* صحيح.

**ژ عوبەیدوللایێ کورێ عەبدوللایێ کورێ عوتبەیی (رضي الله عنه) گۆت: مەیموونەیێ، هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) قەرەك کر، ئێکی گۆتێ: ئەی دایکا باوەریداران تو قەری دکەی و چو بۆ زڤراندنێ ل دەڤ تە نینە؟! گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر کەسێ قەرەکی بکەت و وی دڤێت بزڤرینیت خودایێ هەر ب هێز و مەزن دێ هاریکارییا وی کەت).**

## ١٧ ـ باب: التشديد في الدين

## بابەتێ: گرانکرن د قەریدا.

٣٠٩٤ – عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جَحْشٍ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، ثُمَّ وَضَعَ رَاحَتَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: (**سُبْحَانَ اللهِ! مَاذَا نُزِّلَ مِنَ التَّشْدِيدِ**) ؟ فَسَكَتْنَا وَفَزِعْنَا. فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ، سَأَلْتُهُ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا هَذَا التَّشْدِيدُ الَّذِي نُزِّلَ؟ فَقَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ أَنَّ رَجُلاً قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللهِ، ثُمَّ أُحْيِيَ، ثُمَّ قُتِلَ، ثُمَّ أُحْيِيَ، ثُمَّ قُتِلَ، وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، مَا دَخَلَ الْجَنَّةَ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ دَيْنُهُ**). [ن٤٦٩٨].

* حسن.

**ژ موحەممەدێ کورێ جەحشی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د روینشتی بووین، ئینا سەرێ خۆ بلند کرە عەسمانی و پاشی دەستێ خۆ دانا سەر ئەنیا خۆ، و پاشی گۆت: (پاکی و پاقژی بۆ خودێ بیت، چو ژ گرانکرنێ هاتییە خوار) من**

پرسیارا وی كر ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو چ گرانییە یا هاتییە خوارێ؟ ئینا گۆت: **(ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا ئەگەر مرۆڤەك د رێكا خودێدا بهێتە كوشتن، پاشی بێتە ساخكرن، و پاشی بێتە كوشتن پاشی بهێتە ساخكرن و پاشی بهێتە كوشتن و قەرەك ل سەر بیت، ئەو ناچیتە بەحەشتێ هەتا قەرێ وی پێشڤە نەهێتە دان).**

١٨ . باب: حسن المطالبة

**بابەتێ: داخوازكرنا مافان ب جوانی.**

٣٠٩٥ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَعَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ طَالَبَ حَقاً فَلْيَطْلُبْهُ فِي عَفَافٍ، وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ).** [جه٢٤٢١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری و عائیشایێ (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ داخوازا مافەكی بكەت بلا جوان داخواز كەت، تمام وەربگریت یان نەتەمام).**

٣٠٩٦ – عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ: دَخَلَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) الْمَسْجِدَ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ مُلاَزِمٌ رَجُلاً، قَالَ: فَصَلَّى وَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا هُوَ مُلاَزِمُهُ، قَالَ: **(حَتَّى الآنَ يَا أُبَيُّ، حَتَّى الآنَ يَا أُبَيُّ، مَنْ طَلَبَ أَخَاهُ فَلْيَطْلُبْهُ بِعَفَافٍ وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ).** فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ تَرَكَهُ وَتَبِعَهُ، قَالَ: فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ قُلْتَ قَبْلُ: مَنْ طَلَبَ أَخَاهُ فَلْيَطْلُبْهُ بِعَفَافٍ وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ، قَالَ: **(نَعَمْ)** ، قَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ مَا الْعَفَافُ؟ قَالَ: **(غَيْرَ شَاتِمِهِ، وَلاَ مُتَشَدِّدٍ عَلَيْهِ، وَلاَ مُتَفَحِّشٍ عَلَيْهِ، وَلاَ مُؤْذِيهِ)** ، **قَالَ: وَافٍ أَوْ غَيْرِ وَافٍ؟ قَالَ: (مُسْتَوْفٍ حَقَّهُ أَوْ تَارِكٍ بَعْضَهُ).** [هق ٦/٥٣].

**ژ ئوبەیێ كورێ كەعبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە د مزگەفتێڤە، و ئوبەیێ كورێ كەعبی یێ مایە ب زەلامەكیڤە، گۆت: نڤێژ كر و هەوجەییا خۆ ب جهـ ئینا و پاشی دەركەفت، و هەر ما پێڤە، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەتا ڤێ گاڤێ ئەی ئوبەی هەتا ڤێ گاڤێ ئەی ئوبەی، هەر كەسێ مافەك ژ برایێ خۆ خواست، بلا ب جوانی داخواز بكەت و ب تمامی وەرگریت یان نە ب تمامی). ڤێجا دەمێ ئەڤە گوهـ لێ بووی، ئەو هێلا و د گەل دویف پێغەمبەری (ﷺ) چۆ، گۆت: ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ**

بەری نوكە تە گۆت: **(هەر كەسێ مافەك ژ برایێ خۆ خواست، بلا ب جوانی داخواز بكەت و ب تمامی وەرگریت یان نە ب تمامی)**، گۆت: **(بەلێ)**، گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب جوانی چییە؟ گۆت: **(نە خەبەرا بێژیتێ و نە ل سەر بگڤێشیت و نە ئاخفتنێت كرێت بێژیتێ و نە ئەزیەتا وی بكەت)**، گۆت: پا ب تمامی و نە تمامی؟ گۆت: **(مافێ خۆ تمام وەربگری یان هندەكێ پێ بهێلی)**.

١٩ ـ باب: لصاحب الحق سلطان

**بابەتێ: خودانێ مافی پشتەڤانی هەیە.**

٣٠٩٧ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) يَتَقَاضَاهُ دَيْناً كَانَ عَلَيْهِ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ حَتَّى قَالَ لَهُ: أُحَرِّجُ عَلَيْكَ إِلاَّ قَضَيْتَنِي، فَانْتَهَرَهُ أَصْحَابُهُ، وَقَالُوا: وَيْحَكَ! تَدْرِي مَنْ تُكَلِّمُ؟ قَالَ: إِنِّي أَطْلُبُ حَقِّي، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(هَلاَّ مَعَ صَاحِبِ الْحَقِّ كُنْتُمْ)** ؟ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى خَوْلَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، فَقَالَ لَهَا: **(إِنْ كَانَ عِنْدَكِ تَمْرٌ، فَأَقْرِضِينَا، حَتَّى يَأْتِيَنَا تَمْرُنَا، فَنَقْضِيَكِ)** ، فَقَالَتْ: نَعَمْ، بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: فَأَقْرَضَتْهُ، فَقَضَى الْأَعْرَابِيَّ وَأَطْعَمَهُ، فَقَالَ: أَوْفَيْتَ، أَوْفَى اللهُ لَكَ، فَقَالَ: **(أُولَئِكَ خِيَارُ النَّاسِ، إِنَّهُ لاَ قُدِّسَتْ أُمَّةٌ لاَ يَأْخُذُ الضَّعِيفُ فِيهَا حَقَّهُ غَيْرَ مُتَعْتَعٍ)**. [جه٢٤٢٦].

* صحيح.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: كۆچەرە عەرەبەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، داخوازا قەرەكێ خۆ ل سەر وی بوو كر، و ل سەر گڤاشت هەتا گۆتییێ: ئەز دێ ل تە بەرتەنگ كەم هەتا تو قەرێ من ددەیە من، هەڤالێت وی پاشڤە بر و گۆتنێ وەی هەوار بۆ تە تو دزانی تو د گەل كێ دئاخڤی؟ گۆت: ئەز یێ داخوازا مافێ خۆ دكەم، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(بۆچی هوین د گەل خودانێ مافی نەبوون)**؟ پاشی ڤرێكرە دەڤ خەولا كچا قەیسی و گۆتێ: **(ئەگەر تە قەسپ هەبن، ب قەر بدە مە، هەتا قەسپێت مە دهێن، بۆ تە دزڤرینین)**، ئینا وێ گۆت: بەلێ بابێ من قوربانی تە بیت ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: وێ قەسپ ب قەر دانە پێغەمبەری (ﷺ) قەرێ كۆچەرە عەرەبی دایێ و خوارن دایێ، ئینا گۆت: تە مافێ من ب دورستی دا من، خودێ جزایێ تە ب دورستی بدەتە تە. ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەوێت ب دورستی قەری ددەن باشترینێت**

**خەلكینە، ب راستی ئەو ملەت پاك و پاقژ و سەرفەراز نابیت لاواز د ناڤ واند مافێ خۆ بێ گیرۆبوون و خورتیلێكرن وەرنەگریت).**

٢٠ باب: الوضع من الدين مقابل التعجيل

**بابەتێ: هێلانا هندەك ژ دەینی بەرامبەر لەزكرن ژ دانا وی.**

٣٠٩٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يَكُونُ لَهُ الدَّيْنُ عَلَى الرَّجُلِ إِلَى أَجَلٍ، فَيَضَعُ عَنْهُ صَاحِبُ الْحَقِّ، وَيُعَجِّلُهُ الْآخَرُ، فَكَرِهَ ذَلِكَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَنَهَى عَنْهُ. [ط١٣٧٧].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، پرسیارا زەلامەكی ژێ هاتە كرن، قەرەك ل سەر زەلامەكی بۆ دەمەكێ دەستنیشانكری هەبیت، ڤێجا خودانێ قەری هندەكێ بۆ بهێلیت و یێ دی لەزێ ل دانا قەری بكەت، عەبدوللایێ كورێ عومەی حەژێ نەكر و پاشڤەلێدان ژ هندێ كر[1].**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ئەڤە پرسەكا نەلێكیییە دناڤبەرا زانایاندا: ئەبو حەنیفە و مالك و شافعی د گۆتنا خۆ یا دورستردا و ئەحمەد د ڤەگێرا خۆ یا ئاشكەراتردا دبینن ئەڤ كارە نەیێ دورستە و رەنگەكێ ریباییە. و عەبدوللایێ كورێ عەباسی و نەخەعی و زوفەر ژ حەنەفییان و ئەحمەد د ڤەگێرەكا دیدا دبێژن: ئەڤ كارە یێ دورستە و نابیتە ریبا، و ئەڤە هەلبژارتنا ئیبن تەیمییە و ئیبن قەیمی و شەوكانییە.

## ١ ـ باب: فضل الزرع والغرس

## بابەتێ: خێرا شینکاتی و چاندێ.

٣٠٩٩ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**ما مِنْ مُسْلِمٍ يَغرِسُ غَرْساً، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعاً، فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ، أَوْ إِنْسانٌ، أَوْ بَهِيمَةٌ؛ إِلاَّ كانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ**).[خ٢٣٢٠/ م١٥٥٣].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە موسلمانەك شتلەکی بچینیت، یان شینکاتییەکێ شین بکەت ڤێجا باڵندەیەك ژێ بخۆت یان مرۆڤەك یان گیانەوەرەك هەکە بۆ نەبیتە سەدەقە).**

٣١٠٠ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنْ قَامَتْ عَلَى أَحَدِكُمُ القِيَامَةُ، وَفِي يَدِهِ فَسِيلَةٌ؛ فَلْيَغْرِسْهَا**). [حم١٢٩٠٢].

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر قیامەت ل سەر ئێك ژ هەوە رابوو و شتلەك د دەستێ ویدا بیت بلا بچینیت).**

## ٢ ـ باب: المزارعة بالشطر ونحوه

## بابەتێ: وەرازی ب نیڤی و وەکی وێ.

٣١٠١ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) عامَلَ خَيْبَرَ بِشَطْرِ ما يَخْرُجُ مِنْهَا مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ، فَكانَ يُعْطِي أَزْوَاجَهُ مِائَةَ وَسْقٍ: ثَمَانُونَ وَسْقَ تَمْرٍ، وَعِشْرُونَ وَسْقَ شَعِيرٍ. فَقَسَمَ عُمَرُ خَيْبَرَ، فَخَيَّرَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنْ يُقْطِعَ لَهُنَّ مِنَ الماءِ وَالأَرْضِ، أَوْ يُمْضِيَ لَهُنَّ، فَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الأَرْضَ، وَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الْوَسْقَ، وَكانَتْ عائِشَةُ اخْتَارَتِ الأَرْضَ.[خ٢٣٢٨ (٢٢٨٥)/ م١٥٥١].

- وفي رواية لهما: عَنِ ابْنِ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنهما أَجْلَى الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ أَرْضِ الحِجَازِ، وَكانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، لَمَّا ظَهَرَ عَلَى خَيْبَرَ، أَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا، وَكانَتِ الأَرْضُ حِينَ ظَهَرَ عَلَيْهَا للهِ وَلِرَسُولِهِ (ﷺ) وَلِلْمُسْلِمِينَ، وَأَرَادَ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ مِنْهَا، فَسَأَلَتِ الْيَهُودُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لِيُقِرَّهُمْ بِهَا أَنْ يَكْفُوا عَمَلَهَا، وَلَهُمْ نِصْفُ التَّمَرِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**نُقِرُّكُمْ بِهَا عَلَى ذٰلِكَ ما شِئْنا**). فَقَرُّوا بِهَا حَتَّى أَجْلاَهُمْ عُمَرُ إِلَى تَيْماءَ وَأَرِيحَاءَ. [خ٢٣٣٨].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) رێککەفتن ل خەیبەرێ ل سەر نیڤا ژێ دەردکەڤیت ژ فێقی و دەخلودانی کر، ڤێجا سەد وسق (بار) ژێ ددانە هەڤژینێت خۆ: هەشتێ بارێت قەسپان و بیست بارێت جەهی، ئینا عومەری عەرد لێکڤە کر و هەلبژارتن دا هەڤژینێت پێغەمبەری دویڤ دلێ وان عەرد و ئاڤ بۆ بهێنە دانان یان ل سەر ئەوا هەی یێ بەردەوام بیت، ژ وان هەبوون عەرد هەلبژارت، و ژ وان هەبوون بار هەلبژارت، و عائیشە ژ وان بوو یێت عەرد هەلبژارتی.

- و د ڤەگێرەکا واندا: ژ ئیبن عومەری: عومەرێ کورێ خەتتابی (خودێ ژ وان رازی بیت) جوهی و فەلە ژ عەردێ حیجازی راکرن، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ ل خەیبەرێ سەرکەفتی ڤیا جوهیان ژێ راکەت و دەمێ سەرکەفتی عەرد بۆ خودێ و پێغەمبەری و موسلمانان بوو، و ڤیا جوهیان ژ ئاڤ راکەت، بەلێ جوهیان داخواز ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کر، وان ل وێرێ بهێلیت بەرامبەر ئەو بۆ وان کاری تێدا بکەن، و نیڤا بەرهەمی بۆ وان بیت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دێ هەوە ل وێرێ هێلین هندی مە بڤێت)** ئەو مانە ل وێرێ هەتا عومەری ئەو راکرین و هنارتینە تەیمائێ و ئەریحایێ.

٣١٠٢ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا افْتَتَحَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) خَيْبَرَ، أَعْطَاهَا عَلَى النِّصْفِ. [جه٢٤٦٩].

* صحيح.

ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەیبەر ڤەکری ل سەر نیڤەکێ دا[1].

## ٣ . باب: كراء الأَرض

## بابەتێ: کرێیا عەردی.

٣١٠٣ - (ق) عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا أَكْثَرَ الأَنْصَارِ حَقْلاً، فَكُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ، فَرُبَّمَا أَخْرَجَتْ هذِهِ وَلَمْ تُخْرِجْ ذِهِ، فَنُهِينَا عَنْ ذلِكَ، وَلَمْ نُنْهَ عَنِ الْوَرِقِ.[خ٢٧٢٢ (٢٢٨٦)/ م١٥٤٧/ ١١٧].

- ولفظ مسلم: كُنَّا نُكْرِي الأَرْضَ، عَلَى أَنَّ لَنَا هَذِهِ، وَلَهُمْ هَذِهِ...

---

(١) ئانکو: عەرد هێلانە د دەستێت خەلکێ وێدا شینکەن و چاڤێ خۆ بدەنێ بەرامبەر نیڤا دەرامەتی بۆ وان بیت.

- وفي رواية لمسلم: أَمَّا بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ فَلاَ بَأْسَ بِهِ. وقال: إِنَّمَا كَانَ النَّاسُ يُؤَاجِرُونَ، عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ)، عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ ، وَأَقْبَالِ الْجَدَاوِلِ، وَأَشْيَاءَ مِنَ الزَّرْعِ، فَيَهْلِكُ هَذَا وَيَسْلَمُ هَذَا، وَيَسْلَمُ هَذَا وَيَهْلِكُ هَذَا. فَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَاءٌ إِلاَّ هَذَا، فَلِذَلِكَ زُجِرَ عَنْهُ، فَأَمَّا شَيْءٌ مَعْلُومٌ مَضْمُونٌ، فَلاَ بَأْسَ بِهِ.

**ژ رافعێ کوڕێ خەدیجی (رضي الله عنه) گۆت: ژ ئەنساران مە ژ هەمیان پتر عەرد هەبوو، و مە عەرد دا ب کرێ، و دبیت ڤی بەر دابا و یێ دی بەر نەدابا، لەوا پاشفەلێدانا مە ژ هندێ هاتە کرن، بەلێ ب پارەی پاشفەلێدانا مە نەهاتبوو کرن[1].**

- **و د بێژەیا موسلمیدا: مە عەرد ب کرێ دا ل سەر هندێ ئەڤە بۆ مە بیت و ئەڤە ژی بۆ وان بیت[2].**

- **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: بەلێ کرێدان ب زێری و ب زیڤی چو نینە، و گۆت: خەلکی عەردێت خۆ کرێ دکرن ل سەر ئەوا ل دۆر جۆکێت ئاڤێ و ل دەستپێکا رویبارێت بچویک شین دبیت یان ل سەر هندەك تشتان ژ شینکاتییێ، ڤێجا ئەڤە ژ ناڤ چۆ و ئەڤە ب سلامەت بوو و ئەڤە ب سلامەت بوو و ئەڤە ژ ناڤ چۆ و خەلکێ کرێدان نەبوون ئەڤە نەبیت، ژ بەر هندێ ژێ هاتنە پاشفەلێدان، بەلێ ب تشتەکێ ئاشکەرا و دەستەبەرکری چو نینە دورستە.**

## ٤ ـ باب: الأَرض تمنح

## بابەتێ: پێدانا عەردی.

٣١٠٤ - (ق) عَنْ جابرٍ رضي الله عنه قَالَ: كانَتْ لِرِجالٍ مِنَّا فُضُولُ أَرَضِينَ، فَقَالُوا: نُؤَاجِرُهَا بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَالنِّصْفِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(مَنْ كانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخاهُ، فَإِنْ أَبَى، فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ)**. [خ٢٦٣٢ (٢٣٤٠)/ م١٥٣٦/(٨٩)].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: هندە زەلامان ژ مە عەردەکێ زێدە هەبوو، گۆتن: دێ ب سێکێ یان ب چارێکێ یان ب نیڤێ کرێ کەین، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ**

---

**(١) ئانکو: کرێدانا عەردی ب پارەی.**

**(٢) ئانکو: ئەڤ پارچە بۆ مەیە و ئەڤ پارچە بۆ هەوەیە.**

**عەردەك هەبيت بلا بچينيت يان بلا بدەتەڤ برايێ خۆ، و ئەگەر نەڤيا بلا عەردێ خۆ بگريت و كرێ نەكەت).**

٣١٠٥ - (ق) عن ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ إِلَى أَرْضٍ تَهْتَزُّ زَرْعاً، فَقَالَ: (لِمَنْ هذِهِ) ؟ فَقَالُوا: اكْتَرَاهَا فُلاَنٌ، فَقَالَ: (**أَمَا إِنَّهُ لَوْ مَنَحَهَا إِيَّاهُ، كانَ خَيْراً لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا أَجْراً مَعْلُوماً**). [خ٢٦٣٤ (٢٣٣٠)/ م١٥٥٠ (١٢١)].

ژ ئيبن عەباسى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ عەردەكى ژ بەرهەمى يێ د هەژيێت، ئينا گۆت: (ئەڤە يێ كێيە)؟ گۆتن: يێ فلانييە يێ دايە ب كرێ، ئينا گۆت: (**بەلێ ئەگەر وى داباڤ وى بۆ خۆ كربا ئەڤە بۆ وى باشتر بوو كرێيەكا ئاشكەرا ل سەر وەگرتبا**).

## ٥ . باب: أُجرة الأَجير

## بابەتێ: كرێيا كرێگرتى.

٣١٠٦ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**قَالَ اللهُ: ثَلاَثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرّاً فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيراً فَاسْتَوْفَى مِنْهُ **وَلَمْ يُعْطِ أَجْرَهُ**). [خ٢٢٢٧].

ژ ئەبى هورەيرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: خودايێ مەزن گۆت: (**سێ كەسان ئەز دژمنێ وانم رۆژا قيامەتێ: مرۆڤەكى ب من (ئانكو ب پەيمانا من) دابيتێ پاشى غەدرێ بكەت، و مرۆڤەك كەسەكى ئازا بفرۆشيت و بهايێ وى بخۆت، و مرۆڤەك ئێكى كرێ بكەت، و كرێيا خۆ ژێ بخوازيت، و كريا وى نەدەتێ**).

٣١٠٧ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَعْطُوا الْأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ**). [جه٢٤٤٣].

* صحيح.

ژ عەبدوللايێ كورێ عومەرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**كرێيا پالەى بدەنێ بەرى خوها وى هشك ببيت**).

٦ ـ باب: عسب الفحل

**بابەتێ: كرێیا گیانەوەرێ نێر.**

٣١٠٨ – (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ.[خ٢٢٨٤].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پاشقەلێدانا ژ كرێیا گیانەوەرێ نێر بۆ ئاڤزكرنێ كری.**

٣١٠٩ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ كِلاَبٍ، سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنْ عَسْبِ الْفَحْلِ، فَنَهَاهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نُطْرِقُ الْفَحْلَ فَنُكْرَمُ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي الْكَرَامَةِ. [ت١٢٧٤/ ن٤٦٨٦].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) زەلامەكی ژ هۆزا كیلاب پرسیارا پێغەمبەری (ﷺ) ژ كرێیا گیانەوەرێ نێر بۆ ئاڤزكرنێ كر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) پاشقە لێدا، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم گیانەوەرێ نێر بۆ ئاڤزكرنێ بەر ددەین و ئەم دهێینە خەلاتكرن، ئینا دەستویری ب خەلاتكرنێ دا.**

٧ ـ باب: لا يمنع فضل الماء

**بابەتێ: رێ ل ئاڤا زێدە ناهێتە گرتن.**

٣١١٠ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِهِ فَضْلَ الْكَلإِ**). [خ٢٣٥٤ (٢٣٥٣)/ م١٥٦٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رێگرییێ ل ئاڤا زێدە نەكەن، دا هوین رێگرییێ ژ چەرەیا زێدە بكەن).**

٨ ـ باب: سكر الأنهار

**بابەتێ: گرتنا ئاڤێ.**

٣١١١ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، خاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي شِرَاجِ الحَرَّةِ، الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الماءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَاخْتَصَمَا عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِلزُّبَيْرِ: (**اسْقِ يَا زُبَيْرُ! ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جارِكَ**). فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: أَنْ كانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، ثُمَّ قَالَ: (**اسْقِ يَا زُبَيْرُ! ثُمَّ**

احْبِسِ المَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الجَدْرِ). فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللهِ! إِنِّي لأَحْسِبُ هذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذلِكَ: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ [النساء:٦٥]. [خ٢٣٥٩/ م٢٣٥٧].

- وفي رواية للبخاري: فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) ثُمَّ قَالَ: (اسْقِ، ثُمَّ احْبِسْ حَتَّى يَبْلُغَ الجَدْرَ). فَاسْتَوْعى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَئِذٍ حَقَّهُ لِلزُّبَيْرِ، وَكانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَبْلَ ذلِكَ أَشَارَ عَلَى الزُّبَيْرِ بِرَأْيٍ سَعَةٍ لَهُ وَلِلأَنْصَارِيِّ، فَلَمَّا أَحْفَظَ الأَنْصَارِيُّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) اسْتَوْعَى لِلزُّبَيْرِ حَقَّهُ فِي صَرِيحِ الحُكْمِ. [خ٢٧٠٨].
- وفي رواية: قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَقَدَّرَتِ الأَنْصَارُ وَالنَّاسُ قَوْلَ النَّبِيِّ (ﷺ): (اسْقِ، ثُمَّ احْبِسْ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الجَدْرِ). وَكانَ ذلِكَ إِلَى الْكَعْبَيْنِ. [خ٢٣٦٢].

**ژ عەبدوللایێ کورێ زوبەیری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەکی ژ ئەنساران سکالا ل زوبەیری کر ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ل سەر جۆکا ئاڤا حوررە ئەوا دارقەسپێت خۆ پێ ئاڤ ددان، زەلامێ ئەنساری گۆت: ئاڤێ بەردە بهێت، زوبەیری نەڤیا وێ بکەت، هەڤرکییا خۆ برنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە زوبەیری: (ئەی زوبەیر ئاڤدە و پاشی ئاڤێ بۆ جیرانێ خۆ بەردە) ئینا یێ ئەنساری تۆرە بوو و گۆت: چونکی ئەو کورێ مەتا تەیە؟ روییێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سۆر بوو، پاشی گۆت: (ئەی زوبەیر تو ئاڤدە پاشی ئاڤێ بگرە هەتا دگەهیتە سەرێ حەودکان)، ئینا زوبەیری گۆت: ئەز ب خودێ کەمە ئەز هزر دکەم ئەڤ ئایەتە د ڤێ چەندێدا یا هاتییە خوار:** ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾(1).

- **و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: سەروچاڤێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سۆر بوون، پاشی گۆت: (ئاڤدە پاشی ئاڤێ بگرە هەتا دگەهیتە سەرێ حەودکا)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مافێ زوبەیری د ئاڤێدا ب تمامی دایێ، و بەری هینگێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆچۆنەکا بەرفرەهی تێدا بۆ وی و یێ ئەنساری دابوو، ڤێجا دەمێ یێ ئەنساری پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تۆرە کری مافێ زوبەیری د ئاڤێدا ب دورستی دایێ.**

---

(1) ب خودایێ تە سویند دخۆم ئەو نابنە خودان باوەر [باوەرییێ نائینن] هەتا هەر تشتەکێ ئەو هەڤرکییێ ل سەر دکەن، تە نەکەنە حەکەم ل سەر.

- و د ڤەگێرەکێدا: ئیبن شهابی گۆت: ئەنسار و خەلکی، گۆتنا پێغەمبەری (ﷺ): **(ئاڤدە پاشی ئاڤێ بگرە هەتا دزڤریتە سەرێ حەودکا)**، تەقدیر کر و ئەو دگەهشتە گۆزەکان.

٩ ـ باب: التحذير من عواقب الاشتغال بالزرع

**بابەتێ: هشیارکرن ژ ئەنجامێت مژویلبوونا ب چاندنێڤە.**

٣١١٢ - (خ) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ قالَ: وَرَأَى سِكَّةً وَشَيْئاً مِنَ آلَةِ الحَرْثِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (لاَ يَدْخُلُ هَذَا بَيْتَ قَوْمٍ، إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ الذُّلَّ). [خ٢٣٢١].

**ژ ئەبی ئومامەیێ باهلی (رضي الله عنه) گۆت: گێسنەك و تشتەك ژ ئامویرێت کێلانێ دیت، ئینا گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ئەڤە ناچیتە د مالا هندە کەسانڤە ئەگەر خودێ شکەستنێ نەبەتە د ناڤدا)[1].**

٣١١٣ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَتَّخِذُوا الضَّيْعَةَ، فَتَرْغَبُوا فِي الدُّنْيَا). [ت٢٣٢٨]

* صحيح.

[وانظر: ٣٠٤٦] .

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بیستان و باخچەیان نەهەلگرە، پاشی دێ حەژ دنیایێ کەی)[2].**

---

(١) مەبەست ئەوە: ئەڤە دێ هینگێ چێ بیت ئەگەر وان مرۆڤ و کەسان جیهاد هێلان و پشتا خۆ دانێ و ب تامی مژویلی هندێ ببن و خەما جیهادێ نەخۆن، بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ فەرموودەیا پێغەمبەرییە (ﷺ): (ئەگەر هەوە کرین و فرۆتن ب عینەیێ کر، (کرین و فرۆتنا عەینە ئەڤەیە: تو تشتەکی ب بهایەکێ پاشئێخستی بفرۆشی و بکەیە قەر ل سەر وی، و پاشی هەر وی تشتی ب بهایەکێ کێمتر ژ وی بکڕی یێ تە فرۆتییێ) و هەوە کورییێت چێلا گرتن (ئانکو: هوین مانە ب جۆت و کێلانێڤە)، و هوین ب چاندنێ رازی بوون (ئانکو: چاندن بوو خەما هەوە یا تێکێ)، و هەوە جیهاد هێلا، خودێ دێ شکاندن و رەزیلییێ ل سەر هەوە زال کەت، و ب سەر هەوەدا نابەت هەتا هوین دزڤرنە دینێ خۆ).

(٢) ئانکو: نەمینە ب بیستان و باخچانڤە و ئاخرەتێ ژبیر بکەی، و هەڤسەنگییێ بێخە د ناڤبەرا دنیا و ئاخرەتێدا.

## ١٠ـ باب: اقتناء الكلب للحرث

### بابەتێ: خودانکرنا سەی بۆ چاندنێ.

٣١١٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ أَمْسَكَ كَلْباً، فَإِنَّهُ يَنْقُصُ كُلَّ يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قِيرَاطٌ ؛ إِلاَّ كَلْبَ حَرْثٍ، أَوْ ماشِيَةٍ). [خ٢٣٢٢/ م١٥٧٥].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ سەیەکی بۆ خۆ بینیت، ئەو هەروۆژ قیراتەکی ژ کارێ خۆ کێم دکەت، سەیێ بەر چاندن و بەر پەزی نەبیت).**

٣١١٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنِ اقْتَنَى كَلْباً؛ إِلاَّ كَلْباً ضَارِياً لِصَيْدٍ، أَوْ كَلْبَ ماشِيَةٍ، فَإِنَّهُ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ). [خ٥٤٨١ (٥٤٨٠)/ م١٥٧٤].

ژ ئیبن عومەری، خودێ ژ هەردووان رازی بیت گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەر کەسێ سەیەکی بۆ خۆ بینیت سەیێ نێچیرێ و بەر پەزی نەبیت، ئەو هەروۆژ دو قیراتان ژ خێرا خۆ کێم دکەت)**[1].

## ١١ـ باب: إحياء الموات

### بابەتێ: ساخکرنا عەردێ مری و بێخودان.

٣١١٦ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ أَعْمَرَ أَرْضاً لَيْسَتْ لأَحَدٍ فَهُوَ أَحَقُّ). [خ٢٣٣٥]

ژ عائیشایێ (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ عەردەکێ بێ خودان ئاڤەدان بکەت ئەو پتر بۆ وی دکەڤیت).**

٣١١٧ - عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ أَحْيَا أَرْضاً مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ، وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ). [د٣٠٧٣/ ت١٣٧٨]

* صحيح.

ژ سەعیدێ کورێ زەیدی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ عەردەکێ بێ خودان ساخ بکەت ئەو بۆ وییە، و بۆ خودانێ کارێ [1] ستەمکار ماف نینە).**

---

(١) قیرات: ژ تشتێت کێشانێیە، و هەر قیراتەك چار کیلۆیە.

١٢ . باب: من مر على حائط أو ماشية فأصاب منها

**بابەتێ: یێ د بەر بیستانەکی یان پەزەکیرا ببۆریت و تشتەکی ژێ ببەت.**

٣١١٨ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا أَتَيْتَ عَلَى رَاعٍ، فَنَادِهِ ثَلاَثَ مِرَارٍ، فَإِنْ أَجَابَكَ؛ وَإِلاَّ فَاشْرَبْ فِي غَيْرِ أَنْ تُفْسِدَ، وَإِذَا أَتَيْتَ عَلَى حَائِطِ بُسْتَانٍ، فَنَادِ صَاحِبَ الْبُسْتَانِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَإِنْ أَجَابَكَ؛ وَإِلاَّ فَكُلْ فِي أَنْ لاَ تُفْسِدَ). [جه٢٣٠٠].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر تو هاتییە دەڤ شڤانەکی سێ جاران گازی بکەیێ، ئەگەر بەرسڤا تە دا باشە، و ئەگەر نە، شیری بخۆ بێی تو پویچ بکەی، و ئەگەر تو هاتییە دەڤ بیستانەکی سێ جاران گازی خودانێ بیستانی بکە، ئەگەر بەرسڤا تە دا باشە، و ئەگەر نە ژێ بخۆ بێی تو پویچ بکەی).**

١٣ . باب: اتخاذ الماشية

**بابەتێ: خودانکرنا پەزی.**

٣١١٩ - عَنْ أُمِّ هَانِئٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لَهَا: (اتَّخِذِي غَنَماً، فَإِنَّ فِيهَا بَرَكَةً). [جه٢٣٠٤].

* صحيح.

**ژ ئوم هانیئی (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (پەزی خودانکە، ب راستی بەرەکەت یا تێدا).**

١٤ . باب: كسب الحجام

**بابەتێ: حەقدەستێ خوینبەردانێ (حوجامەیێ).**

٣١٢٠ - عَنْ مُحَيِّصَةَ: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِي إِجَارَةِ الْحَجَّامِ، فَنَهَاهُ عَنْهَا، فَلَمْ يَزَلْ يَسْأَلُهُ وَيَسْتَأْذِنُهُ حَتَّى أَمَرَهُ: أَنِ اعْلِفْهُ نَاضِحَكَ وَرَقِيقَكَ. [د٣٤٢٢/ ت١٢٧٧/ جه٢١٦٦].

* صحيح.

---

(١) ئەوە یێ چاندنێ ل عەردێ ئیکێ دی بچینیت یان شتەلەکێ ئەل جهێ خۆ بچینیت یان ئاڤاهیەکێ ل سەر ئەردێ ئیکێ دی ئاڤاکەت و ژ ئەهەقی و ژ زولم ئەڤ کارە ماڤێ ئادەتە وی.

ژ موحەیسەیی (ﷺ): وی دەستویری ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خواست بۆ وەرگرتنا حەقدەستێ خوینبەردانێ، پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدانا وی ژێ کر، بەردەوام داخواز ژێ کر و دەستویری ژێ خواست حەتا فەرمانا وی کری: بدە ب ئالفێ حێشترا خۆ و خوارنا بەندەیێ خۆ.

٣١٢١ - عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ.[جه٢١٦٥].

* صحيح.

ژ ئەبی مەسعودی عوقبەیێ کوڕێ عەمری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان یا ژ حەقدەستێ خوینبەردانێ کری.

# الكتاب الرابع

# الهبات واللقطة

# كتێبا چوارێ

# دیاری و تشتێ دیتی

## ١ ـ باب: القليل من الهدية والهبة

## بابەتێ: كێمییا دیارییێ و دانێ.

٣١٢٢ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لَوْ دعِيتُ إِلَى ذِرَاعٍ، أَوْ كُرَاعٍ لأَجَبْتُ، وَلَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ ذِرَاعٌ أَوْ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ**).[خ٢٥٦٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە ئەز بێمە گازیكرن بۆ پێپكەكی یان ملەكی دێ قەبویل كەم، و هەكە ملەك یان پێپكەك بۆ من بێتە دیاریكرن دێ قەبویل كەم).**

## ٢ ـ باب: المكافأة على الهبة

## بابەتێ: خەلاتكرن ل سەر دیارییێ.

٣١٢٣ - (خ) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ، وَيُثِيبُ عَلَيْهَا. [خ٢٥٨٥].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیاری قەبویل دكر و خەلات ل سەر ددا.**

## ٣ ـ باب: ما لا يرد من الهدية وما يرد

## بابەتێ: ئەو تشتێ نەهێتە زڤراندن و دهێتە زڤراندن ژ دیارییێ.

٣١٢٤ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ كان لاَ يَرُدُّ الطِّيب، وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كانَ لاَ يَرُدُّ الطِّيبَ. [خ٥٩٢٩ (٢٥٨٢)]

**ژ ئەنەسی (ﷺ) وی بێهنخۆشی نەدزڤراند، و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بێهنخۆشی نەدزڤراند.**

## ٤ ـ باب: العِدَة بالهبة

## بابەتێ: ژڤاندان ب دانێ.

٣١٢٥ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لَوْ قَدْ جاءَ مالُ الْبَحْرَيْنِ قَدْ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وهَكَذَا وهَكَذَا**). فَلَمْ يَجِيءْ مالُ الْبَحْرَيْنِ حتَّى قُبِضَ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَلَمَّا جاءَ مالُ الْبَحْرَيْنِ أَمَرَ أَبُو بَكْرٍ فَنَادَى: مَنْ كانَ لَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) عِدَةٌ ، أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِنا، فَأَتَيْتُهُ

فَقُلْتُ: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لِي كَذَا وَكَذَا، فَحَثَى لِي حَثْيَةً، فَعَدَدْتُهَا، فَإِذَا هِيَ خَمْسُمِائَةٍ، وَقَالَ: خُذْ مِثْلَيْهَا. [خ٢٢٩٦/ م٢٣١٤].

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر مالێ بەحرەینێ هاتبا، دا هۆسا و هۆسا و هۆسا دەینە تە)، و مالێ بەحرەینێ نەهات، هەتا پێغەمبەری (ﷺ) وەغەر کری، ڤێجا دەمێ مالێ بەحرەینێ هاتی، ئەبوبەکری فەرمان کر گازی هاتە کرن، هەر کەسێ ژڤانەك یان قەرەك ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) هەبیت بلا بهێتە دەڤ مە، ئەز هاتمە دەڤ و من گۆتێ: ب راستی پێغەمبەری (ﷺ) ئەڤە و ئەڤە یا گۆتییە من، هەردو مستێت خۆ بۆ من پیڤان من هەژمارتن بوونە پێنج سەد، ئینا گۆت: دو جاری هندێ راکە.**

٥ ـ باب: الهبة للولد

**بابەتێ: دانێ بۆ عەیالی.**

٣١٢٦ - (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ: أَنَّ أَبَاهُ أَتَى بِهِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَماً، فَقَالَ: (**أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَ مِثْلَهُ**) ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: (**فَارْجِعْهُ**). [خ٢٥٨٦/ م١٦٢٣].

**ژ نەعمانێ کورێ بەشیری (رضي الله عنهما)، گۆت: بابێ وی ئەو ئینا دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: من خزمەتکارەکێ خۆ یێ دایە ڤی کورێ خۆ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەمی عەیالێت خۆ وەکی ڤی تە دایێ)؟ گۆت: نەخێر، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بزڤرینەڤە)[1].**

٣١٢٧ - عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ، اعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ**). [د٣٥٤٤/ ن٣٦٨٩]

* صحيح.

**ژ نەعمانێ کورێ بەشیری (رضي الله عنهما)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (عەدالەتێ د ناڤبەرا عەیالێت خۆدا بکەن، عەدالەتێ د ناڤبەرا عەیالێت خۆدا بکەن).**

(١) ئانکو: دانا خۆ بزڤرینەڤە.

## ٦ ـ باب: هدية ما يكره لبسه

### بابەتێ: دیاریکرنا تشتێ نەڤیانا ل بەرکرنێ ل سەر.

٣١٢٨ - (ق) عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: أَهْدَى إِلَيَّ النَّبِيُّ (ﷺ) حُلَّةَ سِيَرَاءَ، فَلَبِسْتُهَا، فَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَشَقَقْتُهَا بَيْنَ نِسَائِي. [خ٢٦١٤/ م٢٠٧١].

- وفِي رواية لمسلم: فَقَالَ: (إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ بِهَا إِلَيْكَ، لِتَلْبَسَهَا. إِنَّمَا بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ، لِتُشَقِّقَهَا خُمُراً بَيْنَ النِّسَاءِ).

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) جلکەکێ بەر و بەتەن ئێك و ب ئارمویشی خیچخیچ کری دیاری دا من، ئینا من کرە بەر خۆ، من تۆڕەبوون د ناڤچاڤێت ویڕا دیت، ئینا من د ناڤبەرا ژنێت خۆدا لێکڤە کر[1].**

- **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: گۆت: (من بۆ تە نەهنارتییە بکەیە بەر خۆ، بەلێ من دەرسۆك بۆ تە پێ هنارتی د ناڤبەرا ژناندا کەر بکەی).**

## ٧ ـ باب: هدية المشركين

### بابەتێ: دیارییا هەڤپشکچێکەران.

٣١٢٩ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ يَهُودِيَّةً أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ فَأَكَلَ مِنْهَا، فَجِيءَ بِهَا، فَقِيلَ: أَلاَ نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: (لاَ). فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [خ٢٦١٧/ م٢١٩٠].

**ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: ژنەکا جوهی پەزەکا ژەهرکری دیاری بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا و وی ژی ژێ خوار، و ئەو ژنە گرت و ئینا، گۆتن ئەرێ نەکوژین، گۆت: (نەخێر) بەردەوام من ئەو ژ پانکا دەڤێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دزانی[2].**

٣١٣٠ - عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ قَالَ: أَهْدَيْتُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) نَاقَةً، فَقَالَ: (أَسْلَمْتَ)؟ فَقُلْتُ: لاَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (إِنِّي نُهِيتُ عَنْ زَبْدِ الْمُشْرِكِينَ). [د٣٠٥٧/ ت١٥٧٧].

---

(١) ئاشکەرایە وی د ژیانا پێغەمبەریدا (ﷺ) ژبلی فاتیمایێ چو ژنێت دی نەئینابوون، و هۆسا دیارە مەخسەدا وی د ناڤبەرا ژنێت مالا خۆدا فاتیما ژنا وی و فاتیما کچا ئەسەدی دایکا وی و فاتیما کچا حەمزەیی دۆتماما وی.

(٢) ئانکو: نیشانێت ژەهرێ من ژ پانکا دەڤێ وی دزانی.

* حسن صحيح.

**ژ عيیازێ كورێ حيمارى گۆت: من حێشترەك ديارى دا پێغەمبەرى (ﷺ) ئينا گۆت: (ئەرێ تو موسلمان بووى)؟ من گۆت: نەخێر، ئينا پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (ب راستى پاشڤەلێدانا من ژ دياريیا هەڤپشكچێكەران يا هاتيیە كرن).**

٨ ـ باب: تحريم الرجوع في الهبة

**بابەتێ: حەرامكرنا زڤراندانا دانێ.**

٣١٣١ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(العَائِدُ فِي هِبَتِهِ، كالْكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ)**. [خ٢٥٨٩/ م١٦٢٢].

وفي رواية للبخاري قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الَّذِي يَعُودُ فِي هِبَتِهِ، كالْكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ)**. [خ٢٦٢٢].

**ژ ئيبن عەباسى، خودێ ژ هەردووان رازى بيت، گۆت: پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (ئەوێ ژ دانا خۆ لێڤە ببيت وەكى سەيە ژ دلرابوونا خۆ دزڤريت).**

**و د ڤەگێرەكا بوخاريدا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نموونەيا خراب بۆ مە نەدورستە[1] ئەوێ ژ دانا خۆ لێڤە ببيت وەكى سەيە ژ دلرابوونا خۆ دزڤريت).**

٣١٣٢ - عَنْ عبد الله بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ يَرْجِعْ أَحَدُكُمْ فِي هِبَتِهِ؛ إلاَّ الْوَالِدَ مِنْ وَلَدِهِ)**. [ن٣٦٩١/جه٢٣٧٨]

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللايێ كورێ عەمرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە دياريیا خۆ نەزڤرينيتەڤە يا بابێ بۆ عەيالێ خۆ نەبيت).**

---

(١) سە دهەلاڤێت و جارەكا دى ژ هەلاڤێتنا خۆ دزڤريتەڤە، و ئەڤە نموونەكا خرابە و لايقى موسلمانى نينە ئەڤ نموونە ل دەڤ هەبيت دياريیا خۆ بكەت و پاشى دياريیا خۆ بزڤرينيتەڤە.

## ٩ . باب: هل يشتري صدقته

## بابەتێ: ئەرێ دورستە خێرا خۆ بکڕیت.

٣١٣٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَوَجَدَهُ يُبَاعُ، فَأَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَهُ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**لاَ تَبْتَعْهُ، وَلاَ تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ**). [خ٢٩٧١ (١٤٨٩)/ م١٦٢١].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: عومەری هەسپەك بۆ جیهادێ دابوو هندەکان، ئەو هەسپ دیت یێ دهێتە فرۆتن، ئینا پرسیارا پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ) گۆت: (نەکرە و ل سەدەقا خۆ نەزڤڕە).**

## ١٠ . باب: فضل المنيحة

## بابەتێ: خێرا پێدانا تەرشی بۆ شیری.

٣١٣٤ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَرْبَعُونَ خَصْلَةً، أَعْلاَهُنَّ مَنِيحَةُ الْعَنْزِ، ما مِنْ عامِلٍ يَعْمَلُ بِخَصْلَةٍ مِنْهَا رَجاءَ ثَوَابِهَا، وَتَصْدِيقَ مَوْعُودِهَا؛ إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللهُ بِهَا الجَنَّةَ**). [خ٢٦٣١].

**عەبدوللایێ کوڕێ عەمری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چل خێرن، یا مەزنتر، دانا بزنا ب شیرە[1] نینە کارکەرەك کاری ب ئێك ژ ڤان خێران بکەت هیڤییا خێرا وان، و ب باوەری ب وێ ژڤانا خودێ و پێغەمبەری ل سەر دای، هەکە خودێ وی پێ نەبەتە بەحەشتێ.**

## ١١ . باب: الاستعارة للعروس

## بابەتێ: خواستنێ بۆ بویکان.

٣١٣٥ - (خ) عَنْ أَيمَنَ الحَبَشِيِّ المَكِّيِّ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عائِشَةَ رضي الله عنها، وَعَلَيْهَا دِرْعُ قِطْرٍ، ثَمَنُ خَمْسَةِ دَرَاهِمَ، فَقَالَتِ: ارْفَعْ بَصَرَكَ إِلَى جارِيَتِي، انْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهَا تُزْهى أَنْ تَلْبَسَهُ فِي الْبَيْتِ، وَقَدْ كانَ لِي مِنْهُنَّ دِرْعٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَمَا كانَتِ امْرَأَةٌ تُقَيَّنُ بِالمدِينَةِ؛ إِلاَّ أَرْسَلَتْ إِلَيَّ تَسْتَعِيرُهُ. [خ٢٦٢٨].

---

**(١) بدەیەف ئێکی مفایی بۆ خۆ ژێ ببینیت هندی یا ب شیر بیت، پاشی بۆ تە بزڤرینیت.**

ژ ئەیمەنێ حەبەشی یێ مەکی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز چۆمە دەڤ عائیشایێ (رضي الله عنها) قەمیسەکێ پەمبوی یێ زڤر ل بەر بوو، بهایێ وی پێنج دەرهەم بوون، ئینا گۆت: چاڤێ خۆ بلند بکە، بەرێ خۆ بدە جارییا من، ئەو ژ خۆ ناگریت ل مال بکەتە بەر خۆ، و من قەمیسەك ژ وان ل سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەبوو و کێم ژن هەبوون ل مەدینێ ببانە بویك و هاتبانە خەملاندن ئەگەر نەڤرێکربا دەڤ من بۆ داخواز کربا.

## ١٢ . باب: العمرى والرقبى

### بابەتێ: دانا ب ژیانێڤە گرێدایی و دانا ب مرنێڤە گرێدایی[1].

٣١٣٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْعُمْرَى جائِزَةٌ**).[خ٢٦٢٦/ م١٦٢٦].

- وفي رواية لمسلم: (**مِيرَاثٌ لأَهْلِهَا**).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (دانا ب عومریڤە (ب مرنێڤە) گرێدایی دورستە).**

- **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا: (ئەو میراتە بۆ خودانێت خۆ).**

٣١٣٧ - (ق) عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَضى النَّبِيُّ (ﷺ) بِالْعُمْرَى، أَنَّهَا لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ. [خ٢٦٢٥/ م١٦٢٥]

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**أَيُّمَا رَجُلٍ أُعْمِرَ عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، فَإِنَّهَا لِلَّذِي أُعْطِيَهَا، لاَ تَرْجِعُ إِلَى الَّذِي أَعْطَاهَا، لأَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ**).

---

(١) عومری: دانەکە بەردەوامییا وێ ب ژیانێڤە گرێدایە و ب ژیانێڤە مەرج کرییە، بۆ نموونە: ئێك بێژیتە هەڤالێ خۆ: ئەڤ خانییێ من بۆ تە، هندی ئەز یێ ساخ و د ژیانێدا بم، ئەگەر ئەز مرم ئەو میراتە و دێ زڤریتە میراتخۆران، یان بێژیتێ ئەڤ خانییە بۆ تە، هندی تو یێ ساخ بی و د ژیانێدا بی، بەلێ ئەگەر تو مری دێ زڤریتەڤە بۆ من، چونکی یێ منە.

رەقبی: دانەکا هەلاویستییە و ب مرنێڤە مەرج کرییە، بۆ نموونە: ئێك بێژیتە هەڤالێ خۆ ئەگەر ئەز بەری تە مرم ئەڤ خانییە بۆ تە و ئەگەر تو بەری من مری چونە، دێ هەر مینیت یێ من، ڤێجا هەر ئێك خۆ ل ژڤانا مرنا یێ دی دگریت، خودانێ خانی خۆ ل مرنا هەڤالێ خۆ دگریت ئەگەر مر خانییێ وی یێ ل جهێ خۆ، و یێ دی ژی یێ ل هیڤییا مرنا خودانێ خانی، ئەگەر بەری وی مری ئەو خانی دێ بۆ وی کەڤیت.

ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) حوکم ب دانا عومریڤە گرێدایی کر ئەو بۆ وییە یێ پێ هاتییە دان.

و د ڤەگێڕەکا موسلمیدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر مرۆڤەکێ دانا ب عومریڤە گرێدایی بۆ وی و بێت پشتی وی بهێتە دان، ئەو بۆ وییە یێ بۆ هاتییە دان، و بۆ وی یێ دان دایی ناهێتە زڤراندن، چونکی وی دانەك دا، میراتگری پێڤە هاتە گرێدان).**

## ١٣ . باب: الرجل يهدي لمن شفع له

## بابەتێ: مرۆڤ دیارییەکێ بدەتە وی یێ بەرمڤانی بۆ کری.

٣١٣٨ – عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ شَفَعَ لِأَخِيهِ بِشَفَاعَةٍ، فَأَهْدَى لَهُ هَدِيَّةً عَلَيْهَا فَقَبِلَهَا، فَقَدْ أَتَى بَاباً عَظِيماً مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا).** [د٣٥٤١].

* حسن. وقال شعيب: منكر.

ژ ئەبی ئومامەیی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ بەرمڤانییەکێ بۆ برایێ خۆ بکەت و ئەو دیارییەکێ بەرامبەر بدەتێ، و وی قەبویل کر، ب راستی وی بەرێ خۆ دا دەرگەهەکێ مەزن ژ دەرگەهێت سەلەفێ).**

## ١٤ . باب: الحث على التهادي

## بابەتێ: پالدان ل سەر پێشکێشکرنا دیارییان بۆ ئێکدو.

٣١٣٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(تَهَادُوْا تَحَابُّوا).** [هق٦/١٦٩].

* قال في «المقاصد: حسن».

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دیارییا بدەنە ئێکدو و حەژ ئێکدو بکەن)**[1].

## ١٥ . باب: من وجد لقطة فليعرفها

## بابەتێ: یێ تشتەکی ببینیت بلا بدەتە نیاسین.

٣١٤٠ – (ق) عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ سَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ وَزَيْدِ بْنِ صُوحانَ فِي غَزَاةٍ، فَوَجَدْتُ سَوْطاً، فَقَالاَ لِي: أَلْقِهِ، قُلْتُ: لاَ، وَلكِنْ إِنْ وَجَدْتُ صَاحِبَهُ وَإِلاَّ اسْتَمْتَعْتُ بِهِ. فَلَمَّا رَجَعْنَا

---

(١) ئانکو: دیاری دێ بیتە ئەگەرێ پەیدابوونا حەژێکرنێ د ناڤبەرا هەوەدا.

حَجَجْنَا، فَمَرَرْتُ بِالمَدِينَةِ، فَسَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ رضي الله عنه فَقَالَ: وَجَدْتُ صُرَّةً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) فِيهَا مِائَةُ دِينَارٍ، فَأَتَيْتُ بِهَا النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقَالَ: (**عَرِّفْهَا حَوْلاً**). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُ، فَقَالَ: (**عَرِّفْهَا حَوْلاً**). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: (**عَرِّفْهَا حَوْلاً**). فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، ثُمَّ أَتَيْتُهُ الرَّابِعَةَ فَقَالَ: (**اعْرِفْ عِدَّتَهَا، وَوِكَاءَهَا، وَوِعَاءَهَا، فَإِنْ جاءَ صَاحِبُهَا، وَإِلاَّ اسْتَمْتِعْ بِهَا**).[خ٢٤٣٧ (٢٤٢٦)/ م١٧٢٣].

**ژ سووەیدێ کورێ غەفلەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل خەزایەکێ د گەل سەلمانێ کورێ رەبیعە و زەیدێ کورێ سوحان بووم، من قامچییەك دیت، هەردوکان گۆتە من: باڤێژە، من گۆت: نەخێر، بەلێ ئەگەر من خودانێ وی دیت باشە، و ئەگەر نە دێ مفایی ژێ بینم، ڤێجا دەمێ ئەم زڤرین مە حەج کر و ئەم د مەدینەیێرا بۆرین و من پرسیارا ئوبەیێ کورێ کەعبی (رضي الله عنه) کر، ئینا گۆت: من کیسکەك ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) دیت، سەد دینار تێدا بوون، و من ئینانە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: (سالەکێ بدە نیاسین) من سالەکێ دا نیاسین پاشی ئەز هاتم، ئینا گۆت: (سالەکێ بدە نیاسین) من سالەکێ دا نیاسین پاشی ئەز هاتمە دەڤ، ئینا گۆت: (سالەکێ بدە نیاسین) من سالەکێ دا نیاسین، پاشی ئەز بۆ جارا چوارێ هاتمە دەڤ، ئینا گۆت: (هژمار و بەندکێ کیسکی و کیسکی ب خۆ ژی بزانە ئەگەر خودانێ وی هات باشە و ئەگەر نە مفایی ژێ ببینە).**

## ١٦ ـ باب: ضالة الإبل والغنم

## بابەتێ: حێشتر و پەزێ بەرزەبوویی.

٣١٤١ - (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ خالِدٍ رضي الله عنه قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: (**اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جاءَ صَاحِبُهَا؛ وَإِلاَّ فَشَأْنَكَ بِهَا**).

قَالَ: فَضَالَّةُ الْغَنَمِ؟ قَالَ: (**هِيَ لَكَ، أَوْ لأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ**).

قَالَ: فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ قَالَ: (**ما لَكَ وَلَهَا، مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ المَاءَ، وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا**). [خ٢٣٧٢ (٩١)/ م١٧٢٢].

ژ زەیدێ کورێ خالدی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پرسیارا تشتێ دیتی ژێ کر؟ ئینا گۆت: **(کیسکی و بەنکێ کیسکی بزانە، پاشی سالەکێ بدە نیاسین، و ئەگەر خودانێ وی هات باشە، ئەگەر نە ئەو بۆ تەیە).**

فوزالەیی گۆت: پا پەزێ بەرزەبویی؟ گۆت: **(ئەو بۆ تەیە، یان بۆ برایێ تەیە، یان بۆ گورگییە).**

فوزالەیی گۆت: پا حێشترا بەرزەبویی؟ گۆت: **(تە چ هەوجەیی سەرگێژییێ هەیە، ئاڤ و پێلاڤا وێ یا د گەل، و ئەو دچیتە سەر ئاڤێ و چەرەی دخۆت هەتا خودانێ وێ ببینیت).**

١٧ ـ باب: لقطة الحرم.

**بابەتێ: تشتێ ل مەکەهێ دهێتە دیتن.**

٣١٤٢ – (م) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ التَّيْمِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ لُقَطَةِ الْحَاجِّ. [م١٧٢٤].

زاد عند أبي داود: قَالَ أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ: قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: يَعْنِي فِي لُقَطَةِ الْحَاجِّ، يَتْرُكُهَا حَتَّى يَجِدَهَا صَاحِبُهَا. [د١٧١٩].

[وانظر: ٢٠٤٥] .

ژ عەبدولرەحمانێ کورێ عوسمانێ تەیمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدانا ژ هەلگرتنا بەرزەبوویێ حەجێ کری.

و ل دەڤ ئەبی داوودی ئەڤە زێدە بوویە: ئەحمەدێ کورێ سالحی گۆت: ئیبن وەهبی گۆت: ئانکو بەرزەبوویێ حەجێ ناهێتە هەلگرتن هەتا خودانێ وی دبینیت.

١٨ ـ باب: لقطة ما لا يلتفت إليه

**بابەتێ: هەلگرتنا بەرزەبوویێ بەرنەکەفتی.**

٣١٤٣ ـ عن جَابِرِ بن عبد اللَّهِ قال رَخَّصَ لنا رسول اللَّهِ (ﷺ) في الْعَصَا وَالسَّوْطِ وَالْحَبْلِ وَأَشْبَاهِهِ يَلْتَقِطُهُ الرَّجُلُ يَنْتَفِعُ بِهِ. [د١٧١٧][1].

---

(١) شێخ سالحێ شامی ئەڤ فەرمووده هەر ب وێ ژمارێ د مالپەرێ خۆدا ئینایە، چونکی یا دی یا لاوازە:

- ضعيف.

**ژ جابرێ کوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د داری و قامچی و کنفێدا و پێت وەکی وان دەستویری دا مە زەلام راکەت مفایی ژێ ببینیت.**

## ١٩ ـ باب: التحذير من أخذ اللقطة

## بابەتێ: هۆشداریکرن ژ هەلگرتنا تشتێ بەرزە.

٣١٤٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ**).[جه٢٥٠٢].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ شیخیری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەرزەبوویێ موسلمانی سۆتنا ئاگرییە)[1].**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

٣١٤٣ – عن أبي سعيد الخدري: أنَّ عليَّ بنَ أبي طالبٍ وجدَ ديناراً، فأتى بِهِ فاطمةَ، فسألت عنهُ رسُولَ اللهِ (ﷺ) فقال: (**هوَ رِزْقُ اللهِ عزّ وجل**) فأكلَ منه رسُولُ اللهِ (ﷺ)، وأكلَ عليٌّ وفاطمةُ، فلما كانَ بعدَ ذلك، أتتهُ امرأةٌ تَنْشُدُ الدِّينارَ، فقالَ رسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يا عليُّ أدِّ الدِّينار**) .[د١٧١٤].

* حسن.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: عەلییێ کوڕێ ئەبی تالبی دینارەك دیت، ئینا داڤ فاتیمایێ و وێ پرسیارا ڤێ چەندێ ژ پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ) ئینا گۆت: **(رزقەکە خودایێ هەر ب هێز و مەزن بۆ تە ئینایی)**، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژێ خوار و عەلی و فاتیمایێ ژی، ڤێجا پشتی خواری ژنەك هات ل دیناری دگەریا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ئەی عەلی: (دیناری بدەیێ).

(١) ئانکو: یێ تشتێ بەرزەبوویێ موسلمانی ببینیت و ڤەشێریت و نەدەتە نیاسین دا بۆ خۆ بهەلگریت ئەڤە هەژییە وی بەرهنگاری سۆتنا ئاگری بکەت.

# الكتاب الخامس

# المظالم والغصب

# کتێبا پێنجێ

# مافخوارن و داگیرکاری

## ١ ـ باب: الظلم ظلمات يوم القيامة

## بابەتێ: ستەم و زۆرداری رۆژا قیامەتێ تاریستانن.

٣١٤٥ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (اتَّقُوا الظُّلْمَ! فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَاتَّقُوا الشُّحَّ! فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ). [م٢٥٧٨].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خۆ ژ ستەمكارییێ بپارێزن، ب راستی ستەم و زۆرداری رۆژا قیامەتێ تاریستانن، و خۆ ژ قەلساتییێ بپارێزن، ب راستی قەلساتییێ یێت بەری هەوە د هیلاك برن، قەلساتییێ وەل وان كر، ئەو خوینا ئێك و دو برێژن و شەرمڤا ئێك و دو یان مالێ ئێك و دو بۆ خۆ دورست كرن).**

## ٢ ـ باب: تحريم الظلم.

## بابەتێ: حەرامكرنا زۆرداریێ.

[انظر الحديث القدسي (يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي]: ٣٠

وانظر في اليمين الغموس: ٢٣٠٦.

وانظر المسلم أخو المسلم لا يظلمه: ٣٤٤٧.

وانظر: ٣٤٩٧].

## ٣ ـ باب: الحث على التحلل من المظالم.

## بابەتێ: پالدان بۆ گەردەن ئازاكرنێ ل سەر ستەم و مافخوارنان.

٣١٤٦ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ، فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ، قَبْلَ أَنْ لاَ يَكُونَ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ). [خ٢٤٤٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ ستەمكارییەكا برایێ وی ل دەڤ هەبیت، ژ نامویسا وی یان ژ هەر تشتەكێ بیت، بلا ئەڤرۆ خۆ ژێ خلاس كەت، بەری دینار و دەرهەم نەبن، هەكە كارەكێ باش هەبیت،**

تەممەت ستەمكارییا وی دێ ژێ هێتە ستاندن، و هەكە باشی و خێر نەبن، گونەهێت هەڤالێ وی دێ هێنە هەلگرتن، و دێ هاڤێژنە سەر وی).

## ٤ ـ باب: عقوبة الظالم

## بابەتێ: سزایێ زۆرداری.

٣١٤٧ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ اللهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ، حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ) ، قال: ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِيَ ظَـٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ [هود] .　　　　[خ٤٦٨٦/ م٢٥٨٣].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ دویڤ ستەمكاریڕا بەرددەت و گیرۆ دكەت[1] و هەكە ئیزا دا، ئیزای ل سەر ناراكەت و ژ ئیزای رزگار نابیت. پاشی خواند، ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِيَ ظَـٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾[2].

## ٥ ـ باب: دعوة المظلوم

## بابەتێ: دوعایا ستەملێكری.

٣١٤٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) بَعَثَ مُعَاذاً إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ: (اتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ حِجَابٌ).　　　　[خ٢٤٤٨ (١٣٩٥)/ م١٩].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) مەعاز هنارتە یەمەنێ و گۆت: (خۆ ژ دوعایا ستەملێكری بپارێزە، ب راستی چو پەردە مابەینا وێ و خودێ نینن).

---

(١) نانكو: ئێكسەر و دەملدەست تۆلێ ژێ ڤەناكەت.

(٢) رامانا نایەتێ ب كورتی: و هۆسا ئیزادانا خودایێ تە، خەلكێ وان گوندان دگریت وەختێ ئەو ستەمكار، ب راستی ئیزادانا خودایێ تە زێدە ب ژان و گرانە.

## ٦ ـ باب: إثم من ظلم شيئاً من الأرض

### بابەتێ: گونەها وی کەسێ د عەردیدا ب داگیرکرنێ ستەمەك کربیت.

٣١٤٩ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ ظَلَمَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئاً طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ). [خ٢٤٥٢/ م١٦١٠].

**ژ سەعیدێ کورێ زەیدی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر کەسێ تشتەکێ[1] ستەمێ د عەردیدا بکەت[2] خودێ دێ حەفت تەخێت عەردی ئێخیتە ستۆیێ وی)[3].**

٣١٥٠ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عمر رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (مَنْ أَخَذَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئاً بِغَيْرِ حَقِّهِ، خُسِفَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ). [خ٢٤٥٤].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ ب نەحەقی تشتەکی ژ عەردی ببەت رۆژا قیامەتێ دێ د ناڤ حەفت عەرداندا چیتە خواری).**

## ٧ ـ باب: نصرة المظلوم

### بابەتێ: هاریکاری و سەرئێخستنا ستەملێکری.

٣١٥١ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِماً أَوْ مَظْلُوماً)، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُوماً، أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالِماً كَيْفَ أَنْصُرُهُ؟ قَالَ: (تَحْجُزُهُ ـ أَوْ تَمْنَعُهُ ـ مِنَ الظُّلْمِ، فَإِنَّ ذلِكَ نَصْرُهُ). [خ٦٩٥٢ (٢٤٤٣)].

- وفي رواية: (تَأْخُذُ فَوْقَ يَدَيْهِ). [خ٢٤٤٤].

---

(١) بهۆستەك بیت یان پتر یان کێمتر.

(٢) ئانکو: عەردی ژ نەحەقی زەبکەت.

(٣) ئانکو: یان دێ هێتە فەرمانکرن هندی وی عەردی هەتا حەفت تەخان بهەلگریت، یان خودێ دێ ستۆیێ وی درێژ کەت و وەکی تۆکێ حەفت تەخێت عەردی ئێخیتە ستۆیێ وی، یان ژی گونەهێ دێ ئێخیتە ستۆیێ وی و دێ ب ستۆیێ ویڤە مینیت هەروەکی تۆك ب ستۆیڤە دمینیت.

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هاریكارییا برایێ خۆ بكە و سەربێخە یێ ستەمكار بیت یان یێ ستەملێكری بیت)**، زەلامەكی گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ ئەز دێ هاریكارییا وی كەم هەكە یێ ستەملێكری بیت، بێژە من هەكە یێ ستەمكار بیت، چاوا دێ هاریكارییا وی كەم؟! گۆت: **(دێ ڤەگری یان دەیە پاش ژ ستەمێ، ئەڤە هاریكرنە بۆ وی)**.

- و د ڤەگێرەكێدا: **(ل سەر هەردو دەستێت وی بگری)**.

٨ ـ باب: لا ضرر ولا ضرار.

**بابەتێ: زیان هەمی نەیا دورستە و زیان نابیت بكەڤیتە بەرامبەر زیانێ.**

٣١٥٢ - عَنْ أَبِي صِرْمَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ ضَارَّ ضَارَّ اللهُ بِهِ، وَمَنْ شَاقَّ شَاقَّ اللهُ عَلَيْهِ). [د٣٦٣٥/ ت١٩٤٠/ جه٢٣٤٢]

* حسن.

ژ ئەبی سەیرەمەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ زیانگەهین بیت خودێ دێ زیانێ گەهینیتێ، و هەر كەسێ گرانبها و زەحمەتخواز بیت خودێ دێ ل سەر زەحمەت و گران كەت)**.

٣١٥٣ - عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَضَى أَنْ لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ. [جه٢٣٤٠]

* صحيح. وقال في (الزوائد): منقطع.

ژ عوبادەیێ كورێ سامتی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان كر زیان هەمی نەیا دورستە و زیان نابیت بكەڤیتە بەرامبەر زیانێ.

# الكتاب السادس

# العتق والمكاتبة

# كتێبا شەشێ

# ئازاكرن و رێككەفتنا ئازاكرنێ ب گرێبەستێ

١ ـ باب: فضل العتق

**بابەتێ: خێرا ئازاکرنێ.**

٣١٥٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمَاً، اسْتَنْقَذَ اللهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْواً مِنْهُ مِنَ النَّارِ). [خ٢٥١٧/ م١٥٠٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر مرۆڤەکێ مرۆڤەکێ موسلمان (ژ کۆلەیان) ئازا بکەت، خودێ دێ ب هەر ئەندامەکێ وی ئەندامەکێ وی ژ ئاگری رزگار کەت).**

٣١٥٥ - عَنْ عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) .: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) سُئِلَ عَنِ الرِّقَابِ أَيُّهَا أَفْضَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَغْلاَهَا ثَمَناً، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا). [ط١٥١٨].

* إسناده صحيح.

**ژ عائیشایێ ـ هەڤژینا پێغەمبەری (رضي الله عنها) ـ گۆت: پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە کرن کیژ کۆلە (عەبد) بۆ ئازاکرنێ چێترە؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ ب بهاتر و ل دەڤ خودانێ خۆ ب قەدرتر).**

٢ ـ باب: عتق العبد المشترك

**بابەتێ: ئازاکرنا کۆلەیێ ب هەڤپشکاتی**

٣١٥٦ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ أَعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ، فَكَانَ لَهُ مالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ، قُوِّمَ الْعَبْدُ عليهِ قِيمَةَ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ العبدُ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ). [خ٢٥٢٢ (٢٤٩١)/ م١٥٠١].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ بارا خۆ ژ کۆلەیەکێ ب هەڤپشکاتی ئازا بکەت، و وی هند مال هەبیت بگەهیتە بهایێ کۆلەی، ئەو کۆلە ب بهایەکێ دادپەروەری تێدا دێ بۆ هێتە هژمارتن، و دێ پشکا هەڤپشکان دەت و کۆلە دێ ل سەر هندێ ئازا بیت، و ئەگەر وی ئەو مال نەبیت دێ هند ئێتە ئازاکرن یا وی ژ بارا خۆ ئازا کری).**

### ٣ . باب: إنما الولاء لمن أعتق

### بابەتێ: ب راستی پشتەڤانی بۆ وییە یێ ئازا دكەت.

٣١٥٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أَرَادَتْ عَائِشَةُ أَنْ تَشْتَرِيَ جَارِيَةً تُعْتِقُهَا، فَأَبَى أَهْلُهَا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الوَلاَءُ، فَذَكَرَتْ ذلِكَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَقَالَ: (**لاَ يَمْنَعُكِ ذَلِكِ، فَإِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ**). [م١٥٠٥].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: عائیشایێ دڤیا جارییەكێ بكڕیت و ئازا بكەت، خودانێت وێ رازی نەبوون ب هندێ نەبیت پشتەڤانیا وێ بۆ وان بیت، ئینا ئەڤ چەندە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەگێرا، ئینا گۆت: (بلا ئەو رێگرییێ ل تە نەكەت، ب راستی پشتەڤانی بۆ وییە یێ ئازا دكەت).**

### ٤ . باب: فضل من أدب جاريته

### بابەتێ: خێرا وی یێ جارییا خۆ تۆرە بدەت.

٣١٥٨ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**ثَلاَثَةٌ لَهُمْ أَجْرَانِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ (ﷺ). وَالْعَبْدُ المَمْلُوكُ إِذَا أَدَّى حَقَّ اللهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ. وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ يَطَؤُهَا، فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ**). [خ٩٧/ م١٥٤].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێ كەسان دو خێر بۆ وانن، زەلامەك ژ خودان كتێبان باوەری ب پێغەمبەرێ خۆ ئینابیت و باوەری ب موحەممەدی ئینابیت، و بەندەیێ كۆلە هەكە مافێ خودێ دا، و مافێ سەركارێ خۆ دا، و زەلامەكی جارییەك هەبیت تۆرە بدەت و باش تۆرە بدەت و نیشا بدەت و باش نیشا بدەت پاشی ئازا بكەت و مارە بكەت دو جارا خێر بۆ وینە).**

### ٥ . باب: ثواب العبد إذا أحسن عبادته ونصح سيده

### بابەتێ: خێرا كۆلەیی ئەگەر پەرستنا خۆ باش بكەت و دلسۆزییێ د گەل خودانێ خۆ بكەت.

٣١٥٩ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (**الْعَبْدُ إِذَا نَصَحَ سَيِّدَهُ، وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ، كانَ لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ**). [خ٢٥٤٦/ م١٦٦٤].

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر کۆلەیی دلسۆزی د گەل خودانێ خۆ کر و پەرستنا خودایێ خۆ باش کر دو جارا خێر بۆ وینە).**

٦ ـ باب: طعام المملوك وعمله

**بابەتێ: خوارنا کۆلەیی و کارێ وی.**

٣١٦٠ - (ق) عَنِ المعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ، وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ، وَعَلى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلاً فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ، فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(يَا أَبَا ذَرٍّ، أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ! إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ، فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلبَسُ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ).** [خ٣٠/ م١٦٦١].

ژ مەغرورێ کورێ سوومەیدی، گۆت: من ئەبی زەرٍ دیت (ﷺ) جلکەکێ بەر و بەتن ژ ئێك ل بەر وی و خزمەتکارێ وی بوو وەکی ئێك، من پرسیارا هندێ ژێ کر، گۆت: وی ل سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەبەر گۆتبوونە زەلامەکی، و ب دایکا وی عەیبدار کربوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەی ئەبا زەرٍ ب راستی تو مرۆڤەکی رەوشتەکی نەزانینێ یێ ل دەڤ تە هەی، ئەو برایێت هەومنە، و خزمەتکارێت هەومنە، خودێ یێت ئێخستینە بن دەستێت هەوەڤە، ڤێجا هەر ئێکێ برایێ وی بن دەستێ ویڤە بیت بلا ژ وێ خوارنا دخۆت بدەتێ و ژ وی جلکێ دکەتە بەر خۆ بکەتە بەر وی. و کارێ نەشێن پێ نەکەن، و هەکە هەوە پێ کر هاریکارییا وان بکەن).**

٣١٦١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: **(لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ. وَلاَ يُكَلَّفُ مِنَ الْعَمَلِ؛ إِلاَّ مَا يُطِيقُ).** [م١٦٦٢].

ژ ئەبو هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وی گۆت: **(کۆلەی خوارنا خۆ و جلکێ خۆ دڤێت هەبن، و چو کار ژێ ناهێنە داخوازکرن ئەو نەبیت بشێت بکەت).**

٧ ـ باب: كفارة من ضرب عبده

**بابەتێ: کەفارەتا یێ کۆلەیێ خۆ بقوتیت.**

٣١٦٢ - (م) عَنْ زَاذَانَ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ دَعَا بِغُلاَمٍ لَهُ، فَرَأَى بِظَهْرِهِ أَثَراً، فَقَالَ لَهُ: أَوْجَعْتُكَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَأَنْتَ عَتِيقٌ.

قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ شَيْئاً مِنَ الأَرْضِ فَقَالَ: مَا لِي فِيهِ مِنَ الأَجْرِ مَا يَزِنُ هَذَا. إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ ضَرَبَ غُلاَماً لَهُ، حَدّاً لَمْ يَأْتِهِ، أَوْ لَطَمَهُ، فَإِنَّ كَفَّارَتَهُ أَنْ يُعْتِقَهُ). [م١٦٥٧].

**ژ زازانی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عومەری گازی خزمەتكارەكێ خۆ یێ كۆلە كر، نیشان ل پشتا وی دیتن، ئینا گۆتێ: ئەرێ من تو ئێشاندی؟ گۆت: نەخێر، گۆتێ: تو یێ ئازاكری.**

**گۆت: پاشی تشتەك ژ عەردی راكر و گۆت: تەمەت كێشا ڤێ ب ئازاكرنا وی خێر بۆ من ناهێتە نڤیسین، ب راستی من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر كەسێ خزمەتكارەكێ خۆ سزا بدەت ل سەر حەددەكێ نەكری، یان بقوتیت، ب راستی گونەهژێبرنا وی ئەوە ئەو وی ئازا بكەت).**

٨ ـ باب: لا يقل عبدي وأَمتي.

**بابەتێ: نەبێژیت كۆلەیێ من و كۆلەیا من.**

٣١٦٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، اسْقِ رَبَّكَ، وَلْيَقُلْ: سَيِّدِي مَوْلاَيَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي أَمَتِي، وَلْيَقُلْ: فَتَايَ وَفَتَاتِي وَغُلاَمِي). [خ٢٥٥٢/ م٢٢٤٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) وی گۆت: (كەس ژ هەوە نەبێژیت خوارنێ بدە خودانێ خۆ، و ئاڤا دەستنڤێژێ بۆ خودانێ خۆ بەرهەڤ بكە، و ئاڤێ بدە خودانێ خۆ، و بلا بێژیت: سەرداری من و مەزنێ من، و بلا ئێك ژ هەوە نەبێژیت: بەندەیێ من و بەندەیا من، و بلا بێژیتێ: گەنجێ من و گەنجا من و خزمەتكارێ من).**

# المقصد السابع

# الإمامة وشؤون الحكم

# مەبەستا حەفتێ

# فەرمانداری و کاروبارێت فەرمانداریێ

# الكتاب الأول

# الإمامة العامة وأحكامها

# كتێبا ئێكێ

# فەرمانداریيا گشتى و فەرمانێت وێ

## ١ . باب: الطاعة للإمام في غير معصية

## بابەتێ: گوهداریيا حاكمداری نە د گونەهێدا.

٣١٦٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى المَرْءِ المُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ).[خ٧١٤٤ (٢٩٥٥)/ م١٨٣٩].

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ل سەر مرۆڤێ موسلمان پێدڤییە گوهدان و گوهداریێ بکەت، د تشتێ پێ خۆش و نەخۆشدا، ژبلی فەرمانا وی ب گونەهێ بێتە کرن، هەکە ب گونەهێ هاتە فەرمانکرن، نەگوهدان و نەگوهداری ل سەرە).**

٣١٦٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ، وَمَنْ عصَانِي فَقَدْ عَصى اللهَ، وَمَنْ يُطِعِ الأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي، وَإِنَّمَا الإِمامُ جُنَّةٌ، يُقَاتَلُ مِنْ وَرَائِهِ وَيُتَّقَى بِهِ، فَإِنْ أَمَرَ بِتَقْوَى اللهِ وَعَدَلَ فَإِنَّ لَهُ بِذلِكَ أَجْراً، وَإِنْ قالَ بِغَيْرِهِ فَإِنَّ عَلَيْهِ مِنْهُ).** [خ٢٩٥٧/ م١٨٣٥، ١٨٤١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ گوهداریيا من کر، ب راستی وی گوهداریيا خودێ کر، و یێ نەگوهداریيا من کر، ب راستی وی نەگوهداریيا خودێ کر، و یێ گوهداریيا میری کر، ب راستی وی گوهداریيا من کر، و یێ نەگوهداریيا میری کر، ب راستی وی نەگوهداریيا من کر، فەرماندار مەتال و پاراستنە[1] د گەل وی شەڕێ نەیاران دهێتە کرن و ب وی خۆپارێزی[2] دهێتە کرن، ئەگەر وی دادپەروەری کر ب راستی بۆ وی ب ڤێ چەندێ خێر یا هەی، و ئەگەر ب تشتەکێ دی فەرمان کر ب راستی ژ وێ گونەه ل سەر وییە).**

٣١٦٦ - (ق) عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (ﷺ) سَرِيَّةً، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ، فَغَضِبَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: أَلَيْسَ قَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ تُطِيعُونِي؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: قَدْ عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ لَمَا جَمَعْتُمْ حطَباً وَأَوْقَدْتُمْ ناراً، ثُمَّ دَخَلْتُمْ فِيهَا. فَجَمَعُوا حَطَباً، فَأَوْقَدُوا ناراً، فَلَمَّا

---

**(١) هەوە ژ خرابیيا دژمنی و ژ خرابیيا نێکدو و ژ هەمی خرابییان دپارێزیت.**

**(٢) ژ خرابیيا دژمن و خرابان و ستەما ستەمکاران.**

هَمُّوا بِالدُّخُولِ، فَقَامُوا يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، قَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّمَا تَبِعْنَا النَّبِيَّ (ﷺ) فِرَاراً مِنَ النَّارِ، أَفَنَدْخُلُهَا؟ فَبَيْنَما هُمْ كَذلِكَ إِذْ خَمَدَتِ النَّارُ، وَسَكَنَ غَضَبُهُ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: **(لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا أَبَداً، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي المَعْرُوفِ).** [خ٧١٤٥ (٤٣٤٠)/ م١٨٤٠].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) قۆلەك هنارت و زەلامەك ژ ئەنساران کرە سەرداراریێ وان، و فەرمانا وان کر گوهدارییا وی بکەن، ئینا ژ وان تۆڕە بوو و گۆت: ما پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا هەوە نەکرییە هوین گوهێ خۆ بدەنە من؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: من هوین دانە سویندێ یان فەرمانێ ل هەوە دکەم، هوین دارا کۆم بکەن و ئاگرەکی هەلکەن و پاشی بچنە د ناڤدا، ئینا دار کۆم کرن و ئاگرەك هەل کرن، ڤێجا دەمێ کرینە دلێ خۆ بچنە د ناڤدا، رابوون هندەکان بەرێ خۆ دا هندەکێت دی، و هندەکا ژ وان گۆت: ب راستی رەڤین ژ ئاگری ئەم یێت گەهشتینە پێغەمبەری (ﷺ)، ڤێجا ئەرێ بچینە د ناڤدا؟! ڤێجا دەمێ ئەو د هۆسا، ئاگر سار بوو و تۆڕەبوونا وی هاتە خوارێ، ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە گۆتن: ئینا گۆت: (ئەگەر ئەو چۆبانە د ناڤدا د بنیڕا ژێ نەدهاتنە دەر، ب راستی گوهداری یا د گوهدارییا فەرمانا خودێ و پێغەمبەری ب تنێدا)[1].**

## ٢ ـ باب: صلاح الأمة باستقامة أئمتها

### بابەتێ: چاکییا ئوممەتێ یا د چاکییا بەردەوامدا یا فەرمانداریێت وان.

٣١٦٧ - (خ) عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حازِمٍ قَالَ: دخَلَ أَبُو بكْرٍ عَلَى امْرَأَةٍ مِنْ أَحْمَسَ يُقَالُ لَهَا: زَيْنَبُ، فرَآهَا لاَ تَكَلَّمُ، فَقَالَ: ما لَهَا لاَ تَكَلَّمُ؟ قالُوا: حَجَّتْ مُصْمِتَةً، قالَ لَهَا: تَكَلَّمِي، فَإِنَّ هَذَا لاَ يَحِلُّ، هَذَا مِنْ عَمَلِ الجَاهِلِيَّةِ، فَتَكَلمَتْ، فَقَالَتْ: مَنْ أَنْتَ؟ قالَ: امْرُؤٌ مِنَ المهَاجِرِينَ، قالَتْ: أَيُّ المهَاجِرِينَ؟ قالَ: مِنْ قُرَيْشٍ، قالَتْ: مِنْ أَيِّ قُرَيْشٍ أَنْتَ؟ قالَ: إِنَّكِ لَسَؤُولٌ، أَنَا أَبُو بَكْرٍ، قالَتْ: ما بَقَاؤُنَا عَلَى هَذَا

---

(١) هەر کەسێ فەرمانەکێ بکەت خوندکار بیت فەرمانداریێ تایبەت بیت یان یێ گشتی بیت گوهدارییا وی راوەستایە ل سەر فەرمانا ئەو دکەت کا چەند د گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ ویدایە، ئەگەر فەرمان ب باشییێ کر گوهدارییا وی ل سەر خەلکی ئەرکە، و ئەگەر نە ب راستی گوهداری بۆ کەسێ د نەگوهدارییا خودێ و پێغەمبەریدا نینە، و فەرمانداریێ فەرمانێ ب گونەهێ دکەت، نە گوهدان بۆ وی هەیە و نە گوهداری.

ـأَمْرِ الصَّالِحِ الَّذِي جاءَ اللهُ بِهِ بَعْدَ الجَاهِلِيَّةِ؟ قالَ: بَقَاؤُكُمْ عَلَيْهِ مَا اسْتَقَامَتْ بِكُمْ أَئِمَّتُكُمْ، قالَتْ: وَما ـأَئِمَّةُ؟ قالَ: أَمَا كانَ لِقَوْمِكِ رُؤُوسٌ وَأَشْرَافٌ، يَأْمُرُونَهُمْ فَيُطِيعُونَهُمْ؟ قَالَتْ: بَلَى، قالَ: فَهُمْ أُولئِكِ عَلَى ـنَّاسِ. [خ٣٨٣٤].

**ژ قەیسێ کورێ ئەبی حازمی (ﷺ) گۆت: ئەبوبەکر چۆ دەڤ ژنەکێ ژ ئەحمەسان[1] د گۆتنێ زەینەب، دیت نائاخڤیت، ئینا گۆت: وێ خێرە نائاخڤیت؟ گۆتن: نەزر یا کری حەجێ ب بێدەنگی بکەت و نەئاخڤیت، ئینا گۆتێ: باخڤە ئەڤە نەیا دورستە، ئەڤە ژ کارێ نەزانینێیە، ئینا ئاخفت و گۆت: تو کی؟ گۆت: مرۆڤەکم ژ مشەختان، وێ گۆت؟ ژ کیژ مشەختان؟ گۆت: ژ قورەیشییان، وێ گۆت: تو ژ کیژ قورەیشییانی؟ گۆت: ب راستی تو گەلەکا پرسیارکەری، ئەز ئەبوبەکرم، ئینا وێ گۆت: ئەم دێ چەند ل سەر ڤێ باشییێ مینین ئەوا خودێ پشتی نەزانینێ ئینایی؟ گۆت: دێ هند مینن هندی فەرماندارێت هەوە ل سەر باشییێ د بەردەوام بن، وێ گۆت: فەرماندار کینە؟ گۆت: ما هۆزا تە سەر و ماقویل نەبوون، فەرمانا وان دکرن و وان گوهدارییا وان دکرن؟ وێ گۆت: بەلێ، گۆت: ئها ئەو ئەون یێت ل سەر خەلکی.**

### ٣ ـ باب: مسؤولية الإمام

### بابەتێ: بەرپرساتییا فەرمانداری.

٣١٦٨ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فالإمامُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ وَهْوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهْوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ على أَهْلِ بَيْتِ زَوْجِهَا وَوَلَدِهِ وَهِيَ مَسْؤُولَةٌ عَنْهُمْ، وَعَبْدُ الرَّجُلِ رَاعٍ عَلَى مالِ سَيِّدِهِ وَهْوَ مَسْؤُولٌ عَنْهُ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ). [خ٧١٣٨ (٨٩٣)/ م١٨٢٩].

**ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بزانن هوین هەمی چاڤدێر و پارێزەرن، و هوین هەمی بەرپرسن ژ یێت ژێر چاڤدێرییا خۆ، فەرماندارێ ل سەر خەلکی چاڤدێر و پارێزەرە ژ یێت ژێر چاڤدێرییا خۆ، و زەلام ل سەر خەلکێ مالا خۆ چاڤدێر و پارێزەرە، ژن د مالا زەلامێ خۆ و بچویکێت ویدا چاڤدێر**

---

(١) هۆزەکا عەرەبانە.

**و پارێزەرە، و بەندەیێ مرۆڤی چاڤدێر و پارێزەرە ل سەر مالێ خودانێ خۆ، ڤێجا بزانن هوین هەمی چاڤدێر و پارێزەرن، و هوین هەمی بەرپرسن ژ بێت زێر چاڤدێریا خۆ).**

٣١٦٩ - (ق) عَنِ الحَسَنِ الْبَصْرِيِّ: أَنَّ عُبَيْدَ اللهِ بْنَ زِيَادٍ، عَادَ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ لَهُ مَعْقِلٌ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللهُ رَعِيَّةً، فَلَمْ يَحُطْهَا بِنُصْحِهِ، إِلاَّ لَمْ يَجِدْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ)**.

[خ٧١٥٠/ م١٤٢، الإمارة: ١٤٢ (٢١، ٢٢)].

**ژ حەسەنێ بەسری (رحمه الله) گۆت: عوبەیدوللایێ کورێ زیادی سەرەدانا مەعقەلێ کورێ یەساری د نەساخییا ویدا کر ئەوا تێدا مری، مەعقەلی گۆتێ: ئەز دێ فەرموودەکێ بۆ تە بێژم من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوھ لێ بووی، من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (نینە بەندەیەك خودێ چاڤدێرییا هندە کەسان بێخیتە ژێر چاڤدێرییا وی و وی ب شیرەتا خۆ ئەو نەپاراستبن، ئەگەر بێهنا بەحەشتێ ببینیت).**

٣١٧٠ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَا مِنْ أَمِيرِ عَشَرَةٍ؛ إِلاَّ يُؤْتَى بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مَغْلُولَةً يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ، أَطْلَقَهُ الْحَقُّ، أَوْ أَوْبَقَهُ). [مي٢٥٥٧].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە کەسەك فەرماندێ دەهان بیت ئەگەر رۆژا قیامەتێ نەهێت و دەستێت وی ب ستۆیێ ویڤە د گرێدای نەبن، حەقی دێ ڤەکەت و رزگار کەت یان دێ وی ژ ناڤ بەت).**

٣١٧١ - عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّهُ قَالَ حِينَ قَدِمَ الْبَصْرَةَ: بَعَثَنِي إِلَيْكُمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، أُعَلِّمُكُمْ كِتَابَ رَبِّكُمْ، وَسُنَّتَكُمْ، وَأُنَظِّفُ طُرُقَكُمْ. [مي٥٧٩].

* إسناده صحيح.

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) دەمێ هاتییە بەسرە، وی گۆت: عومەرێ کورێ خەتتابی ئەز یێ بۆ هەوە هنارتیم، دا کتێبا خودایێ هەوە و سونەتا پێغەمبەرێ هەوە نیشا هەوە بدەم، و رێکێت هەوە پاقژ بکەم.**

## ٤ . باب: الأمراء من قريش

## بابەتێ: فەرماندار ژ قورەیشییانە.

٣١٧٢ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَزَالُ هَذَا الأَمْرُ فِي قُرَيْشٍ ما بَقِيَ مِنْهُمْ اثْنَانِ**). [خ٣٥٠١/ م١٨٢٠].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بەردەوام ئەڤ کارە فەرمانداریا گشتی دێ د ناڤ قورەیشییاندا بیت هندی دو ژ وان مابن).**

## ٥ . باب: وصية الأمراء بالتيسير

## بابەتێ: شیرەتکرنا فەرمانداران ب ساناهیکارییێ.

٣١٧٣ - (م) عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا بَعَثَ أَحَداً مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ، قَالَ: (بَشِّرُوا وَلاَ تُنفِّرُوا، وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا). [م١٧٣٢].

**ژ ئەبی مووسایی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ئەگەر ئێك ژ هەڤالێت خۆ بۆ هندە کاروبارێ خۆ هنارتبا دگۆت: (مزگینییا خێرێ و خۆشییێ بدەن و خەلکی نەرەڤینن[1]، کاروباران ساناهی بکەن و ب زەحمەت نەئێخن).**

## ٦ . باب: الصبر على ظلم الولاة ولزوم الجماعة وعدم نقض البيعة

## بابەتێ: بێهنفرەهی ل سەر ستەما فەرمانداران و مانا د گەل کۆمێ و نەشکاندنا پەیمانێ.

٣١٧٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ كَرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئاً فَلْيَصْبِرْ، فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنَ السُّلْطَانِ شِبْراً، مَاتَ مِيتَةً جاهِلِيَّةً**). [خ٧٠٥٣/ م١٨٤٩].

**ژ ئیبن عەباسی، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ تشتەکێ پێ نەخۆش ژ فەرمانداریێ خۆ دیت بلا بێهنا خۆ فرەهـ کەت، ب راستی هەر کەسێ بهۆستەکێ ژ ئەمرێ فەرمانداری دەرکەڤیت، ئەو مرنەکا نەزانان مر).**

٣١٧٥ - (ق) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**سَتَكُونُ أَثَرَةٌ وَأُمُورٌ تُنْكِرُونَهَا**) ، قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (**تُؤَدُّونَ الحَقَّ الَّذِي عَلَيْكُمْ، وَتَسْأَلُونَ اللهَ الَّذِي لَكُمْ**). [خ٣٦٠٣/ م١٨٤٣].

---

(١) کاروبارێ دینی وەلێ نەکەن خەلك ژێ برەڤن.

ژ ئیبن مەسعودی، (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(پشتی من، پێشئێخستنا نەمافدار و نەهەژییان و کاروبارێت هوین ژێ نەرازی، دێ هەبن). گۆتن: تو چ فەرمان ل مە دکەی؟ گۆت: (ما فێ ل سەر خۆ بدەن، و ما فێ خۆ ژ خودێ بخوازن).**

٣١٧٦ - (خ) عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَدِيٍّ قَالَ: أَتَيْنَا أَنَسَ بْنَ مالِكٍ، فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا يَلْقَوْنَ مِنَ الحَجَّاجِ، فَقَالَ: (اصْبِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ؛ إِلاَّ الَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ، حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ) ، سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّكُمْ (ﷺ). [خ٧٠٦٨].

ژ زوبەیرێ کوڕێ عودەیی (ﷺ) گۆت: ئەم هاتینە دەڤ ئەنەسێ کوڕێ مالکی، و مە گازندە گەهاندنێ ژ وێ یا وان ژ حەجاجی ددیت، ئینا گۆت: **(بێهنا خۆ فرەهـ بکەن، چونکی ب راستی چو دەم ب سەر هەوەدا ناهێنە خوارێ ئەگەر یێ پشتی وی ژ وی خرابتر نەبیت، هەتا هوین دگەهنە خودایێ خۆ)**، من ئەڤە ژ پێغەمبەرێ هەوە گوهـ لێ بوو.

٣١٧٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ خَرَجَ مِنَ الطَّاعَةِ، وَفَارَقَ الْجَمَاعَةَ، فَمَاتَ، مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً. وَمَنْ قَاتَلَ تَحْتَ رَايَةٍ عُمِّيَّةٍ، يَغْضَبُ لِعَصَبَةٍ، أَوْ يَدْعُو إِلَى عَصَبَةٍ، أَوْ يَنْصُرُ عَصَبَةً، فَقُتِلَ، فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ. وَمَنْ خَرَجَ عَلَى أُمَّتِي، يَضْرِبُ بَرَّهَا وَفَاجِرَهَا، وَلاَ يَتَحَاشَ مِنْ مُؤْمِنِهَا، وَلاَ يَفِي لِذِي عَهْدٍ عَهْدَهُ، فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ). [م١٨٤٨].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) وی گۆت: **(هەر کەسێ ژ گوهداریێ دەرکەڤیت، و ژ موسلمانان جودا بیت، و بمریت ئەو مرنەکا نەزانان مر، و هەر کەسێ بن ئالایەکێ کۆرە شەڕی بکەت بۆ دەمارگیرییێ تۆڕە ببیت، یان داخوازا دەمارگیرییێ بکەت، یان هاریکاریا دەمارگیرییێ بکەت و سەر بێخیت، و بهێتە کوشتن ئەو کوشتنەکا نەزانانە، و هەر کەسێ ل سەر ئوممەتا من دەرکەڤیت و ل چاك و باشێ وان بدەت، و خۆ ژ باوەریدارێ وان نەدەتە پاش، و ئەختوباریا پەیمانا خودان پەیمانی نەبیت، ئەو نە ژ منە و ئەز ژ وی نینم).**

٣١٧٨ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَدُ اللهِ مَعَ الجَمَاعَةِ). [ت٢١٦٦].

* صحيح .

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هاریکاری و چاڤدێری و پاراستنا خودێ یا د گەل کۆمێ).**

٧ ـ باب: حكم من فرق أمر المسلمين

**بابەتێ: حوکمێ وی یێ کارێ موسلمانان ژێکڤە بکەت.**

٣١٧٩ – (م) عَنْ عَرْفَجَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ أَتَاكُمْ، وَأَمْرُكُمْ جَمِيعٌ عَلَى رَجُلٍ وَاحِدٍ، يُرِيدُ أَنْ يَشُقَّ عَصَاكُمْ، أَوْ يُفَرِّقَ جَمَاعَتَكُمْ، فَاقْتُلُوهُ). [م١٨٥٢].

ژ عەرفەجەیی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ئەگەر ئێك هاتە هەوە، و ئاخفتنا هەوە ئێکە ل سەر زەلامەکی ب تنێ[1]، و دڤێت ژ کۆما هەوە دەرکەڤیت، یان کۆما هەوە ژێکڤە بکەت، وی بکوژن).**

٨ ـ باب: إذا بويع لخليفتين

**بابەتێ: ئەگەر بەیعە بۆ دو خەلیفەیان هاتە دان.**

٣١٨٠ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا بُويِعَ لِخَلِيفَتَيْنِ، فَاقْتُلُوا الْآخَرَ مِنْهُمَا). [م١٨٥٣].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر بەیعە بۆ دو خەلیفەیان هاتە دان یێ دویماهییێ بکوژن)[2].**

٩ ـ باب: الإنكار على الأمراء وترك قتالهم ما صلوا

**بابەتێ: نەرازیبوون ژ خەلەتییا فەرمانداران و هێلانا شەرێ وان هندی ئەو نڤێژان بکەن.**

٣١٨١ – (م) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)؛ أَنَّهُ قَالَ: (إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَاءُ، فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ، وَمَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلَا نُقَاتِلُهُمْ؟ قَالَ: (لَا، مَا صَلَّوْا). [م١٨٥٤].

---

(١) ئانکو هوین هەمێ ئێکن ل سەر فەرمانداریا مرۆڤەکێ.

(٢) چونکی بەیعەتا یێ ئێکێ دامەزری و نە یا یێ دووێ و دڤێت یێ دووێ هەڤرکییا یێ ئێکێ نەکەت دا ئێکگرتنا موسلمانان یا پاراستی بیت.

**ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها)، هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: هندە کەسان دێ ل سەر هەوە کەنە فەرماندار دێ کارێت باش کەن و کارێت خراب کەن، هەر کەسێ کارێت وان یێت خراب نەڤیان و ب دلێ وان نەبوو[1] ئەو بەری بوو، و یێ نەرازیبوونا خۆ دیار کر ئەو ژ گونەهێ سلامەت بوو، بەلێ یێ رازی بیت و دویڤ وان بچیت)، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما ئەم شەرێ وان نەکەین؟ گۆت: (نە، هندی ئەو نڤێژان بکەن).**

١٠ ـ باب: خيار الأئمة وشرارهم

**بابەتێ: باشترین و خرابترینێت فەرمانداران.**

٣١٨٢ - (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ. وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ) قَالُوا: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ عِنْدَ ذلِكَ؟ قَالَ: (لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ. لاَ، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ. أَلاَ مَنْ وَلِيَ عَلَيْهِ وَالٍ، فَرَآهُ يَأْتِي شَيْئاً مِنْ مَعْصِيَةِ اللهِ، فَلْيَكْرَهْ مَا يَأْتِي مِنْ مَعْصِيَةِ اللهِ، وَلاَ يَنْزِعَنَّ يَداً مِنْ طَاعَةٍ). [م١٨٥٥].

**ژ عەوفێ کورێ مالکێ ئەشجەعی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (فەرماندارێت هەوە یێت باش و برنجی ئەون: یێت هوین حەژێ دکەن، و ئەو حەژ هەوە دکەن و هوین دوعا بۆ دکەن و ئەو دوعا بۆ هەوە دکەن، و خرابە فەرماندارێت هەوە ئەون: یێت هەوە نەڤێن و وان هوین نەڤێن، و هوین لەعنەتان ل وان دکەن و ئەو لەعنەتان ل هەوە دکەن). گۆتن: مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ما ئەم وان نەهێلین؟ گۆت: (نە، هندی نڤێژێ ب هەوە بدەنە کرن، نە، هندی نڤێژێ ب هەوە بدەنە کرن، ب راستی یێ فەرماندارەکێ خۆ ببینیت گونەهێ دکەت، بلا کەرب ژ وێ گونەهێ ڤەببن، و دەستان ژ گوهدارییێ نەبەردەت).**

---

(١) هەلبەت پشتی بێهیڤی ببیت بشێت وێ خرابییێ ب دەستێ خۆ یان ب ئەزمانێ خۆ بگوهۆریت.

ئیمامێ نەوەوی خودێ ژێ رازی بیت دبێژیت: یێ ب دلێ خۆ نەرازی بیت بەلێ وی شیانێت گوهۆرینا ب دەستی و ئەزمانی نەبن ئەو ژ گونەهێ دەرکەفت و هەر کەسێ ل دویڤ شیانێت خۆ خرابییا فەرمانداری نەهێلیت ئەو ژ گونەهێ دەرکەفت و هەر کەسێ ب کارێ وان رازی بیت و ل دویڤ وان بچیت ئەو گونەهکارە.

٣١٨٣ – عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضي الله عنه رَجُلاً مِنْ بَنِي أَسَدٍ عَلَى عَمَلٍ، فَجَاءَ يَأْخُذُ عَهْدَهُ، قَالَ: فَأُتِيَ عُمَرُ رضي الله عنه بِبَعْضِ وَلَدِهِ فَقَبَّلَهُ، قَالَ: أَتُقَبِّلُ هَذَا؟! مَا قَبَّلْتُ وَلَداً قَطُّ، فَقَالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ بِالنَّاسِ أَقَلُّ رَحْمَةً، هَاتِ عَهْدَنَا لاَ تَعْمَلْ لِي عَمَلاً أَبَداً.[هق ٩/٤١].

**ژ ئەبی عوسمانێ نەهدی (رحمه الله) گۆت: عومەرێ کوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) زەلامەك ژ بەنی ئەسەد دانا سەر کارەکی، ڤێجا هات دا نڤیسینا خۆ یا دەستبکاربوونێ وەرگریت، گۆت: هندە زاڕۆکێت عومەری ئینانە دەڤ، ئینا ماچی کر، گۆت: تو ڤی ماچی دکەی؟! هیچ من زاڕۆکەك ماچی نەکرییە، ئینا عومەری گۆت: ما دەم وەسایە دلۆڤانییا تە بۆ خەلکی کێمترە، کا نڤیسینا مە یا کاری بینە، چو جاران چو کاران بۆ من نەکە.**

## ١١ ـ باب: النهي عن طلب الإمارة

## بابەتێ: پاشڤەلێدانا ژ داخوازکرنا فەرمانداریێ.

٣١٨٤ – (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ! لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أُوتِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أُوتِيتَهَا مِنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا).**

[خ٦٦٢٢/ م١٦٥٢، الإمارة: ١٦٥٢ (١٣)].

**ژ عەبدولرەحمانێ کوڕێ سەمورەی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یا عەبدولرەحمانێ کوڕێ سەمورەی، کاربدەستییێ نەخوازە، ب راستی هەکە بێ خواستن بۆ تە هاتە دان دێ هاریکارییا تە ل سەر هێتە کرن، و هەکە ژ خواستن بۆ تە هاتە دان، دێ ب هیڤییا تەڤە هێتە هێلان).**

٣١٨٥ – (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَلاَ تَسْتَعْمِلُنِي؟ قَالَ: فَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى مَنْكِبِي، ثُمَّ قَالَ: **(يَا أَبَا ذَرٍّ، إِنَّكَ ضَعِيفٌ، وَإِنَّهَا أَمَانَةٌ، وَإِنَّهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ؛ إِلاَّ مَنْ أَخَذَهَا بِحَقِّهَا، وَأَدَّى الَّذِي عَلَيْهِ فِيهَا).** [م١٨٢٥].

**ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه)، گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ تو من ب کار نائینی؟[1] ئینا دەستێ خۆ دانا سەر ملێ من، پاشی گۆت: (ئەی ئەبا زەڕ، تو یێ بێچارەیی،**

---

(١) ئانکو: کارەکی بدەڤ من و من بکە فەرماندار ل جهەکی.

**و کاربدەستی ئەمانەتە، و رۆژا قیامەتێ شەرمزاری و پەشێمانییە، بۆ وی نەبیت یێ ب حەقێ وێ وەرگرتبیت[1] و یا ل سەر تێدا دابیت).**

١٢ ـ باب: لا ولاية للمرأة

**بابەتێ: فەرمانداریا گشتی بۆ ژنێ نینە.**

٣١٨٦ - (خ) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: لَقَدْ نَفَعَنِي اللهُ بِكَلِمَةٍ سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَيَّامَ الْجَمَلِ، بَعْدَما كِدْتُ أَنْ أَلْحَقَ بِأَصْحَابِ الْجَمَلِ فَأُقَاتِلَ مَعَهُمْ، قالَ: لَمَّا بَلَغَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَنَّ أَهْلَ فارِسَ قَدْ مَلَّكُوا عَلَيْهِمْ بِنْتَ كِسْرَى، قَالَ: (**لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمُ امْرَأَةً**).[خ٤٤٢٥].

**ژ ئەبی بەکرەیی (رضي الله عنه) گۆت: ب راستی رۆژا جەمەلێ خودێ مفا ب پەیڤەکێ گەهاندە من، من ئەو گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ ببوو (ﷺ) پشتی نێزیك بوویی ئەز بگەهمە هەڤالێت حێشترێ[2] و د گەل وان شەڕی بکەم، گۆت: دەمێ گەهشتییە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەلکێ فورسێ کچا کیسرایی شاهـ ل سەر خۆ دانایە گۆت: (ملەتەك سەرفەراز نابیت کارێ خۆ بکەنە د دەستێ ژنەکێدا).**

١٣ ـ باب: لكل خليفة بطانتان

**بابەتێ: هەر خەلیفەکی دو دەستێت ژێکرتی یێت هەین.**

٣١٨٧ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**ما بَعَثَ اللهُ مِنْ نَبِيٍّ، وَلاَ اسْتَخْلَفَ مِنْ خَلِيفَةٍ؛ إِلاَّ كانَتْ لَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ، فَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللهُ تَعَالَى**). [خ٧١٩٨ (٦٦١١)].

---

(١) نانکو: یێ کێرهاتی و هەژی بیت.

(٢) رۆژا جەمەلێ: ئەو رویدانا نەرێکخستی چێ بوویی د ناڤبەرا دایکا مە موسلمانان و سەحابییێت د گەل وێدا وەکی تەلحەیی و زوبەیری و د ناڤبەرا عەلیدا، و دەمێ عوسمان هاتییە شەهیدکرن چەند سەحابییەکان داخواز ژ دایکا مە موسلمانان کر دەرکەڤیت موسلمانان پێك بینیت و داخوازێ ژ عەلی بکەت بکوژێت عوسمانی تۆلێ ل وان ڤەکەت، و دایکا مە موسلمان ل سەر حێشترێ بوو، و دەمێ مونافق و دوڕوییان ئەڤە زانی هەمی شیانێت خۆ دانە کاری ئەڤ دەرکەفتنە سەر نەکەڤیت و ئارمانجا خۆ ب جهـ نەئینیت، و شیان ب هلێخستنا فتنێ شەری پەیدا بکەن، و نە عەلی (رضي الله عنه) شەڕ دڤیا و نە عائیشایێ (رضي الله عنها) و ئەوێت د گەل، بەلێ نەخشە و پیلانێت دوڕوییان ب هێزتر بوون و ئەو چێ بوو یا کەسێ نەدڤیا، و چونکی دایکا مە موسلمانان ل سەر حێشترێ بوو دگۆتنە وێ رویدانێ رویدانا حێشترێ.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) : پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودێ چو پێغەمبەر نەهنارتینە و چو جهگیر نەکرینە جهگیر هەکە وی دو دەستێت ژێگرتی و نێزیکی خۆ نەبن؛ دەستەك فەرمانا وی ب باشییێ دکەت و وی بۆ هندێ پال ددەت، و دەستەك فەرمانا وی ب خرابیێ دکەت و وی بۆ هندێ پال ددەت، و یێ پاراستی ئەوە یێ خودێ بپارێزیت).**

١٤ ـ باب: ما يكره من الثناء على السلطان

**بابەتێ: ئەوا نەباش ژ پەسنکرنا خوندکاری.**

٣١٨٨ – (خ) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: قَالَ أُنَاسٌ لابْنِ عُمَرَ: إِنَّا نَدْخُلُ عَلَى سُلْطَانِنَا، فَنَقُولُ لَهُمْ خِلاَفَ مَا نَتَكَلَّمُ إِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِمْ، قَالَ: كُنَّا نَعُدُّهَا نِفَاقاً.[خ٧١٧٨].

**ژ موحەممەدێ کورێ زەیدێ کورێ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هندەکان گۆتە ئیبن عومەری: ئەم دچینە دەڤ خوندکارێ خۆ و ئەم بەروڤاژی وێ دبێژینێ یا ئەم پێ دئاخڤین دەمێ ژ دەڤ وان دەردکەڤین، گۆت: مە ئەڤە دورویاتی دهەژمارت.**

٣١٨٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّهُ لَقِيَ نَاساً خَرَجُوا مِنْ عِنْدِ مَرْوَانَ، فَقَالَ: مِنْ أَيْنَ جَاءَ هَؤُلاَءِ؟ قَالُوا: خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِ الْأَمِيرِ مَرْوَانَ، قَالَ: وَكُلُّ حَقٍّ رَأَيْتُمُوهُ تَكَلَّمْتُمْ بِهِ وَأَعَنْتُمْ عَلَيْهِ، وَكُلُّ مُنْكَرٍ رَأَيْتُمُوهُ أَنْكَرْتُمُوهُ وَرَدَدْتُمُوهُ عَلَيْهِ؟ قَالُوا: لاَ، وَاللهِ! بَلْ يَقُولُ مَا يُنْكَرُ فَنَقُولُ: قَدْ أَصَبْتَ أَصْلَحَكَ اللهُ! فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِ قُلْنَا: قَاتَلَهُ اللهُ! مَا أَظْلَمَهُ وَأَفْجَرَهُ! قَالَ عَبْدُ اللهِ: كُنَّا بِعَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) نَعُدُّ هَذَا نِفَاقاً لِمَنْ كَانَ هَكَذَا. [حم٥٣٧٣].

* صحيح.

[وانظر: ٣٤٩١].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ئەو گەهشتە هندەك خەلکی ژ دەڤ مەروانی دەرکەفتبوون، ئینا گۆت: ئەڤە ژ کیرێ هاتینە؟ گۆتن: ئەم یێ ل دەڤ فەرماندار مەروانی دهێین، گۆت: هەر ڕاستییەکا هەوە دیتی هوین پێ ئاخفتن و هەوە هاریکاری ل سەر کر، و هەر خرابییەکا هەوە دیتی هەوە خۆ ل سەر نەرازی کر، و هەوە ل وی زڤراند؟ گۆتن: نەخێر، سویند ب خودێ، بەلکی ئەو وێ دبێژیت یا نەدورست و**

ئەم دبێژین تو راست دبێژی خودێ تە چێ کەت، ڤێجا ئەگەر ئەم ژ دەڤ وی دەرکەفتین مە گۆت: خودێ بکوژیت، چەندێ ستەمکارە و چەندێ خرابکارە، عەبدوللایی گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە مە دوروی ددانا بۆ وی کەسێ ئەڤە ل دەڤ هەبا.

## ١٥ . باب: البيعة على السمع والطاعة

## بابەتێ: بەیعەت ل سەر گوهدان و گوهدارییێ.

٣١٩٠ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قالَ: كُنَّا إِذَا بَايَعْنَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ يَقُولُ لَنَا: (**فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ**). [خ٧٢٠٢/ م١٨٦٧].

[وانظر: ٢٧٣١][1].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەگەر مە بەیعەت ل سەر گوهدان و گوهدارییێ دابا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆتە مە: (د وێدا یا هوین دشێن).**

## ١٦ . باب: الإمام يحاسب الناس بما ظهر منهم

## بابەتێ: فەرماندار پرسینێ د گەل خەلکی دکەت ل سەر وێ یا ل وان ئاشکرا دبیت.

٣١٩١ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُتْبَةَ قالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه يَقُولُ: إِنَّ أُنَاساً كَانُوا يُؤْخَذُونَ بِالْوَحْيِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَإِنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ، وَإِنَّمَا نَأْخُذُكُمُ الآنَ بِمَا ظَهَرَ لَنَا مِنْ أَعْمَالِكُمْ، فَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا خَيْراً أَمِنَّاهُ وَقَرَّبْنَاهُ، وَلَيْسَ إِلَيْنَا مِنْ سَرِيرَتِهِ شَيْءٌ، اللهُ يُحَاسِبُهُ فِي سَرِيرَتِهِ، وَمَنْ أَظْهَرَ لَنَا سُوءاً لَمْ نَأْمَنْهُ وَلَمْ نُصَدِّقْهُ، وَإِنْ قالَ: إِنَّ سَرِيرَتَهُ حَسَنَةٌ. [خ٢٦٤١].

[وانظر: ١١٥٠] .

**ژ عەبدوللایێ کورێ عوتبەیی (رحمه الله) گۆت: من گوه ل عومەرێ کورێ خەتتابی بوو (رضي الله عنه) دگۆت: هندە مرۆڤ ب سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب وەحییێ دهاتنە نیاسین و ب راستی وەحی یاهاتییە برین، و ئەم ڤێ گاڤێ هەوە بەس دێ ب وێ نیاسین یا بۆ مە ژ کریارێت هەوە ئاشکرا دبیت، ڤێجا یێ باشی و خێر بۆ مە ژ**

(١) ئەڤە د چاپا ئێکێدا نینە.

**خۆ ئاشکرا کر ئەو مە ل دەڤ خۆ ئەمین دانا، و مە نێزیکی خۆ کر، و مە شۆله ب نهێنییا وی نینە خودێ دێ حسێبا وی ل سەر نهێنییا وی کەت، و یێ خرابی بۆ مە ژ خۆ ئاشکرا کر، ئەم ئەمین نادانین، و باوەر ژێ ناکەین، بلا بێژن نهێنییا وی یا باشە.**

١٧ ـ باب: رزق الخليفة

**بابەتێ: ژیارا خەلیفەیی.**

٣١٩٢ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: لَمَّا اسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ قَالَ: لَقَدْ عَلِمَ قَوْمِي أَنَّ حِرْفَتِي لَمْ تَكُنْ تَعْجِزُ عَنْ مَؤُونَةِ أَهْلِي، وَشُغِلْتُ بِأَمْرِ المسْلمِينَ، فَسَيَأْكُلُ آلُ أَبِي بَكْرٍ مِنْ هَذَا المَالِ، وَيَحْتَرِفُ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ. [خ٢٠٧٠].

**ژ عائیشایێ (﵂) گۆت: دەمێ ئەبوبەکر ئەلسەدیق بوویە خەلیفە گۆت: خەلکێ من دزانن پیشەیا من نەئەوە دەرهەڤێ ژیارا مالا مندا دەرنەکەڤیت، و ئەز ب کاروبارێت موسلمانانڤە مژویل بووم، ڤێجا مالا ئەبی بەکری دێ ژ ڤی مالی خۆت، و شارەزایی و پیشەیا دی ئێخیتە د مالیدا بۆ موسلمانان.**

٣١٩٣ - عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضي الله عنه: إِنِّي أَنْزَلْتُ نَفْسِي مِنْ مَالِ الله بِمَنْزِلَةِ وَالِي الْيَتِيمِ، إِنِ احْتَجْتُ أَخَذْتُ مِنْهُ، فَإِذَا أَيْسَرْتُ رَدَدْتُهُ، وَإِنِ اسْتَغْنَيْتُ اسْتَعْفَفْتُ.[هق ٦/٤].

**ژ بەرائی (﵁) گۆت: عومەرێ کوڕێ خەتتابی (﵁) گۆتە من: من خۆ ل جهێ سەمیانێ ئێتیمی ل سەر مالێ خودێ دانایە، ئەگەر ئەز هەوجە بووم دێ ژێ ڕاکەم، و ئەگەر هاتە دەستێ من دێ زڤرینمەڤە، و ئەگەر ئەز زەنگین بووم، ئەز دلێ خۆ نابەمێ و خۆ دویر رادگرم.**

١٨ ـ باب: رزق الحكام والعاملين معهم

**بابەتێ: رزقێ فەرمانداران و کاربەدەستێت د گەل وان.**

٣١٩٤ - عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَرَزَقْنَاهُ رِزْقاً، فَمَا أَخَذَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ غُلُولٌ).** [د٢٩٤٣].

* صحيح.

**ژ بورەیدەیی (﵁) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ ژ هەوە ئەم ل سەر کارەکی ب کار بینین، و مە رزقەك دایێ و ئەوا ژ وێ زێدەتر رادکەت ئەو خیانەتە).**

٣١٩٥ – عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنْ كَانَ لَنَا عَامِلاً، فَلْيَكْتَسِبْ زَوْجَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ خَادِمٌ؛ فَلْيَكْتَسِبْ خَادِماً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَسْكَنٌ؛ فَلْيَكْتَسِبْ مَسْكَناً**).

قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أُخْبِرْتُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنِ اتَّخَذَ غَيْرَ ذَلِكَ، فَهُوَ غَالٌّ أَوْ سَارِقٌ**). [د٢٩٤٥].

* صحيح.

**ژ موستەوردێ کورێ شەدادی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر کەسێ کاربدەست بۆ مە، بلا ژنەکێ بۆ خۆ بینیت و ئەگەر خزمەتکار نەبیت بلا خزمەتکارەکی بۆ خۆ بینیت، و ئەگەر خانی نەبیت بلا خانییەکێ بۆ خۆ پەیداکەت).**

**گۆت: ئەبوبەکری گۆت: بۆ من هاتە گۆتن کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ ژ ڤێ زێدەتر راکەت ئەو خائینە یان دزیکەرە).**

## ١٩ ـ باب: التحذير من التخوض في مال الله

## بابەتێ: هۆشداریدان ژ دەستکارییا د مالێ خودێدا.

٣١٩٦ – (خ) عَنْ خَوْلَةَ الأَنْصَارِيَّةِ رضي الله عنها قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ رِجَالاً يَتَخَوَّضُونَ فِي مَالِ اللهِ بِغَيْرِ حَقٍّ، فَلَهُمُ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [خ٣١١٨].

**ژ خەولا ئەنساری (رضي الله عنها)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی هندە زەلامێت هەین دەستکارییێ ژ نەحەقی د مالێ خودێدا دکەن (دا بۆ خۆ هەلگرن) جەهنەم بۆ وانە رۆژا قیامەتێ).**

٣١٩٧ – (م) عَنْ عَدِيِّ بْنِ عَمِيرَةَ الْكِنْدِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَلٍ، فَكَتَمَنَا مِخْيَطاً فَمَا فَوْقَهُ، كَانَ غُلُولاً يَأْتِي بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). قَالَ: فَقَامَ إِلَيْهِ رَجُلٌ أَسْوَدُ، مِنَ الأَنْصَارِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! اقْبَلْ عَنِّي عَمَلَكَ. قَالَ: (**وَمَا لَكَ**) ؟ قَالَ: سَمِعْتُكَ تَقُولُ كَذَا وَكَذَا. قَالَ: (**وَأَنَا أَقُولُهُ الآنَ: مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ مِنْكُمْ عَلَى عَمَلٍ؛ فَلْيَجِئْ بِقَلِيلِهِ وَكَثِيرِهِ، فَمَا أُوتِيَ مِنْهُ أَخَذَ، وَمَا نُهِيَ عَنْهُ انتهى**). [م١٨٣٣].

**ژ عەدییێ کورێ عومەیرەیێ کیندی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (هەر کەسێ ژ هەوە ئەم ل سەر کارەکی ب کار بینین،**

**دەرزیکەکێ و سەرداتر ژ مە فەشێریت، ئەو خیانەتە، رۆژا قیامەتێ دێ ئینیت)**، گۆت: زەلامەکێ رەش ژ ئەنساران خەلکێ مەدینێ ب بەرڤە رابوو هەروەکی ئەز یێ بەرێ خۆ ددەمێ، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، من ژ کارێ خۆ بێخە، گۆت: **(تە ژ بەر چییە)؟** گۆت: من گوه لێ بوو تە ئەڤە و ئەڤە دگۆت، گۆت: **(و ئەز ڤێ گاڤێ ژی ودبێژم: هەر کەسێ مە ل سەر کارەکی ب کار ئینا، چ کێم چ گەلەك بلا بینیت، یێ دایێ بلا هەلگریت و یێ ژێ هاتە پاشئێخستن، بلا خۆ ژێ بدەتە پاش).**

٢٠ ـ باب: تحريم هدايا العمال والرشوة

**بابەتێ: حەرامکرنا دیارییێت کاربەدەستان و بەرتیلان.**

٣١٩٨ - (ق) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اسْتَعْمَلَ ابْنَ الأُتْبِيَّةِ عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ، فَلَمَّا جاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَحَاسَبَهُ قَالَ: هَذَا الَّذِي لَكُمْ، وَهذِهِ هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(فَهَلاَّ جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَبَيْتِ أُمِّكَ، حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقاً)** ؟!

ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَخَطَبَ النَّاسَ، وَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قالَ: **(أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ رِجَالاً مِنْكُمْ عَلَى أُمُورٍ مِمَّا وَلاَّنِي اللهُ، فَيَأْتِي أَحَدُكُمْ فَيَقُولُ: هَذَا لَكُمْ، وَهذِهِ هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، فَهَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَبَيْتِ أُمِّهِ، حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كانَ صَادِقاً. فَوَاللهِ لاَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مِنْهَا شَيْئاً ـ قالَ هِشَامٌ: ـ بِغَيْرِ حَقِّهِ، إِلاَّ جاءَ اللهَ يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَلاَ فَلأَعْرِفَنَّ مَا جَاءَ اللهَ رَجُلٌ بِبَعِيرٍ لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بِبَقَرَةٍ لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةٍ تَيْعَرُ)**.

ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ: **(أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ)**. [خ٧١٩٧ (٩٢٥)/ م١٨٣٢].

**ژ ئەبی حومەیدێ ساعدی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئیبن ئوتەبییە ل سەر زەکاتا بەنی سەلیم ب کار ئینا، ڤێجا دەمێ هاتی، گۆت: ئەڤە یێ هەوەیە، و ئەڤە دیارییە بۆ من یێ هاتییە دیاریکرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بلا تو روینشتبایە مالا بابێ خۆ و مالا دایکا خۆ هەتا دیارییا تە بۆ تە هاتبا ئەگەر تو یێ راستگۆیی).**

پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو و د گەل خەلکی ئاخفت و حەمدا خودێ کر، و پەسن و مەدحێت وی کرن، پاشی گۆت: **(ئەڤە و پشتی ڤێ، ئەز زەلامی ژ هەوە ب کار دئینم ل سەر وی تشتێ خودێ دایە من، دهێت و دبێژیت: ئەڤە بێ هەومیە، و ئەڤە دیارییە بۆ من بێ هاتیە دیاریکرن، کا بلا ل مالا بابێ خۆ یان دەیکا خۆ روینیتە خوارێ هەتا دیاری بۆ بهێن هەکە بێ راست بیت، ئەز ب خودێ کەم، کەس نینە ژ هەوە تشتەکی ژ نەحەقی هەلگریت، هەکە نەگەهیتە خودێ، رۆژا قیامەتێ بێ هەلگرتی، ب راستی ئەز دێ ئێك ژ هەوە نیاسم حێشترەك یا هەلگرتی عۆر عۆرا وێیە، یان چێلەکا هەلگرتی و بۆر بۆرا وێیە، یان گیسکەك بێ هەلگرتی و مەع مەعا وییە).**

پاشی دەستێت خۆ بلندکرن هەتا من سپیاتییا بنکەفشێت وی دیتی، و گۆت: **(بزانن ئەرێ من گەهاند).**

## ٢١ ـ باب: في الإحصاء

## بابەتێ: ئەوا د ژمێریارییێدا هاتی.

٣١٩٩ - (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه قالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اكْتُبُوا لِي مَنْ تَلَفَّظَ بِالإِسْلاَمِ مِنَ النَّاسِ)** ، فَكَتَبْنَا لَهُ أَلْفاً وَخَمْسَمِائَةِ رَجُلٍ، فَقُلْنَا: نَخَافُ وَنَحْنُ أَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ؟! فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا ابْتُلِينَا، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيُصَلِّي وَحْدَهُ وَهْوَ خَائِفٌ.

حَدَّثنا عَبْدَانُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ، عَنِ الأَعْمَشِ: فَوَجَدْنَاهُمْ خَمْسَمَائَةٍ. قالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: ما بَيْنَ سِتِّمِائَةٍ إِلَى سَبْعِمِائَةٍ. [خ٣٠٦٠/م١٤٩].

ولفظ مسلم: عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: **(أَحْصُوا لِي كَمْ يَلْفِظُ الإِسْلاَمَ)**، قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَتَخَافُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ مَا بَيْنَ السِّتِّمِائَة إِلَى السَّبْعِمِائَة؟ قَالَ: **(إِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ، لَعَلَّكُمْ أَنْ تُبْتَلَوْا)** قَالَ: فَابْتُلِينَا، حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ مِنَّا لاَ يُصَلِّي إِلاَّ سِرّاً.

**ژ حوزەیفەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ ژ خەلکی موسلمان بوویی بۆ من بنڤیسن) هزار و پێنج سەد زەلام مە بۆ نڤیسین، ئینا مە گۆت: ما بترسین و ئەم هزار و پێنج سەدین؟! و ب راستی تو مە دبینی ئەم بەرهنگاری بەلایێ بووین هەتا زەلامی ب تنێ نڤێژ دکر و ئەو دترسیا.**

**عەبدانی ژ ئەبی حەمزەیی ژ ئەعمەشی بۆ مە گۆت: مە دیتن پێنج سەدن، ئەبو موعاوییەی گۆت: د ناڤبەرا شەش سەدان بۆ حەفت سەدان بوون.**

**و بێژەیا موسلمی: ژ حوزەیفەیی، گۆت: ئەم ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) ئینا گۆت: (بۆ من بهەژمێرن چەند موسلمان بووینە) گۆت: مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ تو ل سەر مە دترسی و ئەم د ناڤبەرا شەش سەد و حەفت سەدادانین؟ گۆت: (ب راستی هوین نوزانن بەلکی هوین بەرهنگاری بەلایێ ببن) گۆت: ئەم بەرهنگاری بەلایێ بووین هەتا زەلامەکی ژ مە نڤێژ نە دکر ب نهێنی نەبا.**

## ٢٢ ـ باب: الترجمة للحكام

## بابەتێ: وەرگێران بۆ فەرمانداران.

٣٢٠٠ – عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَتَعَلَّمْتُ لَهُ كِتَابَ يَهُودَ، وَقَالَ: (**إِنِّي وَاللهِ مَا آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتَابِي**) فَتَعَلَّمْتُهُ، فَلَمْ يَمُرَّ بِي إِلاَّ نِصْفُ شَهْرٍ حَتَّى حَذَقْتُهُ، فَكُنْتُ أَكْتُبُ لَهُ إِذَا كَتَبَ، وَأَقْرَأُ لَهُ إِذَا كُتِبَ إِلَيْهِ. [د٣٦٤٥/ ت٢٧١٥]

* حسن صحيح.

**ژ زەیدێ کورێ سابتی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ل من کر ئەز بۆ وی فێری نڤیسینا جوهیان بووم، و گۆت: (ب راستی ئەز ب خودێ کەمە ئەز ل سەر نڤیسانێت خۆ پشتراستی جوهیان نینم) ژ بەر هندێ ئەز فێر بووم، و نیڤ هەیڤ د سەر منرا نەبۆری، هەتا ئەز تێدا شارەزا بوویم، ڤێجا ئەگەر ڤیابا نڤیسینەکێ بنڤیسیت من بۆ دنڤیسی و ئەگەر نڤیسانەک بۆ هاتبایە من بۆ دخواند.**

## ٢٣ ـ باب: بيعة النساء

## بابەتێ: بەیعەتا ژنان.

٣٢٠١ – عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ قَالَتْ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِي نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَنَا: (**فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ**)، قُلْتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا مِنَّا بِأَنْفُسِنَا. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ بَايِعْنَا ـ قَالَ سُفْيَانُ: تَعْنِي: صَافِحْنَا ـ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّمَا قَوْلِي لِمِائَةِ امْرَأَةٍ، كَقَوْلِي لاِمْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ**).[ت١٥٩٧/ ن٤١٩٢/ جه٢٨٧٤].

* صحيح.

ژ ئومەيمەيا کچا روقەيقەيێ گۆت: من د گەل ژنان بەيعەت دا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئينا گۆتە مە: **(د وێدا يا هوين دشێن بکەن و خۆ ل بەر بگرن)**، من گۆت: خودێ و پێغەمبەرێ وی ژ مە دلۆڤانترن بۆ مە، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بەيعەتێ ژ مە وەرگرە، سوفيانی گۆت: ئانکو وەرە دەستێ مە، ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ئاخفتنا من بۆ سەد ژنان وەکی ئاخفتنا منە بۆ ژنەکێ ب تنێ)**(١).

٢٤ ـ باب: ما جاء في الظلمة من الولاة

**بابەتێ: ئەوا ل دۆر ستەما فەرمانداران هاتی.**

٣٢٠٢ - عَنْ حُذَيْفَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّهَا سَتَكُونُ أُمَرَاءُ يَكْذِبُونَ وَيَظْلِمُونَ، فَمَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَلَيْسَ مِنَّا وَلَسْتُ مِنْهُمْ، وَلاَ يَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ. وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، وَسَيَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ)**. [حم٢٣٢٦٠].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ژ حوزەيفەيی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی د پاشەرۆژێدا دێ فەرماندار هەبن و دێ درەوان کەن و ستەمێ کەن، ڤێجا یێ باوەر ژ درەوێت وان بکەت، و ل سەر ستەما وان هاریکارییا وان بکەت، ئەو نە ژ مەنە و ئەز نە ژ وانم، و ئەو ناهێتە دەڤ من ل سەر گەرا ئاڤا کەوسەرێ، و یێ باوەر ژ درەوا وان نەکەت و ل سەر ستەما وان هاریکارییا وان نەکەت، ئەو ژ منە و ئەز ژ ویمە و دێ هێتە دەڤ من ل سەر گەرا ئاڤا کەوسەرێ)**.

٣٢٠٣ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لِكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ: **(أَعَاذَكَ اللهُ مِنْ إِمَارَةِ السُّفَهَاءِ)**، قَالَ: وَمَا إِمَارَةُ السُّفَهَاءِ؟ قَالَ: **(أُمَرَاءُ يَكُونُونَ بَعْدِي، لاَ يَقْتَدُونَ بِهَدْيِي، وَلاَ يَسْتَنُّونَ بِسُنَّتِي، فَمَنْ صَدَّقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَأُولَئِكَ لَيْسُوا مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُمْ، وَلاَ يَرِدُوا عَلَيَّ حَوْضِي. وَمَنْ لَمْ يُصَدِّقْهُمْ بِكَذِبِهِمْ، وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ؛ فَأُولَئِكَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ، وَسَيَرِدُوا عَلَيَّ حَوْضِي)**. [حم١٤٤٤١].

* إسناده على شرط مسلم.

---

(١) ئانکو: د بەيعەتا ژناندا ئاخفتن بەسە و هەوجەی چۆنا دەستی نينە.

[وانظر: ٢٧٩٢][1].

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە کەعبێ کورێ عوجرەیی: (خودێ تە ژ فەرمانداریا ساوێلکان بپارێزیت) گۆت: و فەرمانداریا ساوێلکان چییە؟ گۆت: (فەرماندارن پشتی من دێ هێن، ل دویڤ راستەرێیا من ناکەڤن، و ل دویڤ رێکا من ناچن، ڤێجا هەر کەسێ باوەر ژ درەوێت وان بکەت و هاریکاریا وان ل سەر ستەما وان بکەت ئها ئەو نە ژ منن و ئەز نە ژ وانم، و ئەو ناهێنە دەڤ من ل سەر گەرا منا ئاڤا کەوسەرێ، و هەر کەسێ باوەر ژ درەوا وان نەکەت و هاریکاریا وان ل سەر ستەما وان نەکەت ئها ئەو ژ منن و ئەز ژ وانم، و ئەو دێ هێنە دەڤ من ل سەر گەرا منا ئاڤا کەوسەرێ).**

٢٥ ـ باب: احتجاب الأمراء

**بابەتێ: دابڕان و خۆڤەگرتنا فەرمانداران.**

٣٢٠٤ – عَنْ عَبَايَةَ بْنِ رِفَاعَةَ قَالَ: بَلَغَ عُمَرَ رضي الله عنه: أَنَّ سَعْداً لَمَّا بَنَى الْقَصْرَ قَالَ: انْقَطَعَ نصُوَيْتُ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ، فَلَمَّا قَدِمَ أَخْرَجَ زَنْدَهُ، وَأَوْرَى نَارَهُ، وَابْتَاعَ حَطَباً بِدِرْهَمٍ، وَقِيلَ لِسَعْدٍ: إِنَّ رَجُلاً فَعَلَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: ذَاكَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ. فَخَرَجَ إِلَيْهِ، فَحَلَفَ بِاللهِ مَا قَالَهُ، فَقَالَ: نُؤَدِّي عَنْكَ الَّذِي تَقُولُهُ، وَنَفْعَلُ مَا أُمِرْنَا بِهِ، فَأَحْرَقَ الْبَابَ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَعْرِضُ عَلَيْهِ أَنْ يُزَوِّدَهُ، فَأَبَى.

فَخَرَجَ، فَقَدِمَ عَلَى عُمَرَ رضي الله عنه، فَهَجَّرَ إِلَيْهِ، فَسَارَ ذَهَابَهُ وَرُجُوعَهُ تِسْعَ عَشْرَةَ، فَقَالَ: لَوْلاَ حُسْنُ الظَّنِّ بِكَ، لَرَأَيْنَا أَنَّكَ لَمْ تُؤَدِّ عَنَّا؟ قَالَ: بَلَى، أَرْسَلَ يَقْرَأُ السَّلاَمَ وَيَعْتَذِرُ، وَيَحْلِفُ بِاللهِ مَا قَالَهُ، قَالَ: فَهَلْ زَوَّدَكَ شَيْئاً؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَمَا مَنَعَكَ أَنْ تُزَوِّدَنِي أَنْتَ؟ قَالَ: إِنِّي كَرِهْتُ أَنْ آمُرَ لَكَ، فَيَكُونَ لَكَ الْبَارِدُ، وَيَكُونَ لِي الْحَارُّ، وَحَوْلِي أَهْلُ الْمَدِينَةِ قَدْ قَتَلَهُمُ الجُوعُ، وَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(لاَ يَشْبَعُ الرَّجُلُ دُونَ جَارِهِ)**. [حم٣٩٠].

* رجاله رجال الشيخين.

**ژ عەبابەیێ کورێ ریفاعەیی (ﷺ) گۆت: گەهشتە عومەری (ﷺ) دەمێ سەعدی[1] قەسرا خۆ ئاڤا کری گۆت: دەنگۆك هاتنە برین[2]، ئینا موحەممەد بن**

---

**(١) ئەڤ زێدەیییە د چاپا ئێکێدا نینە.**

مەسلەمە هنارتێ، ڤێجا دەمێ هاتی چەقماقا خۆ دەرئێخست و ئاگرێ خۆ هەلکر و بهایێ دەرهەمەکی دار کرین، گۆتنە سەعدی: ب راستی زەلامەکی ئەڤە و ئەڤە و ئەڤە کر، ئینا گۆت ئەو موحەممەدێ کورێ مەسلەمەیە و دەرکەفتە دەڤ وی و ب خودێ سویند خوار ئەو ئاخفتن وی نەگۆتییە، گۆت: ئەم دێ ئاخفتنا تە گەهینین، و دێ وێ کەین یا فەرمانا مە پێ هاتییە کرن، دەرگەهـ سۆت، پاشی بەرێ خۆ دایێ ڤیا تشتەکی بدەتێ بۆ رێکێ بەلێ موحەممەدی نەڤیا.

و موحەممەد دەرکەفت و هاتە دەڤ عومەری (﵁) و ب لەز گەهشتە دەڤ وی، هاتن و چۆنا وی نوازدە رۆژ کێشان، ئینا عومەری گۆت: ئەگەر هزرا باش ب تە نەبایە، دا بێژین ئەوا مە گۆتییە تە، تە ژ مە نەگەهاندییە؟ گۆت: بەلێ من یا گەهاندی، سلاڤان ل تە دکەت و دەستویرییێ دخوازیت، و ب خودێ سویند دخۆت ئەو نەگۆتییە، عومەری گۆت: تشتەك دا تە؟ گۆت: نەخێر، ئینا موحەممەدی گۆت: چ رێگری ل تە کر تو تشتەکی بدەیە من؟ گۆت: من نەدڤیا ئەز فەرمانێ بۆ تە ب تشتەکی بدەم، و سار و خۆشی بۆ تە بیت، و گەرم و نەخۆشی بۆ من بیت، و دۆرماندۆرێت من خەلکێ مەدینەیێ مرنێ یێت کوشتین، و ب راستی من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(نابیت زەلام بێی جیرانێ خۆ تێر ببیت).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) مەبەست سەعدێ کورێ ئەبی وەققاسییە.

(٢) ئانکو: کۆچکا بلندە و دەنگ ناگەهنە وی و ئەو تەنابوو.

## ١ . باب: اجتهاد القاضي

## بابەتێ: ئیجتیهادا دادوەری

٣٢٠٥ - (ق) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ؛ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ؛ فَلَهُ أَجْرٌ). [خ٧٣٥٢/ م١٧١٦].

ژ عەمرێ کورێ عاسی (رضي الله عنه)، وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەکە فەرمانداری[1] ڤیا حوکمی بدەت و هەمی شیانێت خۆ ب کار ئینان دا دورست حوکمی بدەت، و حوکم دورست دا دو خێر بۆ وینە، و هەکە ڤیا فەرمانێ بدەت و هەمی شیانێت خۆ ب کار ئینان دا دورست فەرمانێ بدەت، و خەلەت فەرمان دا خێرەك بۆ وییە).**

## ٢ . باب: حكم القاضي لا يحل حراماً

## بابەتێ: فەرمانا دادوەری حەرامی حەلال ناکەت.

٣٢٠٦ - (ق) عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوٍ مِمَّا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئاً فَلاَ يَأْخُذْه، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ). [خ٦٩٦٧ (٢٤٥٨)/ م١٧١٣].

ژ ئوم سەلەمەیێ (رضي الله عنها)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ئەز مرۆڤم[2] و ب راستی هوین هەڤڕکییا خۆ دئینىنە دەڤ من، و دبیت هندەك ژ هەوە ب بەلگە و نیشانا خۆ ب ئەزمانتر و زاناتر بن ژ هندەکێت دی، و ئەز بۆ وی دویڤ یا من گوه لێ بووی حوکمی دکەم، و هەر کەسێ من ژ حەقێ برایێ وی بۆ ئێخست، ب راستی هینگێ ئەز پارچەکا ئاگری بۆ دبڕم).**

---

(١) مەخسد پێ نە کەسەکێ ئاشکرایە، بەلکی هەر کەسەکێ شیانان هەمیان بمەزێخیت دا بگەهیت راستییێ.

(٢) ئانکو راستە ئەز پێغەمبەرم بەلێ ئەز مرۆڤم، و مرۆڤ غەیبێ نوزانن ئەو نەبیت خودێ بۆ ئێکی گۆتبیت، و ئەز د دادگەهکرنێدا پشتبەستنێ ددەمە سەر گوهلێبوونێ نە ل سەر چو دی.

## ٣ ـ باب: لا يقضي القاضي وهو غضبان

### بابەتێ: دادوەر د تۆڕەبينێدا دادوەریێ نەکەت.

٣٢٠٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كَتَبَ أَبُو بَكْرَةَ إِلَى ابْنِهِ، وَكانَ بِسِجِسْتَانَ، بِأَنْ لاَ تَقْضِيَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ**). [خ٧١٥٨/ م١٧١٧].

**ژ عەبدولرەحمانێ کوڕێ ئەبی بەکرەیی (ﷺ) گۆت: ئەبی بەکرەیی بۆ کوڕێ خۆ نڤیسی و ئەو ل سەجستانێ بوو، دادوەرییێ د ناڤبەرا دو کەساندا نەکە و تو یێ تۆڕە، ب راستی من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (دادوەرەك دادوەرییێ د ناڤبەرا دویاندا نەکەت و ئەو یێ تۆڕە).**

## ٤ ـ باب: البينات والأيمان في الدعاوى

### بابەتێ: بەلگە و سویند د دەعوەیاندا.

٣٢٠٨ - (ق) عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَكَتَبَ إِلَيَّ: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَضى: أَنَّ الْيَمِينَ عَلَى المدَّعى عَلَيْهِ. [خ٢٥١٤/ م١٧١١].

- وفي رواية لمسلم: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ، لاَدَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ، وَلَكِنَّ الْيَمِينَ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ**).

**ژ ئیبن ئەبی مەلیکەیی (ﷺ) گۆت: من بۆ ئیبن عەباسی نڤیسی و وی بۆ من نڤیسی: پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان کر سویند ل سەر داوالێکرییە.**

- **و د ڤەگێرا موسلمیدا: ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) کو پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ب دواکارێت خەلکی دابانە وان، دا خەلکەك داخوازا خوین و مالێ هندەکان کەن، بەلێ سویند ل سەر داوالێکرییە).**

٣٢٠٩ - (م) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَضَى بِيَمِينٍ وَشَاهِدٍ. [م١٧١٢].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دادوەری ب سویندێ و شاهدەکی کر[1].**

٣٢١٠ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بن عَمْرٍو: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ فِي خُطْبَتِهِ: (**الْبَيِّنَةُ عَلَى الْمُدَّعِي، وَالْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ**). [ت١٣٤١].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) کو پێغەمبەری (ﷺ) د خوتبا خۆدا گۆت: (بەلگە ل سەر داواکارییە و سویند ل سەر داوالێکرییە).**

**٥ ـ باب: مسؤولية القاضي**

**بابەتێ: بەرپرساتییا دادوەری.**

٣٢١١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ وَلِيَ الْقَضَاءَ، فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ**). [د٣٥٧١/ ت١٣٢٥/ جه٢٣٠٨]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ دادوەری دا دەستی ب راستی ئەو بێ کێر هاتە ڤەکوشتن).**

٣٢١٢ - عَنْ بُرَيْدَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْقُضَاةُ ثَلاثَةٌ: وَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَاثْنَانِ فِي النَّارِ: فَأَمَّا الَّذِي فِي الْجَنَّةِ فَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ، فَقَضَى بِهِ. وَرَجُلٌ عَرَفَ الْحَقَّ، فَجَارَ فِي الْحُكْمِ، فَهُوَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ، فَهُوَ فِي النَّارِ**). [د٣٥٧٣/ ت١٣٢٢م/ جه٢٣١٥].

* صحيح.

**ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (دادوەر سێنە: ئێك یێ ل بەحەشتێ و دو د ئاگریدا، هندی ئەوێ د بەحەشتێدایە زەلامەکە راستی زانییە و دادوەری پێ کرییە، و زەلامەکی ژی راستی زانییە و ستەم د دادوەرییێدا کرییە ئەو د ئاگریدایە، و زەلامەکی دادوەری ب نەزانینێ بۆ خەلکی کرییە ئەو د ئاگریدایە).**

---

(١) ئانکو: ب سویندا داواکاری و شاهدەکی ب تنێ، ئەو ژی ئەگەر داواکاری شاهدەك ب تنێ هەبیت، پشتی شاهد شەهدەییا خۆ ددەت ئەو شوینا شاهدێ دووێ دێ سویند خۆت.

## ٦ ـ باب: لا يحكم القاضي بعلمه

## بابەتێ: دادوەر ب زانینا خۆ حوکمی ناکەت.

٣٢١٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَوْ كُنْتُ رَاجِماً أَحَداً بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ، لَرَجَمْتُ فُلاَنَةَ، فَقَدْ ظَهَرَ مِنْهَا الرِّيبَةُ فِي مَنْطِقِهَا وَهَيْئَتِهَا، وَمَنْ يَدْخُلُ عَلَيْهَا). [جه٢٥٥٩].

* صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر من بێ بەلگە ئێك بەربارانکربایە، دا فلانێ بەربارانکەم، ب راستی گۆمان د ئاخفتن و سەروبەرێ وێ و ل وی کەسێ دچۆ دەڤ وێ یا ئاشکەرا بوو).**

## ٧ ـ باب: القاضي يسمع من الخصمين

## بابەتێ: دادوەر دێ گوهێ خۆ دەتە هەردو هەڤرکان.

٣٢١٤ - عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى الْيَمَنِ قَاضِياً، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، تُرْسِلُنِي وَأَنَا حَدِيثُ السِّنِّ، وَلاَ عِلْمَ لِي بِالْقَضَاءِ؟ فَقَالَ: (إِنَّ اللهَ سَيَهْدِي قَلْبَكَ، وَيُثَبِّتُ لِسَانَكَ، فَإِذَا جَلَسَ بَيْنَ يَدَيْكَ الْخَصْمَانِ، فَلاَ تَقْضِيَنَّ حَتَّى تَسْمَعَ مِنَ الآخَرِ كَمَا سَمِعْتَ مِنَ الأَوَّلِ، فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يَتَبَيَّنَ لَكَ الْقَضَاءُ).

قَالَ: فَمَا زِلْتُ قَاضِياً، أَوْ مَا شَكَكْتُ فِي قَضَاءٍ بَعْدُ. [د٣٥٨٢/ ت١٣٣١/ جه٢٣١٠].

* صحيح.

ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز دادوەر هنارتمە یەمەنێ، ئینا من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو من دهنێری و ئەز یێ تەمەن بچویکم، و من زانین ب دادوەریێ نینە؟ ئینا گۆت: **(ب راستی خودێ دێ دلێ تە راستەرێ کەت و ئەزمانێ تە راگریت، ڤێجا ئەگەر هەردو هەڤرك بەرامبەری تە راوەستان، دادورەریێ نەکە هەتا گوهێ خۆ ددەیە یێ دی هەروەکی تە گوهێ خۆ دایە یێ ئێکێ، ئەڤە باشترە دادوەری بۆتە ئاشکەرا ببیت).**

گۆت: بەردەوام ئەز دادوەر بووم، یان ئەز پشتی ڤێ د چو دادوەریياندا ب گۆمان نەکەفتیمە.

## ٨ . باب: الصلح

### بابەتێ: پێکهاتنێ.

٣٢١٥ - عَنْ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**الصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ؛ إِلاَّ صُلْحاً حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَاماً، وَالْمُسْلِمُونَ عَلَى شُرُوطِهِمْ؛ إِلاَّ شَرْطاً حَرَّمَ حَلاَلاً أَوْ أَحَلَّ حَرَاماً**). [ت١٣٥٢/ جه٢٣٥٣].

ولم يذكر ابن ماجه الشروط.

* صحيح.

**ژ عەمرێ کورێ عەوفێ موزەنی (رضي الله عنه) کو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پێکهاتن د ناڤبەرا موسلماناندا دورستە، ئەو پێکهاتن نەبیت حەرامەکی حەلال بکەت، یان حەلالەکی حەرام بکەت، و موسلمان ل دویڤ مەرجێت خۆنە، ئەو مەرج نەبیت حەرامەکی حەلال بکەت، یان حەلالەکی حەرام بکەت).**

## ٩ . باب: رفع القلم عن ثلاثة

### بابەتێ: بەرپرساتی ل سەر سێ کەسان یا ڕاکرییە.

٣٢١٦ - عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ**). [د٤٤٠٣/ ت١٤٢٣/ جه٢٠٤٢].

* صحيح.

**ژ عەلی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (قەلەم ل سەر سێ کەسان یێ هەلگرتییە[1] ل سەر یێ نڤستی هەتا هشیار دبیت و، ل سەر زاڕۆکی هەتا بالغ دبیت، و ل سەر شێتی هەتا ب عەقل دکەڤیت).**

## ١٠ . باب: الخطأ والنسيان والإكراه

### بابەتێ: خەلەتی و ژبیرکرن و کۆتەکی و نەچاریکرنێ.

٣٢١٧ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قال: (**إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ**).

---

(١) ئانکو: گونەھ ل سەر ناهێنە نڤیسین و پرسین ل سەر نینە.

[جه٥٤٠٢]

* صحيح.

[وانظر: ١٨٢٣][1].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ گونەها خەلەتی و ژبیرکرن و ئەوا ل سەر دهێتە نەچارکرن ل سەر ئوممەتا من یا راکری).**

## ١١ ـ باب: لا يؤخذ أحد بجريرة غيره.

## بابەتێ: کەس ب گونەها کەسەکێ دی ناهێتە گرتن.

٣٢١٨ - عَنْ أَبِي رِمْثَةَ قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي نَحْوَ النَّبِيِّ (ﷺ)، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ لِأَبِي: (**ابْنُكَ هٰذَا**) ؟ قَالَ: إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، قَالَ: (**حَقّاً**) ؟ قَالَ أَشْهَدُ بِهِ. قَالَ فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ضَاحِكاً مِنْ ثَبْتِ شَبَهِي فِي أَبِي، وَمِنْ حَلِفِ أَبِي عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: (**أَمَا إِنَّهُ لاَ يَجْنِي عَلَيْكَ، وَلاَ تَجْنِي عَلَيْهِ**) ، وَقَرَأَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[الأنعام:١٦٤]. [د٤٤٩٥/ ن٤٨٤٧/ مي٢٤٣٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی ریمسەیی (ڕەزای خودێ لێ بیت) گۆت: ئەز د گەل بابێ خۆ چۆمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە بابێ من: (ئەڤە کورێ تەیە)؟ گۆت: بەلێ ئەز ب خودانێ کەعبێ کەمە، گۆت: (راستا)؟ گۆت: ئەز شادەیێ ددەم، گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) گرنژی و کەنی ژ بەر پشتراستییا کو ئەز ب بابێ خۆڤە چۆیم، و ژ سویندخوارنا بابێ من ل سەر من[2] پاشی گۆت: (تو گونەها وی ناهەلگری و ئەو گونەها تە ناهەلگریت) و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە خواند: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[3].**

---

**(١) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێکێدا نینە.**

**(٢) ئانکو: ئەم وەکی ئێکین و هەوجەی سویندێ نینە و گرنژینا پێغەمبەری (ﷺ) ب سویندخوارنا وی هات.**

**(٣) ئانکو: کەس گونەها کەسێ ناهەلگریت.**

## ١٢ ـ باب: تلك على ما قضينا

## بابەتێ: ئەو ل سەر وێ فەرمانا مە کری.

٣٢١٩ – عَنِ الْحَكَمِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: أَتَيْنَا عُمَرَ فِي الْمُشَرَّكَةِ فَلَمْ يُشَرِّكْ، ثُمَّ أَتَيْنَاهُ الْعَامَ الْمُقْبِلَ فَشَرَّكَ، فَقُلْنَا لَهُ، فَقَالَ: تِلْكَ عَلَى مَا قَضَيْنَاهُ، وَهَذِهِ عَلَى مَا قَضَيْنَا. [مي ٦٧١].

* إسناده جيد.

**ژ حەکەمێ کوڕێ مەسعودی (رحمه الله) گۆت: ئەم د پرسەکا هەڤپشککرنێدا[1] هاتینە دەڤ عومەری پشکدار کرن، مە د راستا ڤێ چەندێدا گۆتە وی، گۆت: ئەوا چۆیی ل سەر وێ یا مە فەرمان پێ کری و ئەڤە ل سەر وێ یا مە فەرمان پێ کری.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) المشركة: پرسەکە ژ پرسێت میراتگرییێ و ب ڤی رەنگییە. ژنەك بمریت و ڤان پاشخۆڤە بهێلیت: زەلامەك و دایکەك و چەند خویشك و برایێت دایکێ و برایەك یان چەند برایێت دایبابی.

عومەری جارا ئێکێ هۆسا فەرمان کر: (٢/١) نیڤ بۆ زەلامی و (٦/١) شەشێك بۆ دایکێ و (٣/١) سێك بۆ خویشك و برایێت دایکێ و چو بۆ برایێت دایبابی نەما ژ بەر کو ئەو میراتخۆرێت خوینێنە (عەسەبەنە).

پاشی هەر وەکی وێ پرسێ هاتە دەڤ هۆسا لێکڤە کر: (٢/١) نیڤ بۆ زەلامی و (٦/١) شەشێك بۆ دایکێ و (٣/١) سێك ب هەڤپشکی دا خویشك و برایێت دایکێ و یێت دایبابی ل سەر بنیاتێ ئەو ژی برایێت وێ یێت دایکێنە.

فەرمانداریا گشتی

و كاروبارێت فەرمانداریێ

# الكتاب الثالث

# الجنايات والديات

# كتێبا سێیێ

# تاوان و دانا خوینێ

## الفصل الأول: الجنايات والجراح

## پشکا ئێکێ: تاوان و برین.

### ١ ـ باب: «من حمل علينا السلاح فليس منا»

### بابەتێ: یێ چەکی دژی مە راکەت ئەو نە ژ مەیە.

٣٢٢٠ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا). [خ٦٨٧٤/ م٩٨].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(یێ چەکی دژی مە راکەت ئەو نە ژ مەیە).**

٣٢٢١ – (م) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا الْمُسْلِمَانِ، حَمَلَ أَحَدُهُمَا عَلَى أَخِيهِ السِّلاحَ، فَهُمَا عَلَى جُرُفِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا قَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، دَخَلاَهَا جَمِيعاً). [م٢٨٨٨].

ژ ئەبی بەکرەیی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر دو موسلمانان ئێکی ژ وان چەك ل سەر برایێ خۆ راکر، هەردو یێ ل سەر لێڤا ئاگری، فێجا ئەگەر ئێکی ژ وان هەڤالێ خۆ کوشت هەردو پێکڤە چۆنە تێدا).**

### ٢ ـ باب: ما يباح به دم المسلم

### بابەتێ: ئەوا خوینا موسلمانی پێ حەلال دبیت.

٣٢٢٢ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ؛ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، والْمُفَارِقُ لِدِينِهِ التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ). [خ٦٨٧٨/ م١٦٧٦].

ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(نەدورستە مرۆڤێ موسلمان شەهدە بدەت کو ب راستی چو خودایێت راست و دورست و هەژی عیبادەتی نینن خودێ نەبیت و ئەز پێغەمبەرێ ویمە بهێتە کوشتن ب سێ تشتان نەبیت: رح ب رحێ (مرۆڤ ب مرۆڤی) و زیناکەر و زیناکەرا ب هەڤژین و یێ ژ دینێ خۆ دەرکەفتی و موسلمان هێلاین).**

## ٣ ـ باب: إثم من سنَّ القتل

## بابەتێ: گونەها وی یێ کوشتنا ئێکێ کری.

٣٢٢٣ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْماً، إلاَّ كانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، لأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ)**.[خ٣٣٣٥/ م١٦٧٧].

ژ ئیبن مەسعودی (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نینە خودان رحەك ژ زولم و بێبەختی بێتە کوشتن هەکە بارا کوڕێ ئادەمی یێ ئێکێ[1] د خوینا ویدا نەبیت، ئەو یێ ئێکێ بوو کوشتن کری و دەرێخستی)**.

## ٤ ـ باب: إثم جريمة القتل.

## بابەتێ: گونەها تاوانا کوشتنێ.

٣٢٢٤ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَوَّلُ مَا يُقْضى بَيْنَ النَّاسِ فِي الدِّمَاءِ)**. [خ٦٥٣٣/ م١٦٧٨].

ژ ئیبن مەسعودی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(تشتێ ئێكێ رۆژا قیامەتێ حوکم تێدا د ناڤبەرا خەلکیدا دهێتە کرن خوینن)**.

٣٢٢٥ – (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ يَزَالُ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ مَا لَمْ يُصِبْ دَماً حَرَاماً)**. [خ٦٨٦٢].

ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بەردەوام مرۆڤێ خودان باوەر دێ مینیت د بەرفرەهییێدا د دینێ خۆدا[2] هندی ئەو خوینەکا حەرام نەرێژیت و کەسێ نەکوژیت)**.

## ٥ ـ باب: إثم من قتل نفسه

## بابەتێ: گونەها وی یێ خۆ دکوژیت.

٣٢٢٦ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً. وَمَنْ تَحَسَّى سُمّاً فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَسُمُّهُ فِي**

---

(١) ئانكو: دەمێ قابیلی هابیل کوشتی.

(٢) ئانکو: هیڤی و نومێدێت رەحما خودێ یێت هەین و گونەهێت وی بۆ ژێ ببەت.

يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً. وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ، فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خالِداً مُخَلَّداً فِيهَا أَبَداً). [خ٥٧٧٨ (١٣٦٥)/ م١٠٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ خۆ د چیایەکیدا باڤێژیت و خۆ بکوژیت، ئەو بۆ هەر و هەر و هەتا هەتا یێ د ئاگرێ جەهنەمێدا خۆ دهاڤێژیت، و هەر کەسێ ژەهرەکێ ڤەخوەت و خۆ بکوژیت ژەهرا وی یا د دەستێ ویدا و بۆ هەر و هەر و هەتا هەتا یێ د ئاگرێ جەهنەمێدا ڤەدخوەت، و هەر کەسێ خۆ ب ئاسنەکی بکوژیت ئاسنێ وی یێ د دەستێ ویدا و بۆ هەر و هەر و هەتا هەتا یێ د ئاگرێ جەهنەمێدا دکەتە د زکێ خۆدا).**

## ٦ ـ باب: القصاص في النفس والمماثلة فيه

## بابەتێ تولڤەکرن د جانیدا و وەکهەڤی تێدا

٣٢٢٧ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: عَدَا يَهُودِيٌّ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) عَلَى جارِيَةٍ، فَأَخَذَ أَوْضاحاً كانَتْ عَلَيْهَا، وَرَضَخَ رَأْسَهَا فَأَتَى بِهَا أَهْلُهَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَهْيَ فِي آخِرِ رَمَقٍ وَقَدْ أُصْمِتَتْ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ قَتَلَكِ؟ فُلانٌ**) ؟ لِغَيْرِ الَّذِي قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا: أَنْ لاَ، قَالَ: فَقَالَ لِرَجُلٍ آخَرَ غَيْرِ الَّذِي قَتَلَهَا، فَأَشَارَتْ: أَنْ لاَ، فَقَالَ: (**فَفُلاَنٌ**) ؟ لِقَاتِلِهَا، فَأَشَارَتْ: أَنْ نَعَمْ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَرُضِخَ رَأْسُهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ. [خ٥٢٩٥ (٢٤١٣)/ م١٦٧٢].

- وفي رواية لهما: فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ فَاعْتَرَفَ. [خ٢٤١٣].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (ﷺ) گۆت: زەلامەکێ جوهی ل سەردەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستدرێژی ل سەر ژنەکێ کر ئەو چەکێ زیڤی یێ ل بەر ژنێ بربوو، و سەرێ وێ د ناڤبەرا دو بەراندا شکاندبوو، ئینانە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو د دویماهییا ژیانێدا بوو (ئانکو: ل بەر مرنێ بوو) و هاتبوو بێدەنگکرن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: (کێ تو کوشتی؟ فلانی) ناڤێ ئێکێ دی بوو نە ئەوێ کوشتی، نیشان ب سەرێ خۆ کر، نەخێر، گۆت: ئینا ناڤێ ئێکێ دی گۆت نەئەوێ ئەو کوشتی، ئینا نیشان کر: نەخێر، ئینا گۆت: (یا فلان بوو)؟ ناڤێ بکوژی ئینا، نیشان کر: بەلێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان پێ کر سەرێ وی د ناڤبەرا دو بەراندا شکاند.**

- **و د ڤەگێرەکا واندا: جوهی ئینا و حەقاند و کوشتن ل سەر خۆ ئاشکەرا کر.**

## ٧ ـ باب: الردة وحد الحرابة(١)

## بابەتێ: خرپیانێ و سزایا رێگرییێ.

٣٢٢٨ - (ق) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ أُنَاسٌ مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ، فَاجْتَوَوُا المدِينَةَ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) بِلِقَاحٍ، وَأَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَانْطَلَقُوا، فَلَمَّا صَحُّوا، قَتَلُوا رَاعِيَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ، فَجَاءَ الْخَبَرُ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، فَبَعَثَ فِي آثارِهِمْ، فَلَمَّا ارْتَفَعَ النَّهَارُ جِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ، وَسُمِرَتْ أَعْيُنُهُمْ، وَأُلْقُوا فِي الْحَرَّةِ، يَسْتَسْقُونَ فَلاَ يُسْقَوْنَ.

قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: فَهؤُلاَءِ سَرَقُوا، وَقَتَلُوا، وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ، وَحَارَبُوا اللهَ وَرَسُولَهُ. [خ٢٣٣/ م١٦٧١]
[وانظر: ٣٢٢٢، ٣٢٦٤](٢).

**ژ ئەبی قیلابەیی (رحمه الله) ژ ئەنەسی گۆت: خەلکەك ژ هۆزا عوکل یان ژی عورەینە هاتن و سەقایێ مەدینەیێ ل وان نەهات و حەژێ نەکرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ب هندە حێشترێت ب شیر بۆ وان کر، و ژ شیر و میزا وان ڤەخون، چۆن، ڤێجا دەمێ چێ بووین، شڤانێ پێغەمبەری (ﷺ) کوشتن، و حێشتر دانە بەر سینگێ خۆ و هاژۆتن، سەرێ سپێدێ بەحسێ وان هات، و دویڤرا هنارتن، ڤێجا دەمێ رۆژ بلند بووی ئیناندن، فەرمان کر دەست و پێت وان ببرین، و چاڤێت وان ب ئاسنکەکی قۆقلاندن، و هاڤێتنە حەرەیێ(٣) و داخوازا ئاڤێ دکرن و ئاڤ نەددایێ.**

**ئەبو قیلابەیی گۆت: ڤان دزی کرن، و کوشتن کرن، و گاور بوون پشتی باوەرییا خۆ، و شەرێ خودێ و پێغەمبەرێ وی کرن.**

## ٨ ـ باب: لا يقتل مسلم بكافر

## بابەتێ: خرپیانێ و سزایا رێگرییێ.

٣٢٢٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ**).
[د٤٥٠٦/ ت١٤١٣/ جه٢٦٥٩]

---

**(١) (حد الحرابة): ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێکێدا نینە، د مالپەریدا هاتییە زێدەکرن.**

**(٢) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێکێدا نەهاتییە.**

**(٣) جهەکە ل مەدینەیێ و گەلەگ بەرێت رەش ل وی جهینە لەوا دبێژنێ حەرە.**

* حسن صحيح.

[وانظر: ٣٢٩، ٢١٧٦].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (موسلمان ب گاوری ناهێتە کوشتن).**

## ٩ ـ باب: إذا اشترك الجماعة في جناية

## بابەتێ: ئەگەر کۆمەك د تاوانەکێدا پشکدار ببن.

٣٢٣٠ – (خ) عَنِ الشَّعْبِيِّ: فِي رَجُلَيْنِ شَهِدَا عَلَى رَجُلٍ أَنَّهُ سَرَقَ، فَقَطَعَهُ عَلِيٌّ، ثُمَّ جَاءَا بِآخَرَ وَقَالاَ: أَخْطَأْنَا، فَأَبْطَلَ شَهَادَتَهُمَا، وَأُخِذَا بِدِيَةِ الْأَوَّلِ، وَقَالَ: لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا تَعَمَّدْتُمَا، لَقَطَعْتُكُمَا. [خ. الديات، باب ٢١].

**ژ شەعبی (رحمه الله) د راستا دو زەلاماندا شادەیی ل سەر زەلامەکی دا وی دزی کرییە، ئینا عەلی دەستێ وی بری، پاشی ئێکێ دی ئینان و گۆتن: ئەم یێت خەلەت بووین، ئینا شادەییا وان وەرنەگرت و خوینا یێ ئێکێ ژ وان وەرگرت، و گۆت: ئەگەر من زانیبا هەوە ژ قەستا ئەڤە کر دا دەستێت هەوە برم.**

٣٢٣١ – عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ قَتَلَ نَفَراً خَمْسَةً، أَوْ سَبْعَةً، بِرَجُلٍ وَاحِدٍ قَتَلُوهُ قَتْلَ غِيلَةٍ، وَقَالَ عُمَرُ: لَوْ تَمَالَأَ عَلَيْهِ أَهْلُ صَنْعَاءَ، لَقَتَلْتُهُمْ جَمِيعاً. [ط١٦٢٣].

**ژ سەعیدێ کورێ موسەییەبی (رحمه الله) گۆت: عومەرێ کورێ خەتتابی چەندەك کوشتن، پێنج کەس یان حەفت ب زەلامەکی ب خاپاندن و ب خافلەتیڤە کوشتبوون و عومەری گۆت: ئەگەر خەلکێ سەنعائێ هەمی ل سەر کوشتنا وی د هاریکار بانە دا هەمیان کوژم.**

## ١٠ ـ باب: لا يقتل الوالد بولده

## بابەتێ: باب ب کورێ خۆ ناهێتە کوشتن.

٣٢٣٢ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تُقَامُ الْحُدُودُ فِي الْمَسَاجِدِ، وَلاَ يُقْتَلُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ).** [ت١٤٠١/ جه٢٥٩٩/ مي٢٤٠٢]

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (سزا[1] ل مزگەفتان ناهێنە ب جهئینان و باب ب کوڕی ناهێتە کوشتن).**

## ١١ ـ باب: القسامة

## بابەتێ: سویندێت گرێدایی ب کوشتنێڤە.

٣٢٣٣ – (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأُخْبِرَ مُحَيِّصَةُ أَنَّ عَبْدَ اللهِ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرٍ ـ أَوْ عَيْنٍ ـ فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللهِ قَتَلْتُمُوهُ، قَالُوا: مَا قَتَلْنَاهُ وَاللهِ. ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ فَذَكَرَ لَهُمْ، فَأَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ، وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ، وَعَبْدُ الرَّحْمنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ لِيَتَكَلَّمَ، وَهْوَ الَّذِي كانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِمُحَيِّصَةَ: (كَبِّرْ كَبِّرْ) ـ يُرِيدُ السِّنَّ. فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ**). فَكَتَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَيْهِمْ بِهِ، فَكَتَبُوا: مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمنِ: (**أَتَحْلِفُونَ، وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ**) ؟ فَقَالُوا: لاَ، قَالَ: (**أَفَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ**) ؟ قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ. فَوَدَاهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنْ عِنْدِهِ مِائَةَ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتِ الدَّارَ. قَالَ سَهْلٌ: فَرَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ. [خ٧١٩٢ (٢٧٠٢)/ م١٦٦٩].

- وفي رواية لهما: فَكَرِهَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يُبْطِلَ دَمَهُ، فَوَدَاهُ مِائَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ.[خ٦٨٩٨].

**ژ سەهلێ کوڕێ ئەبی حەسەمەیی (رضي الله عنه) گۆت: عەبدوللایێ کوڕێ سەهلی و موحەیسە ژ ئەگەرێ تەنگاڤییەکێ گەهشتبوو وان دەرکەفتن و چۆنە خەیبەرێ، ئاخفتن گەهشتە موحەیسەی عەبدوللاه هاتە کوشتن و هاتە هاڤێتن د بیرەکا دەر فرەهـ و نەیا کویر، یان د کانییەکێدا، ئینا هاتە دەڤ جوهییان و گۆتە وان: ئەز ب خودێ کەمە هەوە یێ کوشتی، گۆتن: ب خودێ مە ئەو نەکوشتییە، پاشی زڤری هەتا هاتییە دەڤ مرۆڤێت خۆ، سوحبەت بۆ ڤەگێرا، ڤێجا ئەو و برایێ خۆ حووەیسە ـ ئەو ژ وی مەزنتر بوو ـ و عەبدولرەحمانێ کوڕێ سەهلی هاتن، ڤێجا موحەیسە چۆ دا باخڤیت، و ئەو ل خەیبەرێ**

---

(١) حدود کۆمە و کتا وێ حەددە و حەد: سزایەکێ دەستنیشانکرییە ل سەر وی دکەڤیت یێ وێ گونەهێ دکەت یا ئەڤ سزایە پێڤە گرێدایی (ئەو ژێ ئەڤەنە: زنا و گونەهبارکرنا دەهمن پاکان ب زنایێ و دزی و مەی ڤەخوارن و رێگری).

بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە موحەیسە: **(یێ مەزتر پێش بێخە، یێ مەزنتر پێش بێخە)** مەبەستا وی د ژیدا، حوومیسە ئاخفت، پاشی موحەیسە ئاخفت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یان ئەو دێ خوینا هەڤالێ هەوە دەن، یان دێ شەڕەكی راگەهینن)، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە بۆ وان نڤیسی، وان ژی بۆ نڤیسی مە نەكوشتییە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە حووەسەیی و موحەیسەیی و عەبدولرەحمانی: **(ئەرێ هوین دێ سویند خۆن دا هەژی خوینا كوشتییێ خۆ بن)؟** گۆتن: نەخێر، گۆت: **(ئەرێ جوهی بۆ هەوە سویند بخون)؟** گۆتن: ئەو نەموسلمانن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ دەڤ خۆ سەد حێشتر خوینا وان دا، هەتا برینە مالا خۆ، سەهلی گۆت: حێشترەكێ ژ وان حێشتران زیچكەك (پێنەك) ل من دا.

- و د ڤەگێرەكا واندا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەڤیا خوینا وی هەروە بچیت، ژ بەر هندێ خوینا وی ژ سەد حێشترێت زەكاتێ دا.

٣٢٣٤ - (م) عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَسُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ ـ مَوْلَى مَيْمُونَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَقَرَّ الْقَسَامَةَ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ. [م١٦٧٠].

ژ ئەبی سەلەمەیێ كوڕێ عەبدولرەحمانی و سولەیمانێ كوڕێ یەساری ـ ئازاكرییێ مەیموونەیێ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ژ زەلامەكی ژ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ ئەنساران: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سویندخوارنا ب كوشتنێڤە گرێدایی جهگیر كر ل سەر وێ یا ل سەر دەمێ نەزانینێ هەی.

## ١٢ ـ باب: استحباب العفو

## بابەتێ: باشدانانا لێبۆرینێ.

٣٢٣٥ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) رُفِعَ إِلَيْهِ شَيْءٌ فِيهِ قِصَاصٌ؛ إِلاَّ أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ. [د٤٤٩٧/ ن٤٧٩٧/ جه٢٦٩٢]

* صحيح.

ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەر (ﷺ) نەدیتییە تشتەك ژ تۆلڤەكرنێ ئینابیتە دەڤ ئەگەر فەرمان تێدا ب لێبۆرینێ نەكربیت.

٣٢٣٦ – عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَا مِنْ رَجُلٍ يُجْرَحُ فِي جَسَدِهِ جِرَاحَةً، فَيَتَصَدَّقُ بِهَا؛ إِلاَّ كَفَّرَ اللهُ عَنْهُ مِثْلَ مَا تَصَدَّقَ بِهِ**). [حم٢٢٧٠١]

* صحيح بشواهده، ورجاله رجال الصحيح.

**ژ عوبادەیێ کورێ سامتی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (نینە مرۆڤەك ب برینەکێ د لەشێ خۆدا بریندار ببیت و بکەتە سەدقە[1] ئەگەر خودێ هندی وێ یا کری سەدەقە گونەهان بۆ ژێ نەبەت).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

**(١) ئانکو: تۆلێت خۆ ڤەنەکەت و تۆلڤەکرنێ نەخوازیت.**

## الفصل الثاني: الديات

## پشکا دووێ: خوین.

### ١ ـ باب: مقدار الديات

### بابەتێ: خوین چەندە.

٣٢٣٧ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَطَبَ يَوْمَ الْفَتْحِ بِمَكَّةَ، فَكَبَّرَ ثَلاَثاً، ثُمَّ قَالَ: **(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ، صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، أَلاَ إِنَّ كُلَّ مَأْثُرَةٍ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تُذْكَرُ وَتُدْعَى مِنْ دَمٍ أَوْ مَالٍ تَحْتَ قَدَمَيَّ؛ إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ سِقَايَةِ الْحَاجِّ وَسِدَانَةِ الْبَيْتِ).**

ثُمَّ قَالَ: **(أَلاَ إِنَّ دِيَةَ الْخَطَإِ شِبْهِ الْعَمْدِ، مَا كَانَ بِالسَّوْطِ وَالْعَصَا: مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، مِنْهَا أَرْبَعُونَ فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا)**. واللفظ لأبي داود. [د٤٥٤٧/ ن٤٨٠٥/ جه٢٦٢٧/ مي٢٤٢٨].

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا ڤەکرنا مەکەهێ گۆتار دا، ڤێجا سێ جار تەکبیر کر[1] پاشی گۆت: (چو خودێ و پەرستی پێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت، پەیمانا خۆ ب جه ئینا، و بەندەیێ خۆ ب سەر ئێخست و وی ب تنێ هەڤپەیمان شکاندن، بزانن هەر فەخر و شانازییەکا د نەزانینێدا هەبوو بهێتە گۆتن و بهێتە خواستن ژ خوینێ یان ژ سەر و سامانی د بن ڤان هەردو پێت مندایە ژ بلی ئاڤدانا حەجییان و خزمەتکرنا کەعبەیێ).**

**پاشی گۆت: (بزانن خوینا کوشتنا ب خەلەتیڤە وەکی یا ژ ڤەستا، ئەوا ب ڤامچییێ و داری؛ سەد حێشترە ژ وان چلێت ئاڤز تێژکێت وان د زکێت واندا). و بێژە یا ئەبو داودییە.**

٣٢٣٨ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتَعَمِّداً دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْمَقْتُولِ، فَإِنْ شَاؤُوا قَتَلُوا، وَإِنْ شَاؤُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ، وَهِيَ: ثَلاَثُونَ حِقَّةً، وَثَلاَثُونَ جَذَعَةً، وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً، وَمَا صَالَحُوا عَلَيْهِ فَهُوَ لَهُمْ)**، وَذَلِكَ لِتَشْدِيدِ الْعَقْلِ. [ت١٣٨٧/ جه٢٦٢٦].

* حسن.

---

(١) ئانکو: گۆت: الله أكبر.

**ژ عەبدوللايێ كورێ عەمرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ باوەريدارەكى ژ قەستا بكوژيت، دێ رادەستى سەميانێت كوشتى كەن، ئەگەر ڤيان دێ كوژن[1]، و ئەگەر ڤيان دێ خوينێ وەرگرن، و ئەو ژى ب ڤى رەنگييە: سيە حێشترێت مێ يێت سێ سالى و بارهەلگر، و سيە حێشترێت مێ يێت چوار سالى تەمامكرين و چۆبنە د پێنجێدا، و چل حێشترێت ئاڤز و تێژكێت وان د زكێ واندا و ئەوا ل سەر پێكهاتين).**

٣٢٣٩ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَضَى أَنَّ مَنْ قُتِلَ خَطَأً فَدِيَتُهُ مِائَةٌ مِنَ الإِبِلِ: ثَلاَثُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ، وَثَلاَثُونَ بِنْتَ لَبُونٍ، وَثَلاَثُونَ حِقَّةً، وَعَشَرَةُ بَنِي لَبُونٍ ذَكَرٍ.

وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُقَوِّمُ دِيَةَ الْخَطَإِ عَلَى أَهْلِ الْقُرَى، أَرْبَعَمِائَةِ دِينَارٍ، أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ وَيُقَوِّمُهَا عَلَى أَثْمَانِ الإِبِلِ، فَإِذَا غَلَتْ رَفَعَ فِي قِيمَتِهَا، وَإِذَا هَاجَتْ رُخْصاً نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا.

بَلَغَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَا بَيْنَ أَرْبَعِمِائَةِ دِينَارٍ إِلَى ثَمَانِمِائَةِ دِينَارٍ، وَعَدْلُهَا مِنَ الْوَرِقِ ثَمَانِيَةُ آلاَفِ دِرْهَمٍ.

وَقَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ، وَمَنْ كَانَ دِيَةُ عَقْلِهِ فِي الشَّاءِ فَأَلْفَيْ شَاةٍ.

[د٤٥٤١، ٤٥٦٤/ ن٤٨١٥/ جه٢٦٣٠].

- زاد أبو داود والنسائي: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ الْعَقْلَ مِيرَاثٌ بَيْنَ وَرَثَةِ الْقَتِيلِ عَلَى قَرَابَتِهِمْ، فَمَا فَضَلَ فَلِلْعَصَبَةِ**). وَقَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنَّ عَقْلَ الْمَرْأَةِ بَيْنَ عَصَبَتِهَا مَنْ كَانُوا، لاَ يَرِثُونَ مِنْهَا شَيْئاً؛ إِلاَّ مَا فَضَلَ عَنْ وَرَثَتِهَا، وَإِنْ قُتِلَتْ فَعَقْلُهَا بَيْنَ وَرَثَتِهَا، وَهُمْ يَقْتُلُونَ قَاتِلَهُمْ.
- وزاد أبو داود في رواية: وَقَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي الأَنْفِ إِذَا جُدِعَ: الدِّيَةَ كَامِلَةً، وَإِذَا جُدِعَتْ ثَنْدُوَتُهُ: فَنِصْفُ الْعَقْلِ خَمْسُونَ مِنَ الإِبِلِ، أَوْ عَدْلُهَا مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ، أَوْ مِائَةُ بَقَرَةٍ، أَوْ أَلْفُ شَاةٍ.

وَفِي الْيَدِ: إِذَا قُطِعَتْ نِصْفُ الْعَقْلِ. وَفِي الرِّجْلِ: نِصْفُ الْعَقْلِ.

وَفِي الْمَأْمُومَةِ: ثُلُثُ الْعَقْلِ، ثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ مِنَ الإِبِلِ وَثُلُثٌ، أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ أَوِ الْوَرِقِ، أَوِ الْبَقَرِ، أَوِ الشَّاءِ، وَالْجَائِفَةُ مِثْلُ ذَلِكَ.

وَفِي الأَصَابِعِ: فِي كُلِّ أُصْبُعٍ عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ. وَفِي الأَسْنَانِ: فِي كُلِّ سِنٍّ خَمْسٌ مِنَ الإِبِلِ.

---

(١) وەك تۆلڤەكرن ئێك ب ئێكێ.

وَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَيْسَ لِلْقَاتِلِ شَيْءٌ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَارِثٌ، فَوَارِثُهُ أَقْرَبُ النَّاسِ إِلَيْهِ، وَلاَ يَرِثُ الْقَاتِلُ شَيْئاً).

- ولفظ النسائي وابن ماجه: وَإِذَا هَانَتْ نَقَصَ مِنْ قِيمَتِهَا عَلَى نَحْوِ الزَّمَانِ مَا كَانَ.

* حسن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان کر ئەوێ بێدەستی بهێتە کوشتن خوینا وی سەد حێشترن: سیە حێشترێت مێ یێت ئێك سال دەرباز کرین و چۆینە د سالا دوویێدا، و سیە حێشترێت مێ یێت دو سال دەرباز کرین و چۆینە د سالا سێیێدا، و سیە حێشترێت مێ یێت سێ سالی و بارهەلگر، و دەه حێشترێت نێر یێت دو سال تمام کرین و چۆبنە د سالا سێیێدا.**

**و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خوینا کوشتنا بێدەستی ل سەر خەلکێ گوندان، ب چوار سەد دیناران بها دکر، یان بەرامبەری وان ژ زیڤی و ب حێشتران بها دکر، و ئەگەر گران ببان بها بلند کر و ئەگەر ئاشکرا ببا ئەرزان بان ژ بهایی دئینا خوار.**

**ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بهایێ خوینێ گەهشتبوو چوار سەد دیناران هەتا هەشت سەد دیناران و هەڤتایێ وێ ژ زیڤی هەشت هزار دەرهەم.**

**و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو سەد چێل ل سەر خودان چێلان دانا و هەر کەسێ خوینا وی پەز بان خوین دبوو دوهزار پەز.**

- **و ئەبو داود و نەسائی زێدە کرییە: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (و خوین میراتە د نافبەرا میراتگرێت کوشتیدا بۆ خۆدان پشکان و یا زێدە بۆ میراتگرێت خوینێنە)، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان کر خوینا ل سەر ژنێ دکەڤیت ژ ئەگەرێ تاوانا وێ ل سەر مرۆڤێت وێ یێت خوینێنە یێت دویر و نێزیك، و ئەو ب چو تشتی میراتگرییا وێ ناکەن ئەو نەبیت ئەو یا کوشتی بیت و خوینا وێ بهێتە وەرگرتن و ژ**

**میراتخۆرێت خودان پشك و باران زێدە ببیت، و ئەگەر ئەو هاتە کوشتن خوینا وێ میراتە د ناڤبەرا میراتگرێت وێدا و ئەو دێ بکوژێ وێ کوژن[1].**

- **و ئەبو داوودی د ڤەگێرەکێدا زێدە کریە: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان د خوینا دفنێدا کر، ئەگەر هاتە ژێڤەکرن، ب خوینا تمام، و ئەگەر سەرێ دفنێ هاتە ژێڤەکرن نیڤ خوینا تێدا پێنجی حێشتر یان بەرامبەری وان ژ زێری و زیڤی یان سەد چێل یان هزار پەز.**

**و د خوینا دەستیدا ئەگەر هاتە ژێڤەکرن: نیڤ خوینە و د خوینا پێیدا هەکە هاتە ژێڤەکرن نیڤ خوینە.**

**و د خوینا برینا سەریدا دبیت و دگەهیتە پەردا مەژی، سیێ و سێ حێشترن، و سێکا خوینێ یان بهایێ وان ژ زێری و زیڤی یان ژ چێلان یان ژ پەزی و برینا زکی دبیت هەر ب وی رەنگییە.**

**و خوینا تلان: دەه حێشتر بۆ هەر تلەکێ و خوینا ددانان پێنج حێشتر بۆ هەر ددانەکێنە.**

**و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو تشت بۆ بکوژی نینە بلا میراتگر ژی بیت، و ئەگەر وی چو میراتگر (ژ بلی بکوژی) نە بن، هێنگێ میراتگرێ وی خەلکێ ژ هەمیان نێزکترە بۆ وی و بکوژی هیچ میرات ناگەهیتێ).**

- **و بێژەیا نەسائی و ئیبن ماجە: و ئەگەر ئەرزان بوو ژ بهایێ خۆ دێ کێم بیت ل دویڤ رۆژا خۆیە د کێم و زێدەییێدا.**

٢ . باب: ديات الأعضاء والجراح

**بابەتێ: خوینا ئەندام و برینان.**

[انظر الباب السابق].

**بەرێ خۆ بدێ بابەتێ: پێشییێ.**

---

(١) ئانکو: میراتگرێت وێ دێ بریارێ دەن بکوژن یان نە، ئەگەر ڤیان تۆلێ ڤەکەن و میراتی نەوەرگرن دێ بریارا کوشتنێ دەن و مافێ وانە تۆلوەرگرتنێ هەلبژێرن یان عەفوکرنێ و وەرگرتنا خوینێ.

٣٢٤٠ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ، وَالْأَسْنَانُ سَوَاءٌ، الثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ، هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ**). [د٤٥٥٩/ ت١٣٩١/ ن٤٨٦٤/ جه٢٦٥٠].

- وعند الترمذي: (**فِي دِيَةِ الْأَصَابِعِ: الْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ سَوَاءٌ، عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ لِكُلِّ أُصْبُعٍ**).
- وفي رواية لابن ماجه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَضَى فِي السِّنِّ خَمْساً مِنَ الْإِبِلِ.

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تبل وەکی ئێکن، و ددان وەکی ئێکن، و ددانێت بەرێ دەڤی و یێت کورسی وەکی ئێکن)** [1].

- **و ل دەڤ ترمزی: د راستا خوینا تبلاندا: (تبلێت هەردو دەستان و هەردو پێیان وەکی ئێکن، دەه حێشتر بۆ هەر تبلەکێ).**
- **و د ڤەگێرەکا ئیبن ماجەیدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ددانانsee فەرمان ب پێنج حێشتران کر.**

٣٢٤١ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**فِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ**).
[٤٥٦٦/ ت١٣٩٠/ ن٤٨٦٧/ جه٢٦٥٥/ مي٢٤١٧]

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د بریندارکرنا دگەهیتە هەستی و ئاشکەرا دکەت پێنج حێشترن).**

## ٣ ـ باب: دية الجنين.

## بابەتێ: خوینا بچویکێ د زکیدا.

٣٢٤٢ - (ق) عَنِ المغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ: سَأَلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ عَنْ إِمْلَاصِ المرْأَةِ ـ هِيَ الَّتِي يُضْرَبُ بَطْنُهَا فَتُلْقِي جَنِيناً ـ فَقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِيهِ شَيْئاً؟ فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ: مَا هُوَ؟ قُلْتُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**فِيهِ غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ**). فَقَالَ: لاَ تَبْرَحْ حَتَّى تَجِيئَنِي بِالْمَخْرَجِ فِيما قُلْتَ. فَخَرَجْتُ، فَوَجَدْتُ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ، فَجِئْتُ بِهِ، فَشَهِدَ مَعِي: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**فِيهِ غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ**). [خ٧٣١٧، ٧٣١٨ (٦٩٠٥، ٦٩٠٦)/ م١٦٨٣].

---

**(١) ئانکو: جوداهی د ناڤبەرا خوینا تبلێ و تبلێدا و ددانی و ددانیدا نینە خوینا هەمیان وەکی ئێکە.**

**ژ موغیرەیێ کوڕێ شوعبەیی (ﷺ) گۆت: عومەرێ کوڕێ خەتتابی پرسیارا حوکمێ هاڤێتنا بچویکێ مری ژ لایێ ژنێڤە کر ـ ئەو ژی ئەڤەیە دربەکی ل زکێ ژنێ بدەن هەتا بچویکێ وێ بمریت و ژ بەر دچیت ـ ئینا گۆت: کێ ژ هەوە تشتەك د ڤێ چەندێدا گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوویە؟ من گۆت: من، ئینا گۆت: ئەو چییە؟ من گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (بەندەیەکی یێ کێماسی پێ تێدا زەلام بیت یان ژن) ئینا گۆت: تو ناراوەستی هەتا شاهدەکی ل سەر ئەوا تە گۆتی نەئینی، ئەز دەرکەفتم من موحەممەدێ کوڕێ مەسلەمەیی دیت من ئینا دەڤ و شەهدەیی د گەل من دا: کو وی گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (بەندەیەکی یێ کێماسی پێ تێدا زەلام بیت یان ژن).**

٤ ـ باب: الدية على العاقلة

**بابەت: خوینا ل سەر کەسوکاران.**

٣٢٤٣ – عَنْ مَالِك، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لَيْسَ عَلَى الْعَاقِلَةِ عَقْلٌ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ، إِنَّمَا عَلَيْهِمْ عَقْلُ قَتْلِ الْخَطَإِ.

وَعَنْهُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّهُ قَالَ: مَضَتِ السُّنَّةُ أَنَّ الْعَاقِلَةَ لاَ تَحْمِلُ شَيْئاً مِنْ دِيَةِ الْعَمْدِ؛ إِلاَّ أَنْ يَشَاؤُوا ذَلِكَ.

وَعَنْهُ: إِنَّ ابْنَ شِهَابٍ قَالَ: مَضَتِ السُّنَّةُ فِي قَتْلِ الْعَمْدِ حِينَ يَعْفُو أَوْلِيَاءُ الْمَقْتُولِ: أَنَّ الدِّيَةَ تَكُونُ عَلَى الْقَاتِلِ فِي مَالِهِ خَاصَّةً؛ إِلاَّ أَنْ تُعِينَهُ الْعَاقِلَةُ عَنْ طِيبِ نَفْسٍ مِنْهَا. [ط١٦١٨].

**ژ مالکی (ﷺ) ژ هاشمێ کوڕێ عوروەیی ژ بابێ خۆ، وی دگۆت: خوینا کوشتنا ژ قەستا ل سەر کەسوکاران نینە تنێ خوینا کوشتنا بێدەستی ل سەر وانە.**

**و ژ وی ژ ئیبن شهابی وی گۆت: سونەت هۆسا د خوینا کوشتنا ژ قەستادا بۆرییە چو ژێ ل سەر کەسوکاران نینە ئەو نەبیت وان بڤێت.**

**و ژ وی: کوڕێ شهابی گۆت: سونەت د خوینا کوشتنا ژ قەستادا هۆسا یا بۆری ئەگەر سەمیانێت کوشتی ببۆرن خوین ل سەر بکوژییە د مالێ وی یێ تایبەتدا، ئەو نەبیت کەسوکار ژ دلخۆشییا خۆ هاریکارییا وی تێدا بکەن.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

فەرمانداریيا گشتی

و کاروبارێت فەرمانداریيێ

# الكتاب الرابع

# الحدود

# کتێبا چوارێ

# کتێبا سزایان

## ١ ـ باب: الحدود كفارات

### بابەتێ: سزادان دبنە گونەهژێبرن

٣٢٤٤ - (ق) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه ـ وَكَانَ شَهِدَ بَدْراً، وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ ـ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ ـ وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ ـ: (**بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئاً، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُم وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ. فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذلِكَ شَيْئاً فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذلِكَ شَيْئاً ثُمَّ سَتَرَهُ اللهُ فَهُوَ إِلَى اللهِ، إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ**). فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذلِكَ. [خ١٨/ م١٧٠٩]

ژ عوبادەیێ کوڕێ سامتی (رضي الله عنه) و ئەو ژ وان بوو یێت پشکداری د بەدرێدا کری، و ئەو ئێك ژ بەرپرسێت شەڤا عەقەبەیێ بوو[1]، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: و کۆمەکا هەڤالێت وی ل دۆرماندۆرێت وی بوون: (**بەیعەتێ و پەیمانێ بدەنە من ل سەر وێ هوین چو هەڤپشکان بۆ خودێ چێ نەکەن، و دزییێ نەکەن، و زنایێ نەکەن، و عەیالێت خۆ نەکوژن، و چو بێبەختی و درەوان ب دەست و پێت خۆ نەکەن [2] و نەگوهدارییێ د باشییێدا نەکەن، و هەر کەسێ ژ هەوە ب دورستی پەیمانا خۆ ب جھ ئینا ئەو خەلاتێ وی ل دەڤ خودێیە، و هەر کەسێ د دنیایێدا کەفتە تشتەك د ڤاناندا و هاتە سزادان ئەو بۆ وی گونەهژێبرنە، و هەر کەسێ کەفتە تشتەك د ڤاناندا و هاتە پەردەکرن ئەو ل دەڤ خودێیە**).

٣٢٤٥ - عَنْ عَلِيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ أَصَابَ حَدّاً فَعُجِّلَ عُقُوبَتَهُ فِي الدُّنْيَا، فَاللهُ أَعْدَلُ مِنْ أَنْ يُثَنِّيَ عَلَى عَبْدِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الْآخِرَةِ. وَمَنْ أَصَابَ حَدّاً فَسَتَرَهُ اللهُ عَلَيْهِ، وَعَفَا عَنْهُ، فَاللهُ أَكْرَمُ مِنْ أَنْ يَعُودَ إِلَى شَيْءٍ قَدْ عَفَا عَنْهُ**). [ك٣٦٦٤/ ت٢٦٢٦/ جه٢٦٠٤]

* قال الذهبي: على شرطهما.

---

(١) ئەو شەڤا خەلکێ مەدینەیێ ل مینایێ پەیمان و بەیعەت داینە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و دوازدە بەرپرس و سەرکار ژ وان ناڤکرین و ژێگرتین و ژ نەگەرێ وێ پەیمانێ مەشەختبوون چێ بوو.

(٢) دەست و پێ هاتنە ب ناڤکرن، چونکی پتریا گونەهان ب وان دهێنە کرن.

ژ عەلی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر کەسێ کەفتە د گونەهکا سزایێ وێ دەستنیشانکریدا، و د دنیایێدا سزایێ وێ بۆ لەز لێ هاتبیتە کرن، خودێ ژ وێ دادپەروەرترە رۆژا قیامەتێ بەندەیێ خۆ دوبارە (دوجارکی) سزا بدەت، و هەر کەسێ کەفتە د گونەهەکا سزایێ وێ دەستنیشانکریدا، و د دنیایێدا خودێ پەردە کربیت و لێ بۆری بیت، خودێ ژ هندێ مەردترە بزڤریتە تشتەکێ لێبۆری بیت).**

٢ ـ باب: لا شفاعة في الحدود

**بابەتێ: بەرەڤانی د سزایاندا نینە.**

٣٢٤٦ – (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ قُرَيْشاً أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: وَمَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللهِ (ﷺ)؟ فَقَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، حِبُّ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)؟ فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ)** ؟ ثُمَّ قامَ فَاخْتَطَبَ، ثُمَّ قَالَ: **(إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ. وَايْمُ اللهِ، لَوْ أَنَّ فاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)**. [خ٣٤٧٥ (٢٦٤٨)/ م١٦٨٨].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: قورەیشییان خەما ژ نا مەخزوی هەلگرت ئەوا دزی کری، و گۆتن: کی دێ د راستا وێدا د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئاخڤیت؟ گۆتن: کی جسارەت دکەت، ئوسامەیێ کورێ زەیدی نەبیت، خۆشتڤییێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئوسامە د گەل ئاخفت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(تو بەرەڤانییێ د حەددەکی ژ حدودێت خودێدا دکەی[1])؟** پاشی رابوو گۆتارەك خواند، پاشی گۆت: **(ب راستی یا یێت بەری هەوە هیلاك بری، ئەوان هەکە یێ مەزن ژ وان دزی کربا د هێلان، و هەکە یێ بێچارە ژ وان دزی کربا، سزا ددا نا سەر، ئەز ب خودێ کەمە هەکە فاتما یا کچا موحەممەدی دزی کربا دا دەستێ وێ برم).**

(١) حدود کۆمە و کتا وێ حەددە، و حەد: سزایەکێ دەستنیشانکرییە ل سەر وی دکەڤیت یێ وێ گونەهێ دکەت یا ئەڤ سزایە پێڤە گرێدایی (ئەو ژی ئەڤەنە: زنا و گونەهبارکرنا دەهمن پاکان ب زنایێ و دزی و مەی ڤەخوارن و رێگری). و حەد: ئەو گونەهبارییە یا شەریعەتی سزایێ وێ دیار کربیت وەك مافەك ژ مافێت خودایێ مەزن.

## ٣ . باب: حد الزنى وإثم فاعله

## بابەتێ: سزایێ زنایێ و گونەها بکەرێ وێ.

٣٢٤٧ - (م) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (خُذُوا عَنِّي خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلاً، الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ: جَلْدُ مِائَةٍ، وَنَفْيُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ: جَلْدُ مِائَةٍ، وَالرَّجْمُ).[م١٦٩٠].

**ژ عوبادەیێ کوڕێ سامتی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژ من تێ بگەهن و ژ من وەرگرن، ژ من تێ بگەهن ژ من وەرگرن، خودێ رێك بۆ وان ڤەکر[1]، سزایێ زنا کچێ و کوڕی[2] سەد ڤامچینە و دویرئێخستنا سالەکێ، و سزایا زنا شویکرییێ و ژنئینایی سەد ڤامچینە و بەربارانکرنە[3]).**

٣٢٤٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا زَنَى الرَّجُلُ خَرَجَ مِنْهُ الْإِيمَانُ، كَانَ عَلَيْهِ كَالظُّلَّةِ، فَإِذَا أَقْلَعَ رَجَعَ إِلَيْهِ الْإِيمَانُ). [د٤٦٩٠/ ت: بإثر الحديث ٢٦٢٥].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر زەلامی زنا کر[4] باوەری ژێ دەرکەفت و هنداڤ وەکی پرتە عەورەکی لێ هات، ڤێجا ئەگەر هێلا و ژێ دەرکەفت، باوەری لێ زڤریڤە).**

---

(١) ئەڤە ئیشارەتە بۆ هندێ ل دەستپێکا ئیسلامێ سزایێ ژنا زناکەر کچ بیت یان شویکری بیت ئەو بوو ل مال بهێتە زیندانکرن هەتا دمریت یان خودێ دەرگەهەکی بۆ ڤەکەت، هەروەکی ئەڤە د سۆرەتا نیسائدا هاتی، خودایێ مەزن دبێژیت: ﴿وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا﴾ و ئەوێت زنایێ دکەن ژ ژنکێت هەوە، چار شاهدان ژ خۆ ل سەر بگرن، ڤێجا ئەگەر شادەیی ل سەر دان، د مالێت وانڤە ئاسێ بکەن هەتا دمرن، یان ژی هەتا خودێ رێکەکا ڤورتالبوونێ بۆ ڤەدکەت و ددانیت، هەلبەت ئەڤ فەرمانە یا دەستپێکا ئیسلامێ بوو، پاشی هاتە ڕاکرن و ئەو راکرن رێکە بۆ وان.

(٢) ڤێجا کوڕکی زنا د گەل کچێ کربیت یان د گەل شویکرییێ.

(٣) زانا دبێژن: ئەڤە د دەستپێکا ئیسلامێدا بوو، کۆمکرن د ناڤبەرا سزایا ڤامچییان و بەربارانکرنێ پاشی پێغەمبەری (ﷺ) سزایا وان کرە بەربارانکرن ب تنێ.

(٤) مەخسەد پێ زەلام و ژنە هەر کەسێ ژ وان کەفتە د زنایێدا باوەری ژێ دەردکەڤیت.

٣٢٤٩ – عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**الْعَيْنَانِ تَزْنِيَانِ، وَالْيَدَانِ تَزْنِيَانِ، وَالرِّجْلَانِ تَزْنِيَانِ، وَالْفَرْجُ يَزْنِي**). [حم٣٩١٢].

* صحيح، وإسناده حسن.

[وانظر: في أن الزنى سبب في انتشار الأمراض ٣٩٢١].

**(هەردو چاڤ زنایێ دکەن[1] و هەردو دەست زنایێ دکەن[2] و هەردو پێ زنایێ دکەن[3] و شەرمینگەهـ زنایێ دکەت).**

## ٤ ـ باب: حد الزاني المحصن الرجم

## بابەتێ: سزایا یێ ب هەڤژین بەربارانکرنە[4].

٣٢٥٠ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ـ وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): إِنَّ اللهَ بَعَثَ مُحَمَّداً (ﷺ) بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أَنْزَلَ اللهُ آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَرَأْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا. رَجَمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ. فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ، أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: وَاللهِ مَا نَجِدُ آيَةَ الرَّجْمِ فِي كِتَابِ اللهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللهُ. وَالرَّجْمُ فِي كِتَابِ اللهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أُحْصِنَ، مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ، أَوِ الاِعْتِرَافُ. [خ٦٨٣٠ (٢٤٦٢)/ م١٦٩١].

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەرێ کوڕێ خەتتابی گۆت: و ئەو ل سەر مینبەرا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ روینشتی بوو: (ب راستی خودێ موحەممەد (ﷺ) ب راستییێ هنارت و قورئان بۆ ئینا خوار، و ژ وێ یا تێدا ئینایە خوار ئایەتا بەربارانکرنێیە، و مە ئەو دخواند و ئەم تێ دگەهشتین و مە ژبەر کر، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەربارانکرن یا کری، و مە ژی پشتی وی بەربارانکرن یا کری،**

---

(١) زنا چاڤان بەرێخۆدانا حەرامە.

(٢) زنا دەستان گرتن و دستکرنە.

(٣) زنا پێیان پێنگاڤ هاڤێتنە.

(٤) هەرچەندە یا زانایە پێش و پاش ژ زانایان د گەل هندێنە سزایێ بەربارانکرنا زناکەری د ئیسلامێدا یێ بنەجهە و جهێ گۆمانێ نینە، بەلێ هندە بۆچۆن پێت هەین دبێژن: ئەو سزا د دەستپێکا ئیسلامێدا بوو بەری سۆرەتا نور بێتە خوار، ژ وان زانایان: محمد أبو زوهرە و دکتۆر موستەفا زەلەمی، و قەرزاوی د بۆچۆنەکا خۆدا دبێژیت: بەلێ یا بنەجهە بەلێ تەعزیرە نە حەددە و ب جهێنانا وێ دزڤریتە دیتنا حاکمداری وەکی دویرئێخستنا زناکەری یان زناکەرێ سالەکێ بۆ جهەکێ دی.

**ئەز دترسم ئەگەر دەمەکێ درێژ د سەر خەلکیڕا ببۆریت ئێك ژ وان بێژیت: ئەز ب خودێ کەمە ئەم ئایەتا بەربارانکرنێ د قورئانێدا نابینین، ڤێجا ژبەر هێلانا فەرزەکا خودێ ئینایە خوارێ بەرزە ببن، و بەربارانکرن د قورئانێدا یا بنەجهە ل سەر وی یێ زنایێ دکەت و ب هەڤژین بیت ژ زەلام و ژنان ئەگەر بەلگە ل سەر رابوو، یان دوگیانی دورست بوو یان ل سەر خۆ ئاشکرا کر.**

٣٢٥١ - (ق) عَنْ جابِرٍ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) وَهْوَ فِي المسْجِدِ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ زَنَى، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَتَنَحَّى لِشِقِّهِ الَّذِي أَعْرَضَ، فَشَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ، فَدَعَاهُ فَقَالَ: **(هَلْ بِكَ جُنُونٌ؟ هَلْ أَحْصِنْتَ)** ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ بِالمصَلَّى، فَلَمَّا أَذْلَقَتْهُ الحِجَارَةُ جَمَزَ، حَتَّى أُدْرِكَ بِالحَرَّةِ، فَقُتِلَ. [خ٥٢٧٠/ م١٦٩١].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ژ (هۆزا) ئەسلم هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو ل مزگەفتێ بوو، ئینا گۆت: وی زنا یا کری پێغەمبەری (ﷺ) بەرێ خۆ ژێ وەرگێرا، زڤری وی رەخێ بەرێ خۆ دایێ، و چوار جارا شەهدەیی ل سەر خۆ دا زنا یا کری، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گازی کرێ و گۆت: (ئەرێ تو یێ دینی؟ و تە ژن ئینایە)؟ گۆت: بەلێ، ژ بەر هندێ فەرمان پێ کر د نڤێژگەهێدا[1] بهێتە بەربارانکرن، ڤێجا دەمێ بەران بێزار کری و ئێشاندی ب لەز رەڤی هەتا ل جهێ بەرەشیشکێت رەش (ل خورویێ) ڤێڕا گەهشتین و هاتە کوشتن.**

## ٥ ـ باب: حد الزاني غير المحصن

## بابەتێ: سزایێ زناکەرێ ژن نەئینایی و شوی نەکری.

٣٢٥٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خالِدٍ الجُهَنِيِّ رضي الله عنهما، أَنَّهُمَا قالاَ: إِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنْشُدُكَ اللهَ إِلاَّ قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللهِ، فَقَالَ الخَصْمُ الآخَرُ، وَهْوَ أَفْقَهُ مِنْهُ: نَعَمْ، فَاقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللهِ، وَائْذَنْ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(قُلْ)**. قَالَ: إِنَّ ابْنِي كانَ عَسِيفاً عَلَى هَذَا، فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ، وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي الرَّجْمَ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ، فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ، فَأَخْبَرُونِي: أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عامٍ، وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ.

---

(١) نڤێژگەهـ دکەڤیتە دەرڤەی مالان ل مەدینەیێ، نڤێژێت جەژنان لێ دهاتنە کرن.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللهِ: الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عامٍ. اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا). قَالَ: فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ، فَأَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَرُجِمَتْ. [خ٢٧٢٤، ٢٧٢٥ (٢٣١٤، ٢٣١٥)/ م١٦٩٧، ١٦٩٨].

**ژ ئەبی هورەیرە و زەیدێ کورێ خالدێ جوهەنی (خودێ ژ وان رازی بیت) هەردوکان گۆت: زەلامەك ژ کۆچەرە عەرەبان هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز ب خودێ داخوازێ ژ تە دکەم تو ب قورئانێ فەرمانێ بۆ من بکە، و هەڤرکێ دی ژ وی تێگەهشتیتر بوو گۆت: بەلێ ب کتێبا خودێ فەرمانێ د ناڤبەرا مەدا بکە، و دەستویرییێ بدە من، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بێژە) گۆت: ب راستی کورێ من کرێگرتی بوو ل دەڤ ڤی ـ و زنا یا د گەل ژنا وی کری، و گەهشتە من بەربارانکرن ل سەر کورێ منە، ئینا من سەد پەز و جارییەك فیدیە پێشڤە دان، و من پرسیارا زانایان کر گۆتنە من: بەس سەد قامچی و دویرئێخستنا سالەکێ ل سەر کورێ من، و بەربارانکرن ل سەر ژنا ڤی زەلامییە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ئەز دێ ب کتێبا خودێ فەرمانێ د ناڤبەرا هەوەدا کەم، جارییە و پەز بۆ تە دزڤرینە، و سەد قامچی و دویرئێخستنا سالەکێ ل سەر کورێ تەنە، و ئەی ئونەیس هەرە دەڤ ژنا ڤی زەلامی ئەگەر ل سەر خۆ ئاشکرا کر بەرباران بکە).**

### ٦ ـ باب: إقامة الحد على أهل الذمة

### بابەتێ: جهئینانا سزایان ل سەر بەختومرگرتییان.

٣٢٥٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ الْيَهُودَ جاؤُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلاً مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(ما تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ)**؟ فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ: كَذَبْتُمْ، إن فِيهَا الرَّجْمَ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا، فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، فَقَرَأَ ما قَبْلَهَا وَما بَعْدَهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ: ارْفَعْ يَدَكَ، فَرَفَعَ يَدَهُ، فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ، فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَرُجِمَا.

قَالَ عَبْدُ اللهِ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَجْنَأُ عَلَى الْمَرْأَةِ يَقِيهَا الْحِجَارَةَ. [خ٣٦٣٥ (١٣٢٩)/ م١٦٩٩].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: جوهی هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ وی بەحس کرن زەلامەکی و ژنەکێ ژ وان زنا یا کری، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە وان: (هوین چ د تەوراتێدا د راستا بەربارانکرنێدا دبینن)؟ گۆتن: ئەم وان شەرمزار دکەین و دێ هێنە قامچیکرن، ئینا عەبدوللایێ کورێ سەلامی گۆتە وان: هوین درەوان دکەن، ب راستی بەربارانکرن یا تێدا، ئێکی ژ وان دەستێ خۆ دانا سەر ئایەتا بەربارانکرنێ و یا بەری وێ و پشتی وێ خواند، ئینا عەبدوللایێ کورێ سەلامی گۆتێ: کا دەستێ خۆ راکە، دەستێ خۆ راکر ئایەتا بەربارانکرنێ تێدا دیت، گۆتن: موحەممەدی راست دبێژیت: ئایەتا بەربارانکرنێ یا دتێدا، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان ب وان هەردووان کر هاتنە بەربارانکرن.

عەبدوللایی گۆت: من ئەو زەلام دیت خۆ ب سەردادا و خۆ ددا بەر ژنێ ژ بەربارانێ دپاراست.

### ٧ـ باب: تأخير إقامة الحد على الحامل

### بابەتێ: گیرۆکرنا جهێنانا سزایی ل سەر ژنا ب دوگیان.

٣٢٥٤ - (م) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ: أَنَّ امْرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ أَتَتْ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ)، وَهِيَ حُبْلَى مِنَ الزِّنَى، فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ! أَصَبْتُ حَدّاً فَأَقِمْهُ عَلَيَّ. فَدَعَا نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) وَلِيَّهَا، فَقَالَ: (**أَحْسِنْ إِلَيْهَا، فَإِذَا وَضَعَتْ فَائْتِنِي بِهَا**) ، فَفَعَلَ. فَأَمَرَ بِهَا نَبِيُّ اللهِ (ﷺ)، فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَرُجِمَتْ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: تُصَلِّي عَلَيْهَا؟ يَا نَبِيَّ اللهِ! وَقَدْ زَنَتْ؟ فَقَالَ: (**لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً، لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ. وَهَلْ وَجَدْتَ تَوْبَةً أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا للهِ تَعَالَى**) ؟. [م١٦٩٦].

ژ عیمرانێ کورێ (حەصین)ی (رضي الله عنه) گۆت: ژنەك ژ جوهەینییان هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو ب زنایێ یا ب حال بوو، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من حەددەکێ کری، حەددی دانە سەر من[1] پێغەمبەری (ﷺ) جابا سەرکارێ وێ فرێکر و گۆتێ: (چاڤێ خۆ بدێ و هەکە حەملێ خۆ دانا وەرە دەڤ من و بێژە من)، و وەکر،

---

(١) ئانکو: من زنا یا کری و یا دایە سەر تخوبێ خودێ، فێجا من پاقژکە و چ حوکم و حەد و سزا ل سەر من دچیت دانە سەر من.

**پێغەمبەری (ﷺ) فەرمانا وێ کر، جلکێت وێ ل وێ هاتنە شداندن، پا شی ئەمرێ خۆ د راستا وێدا دا، هاتە بەربارانکرن پاشی پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژ ل سەر کر. ئینا عومەری گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو نڤێژێ ل سەر دکەی و وێ زنا یا کری؟ گۆت: (ب راستی وێ تەوبەکا کری هەکە ل سەر حەفتێ کەسێت خەلکێ مەدینێ بەلاڤ کربا، دا تێرا وان کەت، ما چ ژ وێ ڤەدرترە رحا خۆ دا خودێ).**

٨ . باب: ما جاء فيمن عمل عمل قوم لوط

**بابەتێ: ئەوا د راستا ویدا هاتی یێ کارێ ملەتێ لووتی کری.**

٣٢٥٥ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ**). [د٤٤٦٢/ ت١٤٥٦/ جه٢٥٦١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ هەوە دیت کارێ ملەتێ لووتی دکەت[1]، بکەر و بەرکاری بکوژن).**

٩ . باب: حد شرب الخمر

**بابەتێ: سزایێ عەرق ڤەخۆری.**

٣٢٥٦ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) ضَرَبَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ. [خ٦٧٧٣/ م١٧٠٦].

وفي رواية لمسلم: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الْخَمْرَ. فَجَلَدَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ، نَحْوَ أَرْبَعِينَ.

وفي رواية له: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) جَلَدَ فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ. ثُمَّ جَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ. فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ، وَدَنَا النَّاسُ مِنَ الرِّيفِ وَالْقُرَى، قَالَ: مَا تَرَوْنَ فِي جَلْدِ الْخَمْرِ؟ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا كَأَخَفِّ الْحُدُودِ. قَالَ: فَجَلَدَ عُمَرُ ثَمَانِينَ.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) لێدان ب چەڤێت دارقەسپێ و شمکان ل سەر ڤەخوارنا عەرەقێ دکر، و ئەبوبەکری چل قامچی ددانان.**

---

(١) ئانکو: زەلام بچیتە دەڤ زەلامی.

**و د ڤەگێرا موسلمیدا: زەلامەك ئینابوو دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) عەرەق ڤەخوار بوو، ئینا ب دو چەڤێت دارقەسپێ نێزیکی چل داران لێدا.**

**و د ڤەگێرەکا ویدا: پێغەمبەری (ﷺ) ل سەر ڤەخوارنا عەرەقێ ب چەڤێت دارقەسپێ و شمکان لێدان دکر، پاشی ئەبوبکری چل قامچی دانان، ڤێجا دەمێ عومەر هاتی و خەلك نێزیکی گوندك و گوندان بویین، گۆت: هوین د لێدانا عەرق ڤەخوارنێدا چ دبێژن؟ عەبدولرەحمانێ کورێ عەوفی گۆت: ئەز دبینم بکەیە سڤکترین سزایێ حدودان[1]. گۆت: عومەری هەشتێ قامچی لێدان[2].**

٣٢٥٧ - (ق) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: ما كُنْتُ لأُقِيمَ حَدّاً عَلَى أَحَدٍ فَيَمُوتَ، فَأَجِدَ فِي نَفْسِي، إِلاَّ صَاحِبَ الخَمْرِ، فَإِنَّهُ لَوْ مَاتَ وَدَيْتُهُ، وَذلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لَمْ يَسُنَّهُ. [خ٦٧٧٨/ م١٧٠٧ (٣٩)].

**ژ عەلییێ کورێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز چو سزایان ل سەر کەسێ نادانم و بمریت و ئەز بۆ ب خەم بکەڤم، عەرق ڤەخۆر نەبیت، ب راستی ئەگەر ئەو د بن سزایێڤە مر دێ خوینا وی دەم، ئەو ژی چونکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هژمارەکا تایبەت تێدا دیار نەکرییە[3].**

٣٢٥٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِذَا سَكَرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ سَكَرَ فَاجْلِدُوهُ، ثُمَّ إِنْ سَكَرَ فَاجْلِدُوهُ، فَإِنْ عَادَ الرَّابِعَةَ فَاقْتُلُوهُ). [د٤٤٨٤/ ن٥٦٧٨/ جه٢٥٧٢/ مي٢١٥١].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر سەرخۆش بوو قامچی بدەن، پاشی ئەگەر سەرخۆش بوو قامچی بدەن، پاشی ئەگەر سەرخۆش بوو قامچی بدەن، و ئەگەر بۆ جارا چوارێ لێزڤری بکوژن)[4].**

---

**(١) حەد: ئەو گونەهبارییە یا شەریعەتی سزایێ وێ دیار کربیت وەك مافەك ژ مافێت خودایێ مەزن.**

**(٢) ئانکو: دژوارتر ل سەر دەمێ ئەبوبەکری، ل سەر دەمێ وی چل قامچی ل عەرەق ڤەخۆری ددان.**

**(٣) ئانکو: پێغەمبەری (ﷺ) هژمارەکا قامچییان د راستا ویدا دیار نەکرییە وی ب بەلگێت دارقەسپێ و شمکان لێددا و ئەبوبەکری چل قامچی لێدان و عومەری زێدەکرن کرنە هەشتێ قامچی.**

**(٤) هەر بۆ زانین: زانا ل سەر کوشتنا عەرەق ڤەخۆری بۆ جارا چارێ د نەلێکن ل سەر پتر بۆچۆنەکێ:**

## ١٠ ـ باب: كراهة لعن شارب الخمر

## بابەتێ: نەباشییا لەعنەتکرنا عەرەق ڤەخۆری.

٣٢٥٩ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: أُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ، قَالَ: (**اضْرِبُوهُ**). قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَمِنَّا الضَّارِبُ بِيَدِهِ، وَالضَّارِبُ بِنَعْلِهِ، وَالضَّارِبُ بِثَوْبِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: أَخْزَاكَ اللهُ، قَالَ: (**لاَ تَقُولُوا هكَذَا، لاَ تُعِينُوا عَلَيْهِ الشَّيْطَانَ**). [خ٦٧٧٧].

**ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ئینا دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عەرەق ڤەخواربوو، گۆت: (لێبدەن)، ئەبو هورەیرە گۆت: ژ مە هەبوو ب دەستێ خۆ لێدای، و ژ مە هەبوو ب شمکا خۆ لێدای و ژ مە هەبوو ب کراسێ خۆ لێدای. بەلێ دەمێ چۆی هندەکان گۆت: خودێ رەزیلکەت، گۆت: (ڤێ نەبێژن، و هاریکارییا شەیتانی ل سەر نەکەن).**

٣٢٦٠ - (خ) عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ: أَنَّ رَجُلاً عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) كانَ اسْمُهُ عَبْدَ اللهِ، وَكانَ يُلَقَّبُ حِمَاراً، وَكانَ يُضْحِكُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، وَكانَ النَّبِيُّ (ﷺ) قَدْ جَلَدَهُ فِي الشَّرَابِ، فَأُتِيَ بِهِ يَوْماً فَأَمَرَ بِهِ فَجُلِدَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: اللَّهُمَّ الْعَنْهُ، مَا أَكْثَرَ مَا يُؤْتَى بِهِ؟! فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ تَلْعَنُوهُ، فَوَاللهِ مَا عَلِمْتُ إِلاَّ أَنَّهُ يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ**). [خ٦٧٨٠].

---

**نێك: جمهورێ زانایان دبێژیت: نەڤ فەرمووده ب فەرموودەیا پێغەمبەری (ﷺ) نەوا بوخاری و موسلمی ڤەگێرایی یا نەسخ کرییە: (لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ؛ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، والمُفَارِقُ لِدِينِهِ التَّارِكُ لِلْجَمَاعَةِ).**

**(نەدورستە مرۆڤێ موسلمان شەهدە بدەت کو ب راستی چو خودایێت راست و دورست و هەژی عیبادەتی نینن خودێ نەبیت و نەز پێغەمبەرێ ویمە و بهێتە کوشتن ب سێ تشتان نەبیت: رح ب رحێ (مرۆڤ ب مرۆڤی) و زناکەر و زناکەرا ب هەڤژین و یێ ژ دینێ خۆ دەرکەفتی و موسلمان هێلاین).**

**دو: کوشتن یا بنەجهە بەلێ نە وەك حەددەك (سزایەکێ دەستنیشانکری و دڤێت بهێتە کوشتن) بەلکی وەك هەلبژارتنەك د دەستێ فەرمانداریێدا نەگەر دیت بەرژەوەندی دخوازیتە هندێ دێ هێتە کوشتن وەك پاشڤەبرن نە وەك سزایەکێ دەستنیشانکری و نەڤە بۆچۆنا ئیبن تەیمییە.**

**سێ: نەخێر دێ هێتە کوشتن هەروەکی د فەرموودەیێدا هاتی، و ئاشکەرایە بەلگە پشتەڤانییا بۆچۆنا جمهورێ زانایان دکەن.**

ژ عومەرێ کورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) ناڤێ وی عەبدوللا بوو و ب حیماری دهاتە ناسناڤکرن، و وی کەنییێ پێغەمبەری (ﷺ) دئینا ، و پێغەمبەری (ﷺ) ل سەر ڤەخوارنا عەرقێ لێدابوو، ڤێجا رۆژەکێ ئینا و فەرمان پێ کر هاتە لێدان، ئینا زەلامەکی ژ وی خەلکی گۆت: ئەی خودا لەعنەتان لێ بکە، چەند گەلك دهێتە ئینان؟! ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(لەعنەتان لێ نەکەن ئەز ب خودێ کەمە من نەزانییە ئەو نەبیت ئەو حەژ خودێ و پێغەمبەرێ وی دکەت).**

١١ ـ باب: حد السرقة ونصابها

**بابەتێ: سزایێ دزییێ و بهایێ وێ.**

٣٢٦١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لَعَنَ اللهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ). [خ٦٧٨٣/ م١٦٨٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خودێ لەعنەت یا ل دزیکەری کری خۆزا عەسکەری ددزیت دەستێ وی دهێتە برین و کنفی ددزیت دەستێ وی دهێتە برین).**

٣٢٦٢ - (ق) عَنْ عائِشَةَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (تُقْطَعُ الْيَدُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِداً). [خ٦٧٨٩/ م١٦٨٤].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب چارێك دیناری و پێڤەلتر دەست دهێتە برین).**

١٢ ـ باب: حرز الأَشياء بحسبها

**بابەتێ: جهێ پاراستنا تشتان دویڤوانە.**

٣٢٦٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ ماشِيَةَ امْرِئٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ، فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ، فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ؟ فَإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَاتِهِمْ، فَلاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ ماشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ). [خ٢٤٣٥/ م١٧٢٦].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(کەس پەزێ کەسێ نەدۆشیت ب دەستویریا وی نەبیت، ما ئێك ژ هەوە حەز دکەت ئێك بهێتە د ئۆدا وی یا ڤویتیڤە، و کەنتۆرا وی یا ڤویتی بشکێنیت، ڤێجا خوارنا**

**وی بەلاڤ ببیت؟ ب راستی گوهانێت پەزێت وان خوارنێت وان بۆ وان هەلدگرن، ڤێجا بلا کەس پەزێ کەسێ نەدۆشیت ب دەستویرییا وی نەبیت).**

**١٣ . باب: حد الردة**

**بابەتێ: سزایێ خرپانێ.**

٣٢٦٤ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسى: أَنَّ رَجُلاً أَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ، فَأَتَى مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ وَهْوَ عِنْدَ أَبِي مُوسى، فَقَالَ: ما لِهٰذَا؟ قالَ: أَسْلَمَ ثُمَّ تَهَوَّدَ، قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى أَقْتُلَهُ، قَضَاءُ اللهِ تَعَالى وَرَسُولِهِ (ﷺ).

[خ٧١٥٧(٢٢٦١)/م: الإمارة ١٧٣٣(١٥)].

[وانظر: ٣٢٢٣، ٣٢٢٨][(١)].

**ژ ئەبی مووسایی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك موسلمان ببوو، پاشی بوو جوهی، ئینا موعازێ کورێ جەبەلی هاتە دەڤ ئەبی مووسایی و ئەو کەس ل دەڤ وی بوو، ئینا گۆت: ئەڤە چییە؟ گۆت: ئەڤە موسلمان ببوو پاشی بوو جوهی، گۆت: ئەز نارویێنم هەتا ئەز وی دکوژم ئەڤە فەرمانا خودایێ پاك و بلند و پێغەمبەرێ وییە (ﷺ).**

**١٤ . باب: حد القذف**

**بابەتێ: سزایێ گونەهبارکرنا ب زنایێ.**

٣٢٦٥ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَ عُذْرِي، قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى الْمِنْبَرِ فَذَكَرَ ذَاكَ، وَتَلاَ ـ تَعْنِي: الْقُرْآنَ ـ فَلَمَّا نَزَلَ مِنَ الْمِنْبَرِ أَمَرَ بِالرَّجُلَيْنِ وَالْمَرْأَةِ، فَضُرِبُوا حَدَّهُمْ. [د٤٤٧٤/ ت٣١٨١/ جه٢٥٦٧].

* حسن.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: دەمێ بەرائەتا من هاتییە خوارێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر مینبەرێ راوەستا و ئەو چەند گۆت و ئەو ئایەت خواندن، ڤێجا دەمێ ژ سەر مینبەرێ هاتییە خوارێ، فەرمان ب هەردو زەلامان و ژنەکێ کر و سزایێ خۆ خوارن.**

---

(١) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێکێدا نینە.

٣٢٦٦ - عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ رَجُلَيْنِ اسْتَبَّا فِي زَمَانِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِلآخَرِ: وَاللهِ! مَا أَبِي بِزَانٍ، وَلاَ أُمِّي بِزَانِيَةٍ، فَاسْتَشَارَ فِي ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَقَالَ قَائِلٌ: مَدَحَ أَبَاهُ وَأُمَّهُ، وَقَالَ آخَرُونَ: قَدْ كَانَ لِأَبِيهِ وَأُمِّهِ مَدْحٌ غَيْرُ هَذَا، نَرَى أَنْ تَجْلِدَهُ الْحَدَّ، فَجَلَدَهُ عُمَرُ الْحَدَّ ثَمَانِينَ. [ط١٥٦٩م].

* إسناده صحيح.

**ژ عەمرەیا کچا عەبدولرەحمانی (ﷺ) گۆت: دو زەلامان ل سەر دەمێ عومەرێ کورێ خەتتابی خەبەر گۆتنە ئێکدو، ئێکی ژ وان گۆتە یێ دی: ئەز ب خودێ کەمە نە بابێ من زناکەرە و نە دیکا من زناکەرە، عومەرێ کورێ خەتتابی مشێورەت د ڤێ چەندێدا کر، ئێکی گۆت: پەسنا بابێ خۆ و دەیکا خۆ کر، و هندەکێت دی گۆت: بابێ وی و دەیکا وی پەسنەکا دی ژ بلی ڤێ هەبوو، ئەم دبینین سزایێ دەستنیشانکری سزا بدەی ئینا عومەری سزایێ حەددی دا بەر هەشتێ قامچی لێدان.**

## ١٥ . باب: التعزير

## بابەتێ: پاشڤەبرن و تۆرەئێخستنێ.

٣٢٦٧ - (ق) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ: **(لاَ يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ؛ إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللهِ)**. [خ٦٨٤٨/ م١٧٠٨].

**ژ ئەبی بوردەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (زێدەی دەھ قامچییان نائێنە لێدان، حەددەك ژ حدودێت خودێ تێ نەبیت [1]).**

## ١٦ . باب: فضل إقامة الحدود

## بابەتێ: خێرا ب جهئینانا سزایێت دەستنیشانکری.

٣٢٦٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(حَدٌّ يُعْمَلُ بِهِ فِي الْأَرْضِ، خَيْرٌ لِأَهْلِ الْأَرْضِ مِنْ أَنْ يُمْطَرُوا أَرْبَعِينَ صَبَاحاً)**. [ن٤٩١٩/ جه٢٥٣٨].

---

**(١) حدوود کۆمە و کتا وێ حەددە، و حەد: سزایەکێ دەستنیشانکرییە ل سەر وی دکەڤیت یێ وێ گونەهێ دکەت یا ئەڤ سزایە پێڤە گرێدایی (ئەو ژی ئەڤەنە: زنا و گونەهبارکرنا دەھمن پاکان ب زنایێ و دزی و مەی ڤەخوارن و رێگری). و حەد: ئەو گونەهبارییە یا شەریعەتی سزایێ وێ دیار کربیت وەك مافەك ژ مافێت خودایێ مەزن.**

* حسن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(سزایەکێ دەستنیشانکری د عەردیدا بهێتە ب جهئینان بۆ خەلکێ عەردی باشترە ژ هندێ چل سپێدەهیان باران ل وان بباریت).**

١٧ . باب: العفو في الحدود ما لم تبلغ السلطان

**بابەتێ: لێبۆرین ژ سزایان هندی نەگەهیتە خوندکاری.**

٣٢٦٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(تَعَافُوا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ، فَمَا بَلَغَنِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ).** [د٤٣٧٦/ ن٤٩٠٠].

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەمرێ کوڕێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(د نافبەرا خۆدا ژ سزایان ببۆرن، ئەو سزایێ دگەهیتە دەڤ من ئەو بنەجهـ و واجب بوو).**

٣٢٧٠ - عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: كُنْتُ نَائِماً فِي الْمَسْجِدِ عَلَيَّ خَمِيصَةٌ لِي، ثَمَنُ ثَلاَثِينَ دِرْهَماً، فَجَاءَ رَجُلٌ فَاخْتَلَسَهَا مِنِّي، فَأُخِذَ الرَّجُلُ، فَأُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَأَمَرَ بِهِ لِيُقْطَعَ. قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَتَقْطَعُهُ مِنْ أَجْلِ ثَلاَثِينَ دِرْهَماً؟ أَنَا أَبِيعُهُ وَأُنْسِئُهُ ثَمَنَهَا، قَالَ: **(فَهَلاَّ كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ)؟.**
[د٤٣٩٤/ ن٤٨٩٣/ جه٢٥٩٥/ مي٢٣٤٥].

* صحيح.

ژ سەفوانێ کوڕێ ئومەییەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل مزگەفتێ ل سەر جلکەکێ خۆ یێ نەخشدار یێ نفستی بووم، بهایێ وی سیهـ دەرهەم بوون، ئینا زەلامەك هات و ب فەشارتی و ب دەست سڤکی ژ من دزی، و ئەو زەلام هاتە گرتن و ئینانە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان پێ کر دا دەستێ وی ببڕن، سەفوانی گۆت: ئەز هاتمە دەڤ وی من گۆت: ئەرێ تو دێ دەستێ وی بۆ سیهـ دەرهەمان بڕی؟ ئەز دێ فرۆشمێ و بهایێ وی دێ بۆ گیرۆکەم گۆت: **(بۆ تە ئەڤە نەدکر بەری وی بینییە دەڤ من).**

## ١٨ . باب: ما جاء في درء الحدود

## بابەتێ: ئەوا د راستا دانەپاشا سزایاندا هاتی.

٣٢٧١ – عن عائشة قالت: قال رسول الله (ﷺ): **(ادْرَؤوا الحدودَ عن المسلمِينَ ما استطعتُم ، فإن كان له مَخرجٌ فخلُّوا سبيلَه ، فإنَّ الإمامَ أن يُخطِئَ في العَفْوِ ، خيرٌ من أن يُخطِئَ في العُقوبةِ)**[1]. [ت١٤٢٤].

ضعيف.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سزایان ژ موسلمانان بدەنە پاش هندی هوین بشێن[2]، و ئەگەر رێکەك بۆ هەبیت وی بەردەن، چونکی ب راستی فەرماندار د ئازاکرنێدا خەلەت ببیت باشترە ئەو د سزاییدا خەلەت ببیت).**

## ١٩ . باب: حكم من سب النبي (ﷺ)

## بابەتێ: حوکمێ وی یێ خەبەرا بێژیتە پێغەمبەری (ﷺ).

٣٢٧٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ أَعْمَى كَانَتْ لَهُ أُمُّ وَلَدٍ تَشْتُمُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَتَقَعُ فِيهِ، فَيَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي، وَيَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ، قَالَ: فَلَمَّا كَانَتْ ذَاتَ لَيْلَةٍ، جَعَلَتْ تَقَعُ فِي النَّبِيِّ (ﷺ) وَتَشْتُمُهُ، فَأَخَذَ الْمِغْوَلَ فَوَضَعَهُ فِي بَطْنِهَا، وَاتَّكَأَ عَلَيْهَا فَقَتَلَهَا، فَوَقَعَ بَيْنَ رِجْلَيْهَا طِفْلٌ، فَلَطَّخَتْ مَا هُنَاكَ بِالدَّمِ.

فَلَمَّا أَصْبَحَ، ذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَجَمَعَ النَّاسَ، فَقَالَ: **(أَنْشُدُ اللهَ رَجُلاً فَعَلَ مَا فَعَلَ لِي عَلَيْهِ حَقٌّ؛ إِلاَّ قَامَ)**.

فَقَامَ الْأَعْمَى يَتَخَطَّى النَّاسَ، وَهُوَ يَتَزَلْزَلُ حَتَّى قَعَدَ بَيْنَ يَدَيْ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَا صَاحِبُهَا، كَانَتْ تَشْتُمُكَ وَتَقَعُ فِيكَ، فَأَنْهَاهَا فَلاَ تَنْتَهِي، وَأَزْجُرُهَا فَلاَ تَنْزَجِرُ، وَلِي مِنْهَا ابْنَانِ مِثْلُ اللُّؤْلُؤَتَيْنِ،

---

**(١) شێخ سالحێ شامی ئەڤ فەرموودە و هەر ب وێ ژمارێ د مالپەرێ خۆدا شوینا وێ ئینایە:**

٣٢٧١ – عن عبد الله قال: ادرؤوا الجلد والقتل عن المسلمين ما استطعتم.[هق ٢٣٨/٨].

* سنده متصل. قال الذهبي: هو أجود ما في الباب.

**ژ عەبدوللایی (رضي الله عنه) گۆت: قامچیلێدانێ و کوشتنێ هندی هوین بشێن ژ موسلمانان بدەنە پاش.**

**(٢) ئانکو: ئەگەر گۆمان بۆ هەوە د بەلگەیاندا چێ بوو ئازا بکەن و سزایی ب جه نەئینن و گۆمانێ بێخنە د خێرا ویدا دا سزایی ژ وی بدەنە پاش.**

وَكَانَتْ بِي رَفِيقَةً. فَلَمَّا كَانَ الْبَارِحَةَ جَعَلَتْ تَشْتُمُكَ، وَتَقَعُ فِيكَ، فَأَخَذْتُ الْمِغْوَلَ، فَوَضَعْتُهُ فِي بَطْنِهَا، وَاتَّكَأْتُ عَلَيْهَا حَتَّى قَتَلْتُهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَلاَ اشْهَدُوا أَنَّ دَمَهَا هَدَرٌ)**.[د٤٣٦١/ ن٤٠٨١].

* صحيح.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) زەلامەكێ كۆرە جارییەك هەبوو، خەبەر دگۆتنە پێغەمبەری (ﷺ)، و ئەزمانێ خۆ ل سەر درێژ دكر و دهاڤێتێ، پاشڤە لێدا وێ دكر و گوهێ خۆ نەددایێ، و پاشڤە دبر و پاشڤە نەدچۆ، گۆت: ڤێجا دەمێ وێ د شەڤەكێدا دەستدایێ هاڤێتییە پێغەمبەری (ﷺ) و خەبەر گۆتینێ كورتە شیرەك هەلگرت و دانا سەر زكێ وێ و خۆ ب سەردادا و كوشت، و بچویكەك كەفتە د ناڤبەرا هەردو پێت وێدا و ئەو جهە ژ خوینێ سۆر بوو.**

**ڤێجا دەمێ بوویە سپێدە، ئەڤە بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە گۆتن، ئینا خەلك كۆم كر و گۆت: (ئەز ب خودێ ژ زەلامەكی دخوازم و من ماف ل سەر هەبیت و ئەو كری یا كری ئەگەر نەرابیت).**

**ئینا ئەو زەلامێ كۆرە رابوو د ناڤ خەلكێڕا بۆری و ئەو دهەژیا هەتا بەرامبەری پێغەمبەری (ﷺ) روینشتی و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز خودانێ وێ مە، وێ خەبەر دگۆتنە تە و دهاڤێتە تە، و من پاشڤە لێددا و گوهێ خۆ نەددا منن و من پاشڤە دبر و پاشڤە نەدچۆ، و من كورتەشیر راكر و دانا سەر زكێ وێ و من خۆ ب سەردادا هەتا من ئەو كوشتی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بزانن و شاهد بن ب راستی خوینا وێ هەروەیە).**

٢٠ ـ باب: لا تقام الحدود في المسجد

**بابەتێ: سزایێت حدودان ل مزگەفتێ ناهێنە ب جهئینان.**

٣٢٧٣ – عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يُسْتَقَادَ فِي الْمَسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ الْأَشْعَارُ، وَأَنْ تُقَامَ فِيهِ الْحُدُودُ. [د٤٤٩٠].

* حسن.

**ژ حەکیمێ کوڕێ حیزامی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پاشڤەلێدان کر تۆلڤەکرنا کوشتنێ (قیساس) ل مزگەفتێ بهێتە کرن، و هۆزان تێدا بهێنە خواندن، و سزایێ حدودان تێدا بهێتە ب جهئینان.**

**٢١ . باب: من استأذن بالزنى**

**بابەتێ: یێ دەستویری ب زنایێ خواستی.**

٣٢٧٤ – عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: إِنَّ فَتًى شَابّاً أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ ائْذَنْ لِي بِالزِّنَى، فَأَقْبَلَ الْقَوْمُ عَلَيْهِ فَزَجَرُوهُ، قَالُوا: مَهْ، مَهْ! فَقَالَ: (**ادْنُهْ**) ، فَدَنَا مِنْهُ قَرِيباً، قَالَ: فَجَلَسَ قَالَ: (**أَتُحِبُّهُ لِأُمِّكَ**) ؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِأُمَّهَاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِابْنَتِكَ**) ؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِبَنَاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِأُخْتِكَ**) ؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِأَخَوَاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِعَمَّتِكَ**) ؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِعَمَّاتِهِمْ**). قَالَ: (**أَفَتُحِبُّهُ لِخَالَتِكَ**) ؟ قَالَ: لاَ، وَاللهِ! جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ! قَالَ: (**وَلاَ النَّاسُ يُحِبُّونَهُ لِخَالاَتِهِمْ**). قَالَ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهِ، وَقَالَ: (**اللَّهُمَّ اغْفِرْ ذَنْبَهُ، وَطَهِّرْ قَلْبَهُ، وَحَصِّنْ فَرْجَهُ**) ، فَلَمْ يَكُنْ بَعْدُ ذَلِكَ الْفَتَى يَلْتَفِتُ إِلَى شَيْءٍ. [حم٢٢٢١١ و٢٢٢١٢].

* إسناده صحيح، رجاله رجال الصحيح.

**ژ ئەبی ئومامەیی (رضي الله عنه) گۆت: لاوەکێ گەنج هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا گۆت:** ئەی پێغەمبەرێ خودێ دەستویرییێ ب زناکرنێ بدە من، خەلکی بەرێ خۆ دایێ و پاشڤە بر و گۆتن: نە، نە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(نێزیکی من بکەن)** باش نێزیکی وی بوو گۆت: روینشت، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(تە ئەڤە بۆ دایکا خۆ دڤێت)؟** گۆت: نە ب خودێ، خودێ من قوربانی تە بکەت، گۆت: **(خەلکی ژی ئەڤە بۆ دایکێت خۆ نەڤێن)،** گۆت: **(تە ئەڤە بۆ خویشکا خۆ دڤێت)،** گۆت: نە ب خودێ، خودێ من قوربانی تە بکەت، گۆت: **(خەلکی ژی ئەڤە بۆ خویشکێت خۆ نەڤێن)،** گۆت: **(تە ئەڤە بۆ مەتا خۆ دڤێت)،** گۆت: نە ب خودێ، خودێ من قوربانی تە بکەت، گۆت: **(خەلکی ژی ئەڤە بۆ مەتێت خۆ نەڤێن)،** گۆت: **(تە ئەڤە بۆ خالەتا خۆ دڤێت)،** گۆت: نە ب خودێ، خودێ من قوربانی تە

بکەت، گۆت: **(خەلکی ژی ئەڤە بۆ خالەتێت خۆ نەڤێن)**، گۆت: ئینا دەستێ خۆ دانا سەر سینگێ وی و گۆت: **(ئەی خودا گونەهێت وی ژێ ببە و دلێ وی پاقژ بکە و دەهمانا وی بپارێزە)**، پشتی ڤێ چەندێ ڤی لاوی بەرێ خۆ نە ددا چو تشتی.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

# المقصد الثامن

# الرقائق والأخلاق والآداب

# مەبەستا هەشتێ

# دلنەرمکەر و رەوشت و تۆر و ئەدەب

# الكتاب الأول

# الرقائق

# كتێبا ئێكێ

# دلنەرمكەران

## ١ ـ باب: التقرب بالنوافل والمبادرة بالأعمال

## بابەتێ: نێزیكبوون ب سونەتان و لەزكرن ب كریاران.

٣٢٧٥ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ اللهَ قَالَ: مَنْ عادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ: كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا، وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ، وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنَا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ نَفْسِ المُؤْمِنِ، يَكْرَهُ المَوْتَ وَأَنَا أَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ). [خ٦٥٠٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودایێ مەزن دبێژیت: هەر كەسێ دژمنییا وەلییەكێ من بكەت، ب راستی من ئەو ب شەڕی ئاگەهدار كر. و بەندەیێ من ب چو تشتان خۆ نێزیكی من ناكەت خۆشتڤیتر بن ل دەڤ من ژ وی تشێ من ل سەر وی فەرز كری، و بەردەوام بەندەیێ من ب سونەتان دێ نێزیكی من بیت، حەتا ئەز حەژێ بكەم، ئەگەر من حەژێ كر، من گوهێ وی پاراست یێ پێ گوه لێ دبیت، و چاڤێ وی یێ پێ دبینیت، و دەستێ وی یێ پێ ب هێز دگریت، و پێ وی یێ پێ دچیت، و ئەگەر داخوازێ ژ من بكەت دێ دەمێ، و ئەگەر خۆ ب من بپارێزیت بێ گۆمان دێ پارێزم، و من هنارتییێت خۆ د چو تشتاندا نەزڤراندینە من ڤیایە بكەم وەكی من هنارتییێت خۆ د كێشانا رحا خودان باوەریدا زڤراندین، وی مرن نەڤێت من ژی نەڤێت نەخۆشییێ بگەهینمێ)**[1].

٣٢٧٦ – (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ فِتَناً كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِناً وَيُمْسِي كَافِراً، أَوْ يُمْسِي مُؤْمِناً وَيُصْبِحُ كَافِراً، يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا). [م١١٨].

---

(١) ب راستی زانا د ڤێدا د ژێك جودانە، بەلێ هەمی د ئێك بۆچۆنن، دودلی د دەرحەقێ خودێدا نینە، و باشترین رامان ئەوە یا مە گۆتی ئەو ژی بەیهەقی ئینایە، و مەبەست ئەڤەیە: ژ دلۆڤانییا خودێ ب ڤی بەندەیی دێ بەرهنگاری د گەل ئاتاف و نەخۆشییا بیت هەر ئێك ژ وان بەسە ببیتە ئەگەرێ مرنا وی بەلێ خودێ ملیاكەتێت رحكێشانێ ل دەڤ دزڤرینیتەڤە، ژ بەر دوعایێت وی و حەزكرنا وی هەر بمینیت دا پتر تاعەتان بكەت هەروەكی پتر ژ جارەكێ ئزرائیلی سەرەدانا مووسایی (سلاڤ ل سەر بن) كری.

**ژ وی (ﷺ)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( لەزێ ل كار و كریار ێت خۆ بكەن، دێ بەلا و نەخۆشی چێ بن، دێ بێژی پار چێت شەڤێت تارینە، دێ سپێدە ل زەلامی بیت خودان باوەر، و ئێڤار دێ لێ بیت گاور، و ئێڤار دێ لێ بیت خودان باوەر، و سپێدە دێ لێ بیت گاور)[1].**

٣٢٧٧ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِرَجُلٍ وَهُوَ يَعِظُهُ: **(اغْتَنِمْ خَمْساً قَبْلَ خَمْسٍ: شَبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُغْلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ).** [ك٧٨٤٦].

* قال الذهبي: على شرطهما.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە زەلامەكی و وی شیرەت ل وی دكرن: (پێنج تشتان مفای ژێ ببینە بەری پێنج تشتان؛ گەنجاتییا خۆ بەری پیرییا خۆ، و ساخلەمییا خۆ بەری نەساخییا خۆ، و زەنگینییا خۆ بەرێ هەژارییا خۆ، و بێكارییا خۆ بەری مژویلییا خۆ، و ژیانا خۆ بەری مرنا خۆ).**

٢ . باب: أمر المؤمن كله خير

**بابەتێ: كاروبارێ باوەریدای هەمی بۆ خێرە.**

٣٢٧٨ - (م) عَنْ صُهَيْبٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(عَجَباً لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ: إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْراً لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ، فَكَانَ خَيْراً لَهُ).** [م٢٩٩٩].

**ژ سوهەیبی، (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( ئەز یێ سەیر و عەجێب گرتیمە ژ كارێ باوەریداری هەمی كارێ بۆ وی خێرە و ئەڤە بۆ كەسێ نینە بۆ باوەریداری نەبیت ، هەكە كەیف گەهشتێ و شوكر كر، بۆ خێرە، و هەكە نەخۆشی گەهشتێ و سەبر كێشا، بۆ خێرە).**

(١) ئانكو: زەلام دێ سپێدێ رابیت خودان باوەرە، ئێڤاری دێ گاور بیت، و ئێڤاری خودان باوەرە، سپێدێ دێ گاور بیت.

## ٣ ـ باب: قرب الساعة ومثل الدنيا

## بابەتێ: نێزیکییا رۆژا قیامەتێ و مەتەلا دنیایێ.

٣٢٧٩ - (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رضي الله عنه قالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ بِإِصْبَعَيْهِ هكَذَا، بِالْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ: (بُعِثْتُ وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ). [خ٤٩٣٦/ م٢٩٥٠].

**ژ سەهلێ کورێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت و ب تلا خۆ یا نیڤێ و یا شەهدێ هۆسا دگۆت: (ئەز یێ هاتیمە هنارتن و ئەز و قیامەت وەکی ڤان هەردوکاینە)[1].**

٣٢٨٠ - (م) عَنْ مُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ ـ أَخي بَنِي فِهْرٍ ـ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(وَاللهِ مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ؛ إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ هَذِهِ ـ وَأَشَارَ يَحْيَى بِالسَّبَّابَةِ ـ فِي الْيَمِّ؛ فَلْيَنْظُرْ بِمَ تَرْجِعُ؟)**. [م٢٨٥٨].

**ژ موستەوردێ کورێ شەددادێ فیهری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب خودێ کەمە دنیایێ د گەل ئاخرەتێ چو نینە، نموونەیا هندێ نەبیت ئێک ژ هەوە ڤێ تلا خۆ ـ و نیشان کرە تلا شەهدەیێ ـ بکەتە د دەریایێدا کا بلا بەرێ خۆ بدەتێ دێ ب چ زڤریت)[2].**

## ٤ ـ باب: من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه

## بابەتێ: یێ بڤێت بگەهیتە خودێ، خودێ ژی دڤێت بگەهیتێ.

٣٢٨١ - (ق) عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: **(مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللهِ أَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللهِ كَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ)**. [خ٦٥٠٧/ م٢٦٨٣].

زاد البخاري في روايته: قالَتْ عائِشَةُ، أَو بَعْضُ أَزْوَاجِهِ: إِنَّا لَنَكْرَهُ المَوْتَ، قالَ: **(لَيْسَ ذَلك، وَلكِنَّ المُؤمِنَ إِذَا حَضَرَهُ المَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوَانِ اللهِ وَكَرَامَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَأَحَبَّ لِقَاءَ**

---

(١) و هەردو تلێت خۆ یا نیڤێ و یا شەهدێ دگەهاندنە ئێک ئیشارەتە بۆ نێزیکییا رۆژا قیامەتێ پشتی ئەو (ﷺ) هاتییە هنارتن.

(٢) ئانکو: ئەوا ب تلا ویڤە هاتی بەرامبەر یا د دەریایێدا چو هەڤبەری هەیە، هۆسا دنیا بەرامبەر قیامەتێ چو نینە.

اللهِ، وَأَحَبَّ اللهُ لِقَاءَهُ. وإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا حُضِرَ، بُشِّرَ بِعَذَابِ اللهِ وَعُقُوبَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَهَ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَكَرِهَ لِقَاءَ اللهِ وَكَرِهَ اللهُ لِقَاءَهُ).

ژ عوبادەیێ كورێ سامتی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ ڤیا بگەهیتە خودێ، خودێ دڤێت بگەهیتێ، و هەر كەسێ نەڤێت بگەهیتە خودێ خودێ نەڤێت بگەهیتێ).**

بوخاری د ڤەگێرا خۆدا زێدە كریە: عائیشایێ گۆت: یان هندە هەڤژینێت وی: ب راستی مە مرن نەڤێت، گۆت: **(نەوەسایە، بەلێ باوەریدار هەكە كەفتە بەر مرنێ مزگینی ب رازیبوونا خودێ و خەلاتێ وی بۆ هاتە دان، تشتەك ژ دەڤ وی خۆشڤیتر نینە ژ وێ یا ل پێشییا وی، ڤێجا دڤێت بگەهیتە خودێ، و خودێ ژی حەز دكەت بگەهیتێ، و ب راستی گاور ئەگەر كەفتە بەر مرنێ و مزگینی ب ئیزایا خودێ و سزایێ وی بۆ هاتە دان، تشتەك ژ دەڤ وی نەخۆشڤیتر نینە ژ وێ یا ل پێشییا وی، ڤێجا نەڤێت بگەهیتە خودێ و خودێ ژی نەڤێت بگەهیتێ).**

٣٢٨٢ - (خ) عَنْ مِرْدَاسٍ الأَسْلَمِيِّ قَالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ، الأَوَّلُ فالأَوَّلُ، وَيَبْقَى حُفَالَةٌ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ، أَوِ التَّمْرِ، لاَ يبَالِيهِمُ اللهُ بَالَةً).[خ٦٤٣٤ (٤١٥٦)].

ژ میرداسێ ئەسلەمی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(باش، ئێك دویڤ ئێكی دێ چن و خراب دێ مینن وەكی جەهێ خراب، یان ڤەسپێت خراب، خودێ چو بهای بۆ وان نادانیت).**

٥ ـ باب: بدأ الإسلام غريباً

**بابەتێ: ئیسلامێ ب كێم مرۆڤان یا دەستپێكری.**

٣٢٨٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (بَدَأَ الإِسْلاَمُ غَرِيباً، وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيباً، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ). [م١٤٥].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئیسلامێ ب كێم مرۆڤان یا دەستپێكری و بەلاڤ بووی و دێ زڤریت هەر وەكی دەست پێ كری د كێماندا مینیت، ڤێجا خۆشی (بەحەشت) بۆ وان كێمان بیت).**

## ٦ . باب: الخوف من الله تعالى

## بابەتێ: ترس ژ خودێ.

٣٢٨٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (**كَانَ رَجُلٌ يُسْرِفُ عَلَى نَفْسِهِ، فَلَمَّا حَضَرَهُ المَوْتُ قَالَ لِبَنِيهِ: إِذَا أَنَا مِتُّ فَأَحْرِقُونِي، ثُمَّ اطْحَنُونِي، ثُمَّ ذُرُّونِي فِي الرِّيحِ. فَوَاللهِ! لَئِنْ قَدَرَ عَلَيَّ رَبِّي لَيُعَذِّبَنِّي عَذَاباً ما عَذَّبَهُ أَحَداً. فَلَمَّا مَاتَ فُعِلَ بِهِ ذَلِكَ، فَأَمَرَ اللهُ الأَرْضَ فَقَالَ: اجْمَعِي ما فِيكِ مِنْهُ، فَفَعَلَتْ، فَإِذَا هُوَ قَائِمٌ، فَقَالَ: ما حَمَلَكَ عَلَى ما صَنَعْتَ؟ قالَ: يَا رَبِّ خَشْيَتُكَ! فَغَفَرَ لَهُ**). وَقَالَ غَيْرُهُ: (**مَخَافَتُكَ يَا رَبِّ**). [خ٣٤٨١/ م٢٧٥٦].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**زەلامەكی ستەم ل خۆ دكر و زێدە گونەھ دكرن، ڤێجا دەمێ كەفتییە بەر مرنێ گۆتە عەیالێت خۆ: ئەگەر ئەز مرم من بسۆژن، و پاشی من بهێرن، و پاشی من د گەل هەوای بدەنە بای، ئەز ب خودێ كەمە ئەگەر خودێ بشێتە من[1] دێ ب ئیزایەكێ من ئیزادەت كەسەك ب وی ئیزایی ئیزا نەدابیت، ڤێجا دەمێ مری ئەو ب سەری ئینا، ئینا خودێ فەرمان ل عەردی كر ئەوا د تەدا ژ ڤی كۆم ببە، عەردی وەكر، ڤێجا ئەو كەس رابووڤە، گۆتێ: چ وەل تە كر ل سەر ئەوا تە كری؟ گۆت: ئەی خودا ترسا تە، ئینا گونەھێت وی ژێ برن**)، و غەیری وی گۆت: (**ترسا تە ئەی خودا**).

## ٧ . باب: الحث على قصر الأَمل

## بابەتێ: پالدان ل سەر كورتییا هیڤییێ.

٣٢٨٥ - (خ) عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِمَنْكِبِي فَقَالَ: (**كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ**).

(١) نیمامێ نەوەوی دبێژیت: ئەڤ گۆتنە نە ژ مەبەست گۆتییە و ئەو وەكی وییە یێ دەوارێ وی ل چۆلستانێ لێ بەرزە بووی و پشتی بێهیڤیبوونێ دیتی و ل بەر خەلەت بووی و شوینا بێژیت: تو خودایێ منی و ئەز بەندەیێ تەمە، گۆت: ئەز خودایێ تەمە و تو بەندەیێ منی، ئەڤە ژی هەر ژ ڤی بابەتییە ل بەر ئالۆز بوو و ژ ترساندا وەگۆت و مەبەستا وی ئەو نینە، و هندەك دبێژن رامانا (قدر) ئانكو: ل سەر من تەنگ بكەت.

وكان ابن عمر يقول: إذا أمْسَيتَ فَلا تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ، وإذَا أصْبَحْتَ فَلا تَنْتَظِرِ المساءَ، وَخُذْ مِنْ صِحَتِكَ لمَرَضِكَ، ومِنْ حَيَاتِكَ لمَوْتِكَ. [خ٦٤١٦].

**ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ملێت من گرتن و گۆت: (د دنیایێدا بە هەروەکی تو غەریب و بێ کەس و کاری یان تو رێڤینکی).**

**و ئیبن عومەری، دگۆت: هەکە ئێڤار ل تە بوو خۆ ل هیڤیا سپێدێ نەگرە[1]، و هەکە سپێدە ل تەبوو خۆ ل هیڤیا ئێڤاری نەگرە[2]، و ژ سلامەتییا خۆ بۆ نەساخییا خۆ هەلگرە، و ژ ژیان و ساخییا خۆ بۆ مرنا خۆ هەلگرە.**

٣٢٨٦ - عَنْ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! عَلِّمْنِي وَأَوْجِزْ، قَالَ: **(إِذَا قُمْتَ فِي صَلاَتِكَ فَصَلِّ صَلاَةَ مُوَدِّعٍ، وَلاَ تَكَلَّمْ بِكَلاَمٍ تَعْتَذِرُ مِنْهُ، وَأَجْمِعِ الْيَأْسَ عَمَّا فِي أَيْدِي النَّاسِ).** [جه٤١٧١].

* حسن.

**ژ ئەبی ئەییووبی (ﷺ) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من فێر بکە و کورت بکە، گۆت: (ئەگەر تو رابوویە نڤێژا خۆ نڤێژا خاترخوازی بکە، و ئاخفتنەکێ نەکەی لێبۆرینێ ژێ بخوازی، و بێهیڤیبوونا خۆ پشتراست و بنەجە بکە ژ وێ یا د دەستێ خەلکیدا).**

## ٨ ـ باب: الحرص على المال وطول العمر

## بابەتێ: رژدی ل سەر مالی و ژییێ درێژ.

٣٢٨٧ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: خَطَّ النَّبِيُّ (ﷺ) خَطّاً مُرَبَّعاً، وَخَطَّ خَطّاً فِي الْوَسَطِ خارِجاً مِنْهُ، وَخَط خُطَطاً صِغَاراً إِلَى هَذَا الَّذِي في الْوَسَطِ مِنْ جَانِبِهِ الَّذِي في الْوَسَطِ،

---

(١) ئانكو: ل خۆ بزڤرە و بۆ خۆ تەوبە بکە و خۆ ل هیڤیا ئێڤاری نەگرە، چونکی دبیت نەگەهییە ئێڤاری.

(٢) دیسا رامان ئەوە: ل خۆ بزڤرە و بۆ خۆ تەوبە بکە و خۆ ل هیڤیا سپێدێ نەگرە، چونکی دبیت نەگەهییە سپێدێ.

وَقَالَ: (هَذَا الإِنْسَانُ، وَهذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ ـ أَوْ: قَدْ أَحَاطَ بِهِ ـ وَهَذَا الَّذِي هُوَ خَارِجٌ أَمَلُهُ، وَهذِهِ الخُطُطُ الصِّغَارُ: الأَعْرَاضُ، فَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا، وَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا). [خ٦٤١٧].

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خیچەكا چار كوژی كێشا و خیچەك د نیڤا و یڕا كێشا و ژێ دەرێخست، و خیچكێت بچویك (ژ رەخیڤە) بۆ خیچا نیڤەكێ ئینان و گۆت: **(ئەڤە مرۆڤە، و ئەڤە دویماهیا ویە یا دۆرمەندۆر وەرهاتییە، یان دۆرمەندۆرێت وی یا گرتی، و ئەڤا ژ دەرڤە ئومێدا ویە، و ئەڤ خیچێت بچویك رویدانن، هەكە ڤێ ژ وی نەگرت ئەڤە دێ وی درینیت و هەكە ڤێ ژ وی نەگرت ئەڤە دێ وی درینیت).**




٣٢٨٨ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (لاَ يَزَالُ قَلْبُ دویماهییا مرۆڤی شَابّاً فِي اثْنَتَيْنِ: فِي حُبِّ الدُّنْيَا، وَطُولِ الأَمَلِ). [خ٦٤٢٠/ م١٠٤٦].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(بەردەوام دلێ پیری د دو تشتاندا یێ گەنجە: د ڤیانا دنیایێدا و ئومێد دویر و درێژییێدا).**

٣٢٨٩ – (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لَوْ أَنَّ لاِبْنِ آدَمَ وَادِياً مِنْ ذَهَبٍ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ وَادِيَانِ، وَلَنْ يَمْلأَ فَاهُ إِلاَّ التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللهُ عَلَى مَنْ تَابَ).[خ٦٤٣٩/ م١٠٤٨].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ)، كو پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەكە كورێ ئادەمی (ئانكو مرۆڤی) نهالەكا زێری هەبیت، حەز دكەت ببنە دو، و چو دەڤێ وی تژی ناكەت، ئاخ نەبیت، و خودێ تەوبێ ددەتە سەر وی یێ ل وی بزڤریت، و تەوبە بكەتە وی).**

٣٢٩٠ – (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (إِذَا فُتِحَتْ عَلَيْكُمْ فَارِسُ وَالرُّومُ، أَيُّ قَوْمٍ أَنْتُمْ)؟ قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: نَقُولُ كَمَا أَمَرَنَا اللهُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ

(ﷺ): (أَوَ غَيْرُ ذَلِكَ؟ تَتَنَافَسُونَ، ثُمَّ تَتَحَاسَدُونَ، ثُمَّ تَتَدَابَرُونَ، ثُمَّ تَتَبَاغَضُونَ، أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ. ثُمَّ تَنْطَلِقُونَ فِي مَسَاكِينِ الْمُهَاجِرِينَ، فَتَجْعَلُونَ بَعْضَهُمْ عَلَى رِقَابِ بَعْضٍ).[م٢٩٦٢].

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمرێ كورێ عاسی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وی گۆت: (ئەگەر فرس و رووم بۆ هەوە هاتنە ڤەكرن، هوین دێ بنە چ مرۆڤ)؟ عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی گۆت: ئەم دێ وێ بێژین ئەوا خودێ فەرمانا مە پێ كری[1]، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هوین دێ تشتەكێ دی كەن، ململانا ئێكدو كەن، پاشی دێ حەسویدییێ ب ئێكدو بەن، پاشی دێ ژ ئێكدو سل بن و پشتا خۆ دەنە ئێكدو، پاشی دێ كەربێت خۆ ژ ئێكدو ڤەكەن و نەڤیانا ئێكدو هەلگرن، یان وەكی ڤێ، پاشی دێ چنە هەژار و لاوازێت مشەختان و هندەكان ل سەر هندەكان كەنە فەرماندار).**

## ٩ ـ باب: لا عذر لمن بلغ ستين سنة

## بابەتێ: پێ گەهشتە شێست سالان وی هێجەت نەما.

٣٢٩١ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (أَعْذَرَ اللهُ إِلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ حَتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً). [خ٦٤١٩]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودێ هەجەت بۆ وی مرۆڤی نەهێلان یێ مرنا وی ڤەهێلای هەتا ژییێ وی گەهشتییە شێست سالییێ).**

## ١٠ ـ باب: التحذير من محقرات الذنوب

## بابەتێ: هۆشداری ژ گونەهێت بچویك.

٣٢٩٢ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّكُمْ لَتَعْمَلُونَ أَعْمَالاً، هِيَ أَدَقُّ فِي أَعْيُنِكُمْ مِنَ الشَّعْرِ، إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّهَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنَ الموبِقَاتِ. [خ٦٤٩٢]

ژ ئەنەسی، (رضي الله عنه)، گۆت: هوین هندە كریاران دكەن، د چاڤێت وەدا ژ مووی زرا ڤترن، مە ئەو كریار ل سەر وەختێ پێغەمبەری (ﷺ) ژ گونەهێت مەزن و یێت مرۆڤی دبەنە هیلاكێ دهەژمارتن.

---

(١) ئانكو: دێ پەسن و حەمد و سوپاسییا خودێ ل سەر كەرەما وی كەین و داخوازا پتر كەرەما وی كەین.

٣٢٩٣ - عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِيَّاكُمْ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ، كَقَوْمٍ نَزَلُوا فِي بَطْنِ وَادٍ، فَجَاءَ ذَا بِعُودٍ، وَجَاءَ ذَا بِعُودٍ، حَتَّى أَنْضَجُوا خُبْزَتَهُمْ، وَإِنَّ مُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ مَتَى يُؤْخَذْ بِهَا صَاحِبُهَا، تُهْلِكْهُ**). [حم٢٢٨٠٨].

* حديث صحيح على شرط الشيخين.

**ژ سەهلێ كورێ سەعدی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هشیاری گونەهێت بچویك بن ئەو وەكی خەلكەكێنە داننە نهالەكێ، ئەڤە ب چیلكەكی هات و ئەڤە ب چیلكەكی، هەتا نانێ خۆ پێ چێ كری، هەردەمێ خودانێ گونەهێت بچویك ب وان گونەهان بهێتە گرتن دێ خودانێ خۆ ژ ناڤ بەت).**

## ١١ . باب: ويبقى العمل

## بابەتێ: و كار و كریار دمینن.

٣٢٩٤ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَتْبَعُ المَيِّتَ ثَلاَثَةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ، وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ: يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمالُهُ، وَيَبْقَى عَمَلُهُ**). [خ٦٥١٤/ م٢٩٦٠].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (سێ تشت د دویڤ مریڕا دچن، مرۆڤێت وی و مالێ وی و كار و كریارێت وی، دو دزڤرن و ئێك دمینیت، مرۆڤێت وی و مالێ وی دێ زڤرن و كار و كریارێت وی دێ مینن).**

٣٢٩٥ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَيُّكُمْ مالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مالِهِ**)؟ قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، ما مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ مالُهُ أَحَبُّ إِلَيْهِ، قَالَ: (**فإِنَّ مَالَهُ ما قَدَّمَ، وَمالُ وَارِثِهِ ما أَخَّرَ**). [خ٦٤٤٢].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كێ ژ هەوە مالێ میراتگرێ وی ژ یێ وی خۆشڤیترە)؟** گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ كەس ژ مە نینە هەكە مالێ وی ژ یێ میراتگرێ وی خۆشڤیتر نەبیت، گۆت: (ب راستی مالێ وی ئەوە یێ ددەت، و پێشی خۆ دئێخیت، و مالێ میراتگرێ وی ئەوە یێ پاش خۆ دهێلیت).

٣٢٩٦ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**يَقُولُ الْعَبْدُ: مَالِي، مَالِي. إِنَّمَا لَهُ مِنْ مَالِهِ ثَلَاثٌ: مَا أَكَلَ فَأَفْنَى، أَوْ لَبِسَ فَأَبْلَى، أَوْ أَعْطَى فَاقْتَنَى وَمَا سِوَى ذَلِكَ فَهُوَ ذَاهِبٌ، وَتَارِكُهُ لِلنَّاسِ**). [م٢٩٥٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ): پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەندە دبێژیت: مالێ من مالێ من، و ب ڕاستی سێ تشت ب تنێ ژ مالێ وی یێت وینە: ئەوا خواری نەما، یان كرییە بەرخۆ كەڤن بوو، یان ئەوا دایی و بۆ ئاخرەتێ هەلگرتی، و ژ بلی ڤێ ئەو یێ چۆییە و بۆ خەلكی دێ هێلیت).**

١٢ ـ باب: مكانة الدنيا عند الله

## بابەتێ: بهایێ دنیایێ ل دەڤ خودێ

٣٢٩٧ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَرَّ بِالسُّوقِ، دَاخِلاً مِنْ بَعْضِ الْعَالِيَةِ، وَالنَّاسُ كَنَفَتَهُ، فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ مَيِّتٍ، فَتَنَاوَلَهُ فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ، ثُمَّ قَالَ: (**أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنَّ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ**) ؟ فَقَالُوا: مَا نُحِبُّ أَنَّهُ لَنَا بِشَيْءٍ، وَمَا نَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: (**أَتُحِبُّونَ أَنَّهُ لَكُمْ**) ؟ قَالُوا: وَاللهِ لَوْ كَانَ حَيّاً كَانَ عَيْباً فِيهِ، لأَنَّهُ أَسَكُّ، فَكَيْفَ وَهُوَ مَيِّتٌ؟ فَقَالَ: (**فَوَاللهِ لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ، مِنْ هَذَا عَلَيْكُمْ**). [م٢٩٥٧].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د سویكێڕا بۆری و خەلك ل هەردو رەخێت وێ بوون د بەر كاركەكێ كڕ یێ مرارڕا بۆری، هەلگرت و هەردو گوهێت وی گرتن و پاشی گۆت: (كێ ئەڤە ب دەرهەمەكی دڤێت بۆ وی بیت)؟ گۆتن: مە ب چو نەڤێت، ما دێ ج لێ كەین؟ پاشی گۆت: (هەوە دڤێت بۆ هەوە بیت)؟ گۆتن: ب خودێ هەكە یێ ساخبا یێ عێبەلۆ بوو كاركەكێ كڕە، پا چەوا هەكە یێ مری بیت، ئینا گۆت: (پا ب خودێ دنیا ل دەڤ خودێ بێ بها و سڤكترە ژ ڤێ ل دەڤ هەوە).**

٣٢٩٨ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ، وَجَنَّةُ الْكَافِرِ**). [م٢٩٥٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دنیا زیندانا موسلمانییە و بەحەشتا گاورییە).**

٣٢٩٩ - عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى كَافِراً مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ). [ت٢٣٢٠].

* صحيح.

**ژ سەهلێ كورێ سەعدێ ساعدى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە دنیایێ بهایێ چەنگێ پێشیەكێ ل دەڤ خودێ هەبا، فرەكا ئاڤێ ژێ نەددا گاورەكى).**

## ١٣ ـ باب: ولضحكتم قليلاً

## بابەتێ: دا كێم كەنن.

٣٣٠٠ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو القَاسِمِ (ﷺ): (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَبَكَيْتُمْ كَثِيراً، وَلَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً). [خ٦٦٣٧ (٦٤٨٥)].

**ژ ئەبى هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: بابێ قاسمى (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وى كە مە یێ جانێ من د دەستیدا ئەگەر هوین وێ بزانن یا ئەز دزانم، دا گەلەك كەنە گرى و دا كێم كەنە كەنى).**

٣٣٠١ - وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تُكْثِرُوا الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ). [جه٤١٩٣].

* صحيح.

**و ژ وى گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (گەلەك نەكەنە كەنى، چونكى ب راستى گەلەك كەنى دلى دمرینیت).**

## ١٤ ـ باب: لن يدخل أحد الجنة بعمله

## بابەتێ: كەس ب كار و كریارێت خۆ ناچیتە بەحەشتێ.

٣٣٠٢ - (ق) عَنْ عائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (سَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يُدْخِلُ أَحَداً الجَنَّةَ عَمَلُهُ). قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (وَلاَ أَنَا؛ إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللهُ بِمَغْفِرَةٍ وَرَحْمَةٍ).

[خ٦٤٦٧ (٦٤٦٤)/ م٢٨١٨].

- زاد في رواية لهما: (وأَنَّ أَحبَّ الأَعمالِ أَدومها إِلى الله وإِن قلَّ).[خ٦٤٦٤].

ژ ئەبی عائیشایێ (رضي الله عنها)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(د كار و بارێت خۆدا دورستیخواز بن بێی كێمكرن و زێدەكرن و خۆ راگرن و بەینن، و د كار و بارێت خۆدا نافنجیخواز بن و هەكە هوین نەشیان كاری ب رەنگێ پێدڤی بكەن دویر نەكەڤن و نێزیكی كاری بن، و بلا دلێ هەوە ب خێرا كاری خۆش بیت، و دا بكەهنە خێرێ و بزانن كەس ژ هەوە كاروكریارێت وی وی نابەنە بەحەشتێ)**. گۆتن: خۆ تو ژی ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: **( خۆ ئەز ژی ژبلی هندێ خودێ ژ كەرەما خۆ دلۆڤانیێ خۆ د من وەركەت)**.

- و د ڤەگێرەكا وا ندا ز یدە كری یە: **(و ب راستی خۆ شڤیترین كار ل دەڤ خودێ یێ بەردەوامترە بلا یێ كێم ژی بیت)**.

٣٣٠٣ - (خ) عَنْ عائِشَةَ أَنَّهَا قالَتْ: كانَ أَحَبُّ الْعَمَلِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ. [خ٦٤٦٢ (١١٣٢)].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: خۆشتڤیترین كار بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو بوو یێ خودانێ وی ل سەر بەردەوام.**

## ١٥ . باب: الكفاف والقناعة وغنى النفس

## بابەتێ: تێرا خۆ هەبیت و قەناعەت و زەنگینیا دلی.

٣٣٠٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ)**. [خ٦٤٤٦/ م١٠٥١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەنگین نە ئەوە یێ گەلەك مال هەبیت، بەلێ زەنگینی زەنگینیا دلییە).**

٣٣٠٥ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ، وَرُزِقَ كَفَافاً، وَقَنَّعَهُ اللهُ بِمَا آتَاهُ)**. [م١٠٥٤].

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمرێ كورێ عاسی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ئەو سەرفەراز بوو، یێ موسلمان بووی و رزقێ وی دویڤ ڤایدە و هەوجەیا وی بیت، و خودێ وی ب یا داییێ رازیكەت)**.

## ١٦ ـ باب: فضل الصبر على الفقر

## بابەتێ: خێرا بێنفرەهیيا ل سەر هەژارییێ.

٣٣٠٦ - (م) عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: أَلَسْنَا مِنْ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ؟ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللهِ: أَلَكَ امْرَأَةٌ تأْوِي إِلَيْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَلَكَ مَسْكَنٌ تَسْكُنُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَأَنْتَ مِنَ الأَغْنِيَاءِ. قَالَ: فَإِنَّ لِي خَادِماً. قَالَ: فَأَنْتَ مِنَ الْمُلُوكِ.

- وفي رواية قال أبو عبد الرحمن: وَجَاءَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ إِلَى عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، وَأَنَا عِنْدَهُ، فَقَالُوا: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، إِنَّا وَاللهِ مَا نَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ، لاَ نَفَقَةٍ، وَلاَ دَابَّةٍ، وَلاَ مَتَاعٍ. فَقَالَ لَهُمْ: مَا شِئْتُمْ؟ إِنْ شِئْتُمْ رَجَعْتُمْ إِلَيْنَا فَأَعْطَيْنَاكُمْ مَا يَسَّرَ اللهُ لَكُمْ. وَإِنْ شِئْتُمْ ذَكَرْنَا أَمْرَكُمْ لِلسُّلْطَانِ. وَإِنْ شِئْتُمْ صَبَرْتُمْ. فَإِنِّي سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَسْبِقُونَ الأَغْنِيَاءَ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَى الْجَنَّةِ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفاً**).

قَالُوا: فَإِنَّا نَصْبِرُ، لاَ نَسْأَلُ شَيْئاً. [م٢٩٧٩].

**ژ ئەبی عەبدولرەحمانێ حوبولی (رحمه الله) گۆت: من گوه ل عەبدوللایێ كوڕێ عەمرێ كوڕێ عاسی بوو و زەلامەكی پرسیار ژێ دكر، ئینا گۆت: ما ئەم نە ژ هەژارێت مشەختییانین؟ ئینا عەبدوللایی گۆت: ما تە هەڤژینەك نینە بچییە دەڤ؟ گۆت: بەلێ، گۆت: تە مالەك نینە تێدا ئاكنجی ببی؟ گۆت: بەلێ، گۆت: پا تو ژ زەنگینانی، وی زەلامی گۆت: پا من خزمەتكارەك ژی یێ هەی، گۆت: پا تو ژ شاهانی.**

- **و د ڤەگێرەكێدا ئەبو عەبدولرەحمانی گۆت: سێ كەس هاتنە دەڤ عەبدوللایێ كوڕێ عاسی و ئەز ل دەڤ وی بووم، گۆتن: ئەی بابێ موحەممەدی ب راستی ئەم ب خودێ كەینە مە چو پێ چێنابیت نە مەزاختن هەیە و نە دەوارەك و نە متایەك، ئینا گۆتە وان: هەوە چ دڤێت؟ ئەگەر هەوە دڤێت بزڤرنە دەڤ من ئەوا خودێ بۆ مە ساناهی كری دێ دەینە هەوە، و ئەگەر هەوە دڤێت كارێ هەوە دێ گەهینمە خوندكاری، و ئەگەر هەوە دڤێت بێهنا خۆ فرەهـ بكەن، چونكی ب راستی من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو دگۆت: (ب راستی هەژارێت مشەختان رۆژا قیامەتێ بۆ چۆنا بەحەشتێ چل سالان دێ بەری زەنگینان كەڤن).**

**گۆتن: پا دێ بێهنا خۆ فرەهـ كەین، چو تشتی ناخوازین.**

٣٣٠٧ – عن أبي سعيدٍ الخدريِّ قال: أحبُّوا المساكينَ فإني سمعتُ رسولَ اللهِ (ﷺ) يقولُ في دعائِه : (اللهمَّ أحْيني مسكينًا وأمتني مسكينًا واحشُرني في زمرةِ المساكينِ)[1]. [جه٤١٢٦].

ضعيف.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: حەژ خۆشكێن و بێئەزیەتان بكەن (موتەوازع ئەزیەت نەبەخشان) ب راستی من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د دوعایا خۆدا دگۆت: (ئەی خودا بلا ب ب خۆشكێنی من بژیم و ب خۆشكێنی من بمرم و من د گەل كۆما خۆشكێنان كۆم بكە).**

١٧ . باب: لينظر إلى من هو أسفل منه

**بابەتێ: بلا بەرێ خۆ بدەتە یێ ژ خۆ پێدا.**

٣٣٠٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ، فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ). [خ٦٤٩٠/ م٢٩٦٣].

- زاد في مسلم: (مِمَّنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ).
- وفي رواية له: (انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لاَ تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللهِ).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە بەرێ خۆ دا ئێكی د مالی و لەشیدا ب سەر ویدا هاتییە ئێخستن بلا بەرێ خۆ بدەتە كەسەكێ ژ خۆ پێدا).**

- **و د موسلمیدا ئەڤە زێدە بوویە: (ژ وی یێ ب سەر وی هاتییە ئێخستن).**

---

**(١) شێخ سالحێ شامی ئەڤ فەرموودەیە د مالپەرێ خۆدا ل جهێ وێ ئینایە و هەر ب وێ هەژمارێ:**

٣٣٠٧ - (خ) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ). [خ٣٢٤١].

**ژ عیمرانێ كورێ (حصین)ی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (من بەرێ خۆ دا بەحەشتێ من دیت بارا پتر خەلكێ وێ هەژارن، و من بەرێ خۆ دا جەهنەمێ من دیت بارا پتر خەلكێ وێ ژنن).**

■ **و د ڤەگێرەكا ویدا: (بەرێ خۆ بدەنە وی یێ ژ هەوە پێدا[1] و بەرێ خۆ نەدەنە وی یێ د سەر هەوەدا[2] ئەڤە باشترە دا هوین نیعمەتا خودێ ل سەر خۆ كێم نەبینن)[3].**

١٨ ـ باب: الهمّ بالدنيا

**بابەتێ: خەمخوارنا دنیایێ.**

٣٣٠٩ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ كَانَتِ الْآخِرَةُ هَمَّهُ، جَعَلَ اللهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ، وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ، وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ. وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ، جَعَلَ اللهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ، وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ). [ت٢٤٦٥].

* صحيح.

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ ئاخرەت خەما وی بیت[4] خودێ زەنگینیيا وی دێ كەتە د دلێ ویدا، و دێ كاروبارێت وی یێت پرت و بەلاڤ كۆم كەت، و دنیا دێ بۆ هێت و ئەو یا شكەستی، و هەر كەسێ دنیا خەما وی، خودێ دێ هەژارییا وی ئێخیتە پێشییا هەردو چاڤێت وی[5] و دێ كاروبارێ وی یێ كۆمكری بەلاڤ كەت، و چو ژ دنیایێ بۆ ناهێت ئەو نەبیت یا بۆ هاتییە نڤیسین).**

١٩ ـ باب: طول العمر وحسن العمل

**بابەتێ: درێژیيا ژی و كارێ چاك.**

٣٣١٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (عُمْرُ أُمَّتِي مِنْ سِتِّينَ سَنَةً إِلَى سَبْعِينَ سَنَةً). [ت٢٣٣١، ٣٥٥٠/ جه٤٢٣٦].

* صحيح.

---

(١) د هەمی تشتاندا د زەنگینییێدا د جوانییێدا د هێزێدا د سلامەتییێدا ... هتد.

(٢) د هەمی تشتاندا.

(٣) و دا ژ دەردێ حەسویدی و زكرەشییێ د دویر بن و دا ب خەم نەكەڤن.

(٤) ئانكو: د هەمی كاروبارێت خۆدا رازیبوونا خودێ تنێ وی مەبەستە.

(٥) ئانكو: هەكە یێ زەنگین ژی بیت چاڤێت وی تێر نابن، و دێ هەر خۆ هەژار بینیت بلا چەندێ زەنگین ژی بیت، ژبەر هندێ ئەو تێر نابیت و دێ هەر خەما كۆمكرنا زێدەتر خۆت.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژیێ ئوممەتا من ژ شێست سالانە هەتا حەفتێ سالانە).**

٣٣١١ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ: أَنَّ أَعْرَابِيّاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ خَيْرُ النَّاسِ؟ قَالَ: (**مَنْ طَالَ عُمُرُهُ، وَحَسُنَ عَمَلُهُ**). [ت٢٣٢٩].

**ژ عەبدوللایێ كورێ بوسری (ﷺ) گۆت: ئەعرابییەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ كی باشترینێ خەلكییە؟ گۆت: (یێ ژیێ وی درێژ بووی، و كار و كریارێت وی باش و بنەجھ و دورست هاتین).**

* صحيح.

٣٣١٢ - عَنْ عُبَيْدِ بْنِ خَالِدٍ السُّلَمِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) آخَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَقُتِلَ أَحَدُهُمَا، وَمَاتَ الْآخَرُ بَعْدَهُ، فَصَلَّيْنَا عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**مَا قُلْتُمْ**) ؟ قَالُوا: دَعَوْنَا لَهُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ! اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ! اللَّهُمَّ أَلْحِقْهُ بِصَاحِبِهِ! فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**فَأَيْنَ صَلَاتُهُ بَعْدَ صَلَاتِهِ، وَأَيْنَ عَمَلُهُ بَعْدَ عَمَلِهِ؟ فَلَمَا بَيْنَهُمَا، كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ**). [د٢٥٢٤/ ن١٩٨٤].

* صحيح.

**ژ عوبەیدێ كورێ خالدێ سولەمی (ﷺ): پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) برایینی د ناڤبەرا دو زەلاماندا كر، ئێك ژ وان هاتە كوشتن و یێ دی پشتی وی مر، و مە نڤێژ ل سەر كر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەوە چ گۆت)؟ گۆتن: مە دوعا بۆ كرن: ئەی خودێ گونەهێت وی ژێ ببە، ئەی خودێ دلۆڤانییێ پێ ببە، ئەی خودێ بگەهینە هەڤالێ وی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (پا كا نڤێژا وی پشتی نڤێژا وی كری، و پا كا كارێ وی پشتی كارێ وی كری؟ ئەوا د ناڤبەرا واندا هەی هەروەكی یا د ناڤبەرا عەردو عەسمانیدایە).**

## ٢٠ . باب: ذكر الموت والاستعداد له

## بابەتێ: بیرییا مرنێ و خۆ بۆ بەرهەڤكرن.

٣٣١٣ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ**). يَعْنِي: الْمَوْتَ. [ت٢٣٠٧/ ن١٨٢٣/ جه٤٢٥٨]

* حسن صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خۆ شیرپی ژ ێدە ل بیرا خۆ بینن) ئانكو مرنێ. (مرنێ ل برا خۆ بینن).**

٣٣١٤ - عَنْ هَانِئٍ . مَوْلَى عُثْمَانَ . قَالَ: كَانَ عُثْمَانُ إِذَا وَقَفَ عَلَى قَبْرٍ بَكَى، حَتَّى يَبُلَّ لِحْيَتَهُ، فَقِيلَ لَهُ: تُذْكَرُ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَلاَ تَبْكِي، وَتَبْكِي مِنْ هَذَا؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(إِنَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنْزِلٍ مِنْ مَنَازِلِ الْآخِرَةِ، فَإِنْ نَجَا مِنْهُ، فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ. وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ، فَمَا بَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ).**

قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَا رَأَيْتُ مَنْظَرًا قَطُّ؛ إِلاَّ الْقَبْرُ أَفْظَعُ مِنْهُ).**[ت٢٣٠٨/ جه٤٢٦٧].

* حسن.

ژ هانئی ـ ئازاكرییێ عوسمانی (ﷺ)، گۆت: ئەگەر عوسمان ل سەر گۆڕەكی راوەستابا دگری هەتا رهێت وی تەڕببان، ئێكی گۆتێ: بەحسێ بەحەشت و جەهنەمێ دهێتە كرن و تو نا گری و تو بۆ ڤی دكەیە گری؟ ئینا گۆت: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی گۆڕ پێنگاڤا ئێكێیە ژ پێنگاڤێت قیامەتێ، ڤێجا ئەگەر مرۆڤ ژێ رزگار بوو، یا پشتی وێ ژ وێ ب ساناهیترە، و ئەگەر ژێ رزگار نەبیت یا پشتی وێ ژێ دژوارترە).**

گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(د بینرا من چو دیمەن نەدیتینە ئەگەر گۆڕ ژ وی كەشەفرێتر نەبیت).**

٣٣١٥ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ خَافَ أَدْلَجَ ، وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ، أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ غَالِيَةٌ، أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ الْجَنَّةُ).** [ت٢٤٥٠].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(یێ ترسیا دێ سەرێ شەڤێ چیت[1] و یێ سەرێ شەڤێ چۆ، گەهشتە بنەجهێ، بزانن ب راستی متایێ خودێ یێ گران و خودان قەدرە (هوین ب ساناهی و بێ زەحمەت و ئەرزان ناگەهنێ) بزانن ب راستی متایێ خودێ بەحەشتە).**

(١) ئانكو: یێ بترسیت دێ لەزێ ل گوهدارییێ كەت و دێ كارێ خۆ بەردەوام بۆ گوهدارییا خودێ كەت.

### ٢١ ـ باب: ملازمة التقوى ومحاسبة النفس

### بابەتێ: تەقواداری و حسێبا د گەل نەفسێ.

٣٣١٦ – عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (اتَّقِ اللهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ). [ت١٩٨٧/ مي٢٨٣٣].

* حسن.

**ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (ژ خودێ بترسە هەر جهێ تو لێ بی، و باشیێ و خێرێ پشتی گونەهێ بکە دێ گونەهێ ژێ بەت، و ب رەوشت و ئەخلاقێ جوان تێکەلییێ د گەل خەلکی بکە).**

٣٣١٧ – عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا، وَتَمَنَّى عَلَى اللهِ). [ت٢٤٥٩/ جه٤٢٦٠].

* ضعيف، قال الترمذي: حسن.

[وانظر في الورع: ٣٠٣][(١)].

**ژ شەددادێ کوڕێ ئەوسی (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ ب ژیر و ب ئاقل ئەوە یێ موحاسەبا خۆ بکەت و بۆ پشتی مرنێ کار بکەت، و یێ نەچار ئەوە یێ ب دویڤ دلخوازیا خۆ بکەڤیت، و ب گونەهـ و بێ تەوبە و گو هەداری بەحەشتێ ژ خودێ بخوازیت).**

### ٢٢ ـ باب: الذين إذا رؤوا ذكر الله

### بابەتێ: ئەوێت ئەگەر هاتنە دیتن بیریا خودێ دهێتە کرن.

٣٣١٨ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ جُلَسَائِنَا خَيْرٌ؟ قَالَ: (مَنْ ذَكَّرَكُمْ بِاللهِ رُؤْيَتُهُ، وَزَادَكُمْ فِي عِلْمِكُمْ مَنْطِقُهُ، وَذَكَّرَكُمْ بالآخِرَةِ عِلْمُهُ). [مخ١١/٢٠٩، ٢١٠].

* إسناده حسن.

---

(١) ئەڤ زێدەییە د مالپەریدا هاتییە و د چاپا ئێکێدا نینە.

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ها تە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ کیژ هەڤرویێ شتییێ مە با شترینە؟ گۆت: (یێ دیتنا وی بیرا وە ل خودێ بینیت، و ئاخفتنا وی زانینا هەوە زێدە کەت، و زانینا وی ئاخرەتێ ل بیرا هەوە بینیت).**

٣٣١٩ - وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) ﴿...إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [يونس:٦٢] قال: (**يُذْكَرُ اللهُ بِرُؤْيَتِهِمْ**).

وفي رواية: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَنْ أَوْلِيَاءُ اللهِ؟ قَالَ: (**الذينَ إذا رُؤوا ذُكِرَ اللهُ**).[مخ١٠/١٠٤ . ١٠٦].

* إسناده حسن.

و ژ وی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) ﴿...... إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[1]، **گۆت: (ب دیتنا وان بیرا خودێ دهێتە کرن).**

**و د ڤەگێرەکێدا: ها تە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، مرۆڤێت خودێ کینە؟ گۆت: (ئەوێت ئەگەر هاتنە دیتن بیرا خودێ دهێتە کرن).**

## ٢٣ . باب: شدة الزمان وعظم البلاء

## بابەتێ: تەنگاڤییا زەمانی و مەزناتییا بەلایێ و ئمتیحانێ.

٣٣٢٠ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**عِظَمُ الْجَزَاءِ مَعَ عِظَمِ الْبَلاَءِ، وَإِنَّ اللهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْماً ابْتَلاَهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ**). [ت٢٣٩٦/ جه٤٠٣١].

* حسن.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وی گۆت: (مەزناتییا خەلاتێ دگەل مەزناتییا بەلا و ئمتیحانێ یە، و هەکە خودێ ملەتەک ڤیا، دێ ب نەخۆشییان ئمتیحانەکەت و جەرببینیت، ڤێجا هەر کەسێ ب قەدەرا خودێ رازی بوو، رازیبوونا خودێ بۆ وییە، و هەر کەسێ پێ نەخۆش و نەرازی بوو، نەرازیبوونا خودێ بۆ وییە).**

---

(١) رامانا ئایەتێ ب کورتی: مرۆڤێت خودێ نە ترس بۆ وان هەیە کو خودێ وان ب بەر ئیزایێ بێخیت، و نە ب خەم دکەڤن ل سەر هێلانا دنیایێ و تشتێ ژ وان چۆیی.

٣٣٢١ – عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلاَءً؟ قَالَ: (**الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الْأَمْثَلُ فَالْأَمْثَلُ، يُبْتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ، فَإِنْ كَانَ دِينُهُ صُلْباً اشْتَدَّ بَلاَؤُهُ، وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ ابْتُلِيَ عَلَى قَدْرِ دِينِهِ، فَمَا يَبْرَحُ الْبَلاَءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الْأَرْضِ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ**). [ت٢٣٩٨/ جه٤٠٢٣/ مي٢٨٢٥].

* حسن صحيح.

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وققاسی (رضي الله عنه) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، كیژ خەلكی بەلا و ئمتیحانا وان مەزنتر و گرانترە؟ گۆت: (پێغەمبەران، پاشی یێ باشتر و یێ باشتر و پتر وەكی پێغەمبەران، زەلام ل دویڤ دینێ خۆ بەرهنگاری بەلا و ئمتیحانێ دبیت، ئەگەر دینێ وی یێ ب هێز و موكم بیت، بەلا و ئمتیحانا وی دێ دژوار بیت، و ئەگەر نازكی و لاوازی د دینێ ویدا بیت، دێ ل دویڤ دینێ خۆ بەلا ب سەرێ وی هێن و بەردەوام بەلا بەندەیی بەرنادەن هەتا وی دهێلیت ل سەر عەردی بچیت و گونەهەك ل سەر وی نەمایی).**

## ٢٤ ـ باب: من أرضى الله بسخط الناس

## بابەتێ: یێ خودێ ب نەرازیبوونا خەلكی رازی بكەت.

٣٣٢٢ – عَن مُعَاوِيَةَ: أنه كَتَبَ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله عنها: أَنِ اكْتُبِي إِلَيَّ كِتَاباً تُوصِينِي فِيهِ، وَلاَ تُكْثِرِي عَلَيَّ، فَكَتَبَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها إِلَى مُعَاوِيَةَ: سَلاَمٌ عَلَيْكَ أَمَّا بَعْدُ؛ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَنِ الْتَمَسَ رِضَا اللهِ بِسَخَطِ النَّاسِ، كَفَاهُ اللهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ. وَمَنِ الْتَمَسَ رِضَا النَّاسِ بِسَخَطِ اللهِ، وَكَلَهُ اللهُ إِلَى النَّاسِ**) ، وَالسَّلاَمُ عَلَيْكَ. [ت٢٤١٤].

* صحيح.

**ژ موعاویەی (رضي الله عنه) وی بۆ عائیشایێ دایكا باوەرییداران نڤیسی، نامەكێ بۆ من بنڤیسە تێدا شیرەتان ل من بكە و ل سەر من گران نەكە، ئینا عائیشایێ (رضي الله عنها) بۆ موعاوییەی نڤیسی: سلاڤ ل سەر تە بن، و پاشی ب راستی من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەر كەسێ رازیبوونا خودێ ب نەرازیبوونا خەلكی بخوازیت خودێ**

**دێ وی ژ نەرازیبوونا خەلكی پارێزیت، و هەر كەسێ رازیبوو نا خەلكی ب نەرازیبوونا خودێ بخوازیت خودێ دێ وی دەتە دەستێ خەلكی و ل سەر سەردەست كەت).**

٢٥ . باب: حسن الظن بالله تعالى

**بابەتێ: هزرا باش ژ خودێ.**

٣٣٢٣ – عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، فَلْيَظُنَّ بِي مَا شَاءَ**). [حم١٦٠١٦/ مي٢٧٧٣].

* صحيح.

ژ واسیلەیێ كورێ ئەسقەعی (ﷺ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **( خودایێ مەزن دبێژیت: ئەز یێ ل دویڤ هزرا بەندەیێ من ژ من، ڤێجا هزارا وی دڤێت بلا ژ من بكەت).**

٢٦ . باب: في الصحة والفراغ

**بابەتێ: ئەوا د ساخلەمی و بەتالییێدا هاتی.**

٣٣٢٤ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ**). [خ٦٤١٢].

ژ ئیبن عەباسی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دو نیعمت یێت هەین گەلەك خەلك تێدا د خوسارەتن، ساخلەمی و بێكاری).**

## الفصل الأول: أحاديث جامعة

## پشكا ئێكێ: فەرموودەیێت كۆمكەر

### ١ ـ باب: حسن الخلق

### بابەتێ: باش سنجییێ.

٣٣٢٥ - عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ**). [د٤٧٩٩/ ت٢٠٠٢، ٢٠٠٣]

* صحيح.

**ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (تشتەك د ترازییا موسلمانیدا رۆژا قیامەتێ ژ سنج و رەوشت باشییێ گرانتر نینە).**

٣٣٢٦ - عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ**). [د٤٧٩٨].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (ب راستی موسلمان ب سنج و رەوشت باشییا خۆ دگەهیتە دەرەجا رۆژیگرێ شەڤ نڤێژكەر).**

٣٣٢٧ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صَالِحَ الْأَخْلَاقِ**).

[حم٨٩٥٢/ ط١٦٧٧ بلاغاً].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز بۆ هندێ یێ هاتیمە هنارتن، دا رەوشتێت چاك تەكویز بكەم).**

٣٣٢٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ (ﷺ) يَقُولُ: (**خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقاً إِذَا فَقِهُوا**). [حم١٠٠٢٢]

* إسناده صحيح على شرط مسلم.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل بابێ قاسمی بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی باشێت هەوە ئەون، یێت سنج و رەشت باشتر ژ هەوە، ئەگەر د ئیسلامێدا شارەزا ببن و فەرمانێت ئیسلامێ بزانن).**

٣٣٢٩ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ! أَحْسَنْتَ خَلْقِي، فَأَحْسِنْ خُلُقِي**). [حم٢٤٣٩٢، ٢٥٢٢١]

* حديث صحيح، رجاله رجال الشيخين.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: (ئەی خودا تە لەشێ من جوان کر، ڤێجا رەوشتێ من ژی جوان بکە).**

٢ ـ باب: أَحاديث جامعة في الخير

**بابەتێ: فەرموودەیێت کۆمکەرێت خیرێ.**

٣٣٣٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ تَعَالَى فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظَلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: إِمامٌ عَدْلٌ، وَشابٌ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي المَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللهِ، اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخافُ اللهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ، فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمالُهُ ما تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خالِياً فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ**). [خ١٤٢٣ (٦٦٠)/ م١٠٣١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (حەفتان خودێ دێ ئێخیتە د بن سیبەرا خۆڤە رۆژا چو سیبەر نەبن سیبەرا وی نەبیت: پێشەوایێ داد پەروەر، و جەحێلەك د پەرستنا خودێدا رابىيت و مەزن ببیت، و مرۆڤەك دلێ وی ب مزگەفتانڤە پێ گرێدای بیت[1]، و دو مرۆڤ ل سەر ڤیانا خودێ کۆم ببن و ل سەر ڤیانا خودێ ژێکڤە ببن[2]، و مرۆڤەك ژ نەکا خودان جوانی و دەسهەلات داخوازکەتە خۆ، بێژیت: ئەز ژ خودێ دترسم، و مرۆڤەك سەدەقەکێ بدەت هند ڤەشێریت هەتا دەستێ وی یێ چەپێ**

(١) ئانکو: زێدە حەژ چۆنا مزگەفتان بکەت.

(٢) ئانکو: ئەگەرێ کۆمبوونا وان ڤیانا خودێ بوو دەمێ د گەلێك د ڤیانا خۆدا د راست بوون و دەمێ ژێکڤە بووین ژی هەر د ڤیانا خۆدا د راست بوون چونکی ڤیانا وان ل سەر بنیاتەکێ موکومە د گەلێك بن یان نە هەر حەژ ئێك و دو دکەن.

**نەزانیت دەستێ وی یێ راستێ چ مەزاختییە، و مرۆڤەك ب تنێ خودێ ل بیرا خۆ بینیت چاڤێت وی (ژ ترساندا) تژی رۆندك ببن).**

٣٣٣١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلاَ يُؤْذِ جارَهُ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ). [خ٦٠١٨ (٥١٨٥)/ م٤٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(یێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا قەدرێ مێڤانێ خۆ بگریت، و یێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا د گەل مرۆڤێت خۆ یێ باش بیت، و یێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا ئاخفتنا خێرێ بێژیت یان خۆ بێ دەنگ بكەت).**

٣٣٣٢ - (ق) عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ): أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (إِيمَانٌ بِاللهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ). قُلْتُ: فَأَيُّ الرِّقاب أَفْضَلُ؟ قَالَ: (أَغْلاَهَا ثَمَناً، وَأَنْفَسُها عِنْدَ أَهْلِهَا). قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: (تُعِينُ صَانِعاً، أَو تَصْنَعُ لأَخْرَقَ). قالَ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قالَ: (تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَصَدَّقُ بِهَا عَلَى نَفْسِكَ). [خ٢٥١٨/ م٨٤].

ژ ئەبی زەری، (رضي الله عنه)، گۆت: من پرسیارا پێغەمبەری (ﷺ) كر: كیژ كار و كریار ب قەدرتر و چێترن؟ گۆت: **(باوەرییا ب خودێ، و جیهادا د رێكا ویدا)**، من گۆت: كیژ كۆلە (عەبد) بۆ ئازاكرنێ چێترە؟ گۆت: **(یێ ب قەدرتر ل دەڤ خودانێ خۆ و بها گرانتر)**، من گۆت: پا هەكە من نەكرن؟ گۆت: **(هاریكارییا خودان سنعەتەكی بكە یان سنعەتەكی نیشا نەزانەكی بدە)**. من گۆت: ئەگەر من ئەڤە نەكرن؟ گۆت: **(خرابییا خۆ ژ خەلكی بەسكە ئەڤە سەدەقەیە ژ تە بۆ تە).**

٣٣٣٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ اللهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاَثاً، وَيَكْرَهُ لَكُمْ ثَلاَثاً؛ فَيَرْضَى لَكُمْ: أَنْ تَعْبُدُوهُ، وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً. وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعاً، وَلاَ تَفَرَّقُوا. وَيَكْرَهُ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ). [م١٧١٥].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودایێ مەزن ئەمرێ هەوە ب سێ تشتان دكەت و نەهیا هەوە ژ سێ تشتان دكەت:**

**ئەمرێ هەوە دكەت: هوین وی بپەرێسن، و چو شریكان بۆ چێ نە كەن، و هوین هەمی خۆ ب قورئانێ و دینێ ویڤە بگرن و ژێكڤە نەبن، و نەهیا هەوە دكەت: ژ گۆتگۆتكان، و پرسیاركرنا زێدە، و مەزاختنا مالی نە د جهێ دورستدا).**

٣٣٣٤ - (م) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ. وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً، سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ. وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ. وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْماً، سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقاً إِلَى الْجَنَّةِ. وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ. وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ). [م٢٦٩٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ تەنگاڤییەكێ ل سەر موسلمانەكی راكەت، خودێ دێ تەنگاڤیەكێ ژ تەنگاڤییێت قیامەتێ ل سەر راكەت، و هەر كەسێ ل سەر دەستكورتەكی ساناهی كەت، خودێ دنیا و ئاخرەتێ دێ ل سەر ساناهی كەت، و هەر كەسێ موسلمانەكی پەردە و ستارە كەت، خودێ دێ وی د دنیا و ئاخرەتێدا ستارە كەت. و بەردەوام خودێ یێ د هاریكارییا بەندەیدا هندی بەندە د هاریكاریا برایێ خۆدا بیت[1]، و هەر كەسێ رێكەكێ بگریت، دا خوازا زانینەكێ تێدا بكەت، خودێ دێ بۆ رێكەكێ پێ ساناهی كەت بۆ بەحەشتێ. نینە هندەك كەس د مالەكێدا ژ مالێت خودێدا كۆم ببن، كتێبا خودێ كو قورئانە بخوینن، و د ناڤبەینا ئێكدودا بخوینن[2]، هەكە خودێ دلرەحەتییێ ب سەر واندا نەئینیتە خوارێ و دلۆڤانییێ ب سەر واندا نە بەردەت[3]، و ملیاكەتێت (خە لەكێت ز كری د گەرن) دۆرما ندۆری وان**

---

(١) ئانكو: هەوجەییێت وی بقەتینیت.

(٢) ئانكو: ئێك بخوینیت و راوەستیت، یێ دی هەر وێ بخوینیت.

(٣) ئانكو: دلۆڤانی وان هەمیان نەگریت.

**نەگرن و خودێ دێ بەحسێ وان ل نك ئەوێت دەڤ خۆ كەت، و هەر كەسێ كار و كریارێت وی ئەو گران و گیرۆ كر، نەسەب و بنەمالا وی پێش نائێخن[1]).**

٣٣٣٥ - (م) وَعَنْهُ أَيْضاً قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ اللهَ عزّ وجل يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: يَا ابْنَ آدَمَ، مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي. قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعالَمِينَ؟! قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلاَناً مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ، لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ؟ يَا ابْنَ آدَمَ، اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي. قَالَ: يَا رَبِّ وَكَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟! قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِي فُلاَنٌ، فَلَمْ تُطْعِمْهُ؟ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ، لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي؟ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي. قَالَ: يَا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعالَمِينَ؟! قَالَ: اسْتَسْقَاكَ عَبْدِي فُلاَنٌ، فَلَمْ تَسْقِهِ، أَمَا إِنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ، وَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي). [م٢٥٦٩].

**دیسا ژ وی، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ مەزن رۆژا قیامەتێ دێ بێژیت: ئەی كورێ ئادەمی ئەز نەساخ بووم تە سەرا من نەدا، دێ بێژیت: خودایێ من چاوا دێ سەرا تە دەم و تو خودان و خودایێ هەمی جیهانانی؟ دێ بێژیت: ما تە زانی بوو بێڤان بەندەیێ من یێ نەساخ بوو، و تە سەرا وی نەدا، ما تو نوزانی هەكە تە سەرا وی دابا دا تو من ل دەڤ وی بینی؟ ئەی كورێ ئادەمی من خوارن دا تە و تە نەدا من؟ دێ بێژیت: خودایێ من چاوا دێ خوارنێ دەمە تە و تو خودان و خودایێ هەمی جیهانانی؟ دێ بێژیت: ما تە زانی بوو بێڤان بەندەیێ من خوارن ژ تە خواست و تە نەدایێ و ما تو نوزانی هەكە تە خوارن دابایێ، دا وێ چەندێ ل دەڤ من بینی؟ ئەی كورێ ئادەمی من ئاڤ ژ تە خواست و تە نەدا من؟ دێ بێژیت: خودایێ من چاوا دێ ئاڤێ دەمە تە و تو خودان و خودایێ هەمی جیهانانی؟ دێ بێژیت: بێڤان بەندەیێ من ئاڤ ژ تە خواست و تە نەدایێ بزانە هەكە تە ئاڤ دابایێ، دا وێ چەندێ ل دەڤ من بینی[2]).**

---

(١) ئانكو: یێ كار و كریار و خێرێت وی د كێم بن و وی نەگەهیننە پلەیێت چاك و باشان، بلا خۆ ب هیڤیا بنەمال و مالباتێڤە نەهێلیت نەو وی پێش نائێخن.

(٢) ئانكو: دا خێرا وێ چەندێ یا هەلگرتی ئەڤرۆ ل دەڤ من بینی.

٣٣٣٦ - (م) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ للهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ تَمْلآنِ ـ أَوْ تَمْلأُ ـ مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ. كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ، فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا). [م٢٢٣].

**ژ ئەبی مالکێ ئه شعەری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دستنڤێژ نیڤا نڤێژێ یه و خێرا (الحمد لله) ترازیێ تژی دکەت، و خێرا ( سبحان الله والحمد لله)، ناڤبەرا عەرد و عەسمانان تژی دکەت، و نڤێژ رۆناهییه[1]، و سەدەقە هەجەت و نیشانه[2]، و سەبر و بێنفرەهی رۆناهییه[3]، و قورئان یان نیشان و بەلگەیه بۆ تەیە یان دژی تەیە، هەمی مرۆڤ کار دکەن خۆ دفرۆشن[4]، ڤێجا یان خۆ دێ رزگار کەت یان دێ خۆ بەتە هیلاکێ).**

٣٣٣٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللهُ عَبْداً بِعَفْوٍ إِلا عِزّاً، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ للهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ). [م٢٥٨٨].

**ژ ئەبی هورەیره (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو سەدەقە ژ مالی کێم نا کەت، و خودێ چو ژ بەندەیکی ب ئازاکرنێ ژ ێدە نەکریە عەزیزی و سەربلندی نەبیت، و کەسێ بۆ خودێ خۆ نەشکاندییە، هەکە ئەو نە بلند کربیت).**

٣٣٣٨ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُكَ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيُكَ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِرْشَادُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّلاَلِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَبَصَرُكَ لِلرَّجُلِ

---

(١) ئانکو: رۆناهییه، بۆ خۆ رۆناهییێ ژێ وەردگریت، و رێکا وی رۆن دکەت، و بەرێ وی ددەتە باشییێ، و بەرێ وی ژ خرابییێ وەردگێریت، یان خێرا وێ رۆژا قیامەتێ بۆ خودانێ خۆ رۆناهییه، یان رۆناهییه ناڤچاڤێت خودانێ خۆ ل دنیا و ئاخرەتێ رۆن دکەت، یان ژی رۆناهییا دلییه بۆ خودانێ خۆ دلێ وی بۆ خودێ و رێکا خودێ رۆن دکەت.

(٢) ئانکو: سەدەقە بۆ خودانێ خۆ بەلگە و نیشانە کا مالێ خۆ چ لێ کرییە، یان بەلگە و نیشانە بۆ خودانێ خۆ ل سەر راستییا ئیمانا وی، یان رۆژا قیامەتێ خودانێ سەدەقێ دێ هێتە نیشانکرن دا هەمی بزانن ئەڤە سەدەقەچییە.

(٣) رۆناهییێ ددەتە خودانێ خۆ، بریار و هەلویستێ پێدڤی وەرگریت د هەمی کاروبارێت خۆدا.

(٤) یان خۆ دفرۆشنە خودێ ب گوهدارییێ، یان خۆ دفرۆشنە شەیتانی ب گونەهان.

الرَّدِيءِ الْبَصَرِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُكَ الْحَجَرَ وَالشَّوْكَةَ وَالْعَظْمَ عَنِ الطَّرِيقِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ). [ت١٩٥٦].

* صحيح.

**ژ ئەبی زەڕی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (گر نژینا تە د روییێ برایێ خۆدا بۆ تە سەدەقەیە، و فەرمانا تە ب باشیێ و پاشڤەلێدانا تە ژ گونەهێ بۆ تە سەدەقەیە، و رێنیشاندانا تە بۆ مرۆڤی د جهێ بەرزەبوونێدا بۆ تە سەدەقەیە، و رێکێ نیشا ئێکی چاڤ ڤوسیر یان کۆرە بدەی بۆ تە سەدەقەیە، و راکرنا تە یا بەری یان ستری یان هەستیکی ژ رێکێ بۆ تە سەدەقەیە، و ڤالاکرنا ئاڤا دۆلکێ خۆ بۆ دولکێ برایێ خۆ بۆ تە سەدەقەیە).**

٣٣٣٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَا أَبَا هُرَيْرَةَ! كُنْ وَرِعاً تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَكُنْ قَنِعاً تَكُنْ أَشْكَرَ النَّاسِ، وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُؤْمِناً، وَأَحْسِنْ جِوَارَ مَنْ جَاوَرَكَ تَكُنْ مُسْلِماً، وَأَقِلَّ الضَّحِكَ فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ). [جه٤٢١٧].

* صحيح.

[وانظر في الإمساك عن الشر: ١٧٦٠، ٣٣٣٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی بابێ هورەیرە خۆ ژ تشتێ گۆمان (شوبهە) تێدا بپارێزە دێ بیی یە پەر ستڤانترینێ خەلکی، و ڤانع رازیبە[1] دێ بییە سوپاسدارترینێ خەلکی، و وێ بۆ خەلکی حەز بکە یا تو بۆ خۆ حەز دکەی دێ بییە باوەریدار، و ب باشی جیرانییا وی کەسی بکە یێ بوویە جیرانێ تە دێ بییە موسلمان، و کەنییێ کێم بکە ب راستی کەنییا زێدە دلی دمرینیت).**

(١) ب وێ یا خودێ ب رزقێ تە کری و بۆ تە نفیسی.

## ٣ ـ باب: في الكبائر والموبقات

### بابەتێ: ئەوا د گونەهێت مەزن و هیلاكبەراندا هاتی.

٣٣٤٠ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ**)، قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَما هُنَّ؟ قَالَ: (**الشِّرْكُ بِاللهِ، والسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبا، وَأَكْلُ مالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلاَتِ**). [خ٢٧٦٦/ م٨٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خۆ ژ حەفتێت هیلاكبەر بپارێزن)، گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو چنە؟ گۆت: (شیركا ب خودێ، و سێربەندی، و كوشتنا مرۆڤی ژ نەحەقی، و خوارنا سەلەفێ، و خوارنا مالێ ئێتیمی، و رەڤین رۆژا شەڕی د گەل گاوران، و گونەهباركرنا ژنێت دەهمەن پاقژ و دلساخ و بێ غال و غەرەز و ئاگەهـ ژ چو نەبی و خودان ئیمان ب زنایێ).**

٣٣٤١ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ): أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ؟ قَالَ: (**أَنْ تَجْعَلَ للهِ نِدّاً وَهُوَ خَلَقَكَ**). قُلْتُ: إنَّ ذلِكَ لَعَظِيمٌ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: (**وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ**). قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: (**أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جارِكَ**). [خ٤٤٧٧/ م٨٦].

زاد في رواية لهما: فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل تَصْدِيقَهَا: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾ الآية [الفرقان:٦٨]. [خ٤٧٦١].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیار ژ پێغەمبەری كر (ﷺ): كیژ گونەهـ ل دەڤ خودێ مەزنترە؟ گۆت: (تو بەڤل و هەڤبەركی بۆ خودێ دانی و وی تو یێ چێكری)، من گۆت: ب راستی ئەڤە یا مەزنە، و من گۆت: پاشی كیژك؟ گۆت: (و تو بچویكێ خۆ بكوژی ترسا هندێ د گەل تە بخۆت)، من گۆت: پاشی كیژك؟ گۆت: (تو زنایێ د گەل هەڤژینا جیرانێ خۆ بكەی).**

و د ڤەگێرەكا واندا ئەڤە زێدەبوو یە: خودایێ هەر ب هێز و مەزن راستیيا وێ ئينا خوار: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ﴾[1].

٣٣٤٢ ـ عَن أبي بَكْرَةَ رضي الله عنه قال: قال النبي (ﷺ): (**ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ**) ثَلَاثًا، قالوا: بَلَى يا رَسُولَ اللَّهِ، قال: (**الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ** . وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا فقال: . **ألا وَقَوْلُ الزُّورِ**) قال: فما زَالَ يُكَرِّرُهَا حتى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ. [خ٢٦٥٤/ م٨٧].

**ژ ئەبی بەكرەیی، (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سێ جاران گۆت: ( ئەز مەزنترین گونەهێت مەزن بۆ هەوە نەبێژم)؟ مە گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (هەڤپشك چێكرنە د گەل خودێ و دلهێلانا دایبابانە، و یێ پالدای بوو و روینشتە خوارێ، و گۆت: و بزانن گۆتنا درەو و بێبەخت و پویچە، و شادەزۆرییە، و هەر گۆت و گۆتەڤە هەتا (ژ بەر وی و ژ دلپێڤەبوون هندی هند زێدە گۆتەڤە) مە گۆت: خۆزی هش ببا.**

٣٣٤٣ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يَزْنِي الْعَبْدُ حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَشْرَبُ حِينَ يَشْرَبُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يَقْتُلُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ**).

قَالَ عِكْرِمَةُ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: كَيْفَ يُنْزَعُ الإِيمَانُ مِنْهُ؟ قَالَ: هكَذَا، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، ثُمَّ أَخْرَجَهَا، فَإِنْ تَابَ عَادَ إِلَيْهِ هكَذا، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. [خ٦٨٠٩ (٦٧٨٢)].

**ژ ئیبن عەبا سی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زناكەر زنایێ ناكەت و ئەو باوەریدار بیت، و دزیكەر دزییێ ناكەت و ئەو باوەریدار بیت، و عەرەقڤەخۆر عەرەقێ نا ڤەخۆت و ئەو باوەر یدار ب یت و كو شتنێ نا كەت و ئەو باوەریدار بیت).**

---

(١) رامانا ئایەتێ ب كورتی: و ئەون ئەوێت ژ بلی خودێ، دوعایان ژ كەسێ دی نەكەن [ژ بلی خودێ كەسێ نەپەرێسن] و ئەو، ئەو مرۆڤێ خودێ كوشتنا وی دورست نەكری، و ب هەقی نەبیت [كو بەرانبەر ئێكێ دی بێتە كوشتن] ناكوژن، و زنایێ و دەهمەن پیسییێ ناكەن، و هەر كەسێ ڤان بكەت، دێ گونەهـ ل سەر ستویر بن، و دێ پێ ئێتە جزاكرن.

**عیكریمەیی گۆت: من گۆتە ئیبن عەبا سی: چاوا باوەری دێ ژێ هێتە كێشان؟ گۆت: هۆسا و تلێت خۆ كرنە د نافێكدا و پاشی ژێك ئیانە دەر، و ئەگەر تۆبە كر لێزڤریڤە هۆسا و تلێت خۆ كرنە د نافێكرا.**

٣٣٤٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ**. قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: **وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ. وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ** ). [م١٠٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(سێ كەسان خودێ رۆژا قیامەتێ ئاخفتنا دلۆڤانییێ و رازیبوونێ د گەل نائاخفیت، و گونەهێت وان ژێ نابەت و كریارێت وان قەبویل ناكەت، ـ ئەبو موعاوییە گۆت: و ب چاڤێ دلۆڤانییێ بەرێ خۆ نادەتێ ـ و ئیزایەكا گران بۆ وانە: پیرەمێرێ زناكەر، و مەلكێ درەوین، و هەژارێ خۆمەزنكەر).**

٣٣٤٥ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنَّانٌ، وَلاَ عَاقٌّ، وَلاَ مُدْمِنُ خَمْرٍ**). [ن٥٦٨٨/ مي٢١٣٨]

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(یێ زێدە منەتكەر و یێ خراب بۆ دایبابان و یێ بەردەوام ل سەر ڤەخوارنا عەرەقێ نا چنە بەحەشتێ).**

❀❀❀❀❀❀❀❀❀❀

الفصل الثاني: الفضائل والأخلاق والآداب

## پشكا دووێ: خێر و رەوشت و تۆر و ئەدەب

### ١ ـ باب: فضل الحب في الله تعالى

### بابەتێ: خێرا ڤیانا بۆ خودێ.

٣٣٤٦ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي؟ الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي)**. [م٢٥٦٦].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودایێ مەزن رۆژا قیامەتێ دێ بێژیت، كانێ ئەوێت بۆ مەزناتییا من حەژ ئێكدو دكر؟ ئەڤرۆ ئەز دێ وان ئێخمە د بن سیبەرا خۆڤە رۆژا چو سیبەر نەبن سیبەرا من نەبیت).**

٣٣٤٧ – (م) وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): **(أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى. فَأَرْصَدَ اللهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكاً، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ: أَيْنَ تريدُ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَخاً لِي فِي هَذِهِ الْقَرِيْةِ، قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا؟ قَالَ: لاَ، غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللهِ عزّ وجل . قَالَ: فَإِنِّي رَسُولُ اللهِ إِلَيْكَ، بِأَنَّ اللهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ)**. [م٢٥٦٧].

**ژ وی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (زەلامەكی سەرا برا یەكێ خۆ دا ل گوندەكێ دی، خودێ ملیاكەتەك ئێخستە د رێكا ویدا، و وەختێ هاتیە دەڤ گۆت: تە كیرێ دڤێت؟ گۆت: من برایەك ژ ڤی گوندی دڤێت، گۆتێ: ئەرێ تە قەنجییەك ل سەر وی هەیە تە دڤێت راگری و بپارێزی؟ گۆت: نەخێر، بۆ هندێ نەبیت، من بۆ خودێ یا حەژێ كری، گۆت: ئەز ڤاسدێ خودێمە بۆ تە، ژ بەر هندێ خودێ حەژ تە كر هەروەكی تە بۆ خودێ حەژێ كری).**

٣٣٤٨ – عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ لَأُنَاساً مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ وَلاَ شُهَدَاءَ، يَغْبِطُهُمُ الأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنَ اللهِ تَعَالَى)** ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، تُخْبِرُنَا مَنْ هُمْ؟ قَالَ: **(هُمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللهِ، عَلَى غَيْرِ أَرْحَامٍ بَيْنَهُمْ، وَلاَ أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا. فَوَاللهِ! إِنَّ وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ، وَإِنَّهُمْ عَلَى نُورٍ، لاَ يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاسُ، وَلاَ يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ)** وَقَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ [يونس]. [د٣٥٢٧]

* صحيح.

ژ عو مەرێ كورێ خەتتابی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ژ بە ندەیێت خودێ خەلكەك ھێ هەی نە پێغەمبەرن و نە شەهیدن، رۆژا قیا مەتێ پێغەمبەر و شەهید خۆزییا جهێ وان ژ خودێ هەی دكەن)** گۆتن ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ مە بێژە ئەو كینە؟ گۆت: **(خەلكەكن ب قورئانێ حەژ هەڤدو كرینە، بێی كو مرۆڤانی د ناڤبەرا واندا بیت یان هەڤپشكی د مالیدا ژ ئێكدو وەرگرن، ئەز ب خودێ كەمە سەروچاڤێت وان رۆناهییە یان رۆناهی ژ سەروچاڤان دچیت، و ئەو یێت ل سەر جهێت بلند یێت رۆناهی ژێ دچیت، ئەو ناترسن ئەگەر خەلك ترسیان، و ب خەم ناكەڤن ئەگەر خەلك ب خەم دكەڤیت)**. و ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[1].

٣٣٤٩ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ، وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ؛ فَقَدْ اسْتَكْمَلَ الْإِيمَانَ). [د٤٦٨١].

* صحيح.

ژ ئەبی ئومامەیی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وی گۆت: **(هەر كەسێ ژ بەر خودێ ڤیا و ژ بەر خودێ نەڤیا و ژ بەر خودێ دا و ژ بەر خودێ نەدا وی باوەری تمام كر)**.

٢ ـ باب: إذا أحب الله عبداً حببه إلى عباده

**بابەتێ: ئەگەر خودێ حەژ بەندەیەكی كر دێ ل دەڤ بەندەیێت خۆ خۆشڤی كەت.**

٣٣٥٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا أَحَبَّ اللهُ الْعَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلَانًا؛ فَأَحْبِبْهُ، فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلَانًا؛ فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ). [خ٣٢٠٩/ م٢٦٣٧].

---

(١) رامان ب كورتی: ئاگەهدار بن، مرۆڤێت خودێ نە ترس بۆ وان هەیە كو خودێ وان ب بەر ئیزایێ بێخیت، و نە ب خەم دكەڤن ل سەر هێلانا دنیایێ و تشتێ ژ وان چۆیی.

- زاد مسلم في روايته: (وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْداً دَعَا جِبْرِيلَ فَيَقُولُ: إِنِّي أُبْغِضُ فُلاَناً؛ فَأَبْغِضْهُ. قَالَ: فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ. ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السَّمَاءِ: إِنَّ اللهَ يُبْغِضُ فُلاَناً؛ فَأَبْغِضُوهُ. قَالَ: فَيُبْغِضُونَهُ. ثُمَّ توضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الأَرْضِ).

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەكە خودێ حەژ بەندەیی كر، گازی جبریلی كر: بێ گۆمان خودایێ مەزن حەژ بێڤانی دكەت، تو ژی حەژێ بكە، جبریل دێ حەژێ كەت، دێ گازی خەلكێ عەسمانان كەت: ب راستی خودێ حەژ بێڤانی دكەت، هوین ژی حەژێ بكەن، خەلكێ عەسمانان ژی دێ حەژێ كەن، پاشی دێ حەژێكرنا وی ئێخنە د دلێت خەلكێت خودان دیندا كو ژێ رازی ببن).**

- و موسلمی د ڤەگێرا خۆدا زێدە كریە: **(و هەكە بەندەیەك نەڤیا گازی جبریلی كر و گۆت: بێ گۆمان من بێڤان نەڤێت، تە ژی بلا نەڤێت، جبریلی ژی نەڤێت، پاشی دێ گازی خەلكێ عەسمانان كەت، ب راستی خودێ بێڤان نەڤێت، بلا هەوە ژی نەڤێت، خەلكێ عەسمانان ژی نەڤێت، پاشی نەڤیانا وی دێ ئێخنە د دلێت خەلكێ عەردیدا كو كەسێت باش ژێ رازی نەبن).**

## ۳ ـ باب: المرء مع من أحب

## بابەتێ: مرۆڤ یێ د گەل وی یێ حەژێ دكەت.

٣٣٥١ – (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ) عَنِ السَّاعَةِ، فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: **(وَمَاذَا أَعْدَدْتَ لَهَا)**؟ قالَ: لاَ شَيْءَ، إِلاَّ أني أُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ (ﷺ)، فَقَالَ: **(أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)**.

قالَ أَنَسٌ: فَمَا فَرِحْنَا بِشَيْءٍ فَرَحَنَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ): **(أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ)**. قالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أُحِبُّ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ بِحُبِّي إِيَّاهُمْ، وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِمِثْلِ أَعْمَالِهِمْ. [خ٣٦٨٨/ م٢٦٣٩].

- وفي رواية لهما: قالَ: بَيْنَمَا أَنَا والنَّبِيُّ (ﷺ) خَارِجَانِ مِنَ المسْجِدِ، فَلَقِينَا رَجُلٌ عِنْدَ سُدَّةِ المسْجِدِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(مَا أَعْدَدْتَ لَهَا)** ؟ فَكَأَنَّ الرَّجُلَ اسْتَكَانَ، ثُمَّ قالَ:

يَا رَسُولَ اللهِ، ما أَعْدَدْتُ لَهَا كَبِيرَ صِيَامٍ وَلاَ صَلاَةٍ وَلاَ صَدَقَةٍ، وَلكِنِّي أُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ: (**أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ**). [خ٧١٥٣].

ژ ئەنەسی (ﷺ)، كۆ چەرە عەرەبەكی گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كەنگی قیامەتە؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: **(تە چ بۆ بەرهەڤ كرییە)؟** گۆت: حەژێكرنا خودێ و پێغەمبەرێ وی. گۆت: **(تو یێ د گەل وی یێ تە حەژێ كری)**.

ئەنەسی گۆت: كەیفا مە ب چو تشتا نەهاتییە وەكی كەیفا مە ب گۆتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتی: **(تو یێ د گەل وی یێ تە حەژێ كری)**. ئەنەسی گۆت: و ئەز حەژ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەبوبەكری و عومەری دكەم، و ئەز هیڤی دكەم ئەز د گەل وان بم، ژ بەر حەژێكرنا من بۆ وان، بلا من وەكی كارێ وان نەكربیت.

- و د ڤەگێرەكا واندا: گۆت: د دەمەكیدا ئەز و پێغەمبەر (ﷺ) ژ مزگەفتێ دەرد كەفتین زەلامەك ل بن شەفقێ دەرگەهێ مزگەفتێ گەهشتە مە و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ كەنگی قیامەتە؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: **(تە چ بۆ بەرهەڤ كرییە)؟** هەروەكی ئەو زەلام شكەست، پاشی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من نە گەلەك رۆژی و نە گەلەك نڤێژ و نە گەلەك سەدەقە بۆ بەرهەڤ نەكرییە، بەلێ ئەز حەژ خودێ و پێغەمبەرێ وی دكەم، گۆت: **(تو یێ د گەل وی یێ تە حەژێ كری)**.

٤ ـ باب: تفسير البر والإثم

## بابەتێ: راڤەكرنا چاكییا راست و دورست و گونەهێ.

٣٣٥٢ - (م) عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟ فَقَالَ: (الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ. وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ).[م٢٥٥٣].

ژ نەواسێ كورێ سەمعانێ ئەنساری (ﷺ) گۆت: من پرسیارا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ چاكییا راست و دورست و گونەهێ كر؟ ئینا گۆت: **(چاكییا راست و دورست سنج باشییە، و گونەهـ ئەوە یا دلێ تە ل سەر نەراوەستیت، و تە نەڤێت خەلك ب سەر هەلببیت)**.

٥ ـ باب: مجالسة الصالحين

**بابەتێ: روینشتنا د گەل چاکان.**

٣٣٥٣ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (**مَثَلُ الجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ، كَحَامِلِ المِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ: إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحاً طَيِّبَةً. وَنَافِخُ الْكِيرِ: إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحاً خَبِيثَةً**).[خ٥٥٣٤ (٢١٠١)/ م٢٦٢٨].

**ژ ئەبی موو سایێ ئە شعەری (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی نموونەیا هەڤالێ راستکار و باش و هەڤالێ خراب، وەکی هەلگر و خودانێ مسکێیە، و پفکەرێ کویرهێیە[(١)]، هندیکە هەلگرێ مسکێیە، یان دێ دەتە تە، یان دێ ژێ کڕی، یان دێ بێهنەکا خۆش ژ وی بینی[(٢)]، و پفکەرێ کویرهێ، یان دێ جلکێت تە سۆژیت، یان دێ بێهنەکا پیس ژ وی بینی).**

٦ ـ باب: استحباب طلاقة الوجه

**بابەتێ: باشدانانا رویڤەکرنێ.**

٣٣٥٤ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئاً، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ**). [م٢٦٢٦].

[وانظر: ٣٣٣٨][(٣)].

**ژ ئەبی زەڕی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چو ژ خێرێ بچویک و کێم نەدانە خۆ هەکە تو ب روییەکێ ڤەکری بەرێ خۆ بدەیە برایێ خۆ).**

٧ ـ باب: مداراة الناس وملاطفة الصغار

**بابەتێ: نەرماتی د گەل خەلکی و خوشکۆکی د گەل بچویکی.**

٣٣٥٥ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّهُ اسْتَأْذَنَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) رَجُلٌ فَقَالَ: (**ائْذَنُوا لَهُ، فَبِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ، أَوْ بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ**). فَلَمَّا دَخَلَ أَلاَنَ لَهُ الْكَلاَمَ، فَقُلْتُ لَه: يَا رَسُولَ اللهِ، قُلْتَ

---

(١) مەبەست پی ئاسنگەرە.

(٢) ئانکو: دێ گەهیە هەوجەییا خۆ، چ ئەو بدەتە تە، چ بکڕی، چ بێهنخۆشی بگەهیتە تە و هۆسا ب چو رەنگا تو یێ خوسارەت نینی.

(٣) ئەڤ زێدەییە د مالپەریدا هاتییە و د چاپا ئێکێدا نەهاتییە.

ما قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ فِي الْقَوْلِ؟! فَقَالَ: (أَيْ عائِشَةُ، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَ اللهِ مَنْ تَرَكَهُ ـ أَوْ وَدَعَهُ ـ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ). [خ٦١٣١ (٦٠٣٢)/ م٢٥٩١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: زەلا مەكی دەستویری خواست بێتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا گۆت: (دەستویرییا وی بدەن، ئەو پیسە مرۆڤە ژ عەشیرا). ڤێجا دەمێ هاتییە دەڤ پێغەمبەر (ﷺ) نەرم د گەل ئاخفت، ئینا من گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە ئەو گۆت یا تە گۆتی پاشی ب ئاخفتنا نەرم د گەل دئاخڤی؟ ئینا گۆت: (ئەی عائیشا ب راستی خرابترینێ خەلكی جهێ وی ل دەڤ خودێ ئەوە یێ خەلك وی بهێلن یان نەرمی د گەل بكەن خۆ پاراستن ژ ئەزمان رەشییا وی).**

٣٣٥٦ – (ق) وَعَنْهَا رضي الله عنها قَالَتْ: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَكَانَ لِي صَوَاحِبُ يَلْعَبْنَ مَعِي، فَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ يَتَقَمَّعْنَ مِنْهُ، فَيُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ فَيَلْعَبْنَ مَعِي. [خ٦١٣٠/ م٢٤٤٠].

- وفي رواية لمسلم: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ فِي بَيْتِهِ، وَهُنَّ اللُّعَبُ.

**و ژ وێ (رضي الله عنها) گۆت: من ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) یاری ب بویكان دكر، و من هندە هەڤال هەبوون د گەل من یاری دكرن، و ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتبا ژۆر ئەو دچۆنە پشت پەردێ، و دا پێغەمبەر وان فرێكەتە دەڤ من دا یارییا د گەل من بكەن.**

- **و د ڤەگێڕەكا موسلمیدا: من ل مالا وی یاری ب كچكان دكرن و ئەو بویكێت یارییا بوون.**

٣٣٥٧ – (ق) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقاً، وَكَانَ لِي أَخٌ يُقَالُ لَهُ: أَبُو عُمَيْرٍ ـ قَالَ: أَحْسِبُهُ ـ فَطِيمٌ، وَكَانَ إِذَا جَاءَ قَالَ: (يَا أَبَا عُمَيْرٍ، ما فَعَلَ النُّغَيْرُ) ؟. نُغَرٌ كَانَ يَلْعَبُ بِهِ، فَرُبَّمَا حَضَرَ الصَّلاةَ وَهُوَ فِي بَيْتِنَا، فَيَأْمُرُ بِالْبِسَاطِ الَّذِي تَحْتَهُ فَيُكْنَسُ وَيُنْضَحُ، ثُمَّ يَقُومُ وَنَقُومُ خَلْفَهُ، فَيُصَلِّي بِنَا. [خ٦٢٠٣ (٦١٢٩)/ م٢١٥٠].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ هەمی مرۆڤان سنج و رەوشت پاك و باشتر بوو و من برایەك هەبوو د گۆتنێ ئەبو عومەیر گۆت ئەز ـ هزر د كەم یێ شیرڤەكری بوو ـ ئەگەر هاتبا دەڤ د گۆتێ: (ئەی بابێ عومەیری چویچكا**

**نوغەیر[1] چ كر)، چویچكا نوغەر بوو یاری پێ دكرن، و دبێت دەمێ نڤێژێ هاتبا و ئەو ل مالا مە ڤێجا دا فەرمانێ ب حێسیلا بن خۆ كەت و دا هێتە پاقژكرن و ئاڤ لێ دهاتە رەشاندن، و پاشی دا راوەستیت و ئەم ژی پشت وی رادوەستاین و نڤێژ ل بەری مە دكر.**

٨ . باب: احترام الكبير وتقديمه

**بابەتێ: رێزگرتن ل مەزنی و پێشئێخستنا وی.**

٣٣٥٨ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (أَرَانِي فِي الْمَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَذَبَنِي رَجُلاَنِ، أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ مِنْهُمَا، فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الأَكْبَرِ). [م٢٢٧١ و٣٠٠٣/ خ معلّقاً ٢٤٦].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من د خەونێدا ددیت، من سیواك ب كار دئینا، و دو زەلاما ئەز كێشام، ئێك ژ یێ دی مەزنتر بوو، من سیواك داڤ یێ بچویكتر، ئێكی گۆتە من[2]: بدەڤ یێ مەزن، ئینا من داڤ یێ مەزنتر).**

٣٣٥٩ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا، فَلَيْسَ مِنَّا). [د٤٩٤٣/ ت١٩٢٠].

* صحيح.

[وانظر: ٣٢٣٣، ٣٤١٦][3].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ دلۆڤانییێ ب بچویكێ مە نەبەت، و مافێ مەزنێ مە نەزانیت ئەو نە ژ مەیە و نە ل سەر رێكا مەیە).**

(١) نوغەیر: بچویككرنا نەغرە، و ئەو: چویچكەكا بچویكە و ژ بلبلان دهێتە هەژمارتن و یا سەر رەشە و بنزك رساسییە و پارچێت زەر یێت لێ و پشتا وێ زەرەكێ خاڤە رەنگێ رەملێیە.

(٢) خودانێ وێ گۆتنێ جبریل بوو سلاڤ ل سەر بن.

(٣) ئەڤ زێدەییە د مالپەریدا هاتییە و د چاپا ئێكێدا نینە.

## ٩ ـ باب: فضل التيسير والستر

## بابەتێ: خێرا ساناهیكرن و پەردەكرنێ.

٣٣٦٠ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قـالَ: قـالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَسَكِّنُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا). [خ٦١٢٥ (٦٩)/ م١٧٣٤].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (كاروباران ساناهیكەن و ب زەحمەت نەئێخن، و بنەجە بكەن و خەلكی نەرەڤینن)[١].**

٣٣٦١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يَسْتُرُ اللهُ عَلَى عَبْدٍ فِي الدُّنْيَا؛ إِلاَّ سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). [م٢٥٩٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (خودێ د دنیایێدا بەندە یەكی پەردە ناكەت ئەگەر رۆژا قیامەتێ وی پەردەنە كەت).**

٣٣٦٢ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، كَشَفَ اللهُ عَوْرَتَهُ، حَتَّى يَفْضَحَهُ بِهَا فِي بَيْتِهِ). [جه٢٥٤٦].

* صحيح.

[وانظر: ٦٢، ٣٣٣٤][٢].

**ژ ئیبن عەباس ( خودێ ژ وان رازی ب یت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ( هەر كەسێ گونەه و كێماسی و عەیبا برایێ خۆ یێ موسلمان پەردە بكەت خودێ رۆژا قیامەتێ دێ گونەه و كێماسی و عەیبا وی پەردە كەت، و هەر كەسێ گونەه و كێماسی و عەیبا برایێ خۆ یێ موسلمان ئاشكەرا بكەت خودێ دێ گونەه و كێماسی و عەیبا وی ئا شكەرا كەت هەتا د مالا ویدا وی پێ شەرمزار دكەت).**

---

(١) كار و بارێ دینی وەلێ نەكەن خەلك ژێ برەڤن.

(٢) ئەڤ زێدەییە د مالپەریدا هاتییە و د چاپا ئێكێدا نەهاتییە.

١٠ - باب: النهي عن التقنيط من رحمة الله تعالى

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ بێهیڤیبوونا ژ دلۆڤانییا خودێ.**

٣٣٦٣ - (م) عَنْ جُنْدَبٍ بْنِ عَبْدِ اللهِ الجَبَلِيّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَدَّثَ: (**أَنَّ رَجُلاً قَالَ: وَاللهِ لاَ يَغْفِرُ اللهُ لِفُلاَنٍ. وَإِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ ذَا الَّذِي يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَنْ لاَ أَغْفِرَ لِفُلاَنٍ، فَإِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِفُلاَنٍ، وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ**)، أَوْ كَمَا قَالَ. [م٢٦٢١].

ژ جوندوبێ كوڕێ عەبدوللایێ جەبەلی (ڕضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**زەلامەكی گۆت: ب خودێ، خودێ گونەهێت بێڤانی ژێ نابەت، خودێ گۆت: ئەو كییە سویندێ ب سەر من دخۆت ئەز گونەهێت بێڤانی ژێ نابەم، ب ڕاستی من گونەهێت وی بۆ ژێ برن، و كارێ تە پویچ كر**). یان ژی ب وی ڕەنگی گۆتی.

١١ - باب: النهي عن مناجاة الاثنين دون الثالث

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ پستەپستا دووان بێی یێ سێیێ.**

٣٣٦٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً، فَلاَ يَتَنَاجى رَجُلاَنِ دُونَ الآخَرِ، حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، أَجْلَ أَنَّ ذلك يُحْزِنُهُ**). [خ٦٢٩٠/ م٢١٨٤].

ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (ڕضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**هەكە هوین سێ د گەلێك بن دو بێی یێ دی پستەپستێ نەكەن، هەتا هوین دهێنە د ناڤ خەلكیدا، چونكی ئەڤە دێ وی ب خەم ئێخیت**).

١٢ - باب: لا يقام الرجل من مجلسه

**بابەتێ: مرۆڤ ژ جهێ وی ناهێتە ڕاكرن.**

٣٣٦٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ**). [خ٦٢٦٩ (٩١١)/ م٢١٧٧].

ژ ئیبن عومەری، (خودێ ژ وان ڕازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**كەس كەسێ ژ جهێ وی نەڕاكەت و پاشی ل جهێ وی ڕوینیتە خوارێ**).

٣٣٦٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**مَنْ قَامَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ**). [م٢١٧٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە ئێك ژ هەوە ژ جهێ خۆ رابوو و هاتێڤە، ئەو ب وی جهی هەژیترە).**

## ١٣ ـ باب: الأدب في العطاس والتثاؤب

## بابەتێ: تۆر و ئەدەبێ بێهنشك و باوشکێ.

٣٣٦٧ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (**إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الحَمْدُ للهِ، وَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ، فَإِذَا قالَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللهُ، فَلْيَقُلْ: يَهْدِيكُمُ اللهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ**). [خ٦٢٢٤].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەکە ئێك ژ هەوە بێهنژی بلا بێژیت: الحمد لله، و بلا برایێ وی یان هەڤالێ وی بێژیتێ: خودێ رەحمێ ب تە ببەت، هەکە گۆتێ خودێ رەحمێ ب تە ببەت بلا بێژیت: خودێ تە راستەرێ کەت و کاروبارێت تە دورست بکەت).**

٣٣٦٨ – (م) عَنْ أَبِي موسى قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَحَمِدَ اللهَ فَشَمِّتُوهُ. فَإِنْ لَمْ يَحْمَدِ اللهَ، فَلاَ تُشَمِّتُوهُ**). [م٢٩٩٢].

**ژ ئەبی مووسای (ﷺ)، گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (هەکە ئێك ژ هەوە بێهنشی و حەمدا خودێ کر (ئانکو گۆت: الحمد لله) بێژنێ: خودێ رەحمێ ب تە ببەت، و هەکە حەمدا خودێ نەکر، دوعا رەحمێ بۆ نەکەن).**

٣٣٦٩ – (م) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ: أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ)، وَعطَسَ رَجُلٌ عِنْدَهُ فَقَالَ لَهُ: (**يَرْحَمُكَ اللهُ**) ، ثُمَّ عَطَسَ أُخْرَى فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**الرَّجُلُ مَزْكُومٌ**). [م٢٩٩٣].

- ولفظ ابن ماجه: (**يُشَمَّتُ الْعَاطِسُ ثَلاَثاً، فَمَا زَادَ فَهُوَ مَزْكُومٌ**). [جه٣٧١٤].

ژ سەلەمەیێ کورێ ئەکوەعی (ﷺ) وی گوهـ ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) و زەلامەك ل دەڤ وی بێهنژی گۆت: (خودێ دلۆڤانییێ ب تە ببەت) پاشی جارەکا دی بێهنژی ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: **(ڤی زەلامی پەرسیڤ یا لێ).**

و بێژەیا ئیبن ماجەی: **(سێ جاران دێ دوعا دلۆڤانییێ بۆ یێ بێهنژی کەی و ئەگەر ژ ڤێ زێدە بوو ئەو وی پەرسیڤ یا لێ).**

٣٣٧٠ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (**التَّثَاؤُبُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ ما اسْتَطَاعَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قالَ: هَا، ضَحِكَ الشَّيْطَانُ**).[خ٣٢٨٩/ م٢٩٩٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(باوەشك ژ شەیتانییە، فێجا هەکە باوەشکا ئێکی ژ هەوە هات بلا نەهێلیت هندی بشێت، ب راستی هەکە باوەشکا ئێکی ژ هەوە هات شەیتان پێ دکەتە کەنی).**

٣٣٧١ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلَى فِيهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ**). [م٢٩٩٥].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەکە باوەشکا ئێکی ژ هەوە هات بلا دەستێ خۆ بدەتە بەر دەڤێ خۆ، ب راستی شەیتان تێرا دچیتە د زۆرڤە).**

## ١٤ ـ باب: أدب الطريق في الجلوس وغيره

## بابەتێ: رەوشت و تۆرێ روینشتنا د رێکێدا و تشتێ دیتر.

٣٣٧٢ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ عَلَى الطُّرُقَاتِ**)، فَقَالُوا: ما لَنَا بُدٌّ، إِنَّمَا هِيَ مَجَالِسُنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا، قَالَ: (**فَإِذَا أَبَيْتُمْ الاَّ الْمَجَالِسَ، فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهَا**). قالُوا: وَما حَقُّ الطَّرِيقِ؟ قَالَ: (**غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الأَذَى، وَرَدُّ السَّلاَمِ، وَأَمْرٌ بِالمَعْرُوفِ، وَنَهْيٌ عَنِ المُنْكَرِ**). [خ٢٤٦٥/ م٢١٢١].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هشیار بن ل سەرێ رێکان نەروینن خوارێ، گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ، ئەم نەشێین ژ بەر روینشتنێت خۆ رێکان بهێلین ئەم تێدا د گەل ئێکدو دئاخڤین، گۆت: هەکە هوین نەهێلن هەر دێ روینن خوارێ، پا حەقێ رێکێ بدەنێ، گۆتن: حەقێ رێکێ چییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: چاڤگرتنە (ژ بەرێخۆدانا حەرام)، و ئەزیەت نەگەهاندنە، و سلاڤ وەرگرتنە، و فەرمان ب باشییێیە، و نەهی ژ خرابییێیە).**

٣٣٧٣ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ**). [خ٦٥٢/ م١٩١٤م].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(د دەمەكیدا زەلامەك ل ڕێكەكێ دچۆ، تایێ سترییەكی دیت ژ ڕێكێ دا پاش، ئینا خودێ ژێ ڕازی بوو، و كارێ وی قەبویل كر، فێجا گونەهێت وی ژێ برن)**.

٣٣٧٤ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِي مَسْجِدِنَا، أَوْ فِي سُوقِنَا، وَمَعَهُ نَبْلٌ؛ فَلْيُمْسِكْ عَلَى نِصَالِهَا ـ أَوْ قَالَ: فَلْيَقْبِضْ بِكَفِّهِ ـ أَنْ يُصِيبَ أَحَداً مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِنْهَا بِشَيْءٍ)**. [خ٧٠٧٥ (٤٥٢)/ م٢٦١٥].

ژ ئەبی مووسایی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێك ژ هەوە د مزگەفتا مەڕا یان د سویكا مەڕا بۆری و تیر د گەل بن، بلا سەرێت وان بگریت ـ یان گۆت: بلا ب لەپێ خۆ بگریت ـ ترسا هندێ تشتەك ژێ ژ موسلمانان بگریت)**.

٣٣٧٥ - (م) عَنْ أَبِي بَرْزَةَ قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، عَلِّمْنِي شَيْئاً أَنْتَفِعُ بِهِ؟ قَالَ: **(اعْزِلِ الأَذَى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ)**. [م٢٦١٨].

ژ ئەبی بەرزەیی (رضي الله عنه) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تشتەكی نیشا من بدە مفایی ژێ وەرگرم؟ گۆت: **(ئەزیەتێ ژ ڕێكا موسلمانان ڕاكە)**.

## ١٥ ـ باب: النهي عن ضرب الوجه والإشارة بالسلاح

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ لێدانا ناڤچاڤان و نیشانكرنا ب چەكی.

٣٣٧٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ؛ فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ)**. [خ٢٥٥٩/ م٢٦١٢]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئێكی ژ هەوە شەڕ كر بلا ژ ناڤچاڤان دویر بكەڤیت)**[1].

٣٣٧٧ - (ق) وَعَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلاَحِ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ، فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ)**. [خ٧٠٧٢/ م٢٦١٧].

---

(١) ئانكو: چو دربان نەدانیتە ناڤچاڤان.

**ژ وی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە بەرێ چەكی نەدەتە برایێ خۆ، ئەو نوزانیت دبیت شەیتان ژ دەستی بینیتە دەرێ، پاشی بكەڤیتە د كۆرەكا ئاگریدا).**

٣٣٧٨ – عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى أَنْ يُتَعَاطَى السَّيْفُ مَسْلُولاً. [د٢٥٨٨/ ت٢١٦٣].

* صحيح.

**ژ جابری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) پاشڤەلێدان یا كری شیر رویس بهێتە هەلگرتن.**

## ١٦ ـ باب: الوعيد الشديد لمن عذَّب الناس

## بابەتێ: گەفێت دژوار ل بێ خەلك ئەشكەنجە دای.

٣٣٧٩ – (م) عَنْ هِشَامِ بْنِ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ قَالَ: مَرَّ بِالشَّامِ عَلَى أُنَاسٍ، وَقَدْ أُقِيمُوا فِي الشَّمْسِ، وَصُبَّ عَلَى رُؤُوسِهِمُ الزَّيْتُ. فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قِيلَ: يُعَذَّبُونَ فِي الْخَرَاجِ. فَقَالَ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ اللهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ فِي الدُّنْيَا**). [م٢٦١٣].

وفي رواية: قَالَ: وَأَمِيرُهُمْ يَوْمَئِذٍ عُمَيْرُ بْنُ سَعْدٍ عَلَى فِلَسْطِينَ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ فَحَدَّثَهُ، فَأَمَرَ بِهِمْ؛ فَخُلُّوا.

**ژ هیشامێ كورێ حەكیمێ كورێ حیزامی، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەو ل شامێ د بەر هندەك خەلكێ بۆری، ل بەر رۆژێ راوەستاندبوون و زەیت ب سەرێ واندا كربوو، گۆت: ئەڤە چییە؟ ئێكی گۆت: سەرا خویكێ یێ دهێنە ئیزادان، هیشامی گۆت: بەلێ یا من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی خودێ دێ وان ئیزا دەت ئەوێت خەلكی د دنیایێدا ئیزا ددەن).**

**و د ڤەگێرەكێدا: گۆت: و ئەمیرێ فەلەستینێ وێ رۆژێ عومەیرێ كورێ سەعدی بوو، چۆ دەڤ وی و ئەو بۆ گۆت، فەرمان دا، هاتنە بەردان.**

٣٣٨٠ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُوشِكُ إِنْ طَالَتْ بِكَ مُدَّةٌ، أَنْ تَرَى قَوْماً فِي أَيْدِيهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ، يَغْدُونَ فِي غَضَبِ اللهِ، وَيَرُوحُونَ فِي سَخَطِ اللهِ**). [م٢٨٥٧].

[وانظر: ٢٧٩٢][1].

(١) ئەڤ زێدەییە د مالپەرێ ویدا هاتییە و د چاپا ئێكێدا نینە.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نێزیكە ئەگەر دەم ل بەر هەوە درێژ ببیت هوین هندە كەسان ببینن قامچی یێت د دەستێت واندا وەكی كوریا چێلان، سپێدە ل وان دبیت و ئەو یێت د نەرازیبوونا خودێدا و ئێڤار ل وان دبیت و ئەو یێت د نەرزیبوونا خودێدا).**

١٧ ـ باب: الحياء من الإيمان

**بابەتێ: شەرم ژ باوەرییێیە.**

٣٣٨١ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ)**. [خ٢٤/ م٣٦].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر زەلامەكێ ئەنساریڕا بۆری و شیرەت ل سەر شەرمێ ل برایێ خۆ دكرن[1] ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (بهێلە ب راستی شەرم ژ ئیمانێیە).**

٣٣٨٢ - (خ) عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلامِ النُّبُوَّةِ الأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِي فَاصْنَعْ ما شِئْتَ)**. [خ٦١٢٠ (٣٤٨٣)].

**ژ ئەبی مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژ یا گەهشتیە خەلكی ژ ئاخفتنێت پێغەمبەرێت ئێكێ: هەكە تو شەرم نەكەی وێ بكە یا تە بڤێت)[2].**

٣٣٨٣ - عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ شَانَهُ، وَلاَ كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ زَانَهُ)**. [ت١٩٧٤/ جه٤١٨٥].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئاخفتن و كار و كریار كەشەفرێت د چو تشتاندا نابیت هەكە كرێت نەكەت و شەرم د چو تشتاندا نابیت هەكە جوان نەكەت).**

---

(١) ئانكو: دگۆتێ یێ شەرمین نەبە.

(٢) ئانكو: شەرمە مرۆڤی ژ گونەهێ ددەتە پاش، و هەكە شەرم نەما چو وی ژ خرابییێ ناڤەگریت.

٣٣٨٤ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (اسْتَحْيُوا مِنَ اللهِ حَقَّ الْحَيَاءِ) قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا نَسْتَحْيِي وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، قَالَ: (لَيْسَ ذَاكَ، وَلَكِنَّ الاِسْتِحْيَاءَ مِنَ اللهِ حَقَّ الْحَيَاءِ: أَنْ تَحْفَظَ الرَّأْسَ وَمَا وَعَى، وَتَحْفَظَ الْبَطْنَ وَمَا حَوَى، وَلْتَذْكُرْ الْمَوْتَ وَالْبِلَى. وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ: تَرَكَ زِينَةَ الدُّنْيَا، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ؛ فَقَدْ اسْتَحْيَا مِنَ اللهِ حَقَّ الْحَيَاءِ). [ت٢٤٥٨].

* حسن.

[وانظر: ٣١٢][(١)].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (راست و دورست شەرمێ ژ خودێ بكەن)** گۆت: مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم شەرمێ ژ خودێ دكەین و سوپاس بۆ خودێ، گۆت: **(وەسا نینە، بەلێ شەرما راست و دورست ژ خودێ ئەوە؛ سەر و ئەوا كۆم دكەت بپارێزی[(٢)] و زك و تشتێ پێڤە بپارێزی[(٣)]، و بیر ل مرنێ و پرتپرتبوونێدا بكەی، و یێ ئاخرەت بڤێت، دێ خەملا دنیایێ هێلیت، و یێ ئەڤە كر راست و دورست وی شەرم ژ خودێ كر).**

## ١٨ . باب: النهي عن الغضب والهجر

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ تۆرەبوون و سلبوونێ.

٣٣٨٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لَيْسَ الشَّدِيدُ بالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ). [خ٦١١٤/ م٢٦٠٩].

**ژ ئەبی هورەیرە، (رضي الله عنه)، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (یێ ب هێز نەئەوە یێ گەلەك خەلكی بێخیت، بەلێ یێ ب هێز ئەوە؛ یێ وەختێ كەربێ بشێتە خۆ).**

٣٣٨٦ - (خ) وَعَنْهُ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً قالَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): أَوْصِنِي، قالَ: (لاَ تَغْضَبْ). فَرَدَّدَ مِرَاراً، قَالَ: (لاَ تَغْضَبْ). [خ٦١١٦].

---

(١) نەڤ زێدەییە د مالپەریدا هاتییە و د چاپا ئێكێدا نینە.

(٢) ئانكو: عەقل و مێشك و گوه و چاڤ و ئەزمان و دەڤێ خۆ ژ حەرامی بپارێزی.

(٣) ئانكو: زكی ژ حەرامی بپارێزی و دەهمەنا خۆ بپارێزی.

**ژ ئەبی هورەیرە، (رضي الله عنه)، زەلامەکی گۆتە پێغەمبەری (ﷺ) من شیرەت بکە و فەرمانێ ل من بکە. گۆت: (تۆڕە نەبە) چەند جاران ڤەگێرا، گۆت: (تۆڕە نەبە).**

۳۳۸۷ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ لَنَا: (**إِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ قَائِمٌ؛ فَلْيَجْلِسْ فَإِنْ ذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ، وَإِلاَّ فَلْيَضْطَجِعْ**). [د٤٧٨٢، ٤٧٨٣].

* صحيح.

ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە مە: **(ئەگەر ئێك ژ هەوە تۆڕە بوو و ئەو ژ پیاڤە بیت بلا روینیت، ئەگەر تۆڕەبوون ژێ چۆ باشە و ئەگەر نە بلا خۆ درێژ کەت).**

۳۳۸۸ - (ق) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَحِلُّ لِمسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ، يَلْتَقِيَانِ: فَيَصُدُّ هَذَا وَيَصُدُّ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ**).[خ٦٢٣٧ (٦٠٧٧)/ م٢٥٦٠].

ژ ئەبی ئەیووب (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نەدورستە بۆ چو موسلمانان سێ شەڤان زێدەتر ژ برایێ خۆ سل ببیت، بگەهنە ئێك، ئەڤە بەرێ خۆ وەرگێریت و ئەڤە بەرێ خۆ وەرگێریت، و یێ باشتر ژ وان ئەوە یێ بەراهییێ سلاڤ دکەت).**

۳۳۸۹ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الاثْنَيْنِ، وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً؛ إِلاَّ رَجُلاً كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا. أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا. أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا**). [م٢٥٦٥].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دەرگەهێت بەحشتێ رۆژا دوشەمبێ و رۆژا پێنج شەمبێ ڤەدبن و گونەهێت هەر بەندەیەکێ هەبیت چو شریك بۆ خودێ نەچێکر بن دهێنە ژێبرن، مرۆڤەك نەبیت ئەو و برایێ خۆ (یان خویشکا خۆ) یێت ژێك سل بن، دێ بێژیت؛ ڤان هەردوکان بهێلن هەتا ژ ئێك ئاشت دبن، ڤان هەردوکان بهێلن هەتا ژ ئێك ئاشت دبن، ڤان هەردوکان بهێلن هەتا ژ ئێك ئاشت دبن).**

## ١٩ - باب: الرحمة والرفق

## بابەتێ: دلۆڤانی و نەرم و حەلیمییێ.

٣٣٩٠ - (ق) عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ يَرْحَمُ اللهُ مَنْ لاَ يَرْحَمُ النَّاسَ). [خ٧٣٧٦ (٦٠١٣)/ م٢٣١٩].

**ژ جەریرێ كورێ عەبدوللایی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ دلۆڤانییێ ب مرۆڤان نەبەت، خودێ دلۆڤانییێ پێ نابەت).**

٣٣٩١ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ، ارْحَمُوا أَهْلَ الْأَرْضِ، يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ). [د٤٩٤١/ ت١٩٢٤].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دلۆڤانان خودایێ پڕ دلۆڤان دلۆڤانییێ پێ دبەت، دلۆڤانییێ ب خەلكێ عەردی ببەن ئەوێ ل عەسمانان دێ دلۆڤانییێ ب هەوە بەت).**

٣٣٩٢ - (م) عَنْ جَرِيرٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ، يُحْرَمِ الْخَيْرَ). [م٢٥٩٢].

**ژ جەریری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ژ نەرم و حەلیمییێ بێبار ببیت ئەو ژ خێرێ بێبار دبیت).**

٣٣٩٣ - (م) عَنْ عائشةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (يَا عَائِشَةُ! إِنَّ اللهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ، وَمَا لاَ يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ). [م٢٥٩٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی عائیشا ب راستی خودێ یێ بێنفرەهە ل سەر ئیزادانێ و حەژ نەرم و حەلیمییێ دكەت، و وێ ل سەر نەرم و حەلیمییێ ددەت، یا ل سەر رەقی و زڤرییێ نەدەت، و یا ل سەر غەیری وێ نەدەت).**

## ٢٠ - باب: الرفق بالحيوان

## بابەتێ: دلۆڤانی ب گیانەوران.

٣٣٩٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى ماتَتْ، فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ، لاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا، وَلاَ سَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا، وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خُشَاشِ الأَرْضِ**). [خ٣٤٨٢ (٢٣٦٥)/ م٢٢٤٢]

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژنەك هاتە ئێزادان ژ بەر کتکەکێ زیندان کر هەتا مری، پێ چۆ جەهنەمێ، نە وێ خوارن و ڤەخوارن دایێ دەمێ زیندان کری و نە هێلا ژ خشۆکێت عەردی بخۆت).**

٣٣٩٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْراً فَنَزَلَ فِيهَا، فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبُ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كانَ بَلَغَ بِي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ**). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْراً؟ فَقَالَ: (**فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ**). [خ٦٠٠٩ (١٧٣)/ م٢٢٤٤].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(وەختەکی زەلامەك ل رێکەکێ دچۆ زێدە تێنی بوو، بیرەك دیت چۆ تێدا و ئاڤ ڤەخوار، پاشی دەرکەفت، هۆ دیت سەیەك پێ حلکەحلکێ دکەت و پێ ئاخێ ژ تێنادا دخۆت، وی زەلامی گۆت: ئەڤ سەیە ژ تێنادا پێ گەهشتییە وێ یا ئەز ژ تێنادا گەهشتیمێ، ئینا چۆ د بیرێدا و تژی پێلاڤا خۆ ئاڤ کر پاشی ب دەڤێ خۆ گرت هەتا سەرکەفتی و سە ئاڤدا، ئینا خودێ ژێ رازی بوو و کارێ وی قەبویل کر، ڤێجا گونەهێت وی ژێ برن).** گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بۆ مە خێر د جانەوەراندا ژی هەیە؟ گۆت: **(خێر د هەر خودان رحەکێ هەبیتدا یا هەی).**

## ٢٠ ـ باب: الرفق بالحيوان

## بابەتێ: دلۆڤانی ب گیانەوران.

٣٣٩٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى ماتَتْ، فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ، لاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا، وَلاَ سَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا، وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خُشَاشِ الأَرْضِ**). [خ٣٤٨٢ (٢٣٦٥)/ م٢٢٤٢]

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ژنەك هاتە ئێزادان ژ بەر کتکەکێ زیندان کر هەتا مری، پێ چۆ جەهنەمێ، نە وێ خوارن و ڤەخوارن دایێ دەمێ زیندان کری و نە هێلا ژ خشۆکێت عەردی بخۆت).**

٣٣٩٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْراً فَنَزَلَ فِيهَا، فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبُ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كانَ بَلَغَ بِي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ**). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْراً؟ فَقَالَ: (فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ). [خ٦٠٠٩ (١٧٣)/ م٢٢٤٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(وەختەکی زەلامەك ل رێکەکێ دچۆ زێدە تێنی بوو، بیرەك دیت چۆ تێدا و ئاڤ ڤەخوار، پاشی دەرکەفت، هۆ دیت سەیەك یێ حلکەحلکێ دکەت و یێ ئاخێ ژ تێنادا دخۆت، وی زەلامی گۆت: ئەڤ سەیە ژ تێنادا یێ گەهشتییە وێ یا ئەز ژ تێنادا گەهشتیمێ، ئینا چۆ د بیرێدا و تژی پێلاڤا خۆ ئاڤ کر پاشی ب دەڤێ خۆ گرت هەتا سەرکەفتی و سە ئاڤدا، ئینا خودێ ژێ رازی بوو و کارێ وی قەبویل کر، ڤێجا گونەهێت وی ژێ برن)**. گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، بۆ مە خێر د جانەوەراندا ژی هەیە؟ گۆت: **(خێر د هەر خودان رحەکێ هەبیتدا یا هەی).**

٣٣٩٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِجَهَازِهِ فَأُخْرِجَ مِنْ تَحْتِهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِبَيْتِهَا فَأُحْرِقَ بِالنَّارِ، فَأَوْحَى اللهُ إِلَيْهِ: فَهَلاَّ نَمْلَةً وَاحِدَةً**). [خ٣٣١٩ (٣٠١٩)/ م٢٢٤١]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**پێغەمبەرەك ژ پێغەمبەران روینشتە بن دارەکێ مێرییەکێ لەقەك لێ دا، فەرمان کر تشتێت وی ژ بن دارێ هاتنە دەرئێخستن، و فەرمان کر مالا وێ ب ئاگری هاتە سۆتن، ئینا خودێ وەحی بۆ هنارت بۆچی ئێك مێری ب تنێ نەبوو**).

٢١ . باب: فضل التواضع وتحريم التكبر

**بابەتێ: خێرا خۆشکاندنێ و حەرامکرنا خۆمەزنکرنێ.**

٣٣٩٧ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ**) قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَناً وَنَعْلُهُ حَسَنَةً. قَالَ: (**إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ. الْكِبْرُ: بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ**). [م٩١].

ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**هەر کەسێ تەممەت گرانییا پرتا ژ هەمییان بچویکتر ژ مەزناتییێ د دلێ ویدا هەبیت ناچیتە بەحەشتێ**)، زەلامەکی گۆت: ب راستی مرۆڤی دڤێت جلکێ وی یێ جوان بیت و پێلاڤا وی یا جوان بیت، گۆت: (**ب راستی خودێ یێ جوانە و کاروبارێت وی هەمی د جوانن و حەژ خۆجوانکرنێ دکەت، مەزناتی نەوەرگرتن و زڤراندنا راستییێیە و کێمکرنا خەلکییە**).

٣٣٩٨ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَقُولُ اللهُ سُبْحَانَهُ: الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي، فَمَنْ نَازَعَنِي وَاحِداً مِنْهُمَا، أَلْقَيْتُهُ فِي النَّارِ**). [جه٤١٧٥].

* صحيح.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت:
**(خودایێ پاك ژ هەمی كێماسییان گۆت: بلندی ئیزارێ منە و مەزنی عەبایێ منە[1] هەر كەسێ هەڤركییا من د ئێك ژ وانادا بكەت، دێ هاڤێژمە د ئاگریدا).**

٣٣٩٩ - (م) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ خَطَبَهُمْ فَقَالَ: **(إِنَّ اللهَ عزّ وجل أَوْحَى إِلَيَّ: أَنْ تَوَاضَعُوا، حَتَّى لاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ).** [م(٢٨٦٥) (٦٤)/ د٤٨٩٥/ جه٤١٧٩]. [وانظر في لباس الشهرة: ٢٨٢٩][2].

ژ عیازێ كورێ حیماری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن وەحی بۆ من هنارت، خۆ بشكێنن، هەتا كەس خۆ ل سەر كەسێ مەزن نەبینیت، و كەس دەستدرێژییێ ل سەر كەسێ نەكەت).**

## ٢٢ ـ باب: الرياء

## بابەتێ: روپمەتییێ

٣٤٠٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ).** [م٢٩٨٥].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت:
**(خودایێ مەزن گۆت: ب راستی ئەز ژ هەمی هەڤپشكان بێمەنتترم ژ هەڤپشكییێ[3]، ڤێجا هەر كەسێ كارەكی بكەت ئێكی دی د گەل من پشكدار كر، ئەز قەبویل ناكەم و دێ بۆ هەڤپشكدارییا وی هێلم).**

٣٤٠١ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: ذُكِرَ لِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ، وَلَمْ أَسْمَعْهُ مِنْهُ: **(إِنَّ فِيكُمْ قَوْماً يَعْبُدُونَ وَيَدْأَبُونَ حَتَّى يُعْجَبَ بِهِمُ النَّاسُ وَتُعْجِبَهُمْ نُفُوسُهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ).** [حم١٢٨٨٦، ١٢٩٧٢].

(١) مەخسەد پێ كا چاوا هەر ئێكی ئیزار و عەبایێ خۆ هەیە و ب ویڤە تایبەتن و نابیت كەس د گەل پشكدار بیت، هۆسا بلندی و مەزنی سالۆخەتێت خودێ ب تنێنە و نابیت بەندە هەڤركییا وی د سالۆخەتێت ویدا بكەن.

(٢) نەڤ زێدەییە د مالپەریدا هاتییە و د چاپا ئێكێدا نەهاتییە.

(٣) ئانكو: ئەز پێدڤی شریكی نینم و هەوجەیی پێ نینە.

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[وانظر: ٥، ٧].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: بۆ من هاتە گۆتن كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت، و من ژ وی گوه لێ نەبوویە: (هندەك ژ هەوە پەرستنا خودێ رژد دكەن و بەردەوام دبن هەتا خەلك ژ وان حێبەتی دبن، و ئەو ژی ب خۆ حێبەتی دبن و ئەو ژ دینی دەرد كەڤن دەركەفتنا تیرێ ژ نێچیرێ).**

## ٢٣ ـ باب: الأمانة

## بابەتێ: ئەمانەتی.

٣٤٠٢ – (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ (ﷺ) فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُحَدِّثُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ. حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ: **(أَيْنَ ـ أُرَاهُ ـ السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ)** ؟ قَالَ: هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(فَإِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ)**. قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: **(إِذَا وُسِّدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ)**. [خ٥٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: د دەمەكیدا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل دیوانەكێ بوو، بۆ وان دئاخفت، كۆچەرە عەرەبەك هاتە دەڤ گۆت: قیامەت كەنگییە؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەردەوامی دا ئاخفتنا خۆ، هندەكان گۆت: گوه لێ بوو كا چ گۆت، بەلێ پێ نەخۆش بوو یا گۆتی، و هندەكان گۆت: نەخێر گوه لێ نەبوو، فێجا دەمێ ئاخفتنا خۆ ب دویماهی ئینای، گۆت: (كا ئەز دێ ل كیرێ پرسیاركەرێ ژ قیامەتێ بینم)؟ گۆت: ها ئەز ئەڤەمە ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (هەكە ئەمانەت هاتە بەرزەكرن ل هیڤیا قیامەتێبە). گۆت: و بەرزەكرنا وێ چاوایە؟ گۆت: (هەكە كار ئێخستە دەستێ یێ نەهەژی ل هیڤیا قیامەتێ بە).**

٣٤٠٣ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ، وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ)**. [د٣٥٣٥/ ت١٢٦٤/ مي٢٦٣٩]

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئێما نەتی بۆ وی بزڤرینە یێ باوەری ب تە ئینایی و ئێمانەت دانایە دەڤ تە و خیانەتێ ل وی نەکە یێ خیانەت ل تە کری)[1].**

٣٤٠٤ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: مَا خَطَبَنَا نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) إِلاَّ قَالَ: (**لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ، وَلاَ دِينَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ**). [حم١٢٣٨٣].

* حديث حسن.

[وانظر: ٧٦، ٧٧، ٣٠٩٠، ٣٠٩١] .

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خوتبە بۆ مە نەخوانديیە نە گۆتبا: (نە وی باوەری هەیە یێ ئێمانەت ل دەڤ نەبیت و نە دین هەیە یێ پەیمانپارێزی ل دەڤ نەبیت).**

## ٢٤ . باب: (ولا تسألوا الناس شيئاً)

## بابەتێ: چو تشتی ژ خەلكی نەخوازن.

٣٤٠٥ - (م) عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) تِسْعَةً ـ أَوْ ثَمَانِيَةً أَوْ سَبْعَةً ـ فَقَالَ: (**أَلاَ تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللهِ**) ؟ وَكُنَّا حَدِيثَ عَهْدٍ بِبَيْعَةٍ، فَقُلْنَا: قَدْ بَايَعْنَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ! ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللهِ**) ؟ فَقُلْنَا: قَدْ بَايَعْنَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ! ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ تُبَايِعُون رَسُولَ اللهِ**) ؟ قَالَ: فَبَسَطْنَا أَيْدِيَنَا وَقُلْنَا: قَدْ بَايَعْنَاكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَعَلاَمَ نُبَايِعُكَ؟ قَالَ: (**عَلَى أَنْ تَعْبُدُوا اللهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَالصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، وَتُطِيعُوا ـ وَأَسَرَّ كَلِمَةً خَفِيَّةً ـ وَلاَ تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئاً**). فَلَقَدْ رَأَيْتُ بَعْضَ أُولَئِكَ النَّفَرِ يَسْقُطُ سَوْطُ أَحَدِهِمْ، فَمَا يَسْأَلُ أَحَداً يُنَاوِلُهُ إِيَّاهُ. [م١٠٤٣].

**ژ عەوفێ كورێ مالكێ ئەشجەعی (ﷺ) گۆت: ئەم نەهـ یان هەشت یان حەفت كەس ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ)، گۆت: (ئەرێ هوین سۆز و پەیمانان نادەنە پێغەمبەرێ خودێ)، و مە نێزیك سۆز و پەیمان دابوون، مە گۆت: (ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی مە سۆز و پەیمان پێت داینە تە)، پاشی گۆت: (ئەرێ هوین سۆز و**

(١) ئانكو: ئەمانەتێ وی بدەڤ وی یێ ئەمانەت دانایە دەڤ تە ئەگەر ژ تە خواست و ئەمانەتی نەڤەشێرە ژ وی یێ ئەمانەت ژ تە ڤەشارتی و خیانەت د ئەمانەتیدا د گەل تە كری، تو وەكی وی نەكە.

**پەیمانان نادەنە پێغەمبەرێ خودێ)؟** ئینا مە دەستێت خۆ درێژکرن مە گۆت: ئەم سۆز و پەیمانان ددەینە تە ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ل سەر چ سۆز و پەیمانان بدەینە تە؟ گۆت: **(ل سەر هندێ هوین خودێ بپەرێسن و چو تشتان بۆ نەکەنە هەڤپشك، و ل سەر کرنا پێنج نڤێژان و گوهداریێ بکەن)**، و ئاخفتنەك نزم گۆت: **(و هوین داخوازا چو تشتان ژ خەلکی نەکەن)**. ب راستی من هندەك ژ وان کەسان دیتن قامچیا وی ژ دەستێ وی دکەفت ژ کەسێ نەدخواست بدەتە ڤێ.

## ٢٥ ـ باب: الأَمر بالقوة وترك العجز

## بابەتێ: فەرمانکرن ب هێزێ و هێلانا نەچاریێ.

٣٤٠٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ. احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَلاَ تَعْجَزْ. وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ: لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللهِ، وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ). [م٢٦٦٤].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودان باوەرێ ب هێز چێتر و خۆشڤیتر ل دەڤ خودێ ژ خودان باوەرێ لاواز، و خێر یا د هەردوکاندا هەی[1]، و یێ هشیاربە ل سەر پەرستنێ، و هاریکاریێ ژ خودێ بخوازە و بێ خیرەتی تە نەگریت ژ پەرستنێ و داخوازا هاریکاریێ ژ خودێ ب تنێ بخوازە، و هەکە تشتەك گەهشتە تە، نەبێژە: هەکە من ئەڤە و ئەڤە کربایە، بەلێ بێژە: خودێ یا نڤیسی، و هەر تشتێ بڤێت دێ کەت، ب راستی: هەکە، دەرگەهێ وەسوەسا شەیتانی ڤەدکەت[2])**.

## ٢٦ ـ باب: لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين

## بابەتێ: د کونەکێڕا دوجارکی مار ب باوەریدارێڤە نادەت.

٣٤٠٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ). [خ٦١٣٣/ م٢٩٩٨].

---

(١) چونکی هەردو خودان باوەرن.

(٢) ئانکو: ب قەدەرێ نەرازی کەت.

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د كونەكێرا دوجاركی ب باوەریداریڤە ناهێتە پێڤەدان)(١).**

٢٧ ـ باب: دفع سوء الظن

**بابەتێ: پالدانا گۆمانا خراب.**

٣٤٠٨ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ مَعَ إِحْدَى نِسَائِهِ، فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ فَدَعَاهُ، فَجَاءَ، فَقَالَ: (**يَا فُلاَنُ! هَذِهِ زَوْجَتِي فُلانَةُ**) ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ كُنْتُ أَظُنُّ بِهِ، فَلَمْ أَكُنْ أَظُنُّ بِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ**). [م٢١٧٤].

[وانظر: ١٨٧١](٢).

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د گەل ئێك ژ هەڤژینێت خۆ بوو، زەلامەك د بەرڕا بۆری، ئینا گازی كرێ، هات، ئینا گۆت: (ئەی بێڤان ئەڤە بێڤانە هەڤژینا من) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر ئەز هزرا خەلەت ب كەسەكی ببەم ئەز نە ئەوم هزرا خەلەت ب تە ببەم(٣)، ئینا گۆت: (ب راستی شەیتان د جهێ خوینێدا د ناڤ مرۆڤیدا دهێت و دچیت)(٤).**

٢٨ ـ باب: التوكل على الله

**بابەتێ: خۆهێلانا ب هیڤیا خودێڤە.**

٣٤٠٩ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرُزِقْتُمْ كَمَا يُرْزَقُ الطَّيْرُ، تَغْدُو خِمَاصاً وَتَرُوحُ بِطَاناً**). [ت٢٣٤٤/ جه٤١٦٤].

* صحيح.

---

(١) ئانكو: دڤێت موسلمان یێ هشیار بیت نەهێتە خاپاندن هەكە نەشیا و جارەكێ هاتە خاپاندن دڤێت ئاگەهـ ژ خۆ هەبیت جارا دووێ نەهێتە خاپاندن، چونكی موسلمان دوجاركی ناهێتە خاپاندن.

(٢) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێكێدا نەهاتییە و د مالپەریدا هاتییە.

(٣) ئانكو: چاوا ئەز دێ هزرەكا نەدورست د راستا تەدا كەم.

(٤) ئانكو: هندی شەیتان مرۆڤی د بەر سەرداېرنێدا دبەت دێ تو بێژی خوینە د ناڤ رهێت مرۆڤیدا دهێت و دچیت و ئەز ترسیام خەلەتییەكێ باڤێژیتە د دلێت هەوەدا.

ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەكە هوین ب دورستی خۆ ب هیڤییا خودێڤە بهێلن و پشتا خۆ ب وی راست و گەرم بكەن، دا رزقێ هەوە دەت، هەروەكی رزقێ بالندەی ددەت، سپێدێ زك ڤالا دەردكەڤیت، و ئێڤاری زك تژی دزڤریت).**

٢٩ ـ باب: إصلاح ذات البين

**بابەتێ: ئاشتكرنا د ناڤبەرا خەلكیدا.**

٣٤١٠ – عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ)** ؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: **(إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، وَفَسَادُ ذَاتِ الْبَيْنِ الْحَالِقَةُ)**. [د٤٩١٩/ ت٢٥٠٩].

* صحيح.

ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەرێ ئەز بۆ هەوە بێژم تشتێ باشتر ژ پلەیا رۆژییێ و نڤێژێ و سەدەقەیێ)**، گۆتن: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(ئاشتكرنا د ناڤبەرا خەلكیدا و خرابكرنا د ناڤبەرا خەلكیدا تراشكەرە)**(1).

٣٠ ـ باب: إقالة عثرات ذوي الهيئات

**بابەتێ: بۆرین ژ خەلەتییێت جوامێران.**

٣٤١١ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَقِيلُوا ذَوِي الْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ؛ إِلاَّ الْحُدُودَ)**. [د٤٣٧٥].

* صحيح.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت (ل خەلەتییێت جوامێران(2) ببۆرن سزایێت دەستنیشانكری نەبن)(3).

(1) ئانكو: تراشكەرا دینییە.

(2) جوامێر ئەون یێت بنیات پاقژ و حەژ خرابییێ نەكەن و نە د خرابكارن، ڤێجا ئەگەر خەلەتییەك ژ وان چێ بوو دڤێت جوامێرییا وان بەرهڤانییێ بۆ وان بكەت و ل وان نەهێتە گرتن.

(3) حدود كۆمە و كتا وێ حەددە، و حەد: سزایەكێ دەستنیشانكرییە ل سەر وی دكەڤیت یێ وێ گونەهێ دكەت یا ئەڤ سزایە پێڤە گرێدایی (ئەو ژی ئەڤەنە: زنا و گونەهباركرنا دەهمن پاكان ب زنایێ و دزی و مەی

## ٣١ - باب: الدال على الخير كفاعله

## بابەتێ: نیشاندەرێ خێرێ وەكی بكەرێ وێیە.

٣٤١٢ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ يَسْتَحْمِلُهُ، فَلَمْ يَجِدْ عِنْدَهُ مَا يَحْمِلُهُ، فَدَلَّهُ عَلَى آخَرَ فَحَمَلَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: (**إِنَّ الدَّالَّ عَلَى الْخَيْرِ كَفَاعِلِهِ**). [ت٢٦٧٠].

* حسن صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) دا خوازا هەلگرتنێ ژێ كر[1] وی چو ل دەڤ خۆ نەدیت وی هەلگریت، ئینا ئێكی دی نیشا دا وی هەلگریت، و وی ئەو هەلگرت، ئینا ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئەو چەندە بۆ گۆت، ئینا گۆت: (ب راستی نیشاندەرێ خێرێ وەكی بكەرێ وێیە).**

## ٣٢ - باب: الحلم والتؤدة والسمت الصالح

## بابەتێ: نەرم و حەلیمی و سەرخۆیی و رێزداری.

٣٤١٣ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: قَالَ أَشَجُّ بْنُ عَصَرٍ قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ فِيكَ خُلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ عزّ وجل** ) ، قُلْتُ: مَا هُمَا؟ قَالَ: (**الْحِلْمُ وَالْحَيَاءُ**) ، قُلْتُ: أَقَدِيماً كَانَ فِيَّ أَمْ حَدِيثاً، قَالَ: (**بَلْ قَدِيماً**) ، قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَبَلَنِي عَلَى خُلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا. [حم١٧٨٢٨].

* إسناده صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبی بەكرەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەشەجێ كورێ عەسری گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (دو ساخلەت یێ ل دەڤ تە هەین، خودێ حەژێ دكەت) من گۆت: ئەو چنە؟ گۆت: (نەرم و حەلیمی و شەرم) من گۆت: كەڤن ل دەڤ من بوون یان نوینە؟ گۆت: (بەلكی د كەڤندا) من گۆت: سوپاس بۆ وی خودایێ ئەز ل سەر دو ساخلەتان راكرم حەژێ دكەت.**

---

**ڤەخوارن و رێگری). و حەد: ئەو گونەهبارییە یا شەریعەتی سزایێ وێ دیار كربیت وەك مافەك ژ مافێت خودایێ مەزن.**

**(١) نانكو: داخوازا دەوارەكی ژێ كر وی هەلگریت.**

**قورئانێ (خواندنڤانێ قورئانێ) بێ نەبیێ توند تێدا[1] و نە بێ سست و پشتا خۆ دایە خواندنا وێ[2] و قەدرگرتنا خودان دەسهەلاتێ دادپەروەر).**

## ٣٤ - باب: الاقتصاد في الحب والبغض

### بابەتێ: نافنجیخوازی د ڤیان و نەڤیانێدا.

٣٤١٧ - عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - أُرَاهُ رَفَعَهُ - قَالَ: (**أَحْبِبْ حَبِيبَكَ هَوْناً مَا، عَسَى أَنْ يَكُونَ بَغِيضَكَ يَوْماً مَا، وَأَبْغِضْ بَغِيضَكَ هَوْناً مَا، عَسَى أَنْ يَكُونَ حَبِيبَكَ يَوْماً مَا**). [ت١٩٩٧].

* صحيح.

ژ موحەممەدێ کورێ سیرینی (رحمه الله) ژ ئەبی هورەیرە - ئەز هزر دکەم بلند کریە پێغەمبەری (ﷺ) - گۆت: (**خۆشڤییێ خۆ نافنجی حەژێ بکە، دبیت رۆژەکێ تە کەرب ژێ ڤەبن و بێ تە کەرب ژێ ڤەدبن بلا کەربا تە نافنجی بیت دبیت رۆژەکێ ببیتە خۆشڤییێ تە**).

٣٤١٨ - عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ أَخَاهُ؛ فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ**). [د٥١٢٤/ ت٢٣٩٢/ والملحق ٢٥٠٢]

* صحيح.

ژ میقدادێ کورێ مەعدی یەکریب (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**هەکە مرۆڤی حەژ برایێ خۆ کر، بلا بێژیتێ ئەز حەژ تە دکەم**).

## ٣٥ - باب: يترك المسلم ما لا يعنيه

### بابەتێ: موسلمان تشتێ مایێ وی تێ نەچیت دهێلیت.

٣٤١٩ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مِنْ حُسْنِ إِسْلاَمِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ**). [ت٢٣١٧/ جه٣٩٧٦]

* صحيح.

---

(١) بێ کویر نەچۆبیتە تێدا و ژ تخویبێت وێ پێت دورست دەرباز نەبووی.

(٢) مەخسەد دڤێت د گەل قورئانێ و د هەمی کار و باراندا مرۆڤ بێ نافنجی بیت.

**ژ ئەبی هورەیرە، (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ژ باشییا موسلمانەتییا مرۆڤییە تشتێ مایێ وی تێ نەچیت بهێلیت).**

٣٦ ـ باب: لا تكونوا إمعة

**بابەتێ: چاڤلێكەرێ كۆرە نەبن.**

٣٤٢٠ – عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَكُونُوا إِمَّعَةً تَقُولُونَ: إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنَّا، وَإِنْ ظَلَمُوا ظَلَمْنَا، وَلَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَنْ تُحْسِنُوا، وَإِنْ أَسَاؤُوا فَلاَ تَظْلِمُوا). [ت٢٠٠٧].

* ضعيف، وقال الترمذي: حسن غريب.

**ژ حوزەیفەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چاڤلێكەرێت كۆرە نەبن؛ ئەگەر خەلكی باشی كر[1]، مە باشی كر، و ئەگەر ستەم كر[2]، مە ستەم كر، بەلێ خۆ ل سەر هندێ راكەن، ئەگەر خەلكی باشی كر هوین باشییێ بكەن، و ئەگەر خەلكی خرابی كر ستەمێ نەكەن).**

٣٧ ـ باب: مخالطة الناس

**بابەتێ: تێكەلییا د گەل خەلكی.**

٣٤٢١ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (الْمُسْلِمُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، خَيْرٌ مِنَ الْمُسْلِمِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ). [ت٢٥٠٧/ جه٤٠٣٢].

* صحيح.

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەو موسلمانێ تێكەلییا خەلكی بكەت و بێهنا خۆ ل سەر ئەزیەتا وان بكێشیت ژ وی موسلمانی باشترە یێ تێكەلییا خەلكی نەكەت و بێهنا خۆ ل سەر ئەزیەتا وان نەكێشیت).**

---

(١) د گەل مە یان د گەل خەلكی كر، ئانكو: خەلكێ باش بیت ئەم ژی دێ د باش بین.

(٢) ل مە كر یان ل خەلكی كر، ئانكو: ئەگەر خەلك خراب ببیت ئەم ژی وەكی وان دێ د خراب بین.

## ٣٨ . باب: عظم حرمة المؤمن

### بابەتێ: مەزنییا حورمەتا باوەریداری.

٣٤٢٢ - عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمِنْبَرَ فَنَادَى بِصَوْتٍ رَفِيعٍ، فَقَالَ: **(يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ، وَلَمْ يُفْضِ الْإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ، لاَ تُؤْذُوا الْمُسْلِمِينَ، وَلاَ تُعَيِّرُوهُمْ، وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ، وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ)**.

قَالَ: وَنَظَرَ ابْنُ عُمَرَ يَوْماً إِلَى الْبَيْتِ، أَوْ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: مَا أَعْظَمَكِ وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ، وَالْمُؤْمِنُ أَعْظَمُ حُرْمَةً عِنْدَ اللهِ مِنْكِ. [ت٢٠٣٢].

* حسن صحيح.

**ژ ئیبن عومەری ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب سەر مینبەرێ کەفت و ب دەنگەکێ بلند گۆت: (گەلی ئەو کەسێت ب ئەزمانێ خۆ موسلمان بووین، و هێژ باوەری نەگەهشتییە دلێت وان، ئەزیەتا موسلمانان نەکەن و نەئێشینن و تانان لێ نەدەن، و ل دویڤ گونەهـ و کێماسی و خەلەتییێن وان نەچن (ئاشکەرا بکەن) هەر کەسێ ل دویڤ گونەهـ و کێماسی و خەلەتییێن برایێ خۆ یێ موسلمان بچیت، خودێ دێ وی شەرمزار کەت و کێماسییێت وی ئاشکەرا کەت خۆ ئەگەر ئەو دنیڤا مالا خۆدا بیت).**

## ٣٩ . باب: خير الناس وشرهم

### بابەتێ: باشترینێ خەلکی و خرابترینێ وان.

٣٤٢٣ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَقَفَ عَلَى أُنَاسٍ جُلُوسٍ، فَقَالَ: **(أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِكُمْ مِنْ شَرِّكُمْ)** ؟ قَالَ: فَسَكَتُوا، فَقَالَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ أَخْبِرْنَا بِخَيْرِنَا مِنْ شَرِّنَا، قَالَ: **(خَيْرُكُمْ مَنْ يُرْجَى خَيْرُهُ وَيُؤْمَنُ شَرُّهُ، وَشَرُّكُمْ مَنْ لاَ يُرْجَى خَيْرُهُ، وَلاَ يُؤْمَنُ شَرُّهُ)**. [ت٢٢٦٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل هندەک مرۆڤێت روینشتی راوەستا و گۆت: (ئەرێ باشترینێ هەوە ژ خرابترینێ هەوە بۆ هەوە بێژم)؟ گۆت: بێدەنگ بوون، و ئەڤە سێ جاران گۆت، ئینا زەلامەکی گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ**

**خودێ باشترینێ مە ژ خرابترینێ مە بۆ مە بێژە، گۆت: (باشترینێ هەوە ئەوە یێ هیڤیا خێرێ ژێ بهێتە كرن و ئێمنی ژ خرابییا وی بهێتە كرن، و خرابترینێ هەوە ئەوە یێ هیڤیا خێرێ ژێ نەهێتە كرن، و ئێمنی ژ خرابییا وی نەهێتە كرن).**

٣٤٢٤ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلْخَيْرِ مَغَالِيقَ لِلشَّرِّ، وَإِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلشَّرِّ مَغَالِيقَ لِلْخَيْرِ، فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الْخَيْرِ عَلَى يَدَيْهِ، وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ). [جه٢٣٧].

* حسن.

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ژ خەلكی هندە كەس یێت هەین كلیلن بۆ خێرێ و رێگر و دەرگەهگرن بۆ خرابییێ، و ب راستی ژ خەلكی هندە كەس یێت هەین كلیلن بۆ خرابییێ و رێگر و دەرگەهگرن بۆ باشییێ، ڤێجا پیرۆز بیت وی (ب خۆشی بیت) یێ خودێ كلیلێت خێرێ ئێخستینە سەر دەستێت وی، و نەخۆشی بۆ وی بیت یێ خودێ كلیلێت خرابییێ ئێخستینە سەر دەستێت وی).**

٤٠ . باب: كظم الغيظ

**بابەتێ: كەرب داعویرانێ.**

٣٤٢٥ – عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَا مِنْ جُرْعَةٍ أَعْظَمُ أَجْراً عِنْدَ اللهِ مِنْ جُرْعَةِ غَيْظٍ، كَظَمَهَا عَبْدٌ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ). [جه٤١٨٩].

* صحيح.

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(چو داعویران ل دەڤ خودێ ب خێرتر نینن ژ داعویرانەكا كەربێ، بەندەیەك بۆ رازیبوونا خودێ داعویریت).**

٤١ . باب: شكر المعروف ومكافأته

**بابەتێ: سوپاسكرنا باشییێ و خەلاتكرنا وێ.**

٣٤٢٦ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يَشْكُرُ اللهَ مَنْ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ).

[د٤٨١١/ ت١٩٥٤]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (وی سوپاسییا خودێ نەکرییە یێ سوپاسییا خەلکی نەکەت)(١).**

٣٤٢٧ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ أُعْطِيَ عَطَاءً، فَوَجَدَ فَلْيَجْزِ بِهِ ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُثْنِ بِهِ، فَمَنْ أَثْنَى بِهِ فَقَدْ شَكَرَهُ، وَمَنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ)**.[د٤٨١٣، ٤٨١٤/ ت٢٠٣٤].

* حسن.

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ تشتەك بێ هاتە دان و تشتەك دیت بلا وی خەلات بکەت، و ئەگەر چو نەدیت بلا ب باشی بەحسێ وی بکەت، و ب راستی یێ ڤە شێریت وی مافێ باشییا وی نەدا).**

٣٤٢٨ - عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ، فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللهُ خَيْراً، فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ)**. [ت٢٠٣٥].

* صحيح.

[وانظر: ١٧٨٠](٢).

**ژ ئوسامەیێ کورێ زەیدی (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ قەنجییەك لێ هاتە کرن، و گۆتە خودانێ وێ: خودێ خێرێ بدەتە تە، ب راستی وی زێدە سوپاسییا وی کر).**

(١) زانا دو رامانان ددەنە ڤێ فەرموودەیێ:

ئێك: خودێ سوپاسییا وی بەندەیێ خۆ ئەوێ قەنجی لێ کری قەبویل ناکەت ئەگەر ئەو بەندە ژ وان بیت یێت قەنجییا خەلکی ژبیر بکەت و سوپاسیا وان نەکەت. دو: ئەوێ رێز و سەروبەرێ وی ئەو بیت قەنجییا خەلکی ژبیر بکەت و سوپاسییا وان نەکەت، دێ رێز و سەروبەرێ وی ئەو بیت ئەو سوپاسییا کەرەم و قەنجییێت خودێ نەکەت.

(٢) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێکێدا نینە و د مالپەریدا هاتییە.

## ٤٢ . باب: في المشورة

### بابەتێ: مشێورەتێ شیرەتكارییێ.

٣٤٢٩ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ).[د٥١٢٨/ ت٢٣٦٩/ جه٣٧٤٥]

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( شیرەتكار ئەمیندارە)[1].**

## ٤٣ . باب: كفارة المجلس

### بابەتێ: گونەهژێبەرا روینشتنێ.

٣٤٣٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ؛ إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ). واللفظ للترمذي. [د٤٨٥٨/ ت٣٤٣٣].

* صحيح.

[وانظر: ٢٢٢٣، ٢٢٧٦][2].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ ل دیوانەكێ روینیت و ئاخفتنا وی یا بێ فایدە تێدا زێدە ببیت و بەری ژ جهێ خۆ رابیت بێژیت: ئەز تە ژ هەمی كێماسییا پاك و پاقژ دكەم یا خودێ و ب هاریكارییا تە، چو خودێ و پەرستییێت راست و دورست نین تو نەبی، ئەز داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ تە دكەم و تەوبە دكەمە تە. خودێ دێ گونەهێت وی یێت وێ روینشتنێ ژێ بەت).**

---

(١) ئانكو: هەر كەسێ بۆچۆنا وی هاتە خواستن دڤێت ب هەمی ئەمانەت بۆچۆنا خۆ بدەت و چو نەڤەشێریت و ئەگەر تشتەك ڤەشارت وی خیانەت كر.

(٢) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێكێدا نەهاتییە و د مالپەریدا زێدە كرییە.

## ٤٤ ـ باب: المجالس أمانة

### بابەتێ: روینشتن ئەمانەتن.

٣٤٣١ – عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ، ثُمَّ الْتَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ**). [د٤٨٦٨/ ت١٩٥٩].

* حسن.

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر مرۆڤ د گەل مرۆڤی ئاخفت، و پاشی ل خۆ زڤری ئەو ئاخفتن ئەمانەتە).**

## ٤٥ ـ باب: النهي عن التجسس

### بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ سیخوڕییێ.

٣٤٣٢ – عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّكَ إِنِ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتِ النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ، أَوْ كِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ**).

فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةٌ سَمِعَهَا مُعَاوِيَةُ مِنْ رَسُولِ اللهِ نَفَعَهُ اللهُ تَعَالَى بِهَا. [د٤٨٨٨].

* صحيح.

**ژ موعاویەیی (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (ب راستی ئەگەر تو ب دویڤ گونەه و خەلەتی و كێماسییێت خەلكی كەفتی (تە ڤیا ئاشكەرا بكەی) تە ئەو خرابكرن یان نێزیكە خراب بكەی).**

**ئەبو دەردائی گۆت: پەیڤەكە موعاوییەی ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بووی، خودێ مفا پێ گەهاندێ.**

٣٤٣٣ – عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: أُتِيَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَقِيلَ: هَذَا فُلَانٌ تَقْطُرُ لِحْيَتُهُ خَمْرًا، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: إِنَّا قَدْ نُهِينَا عَنِ التَّجَسُّسِ، وَلَكِنْ إِنْ يَظْهَرْ لَنَا شَيْءٌ نَأْخُذْ بِهِ. [د٤٨٩٠].

* صحيح الإسناد.

**ژ زەیدێ كوڕێ وەهبی (ﷺ) گۆت: زەلامەك ئینا دەڤ ئیبن مەسعودی، ئێكی گۆتێ: ئەڤە بێڤانە عەرەق یا د ڕهێت ویدا دهێتە خوارێ، ئینا گۆت: ب راستی نەهیا مە یا ژ سیخوڕییێ هاتییە كرن، بەلێ هەكە تشتەك بۆ مە دیار بوو ئەم دێ پێ كەین.**

## ٤٦ ـ باب: الرجل يدفع عن عرض أخيه

**بابەتێ: مرۆڤ بەرەڤانییێ ژ نەكامیكرنا برایێ خۆ بكەت.**

٣٤٣٤ – عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ رَدَّ اللهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**. [ت١٩٣١].

* صحيح.

ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هەر كەسێ بەرەڤانییێ ژ برایێ خۆ بكەت دەمێ نەكامییا وی دهێتە كرن، خودێ دێ رۆژا قیامەتێ ئاگری ژ ناڤچاڤێت وی دەتە پاش).**

## ٤٧ ـ باب: ما جاء في المزاح

**بابەتێ: ئەوا د ڕاستا تڕانەیێدا هاتی.**

٣٤٣٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا، قَالَ: **(إِنِّي لاَ أَقُولُ إِلاَّ حَقّاً)**. [ت١٩٩٠].

* صحيح.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب ڕاستی تو تڕانەیان د گەل مە دكەی، گۆت: **(ب ڕاستی ئەز ژ ڕاستییێ پێڤەتر نابێژم).**

٣٤٣٦ – عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، احْمِلْنِي، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّا حَامِلُوكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ)** ، قَالَ: وَمَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(وَهَلْ تَلِدُ الْإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ)**. [د٤٩٩٨/ ت١٩٩١].

* صحيح.

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من هەلگرە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەم دێ تە ل سەر تێژكا حێشترێ هەلگرین)** گۆت: ما ئەز دێ چ ل تێژكا حێشترێ كەم؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ما حێشترا چ دبیت تێژكا حێشترێ نەبیت).**

٣٤٣٧ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) أَنَّهُمْ كَانُوا يَسِيرُونَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَنَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، فَانْطَلَقَ بَعْضُهُمْ إِلَى حَبْلٍ مَعَهُ فَأَخَذَهُ، فَفَزِعَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً)**. [د٥٠٠٤].

* صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ كورێ ئەبی لەیلایی (رضي الله عنه) گۆت: هەڤالێت موحەممەدی (ﷺ) گۆتە مە، ئەو د گەل پێغەمبەری (ﷺ) دچۆن، ئینا زەلامەك ژ وان نڤست، هندەك ژ وان چۆن كنفەك د گەل وی بوو راكر، ئینا ترسیا، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ بەر هندێ گۆت: (بۆ چو موسلمانان دورست نینە ئەو موسلمانەكی بترسینیت).**

## ٤٨ ـ باب: الجلوس بين الظل والشمس

## بابەتێ: روینشتنا د ناڤبەرا هەتاڤێ و سیبەرێدا.

٣٤٣٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ): **(إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الشَّمْسِ. وَقَالَ مَخْلَدٌ: فِي الْفَيْءِ. فَقَلَصَ عَنْهُ الظِّلُّ، وَصَارَ بَعْضُهُ فِي الشَّمْسِ، وَبَعْضُهُ فِي الظِّلِّ؛ فَلْيَقُمْ)**. [د٤٨٢١].

* صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: بابێ قاسمی گۆت: (ئەگەر ئێك ژ هەوە ل بەر هەتاڤێ بوو ـ و مەخلەدی گۆت: ل بەر سیبەرێ بوو، و سیبەر لێ بلند بوو، هەتا هندەك ژ وی كەفتیيە بەر سیبەرێ و هندەك ل بەر هەتاڤێ بلا رابیت).**

٣٤٣٩ - عَنْ بُرَيْدَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى أَنْ يُقْعَدَ بَيْنَ الظِّلِّ وَالشَّمْسِ. [جه٣٧٢٢].

* صحيح.

**ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) پێغەمبەری (ﷺ) پا شڤەلێدان یا ژ روینشتنا د ناڤ بەرا سیبەرێ و هەتاڤێدا كری.**

## ٤٩ ـ باب: آداب الجلوس مع الجماعة

## بابەتێ: رەوشت و ئادابێت روینشتنا د گەل جڤاتێ.

٣٤٤٠ - عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا النَّبِيَّ (ﷺ) جَلَسَ أَحَدُنَا حَيْثُ يَنْتَهِي. [د٤٨٢٥/ ت٢٧٢٥]

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ سەمورەی، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: دەمێ ئەم دهاتینە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئەم ل دویماهییا دیوانێ دروینشتین ل كیڤە جە هەبا ئەم ل وێرێ دروینشتین.**

٣٤٤١ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ؛ إِلاَّ بِإِذْنِهِمَا**). [د٤٨٤٤، ٤٨٤٥/ ت٢٧٥٢]

- وفي رواية لأبي داود: (**لاَ يُجْلَسْ بَيْنَ رَجُلَيْنِ؛ إِلاَّ بِإِذْنِهِمَا**).

* حسن صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەدورستە بۆ مرۆڤی دو مرۆڤان ژێكڤە كەت و د مابەینا واندا روینیتە خوارێ ب دەستویرییا وان نەبیت).**

- **و د ڤەگێرەكا ئەبو داوودیدا: (د مابەینا دو مرۆڤاندا نەروینیتە خوارێ ب دەستویرییا وان نەبیت).**

### ٥٠ ـ باب: مشي النساء في الطريق

### بابەتێ: چۆنا ژنان د رێكاندا.

٣٤٤٢ – عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ وَهُوَ خَارِجٌ مِنَ الْمَسْجِدِ، فَاخْتَلَطَ الرِّجَالُ مَعَ النِّسَاءِ فِي الطَّرِيقِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِلنِّسَاءِ: (**اسْتَأْخِرْنَ، فَإِنَّهُ لَيْسَ لَكُنَّ أَنْ تَحْقُقْنَ الطَّرِيقَ، عَلَيْكُنَّ بِحَافَّاتِ الطَّرِيقِ**). فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تَلْتَصِقُ بِالْجِدَارِ، حَتَّى إِنَّ ثَوْبَهَا لَيَتَعَلَّقُ بِالْجِدَارِ مِنْ لُصُوقِهَا بِهِ. [د٥٢٧٢].

* حسن. وقال شعيب: ضعيف.

**ژ ئەبی ئوسەیدێ ئەنساری: وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت و ئەو ژ مزگەڤتێ دەردكەفت و ژن و زەلام د رێكێدا تێكەل دبوون ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە ژنان: (خۆ ڤەهێلن ب راستی بۆ هەوە نینە هوین د نیڤا رێكێدا بچن، رەخێت رێكێ بگرن) ڤێجا ژنێ خۆ ب دیواری ڤەدنا هەتا جلكێ وێ د ما ب دیواریڤە ژ پێڤەمانا ب دیواریڤە.**

## ٥١ . باب: النوم على طهارة

## بابەتێ: نڤستن ب دەستنڤێژ.

٣٤٤٣ - عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَبِيتُ عَلَى ذِكْرٍ طَاهِراً، فَيَتَعَارُّ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَسْأَلُ اللهَ خَيْراً مِنَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ؛ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ**). [د٥٠٤٢/ جه٣٨٨١].

* صحيح.

**ژ موعازێ كورێ جەبەلی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نینە موسلمانەك ب شەڤ ل سەر زكرەكی[1] و ب دەستنڤێژ بنڤیت، و ژ شەڤێ خۆ بقولپینیت و هشیار ببیت، و دوعا خێرا دنیایێ و ئاخرەتێ ژ خودێ بكەت ئەگەر خودێ نەدەتێ).**

## ٥٢ . باب: ما جاء في الاضطجاع على البطن

## بابەتێ: ئەوا د راستا نڤستنا ل سەر زكی هاتی.

٣٤٤٤ - عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَنَا مُضْطَجِعٌ عَلَى بَطْنِي، فَرَكَضَنِي بِرِجْلِهِ، وَقَالَ: (**يَا جُنَيْدِبُ، إِنَّمَا هَذِهِ ضِجْعَةُ أَهْلِ النَّارِ**). [جه٣٧٢٤].

* صحيح. وقال شعيب: ضعيف.

**ژ ئەبی زەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) د بەر مەنرا بۆری و من خۆ ل سەر زكێ خۆ رازاندبوو، پێ خۆ دا من و گۆت: (ئەی جونەیدیب، ب راستی ئەڤە رازاندنا خەلكێ جەهنەمێیە).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

---

(١) قورئانێ بخوینیت یان تەسبیحێ بكەت یان دوعایێت نڤستنێ بكەت و هۆسا.

الفصل الثالث: البر والصلة

## پشكا سێیێ: چاكی و مرۆڤانی.

١ . باب: الأرواح جنود مجندة

### بابەتێ: رح كۆمێت كۆمن.

٣٤٤٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ). [م٢٦٣٨].

- وفي رواية: (النَّاسُ مَعَادِنُ كَمَعَادِنِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ، خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلاَمِ إِذَا فَقُهُوا. وَالأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ).

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(رح كۆمێت كۆمن یێت نێزیكی ئێك و ب ساخلەتان وەكی ئێك دكەڤنە بەرێك و ڤێر دبنە ئێك، و یێت ساخلەتێت وان نەوەكی ئێك ژێك جودا دبن و ناكەڤنە بەرێك).**

- **و د ڤەگێرەكێدا: (ب راستی مرۆڤ خودان ئەسل و بنیاتن وەكی زێری و زیڤی (ئانكو: چاوا زێر و زیڤ نەوەكی ئێكن هۆسا مرۆڤ ژی نەوەكی ئێكن، یان یێ بنیاتێ وی یێ باش بیت چقێت وی ژی دێ د باش بن و هەرهۆسا بەروڤاژی ژی) باش و بژارەیێت وان د جاهلیەتێدا باش و بژارەنە د ئیسلامەتییێدا هەكە د ئیسلامێدا شارەزا ببن و فەرمانێت ئیسلامێ بزانن، و رح كۆمێت كۆمن یێت نێزیكی ئێك و ب ساخلەتان وەكی ئێك دكەڤنە بەرێك و ڤێر دبنە ئێك، و یێت ساخلەتێت وان نەوەكی ئێك ژێك جودا دبن و ناكەڤنە بەرێك).**

٢ . باب: الناس كإبل لا راحلة فيها

### بابەتێ: خەلك وەكی حێشترانە بارهەلگر د ناڤدا نینە.

٣٤٤٦ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّمَا النَّاسُ كَالإِبِلِ الْمِائَةِ، لاَ تَكَادُ تَجِدُ فِيهَا رَاحِلَةً). [خ٦٤٩٨/ م٢٥٤٧].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی خەلك وەكی سەد حێشترانن نێزیكە بار هەلگرەكێ د ناڤدا نەبینی)[1].**

## ٣ - باب: حق المسلم على المسلم

## بابەتێ: مافێ موسلمانی ل سەر موسلمانی.

٣٤٤٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (**الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كانَ فِي حاجَةِ أَخِيهِ كانَ اللهُ فِي حاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُباتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [خ٢٤٤٢/ م٢٥٨٠].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (موسلمان برایێ موسلمانییە، نە ستەمێ لێ دكەت، و نە دەستان ژێ بەردەدەت، هەر كەسێ د هەوجەیا برایێ خۆدا بیت، (ئانكو: هەوجەیێت وی بقەتینیت) خودێ دێ هاریكاریا وی كەت د هەوجەیێت ویدا، و هەر كەسێ بەرتەنگییەكێ ژ سەر موسلمانەكی راكەت، خودێ دێ بەرتەنگییەكێ ژ بەرتەنگییێت قیامەتێ ژ سەر راكەت، و هەر كەسێ موسلمانەكی پەردە و ستارە بكەت، خودێ دێ وی رۆژا قیامەتێ ستارە كەت).**

٣٤٤٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلاَمِ، وَعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ**). [خ١٢٤٠/ م٢١٦٢].

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ**). قِيلَ: مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللهَ؛ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ**).
- وفي رواية لمسلم: (**الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَاهُنَا**) وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ (**بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ. كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ، وَمَالُهُ، وَعِرْضُهُ**). [م٢٥٦٤].

---

(١) ئانكو: مرۆڤێت تمام و جهێ پشت بەستنێ، و دین تمام د كێمن كا چاوا حێشترێت بارهەلگر د كێمن.

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی خەلك وەکی سەد حێشترانن نێزیکە بارهەلگرەکێ د ناڤدا نەبینی)[1].**

### ٣ . باب: حق المسلم على المسلم

### بابەتێ: مافێ موسلمانی ل سەر موسلمانی.

٣٤٤٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (**المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كانَ فِي حاجَةِ أَخِيهِ كانَ اللهُ فِي حاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرُباتِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [خ٢٤٤٢/ م٢٥٨٠].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (موسلمان برایێ موسلمانییە، نە ستەمێ لێ دکەت، و نە دەستان ژێ بەرددەت، هەر کەسێ د هەوجەیا برایێ خۆدا بیت، (ئانکو: هەوجەیێت وی بقەتینیت) خودێ دێ هاریکاریا وی کەت د هەوجەیێت ویدا، و هەر کەسێ بەرتەنگییەکێ ژ سەر موسلمانەکی راکەت، خودێ دێ بەرتەنگییەکێ ژ بەرتەنگییێت قیامەتێ ژ سەر راکەت، و هەر کەسێ موسلمانەکی پەردە و ستارە بکەت، خودێ دێ وی رۆژا قیامەتێ ستارە کەت).**

٣٤٤٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ: رَدُّ السَّلاَمِ، وَعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ**). [خ١٢٤٠/ م٢١٦٢].

- وفي رواية لمسلم: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ**). قِيلَ: مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللهَ؛ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ**).
- وفي رواية لمسلم: (**الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَاهُنَا**) وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ (**بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ. كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ، وَمَالُهُ، وَعِرْضُهُ**). [م٢٥٦٤].

---

(١) ئانکو: مرۆڤێت تمام و جهێ پشت بەستنێ، و دین تمام د کێمن کا چاوا حێشترێت بارهەلگر د کێمن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مافێ موسلمانی ل سەر موسلمانی پێنجن: سلاڤ زڤراندنە، و سەرەدانا نەساخییە، و دویڤچۆنا جەنازایە، و بەرسڤدانا داخوازنامایە، و بێژیتە بێنیشك ڤەدای (یرحمك الله) خودێ رەحمێ ب تە ببەت، پشتی دبێژیت (الحمد لله).**

- و د ڤەگێرەكا موسلمیدا هاتیە: **(مافێ موسلمانی ل سەر موسلمانی شەشن)**: هاتە گۆتن: و ئەو چنە ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: **(هەكە تو گەهشتییێ سلاڤكە سەر، و هەكە تو داخواز كری بۆ خوارنێ جابا وی بدە، و هەكە داخوازا شیرەت و نەسیحەتێ ژ تە كر وی نەسیحەت و شیرەت بكە، و هەكە بێنژی و گۆت: (الحمد لله) بێژێ: (یرحمك الله) خودێ رەحمێ ب تە ببەت، و هەكە نەساخ بوو سەرا وی بدە، و هەكە مر د گەل جەنازێ وی هەرە).**
- و د ڤەگێرەكا موسلمیدا هاتییە: **(موسلمان برایێ موسلمانییە، نە ستەمێ لێ دكەت، نە كێم دكەت، و نە دهێلیتە ب تنێ بێی هاریكاری، تەقوا و خودێ ترسی، ئها یا ل ڤێرێ، تەقوا و خودێ ترسی، ئها یا ل ڤێرێ)** و سێ جاران ئیشارەت كرە سینگێ خۆ، **(بەسی مرۆڤییە خرابی، ئەو برایێ خۆ یێ موسلمان كێم بدانیت. هەمی تشتێ موسلمانی ل سەر موسلمانی حەرامە، خوینا وی و مالێ وی و نامویسا وی).**

٤ ـ باب: تراحم المؤمنين وتعاونهم

**بابەتێ: دلۆڤانیرنا باوەریدان ب ئێكدو و هەڤكارییا وان.**

٣٤٤٩ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسى رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(المُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كالْبُنْيَانِ، يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً)**. وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ. [خ٢٤٤٦ (٤٨١)/ م٢٥٨٥].

ولم يذكر مسلم تشبيك الأصابع.

ژ ئەبی مووسایی (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(باوەریدار بۆ باوەریداری وەكی ئاڤاهینە، ئێكدو دگرن)**. و دەستێت خۆ كرنە د ناڤێكدا.

و موسلمی بەحسێ دەستناڤێكدانێدا نەكرییە.

٣٤٥٠ - (ق) عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (تَرَى الْمُؤْمِنِينَ: فِي تَرَاحُمِهِمْ، وَتَوَادِّهِمْ، وَتَعَاطُفِهِمْ، كَمَثَلِ الجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى عُضْواً، تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالحُمَّى). [خ٦٠١١/ م٢٥٨٦].

ژ نەعمانێ كوڕێ بەشیری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(مەتەلا باوەریداران د حەژێكرن و د دلۆڤانی و دلپێڤەبوون و دلنەرمییا خۆدا، وەكی مەتەلا ئێك لەشییە، هەكە ئەندامەك ژێ ئێشا، هەمی لەش ب شەڤبێری و تایێ خۆ ددەتە د گەل).**

٥ . باب: بر الوالدين وصلة الرحم

**بابەتێ: باشییا د گەل دایبابان و مرۆڤباشی.**

٣٤٥١ - عَنْ زُرَارَةَ بْنِ أَوْفَى، عَنْ أُبَيِّ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ أَوْ أَحَدَهُمَا، ثُمَّ دَخَلَ النَّارَ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ، فَأَبْعَدَهُ اللهُ وَأَسْحَقَهُ). [حم١٩٠٢٧ . ١٩٠٢٩، ٢٠٣٢٨]

* إسناده صحيح.

[انظر: ٢٦١٦ . ٢٦١٩، ٢٦٢٩، ٢٦٣٠] .

ژ زورارەیێ كوڕێ ئەوفایی (رضي الله عنه) ژ ئەبی مالكی ژ پێغەمبەری (ﷺ) وی گۆت: **(یێ بگەهیتە دایبابێت خۆ یان ئێك ژ وان و پاشی پشتی ڤێ بچیتە جەهنەمێ[1] خودێ وی دویركەت و ژ ناڤ ببەت).**

٦ . باب: الوصية بالجار

**بابەتێ: ڤەویاتی ب جیرانی.**

٣٤٥٢ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (ما زَالَ يُوصِينِي جِبْرِيلُ بِالجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ). [خ٦٠١٤/ م٢٦٢٤].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بەردەوام جبریلی فەرمانا من ب جیرانی كر هەتا من هزر كر دێ میراتگرییا وی كەت).**

٣٤٥٣ - (خ) عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (وَاللهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللهِ لاَ يُؤْمِنُ، وَاللهِ لاَ يُؤْمِنُ)، قِيلَ: وَمَنْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (الَّذِي لاَ يَأْمَنُ جارُهُ بَوَائِقَهُ). [خ٦٠١٦].

---

(١) ئانكو: هند باشییێ د گەل وان نەكەت بچیتە بەحەشتێ و نەچیتە جەهنەمێ.

**ژ ئەبی شورەیحێ خوزاعی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب خودێ کەم باوەرییا راست و دورست نەئینایە، ئەز ب خودێ کەم باوەرییا راست و دورست نەئینایە)، گۆتن: کێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (یێ جیرانێ وی ژ خرابی و خرابکارییا وی ئێمن نەبیت).**

٣٤٥٤ - (خ) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ لِي جارَيْنِ، فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: (**إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ باباً**). [خ٢٢٥٩].

**ژ عائیشایێ (ﷺ)، گۆت: من گۆت ئەی پێغەمبەرێ خودێ من دو جیران یێت هەین، ئەز دیارییێ بدەمە کێ؟ گۆت: (بدە یێ دەرگەهێ وی بۆ تە نێزیکتر).**

٣٤٥٥ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَا أَبَا ذَرٍّ، إِذَا طَبَخْتَ مَرَقَةً، فَأَكْثِرْ مَاءَهَا، وَتَعَاهَدْ جِيرَانَكَ**). [م٢٦٢٥ (١٤٢)].

**ژ ئەبی زەڕی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی ئەبا زەڕ هەکە تە ئاڤك لێنا ئاڤا وێ زێدەکە، و سەحکە جیرانێ خۆ پشکدار بکە).**

## ٧ ـ باب: الإحسان إلى اليتيم والأرملة والمسكين

## بابەتێ: باشیکرن د گەل ئێتیم و بیژن و بەلنگازی.

٣٤٥٦ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ، كَالْمُجاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ**) ، وَأَحْسِبُهُ قَالَ ـ يَشُكُّ الْقَعْنَبِيُّ ـ: (**كَالْقَائِمِ لاَ يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لاَ يُفْطِرُ**). [خ٦٠٠٧ (٥٣٥٣)/ م٢٩٨٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ): گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (یێ بەرگار و بەرگەرییا بیژن و بەلنگازی دکەت وەکی جیهادکەرێ د رێکا خودێدایە). و ئەز دبێژم گۆت: (و وەکی شەڤ ساخکەرێ بەردەوام، و رۆژیگرێ رۆژییێ نەخۆت).**

٣٤٥٧ - (خ) عَنْ سَهْلٍ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَنَا وَكافِلُ الْيَتِيمِ فِي الجَنَّةِ هكَذَا**). وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئاً. [خ٥٣٠٤].

ژ سەهلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز و خودانکەرێ سێوی[1] د بەحەشتێدا د هۆساینە)**، و نیشانکرە تلا خۆ یا شەهدێ و یا نیڤەکێ و ژێکڤەکرن.

## ٨ . باب: الضيافة

## بابەتێ: مێڤانداریێ.

٣٤٥٨ - (ق) عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْعَدَوِيِّ قَالَ: سَمِعَتْ أُذُنَايَ، وَأَبْصَرَتْ عَيْنَايَ، حِينَ تَكَلَّمَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: **(مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيُكْرِمْ جارَهُ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جائِزَتَهُ)**. قَالَ: وَما جائِزَتُهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: **(يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا كانَ وَرَاءَ ذلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ عَلَيْهِ، وَمَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيَقُلْ خَيْراً، أَوْ لِيَصْمُتْ)**. [خ٦٠١٩/ م: اللقطة ٤٨ (١٤)].

[وانظر: . في إكرام الضيف: ٣٣٣١. .

وفي الضيف إذا تبعه غيره: ٢٦٥٠. .

وفي إذا طلب الضيف دعوةَ غيره: ٢٦٥١. .

وفي طلب الدعاء من الضيف الصالح: ٢٦٥٣] .

ژ ئەبی شورەیحێ عەدەوی (رضي الله عنه)، گۆت: ڤان هەردو گوهێت من گوه لێ بوو و هەردو چاڤێت من دیت دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاخفتی و گۆتی: **(یێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا قەدرێ مێڤانێ خۆ بگریت، یێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا قەدرێ خەلاتێ مێڤانێ خۆ بگریت)**. گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ خەلاتێ وی چییە؟ گۆت: **(شەڤەك و رۆژەکن، و مێڤانداری سێ رۆژن، چ یا ژ وێ زێدەبوو سەدەقەیە هەر کەسێ باوەری ب خودێ و رۆژا قیامەتێ هەبیت بلا ئاخفتنا خێرێ بێژیت یان خۆ بێدەنگ کەت)**[2].

---

(١) یێ ب کاروبارێت وی رادبیت و خودان دکەت.

(٢) ئیمامێ نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: ئەڤە حەدیسەکا ئاشکرایە کو دڤێت نەئاخفی ژ بلی کو ئاخفتنا خێرێ بیت، و ئاخفتنا خێرێ ئەوە: یا خێر و بەرژەوەندی لێ ئاشکرا ببیت، و هەر گاڤا گۆمان ب ئاشکراییا خێرێ چێ بوو بلا نەئاخڤیت.

## ٩ . باب: استحباب المواساة بفضول المال

## بابەتێ: باشدانانا ژ بیرڤەبرنێ ب مالێ زێدە.

٣٤٥٩ – (م) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي سَفَرٍ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى رَاحِلَةٍ لَهُ. قَالَ: فَجَعَلَ يَصْرِفُ بَصَرَهُ يَمِيناً وَشِمَالاً. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلُ ظَهْرٍ؛ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ ظَهْرَ لَهُ. وَمَنْ كَانَ لَهُ فَضْلٌ مِنْ زَادٍ؛ فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَنْ لاَ زَادَ لَهُ)**.

قَالَ: فَذَكَرَ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ مَا ذَكَرَ، حَتَّى رَأَيْنَا أَنَّهُ لاَ حَقَّ لأَحَدٍ مِنَّا فِي فَضْلٍ. [م١٧٢٨].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: ل دەمەكی ئەم ل وەغەرەكێ بووین د گەل پێغەمبەری (ﷺ) زەلامەك ل سەر حێشترا خۆ هات، و دەست هاڤێتێ بەرێ خۆ ددا لایێ چەپێ و یێ راستێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ دەوارەكێ زێدە د گەل بیت بلا بدەتە وی یێ دەوار نەی، و هەر كەسێ خوارنەكا زێدە د گەل بیت بلا بدەتە وی یێ خوارن نەی).**

**گۆت: و جوین و رەنگێت مالی گۆتن هەتا مە هزر كر كەسێ ژ مە حەق د تشتەكێ زێدەدا نینە.**

## ١٠ . باب: النهي عن الشح

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ دلقەلساتییێ.

٣٤٦٠ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: **(إِيَّاكُمْ وَالشُّحَّ! فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِالشُّحِّ: أَمَرَهُمْ بِالْبُخْلِ فَبَخِلُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْقَطِيعَةِ فَقَطَعُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْفُجُورِ فَفَجَرُوا)**. [د١٦٩٨].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ گۆتار خواند و گۆت: (هشیاری دلقەلساتییێ بن، ب راستی یێت بەری هەوە ب دلقەلساتییێ ژ ناڤ چۆن، فەرمانا وان ب قەلسییێ كر و قەلساتی كرن، و فەرمانا وان ژ مرۆڤانی برینێ كر مرۆڤانی برین، و فەرمانا وان ب سەرداچۆن و گونەهان كرن سەردا چۆن و گونەه كرن).**

## ١١ . باب: في الأصحاب

### بابەتێ: هەڤالینییێ.

٣٤٦١ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِناً، وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ**). [د٤٨٣٢/ ت٢٣٩٥/ مي٢١٠١]

* حسن.

**ژ ئەبی سەعیدی (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەڤالینییا كەسێ نەكە موسلمان و باوەردار نەبیت، و كەس زادێ تە نەخۆت یێ خودێ ترس و پارێزكار نەبیت).**

٣٤٦٢ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ**). [د٤٨٣٣/ ت٢٣٧٨]

* حسن.

[وانظر: ٣٤٤٥] .

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (مرۆڤ یێ ل سەر دینێ هەڤالێ خۆ، ڤێجا بلا هەر ئێك ژ هەوە بەرێ خۆ بدەتێ كا دێ هەڤالینییا كێ كەت).**

الفصل الرابع: آداب اللسان وآفاته

## پشكا چوارێ: تۆر و رەوشتێت ئەزمانی و زیانێت وی.

١ ـ باب: حفظ اللسان

### بابەتێ: پاراستنا ئەزمانی.

٣٤٦٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ، مَا يَتَبَيَّنُ فِيهَا، يَزِلُّ بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ مِمَّا بَيْنَ المَشْرِقِ). [خ٦٤٧٧/ م٢٩٨٨].

- وفي رواية لمسلم: (أَبْعَدَ مَا بَيْنَ المَشْرِقِ وَالمَغْرِبِ).

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ب راستی بەندە یێ هەی ئاخفتنەكێ دئاخڤیت، و هزرا خۆ تێدا ناكەت (كا خێرە ئان نە) وی دئێخیتە د ئاگریدا دویرتر ژ ناڤبەرا رۆژهەلاتێ)[1].**

- **و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: (دویرتر ژ ناڤبەرا رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ).**

٣٤٦٤ - (خ) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ، أَضْمَنْ لَهُ الجَنَّةَ). [خ٦٤٧٤].

**ژ سەهلێ كورێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ پشتراستییێ ب پاراستنا مابەینا هەردو پێیێت خۆ[2] و مابەینا هەردو پێت خۆ بدەتە من ئەز دێ پشتراستییێ ب بەحەشتێ دەمێ).**

٣٤٦٥ - عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا النَّجَاةُ؟ قَالَ: (أَمْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ). [ت٢٤٠٦].

* صحيح.

[وانظر: ٢][3].

---

(١) مەبەست پێ مەزناتییا گونەهێیە و رۆژهەلات پتر ژ رۆژهەلاتەكێ هەیە یا زڤستانێ و یا هاڤینێ، ئانكو: د ناڤبەرا واندا.

(٢) مەخسەد پێ دەڤ و ئەزمانە، نە حەرام ب دەڤی بێتە خوارن، نە خرابی ب ئەزمانی بێتە گۆتن.

(٣) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێكێدا نەهاتییە و د مالپەریدا هاتییە.

ژ عوقبێ كورێ عامری (ﭬ) گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ رزگاربوون د چ دایە؟ گۆت: **(ئەزمانێ خۆ ل سەر خۆ بگرە[1] و ل مالا خۆ بە[2] و بۆ گونەها خۆ بكە گری).**

٢ . باب: النهي عن الحديث بكل ما سمع

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ پێئاخفتنا هەر تشتێ گوه لێ بوو.**

٣٤٦٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِباً أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ). [م المقدمة ٥]

ژ ئەبی هورەیرە (ﭬ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بەسی مرۆڤییە درەوكرن ئەو هەر تشتێ گوه لێ بیت پێ باخڤیت).**

٣ . باب: التزام الصدق وترك الكذب

**بابەتێ: بەردەوامبوون ل سەر راستگۆیییێ و هێلانا درەوێ.**

٣٤٦٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الجَنَّةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يَكُونَ صِدِّيقاً. وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ، حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّاباً).

[خ٦٠٩٤/ م٢٦٠٧].

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﭬ)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی راستگۆیی بەرێ مرۆڤی ددەتە باشییێ (كار و كریارێت باش و خودێ پێ خۆش) و باشی بەرێ مرۆڤی ددەتە بەحەشتێ، و مرۆڤ هەر دێ راستییێ بێژیت، هەتا ل دەڤ خودێ راستگۆ دنێتە نڤیسین و نیاسین، و درەو بەرێ مرۆڤی ددەتە گونەهێ، (خوارکەفتنا ژ رێكا راست)، و گونەهـ بەرێ مرۆڤی ددەتە جەهنەمێ، و مرۆڤ هەر دێ درەوێ كەت، هەتا ل دەڤ خودێ درەوین دنێتە نڤیسین و نیاسین).**

---

(١) ئانكو: بلا ئەزمانێ تە ب گونەهان ل سەر تە ڤەید نەكەت.

(٢) ئانكو: وان رێكان بگرە یێت تە ب مال و گوهدارییا خودێڤە گرێ ددەن.

٣٤٦٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: (**مَنْ قَالَ لِصَبِيٍّ: تَعَالَ هَاكَ، ثُمَّ لَمْ يُعْطِهِ فَهِيَ كَذْبَةٌ**). [حم٩٨٣٦]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر کەسێ گۆتە بچویکەکی وەرە بۆ خۆ تشتەکی و پاشی نەدەتێ ئەو درەوەکە).**

## ٤ . باب: ما يباح من الكذب

## بابەتێ: چ ژ درەوێ دورستە.

٣٤٦٩ - (ق) عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ عُقْبَةَ: أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، فَيَنْمِي خَيْرًا، أَوْ يَقُولُ خَيْرًا**). [خ٢٦٩٢/ م٢٦٠٥].

- وزاد في رواية لمسلم: وقالت: وَلَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِي شَيْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ كَذِبٌ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ: الْحَرْبُ، وَالإِصْلاَحُ بَيْنَ النَّاسِ، وَحَدِيثُ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ، وَحَدِيثُ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا.

**ژ ئوم کولسوومێ، کچا عوقبەیی (رضي الله عنها)، وێ گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (درەوین نەئەوە یێ ئاشتییێ د ناڤبەرا خەلکیدا بکەت، خێرێ ڤەگوهێزیت، یان خێرێ بێژیت).**

- **و د ڤەگێرەکا موسلمیدا زێدەکرییە، گۆت: (و من گوه لێ نەبوویە رێك و دەستویری ژ تشتەکی دابیت ژ ڤێ ئەڤا خەلك دبێژن ژ درەوان، د سێ تشتاندا نەبیت، مەخسدا وێ: درەو د شەریدا، و د پێکئینانا خەلکیدا، و د ئاخفتنا زەلامیدا بۆ ژنا خۆ و د ئاخفتنا ژنێدا بۆ زەلامێ خۆ)[1].**

## ٥ . باب: الألد الخصم

## بابەتێ: هەڤرکێ زێدە دژوار.

٣٤٧٠ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ**). [خ٢٤٥٧/ م٢٦٦٨].

---

(١) هەلبەت د حەژێکرن و ڤیانێدا، ژبلی ڤێ نابیت ژن و مێر درەوان ل ئێك و دو بکەن و ب درەوان حیلە و حەوالان ل ئێکدو بکەن ب ئیجماعا موسلمانان.

**ژ عائیشایێ (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خرابترین مرۆڤ ل دەڤ خودێ هەڤڕكێ زێدە دژوارە)[1].**

٣٤٧١ - عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي كُلُّ مُنَافِقٍ عَلِيمِ اللِّسَانِ**). [حم١٤٣، ٣١٠].

* إسناده قوي.

**ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ترسا ژ هەمیان پتر ئەز ل سەر ئوممەتا خۆ دترسم هەر دورویەكێ ئەزمانزانە).**

٦ . باب: تحريم الغيبة والنميمة وقول الزور

**بابەتێ: حرامكرنا نەكامی و ئاخفتنڤەگوهێزی و گۆتنا درەو.**

٣٤٧٢ - (ق) عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ رَجُلاً يَرْفَعُ الحَدِيثَ إِلَى عُثْمَانَ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتَّاتٌ**). [خ٦٠٥٦/ م١٠٥].

**ژ هەممامی (ﷺ) گۆت: ئەم ل دەڤ حوزەیفە بووین گۆ تە وی: ئ یێك ئاخفتنا دگەهینیتە عوسمانی، ئینا حوزەیفەیی گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ئاخفتنڤەگوهێز ناچیتە بەحەشتێ).**

٣٤٧٣ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ للهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ**). [خ١٩٠٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ گۆتنا درەو و كارپێكرنێ نەهێلیت خودێ منەت ب وی نینە ئەو خوارنا خۆ و ڤەخوارنا خۆ بهێلیت).**

٣٤٧٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**أَتَدْرُونَ مَا الْغِيْبَةُ**) ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: (**ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ**) قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: (**إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ؛ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ. وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ؛ فَقَدْ بَهَتَّهُ**). [م٢٥٨٩].

---

(١) زێدە دژوار: نەئەوە یێ مافێ خۆ دخوازیت و ل سەر مافێ خۆ یێ رژد بیت، بەلكی نەوە یێ راستییێ نەوەرگریت و زێدەتر مافێ خۆ دخوازیت و ب رێكێت نەدورست.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هوین دزانن نەكامی چییە)؟** گۆتن: خودێ و پێغەمبەرێ وی دزانن، گۆت: **(تو بەحسێ برایێ خۆ ب تشتێ پێ نەخۆش بكەی).** ئێكی گۆت: بێژە من هەكە ئەو تشتێ ئەز دبێژم ل دەڤ برایێ من هەبیت؟ گۆت: **(هەكە ئەوا تو دبێژی ل دەڤ هەبیت ئەو تە نەكامییا وی كر، و هەكە ئەوا تو دبێژی ل دەڤ وی نەبیت ئەو تە بێبەختی لێ كر).**

٣٤٧٥ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ، يَخْمُشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ، فَقُلْتُ: مَنْ هَؤُلاَءِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلاَءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ، وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ). [د٤٨٧٨، ٤٨٧٩]

* صحيح.

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دەمێ ئەز بریمە عەسمانان، ئەز د بەر هندە كەسانرا بۆریم نینۆكێت وان ژ سفری بوون سەر و چاڤ و سینگێت خۆ پێ ددانە بەر پەنجا، من گۆت: ئەڤە كینە یا جبریل؟ گۆت: ئەڤە ئەون یێت گۆشتێ خەلكی دخۆن (ئانكو نەكامییا وان دكەن) و بەحسێ نامویسا وان دكەن).**

٣٤٧٦ – عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الْإِيمَانُ قَلْبَهُ، لاَ تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ، وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّهُ مَنِ اتَّبَعَ عَوْرَاتِهِمْ يَتَّبِعُ اللهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ يَتَّبِعِ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ فِي بَيْتِهِ). [د٤٨٨٠]

* حسن صحيح.

ژ ئەبی بەرزەیێ ئەسلەمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(گەلی ئەو كەسێت ب ئەزمانێ خۆ باوەری ئینایین، و باوەری هێژ نەچۆیە د ناڤ دلێت واندا، نەكامییا موسلمانان نەكەن، و ل دویڤ گونەه و كێماسی و خەلەتییێن وان نەچن (ئاشكەرا بكەن) هەر كەسێ ل دویڤ گونەه و كێماسی و خەلەتییێن برایێ خۆ یێ موسلمان بچیت، خودێ دێ وی شەرمزار كەت و كێماسییێت وی ئاشكەرا كەت خۆ ئەگەر ئەو د مالا خۆدا بیت).**

٧ ـ باب: ما جاء في ذي الوجهين

**بابەتێ: ئەوا د راستا دوروییاندا هاتی.**

٣٤٧٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (تَجِدُ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللهِ ذَا الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هؤُلاَءِ بِوَجْهٍ، وَهؤُلاءِ بِوَجْهٍ).[خ٦٠٥٨ (٣٤٩٤)/ م: البر والصلة ٢٥٢٦ (٩٨)].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ل دەڤ خودێ رۆژا قیامەتێ دێ بینی خرابترینێ خەلکی یێ دوروییە ئەوێ ب روییەکی دهێتە دەڤ ڤان و ب روییەکێ دی دهێتە دەڤ ڤان).**

٨ ـ باب: المجاهرة بالمعاصي

**بابەتێ: ئاشكەراكرنا گونەهان.**

٣٤٧٨ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (كُلُّ أُمَّتِي مُعَافى إِلاَّ الْمُجَاهِرِينَ، وَإِنْ مِنَ الْمُجَاهَرَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً، ثُمَّ يُصْبِحُ وَقَدْ سَتَرَهُ اللهُ، فَيَقُولُ: يَا فُلاَنُ، عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا، وَقَدْ باتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ، وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللهِ عَنْهُ). [خ٦٠٦٩/ م٢٩٩٠].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(هەمی ئوممەتا من ب سلامەتن یان د ئازاكرینە، گونەه ئاشكراكەر نەبن، و ژ ئاشكراكرنێیە زەلام ب شەڤ كارەكی، گونەهەكێ بكەت، پاشی سپێدە لێ ببیت، و خودێ یێ ستارە كری و ڤەشارتی، دێ بێژیت: یا بێڤان دوهی من ئەڤە و ئەڤە یا كری، و شەڤێ یێ مای خودێ یێ ستارە كری، و سپێدە لێ دبیت، ستارەیا خودێ ئاشكرا دكەت).**

٩ ـ باب: النهي عن السباب

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ خەبەرگۆتنێ.**

٣٤٧٩ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ). [خ٤٨/ م٦٤]

ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خەبەرگۆتنا موسلمانی ژ رێ دەركەفتنە و شەڕكرنا وی گاورییە)**[1].

(١) ئانكو: كارێ گاورانە.

٣٤٨٠ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ ، فَعَلَى الْبَادِئِ، مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ**). [م٢٥٨٧].

ژ ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**هەردو خەبەربێژ گونەها خەبەرێت وان ل سەر یێ ئێكێ خەبەر گۆتین هندی یێ ستەملێكری زێدە نەكەت**).

١٠ ـ باب: النهي عن التحاسد والتدابر والظن

**بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ حەسویدی ب ئێكدو برن و پشتدانا ئێك و هزرا خەلەت ژ ئێكدو.**

٣٤٨١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الحَدِيثِ، وَلاَ تَحَسَّسُوا، وَلاَ تَجَسَّسُوا ، وَلاَ تَنَاجَشُوا ، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَاناً**). [خ٦٠٦٦ (٥١٤٣)/ م٢٥٦٣].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**هشیار بن هزرا خەلەت نەكەن، ب راستی هزرا خەلەت درەوترین ئاخفتنە، و سەحوسوییا عەیبێت ئێكدو نەكەن، و جاسویسییێ ل سەر ئێكدو نەكەن، و ل سەر ئێكدو زێدە نەكەن ب ئنیەتا تێئێخستنێ و خوسارەتییا هەڤالێ خۆ ، و حەسویدییێ ب ئێكدو نەبەن، و كەربێت خۆ ژ ئێكدو نەڤەكەن و نەڤیانا ئێكدو نەهەلگرن، و ژ ئێكدو سل نەبن و پشتا خۆ نەدەنە ئێكدو، و بەندەیێت خودێ بن و برایێت ئێك بن**)[1].

٣٤٨٢ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَاناً، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ**). [خ٦٠٦٥/ م٢٥٥٩].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**كەربێت خۆ ژ ئێكدو نەڤەكەن و نەڤیانا ئێكدو نەهەلگرن، و حەسویدییێ ب ئێكدو نەبەن، و ژ ئێكدو سل نەبن و پشتا خۆ نەدەنە ئێكدو و بەندەیێت خودێ بن و برایێت ئێك بن،**

(١) ئانكو: هەڤكارییا برایینییێ د گەل ئێكدو بكەن.

**(ئانكو هەڤكاریيا برایينيیێ د گەل ئێكدو بكەن) و نەدورستە بۆ چو موسلمانان سێ رۆژان زێدەتر ژ برایێ خۆ سل ببیت).**

٣٤٨٣ - عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ: الْحَسَدُ وَالْبَغْضَاءُ، هِيَ الْحَالِقَةُ، لاَ أَقُولُ: تَحْلِقُ الشَّعَرَ وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَفَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِمَا يُثَبِّتُ ذَاكُمْ لَكُمْ، أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ). [ت٢٥١٠].

* حسن.

**ژ زو بەيرێ كورێ عەووامی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئێشا ملەتێت بەرێ كەفتە د ناڤ هەوەدا، زكرەشی و كەرب و كین، و ئەو تراشكەرە، و ئەز نابێژم پرچێ دتراشیت، بەلكی دینی دتراشیت، ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا هوین ناچنە بەحەشتێ هەتا باوەرییێ نەئینن و هوین باوەرییێ نائینن هەتا حەژ ئێكدو نەكەن، و ئەز وێ بۆ هەوە نەبێژم یا ئەڤە پێ بنەجە دبیت، سلاڤێ د ناڤبەرا خۆدا بەلاڤ و ئاشكەرا بكەن).**

## ١١ ـ باب: من قال لأخيه يا كافر

## بابەتێ: یێ بێژیتە برایێ خۆ ئەی گاور.

٣٤٨٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لأَخِيهِ: يَا كَافِرُ، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا). [خ٦١٠٤/ م٦٠].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری، (خودێ ژ وان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: هەر مرۆڤەكێ بێژیتە برایێ خۆ: ئەی گاور، ل سەر ئێك ژ وان زڤری)[1].**

٣٤٨٥ - (خ) عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (لاَ يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفُسُوقِ، وَلاَ يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ، إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذلِكَ). [خ٦٠٤٥ (٣٥٠٨)].

---

(١) ئانكو: هەكە یێ وەسا بیت وەكی گۆتی (ئەو هەژی وێیە)، و هەكە نە بۆ وی زڤری یێ وەگۆتی.

ژ ئەبی زەرِی (رضي الله عنه)، وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(بلا چو کەس کەسێ رێدەرکەفتی و گاور نەدانیت هەکە دێ بۆ وی زڤرپتەڤە هەکە هەڤالێ وی یێ وەسا نەبیت).**

## ١٢ . باب: النهي عن اللعن

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ لەعنەتکرنێ.

٣٤٨٦ - (م) عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِنَّ اللَّعَّانِينَ لاَ يَكُونُونَ شُهَدَاءَ، وَلاَ شُفَعَاءَ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ**). [م٢٥٩٨].

ژ ئەبی دەردائی (رضي الله عنه)، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(ب راستی زێدە لەعنەتچی نەدبنە شاهد و نەدبنە بەرِهڤان رۆژا قیامەتێ).**

٣٤٨٧ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ يَنْبَغِي لِصِدِّيقٍ أَنْ يَكُونَ لَعَّاناً**).[م٢٥٩٧].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نەدورستە بۆ راستگۆیی، زێدە یێ لەعنەتچی بیت).**

٣٤٨٨ - (م) وَعَنْهُ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ عَلَى الْمُشْرِكِينَ، قَالَ: (**إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّاناً، وَإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً**). [م٢٥٩٩].

و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: ها تە گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ نفرینا ل هەڤپشکچێکەران بکە، گۆت: **(ب راستی ئەز زێدە لەعنەتچی نەهاتیمە هنارتن، بەلێ ئەز بەس دلۆڤانی یێ هاتیمە هنارتن).**

٣٤٨٩ - (م) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، وَامْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ عَلَى نَاقَةٍ، فَضَجِرَتْ، فَلَعَنَتْهَا. فَسَمِعَ ذَلِكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ: (**خُذُوا مَا عَلَيْهَا وَدَعُوهَا، فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ**).

قَالَ عِمْرَانُ: فَكَأَنِّي أَرَاهَا الآنَ تَمْشِي فِي النَّاسِ، مَا يَعْرِضُ لَهَا أَحَدٌ. [م٢٥٩٥].

ژ عیمرانێ کورِێ (حصین)ی (خودێ ژ وان رازی بیت)، وەختەکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل وەغەرەکا خۆ بوو، ژنەکا خەلکێ مەدینێ ل سەر حێشترەکێ بوو، بێزار بوو لەعنەت ل حێشترێ کرن، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بوو ئینا گۆت: **(کا چ ل**

**سەرە، راكەن، و بهێلن بچيت، ئەو يا لەعنەت لێكرييە). عيمرانى گۆت: هەروەكى ئەز ڤێ گاڤێ بەرێ خۆ ددەمێ ئەو حێشترێ د ناڤ خەلكيدا يا دچيت و كەس مايێ خۆ تێ ناكەت.**

## ١٣ ـ باب: ما جاء في المدح

## بابەتێ: ئەوا د راستا پەسنكرنێدا هاتى.

٣٤٩٠ - (ق) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: أَثْنَى رَجُلٌ عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: (**وَيْلَكَ! قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ**). مِرَاراً، ثُمَّ قَالَ: (**مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحاً أَخَاهُ لاَ مَحَالَةَ، فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ فُلاَناً، وَاللهُ حَسِيبُهُ، وَلاَ أُزَكِّي عَلَى اللهِ أَحَداً، أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا، إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذلِكَ مِنْهُ**). [خ٢٦٦٢/ م٣٠٠٠].

**ژ ئەبى بەكرەى (رضي الله عنه)، گۆت: زەلامەكى باش مەدحێت زەلامەكى ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كرن، ئينا گۆت: (وەى بۆ تە، تە ستۆيێ هەڤالێ خۆ برى)[1] چەند جاران گۆت، پاشى گۆت: (هەكە ئێك ژ هەوە هەر دێ مەدحان كەت چو چارە نينە، بلا بێژيت: ئەز هزر دكەم فلان و حسێبا وى يا ل سەر خودێ و مەدحێت كەسێ بۆ خودێ ناهێنە كرن[2] ئەز هزر دكەم يێ هۆسايە و يێ هۆسايە هەكە ئەو وەسا ببينيت).**

٣٤٩١ - (م) عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ: أَنَّ رَجُلاً جَعَلَ يَمْدَحُ عُثْمَانَ، فَعَمِدَ الْمِقْدَادُ، فَجَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَكَانَ رَجُلاً ضَخْماً، فَجَعَلَ يَحْثُو فِي وَجْهِهِ الْحَصْبَاءَ. فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: مَا شَأْنُكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا رَأَيْتُمُ الْمَدَّاحِينَ، فَاحْثُوا فِي وُجُوهِهِمُ التُّرَابَ**)[3]. [م٣٠٠٢].

---

(١) ئانكو: تە نێزيكى هيلاكێ كر هندى تو مەدحێت وى دكەى.

(٢) ئانكو: چو ل بەر وى بەرزە نابيت و ئەو چێتر دزانيت كا بەندەيێ وى يێ چاوايە.

(٣) نيمامێ نەوەوى (رحمه الله) دبێژيت: ئەڤ حەديسە د پاشڤەلێدانێدا دورستن و د دورستييا مەدحەكرنێدا حەديسێت دورست گەلەك يێت هاتين، و زانا دبێژن:

و رێكا كۆمكرنێ د ناڤبەرا حەديساندا ئەڤەيە: ئەوێت مەدحێت وى دهێنە كرن هەكە باوەرى و يەقينا تەكويز و شيان و دەستەسەرييا نەفسێ و زانينەكا تمام ل دەڤ هەبيت ب رەنگەكێ وەسا سەردا نەچيت و نەهێتە خاپاندن، نەيا حەرامە و نەيا نەباشە، و هەكە ژێ ترسيا ژ ئێك ژ ڤان تشتان نەباشە مەدحێت وى بێنە كرن نەباشييەكا زێدە، و دويف ڤێ دريژييێ حەديسێت ژێك جودا دهێنە شرۆڤەكرن. و ژ حەديسێت سەر دورستيێ هاتين، گۆتنا وى (ﷺ) يا گۆتييە ئەبوبەكرى (رضي الله عنه): ئەز هيڤى دكەم تو ژ وان بى. ئانكو ژ وان بى يێت د هەمى دەرگەهێت بەحەشتێرا دهێنە گازيكرن دا تێرا بچييە د بەحەشتێڤە، و (ﷺ) گۆتە عومەرى

**ژ هەممامێ كوڕێ حارسی (ڕەحمەتا خودێ لێ بیت)، گۆت: زەلامەكی دەستهاڤێتێ مەدحێت عوسمانی كرن (خودێ ژێ ڕازی بیت)، میقدادی قەستا ئاخێ كر و كەفتە سەر چۆكێت خۆ و زەلامەكی ب كەلەخ بوو و حەسحاسۆك هاڤێتنە سەر و چاڤێت وی، عوسمانی گۆتێ: تە خێرە؟[1] گۆت: ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) یا گۆتی: (هەكە هەوە زێدە مەدحەكەر دیتن، ئاخێ باڤێژنە سەر و چاڤێت وان).**

٣٤٩٢ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يَعْمَلُ الْعَمَلَ مِنَ الْخَيْرِ، وَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ؟ قَالَ: (**تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ**). [م٢٦٤٢].

**ژ ئەبی زەڕی (خودێ ژێ ڕازی بیت) گۆت: ئێكی گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) تو چ دبێژی بۆ وی مرۆڤی یێ كارێ خێرێ دكەت و خەلك ژ بەر هندێ مەدحێت وی بكەن؟ گۆت: (ئەو مزگینیيا لەزلێكرییە بۆ خودان باوەری).**

٣٤٩٣ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): كَيْفَ لِي أَنْ أَعْلَمَ إِذَا أَحْسَنْتُ وَإِذَا أَسَأْتُ؟ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِذَا سَمِعْتَ جِيرَانَكَ يَقُولُونَ: أَنْ قَدْ أَحْسَنْتَ؛ فَقَدْ أَحْسَنْتَ، وَإِذَا سَمِعْتَهُمْ يَقُولُونَ: قَدْ أَسَأْتَ؛ فَقَدْ أَسَأْتَ**). [جه٤٢٢٣].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (خودێ ژێ ڕازی بیت) گۆت: زەلامەكی گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) ئەز دێ چاوا زانم من باشی كریيە یان خرابی كرییە؟ گۆت: (ئەگەر تە گوهـ ل جیرانێت خۆ بوو دبێژن: تە باشی كر ئەو ب راستی تە باشی كر، و ئەگەر تە گوهـ ل وان بوو دبێژن: تە خرابی كر، هینگێ ب راستی تە خرابی كر).**

٣٤٩٤ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنْ مَلَأَ اللهُ أُذُنَيْهِ مِنْ ثَنَاءِ النَّاسِ خَيْرًا، وَهُوَ يَسْمَعُ، وَأَهْلُ النَّارِ مَنْ مَلَأَ أُذُنَيْهِ مِنْ ثَنَاءِ النَّاسِ شَرًّا وَهُوَ يَسْمَعُ**). [جه٤٢٢٤].

---

(خودێ ژێ ڕازی بیت)، شەیتان تە ببینیت تە ڕێكەك یا گرتی و لێ دچی ئەو دێ ل ڕێكەكا دی چیت نە ئەو بیت یا تە گرتی و حەدیس ل سەر دورستییا مەدحێ گەلەكن و من هندەك ژ وان د كتێبا نەزكارێدا یێت ئینایین.

(١) ڕامان ئەڤەیە: دبیت عوسمانی (خودێ ژێ ڕازی بیت) ئەڤ فەرمووده گوهـ لێ نەبیبیت لەوا پرسیارا ئەگەری ژ كارێ وی كر، یان ژی دبیت عوسمانی ڕامانەكا دی ژ ڤێ ئاخفتنێ تێ گەهشتبیت نە ڕامانا ئاشكەرا ژ فەرموودەیێ ئەو ژی چو ب مەدحێت وی نەدەن و بێهیڤی بكەن.

* حسن صحيح.

**ژ ئیبن عەبا سی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خەلکێ بەحشتێ ئەوە یێ خودێ هەردو گوهێت وی ژ مەتحەکارییا خێرێ یا خەلکی پڕ کەت و وی گوه لێ دبیت، و خەلکێ جەهنەمێ ئەوە یێ خودێ هەردو گوهێت وی ژ رەوشکرنا خراب یا خەلکی پڕ کەت و وی گوه لێ دبیت).**

١٤ . باب: كتمان السر

**بابەتێ: ڤەشارتنا نهێنییێ.**

٣٤٩٥ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ، فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثاً، لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَداً مِنَ النَّاسِ. [م٣٤٢ و٢٤٢٩].

[وانظر: ٢٣٥٥][1].

**ژ عەبدوللایێ کورێ جەعفەری، (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: رۆژەکێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز ل پشت خۆ سویار کرم، ئاخفتنەکا نهێنی بۆ من کر ئەز بۆ کەسێ ژ خەلکی نابێژم.**

١٥ . باب: اشفعوا تؤجروا

**بابەتێ: مەهدەرێ بکەن دێ خودان خێر بن.**

٣٤٩٦ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا جَاءَهُ السَّائِلُ، أَوْ طُلِبَتْ إِلَيْهِ حَاجَةٌ، قَالَ: (اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا، وَيَقْضِي اللهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ (ﷺ) ما شَاءَ). [خ١٤٣٢/ م٢٦٢٧].

**ژ ئەبی مووسایی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەکە خودان هەوجەیەك هاتبا دەڤ، بەرێ خۆ ددا ئەوێت ل دەڤ وی روینشتی[2] و دگۆت: (بەرمڤانییێ و مەهدەرییا خێرێ بکەن، دێ خودان خێر بن، و کا خودێ چ ڤیا ببیت سەر ئەزمانێ پێغەمبەرێ خۆ دئینیت)[3].**

---

(١) ئەڤ زێدەییە د مالپەریدا هاتییە و د چاپا ئێکێدا نەهاتییە.

(٢) کەسێت ل دیوانا وی د روینشتی.

(٣) ئانکو: هوین مەهدەرێ بکەن یان نەکەن دێ هەر ئەو بیت یا خودێ نڤیسی، بەلێ هەکە هەوە مەهدەرا خێرێ کر دێ خودان خێر بن، چ ئەو شۆل ببیت یان نەبیت.

## ١٦ . باب: الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر

## بابەتێ: فەرمانكرن ب باشییێ و پاشڤەلێدانكرن ژ خرابییێ.

٣٤٩٧ – عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ أَنَّهُ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّكُمْ تَقْرَؤُونَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ﴾ [المائدة:١٠٥] ، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ، فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ)**. [د٤٣٣٨/ ت٢١٦٨/ جه٤٠٠٥].

* صحيح.

**ژ ئەبی بەكرێ سەدیق (ﷺ) گۆت: گەلی خەلكی هوین ڤێ ئایەتێ دخوینن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ﴾[1]، و من یا گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بووی (ﷺ) دگۆت: (هەكە خەلكی زۆردار دیت و دەستێت وی نەگرتن نێزیكە خودێ ئیزایەكێ ژ دەڤ خۆ بدەتە بەر وان هەمیان).**

٣٤٩٨ – عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَاباً مِنْهُ، ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلاَ يَسْتَجِيبُ لَكُمْ)**.[ت٢١٦٩].

* حسن.

**ژ حوزەیفەیێ كورێ یەمانی (ﷺ)، ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا یان هوین دێ فەرمانێ ب باشییێ كەن و پاشڤەلێدانێ ژ خرابییێ كەن یان نێزیكە خودێ دێ سزایەكی ژ دەڤ خۆ ب سەر وەدا هنێریت، پاشی هوین دوعا ژێ ژێ بكەن ژ هەوە نەوەرگریت).**

٣٤٩٩ – عَنِ الْعُرْسِ ابْنِ عَمِيرَةَ الْكِنْدِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(إِذَا عُمِلَتِ الْخَطِيئَةُ فِي الْأَرْضِ، كَانَ مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا ـ وَقَالَ مَرَّةً: أَنْكَرَهَا ـ كَانَ كَمَنْ غَابَ عَنْهَا، وَمَنْ غَابَ عَنْهَا فَرَضِيَهَا كَانَ كَمَنْ شَهِدَهَا)**. [د٤٣٤٥، ٤٣٤٦].

* حسن.

---

(١) رامانا ئایەتێ ب كورتی: گەلی خودان باوەران، هەوە ئاگەھ ژ خۆ هەبیت، نەگەر هوین د راستەرێكری بن، یێت سەرداچۆیی و بەرزە، زیانێ ناگەهینتە هەوە.

**ژ عورسێ کورێ عومەیرێ کیندی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر گونەهـ د عەردیدا هاتە کرن ئەوێ دیتی و پێنەخۆش بوویی ـ و جارەکێ گۆت: پاشڤەلێدان ژێ کری ـ وەکی وییە یێ نە ل وێرێ و نەدیتی، و یێ نەدیتی و نە ل وێرێ و پێرازی بووی وەکی وییە یێ ل وێرێ و ل سەر ئامادە).**

٣٥٠٠ - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَامَ خَطِيباً فَكَانَ فِيمَا قَالَ: (**أَلاَ لاَ يَمْنَعَنَّ رَجُلاً هَيْبَةُ النَّاسِ، أَنْ يَقُولَ بِحَقٍّ إِذَا عَلِمَهُ**).

قَالَ: فَبَكَى أَبُو سَعِيدٍ وَقَالَ: قَدْ وَاللهِ رَأَيْنَا أَشْيَاءَ، فَهِبْنَا. [جه٤٠٠٧].

* صحيح.

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو و گۆتارەك دا و ژ وێ یا گۆتی: (هشیار بن بلا ترس و سەهما خەلکی رێگرییێ ل کەسێ نەکەت راستییەکێ بێژیت ئەگەر زانی ئەو راستییە).**

**گۆت: ئەبو سەعید کرە گری و گۆت: ب خودێ کەمە مە گەلەك تشت یێت دیتین و ئەم ترساین.**

١٧ ـ باب: الحكاية على سبيل السخرية

**بابەتێ: ئاخفتن کرن ب رێیا ترانەپێکرنێ.**

٣٥٠١ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): حَسْبُكَ مِنْ صَفِيَّةَ كَذَا وَكَذَا ـ تَعْنِي: قَصِيرَةً ـ فَقَالَ: (**لَقَدْ قُلْتِ كَلِمَةً لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ لَمَزَجَتْهُ**).

قَالَتْ: وَحَكَيْتُ لَهُ إِنْسَاناً، فَقَالَ: (مَا أُحِبُّ أَنِّي حَكَيْتُ إِنْسَاناً، وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا).[د٤٨٧٥/ ت٢٥٠٢].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (ﷺ)، گۆت: من گۆتە پێغەمبەری (ﷺ) بەسی تەیە سەفییە یا هۆسایە و هۆسایە، ـ ئانکو یا کورتە ـ ئینا گۆت: (ب راستی تە ئاخفتنەك گۆت، هەکە د گەل ئاڤا دەریایێ تێکەل کربا دا د گەل تێکەل بیت و گوهۆریت).**

**عائیشایێ گۆت: و من زاری مرۆڤەکی کر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (من پێ خۆش نینە ئەز زاری مرۆڤەکی بکەم، خۆ هەکە هندە و هندە ژ دنیایێ بۆ من بیت).**

الفصل الخامس: آداب السلام

## پشكا پێنجێ: رەوشتێت سلاڤێ.

### ١ . باب: (أفشوا السلام بينكم)

**بابەتێ: سلاڤێ د ناڤبەرا خۆدا ئاشكرا و بەلاڤ بكەن.**

٣٥٠٢ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لاَ تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَ لاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ). [م٥٤].

ژ ئەبی هورەیرە گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا، هوین ناچنە بەحەشتێ هەتا هوین باوەرییێ نەئینن، و هوین باوەرییێ نائینن، هەتا حەژ ئێك و دو نەكەن، ئەرێ ئەز تشتەكی نیشا هەوە نەدەم هەكە هەوە كر حەژ ئێك و دو بكەن؟ سلاڤێ د ناڤبەرا خۆدا بەلاڤ و ئاشكرا بكەن).**

### ٢ . باب: يسلم القليل على الكثير

**بابەتێ: یێت كێم سلاڤ دكەنە یێت گەلەك.**

٣٥٠٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ). [خ٦٢٣٢ (٦٢٣١)/ م٢١٦٠].

- وفي رواية للبخاري: (يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَارُّ عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ). [خ٦٢٣١].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بلا یێ سویار سلاڤ بكەتە یێ پەیا و یێ دچیت سلاڤ بكەتە یێ روینشتی، و یێت كێم سلاڤ بكەنە یێت گەلەك).**

- و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: **(بلا یێ بچویك سلاڤ بكەتە یێ مەزن و یێ دچیت سلاڤ بكەتە یێ روینشتی و یێت كێم سلاڤ بكەنە یێت گەلەك).**

### ٣ . باب: السلام على من عرفت وغيره

**بابەتێ: سلاڤكرن ل سەر یێ نیاس و یێ نەنیاس.**

٣٥٠٤ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ؟ قَالَ: (تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ). [خ١٢/ م٣٩].

ژ عەبدوللایێ كورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: زەلامەكی پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ كر (ﷺ) كیژ كار د موسلمانەتییێدا ب خێرن؟ گۆت: **(تو خوارنێ بدەی و سلاڤ بكەیە سەر یێ تو بنیاسی و یێ نەنیاسی).**

**٤ . باب: السلام على الصبيان**

**بابەتێ سلاڤكرنا ل سەر بچویكان**

٣٥٠٥ - **(ق)** عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ مَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَفْعَلُهُ. [خ٦٢٤٧/ م٢١٦٨].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) ئەو د بەر بچویكانرا دبۆری سلاڤ كرە وان و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە دكر.

**٥ . باب: فضل السلام ومن بدأ به وتكراره**

**بابەتێ: خێرا سلاڤێ و یێ دەست پێ دكەت و دوبارەكرنا وێ.**

٣٥٠٦ - عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِاللهِ مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلَامِ).** [د٥١٩٧/ ت٢٦٩٤]

* صحيح.

ژ ئەبی ئومامەی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(یێ ب گوهدارییێ ژ خودێ نێزیكتر ئەوە یێ بەراهیێ سلاڤ دكەت).**

٣٥٠٧ - عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ، ثُمَّ جَلَسَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(عَشْرٌ).**

ثُمَّ جَاءَ آخَرُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَجَلَسَ، فَقَالَ: **(عِشْرُونَ).**

ثُمَّ جَاءَ آخَرُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَجَلَسَ، فَقَالَ: **(ثَلَاثُونَ).**

[د٥١٩٥/ ت٢٦٨٩/ مي٢٦٨٢]

* صحيح.

ژ عیمرانێ كورێ (حصین)ی خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: السَلامُ علَیكم، سلاڤا وی ڤەدا و پاشی روینشت ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەڤە دەھ خێر).**

**پاشی ئێكێ دی هات و گۆت: السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ الله، سلاڤا وی ڤەدا و ڕوینشت ئینا گۆت: (ئەڤە بیست خێر).**

**پاشی ئێكێ دی هات و گۆت: السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ الله وَبَرَكَاتهُ، سلاڤا وی ڤەدا و ڕوینشت ئینا گۆت: (ئەڤە سیهـ خێر).**

٣٥٠٨ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِذَا انْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَجْلِسِ؛ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ، فَلَيْسَتِ الْأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الْآخِرَةِ**). [د٥٢٠٨/ ت٢٧٠٦].

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (﵁) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە ئێك ژ هەوە گەهشتە دیوانێ بلا سلاڤ بكەت، و هەكە ڤیا ڕابیت، بلا سلاڤ بكەت، سلاڤا ئێكێ ژ یا دووێ هەژیتر نینە).**

٣٥٠٩ – عَنْ عُمَرَ: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) وَهُوَ فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ! السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، أَيَدْخُلُ عُمَرُ؟ [د٥٢٠١].

* صحيح.

**ژ عومەری (﵁) ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو د ژۆرەكا خۆڤە بوو، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ السلام عليك، السلام عليكم ئەرێ عومەر بهێتە ژۆر؟.**

## ٦ . باب: السلام على النساء

## بابەتێ: سلاڤ ل سەر ژنان.

٣٥١٠ – عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ يَزِيدَ قالتْ: مَرَّ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (ﷺ) فِي نِسْوَةٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا.[د٥٢٠٤/ جه٣٧٠١/ مي٢٦٧٩]

* صحيح.

**ژ ئەسمائا كچا یەزیدی (﵁)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر مە كۆمەكا ژنانڕا بۆری، سلاڤ كرە مە.**

## ٧ . باب: ما جاء في القيام

## بابەتێ: ئەوا د ڕاستا ڕابوونەڤەیێدا هاتی.

٣٥١١ – عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). قَالَ: وَكَانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا، لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهِيَتِهِ لِذَلِكَ. [ت٢٧٥٤].

* صحيح.

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: کەس ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ وان خۆشڤیتر نەبوو، گۆت: و ئەگەر وان دیتبا بۆ نەرادبوونەڤە، وان دزانی کەربێت وی ژ هندێ ڤەدبوون.**

٨ . باب: المصافحة والمعانقة

**بابەتێ: چۆنا دەستی و سەر و ستۆیا.**

٣٥١٢ - (خ) عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: أَكَانَتِ المصَافَحَةُ فِي أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ قَالَ: نَعَمْ. [خ٦٢٦٣].

**ژ قەتادەیی (ﷺ) گۆت: من گۆتە ئەنەسی ئەرێ چۆنا دەستی د ناڤ هەڤالێت پێغەمبەریدا (ﷺ) هەبوو؟ گۆت: بەلێ.**

٣٥١٣ - عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ، فَيَتَصَافَحَانِ؛ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا)**. [د٥٢١٢/ ت٢٧٢٧/ جه٣٧٠٣].

* صحيح.

**ژ بەرائی (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نینە دو موسلمان بگەهنە ئێك، و بچنە دەستێت ئێك و دو، هەكە خودێ گونەهێت وان ژێ نەبەت بەری ژێكڤە ببن).**

٣٥١٤ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! الرَّجُلُ مِنَّا يَلْقَى أَخَاهُ، أَوْ صَدِيقَهُ، أَيَنْحَنِي لَهُ؟ قَالَ: **(لاَ)** ، قَالَ: أَفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ؟ قَالَ: **(لاَ)** ، قَالَ: فَيَأْخُذُ بِيَدِهِ وَيُصَافِحُهُ؟ قَالَ: **(نَعَمْ)**.[ت٢٧٢٨/ جه٣٧٠٢].

* حسن.

**ژ ئەنەسێ کورێ مالكی (ﷺ)، گۆت: زەلامەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئێك ژ مە برایێ خۆ یان هەڤالێ خۆ ببینیت خۆ بۆ بچەمینیت؟ گۆت: (نەخێر)، گۆت: بگریت و ماچی كەت؟ گۆت: (نەخێر)، گۆت: دەستێ وی بگریت و بچیتە دەستێ وی؟ گۆت: (بەلێ).**

## ٩ ـ باب: كيفية السلام على أهل الكتاب

## بابەتێ: چەوانييا سلاڤێ ل سەر خودان كتێبان.

٣٥١٥ – (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمُ الْيَهُودُ، فَإِنَّمَا يَقُولُ أَحَدُهُمْ: السَّامُ عَلَيْكَ، فَقُلْ: وَعَلَيْكَ**). [خ٦٢٥٧/ م٢١٦٤].

**ژ عەبدوللايێ كورێ عومەرى (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە جوهييان سلاڤ كرە هەوە، ب راستى ئێك ژ وان دبێژيت: (السام عليك)[١]، بێژە: و ل سەر تە ژى بن)[٢].**

## ١٠ ـ باب: تقبيل اليد

## بابەتێ: ماچيكرنا دەستى.

٣٥١٦ – عن عبد الله بن عمر – وذَكَرَ قِصَّةً – قال: فَدَنَوْنَا، – يعني: مِنَ النَّبِي (ﷺ)– فَقَبَّلْنَا يَدَهُ[٣]. [د٥٢٢٣/ جه٣٧٠٤].

* ضعيف.

[انظر: ٦٩٣].

**ژ عە بدوللايێ كورێ عو مەرى ( خودێ ژ وان رازى ب يت) ـ و سەرهاتييەك گۆت ـ و گۆت: و ئەم نێزيك بووين: ئانكو ژ پێغەمبەرى (ﷺ) و مە دەستێ وى ماچى كر.**

---

**(١) ئانكو: مرن ل سەر تە بيت و ئەو دەڤێ خۆ ب سلاڤێ خواركەن و تشتەكێ خەلەت دبێژن.**

**(٢) دا هەر بۆ وان بزڤريت.**

**(٣) ـ شێخ سالحێ شامى ئەڤ فەرمووده هەر ب وێ ژمارەيێ د مالپەرێ خۆدا شوينێ ئينايە:**

٣٥١٦ – عن زارع ـ وكان في وفد عبد القيس ـ قال: لما قدمنا المدينة، فجعلنا نَتَبادرُ من رواحلنا، فنقبّل يد النبي (ﷺ).. الحديث.[د٥٢٢٥].

* حسن. [انظر: ٦٩٣].

**ژ زارعى (رضي الله عنه) ـ و ئەو د گەل شاندێ عەبد قەيس بوو ـ گۆت: دەمێ ئەم هاتينە مەدينەيێ مە دەستهاڤێتێ لەز ل هاتنەخوارا دەوارێت خۆ كر و مە دەستێ پێغەمبەرى (ﷺ) ماچى دكر.**

## الفصل السادس: ما جاء في الشعر والألفاظ واللهو

## پشكا شەشێ: ئەوا د راستا هۆزان و پەیڤتن و مژویلییێدا هاتی.

### ١ ـ باب: ما جاء في الشِعر

### بابەتێ: ئەوا د هۆزانێدا هاتی.

٣٥١٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللهَ بَاطِلُ. وَكادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ). [خ٦١٤٧ (٣٨٤١)/ م٢٢٥٦].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(راستگوترین پەیڤ ئێکی گۆتبیت پەیڤا لەبیدییە: بزانن هەر تشتێ هەبیت خودێ نەبیت بێ چۆییە و نامینیت و ئومەییە كورێ ئەبی سەلتی نێزیك بوو موسلمان ببیت).**

٣٥١٨ - (خ) عَنِ ابنِ عمرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قال: (لأَن يَمتلئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحاً، خيرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمتلئَ شِعراً). [خ٦١٥٤].

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر سینگێ ئێكی ژ هەوە تژی ئادائ ببیت بۆ وی چێترە تژی هۆزان ببیت)[1].**

٣٥١٩ - (خ) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً). [خ٦١٤٥].

ژ ئوبەیێ كورێ كەعبی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی هندەك ژ هۆزانێ عەقلمەندییە).**

٣٥٢٠ - (م) عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَدِفْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَوْماً، فَقَالَ: (هَلْ مَعَكَ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ شَيْئاً)؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: (هِيهِ) فَأَنْشَدْتُهُ بَيْتاً. فَقَالَ: (هِيهِ)، ثُمَّ أَنْشَدْتُهُ بَيْتاً. فَقَالَ: (هِيهِ) حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ بَيْتٍ. [م٢٢٥٥].

ژ عەمرێ كورێ شەریدی (ﷺ) ژ بابێ خۆ، گۆت: ئەز رۆژەكێ ل پشت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سویار بووم، ئینا گۆت: **(ئەرێ تە تشتەك ژ هۆزانا ئومەیێ كورێ ئەبی**

---

(١) هەلبەت بەحسێ هۆزانا درەو و خرابی تێدا، نە هەر هۆزانەكا هەبیت، چونكی پێغەمبەری (ﷺ) هۆزانڤان هەبوون و هۆزان ل مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) دگۆتن وەكی حەسسانێ كورێ سابتی.

**سەلتی ژبەره)؟ من گۆت: بەلێ، گۆت: (ئێ کا بێژه) من مالکەك بۆ گۆت ئینا گۆت: (ئێ هێژ) پاشی من مالکەکا دی بۆ گۆت، ئینا گۆت: (ئێ هێژ) هەتا من سەد مالك بۆ گۆتین.**

٣٥٢١ – عَنْ عَائِشَةَ قِيلَ لَهَا: هَلْ كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَتَمَثَّلُ بِشَيْءٍ مِنَ الشِّعْرِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَتَمَثَّلُ بِشِعْرِ ابْنِ رَوَاحَةَ، وَيَتَمَثَّلُ وَيَقُولُ: (**وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ**). [ت٢٨٤٨].

* صحيح.

**ژ عائیشایێ (ڕەزیاللە عەنها) ئێکی گۆتێ: ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تشتەك ژ هۆزانێ نموونە دئینا؟ گۆت: نموونە ب هۆزانا ئیبن رەوا حەیی دئینا و نموونە دئینا و دگۆت: و ئەو دێ دەنگوباسان بۆ تە ئینیت یێ تو ژێ نەخوازی[1].**

٣٥٢٢ – عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): إِنَّ الله عزّ وجل قَدْ أَنْزَلَ فِي الشِّعْرِ مَا أَنْزَلَ، فَقَالَ: (**إِنَّ الْمُؤْمِنَ يُجَاهِدُ بِسَيْفِهِ وَلِسَانِهِ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَكَأَنَّ مَا تَرْمُونَهُمْ بِهِ نَضْحُ النَّبْلِ**).

[حم٢٧١٧٤، ١٥٧٨٥، ١٥٧٨٦، ١٥٧٩٦]

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

**ژ کەعبێ کوڕێ مالکی (ڕەزیاللە عەنهو) وی گۆتە پێغەمبەری (ﷺ) ب راستی خودێ ئەوا د هۆزانێدا ئینایە خوارێ یا ئینایە خوارێ، ئینا گۆت: (ب راستی باوەریدار ب شیرێ خۆ و ب ئەزمانێ خۆ جیهادێ دکەت، و ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ئەوا هوین دهاڤێژنە وان وەکی تیربارانکرنێیە).**

---

**(١) ئەڤە نیڤ مالکا دوویێە یا تەرفەیێ کوڕێ عەبدی و نیڤا ئێکێ ئەڤەیە:**

سَتُبْدي لك الأيّامُ ما كنتَ جاهِلًا ** ويأتيكَ بالأخبارِ مَن لم تُزوِّدِ

**رامان ئەوە: دێ رۆژ بۆ تە وێ ئاشکەراکەن یا تە نەدزانی و ئەو دێ دەنگوباسان بۆ تە ئینیت یێ تو ژێ نەخوازی.**

## ٢ ـ باب: إن من البيان سحراً

## بابەتێ: هندەك ژ رەوانبێژی و ئاخفتن جێکرییێ سێربەندییە.

٣٥٢٣ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ قَدِمَ رَجُلاَنِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْراً** ، أَوْ: **إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ**). [خ٥٧٦٧ (٥١٤٦)].

**ژ عە بدوللایێ کورێ عو مەری ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: دو زەلام ژ لا یێ رۆژهەلاتا مەدینەیێڤە هاتن و گۆتار دان و خەلك ژ وان حێبەتی بوو ژ بەر رەوانبێژی و ئاخفتن جێکرییا وان، ئێ نا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب را ستی جوێ نەك ژ رەوانبێژی و ئاخفتن جێکرییێ سێربەندییە یان ب راستی هندەك ژ رەوانبێژی و ئاخفتن جێکرییێ سێربەندییە)[1].**

## ٣ ـ باب: رفقاً بالقوارير

## بابەتێ: نەرم بن ل گەل نازداران

٣٥٢٤ - (ق) عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ وَمَعَهُنَّ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَقَالَ: (**وَيْحَكَ يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدَكَ سَوْقاً بِالْقَوَارِيرِ**). قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: فَتَكَلَّمَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِكَلِمَةٍ، لَوْ تَكَلَّمَ بِهَا بَعْضُكُمْ لَعِبْتُمُوهَا عَلَيْهِ؛ قَوْلُهُ: (**سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ**).[خ٦١٤٩/ م٢٣٢٣].

- وفي رواية لهما: كَانَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) حادٍ يُقَالُ لَهُ: أَنْجَشَةُ، وَكَانَ حَسَنَ الصَّوْتِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): (**رُوَيْدَكَ يَا أَنْجَشَةُ! لاَ تَكْسِرِ الْقَوَارِيرَ**).

قَالَ قَتَادَةُ: يَعْنِي: ضَعَفَةَ النِّسَاءِ. [خ٦٢١١].

- ولهما: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، وَكَانَ مَعَهُ غُلاَمٌ.. [خ٦١٦١].

**ژ ئەبی قیلابەیی (رضي الله عنه) ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەڤ هندە هەڤژینێت خۆ و ئوم سولەیم د گەل وان بوو، ئینا گۆت: (وەی بۆ تە ئەی**

---

(١) ئانکو: دڤێت ئەم ب ئاخفتنا ب هنگڤینی تامدایی نەهێینە خاپاندن، و دبیت ئاخفتنا رێك و پێك و رەوانبێژی تێدا و جێکری کارتێکرنا سێربەندییێ تێدا بیت، ڤێجا دڤێت مرۆڤی ئاگەهـ ژ خۆ هەبیت، و هەر د وی دەمیدا ئەم د فەرمانکرینە گرینگیدانێ بدەینە ئاخفتنا جێکری و رەوانبێژی تێدا دا ناما خۆ پێ بگەهینین.

**ئەنجەشە نازداران رەحمەت و نەرم رێبێخە)**، ئەبو قەلابەیی گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ب پەیڤەكێ ئاخفت ئەگەر ئێكی ژ هەوە پێ ئاخفتبا دا هوین لۆمی وی كەن، گۆتنا وی **(رێئێخستنا تە بۆ نازداران)**.

و د ڤەگێرەكا واندا: پێغەمبەری (ﷺ) خەربەندەكی[1] حێشترا هەبی د گۆتنێ ئەنجەشە، و یێ دەنگ خۆش بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: **(رەحمەت و نەرم ئەی ئەنجەشە نازداران نەشكێنە)**.

قەتادەیی گۆت: ئانكو: ژنێت لاواز.

و د ڤەگێرەكا دی یا واندا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د وەغەرەكێدا بوو و خزمەتكارەك د گەل بوو.

## ٤ ـ باب: النهي عن سب الدهر

## بابەتێ: پاشڤەلێدان ژ خەبەرگۆتنا دەمی.

٣٥٢٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (قالَ اللهُ عزّ وجل : يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ، يَسُبُّ الدَّهْرَ، وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الأَمْرُ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ). [خ٤٨٢٦/ م٢٢٤٦].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خودایێ هەر ب هێز و مەزن گۆت: مرۆڤ من دئێشینن[2] خەبەران دبێژنە دەمی و ئەز چێكەرێ دەمیمە، فەرمان یا د دەستێ مندا، ئەز شەڤ و رۆژان لێك وەردگێرم)**.

## ٥ ـ باب: تحريم اللعب بالنرد

## بابەتێ: حەرامكرنا یارییا ب تاولێ.

٣٥٢٦ - (م) عَنْ بُرَيْدَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ، فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ). [م٢٢٦٠].

ژ بورەیدەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(یێ یارییێ ب تاولەیێ بكەت هەروەكی وی دەستێ خۆ ب گۆشتێ بەرازی و خوینا وی سۆر كری)**.

(١) خەربەند: ئەوە یێ دەواران دهاژۆت.

(٢) حاشا ئێك بشێت بێشینیت، بەلێ مەبەست ئەوە وێ ب بال منڤە لێ ددەن یا نەهەژی.

٣٥٢٧ - عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدِ، فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ). [د٤٩٣٨/ جه٣٧٦٢]

* حسن.

**ژ ئەبی موو سایێ ئە شعەری (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( هەر كەسێ یارییێ ب تاولەیێ بكەت ب راستی وی نەگوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی كر).**

## ٦ ـ باب: الغناء والمعازف واللهو

## بابەتێ: ستران و ئالەتێت ژەنین و مژویلاهییێ

٣٥٢٨ - (خـ) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ: أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ، يَسْتَحِلُّونَ الحِرَ وَالحَرِيرَ، وَالخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ، وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ، يَرُوحُ عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ، يَأْتِيهِمْ ـ يَعْنِي: الْفَقِيرَ ـ لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ: ارْجِعْ إِلَيْنَا غَداً، فَيُبَيِّتُهُمُ اللهُ، وَيَضَعُ الْعَلَمَ، وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ). [خ٥٥٩٠معلق].

**ژ ئەبی مالكێ ئەشعەری (ﷺ) وی گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (دێ هندە كەس ژ ئوممەتا من هەبن زنا و ئارمویش و عەرەق و ئامویرێت ژەنینان[1] حەلال كەن و**

---

(١) هندە زانا دبێژن: ئەڤ حەدیسە یا ئاشكرایە كو ئامویرێت موزیكێ ب هەمی رەنگانڤە د حەرامن.

بەرسڤا مە: هەلبەت ئەڤ حەدیسە راستە یا د بوخارییێدا، بەلێ ژ موعەلەقاتانە، ئانكو: سەنەدا وێ یا قەتیایە و نەیا پێكڤە گرێدایە لەوا ئیبن حەزم (ﷺ) ڤێ حەدیسێ ناوەرگریت و دبێژیت: ئەڤ حەدیسە سەنەدا وێ نەیا پێكڤە گرێدایە و د گەل هندێ مەتنا وێ ژی ژ ئیزترابێ ساخلەم نەبوویە. هەرچەندە ئیبن حەجەرێ عەسقەلانی (ﷺ) د (تعليق التعليق)ێدا دبێژیت: حەدیس یا دورستە و سەنەدێ وێ پێكڤە یێ گرێدایە. و ئەم ژی د گەل ئیبن حەجەرینە كو ئەڤ حەدیسە یا دورستە و ئەم د دورستییا وێدا ب شك ناكەڤین. بەلێ حەدیس نەیا ئاشكرایە ل سەر حەرامییا ئامویرێت موزیكێ، چونكی وەكی (ابن العربي) (ﷺ) فقهزانەكێ مالكیانە دبێژیت: پەیڤا (يستحلون) دو رامانان ددەت:

١ـ یستحلون، ئانكو: حەرامن و ئەو دێ حەلالكەن. بەلێ هەكە ڤێ رامانێ وەرگرین، هینگێ ئەم دێ كەڤینە د ڤێ ئالۆزی و ئارێشەیێدا، باشە مانێ حەریر ژی یێ د ناڤ وان تشتاندا، ما كەنگی حەریر یێ حەرامە هەتا وەختەك بێت ژ نوی هندەك حەلالكەن! نێ ئەو خۆ ب خۆ یێ حەلالە. حەریر بەس بۆ زەلامان یێ حەرامە ئەو ژی ئەگەر بكەنە بەر خۆ.. ئەكرین و فرۆتنێ پێ بكەن ئەو ژی دا وەكلێهاتن د ناڤبەرا ژن و زەلاماندا چێ نەبیت وەكی زێری. و هەكە حەریر د بنیاتدا یێ حەرام با خۆ چێ نەدبوو كرین و فرۆتن ژی پێ هاتبا كرن. و یا ئاشكرایە حەریر یێ حەلالە و زەلامان دكڕی و دفرۆت، و ژنان ب كار دئینا، و ئەڤە هەمی ل سەر

**خەلكەك دێ ب رەخ چیایەكیڤە دانن، و شڤانێ هەژار دێ پەزێ خۆ ئینیتە دەڤ وان ژ بەر هەوجەیەكێ دێ بێژن: سوبەهی بزڤرە دەڤ مە، خودێ ب شەڤ دێ وان ژ ناڤ بەت و چیای ب سەر واندا هویر هویر كەت، و هندەكان گوهۆریت[1] كەتە مەیموینك و بەراز هەتا رۆژا قیامەتێ).**

٣٥٢٩ - عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (**يَا عَائِشَةُ أَتَعْرِفِينَ هَذِهِ**) ؟ قَالَتْ: لاَ يَا نَبِيَّ اللهِ، فَقَالَ: (**هَذِهِ قَيْنَةُ بَنِي فُلاَنٍ، تُحِبِّينَ أَنْ تُغَنِّيَكِ**) ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَعْطَاهَا طَبَقاً فَغَنَّتْهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**قَدْ نَفَخَ الشَّيْطَانُ فِي مَنْخِرَيْهَا**). [حم١٥٧٢٠].

* إسناده صحيح على شرط الشيخين.

[وانظر: ١٤٩٨، ١٤٩٩][2].

**ژ سائیبێ كورێ یەزیدی (رضي الله عنه) گۆت: ژنەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا گۆت: (ئەی عائیشە تو ڤێ دنیاسی) گۆت: نەخێر ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئینا گۆت:**

---

دەمێ پێغەمبەری (ﷺ)، باشە چەوا پێغەمبەر (ﷺ) دێ بێژیت: رۆژەك دێ ئێت حەلالی دێ حەلالكەن، ما ئەڤە چەوا چێ دبیت نێ حەریر پێغەمبەری (ﷺ) یێ حەلال كری. ل ڤێرێ دیار دبیت ئەڤ رامانە نەیا ب مەرەمە

٢ـ رامانا دووێ ئەڤەیە: مەرەم ژێ رامانا مەجازییە نەیا دورستی، ئانكو: وەختەك دێ ئێت خەلك دێ زێدە ڤان تشتان ب كار ئینن و پێكڤە. و ئیبن ئەلعەرەبی دبێژیت: رامانا (يستحلون) ئەڤەیە هندەك دێ دەركەڤن ب ڤی رەنگینە ئەڤ هەرچار تشتە پێكڤە دێ ل دەڤ وان بن، دێ د زناكەر بن و دێ د خۆشییاندا بن و ل سەر حەریری بن و دێ د مەیڤەخۆر بن و نامویرێت موززیكێ ژی بۆ ئێنە لێدان.

و ل دویڤ ڤێ چەندا سەری وەسا دیار دبیت موززیك ب رەنگەكی یا حەرامە هەكە د گەل حرامی كۆم بوو، و هۆسا ئەڤ حەدیسە نابیتە بەلگە ل سەر حەرامییا موززیكێ هەكە د گەل حەرامی نەئێتە گرێدان.

و هەر ئەڤ حەدیسە ب ریوایەتا ئیبن ماجە یا هاتی ژ ئەبی مالكێ ئەشعەری (رضي الله عنه) ب ڤی رەنگی: (ليشربن اناس من امتي الخمر بغير اسمها يعزف على رؤسهم بالمعازف والمغنيات يخسف الله بهم الارض ويجعل منهم القردة والخنازير). و د ڤێ ریوایەتێدا ژی دیار دبیت موززیك ب تنێ نەیا حەرامە بەلێ دێ حەرام بیت هەكە تشتەكێ حەرام د گەل هاتە ب كارئینان.

[1] گوهارتنا رەوشتێ وانە بۆ رەوشتێ بەراز و مەیموینكان، چونكی گوهارتنا راستی ژ بەر قەدرێ پێغەمبەرێ مە (ﷺ) د ئوممەتا ویدا ناهێتە كرن و خودێ چێتر دزانیت.

(٢) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێكێدا نەهاتییە و د مالپەریدا هاتییە.

**( ئەڤە جارییا سترانبێژا فلان بنەمالێیە تە دڤێت بۆ تە ستران بێژیت) گۆت: بەلێ، گۆت: ئینا عائیشایێ دەفەك دا ڤێ و ستران بۆ گۆتن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی شەیتانی یا پف كرییە بن هەردو دفنێت وێڤە).**

٧ ـ باب: ما جاء في الألفاظ

**بابەتێ: ئەوا د راستا ئاخفتناندا هاتی.**

٣٥٣٠ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي). [خ٦١٧٩/ م٢٢٥٠].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە نەبێژیت لەشێ من یێ خەبیس بووی[1]، بەلێ بلا بێژیت: لەشێ من یێ لەقس بووی)[2].**

٣٥٣١ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِذَا قَالَ الرَّجُلُ: هَلَكَ النَّاسُ، فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ). [م٢٦٢٣].

قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: لاَ أَدْرِي، أَهْلَكَهُمْ بِالنَّصْبِ، أَوْ أَهْلَكُهُمْ بِالرَّفْعِ.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەكە زەلامی (ژ خۆرازیبوون و ب خۆشاییبوون) گۆت: خەلك د هیلاك چۆ، ئەو پتر ژ هەمیان یێ د هیلاك چۆییە)[3].**

**ئەبو ئیسحاق دبێژیت: نزام (أَهْلَكَهُمْ) ب فەتحا ل سەر كافێ یان (أَهْلَكُهُمْ) ب (ضمة)یا ل سەر كافێ[1].**

(١) ئانكو: گران بوویی.

(٢) هەردو پەیڤ ئێك رامانن، ئانكو: یێ گران بووی، بەلێ یا ئێكێ یا كرێتە و یا دووێ جوانترە، و ڤێرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مە ئاراستەی هندێ دكەت ئەم پەیڤا جوانتر ژێ بگرین.

(٣) ئیمامێ نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: ئەڤ نەهیە بۆ وییە یێ ژ خۆ شاهی و ژ خۆ رازی، و خەلكی كێم دانیت، و خۆ ل سەر وان بلند بكەت، ئەڤە یا حەرامە، بەلێ ئەوێ ژ بەر ئەو كێماتییا ل دەڤ خەلكێ د كارێ دینێ واندا دبینیت، و خەمكەفتن ل سەر وان و ل سەر دینی بێژیت چو تێدا نینە، هۆسا زانایان یا راڤەكری و درێژی داییێ، و ژ ئیمامێت ناڤدار یێت ئەڤە گۆتی: مالكێ كورێ ئەنەسییە و خەتتابییە و حومەیدییە و هندەكێت دی.

٣٥٣٢ – (م) عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (**لاَ تَقُولُوا: الْكَرْمُ. وَلَكِنْ قُولُوا: الْعِنَبُ وَالْحَبَلَةُ**). [م٢٢٤٨].

**ژ عەلقەمەیێ كوڕێ وائلی ژ بابێ خۆ (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەبێژنە تری كەرەم، بەلێ بێژن: تری و دارا تری (مێو))[٢].**

٣٥٣٣ – عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ لِأَبِي عَبْدِ اللهِ. أَوْ قَالَ أَبُو عَبْدِ اللهِ لِأَبِي مَسْعُودٍ.: مَا سَمِعْتَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ فِي«زَعَمُوا»، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**بِئْسَ مَطِيَّةُ الرَّجُلِ: زَعَمُوا**).

قال أبو داود: أبو عبد الله هذا: حذيفة. [د٤٩٧٢].

* صحيح.

**ژ ئەبی قیلابەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەبو مەسعودی گۆتە ئەبو عەبدوللایی یان ئەبو عەبدوللایی گۆتە ئەبو مەسعودی تە چ ژ پێغەمبەری (ﷺ) گوه لێ بوو یە د دەر حەقێ (وان دگۆت) گۆتییە؟ گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: ( خرابترین دەوارێ زەلامی ئەوە بێژیت وان گۆت)[٣].**

## ٨ ـ باب: التشدق في الكلام

## بابەتێ: دەڤ پەحنییێ (دەڤ تژیاتی د ئاخفتنێدا ژ خۆمەزنكرن).

٣٥٣٤ – عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ اللهَ يَبْغَضُ الْبَلِيغَ مِنَ الرِّجَالِ الَّذِي يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ، كَمَا تَتَخَلَّلُ الْبَقَرَةُ**). زاد أبو داود: (**بِلِسَانِهَا**). [د٥٠٠٥/ ت٢٨٥٣].

---

**(١) ئەگەر (أَهْلَكَهُمْ) ب فەتحێ بیت رامان ئەوە: وی ئەو ژ ناڤ برن و ئەگەر (أَهْلَكُهُمْ) ب زەممێ بیت رامان ئەوە: ئەو پتری هەمیان یێ ژ ناڤ چۆیە.**

**(٢) ئیمامێ نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: زانا دبێژن: ئەهیا وان هاتە كرن ئەو بێژنە تری كەرەم، چونكی عەرەبان د جاهلییەتێدا دگۆتە عەرەقێ كەرەم، ئێك: چونكی ژ تری كو كەرەمە چێ دبیت، دو: چونكی نیشان ددانا سەر كەرەم و مەردینییا زەلامی، و دا ئەڤ ناڤە بیرا وان نەئینیتە عەرەقێ و دا بۆ وان دیار كەت چو مەردینی و كەرەم تێدا نینە ئەهیا وان هاتە كرن بێژنە تری كەرەم.**

**(٣) پێغەمبەر (ﷺ) بەرێ مە ددەتە هندێ ئەم ئاخفتنێ نەڤەگوهێزین ئەگەر ئەم ژێ پشتراست نەبین و خودانێ ئاخفتنێ یێ باوەرپێكری نەبیت و ئەو ئاخفتن گرێدایی دنیایێ بیت یان ئاخرەتێ نابیت ئەم بێژین گۆتۆی گۆت و بێ پشتراستی و بنەجهی.**

* صحيح.

ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودێ حەژ وی زەلامی ناكەت یێ كۆتەكییێ د ئاخفتنا خۆدا دكەت ئەوێ ئاخفتنا خۆ ب ئەزمانێ خۆ ڤەدجویت هەروەكی چێل ئالفی ڤەدجویت).**

ئەبو داوودی زێدەكرییە: **(ب ئەزمانێ خۆ).**

٩ ـ باب: التفاخر بالأحساب

**بابەتێ: خۆمەزنكرن سەر ئێكدو ب بنەمالییێ.**

٣٥٣٥ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ اللهَ عزّ وجل قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ، وَفَخْرَهَا بِالْآبَاءِ، مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ، وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ ، أَنْتُمْ بَنُو آدَمَ، وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ، لَيَدَعَنَّ رِجَالٌ فَخْرَهُمْ بِأَقْوَامٍ، إِنَّمَا هُمْ فَحْمٌ مِنْ فَحْمِ جَهَنَّمَ، أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللهِ مِنَ الْجِعْلَانِ الَّتِي تَدْفَعُ بِأَنْفِهَا النَّتِنَ).** [د٥١١٦/ ت٣٩٥٥، ٣٩٥٦].

* حسن الإسناد.

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی خودایێ هەر ب هێز و مەزن خۆمەزنكرنا نەزانینێ و خۆمەزنكرنا ب باب و باپیران یا ژ سەر هەوە راكری، باوەردارەكی پارێزكارە، یان گو نەهكارەكێ خرا بە[1]، هوین دوپ ندەها ئادەمینە و ئادەم ژی ژ ئاخێیە، ب سویند هندە كەس خۆمەزنكرنا خۆ ب هندەكان دێ هێلن ب راستی ئەو رەژوییەكن ژ رەژوییێت جەهنەمێ، یان ئەو دێ ل دەڤ خودێ سڤكتر بن ژ وان كێزگولۆلكان ئەوێت پیساتییێ ب دفنا خۆ پالددەن).**

٣٥٣٦ – عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ تَفْتَخِرُوا بِآبَائِكُمُ الذِينَ مَاتُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَمَا يُدَهْدِهُ الْجُعَلُ بِمَنْخَرَيْهِ خَيْرٌ مِنْ آبَائِكُمُ الذِينَ مَاتُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ).** [حم٢٧٣٩].

* إسناده صحيح.

---

(١) ئانكو: ترازییا بهایی د ئیسلامەتییێدا تەقوادارییە یان مرۆڤەكێ تەقوادارە ئەو ل دەڤ خودێ یێ ب بهایە یان گونەهكارەكێ خراب و وی بهایێ خۆ ل دەڤ خودێ نینە.

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خۆ ب باب و باپیرێت خۆ ئەوێت د نەزانینێدا مرین مەزن نەکەن، ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ئەو تشتی کێز ب دفنا خۆ گولۆل دکەت و دخرپینیت، چێترە ژ باب و باپیرێت هەوە یێت د نەزانینێدا مرین).**

١٠ ـ باب: ما جاء بشأن السيد

**بابەتێ: ئەوا د راستا سەرداریدا هاتی.**

٣٥٣٧ – عَنْ بُرَيْدَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(لاَ تَقُولُوا لِلْمُنَافِقِ: سَيِّدٌ، فَإِنَّهُ إِنْ يَكُ سَيِّداً؛ فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ عزّ وجل ).** [د٤٩٧٧].

* صحيح.

ژ بورەیدەی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(نەبێژنە دوڕوی سەردار و مەزن، هەکە ئەو مەزنێ تە بیت، هەوە خودێ ژ خۆ نەرازی کر).**

١١ ـ باب: لا يقل: تعس الشيطان

**بابەتێ: نەبێژە: شەیتان ژ ناڤ چۆ.**

٣٥٣٨ – عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ رَجُلٍ قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَعَثَرَتْ دَابَّتُهُ، فَقُلْتُ: تَعِسَ الشَّيْطَانُ، فَقَالَ: **(لاَ تَقُلْ: تَعِسَ الشَّيْطَانُ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ، تَعَاظَمَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الْبَيْتِ، وَيَقُولُ: بِقُوَّتِي، وَلَكِنْ قُلْ: بِاسْمِ اللهِ، فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ تَصَاغَرَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الذُّبَابِ).** [د٤٩٨٢].

* صحيح.

ژ ئەبی مەلیحی (رضي الله عنه) ژ زەلامەکی گۆت: ئەز پشت پێغەمبەری سویار بووم، ئینا دەوارێ وی هەلنگفت، ئینا من گۆت: شەیتان د هیلاك چۆ، ئینا گۆت: نەبێژە: **(شەیتان د هیلاك چۆ، چونکی ب راستی ئەگەر تو وەبێژی، مەزن دبیت هەتا وەکی خانییەکی لێ دهێت و دبێژیت: ب هێزا من[1]، بەلێ بێژە: ب ناڤێ خودێ، ب راستی ئەگەر تە ئەو گۆت، دێ بچویك بیت، هەتا وەکی مێشێ لێ دهێت).**

(١) ئانکو: ب هێزا خۆ من ئەو کار کر.

## ١٢ ـ باب: اللعب بالبنات

## بابەتێ: یاریکرن ب بویکان (لەعبیکان).

٣٥٣٩ – عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ . أَوْ خَيْبَرَ . وَفِي سَهْوَتِهَا سِتْرٌ، فَهَبَّتْ رِيحٌ، فَكَشَفَتْ نَاحِيَةَ السِّتْرِ عَنْ بَنَاتٍ لِعَائِشَةَ لُعَبٍ، فَقَالَ: (**مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ**) ؟ قَالَتْ: بَنَاتِي، وَرَأَى بَيْنَهُنَّ فَرَساً لَهَا جَنَاحَانِ مِنْ رِقَاعٍ، فَقَالَ: (**مَا هَذَا الَّذِي أَرَى وَسْطَهُنَّ**) ؟ قَالَتْ: فَرَسٌ، قَالَ: (**وَمَا هَذَا الَّذِي عَلَيْهِ**) ؟ قَالَتْ: جَنَاحَانِ، قَالَ: (**فَرَسٌ لَهُ جَنَاحَانِ**) ؟ قَالَتْ: أَمَا سَمِعْتَ أَنَّ لِسُلَيْمَانَ خَيْلاً لَهَا أَجْنِحَةٌ؟ قَالَتْ: فَضَحِكَ حَتَّى رَأَيْتُ نَوَاجِذَهُ. [د٤٩٣٢].

* صحيح.

[وانظر: اللعب بالأرجوحة ٣٦١٠].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ خەزایا تەبووکێ ـ یان یا خەیبەرێ ـ زڤری، و پێشیا مالێ پەردەك هەبوو، ئینا بایەك هات و پەردە ژ سەر بویکان راکر، یاریکێت عائیشایێ بوون، ئینا گۆت: (ئەڤە چییە ئەی عائیشا) گۆت: بویکێت منن و هەسپەك د ناڤبەرا واندا دیت دو چەنگ ژ چەرمی هەبوون، ئینا گۆت: (و ئەڤێ د نیڤا واندا چییە). گۆت: هەسپە، گۆت: (و ئەڤە چییە ل سەر)؟ گۆت: دو چەنگن گۆت: (هەسپ و دو چەنگ هەبن)؟ ئینا وێ گۆت: ما تە گوه لێ نەبوویە سولەیمانی هەسپێت ب چەنگ هەبوون؟ گۆت: ئینا کرە کەنی هەتا من ددانێت وی یێت بەرێ دەڤێ وی دیتین.**

## ١٣ ـ باب: اللعب بالحمام

## بابەتێ: یاریکرن ب کۆتران.

٣٥٤٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَأَى رَجُلاً يَتْبَعُ حَمَامَةً، فَقَالَ: (**شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانَةً**). [د٤٩٤٠/ جه٣٧٦٥]

* حسن صحيح.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەلامەك دیت یێ ب دویڤ کۆترەکێ کەفتی، ئینا گۆت: (شەیتانەکە ب دویڤ شەیتانەکێ کەفتی)[1].**

---

(١) پێغەمبەری (ﷺ) ئەو زەلام شەیتان دانا، چونکی دەمێ خۆ ب تشتێ بێ مفاڤە دبەت و دویڤ تشتێ باش و راست ناچیت، و کۆتر ژی شەیتان دانا، چونکی ئەو مژویل کر و هەر تشتێ مرۆڤی ژ حەقییێ مژویل بکەت ئەو شەیتانە.

١ ـ باب: ذكر آدم عليه السلام

**بابەتێ: بەحسێ ئادەمی (سلاڤ ل سەر بن)**

٣٥٤١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (**خَلَقَ اللهُ آدَمَ وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعاً، ثُمَّ قالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولئِكَ مِنَ المَلاَئِكَةِ، فَاسْتَمِعْ ما يُحَيُّونَكَ، تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ، فَزَادُوهُ: وَرَحْمَةُ اللهِ. فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلِ الجَنَّةَ عَلَى صَوَرةِ آدَمَ، فَلَمْ يَزَلِ الخَلْقُ يَنْقُصُ حَتَّى الآنَ**). [خ٣٣٢٦/ م٢٨٤١]

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خودێ ئادەم چێ كر و درێژییا وی شێست گەز بوو، پاشی گۆت؛ هەرە سلاڤ بكە سەر ڤان ملیاكەتان و گوهێ خۆ بدەیێ بزانە چاوا دێ بەرسڤا تە دەن، ئەو سلاڤا تە یە و سلاڤا دویندەها تە یە، ئینا گۆت؛ (السَّلاَمُ عَلَيْكُم) گۆتن؛ (السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللهِ) و (وَرَحْمَةُ اللهِ) بۆ زێدە كرن، ڤێجا كەسێ د چیتە بەحەشتێ دێ ل سەر رەنگێ ئادەمی چیت، و بەردەوام هەتا ڤێ گاڤێ مرۆڤ كێم دكەن).**

٢ ـ باب: ذكر ثمود قوم صالح عليه السلام

**بابەتێ: بەحسێ سەموود ملەتێ سالح (سلاڤ ل سەر بن).**

٣٥٤٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمَّا مَرَّ بَالْحِجْرِ قالَ: (**لاَ تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَموا، إِلاَّ أَن تَكُونُوا بَاكِينَ، أَنْ يُصِيبَكُمْ ما أَصَابَهُمْ**). ثمَّ تَقَنَّعَ بِرِدَائِهِ وَهُوَ عَلَى الرَّحْلِ. [خ٣٣٨٠ (٤٣٣)/ م٢٩٨٠].

ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری، ( خودێ ژ هەردووان رازی ب یت)، گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر حیجرێرا بۆری گۆت: **(نەچنە جهێت وان یێت ستەم ل خۆ كرین ژ بلی كو هوین ب گری بن، دا یا ب سەرێ وان هاتی ب سەرێ هەوە نەهێت)،** پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرێ خۆ نخافت و ئەو ل سەر حێشترێ بوو.

٣ ـ باب: ذكر إبراهيم عليه السلام

**بابەتێ: بەحسێ ئیبراهیم (سلاڤ ل سەر بن).**

٣٥٤٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أن رسول الله (ﷺ) قالَ: (**لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ عليه السلام إِلاَّ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ: ثِنْتَيْنِ مِنْهُنَّ فِي ذاتِ اللهِ عزّ وجل: قَوْلُهُ:** ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ [الصافات:٨٩]

، وَقَوْلُهُ: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَـٰذَا﴾[الأنبياء:٦٣] . وَقَالَ: بَيْنَا هُوَ ذَاتَ يَوْمٍ وَسَارَةُ، إِذْ أَتَى عَلَى جَبَّارٍ مِنَ الجَبَابِرَةِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ هَاهنَا رَجُلاً مَعَهُ امْرَأَةٌ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَسَأَلَهُ عَنْهَا، فَقَالَ: مَنْ هذِهِ؟ قَالَ: أُخْتِي. فَأَتَى سَارَةَ فَقَالَ: يَا سَارَةُ لَيْسَ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ مُؤْمِنٌ غَيْرِي وَغَيْرُكِ، وَإِنَّ هَذَا سَأَلَنِي، فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّكِ أُخْتِي، فَلاَ تُكَذِّبِينِي. فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ، ذَهَبَ يَتَنَاوَلُهَا بِيَدِهِ، فَأُخِذَ، فَقَالَ: ادْعِي اللهَ وَلاَ أَضُرُّكِ، فَدَعَتِ اللهَ فَأُطْلِقَ. ثُمَّ تَنَاوَلَهَا الثَّانِيَةَ فَأُخِذَ مِثْلَهَا أَوْ أَشَدَّ، فَقَالَ: ادْعِي اللهَ لِي وَلاَ أَضُرُكِ، فَدَعَتْ فَأُطْلِقَ. فَدَعَا بَعْضَ حَجَبَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّكُمْ لَمْ تَأْتُونِي بِإِنْسَانٍ، إِنَّمَا أَتَيْتُمُونِي بِشَيْطَانٍ، فَأَخْدَمَهَا هَاجَرَ. فَأَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي، فَأَوْمأَ بِيَدِهِ: مَهْيَا ، قالَتْ: رَدَّ اللهُ كَيْدَ الْكَافِرِ ـ أَوِ الْفَاجِرِ ـ فِي نَحْرِهِ، وَأَخْدَمَ هَاجَرَ).

قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: تِلْكَ أُمُّكُمْ، يَا بَنِي ماءِ السَّمَاءِ. [خ٣٣٥٨ (٢٢١٧)/ م٢٣٧١].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئیبراهیمی درەو نەكرییە سێ درەو نەبن[1]، دو بۆ خودایێ هەر ب هێز و مەزن كرن گۆتنا خودێ: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ و گۆتنا وی: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾[2] و گۆت: رۆژەكێ ئەو و سارە هاتنە دەڤ زۆردارەكی ژ زۆرداران، گۆتنە وی: ل ڤێرێ زەلا مەكی ژ نەكا د گەل هەی ژ جوانترین ژنا نە، ئینا ڤرێكرە دویڤرا و پرسیارا وێ ژێ كر، گۆت: ئەڤە كییە؟ گۆت: ئەو خویشكا منە[3]، هاتە دەڤ سارایێ و گۆت: ئەی سارە ل سەر روییێ ڤی عەردی كەس باوەریدار نینە ئەز و تو نەبین، و ڤی (زۆرداری) پرسیارا تە ژ من كر، من گۆتێ تو خویشكا منی، ڤێجا من درەوین دەرنەئێخە، ڤرێكرە دویڤرا، ڤێجا دەمێ چۆیە دەڤ چۆ دا دەستێ خۆ بكەتێ، بێهنا وی هاتە تەنككرن، ئینا گۆت: دوعا ژ خودێ بكە و ئەز زیانێ ناگەهینمە تە، دوعا**

---

(١) پێغەمبەری (ﷺ) ناڤێ درەوێ دانا سەر ڤان و ئەو ب خۆ د راستییا خۆدا نەدرەوون و ب درەو ناڤ كرن، چونكی یێ گوهـ لێ ببیت دێ هزر كەت درەوە، و د بنەكۆكا خۆدا وەسا نینە بەلكی ئەو ژ رامانهەلگرانە درەوە و نەدرەوە.

(٢) دەمێ ئیراهیمی (ﷺ) ڤیایی بوتێت وان بشكێنیت خۆ ژ وان ڤەهێلا ب هێجەتا هندێ یێ نەساخە دا ب تنێ بمینیت و بشێت بوتێت وان تێك بشكێنیت، و ئەو هەمی شكاندن یێ ژ هەمیان مەزنتر نەبیت، و دەمێ ڤەگەریاین پرسیارا وی كرن كێ ئەڤ كارە كرییە؟ گۆتە وان: مەزنێ وان ڤی یا وەكری.

(٣) مەبەستا وی خویشكا باوەرییێ و دینییە.

**كرن ئینا بێهنا وی هاتە بەردان، پاشی كار كر بۆ جارا دووێ دەستێ خۆ بكەتێ، بێهنا وی هەر وەكی جارا ئێكێ بەلكی دژوارتر هاتە تەنگكرن، ئینا گۆت: بۆ من دوعا ژ خودێ بكە و ئەز زیانێ ناگەهینمە تە، ئینا دوعا كرن و بێهنا وی هاتە بەردان، ئینا گازی هندەك دەرگەهڤانێت خۆ كر و گۆت: هەوە مرۆڤەك بۆ من نەئینایە بەلكی هەوە شەیتانەكا بۆ من ئینای، هاجەر بۆ كرە خزمەتكار، و سارە هاتە دەڤ ئیبراهیمی و وی نڤێژ دكر، ب دەستی نیشان كر چ چێ بوو؟ گۆت: سارایێ گۆت: خودێ پیلانا گاوری یان یا خرابكاری د سەرێ ویدا شكاند و هاجەر كرە خزمەتكار).**

٣٥٤٤ - (ق) وَعَنْهُ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: (**نَحْنُ أَحَقُّ بالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ إِذْ قالَ:** ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾[البقرة: ٢٦٠]. وَيَرْحَمُ اللهُ لُوطاً، لَقَدْ كانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ. وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ طُولَ ما لَبِثَ يُوسُفُ، لأَجَبْتُ الدَّاعِيَ). [خ٣٣٧٢/ م١٥١].

**و ژ وی (ﷺ) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەم ژ ئیبراهیمی ب گۆمانێ هەژیترین[١]، دەمی گۆتی: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ و خودێ دلۆڤانییێ ب (لوط) پێغەمبەر ببەت وی پشتەڤانێ ب هێز هەبوو[٢]، و ئەگەر ئەو دەمێ درێژ یێ یووسف د زیندانێدا مایی ئەز مابامە دا ئێكسەر بەرسڤا هنارتی دەم)[٣].**

---

(١) مەبەستا پێغەمبەری (ﷺ) شك و گۆمانێ ژ ئیبراهیمی دویر بێخیت و ڤیا بێژیت هزرا شكێ و گۆمانێ ژ ئیبراهیمی نەبەن ژ بەر داخوازییا وی.

(٢) مەبەستا پێغەمبەری (ﷺ) ئەوە دیار بكەت (لوط) پێغەمبەری (ﷺ) پشتبەستن ب خودێ ژبیر نەكربوو دەمێ گۆتی : ﴿لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ ئانكو: خۆزی من هێزەك هەبایە، یان ژی من پشتەڤانەكێ ب هێز هەبایە، هوین دا بینن كا ئەز دا چاوا هەوە پاشڤە بەم، بەلێ مەبەستا وی ئەوە رێكان بگریت ئەو رێكێت د دنیاییێدا وان پاشڤە ببەت، ئانكو: (الاخذ بالاسباب).

(٣) ئانكو: ئەوێ دهات داخوازا وی بۆ دەڤ مەلكی كری من هند خۆ نەدگرت وەكی یووسفی كری و گۆتێ: ئەز نادەركەڤم و بزڤرە دەڤ خوندكارێ خۆ، و بێژێ و پرسیارێ ژێ بكە وان ژنان چ بوو ئەوێت دەستێت خۆ

٣٥٤٥ - (خ) وَعَنْهُ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (يَلْقَى إِبْرَاهِيمُ أَبَاهُ آزَرَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَعَلَى وَجِهِ آزَرَ قَتَرَةٌ وَغَبَرَةٌ، فَيَقُولُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ: أَلَمْ أَقُلْ لَكَ لاَ تَعْصِنِي؟! فَيَقُولُ أَبُوهُ: فَالْيَوْمَ لاَ أَعْصِيكَ، فَيَقُولُ إِبْرَاهِيمُ: يَا رَبِّ إِنَّكَ وَعَدْتَنِي أَنْ لاَ تُخْزِيَنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ، فَأَيُّ خِزْيٍ أَخْزَى مِنْ أَبِي الأَبْعَدِ؟ فَيَقُولُ اللهُ تَعَالَى: إِنِّي حَرَّمْتُ الجَنَّةَ عَلَى الْكَافِرِينَ. ثُمَّ يُقَالُ: يَا إِبْرَاهِيمُ ما تَحْتَ رِجْلَيْكَ؟ فَيَنْظُرُ، فَإِذَا هوَ بِذِيخٍ مُلْتَطِخٍ، فَيُؤْخَذُ بِقَوَائِمِهِ، فَيُلْقَى فِي النَّارِ). [خ٣٣٥٠].

و ژ وی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئیبراهیم بابێ خۆ ئازەری رۆژا قیامەتێ دێ بینیت و تەنی و تۆز یا ب ناڤچاڤێت ویڤە، ئیبراهیم دێ بێژیتێ: ما من نەگۆتبوو تە نەگوهدارییا من نەكە؟! بابێ وی دێ بێژیتێ: ئەڤرۆ ئەز نەگوهدارییا تە ناكەم، ئیبراهیم دێ بێژیت: ئەی خودایێ من تە ژڤان دابوو من تو رۆژا زیندیكرنێ من شەرمزار نەكەی، كا چ شەرمزاری ژ شەرمزارییا بابەكێ دویرئێحستی ژ دلۆڤانییا خودێ مەزنتر هە یە؟! خودایێ بلند دێ بێژیت: ب راستی من بەحشت یا ل گاوران حەرام كری، پاشی دێ هێتە گۆتن: ئەی ئیبراهیم ئەو چییە ل بن پێت تە؟ دێ بەرێ خۆ دەتێ، دێ نێرە حەفتیارەكێ ب خوینێ یان ب پیساتییێ وەریایی بینیت، ڤێجا دێ دەست و پێت وی گریت و هاڤێژیتە د ئاگریدا).**

٣٥٤٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قال: لَمَّا كانَ بَيْنَ إِبْرَاهِيمَ وَبَيْنَ أَهْلِهِ ما كَانَ، خَرَجَ بِإِسْمَاعِيلَ وَأُمِّ إِسْمَاعِيلَ، وَمَعَهُمْ شَنَّةٌ فِيهَا ماءٌ، فَجَعَلَتْ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ تَشْرَبُ مِنَ الشَّنَّةِ، فَيَدِرُّ لَبَنُهَا عَلَى صَبِيِّهَا، حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ فَوَضَعَهَا تَحْتَ دَوْحَةٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِبْرَاهِيمُ إِلَى أَهْلِهِ، فَاتَّبَعَتْهُ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ، حَتَّى لَمَّا بَلَغُوا كَدَاءً نَادَتْهُ مِنْ وَرَائِهِ: يَا إِبْرَاهِيمُ إِلَى مَنْ تَتْرُكُنَا؟ قالَ: إِلَى اللهِ، قالَتْ: رَضِيتُ بِاللهِ.[خ٣٣٦٥].

**ژ ئیبن عەباس (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ ئەو چێ بووی یا د ناڤبەرا ئیبراهیمی و هەڤژینا ویدا چێ بووی[1]، ئیبراهیمی ئیسماعیل و دایكا ئیسماعیلی برن، و كونكەكێ ئاڤێ د گەل وان بوو، دایكا ئیسماعیلی ژێ ڤەدخوار و شیرێ وێ زێدە دبوو بۆ**

---

برین؟ ب راستی خودایێ من ئاگەهـ ژ ڤندوڤێلێت وان هەیە. و مەبەستا پێغەمبەری (ﷺ) دیاركرنا بێنفرەهییا مەزنە یا یووسفی (سلاڤ ل سەر بن).

(١) مەبەست دەمێ هاجەرێ ئیسماعیل بوویی، سارە ب خەم كەفت و ژێ دلگران بوو، چونكی هاجەر خزمەتكارا وێ بوو، و وێ ب دیاری دابوو ئیبراهیمی (سلاڤ ل سەر بن) و ئەو بوو دایكا عەیالێ وی و ئەو بێ عەیال ما.

**كوڕێ وێ هەتا هاتینە مەكەهێ، دانا بن دارەكێ، پاشی ئیبراهیم زڤریڤە دەڤ مالا خۆ، دایكا ئیسماعیلی دویڤڕا چۆ هەتا گەهشتییە كەدائێ ژ پشتێڤە گازی كرێ: یا ئیبراهیم تو دێ مە بۆ كێ هێلی؟ گۆت: بۆ خودێ. گۆت ئەز ب خودێ رازیمە.**

٣٥٤٧ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا خَيْرَ الْبَرِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (ذَاكَ إِبْرَاهِيمُ عليه السلام). [م٢٣٦٩].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ئەی باشترینێ چێكرییان، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەو ئیبراهیمە سلاڤ ل سەر بن)[1].**

## ٤ . باب: ذكر يوسف عليه السلام

## بەحسێ یووسفی سلاڤ ل سەر بن.

٣٥٤٨ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**الْكَرِيمُ ابْنُ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ، يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ عليهم السلام**). [خ٣٣٨٢].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (پیرۆزێ كوڕێ پیرۆزێ كوڕێ پیرۆزی یووسفێ كوڕێ یەعقوبێ كوڕێ ئیسحاقێ كوڕێ ئیبراهیمی).**

## ٥ . باب: ذكر موسى عليه السلام

## بابەتێ: بەحسێ مووسایی سلاڤ ل سەر بن.

٣٥٤٩ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) جَالِسٌ جَاءَ يَهُودِيٌّ، فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، ضَرَبَ وَجْهِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِكَ، فَقَالَ: (**مَنْ**) ؟ قَالَ: رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: (**ادْعُوهُ**). فَقَالَ: (**أَضَرَبْتَهُ**) ؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ بِالسُّوقِ يَحْلِفُ: وَالَّذِي اصْطَفَى مُوسَى عَلَى الْبَشَرِ، قُلْتُ: أَيْ خَبِيثُ! عَلَى مُحَمَّدٍ (ﷺ)؟ فَأَخَذَتْنِي غَضْبَةٌ ضَرَبْتُ وَجْهَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ تُخَيِّرُوا بَيْنَ الأَنْبِيَاءِ، فَإِنَّ النَّاسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ، فَإِذَا أَنَا بِمُوسَى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ الْعَرْشِ، فَلاَ أَدْرِي أَكَانَ فِيمَنْ صَعِقَ، أَمْ حُوسِبَ بِصَعْقَةِ الأُولَى؟**). [خ٢٤١٢/ م٢٣٧٤].

---

(١) پێغەمبەری (ﷺ) تەوازع و خۆشكاندن بۆ خودێ هەلبژارت و گۆت باشترین چێكرییێ خودێ ئیبراهیمە، ئەگەر وەكی دی ئەو باشترین چێكرییێت خودێیە.

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ روینشتی بوو، جوهییەك هاتە دەڤ، گۆت: ئەی بابێ قاسمی، زەلامەكێ هەڤالێ تە دربەك دانا ناڤچاڤێت من، ئینا گۆت: **(كێ)؟** گۆت: زەلامەكی ژ ئەنساران، گۆت: **(كا گازیكەنێ)** ئینا گۆت: **(ئەرێ تە دانایێ)؟** گۆت: من گوهـ لێ بوو ل سویكێ سویند دخوار: ئەز ب وی كەمە یێ مووسا ل سەر مرۆڤان هەلبژارتی، من گۆت هەی پیس ب سەر موحەممەدی ژی (ﷺ) و تورەبوونەكێ ئەز گرتم و من دربەك ل ناڤچاڤێت وی دا، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هەلبژاتنێ د ناڤبەرا پێغەمبەراندا نەكەن، رۆژا قیامەتێ خەلك دێ مرن، ئەز یێ ئێكێ مە عەرد بۆ ددەرزیت، دێ مووسایی بینم دەستێ خۆ یێ هاڤێتیە پێپكەكی ژ پێپكێت عەرشی، ڤێجا ئەز نوزانم ئەو ژ وانە یێت مرین، یان مرنا ئێكێ بۆ هاتییە هژمارتن)**[1].

٣٥٥٠ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا: واللهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا؛ إِلاَّ أَنَّهُ آدَرُ. فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ، فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ، فَخَرَجَ مُوسَى فِي إِثْرِهِ، يَقُولُ: ثَوْبِي يَا حَجَرُ، حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى مُوسَى، فَقَالُوا: وَاللهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ. وَأَخَذَ ثَوْبَهُ، فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْباً). فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللهِ إِنَّهُ لَنَدَبٌ بِالْحَجَرِ، سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ، ضَرْباً بِالْحَجَرِ. [خ٢٧٨/ م٣٣٩].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئیسرائیلییان رو یس خۆ دشویشتن، و هندەكان بەرێ خۆ ددا هندەكێت دی، و مووسایی ب تنێ خۆ دشویشت، ئینا گۆتن: سویند ب خودێ چو ناهێلیت مووسا د گەل هەوە خۆ بشۆت ئەو نەبیت یێ رتلۆییە، جارەكێ چۆ خۆ بشۆت و جلكێت خۆ دانانە سەر بەرەكی، ئینا بەر ب جلكێ ڤیڤە رەڤی، و مووسا دویڤرا چۆ و دگۆت: جلكێت من ئەی بەرۆ، هەتا بەنی ئیسرائیلییان بەرێ خۆ دایە مووسای، گۆت: ب خودێ چو كێماسی ل دەڤ مووسای نینن، و جلكێ خۆ هەلگرت و دەست ب لێدانا بەری كر)**. ئەبو هورەیرە گۆت: سویند ب خودێ چەند شوین دربەك ل بەری بوون شەش یان حەفت ژ لێدانا بەری.

---

(١) پێغەمبەر (ﷺ) ل ڤێرێ بها و قەدرێ مووسایی دیار دكەت ب وێ: نان ئەو بەری پێغەمبەری ساخ بوویە یان پڤا ئێكێ ل بووقێ ئەو نەمرییە و مرنا وی بەس مرنا ئێكێ بوو د دنیایێدا.

٣٥٥١ - (ق) وَعَنْهُ رضي الله عنه قَالَ: أُرْسِلَ مَلَكُ المَوْتِ إِلَى مُوسى عليهما السلام، فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ، فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ، فَقَالَ: أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لاَ يُرِيدُ المَوْتَ، فَرَدَّ اللهُ عَلَيْهِ عَيْنَهُ، وَقَالَ: ارْجِعْ، فَقُلْ لَهُ يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِكُلِّ ما غَطَّتْ بِهِ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ. قَالَ: أَيْ رَبِّ، ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ المَوْتُ. قَالَ: فَالآنَ. فَسَأَلَ اللهَ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الأَرْضِ المَقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ لأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ، إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ، عِنْدَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ). [خ١٣٣٩/ م٢٣٧٢]

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: ملیاكەتێ مرنێ بۆ مووسایی هاتە هنارتن، ڤێجا دەمێ هاتییە دەڤ لاتمەك دانایێ (چاڤێ وی پەقاند و ئینا دەر) ئینا زڤری دەڤ خودایێ خۆ و گۆت: تە ئەز یێ هنارتیمە دەڤ زەلامەكی مرن نەڤێت، خودێ چاڤێ وی بۆ زڤراندەڤە و گۆت: بزڤرەڤە و بێژە وی: بلا دەستێ خۆ دانیتە سەر پشتا گایەكی بۆ وی هندی دەستێ وی گرتی ب هەر موییەكی سالەك، ئینا گۆت: ئەی خودایێ من پاشی چ؟ گۆت: پاشی مرن، گۆت: مادەم وەسایە بلا ڤێ گاڤێ بیت، و داخواز ژ خودێ كر وی تەمەت هاڤێتنا بەرەكی نێزیكی عەردێ پیرۆز بكەت، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر ئەز ل وێرێ بام، دا گۆڕێ وی نیشا هەوە دەم، یێ ل رەخێ رێكێ ل دەڤ گرێ خیزێ سۆر).**

٦ - باب: ذكر موسى والخضر عليهما السلام

**بابەتێ: بەحسێ مووسای و خدری سلاڤ ل سەر وان بن.**

٣٥٥٢ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: إِنَّ نَوْفاً الْبِكَالِيَّ يَزْعُمُ: أَنَّ مُوسى صَاحِبَ الخَضِرِ لَيْسَ هُوَ مُوسى بَنِي إِسْرَائِيلَ، إِنَّمَا هُوَ مُوسى آخَرُ، فَقَالَ: كَذَبَ عَدُوُّ اللهِ، حَدَّثَنَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): **(أَن مُوسى قَامَ خَطِيباً فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا، فَعَتَبَ اللهُ عَلَيْهِ، إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَقَالَ لَهُ: بَلَى، لِي عَبْدٌ بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ، قَالَ: أَيْ رَبِّ وَمَنْ لِي بِهِ؟ - وَرُبَّمَا قَالَ سُفْيَانُ: أَيْ رَبِّ وَكَيْفَ لِي بِهِ ؟ - قَالَ: تَأْخُذُ حُوتاً، فَتَجْعَلُهُ فِي مِكْتَلٍ، حَيْثُمَا فَقَدْتَ الحُوتَ فَهْوَ ثَمَّ .**

وذَكَرَ القِصَّةَ كَما وَرَدَتْ في سُورةِ الكَهْفِ. وجَاءَ في آخرِه:

قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**يَرْحَمُ اللهُ مُوسى، لَوْ كانَ صَبَرَ لَقُصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَمْرِهِمَا**).[خ٣٤٠١/ م٢٣٨٠].

ژ سەعیدێ كوڕێ جوبەیری گۆت: من گۆتە ئیبن عەباسی: ب راستی نەوفێ بیكالی دبێژیت: ئەو مووسایێ هەڤالێ خدری نە مووسایێ ئیسرائیلییانە، بەلكی ئەو مووسایەكێ دییە، گۆت: دژمنێ خودێ درەو كر، ئوبەیێ كوڕێ كەعبی بۆ مە بەحس كر ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(مووسا ل ناڤ ئیسرائیلیان رابوو و گۆتار دا، پرسیار ژێ هاتە كرن: كی ژ هەمیان زاناترە؟ ئینا گۆت: ئەز، ئینا خودێ گازندە ل سەر ڤێ ژێ كر، چونكی وی زانین نەزڤراندە وی[1]، ئینا گۆتە وی بەلێ ژ تە زاناتر پێت هەین، ل دەڤ جهێ تێكەلبوونا دو دەریایان من بەندەیەك یێ هەی ژ تە زاناترە، گۆت: ئەی خودایێ من كی هەیە من بگەهینیتە وی؟** ـ دبیت سوفیانی گۆتبیت ـ **ئەی خودایێ من چاوا دێ گەهمە وی؟ گۆت: ماسییەكی دێ هەلگری و كەیە د سەلكەكێدا هەر جهێ تە ئەو بەرزە كر ئەو جهێ وییە).**

و چیرۆكا وی بەحس كر هەروەكی د سۆرەتا كەهفدا هاتی و د دویماهییا وێدا هاتییە.

پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خودێ دلۆڤانییێ ب مووسایی ببەت ئەگەر بێهنا خۆ فرەه كربا دا پتر كاروبارێ وان بۆ مە هێتە گۆتن).**

٣٥٥٣ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّمَا سُمِّي الخَضِرَ لِأَنَّهُ جَلَسَ عَلَى فَرْوَةٍ بَيْضَاءَ، فَإِذَا هِيَ تَهْتَزُّ مِنْ خَلْفِهِ خَضْرَاءَ). [خ٣٤٠٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ب خدر هاتە ناڤكرن چونكی ئەو ل سەر رووییێ عەردەكێ سپی روینشتبوو خوارێ، ئەو ل پشت وی د هەژیا كەسك دبوو).**

٧ ـ باب: ذكر داود وسليمان عليهما السلام

**بابەتێ: بەحسێ داوودی و سولەیمانی سلاڤ ل وان بن.**

٣٥٥٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (كَانَتِ امْرَأَتَانِ مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا، جَاءَ الذِّئْبُ فَذَهَبَ بِابْنِ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَتْ لِصَاحِبَتِهَا: إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ، وقَالَتِ الأُخْرَى: إِنَّمَا ذَهَبَ بِابْنِكِ، فَتَحَاكَمَتَا إِلَى دَاوُدَ عليه السلام فَقَضَى بِهِ لِلْكُبْرَى، فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بنِ

---

(١) ئانكو: بێژیت خودێ دزانیت.

دَاوُدَ عليهما السلام فَأَخْبَرَتَاهُ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِالسِّكِينِ أَشُقُّهُ بَيْنَهُمَا، فَقَالَتِ الصُّغْرَى: لاَ تَفْعَلْ يَرْحَمُكَ اللهُ هُوَ ابْنُهَا، فَقَضَى بِهِ لِلصُّغْرَى). [خ٦٧٦٩ (٣٤٢٧)/ م١٧٢٠].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(دو ژنان كورێت وان د گەل بوون، گورگ هات كورێ ئێكێ ژ وان خوار، ئینا گۆتە هەڤالا خۆ كورێ تە بوو بری، یا دی گۆت: نەخێر كورێ تە بوو بری، حوكمێ خۆ ئینانە دەڤ داوودی (ﷺ) حوكم بۆ یا مەزن ئێخست، دەركەفتن چۆنە دەڤ سولەیمانێ كورێ داوودی (ﷺ) بەحسێ خۆ بۆ كرن، ئینا گۆت: كا كێرێ بۆ من بینن دا د مابەینا واندا لێكڤەكەم، ئینا یا بچویك گۆت: ومنەكە خودێ دلۆڤانییێ ب تە ببەت ئەو كورێ وێیە، ئینا حوكم بۆ یا بچویك ئێخست).**

٣٥٥٥ - (ق) وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ عليهما السلام: لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ بِمَائَةِ امْرَأَةٍ، تَلِدُ كُلُّ امْرَأَةٍ غُلاَماً يُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللهِ، فَقَالَ لَهُ المَلَكُ: قُلْ: إِنْ شَاءَ اللهُ، فَلَمْ يَقُلْ وَنَسِيَ، فَأَطَافَ بِهِنَّ، وَلَمْ تَلِدْ مِنْهُنَّ إِلاَّ امْرَأَةٌ نِصْفَ إِنْسَانٍ. قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (لَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللهُ لَمْ يَحْنَثْ، وَكَانَ أَرْجَى لِحَاجَتِهِ). [خ٥٢٤٢ (٢٨١٩)/ م١٦٥٤].

و ژ وی (ﷺ) گۆت: سولەیمانێ كورێ داوودی سلاڤ ل سەر هەردووان بن، گۆت: **ئەڤ شەڤە دێ ل سەر سەد هەڤژینان گەریێم[١]، هەر ئێكێ ژ وان كورەك ببیت د رێكا خودێدا جیهادێ بكەن، ئینا ملیاكەتی گۆتێ بێژە: ئەگەر خودێ حەز بكەت، نەگۆت و ژبیر كر، ل سەر وان گەریا و كەسێ ژ وان بچویك نەبوو ژنەك ب تنێ تێ نەبیت وێ ژی نیڤ مرۆڤ بوو، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر گۆتبا: خودێ حەز كەت سویند لێ نەدكەفت ئەگەر نەچۆبا دەڤ هەمیان و بۆ هەوجەیی و داخوازییا وی ب هیڤیتر بوو).**

٣٥٥٦ - (خ) وَعَنْهُ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (خُفِّفَ عَلَى دَاوُدَ عليه السلام الْقُرْآنُ، فَكَانَ يَأْمُرُ بِدَوَابِّهِ فَتُسْرَج، فَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ قَبْلَ أَنْ تُسْرَجَ دَوَابُّهُ، وَلاَ يَأْكُلُ إِلاَّ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ). [خ٣٤١٧ (٢٠٧٣)].

[وانظر: ١٣٥٠ في صيام داود وصلاته][٢].

---

(١) نانكو: جمە نڤینا وان.

(٢) ئەڤ زێدەییە د چاپا ئێكێدا نەهاتییە و د مالپەریدا ئینایە.

**و ژ وی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (قور ئان خوا ندن بۆ داوودی هاتبوو ساناهیکرن[1] و فەرمان دكر دەوارێ وی زین بکەن، ڤێجا قورئان دخواند بەری دەوارێ وی هاتبا زینكرن و ژ كارێ دەستێ خۆ نەبا نەدخوار).**

٨ . باب: ذكر أيوب عليه السلام

**بابەتێ: بەحسێ ئەیووبی سلاڤ ل سەر بن.**

٣٥٥٧ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (بَيْنَمَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَاناً، خَرَّ عَلَيْهِ رِجْلُ جَرَادٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ يَحْثِي فِي ثَوْبِهِ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ: يَا أَيُّوبُ أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى؟ قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ، وَلكِنْ لاَ غِنَى لِي عَنْ بَرَكَتِكَ). [خ٣٣٩١ (٢٧٩)].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د دەمەكیدا ئەیووبی (عليه السلام) رویس سەرێ خۆ دشویشت، پێلەك و رەڤدەكا كولیا ژ زێری ل سەر بارین، ئەیووبی دەستهاڤێتێ كۆمكرنە د كراسێ خۆدا، خودایێ وی پێ ب هێز و مەزن گازی كرێ: یا ئەیووب ما من تو بێ منەت نەكربووی ژ تشتێ تو دبینی؟ گۆت: بەلێ ئەز ب هێز و مەزناتییا تە كەمە، بەلێ من بێ منەتی ژ كەرەما تە نینە).**

٩ . باب: ذكر يونس عليه السلام

**بابەتێ: بەحسێ یوونسی سلاڤ ل سەر بن.**

٣٥٥٨ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (لاَ يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ: أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى). وَنَسَبَهُ إِلَى أَبِيهِ. [خ٣٣٩٥/ م٢٣٧٧].

**ژ ئیبن عەبا سی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ناب یت بەندەیەك بێژیت ئەز ژ یوونسێ كورێ مەتی باشترم).**

١٠ . باب: ذكر زكريا عليه السلام

**بابەتێ: بەحسێ زەكەریایی سلاڤ ل سەر بن.**

٣٥٥٩ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (كَانَ زَكَرِيَّاءُ نَجَّاراً). [م٢٣٧٩].

---

**(١) قورئانا هەر پێغەمبەرەكی ئەو كتێبە یا بۆ هاتییە خوارێ، و زەبوور بۆ داوودی هاتبوو خوارێ و هێز دەوارێ وی نەهاتییە زینكرن هەمی زەبوور ل سەرێ وێ هەتا بنێ وێ دخواند.**

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (زەكەریا دارتاش بوو).**

## ١١ ـ باب: ذكر عيسى عليه السلام

**بابەتێ: بەحسێ عیسایی سلاڤ ل سەر بن.**

٣٥٦٠ - (ق) عَنْ عُبَادَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسى عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، والنَّارُ حَقٌّ، أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ عَلَى ما كَانَ مِنَ الْعَمَلِ). [خ٣٤٣٥/ م٢٨].

**ژ عوبادەیێ كورێ سامتی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هەر كەسێ شەهدەیێ بدەت كو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ ب تنێ نەبیت و یێ بێ شریك و بێ هەڤالە و موحەممەد پێغەمبەرێ وییە و بەندەیێ وییە و عیسا بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە و ب پەیڤا خۆ [ببە] چێكرییە[1]، و ئەو جانەكە ژ خودێ. و بەحەشت راستە و جەهنەم راستە[2]، خودێ دێ وی بەتە بەحەشتێ د گەل وی كارێ كری)[3].**

٣٥٦١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (رَأَى عِيسى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلاً يَسْرِقُ، فَقَالَ لَهُ: أَسَرَقْتَ؟ قالَ: كَلا، وَاللهِ الَّذِي لاَ إِلهَ إِلاَّ هُوَ! فَقَالَ عِيسى: آمَنْتُ بِاللهِ، وَكَذَّبْتُ عَيْنِي). [خ٣٤٤٤/ م٢٣٦٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (عیسایێ كورێ مەریەمێ زەلامەك دیت یێ دزییێ دكەت، ئینا گۆتێ: تە دزی كر؟ گۆت: نەخێر ئەز ب خودێ سویند دخۆم یێ چو خودایێت راست و دورست نەی ئەو نەبیت، ئینا عیسایی گۆت: من باوەری ب خودێ ئینا و چاڤێ خۆ درەوین دەرئێخست)[4].**

---

(١) كو ئاراستەی مەریەمێ كربوو.

(٢) ئانكو: یێت سابتن و یێت هەین.

(٣) چ یێ خراب بیت چ یێ باش بیت.

(٤) ئانكو: دبیت وەسا نەبیت وەكی من دیتی، دبیت ئەو تشتێ هەلگرتی یێ وییە، یان خودانی یێ دایێ، یان هەلگرت دا بەرێ خۆ بدەتێ، ئانكو: پشتی سویند خواری ئەو هزرا هەلگرتی ژێ هێلا ژبەر وێ سویندا خواری.

٣٥٦٢ - (ق) وَعَنْهُ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**ما مِنْ بَنِي آدَمَ مَوْلُودٌ إلاَّ يَمَسُّهُ الشَّيْطَانُ حِينَ يُولَدُ، فَيَسْتَهِلُّ صَارِخاً مِنْ مَسِّ الشَّيْطَانِ، غَيْرَ مَرْيَمَ وَابْنِهَا**).

ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ [آل عمران:٣٦].

[خ٣٤٣١ (٣٢٨٦)/ م٢٣٦٦].

**و ژ وی (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (نینە مرۆڤەك ژ دویندەها ئادەمی ژ دایك ببیت ئەگەر شەیتان دەستێ خۆ لێ نەدەت دەمێ دبیت و ژبەر هندێ ب دەنگێ بلند دگریت مەریەم و كورێ وێ نەبن).**

**پاشی ئەبو هورەیرە ئەڤ ئایەتە گۆت: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾[1].**

## ١٢ . باب: المتكلمون في المهد

## بابەتێ: ئەوێت د لاندكێدا ئاخفتین.

٣٥٦٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ إلاَّ ثَلاَثَةٌ: عِيسى.**

**وَكَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: جُرَيْجٌ، كانَ يُصَلِّي، فَجَاءَتْهُ أُمُّهُ فَدَعَتْهُ، فَقَالَ: أُجِيبُهَا أَوْ أُصَلِّي؟ فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى تُرِيَهُ وُجُوهَ الْمُومِسَاتِ، وَكَانَ جُرَيْجٌ فِي صَوْمَعَتِهِ، فَتَعَرَّضَتْ لَهُ امْرَأَةٌ وَكَلَّمَتْهُ فَأَبَى، فَأَتَتْ رَاعِياً فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا، فَوَلَدَتْ غُلاَماً، فَقَالَتْ: مِنْ جُرَيْجٍ، فَأَتَوْهُ، فَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ، وَأَنْزَلُوهُ، وَسَبُّوهُ، فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى، ثُمَّ أَتَى الْغُلاَمَ، فَقَالَ: مَنْ أَبُوكَ يَا غُلاَمُ؟ قَالَ: الرَّاعِي، قالُوا: نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ؟ قَالَ: لاَ، إلاَّ مِنْ طِينٍ.**

**وَكَانَتِ امْرَأَةٌ تُرْضِعُ ابْناً لَهَا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ رَاكِبٌ ذُو شَارَةٍ، فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ، فَتَرَكَ ثَدْيَهَا، وَأَقْبَلَ عَلَى الرَّاكِبِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهَا يَمَصُّهُ . قالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) يَمَصُّ إِصْبَعَهُ . ثُمَّ مُرَّ بِأَمَةٍ، فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هذِهِ، فَتَرَكَ ثَدْيَهَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَقَالَتْ: لِمَ ذَاكَ؟ فَقَالَ: الرَّاكِبُ جَبَّارٌ مِنَ الْجَبَابِرَةِ، وَهذِهِ الأَمَةُ يَقُولُونَ: سَرَقْتِ، زَنَيْتِ، وَلَمْ تَفْعَلْ).** [خ٣٤٣٦ (١٢٠٦)/ م٢٥٥٠].

---

(١) ئایەت بەلگەییە دەمێ مەریەم و عیسا بووین شەیتان نەشیا دەستێ خۆ بگەهینیتە وان ژبەر وێ دوعایا دایكا مەریەمێ كری دەمێ گۆتی: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ و دویندەها مەریەمێ بەس عیسا بوو سلاڤ ل سەر بن.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(كەس د لاندكێدا نەئاخفتیە سێ نەبن: عیسایێ كورێ مەریەمێ و زەلامەكی ژ ئیسرائیلییان دگۆتنێ جورەیج، دەیكا وی هاتە دەڤ، و وی نڤێژ دكر گازی كرێ: یا جورەیج، گۆت: یا خودێ دەیكا منە و نڤێژا منە و ما ب نڤێژا خۆڤە، دەیكا وی گۆت: یا خودێ وی نەمرینە هەتا بەرێ وی ب ناڤچاڤێت دەممەن پیسان دكەڤیت، و جورەیج د پەرستگەها خۆڤە بوو ژنەكێ خۆ نیشا دا و د گەل ئاخفت، بەلێ وی نەڤیا وی كاری بكەت، هاتە دەڤ شڤانەكی و خۆ ب دەستڤە بەردا، و بچویكەك بوو، گۆت: ئەڤە ژ جورەیجییە، هاتنێ، و پەرستگەها وی هەرفاند، و ژێ ئینانە دەر و خەبەر گۆتنێ، دەستنڤێژا خۆ شویشت و نڤێژ كر و پاشی هاتە دەڤ بچویكی و گۆت: بچویكۆ بابێ تە كییە؟ گۆت: بێڤانێ شڤانە، ئینا گۆتن: پەرستگەها تە دێ ب زێری بۆ تە ئاڤا كەین، گۆت: نە، ب تەقنێ نەبیت.**

**و ژنەكێ شیر ددا بچویكەكی ژ ئیسرائیلییان، زەلامەكی سەر و سیما جوان و ماقویل و ل دەوارەكێ سویار بۆری، دەیكا وی گۆت: یا خودێ كورێ من وەكی ڤی لێ بكە، بچویكی چچك بەردا و زڤری بەرێ خۆ دایێ و گۆت: یا خودێ من وەكی وی لێ نەكە، و زڤری چچكیڤە و شیر خوار،** ـ ئەبو هورەیرە گۆت: هەروەكی ئەز یێ بەرێ خۆ ددەمە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو یێ بەحسێ شیرخوارنا وی ب تلا خۆ یا شەهدێ دكەت و دكەتە د دەڤێ خۆدا و دمێژیت ـ **گۆت: پاشی د بەر جارییەكێرا بۆرین، دەیكا وی گۆت: یا خودێ كورێ من وەكی ڤێ لێ نەكەی، چچك بەردا و بەرێ خۆ دایێ و گۆت: یا خودێ تو من وەكی ڤێ لێ بكەی[1]، گۆت: بۆچی؟! گۆت ب راستی سوار زەلامەكێ حەق دژمن و زۆردار بوو، و ڤێ جارییێ دبێژنێ زنا یا كری، و دزی یا كری و وەنەكرییە).**

١٣ ـ باب: حديث أبرص وأقرع وأعمى

**بابەتێ: فەرموودەیا خلتەی و كەچەلی و كۆرەی.**

٣٥٦٤ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (إِنَّ ثَلَاثَةً فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ: أَبْرَصَ، وَأَقْرَعَ، وَأَعْمى، بَدَا للهِ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكاً.

(١) ئانكو: من ژی بێ گونەهكە وەكی ئەڤە یا بێ گونەهە.

فَأَتَى الأَبْرَصَ فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: لَوْنٌ حَسَنٌ، وَجِلْدٌ حسَنٌ، قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ، قالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ، فَأُعْطِيَ لَوْناً حَسناً، وَجِلْداً حَسَناً، فَقَالَ: أَيُّ المَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الإِبِلُ. أَوْ قَالَ: الْبَقَرُ، هُوَ شَكَّ فِي ذَلِكَ: أَنَّ الأَبْرَصَ وَالأَقْرَعَ: قالَ أَحَدُهُمَا: الإِبِلُ، وَقَالَ الآخَرُ: الْبَقَرُ. فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ، فَقَالَ: يُبَارَكُ لَكَ فِيها.

وَأَتَى الأَقْرَعَ فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: شَعَرٌ حَسَنٌ، وَيَذْهَبُ هذَا عَنِّي، قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ، قالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ، وَأُعْطِيَ شَعَراً حَسناً، قَالَ: فَأَيُّ المَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: الْبَقَرُ، قالَ: فَأَعْطَاهُ بَقَرَةً حَامِلاً، وَقَالَ: يُبَارَكُ لَكَ فِيها.

وَأَتَى الأَعْمَى فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: يَرُدُّ اللهُ إِلَيَّ بَصَرِي، فَأُبْصِرُ بِهِ النَّاسَ، قالَ: فَمَسَحَهُ، فَرَدَّ اللهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ، قالَ: فَأَيُّ المَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قالَ: الْغَنَمُ، فَأَعْطَاهُ شَاةً وَالِداً.

فَأُنْتِجَ هذَانِ، وَوَلَّدَ هَذَا، فَكَانَ لِهَذَا وَادٍ مِنْ إِبِلٍ، وَلِهَذَا وَادٍ مِنْ بَقَرٍ، وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَمِ.

ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الأَبْرَصَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ، تَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلاَ بَلاَغَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الحَسَنَ وَالجِلْدَ الحَسَنَ وَالمَالَ، بَعِيراً أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي. فَقَالَ لَهُ: إِنَّ الْحُقُوقَ كَثِيرَةٌ، فَقَالَ لَهُ: كَأَنِّي أَعْرِفُكَ، أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ، فَقِيراً فَأَعْطَاكَ اللهُ؟ فَقَالَ: لَقَدْ وَرِثْتُ لِكَابِرٍ عَنْ كَابِرٍ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِباً؛ فَصَيَّرَكَ اللهُ إِلَى مَا كُنْتَ.

وَأَتَى الأَقْرَعَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قالَ لِهَذَا، فَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَيهِ هَذَا، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِباً؛ فَصَيَّرَكَ اللهُ إِلَى مَا كُنْتَ.

وَأَتَى الأَعْمَى فِي صُورَتِهِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ، وَتَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلاَ بَلاَغَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي، فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أَعْمى فَرَدَّ اللهُ بَصَرِي، وَفَقِيراً فَقَدْ أَغْنَانِي، فَخُذْ مَا شِئْتَ، فَوَاللهِ لا أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ بِشَيْءٍ أَخَذْتَهُ للهِ، فَقَالَ: أَمْسِكْ مالَكَ، فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ، فَقَدْ رَضِيَ اللهُ عَنْكَ، وَسَخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ).

[خ٣٤٦٤/ م٢٩٦٤].

ولفظ مسلم: (فَأَرَادَ اللهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ) وهو رواية عند البخاري.[خ٦٦٥٣].

ژ ئەبی هورەیرە، (ﷺ)، وی گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (سێ ژ ئیسرائیلییان، لەش بەلەكەك و كەچەلەك و كۆرەك، خودێ ڤیا وان ب جەرباندنێ ئاشكەرا بكەت، ملیاكەتەك هنارتە دەڤ وان.

هاتە دەڤ یێ لەش بەلەك، گۆتێ: چ تشت ژ هەمیان خۆشڤیترە ل دەڤ تە؟ گۆت: رەنگەكێ باش، و پیستەكێ باش، و ئەڤا ل دەڤ من ئەوا خەلك پێ تێك دچن بچیت، ئینا ڤەمالی، و پیساتییا وی یا ئاشكرا ژێ چۆ، و رەنگەكێ باش و پیستەكێ باش گرت. و گۆتێ: چ مال شرین و خۆشڤیترە ل دەڤ تە؟ گۆت: حێشتر، یان گۆت چێل، (ڤەگێر یێ ب شك كەڤتی) حێشترەكا ئاڤز و سەر زانێ دایێ، و گۆتێ: خودێ بۆ تە بەرەكەتێ بێخیتێ.

و هاتە دەڤ یێ كەچەل، گۆتێ: چ تشت ژ هەمیان خۆشڤیترە ل دەڤ تە؟ گۆت: پرچەكێ باش، و ئەڤا ل دەڤ من ئەوا خەلك پێ تێك دچن بچیت، ئینا ڤەمالی، و ژێ چۆ، و پرچەكێ باش گرت. و گۆتێ: چ مال شرین و خۆشڤیترە ل دەڤ تە؟ گۆت: چێل، ئینا چێلەكا ئاڤز دایێ و گۆتێ خودێ بۆ تە بەرەكەتێ بێخیتێ.

و هاتە دەڤ یێ كۆرە و گۆتێ: چ تشت ژ هەمیان خۆشڤیترە ل دەڤ تە؟ گۆت: خودێ چاڤێت من بۆ من بزڤرینیت و ئەز خەلكی ببینم، ئینا ڤەمالی و خودێ چاڤێت وی بۆ زڤراندن، و گۆتێ: چ مال شرین و خۆشڤیترە ل دەڤ تە؟ گۆت: پەز، ئینا بزنەكا ب كار دایێ.

زێدەیی دا ڤان هەردوكان و ئەڤە دا زان. ئەڤی نهالەكا حێشتران هەبوو، و ئەڤی نهالەكا چێلان هەبوو، و ئەڤی نهالەكا پەزی.

پاشی ملیاكەت هاتە دەڤ لەش بەلەكی ل سەر خولك و سەروبەرێ وی، و گۆتێ: زەلامەكێ ڤەلەندەرم و رێك ل ڤێ وەغەرا من یێت ل من هاتینە گرتن، و ئەڤرۆ گەهشتنا من نینە ب خودێ نەبیت پاشی تە، ئەز داخوازا حێشترەكێ ب وی ژ تە دكەم یێ رەنگێ باش و پیستێ باش دایە تە، دا پێ بگەهمە وەغەرا خۆ، گۆت: ماف گەلەكن. ئینا گۆتێ: هەروەكی ئەز تە دنیاسم، تو ئەو نینی یێ لەش بەلەك خەلك ب تە تێك دچۆ، و یێ هەژار بووی و خودێ دایە تە؟ گۆت: نەخێر ئەڤ مالە ژ باب و باپیران یێ گەهشتییە من. ملیاكەتی گۆت: هەكە تو یێ درەوین بی خودێ تە وەكی بەرێ بزڤرینیت.

**و هاتە دەڤ یێ کەچەل ل سەر خولك و سەروبەرێ وی، و کا چ گۆتە یێ دی هەر ئەو گۆتە وی ژی و وی ژی بەرسڤا وی دا وەکی ڤی بەرسڤا وی دای. ملیاکەتی گۆت: هەکە تو یێ درەوین بی خودێ تە وەکی بەرێ بزڤرینیت.**

**هاتە دەڤ یێ کۆرە ل سەر خولك و سەروبەرێ وی، و گۆتێ: زەلامەکێ ڤەلەندەرم و رێك ل ڤێ وەغەرا من یێت ل من هاتینە گرتن و ئەڤرۆ گەهشتنا من نینە، ب خودێ نەبیت پاشی تە، ئەز داخوازا گیسکەکی ب وی ژ تە دکەم یێ چاڤێت تە بۆ تە زڤراندین، دا پێ بگەهمە وەغەرا خۆ، گۆت: ئەز یێ کۆرەبووم، خودێ چاڤێت من بۆ من زڤراندن، ڤێجا تە چ دڤێت بۆ خۆ راکە و تە چ دڤێت بهێلە، ئەز ب خودێ کەمە ئەز دلێ تە ناهێلم و ل سەر تە گران ناکەم تشتەکی تو بۆ خودێ راکەی و ئەز ژ تە ڤەگرم، ملیاکەتی گۆتێ: مالێ خۆ بگرە، هوین هاتنە ئیمتحانەکرن، خودێ ژ تە رازی بوو، و ژ هەردو هەڤالێت تە رازی نەبوو).**

- و بێژەیا موسلمی: **(خودێ ڤیا وان بجەرببینیت)** و ئەڤە هەر ڤەگێرەکا بوخارییە ژی.

١٤ . باب: حدیث الغار

**بابەتێ: فەرموودەیا شکەفتێ.**

٣٥٦٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قالَ: (بَيْنَمَا ثَلاَثَةُ نَفَرٍ يَتَمَاشَوْنَ أَخَذَهُمُ المَطَرُ، فَمَالُوا إِلَى غارٍ فِي الجَبَلِ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الجَبَلِ فَأَطْبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالاً عَمِلْتُمُوهَا للهِ صَالِحَةً، فَادْعُوا اللهَ بِهَا لَعَلَّهُ يَفْرُجُهَا.

فَقَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ، وَلِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ، كُنْتُ أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا رُحْتُ عَلَيْهِمْ، فَحَلَبْتُ بَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ أَسْقِيهِمَا قَبْلَ وَلَدِي، وَإِنَّهُ نَأَى بِيَ الشَّجَرُ يَوْماً، فَمَا أَتَيْتُ حَتَّى أَمْسَيْتُ فَوَجَدْتُهُمَا قَدْ نَامَا، فَحَلَبْتُ كما كُنْتُ أَحْلُبُ، فَجِئْتُ بِالْحِلاَبِ فَقُمْتُ عِنْدَ رُؤُوسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا مِنْ نَوْمِهِمَا، وَأَكْرَهُ أَنْ أَبْدَأَ بِالصِّبْيَةِ قَبْلَهُمَا، وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذلِكَ دَأْبِي وَدَأْبَهُمْ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ؛ فَافْرُجْ لَنَا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ. فَفَرَجَ اللهُ لَهُمْ فُرْجَةً حَتَّى يَرَوْنَ مِنْهَا السَّمَاءَ.

وَقَالَ الثَّانِي: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كانَتْ لِي ابْنَةُ عَمٍّ أُحِبُّهَا كَأَشَدِّ ما يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، فَطَلَبْتُ إِلَيْهَا نَفْسَهَا، فَأَبَتْ حَتَّى آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَسَعَيْتُ حَتَّى جَمَعْتُ مِائَةَ دِينَارٍ فَلَقِيتُهَا بِهَا، فَلَمَّا قَعَدْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللهِ، اتَّقِ اللهَ، وَلاَ تَفْتَحِ الخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ، فَقُمْتُ عَنْهَا. اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي قَدْ فَعَلْتُ ذلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ؛ فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا. فَفَرَجَ لَهُمْ فُرْجَةً.

وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي كُنْتُ اسْتَأْجَرْتُ أَجِيراً بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضى عَمَلَهُ قالَ: أَعْطِنِي حَقِّي، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ حَقَّهُ، فَتَرَكَهُ وَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَراً وَرَاعِيَهَا، فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللهَ وَلاَ تَظْلِمْنِي وَأَعْطِنِي حَقِّي، فَقُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ وَرَاعِيهَا، فَقَالَ: اتَّقِ اللهَ وَلاَ تَهْزَأْ بِي، فَقُلْتُ: إِنِّي لاَ أَهْزَأُ بِكَ، فَخُذْ تِلْكَ الْبَقَرَ وَرَاعِيَهَا، فَأَخَذَهُ فَانْطَلَقَ بِهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ، فَافْرُجْ ما بَقِيَ. فَفَرَجَ اللهُ عَنْهُمْ). [خ٥٩٧٤ (٢٢١٥)/ م٢٧٤٣].

ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(د دەمەكیدا سێ كەس د رێكەكێڕا دچۆن، ئینا بارانێ ئەو برنە شكەفتەكێڤە ل چای، كەڤرەك ژ چیای هاتە خوارێ و دەرێ شكەفتێ د چیایدا ل وان گرت، ئینا گۆتنە ئێكدو: بەرێ خۆ بدەنێ هندە كارێت باش هەوە كربن دوعا پێ بكەن بەلكی خودێ هەوە پێ رزگار بكەت.**

**ئێكی ژ وان گۆت: یا خودێ من دایبابێت دانعومر هەبوون، و من زارۆكێت بچویك هەبوون، و ئەگەر ئەز چۆبامە دەڤ وان من شیر ددۆت و من دەست ب دایبابێت خۆ دكر بەری بدەمە بچویكێت خۆ، رۆژەكێ ئەز ب دویڤ دارانڤە دویر چۆم، و نەزڤریمە دەڤ وان هەتا بوویە شەڤ و من دیت ئەو هەردو پێت نڤستین، من شیرێ وان بۆ دۆت وەكی هەرجار من ددۆت، و من شیر ئینا و ئەز هنداڤ سەرێ وان راوەستام و من نەڤیا وان ژ خەوا وان هشیار بكەم، و من نەڤیا ئەز بەری وان هەردوكان دەست ب بچویكان بكەم، و گرییێ بچویكانە ب دەنگێ بلند ل بەر پێت من، و ئەز و ئەو هۆسا ماین هەتا سپێدە دەركەفتی، ئەگەر تو بزانی من ئەڤە بۆ رازیبوونا روییێ تە یا كری، تو بۆ مە كونەكێ ژێ ڤەكە ئەم عەسمانی تێڕا ببینین ، خودێ بۆ وان كونەك ژێ ڤەكر هەتا عەسمان تێڕا دیتین.**

**پێ دی گۆت: یا خودێ من دۆتمامەك هەبوو من حەژێ دكر كا چاوا زەلام ب هەمی هێزێ حەژ ژنان دكەن، من داخواز كر خۆ ب دەست منڤە بەردەت، رازی نەبوو هەتا سەد دیناران نەدەمێ، من كار كر هەتا من سەد دینار كۆم كرین، ڤێجا دەمێ ئەز د ناڤبەرا پێت وێدا روینشتیم، گۆت: ئەی بەندەیێ خودێ ژ خودێ بترسە و گوستیركێ نەشكێنە ب حەقێ وێ نەبیت[1]، من هێلا و ئەز رابووم، یا خودێ ئەگەر تو بزانی من ئەڤە بۆ رازیبوونا روییێ تە یا كری، كونەكێ بۆ مە لێ ڤەكە خودێ كونەكا دی لێ ڤەكر.**

**و پێ دی گۆت: یا خودێ من پالە ب ئامویرەكێ گەنمۆك كێشانێ گرت، ڤێجا دەمێ كارێ خۆ كری گۆت: پالەتییا من بدە من، من ب بەرچاڤا ئێخست، بەلێ نەوەرگرت و هێلا و چۆ ، و من بەردەوام دچاند، هەتا من كۆمەكا چێلان و گاڤانێت وان پێ كۆم كرین، و هاتە دەڤ من و گۆت: ژ خودێ بترسە و ستەمێ ل من نەكە و پالەتییا من بدە من، ئینا من گۆت: هەرە وان چێلێت هە و گاڤانێت وان بۆ خۆ ببە، گۆت: ژ خودێ بترسە و ترانەیان بۆ خۆ ب من نەكە! من گۆتێ: ئەز ترانەیان بۆ خۆ ب تە ناكەم، وان چێلا و گاڤانێت وان ببە، ئینا هەمی دانە بەرۆكێ خۆ و برن و چۆ، ئەگەر تو بزانی من ئەڤە بۆ رازیبوونا روییێ تە یا كری ئەڤا مایی بۆ مە ڤەكە و خودێ دەرگەهـ لێ ڤەكر).**

## ١٥ ـ باب: قصة أصحاب الأخدود

### بابەتێ: چێرۆكا خودانێت خەندەكێ.

٣٥٦٦ – (م) عَنْ صُهَيْبٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ، فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ: إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ، فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلاَماً أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ. فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلاَماً يُعَلِّمُهُ، فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ ـ إِذَا سَلَكَ ـ رَاهِبٌ، فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَسَمِعَ كَلاَمَهُ، فَأَعْجَبَهُ. فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ، فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ. فَشَكَا ذٰلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ، فَقَالَ: إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ فَقُلْ: حَبَسَنِي أَهْلِي، وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ: حَبَسَنِي السَّاحِرُ.

فَبَيْنَمَا هُوَ كَذٰلِكَ إِذْ أَتَى عَلى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ، فَقَالَ: الْيَوْمَ أَعْلَمُ آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ؟ فَأَخَذَ حَجَراً فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ

---

(١) ئانكو: من ژ كچینییێ نەئێخە ب مارەكرنێ نەبیت.

السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ، حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ، فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا، وَمَضَى النَّاسُ. فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: أَيْ بُنَيَّ، أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي، قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى، وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى، فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلاَ تَدُلَّ عَلَيَّ. وَكَانَ الْغُلاَمُ يُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ، وَيُدَاوِي النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الأَدْوَاءِ.

فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ، فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ، فَقَالَ: مَا هَاهُنَا لَكَ أَجْمَعُ، إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِي، فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَشْفِي أَحَداً، إِنَّمَا يَشْفِي اللهُ، فَإِنْ أَنْتَ آمَنْتَ بِاللهِ دَعَوْتُ اللهَ فَشَفَاكَ، فَآمَنَ بِاللهِ، فَشَفَاهُ اللهُ. فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ؟ قَالَ: رَبِّي. قَالَ: وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِي؟ قَالَ: رَبِّي وَرَبُّكَ اللهُ. فَأَخَذَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلاَمِ. فَجِيءَ بِالْغُلاَمِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: أَيْ بُنَيَّ! قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ، وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ، فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَشْفِي أَحَداً، إِنَّمَا يَشْفِي اللهُ، فَأَخَذَهُ، فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ.

فَجِيءَ بِالرَّاهِبِ، فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَدَعَا بِالْمِئْشَارِ، فَوَضَعَ الْمِئْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ، فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ. ثُمَّ جِيءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ، فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَوَضَعَ الْمِئْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ، فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ.

ثُمَّ جِيءَ بِالْغُلاَمِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا، فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ، فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذِرْوَتَهُ ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ؛ وَإِلاَّ فَاطْرَحُوهُ. فَذَهَبُوا بِهِ، فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ! اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَرَجَفَ بِهِمُ الْجَبَلُ، فَسَقَطُوا.

وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللهُ، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: اذْهَبُوا بِهِ، فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورٍ، فَتَوَسَّطُوا بِهِ الْبَحْرَ، فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ؛ وَإِلاَّ فَاقْذِفُوهُ. فَذَهَبُوا بِهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَانْكَفَأَتْ بِهِمُ السَّفِينَةُ، فَغَرِقُوا. وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ، فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللهُ، فَقَالَ لِلْمَلِكِ: إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ، قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَتَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ خُذْ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِي، ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قُلْ: بِاسْمِ اللهِ رَبِّ الْغُلاَمِ، ثُمَّ ارْمِنِي، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ، قَتَلْتَنِي.فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ، ثُمَّ أَخَذَ

سَهْماً مِنْ كِنَانَتِهِ، ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، ثُمَّ قَالَ: بِاسْمِ اللهِ، رَبِّ الْغُلاَمِ! ثُمَّ رَمَاهُ فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ فِي مَوْضِعِ السَّهْمِ، فَمَاتَ. فَقَالَ النَّاسُ: آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ! آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ! آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ! فَأُتِيَ الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ: أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ؟ قَدْ وَاللهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ، قَدْ آمَنَ النَّاسُ. فَأَمَرَ بِالأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ، وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ، وَقَالَ: مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ، فَأَحْمُوهُ فِيهَا، أَوْ قِيلَ لَهُ: اقْتَحِمْ، فَفَعَلُوا. حَتَّى جَاءَتِ امْرَأَةٌ وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا، فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا، فَقَالَ لَهَا الْغُلاَمُ: يَا أُمَّهِ! اصْبِرِي، فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ). [م٣٠٠٥].

**ژ سوهەیبی، (رضي الله عنه)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (شاهەكی ژ پێت بەری هەوە سێربەندەك هەبوو، وەختێ پیر بووی، گۆتە شاهی: ئەز پیر بووم، لاوەكی بۆ من فرێكە، دا سێربەندییێ نیشا بدەم: لاوەك فرێكرە دەڤ فێر بكەت، دەمێ دچۆ دەڤ سێربەندی عیبادەتكەرەكێ خودێ ترس د رێكا ویدا بوو درووینشتە خوارێ ل دەڤ وی، و گوهێ خۆ ددا ئاخفتنا وی، پێ پێ رازی بوو، هەر جارا هاتبا نك سێربەندی د دەڤ عیبادەتكەریرا دهات، و درووینشتە خوارێ ل دەڤ، فێجا وەختێ دهاتە دەڤ سێربەندی دقوتا، گازندە ب ڤێ كەهاندە عیبادەتكەری، گۆتێ: هەكە تو ژ سێربەندی ترسیای بێژە: مالا من ئەز گیرۆكرم، و هەكە تو ژ مالا خۆ ترسیای بێژە: سێربەندی ئەز گیرۆكرم.**

**و ئەو ل سەر ڤێ چەندێ بوو، ب سەر دەهبەكێ مەزن هەل بوو، رێكا خەلكی گرتبوو، ئینا گۆت: ئەڤرۆ دێ زانم كا سێربەند چێترە، یان عیبادەتكەر، بەرەك هەلگرت، و گۆت: یاخودێ هەكە كارێ عیبادەتكەری خۆشڤیتر بیت ل دەڤ تە، ژ كارێ سێربەندی، ڤی دەهبەی بكوژە، دا خەلك بچن و رێكا وان ڤەبیت. بەر هاڤێتێ و كوشت، و خەلك چۆنە سەر رێكا خۆ. و هاتە دەڤ عیبادەتكەری و گۆتێ، ئینا عیبادەتكەری، گۆتێ: ئەی كورێ من، ئەڤرۆ تو ژ من چێتری، كارێ تە پێ گەهشتی، وەكی ئەز دبینم تو دێ هێیە جەرباندن و ئیمتحانەكرن، و هەكە تو هاتییە ئیمتحانەكرن، من نیشا كەسێ نەدەی. و لاوی كورێ زكماكی و بەلەكەیی ساخ دكرن، و خەلك ژ هەمی دەردان دەرمان دكرن.**

**دیوانچییەكێ شاهی كۆرە ببوو، ب گەلەك دیارییانڤە هاتە دەڤ و گۆتێ: كا چ ل ڤێرێیە هەمی بۆ تە، هەكە تە ئەز چێ كرم، گۆت: ئەز كەسێ چێ ناكەم، پێ چێ دكەت، بەس خودێیە، هەكە تو باوەرییێ ب خودێ بینی، ئەز دێ بۆ تە دوعا ژ خودێ كەم، دێ**

تە سلامەت کەت، ئینا باوەری ب خودێ ئینا، خودێ ژی، چێ کر، هاتە دەڤ شاهی، ل دەڤ روینشتە خوارێ وەکی هەرجار، شاهی گۆتێ: کێ چاڤێ تە بۆ تە زڤراند؟ گۆت خودایێ من. گۆت: ما تە خودایەکێ دی هەیە ژ بلی من؟ گۆت: خودایێ من و خودایێ تە خودێیە. گرت و هەر ئێزادا، هەتا، لاو نیشا دای. لاو ئینا، شاهی گۆتێ: وەی کورێ من سێربەندییا تە هند گەهشتییە تو کورێ زکماکی و بەلەکەیی ساخ کەی و تو ڤێ بکەی و ڤێ بکەی!! ئینا گۆت: ئەز کەسێ چێ ناکەم، خودێیە چێ دکەت، گرت و هەر ئێزا دا، هەتا عیبادەتکەر نیشا دای.

عیبادەتکەر ئینا و گۆتێ: ژ دینێ خۆ ڤەبە و بزڤرە، رازی نەبوو، مشار خواست و دانا سەر نیڤەکا سەرێ وی و کەر کر هەتا هەردو کەرێت وی کەفتین. پاشی دیوانچییێ شاهی ئینا و گۆتێ: ژ دینێ خۆ ڤەبە و بزڤرە، رازی نەبوو، مشار خواست و دانا سەر نیڤەکا سەرێ وی و کەر کر هەتا هەردو کەرێت وی کەفتین.

پاشی لاو ئینا و گۆتێ: ژ دینێ خۆ ڤەبە و بزڤرە، رازی نەبوو، داڤ هندە هەڤالێت خۆ و گۆتێ: ببەنە فلان چیایێ هۆسا و هۆسا هەتا هوین دگەهنە سەرێ چیای هەکە ژ دینێ خۆ نەزڤری تێدا باڤێژن. برن و ب چیای سەرئێخستن ئینا گۆت: یا خودێ بەلا وان ب تشتێ تە دڤێت ژ من ڤەکە. چیا ب وان هەژیا، تێدا کەفتن و ئەو هات، هاتە دەڤ شاهی. شاهی گۆتێ: هەڤالێت تە چ کرن؟ گۆت: خودێ بەلا وان ژ من ڤەکەر. داڤ هندە هەڤالێت خۆ و گۆتێ: ببەن بکەنە د گەمییەکێدا، و ببەنە نیڤا دەریای، هەکە ژ دینێ خۆ نەزڤری، باڤێژنە تێدا. برن، ئینا گۆت: یا خودێ بەلا وان ب تشتێ تە دڤێت ژ من ڤەکە، گەمی ب وان ڤولپی، و ئەو هات، هاتە دەڤ شاهی. شاهی گۆتێ: هەڤالێت تە چ کرن؟ گۆت: خودێ بەلا وان ژ من ڤەکەر. ئینا گۆتە شاهی: تو نەشێی من بکوژی، هەتا تو وێ نەکەی یا ئەز فەرمانا تە پێ دکەم. گۆت: و ئەو چییە؟ گۆت: خەلکی ل عەردەکێ بلند کۆم کەی و من ب ڤورمەکیڤە بهەلاویسە، و پاشی تیرەکێ ژ کاڤلانکێ من دەربێخە، پاشی تیرێ بێخە د نیڤا کڤانیدا، پاشی بێژە: ب ناڤێ خودایێ لاوی، پاشی باڤێژە، هەکە تە ئەڤە کر، تە ئەز کوشتم. خەلك ل عەردەکێ ب تنێ یێ بلند کۆم کر، و ب ڤورمەکیڤە هەلاویست، پاشی تیرەك ژ کاڤلانکێ وی دەرێخست، و کرە د نیڤا کڤانیدا، پاشی گۆت: ب ناڤێ

خودایێ لاوی، پاشی تیر هاڤێت، مابەینا گوهێ وی و چاڤێ وی کەفت و مر. خەلکی گۆت: مە باوەری ب خودایێ لاوی ئینا. هاتنە دەڤ شاهی و گۆتنێ: تە دیت یا تو ژێ دترسیای، ب خودێ کەمە ئەو ب سەرێ تە هات یا تە ترس پێ دکر. فەرمان دا خەندەکا ل سەرێت رێکا بکۆلن، هاتنە کۆلان، ئاگر تێدا هاتنە هەلکرن. و گۆت: هەر کەسێ ژ دینێ خۆ نەزڤری، باڤێژنە د ئاگریدا یان بێژنێ بدە ناڤ ئاگری. وەکرن هەتا ژنکەك هات و بچویکەکێ وێ د گەل بوو، راوەستییا ترسیا، بچویکی گۆتێ: دەیکا من، تو یا ل سەر حەقییێ سەبری بکێشە).

الفصل الأول: الجاهلية وما قبل البعثة:

## پشكا ئێكێ: دەمێ نەزانینێ و بەری پێغەمبەراتیێ

### ١ ـ باب: أول من سيب السوائب

### بابەتێ: یێ جارا ئێكێ گیانەور بەرەللا كرین

٣٥٦٧ – (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ قالَ: البَحِيرَةُ:الَّتِي يُمْنَعُ دَرُّهَا لِلطَّوَاغِيتِ، وَلاَ يَحْلُبُهَا أَحَدٌ مِنَ النَّاسِ. وَالسَّائِبَةُ: الَّتِي كانُوا يُسَيِّبُونَهَا لآلِهَتِهِمْ، فَلاَ يُحْمَلُ عَلَيْهَا شَيْءٌ.

قَالَ: وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ عامِرِ بْنِ لُحَيٍّ الخُزَاعِيَّ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ**). [خ٣٥٢١/ م٢٨٥٦].

**ژ سەعیدێ كوڕێ موسەییەبی (رحمه الله) گۆت: بەحیرە ئەو حێشترە یا شیرێ وێ بۆ بوتان دهاتە راگرتن و كەسێ ژ خەلكی نەددوت، و سائیبە ئەو بوو یا بۆ بوتێت خۆ بەرددان و ئازا دكرن و چو بار لێ نەدكرن.**

**و گۆت: ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (من عەمرێ كوڕێ عامرێ كوڕێ لوحیەیێ خوزاعی د ناڤ ئاگریدا دیت رویڤیكێت خۆ د دویڤ خۆڕا دكێشان، ئەو یێ ئێكێ بوو جانەوەر بەرللا كرین).**

### ٢ ـ باب: عبادة الأَحجار

### بابەتێ: پەرستنا بەران.

٣٥٦٨ – (خ) عَنْ أَبِي رَجاءٍ الْعُطَارِدِيِّ قَالَ: كُنَّا نَعْبُدُ الحَجَرَ، فَإِذَا وَجَدْنَا حَجَراً هُوَ أَخْيَرُ مِنْهُ أَلْقَيْنَاهُ وَأَخَذْنَا الآخَرَ، فَإِذَا لَمْ نَجِدْ حَجَراً جَمَعْنَا جُثْوَةً مِنْ تُرَابٍ، ثُمَّ جِئْنَا بِالشَّاةِ فَحَلَبْنَاهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُفْنَا بِهِ، فَإِذَا دَخَلَ شَهْرُ رَجَبٍ قُلْنَا: مُنَصِّلُ الأَسِنَّةِ، فَلاَ نَدَعُ رُمْحاً فِيهِ حَدِيدَةٌ، وَلاَ سَهْماً فِيهِ حَدِيدَةٌ؛ إِلاَّ نَزَعْنَاهُ وَأَلْقَيْنَاهُ شَهْرَ رَجَبٍ. [خ٤٣٧٦].

**ژ ئەبی رەجائێ عوتاردی (رحمه الله) گۆت: مە بەر دپەرستن، و ئەگەر مە بەرەك دیتبا ژ وی باشتر دا وی هاڤێژین و یێ دی هەلگرین و ئەگەر مە بەرەك نەدیتبا دا كۆمەكەكێ ژ ئاخێ كۆم كەین، و پاشی دا پەزەكێ ئینین و ل سەر دۆشین و پاشی دا ل دۆر زڤرین، و ئەگەر هەیڤا رەجەبێ هاتبا مە دگۆت: دەرهینەرێ سەركایە، نە مە رومەك دهێلا سەركێ**

ئاسنی پێڤە بیت و نە تیرەك دهێلا سەرکێ ئاسنی پێڤە بیت، ئەگەر مە نەئینابا نە دەر و د هەیڤا رەجەبێدا نەهاڤێتبانە.

## ۳ . باب: القسامة في الجاهلية

## بابەتێ: سویندێت گرێدایی ب كوشتنێڤە د دەمێ نەزانینێدا.

٣٥٦٩ – (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ قَسَامَةٍ كَانَتْ فِي الجَاهِلِيَّةِ لَفِينَا بَنِي هَاشِمٍ: كَانَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، اسْتَأْجَرَهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ مِنْ فَخِذٍ أُخْرَى، فَانْطَلَقَ مَعَهُ فِي إِبِلِهِ، فَمَرَّ رَجُلٌ بِهِ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، قَدِ انْقَطَعَتْ عُرْوَةُ جُوَالِقِهِ، فَقَالَ: أَغِثْنِي بِعِقَالٍ أَشُدُّ بِهِ عُرْوَةَ جُوَالِقِي، لاَ تَنْفِرُ الإِبِلُ، فَأَعْطَاهُ عِقَالاً فَشَدَّ بِهِ عُرْوَةَ جُوَالِقِهِ. فَلَمَّا نَزَلُوا عُقِلَتِ الإِبِلُ؛ إِلاَّ بَعِيراً وَاحِداً، فَقَالَ الَّذِي اسْتَأْجَرَهُ: ما شَأْنُ هَذَا البَعِيرِ لَمْ يُعْقَلْ مِنْ بَيْنِ الإِبِلِ؟ قَالَ: لَيْسَ لَهُ عِقَالٌ، قَالَ: فَأَيْنَ عِقَالُهُ؟ قَالَ: فَحَذَفَهُ بِعَصاً كَانَ فِيهَا أَجَلُهُ. فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ، فَقَالَ: أَتَشْهَدُ المَوْسِمَ؟ قَالَ: ما أَشْهَدُ، وَرُبَّمَا شَهِدْتُهُ، قَالَ: هَلْ أَنْتَ مُبْلِغٌ عَنِّي رِسَالَةً مَرَّةً مِنَ الدَّهْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَكُنْتَ إِذَا أَنْتَ شَهِدْتَ المَوْسِمَ فَنَادِ: يَا آلَ قُرَيْشٍ! فَإِذَا أَجَابُوكَ فَنَادِ: يَا آلَ بَنِي هَاشِمٍ! فَإِنْ أَجَابُوكَ، فَسَلْ عَنْ أَبِي طَالِبٍ فَأَخْبِرْهُ: أَنَّ فُلاَناً قَتَلَنِي فِي عِقَالٍ، وَمَاتَ المُسْتَأْجَرُ.

فَلَمَّا قَدِمَ الذِي اسْتَأْجَرَهُ، أَتَاهُ أَبُو طَالِبٍ، فَقَالَ: ما فَعَلَ صَاحِبُنَا؟ قَالَ: مَرِضَ، فَأَحْسَنْتُ الْقِيَامَ عَلَيْهِ، فَوَلِيتُ دَفْنَهُ، قَالَ: قَدْ كَانَ أَهْلَ ذَاكَ مِنْكَ، فَمَكَثَ حِيناً، ثُمَّ إِنَّ الرَّجُلَ الَّذِي أَوْصَى إِلَيْهِ أَنْ يُبْلِغَ عَنْهُ وَافَى المَوْسِمَ، فَقَالَ: يَا آلَ قُرَيْشٍ! قَالُوا: هذِهِ قُرَيْشٌ، قَالَ: يَا آلَ بَنِي هَاشِمٍ! قَالُوا: هذِهِ بَنُو هَاشِمٍ، قَالَ: أَيْنَ أَبُو طالِبٍ؟ قالوا: هَذَا أَبُو طَالِبٍ، قَالَ: أَمَرَنِي فُلاَنٌ أَنْ أُبْلِغَكَ رِسَالَةً، أَنَّ فُلاَناً قَتَلَهُ فِي عِقَالٍ.

فَأَتَاهُ أَبُو طَالِبٍ فَقَالَ لَهُ: اخْتَرْ مِنَّا إِحْدَى ثَلاَثٍ: إِنْ شِئْتَ أَنْ تُؤَدِّيَ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ فَإِنَّكَ قَتَلْتَ صَاحِبَنَا، وَإِنْ شِئْتَ حَلَفَ خَمْسُونَ مِنْ قَوْمِكَ أَنَّكَ لَمْ تَقْتُلْهُ، فَإِنْ أَبَيْتَ قَتَلْنَاكَ بِهِ، فَأَتَى قَوْمَهُ فَقَالُوا: نَحْلِفُ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ، كَانَتْ تَحْتَ رَجُلٍ مِنْهُمْ، قَدْ وَلَدَتْ لَهُ، فَقَالَتْ: يَا أَبَا طَالِبٍ! أُحِبُّ أَنْ تُجِيزَ ابْنِي هَذَا بِرَجُلٍ مِنَ الْخَمْسِينَ، وَلاَ تَصْبُرْ يَمِينَهُ حَيْثُ تُصْبَرُ الأَيْمَانُ، فَفَعَلَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَالَ: يَا أَبَا طَالِبٍ! أَرَدْتَ خَمْسِينَ رَجُلاً أَنْ يَحْلِفُوا مكَانَ مِائَةٍ مِنَ الإِبِلِ، يُصِيبُ كُلَّ رَجُلٍ بَعِيرَانِ، هَذَانِ بَعِيرَانِ، فَاقْبَلْهُمَا عَنِّي وَلا تَصْبُرْ يَمِينِي حَيْثُ تَصْبَرُ الأَيْمَانُ، فقَبِلهُمَا، وَجَاءَ ثَمَانِيَةٌ وَأَرْبَعُونَ فَحَلَفُوا.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! ما حَالَ الحَوْلُ، وَمِنَ الثَّمَانِيَةِ وَالأَرْبَعِينَ عَيْنٌ تَطْرِفُ. [خ٣٨٤٥].

ژ ئیبن عەبا سی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: ئێ كەمین سویندێت گر ێدایی ب كو شتنێڤە د نەزانینێدا د ناڤ مە بەنی هاشمییا ندا بوو، زەلا مەك ژ هاشمیان ژ لا یێ زەلامەكی ژ قورەیشییان ژ بنەمالەكا دی كرێ گرت، د گەل وی و حێشترێت وی رێكەفت، زەلامەكێ دی یێ هاشمی د بەر كرێگرتییێ هاشمیرا بۆری و دەستكێت جهالێت وی قەتیا بوون، ئینا گۆت: من ب كنفەكێ قورتالكە ئەز پێ جهالێت خۆ گرێدەم و حێشترا من ژ دەستێت من نەرەڤیت، ئینا كنفەك دا یێ و دەستكێت جهالێت خۆ گرێدان. ڤێجا دەمێ راوەستاین حێشتر هاتنە گرێدان، حێشترەك نەبیت، ئینا ئەوێ كرێكری گۆت: ئەڤێ حێشترێ خێرە بۆچی ئەو حێشتر د ناڤ حێشترێت دیدا نەهاتە گرێدان؟ گۆت: وێ كنف نینە، گۆت: پا كا كنفا وێ؟ گۆت: دارەك هاڤێتێ مرنا وی تێدا بوو، زەلامەك ژ خەلكێ یەمەنێ د دەڤرا بۆری، ئینا گۆتێ: ئەرێ دێ چییە حەجێ؟ گۆت: ئەز نا چم و دبیت بچم، گۆت: ئەرێ دێ نامەیەكێ ل هەر دەمێ تو چۆی ژ من گەهینی؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ئەگەر تو دەمێ حەجێ ئامادە بووی، گازی بكە گەلی قورەیشییان، ڤێجا ئەگەر بەرسڤا تە دان، گازی بكە و بێژە: گەلی هاشمییان ڤێجا ئەگەر وان بەرسڤا تە دا، پرسیارا ئەبو تالبی بكە، و بێژێ: ب راستی فلانی ئەز ژ بەر كنفەكێ كوشتم و ئەو كرێگرتی مر.

ڤێجا دەمێ ئەوێ كرێكری هاتی ئەبو تالب هاتە دەڤ و گۆتێ: مرۆڤێ مە چ لێ هات؟ گۆت: نەساخ بوو و من باش چاڤێ خۆ دایێ و من گۆڕ كر و ڤەشارت، گۆت: ب راستی ئەو یێ هەژی ڤێ چەندێ بوو، دەمەك د سەررا بۆری پاشی ئەو زەلامێ وەسیەت لێ هاتییە كرن نامەكێ ژ وی بگەهینیت گەهشتە دەمێ حەجێ، ئینا گۆت: گەلی قورەیشییان! گۆتن: بەلێ ئەڤە قورەیشینە، گۆت: گەلی هاشمییان! گۆتن: ئەڤە هاشمینە، گۆت: كا ئەبو تالب؟ گۆتن: ئەڤە ئەبو تالبە، گۆت: فلانی فەرمان ل من كر ئەز نامەكێ بگەهینمە تە كو فلانی ئەو سەرا كنفەكێ كوشت.

ئەبو تالب هاتە دەڤ و گۆتێ: ئێكێ ژ سێیان هەلبژێرە: ئەگەر تە بڤێت سەد حێشترا خوینێ بدە، چونكی ب راستی تە مرۆڤێ مە یێ كوشتی، و ئەگەر تە بڤێت پێنجی كەس ژ مرۆڤێت تە سویندێ بخۆن كو تە نەكوشتییە، و ئەگەر تو وەنەكەی و رازی نەبی دێ تە پێشڤە كوژین، ها تە دەڤ مرۆڤێت خۆ ئینا گۆتن: دێ سویند خوین، ئینا ژ نەكا

هاشمییان شوی ب زەلامەکێ وان کربوو و کورەك ژ وی هەبوو، وێ گۆت: ئەی ئەبو تالب ئەز حەز دکەم تو ڤی کورێ من ئێك ژ پێنجییا بهەژمێری و نەدەیە سویندێ و نەچار نەکەی سویندێ ل جهێ سویندخوارنێ بخۆت[1]، ئەوی وەکر، و زەلامەك ژ وان هاتە دەڤ و گۆت: ئەی ئەبا تالب تە ڤیا پێنجی بۆ تە شوینا سەد حێشتران سویند بخۆن و هەر زەلامەکی دو حێشتر بارا وینە، و ئەڤە دو حێشتر ژ من قەبویل بکە و من پێگر نەکە ب سویندێ ل جهێ سویندخوارنێ، ژێ وەرگرتن و چل و هەشت هاتن سویند خوارن.

ئیبن عەباسی گۆت: ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا سال نەبۆری و ئێك ژ وان چل و هەشتان چاڤێت وی مابنە زل[2].

٤ . باب: تحنف زيد بن عمرو بن نفيل

**بابەتێ: خۆدویرکرنا زەیدێ کورێ عەمرێ کورێ نەوفەلی ژ بوتان.**

٣٥٧٠ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَقِيَ زَيْدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ بِأَسْفَلِ بَلْدَحَ، قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) الْوَحْيُ، فَقُدِّمَتْ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) سُفْرَةٌ، فَأَبَى أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ زَيْدٌ: إِنِّي لَسْتُ آكُلُ مِمَّا تَذْبَحُونَ عَلَى أَنْصَابِكُمْ، وَلاَ آكُلُ إِلاَّ ما ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ. وَأَنَّ زَيْدَ بْنَ عَمْرٍو كانَ يَعِيبُ عَلَى قُرَيْشٍ ذَبَائِحَهُمْ، وَيَقُولُ: الشَّاةُ خَلَقَهَا اللهُ، وَأَنْزَلَ لَهَا مِنَ السَّمَاءِ الماءَ، وَأَنْبَتَ لَهَا مِنَ الأَرْضِ، ثُمَّ تَذْبَحُونَهَا عَلَى غَيْرِ اسْمِ اللهِ! إِنْكاراً لِذلِكَ وَإِعْظَاماً لَهُ. [خ٣٨٢٦،٣٨٢٧].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ل بنێ بەلدەح[3] گەهشتە زەیدێ کورێ عەمرێ کورێ نەوفەلی[4]، بەری وەحی بۆ پێغەمبەری (ﷺ) بهێت، سفرا خوارنێ بۆ هاتە پێشکێشکرن، پێغەمبەر (ﷺ) رازی نەبوو ژێ بخۆت، پاشی زەیدی گۆت: ب راستی ئەز ژ وان ڤەکوشتییان ناخۆم یێت هوین ل سەر بەرێت بوتان ڤەدکوژن، تنێ ئەز وان دخۆم یێت ناڤێ خودێ ل سەر هاتییە ئینان، و زەیدێ

---

(١) ئەو جهە د ناڤبەرا روکنێ بەرێ رەش و جهێ ئیبراهیمیدایە، دا کارێ سویندێ مەزن بهێتە زانین و ساناهی و بچویك نەهێتە زانین.

(٢) ئانکو: هەمی مرن.

(٣) نهالەکە ل مەکەهێ ژ لایێ رۆژئاڤایێڤە.

(٤) زەید دبیتە کورمامێ عومەرێ کورێ خەتتابی و خۆ ل سەر دینێ ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) دزانی.

**کوڕێ عەمری کێماسی بۆ قورەیشییان ددانا ل سەر ڤەکوشتییێت وان و دگۆت: پەز خودێ یێ چێ کری و ئاڤ بۆ ژ عەسمانی یا ئینایە خوار و عەرد یێ بۆ شین کری و پاشی هوین ب ناڤەکێ دی نە یێ خودێ سەرژێ دکەن، نەرازیبوون ژ کارێ وان و مەزن دانان.**

٥ ـ باب: نسب النبي (ﷺ)

**بابەتێ: بنەمالا پێغەمبەری (ﷺ).**

٣٥٧١ - (م) عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: **(إِنَّ اللهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى قُرَيْشاً مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِي هَاشِمٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ).** [م٢٢٧٦].

**ژ واسیلەیێ کوڕێ ئەسقەعی (رضي الله عنه) گۆت: من گوھ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ژ دویندەھا ئیسماعیلی خودێ کینانە ژێ گرت و قورەیشی ژ کینانە ژێ گرتن و ژ قورەیشییان هاشمی ژێ گرتن و ئەز ژ هاشمییان ژێ گرتم).**

٦ ـ باب: شق صدره (ﷺ) وهو صغير

**بابەتێ: کەلاشتنا سینگێ وی (ﷺ) و ئەو یێ بچویك.**

٣٥٧٢ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَتَاهُ جِبْرِيلُ (ﷺ) وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، فَأَخَذَهُ فَصَرَعَهُ، فَشَقَّ عَنْ قَلْبِهِ، فَاسْتَخْرَجَ الْقَلْبَ، فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ عَلَقَةً، فَقَالَ: هَذَا حَظ الشَّيْطَانِ مِنْكَ. ثُمَّ غَسَلَهُ فِي طَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ بِمَاءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ لأَمَهُ، ثُمَّ أَعَادَهُ فِي مَكَانِهِ. وَجَاءَ الْغِلْمَانُ يَسْعَوْنَ إِلَى أُمِّهِ ـ يَعْنِي: ظِئْرَهُ ـ فَقَالُوا: إِنَّ مُحَمَّداً قَدْ قُتِلَ، فَاسْتَقْبَلُوهُ وَهُوَ مُنْتَقِعُ اللَّوْنِ.

قَالَ أَنَسٌ: وَقَدْ كُنْتُ أَرَى أَثَرَ ذلِكَ الْمِخْيَطِ فِي صَدْرِهِ. [م: الإيمان ١٦٢ (٢٦١)]

**ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: جبریل (عليه السلام) هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و وی د گەل بچویکان یاری دکرن، ئینا پێغەمبەر گرت و دانا عەردی و سینگێ وی کەر کر و دلێ وی دەرێخست و پار چەکا خوینا رەش ژێ دەرئێخست، و گۆت: ئەڤە بارا شەیتانییە ژ تە، پاشی د تەشتەکا زێریدا ب ئاڤا زەمزەمێ شویشت، پاشی گەھاندە ئێك و پاشی زڤراندەڤە جهێ وی، و بچویك ب لەز بۆ دەڤ دایکا وی چۆن ـ ئانکو دایکا وی یا شیری ـ گۆتن: موحەممەد هاتە کوشتن، و ئەو ژی بەرف ویڤە چۆن و دیتن رەنگێ وی یێ هاتییە گوھۆرین.**

**ئەنەسی گۆت: و من نیشانا وێ درواریێ ل سینگێ وی ددیت.**

٧ ـ باب: رعي النبي (ﷺ) الغنم

**بابەتێ: شڤانییا پێغەمبەری (ﷺ)یا پەزی.**

٣٥٧٣ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(ما بَعَثَ اللهُ نَبِيّاً إِلاَّ رَعى الْغَنَمَ)** ، فَقَالَ أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ؟ فَقَالَ: **(نَعَمْ، كُنْتُ أَرْعَاهَا عَلَى قَرَارِيطَ لأَهْلِ مَكَّةَ)**.[خ٢٢٦٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودێ پێغەمبەر نەهنارتییە هەكە شڤانییا پەزی نەكربیت)، هەڤالێت وی گۆتنێ: و تە؟ گۆت: (بەلێ، ئەز ل بەر پەزێ خەلكێ مەكەهێ بووم سەر چەند قیراتەكان)[1].**

٨ ـ باب: مبشرات بالنبوة

**بابەتێ: مزگینییێت ب پێغەمبەراتییێ.**

٣٥٧٤ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنِّي لأَعْرِفُ حَجَراً بِمَكَّةَ، كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ، إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ)**. [م٢٢٧٧].

**ژ جابرێ كورێ سەمورەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ئەز بەرەكی ل مەكەهێ دزانم سلاڤ دكرە من بەری ئەز بهێمە هنارتن، ب راستی ئەز ڤێ كاڤێ ژی دزانم كیژكە).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) قەراریت: هندە پشكێت دینار و دەرهەمانە.

## الفصل الثاني: البعثة والمرحلة المكية

## پشكا دووێ: هنارتنا پێغەمبەری و قۆناغا مەكەهێ

### ١ . باب: مبعث النبي (ﷺ)

### بابەتێ: هنارتنا پێغەمبەری (ﷺ).

٣٥٧٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: بُعِثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَرْبَعِينَ سَنَةً، فَمَكَثَ بِمَكَّةَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحى إِلَيْهِ، ثُمَّ أُمِرَ بِالْهِجْرَةِ فَهَاجَرَ عَشْرَ سِنِينَ، وَمَاتَ وَهْوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [خ٣٩٠٢ (٣٨٥١)/ م٢٣٥١].

**ژ ئیبن عەبا سی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: پێغەم بەرێ خودێ (ﷺ) د چل سالییێدا ها تە ھ نارتن، و سێزدە سالان ما ل مە كەھێ وە حی بۆ دها تە ھ نارتن، پا شی فەرمانا وی ب مەشەختبوونێ هاتە كرن و دەھ سالان ژی د مە شختبوونێدا بوو، و مر و ژییێ وی شێست و سێ سال بوون.**

### ٢ . باب: بدء الوحي

### بابەتێ: دەستپێكرنا وەحییێ.

٣٥٧٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا؛ إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ، فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ . وَهُوَ: التَّعَبُّدُ . اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الملَكُ فَقَالَ: اقْرَأْ، قَالَ: **(مَا أَنَا بِقَارِئٍ)**. قَالَ: **(فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَة حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ، فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ، فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ:** ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣﴾ [العلق] ).

فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رضي الله عنها فَقَالَ: **(زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي)**. فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ: **(لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى**

نَفْسِي). فَقَالَتْ خَدِيجَةُ: كَلاَّ، وَاللهِ! مَا يُخْزِيكَ اللهُ أَبَداً، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ ، وَتَكْسِبُ المَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ.

فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى، ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ، وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاء اللهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخاً كَبِيراً قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: يَا ابْنَ عَمِّ! اسْمَعْ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ.

فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي! مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) خَبَرَ مَا رَأَى، فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللهُ عَلَى مُوسَى، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعاً! ، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيّاً إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ**). قَالَ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ؛ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْراً مُؤَزَّراً. [خ٣/ م١٦٠].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) وێ گۆت: جارا ئێكێ ژ وەحییێ بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دەست پێ كری خەونێن راست و دورست ددیتن، و هەر خەونەكا دیتبا ئەو وەكی رۆناهییا سپێدێ دهات[1]، پاشی مانا ب تنێ ل بەر شرین بوو، و ب تنێ د ما ل شكەفتا حەرائێ و پەرستن تێدا دكر، چەندین شەڤان تێدا د ما بەری بهێت بگەریتەڤە ل دەڤ هەڤژینا خۆ و كارێ خۆ بۆ هندێ دكرەڤە پاشی دا زڤریتەڤە دەڤ خەدیجایێ و بۆ هندێ وی دەمی كارێ خۆ دكرەڤە، هەتا راستی بۆ هاتی، و ئەو د شكەفتا حەرائێڤە بوو و ملیاكەت هاتە دەڤ و گۆتێ: بخوینە، گۆت: (ئەز نەخواندەڤانم)، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (وی ئەز گرتم و ب نك خۆڤە كێشام و ئەز ب هێز شداندم هەتا گڤاشتنا من گەهشتییە دویماهییێ، پاشی ئەز بەردام و گۆت بخوینە، من گۆتێ: ئەز نەخواندەڤانم، ئینا بۆ جارا دووێ ئەز گرتم و ب نك خۆڤە كێشام و ئەز ب هێز شداندم هەتا گڤاشتنا من گەهشتییە دویماهییێ، پاشی ئەز بەردام و گۆت بخوینە، من گۆتێ: ئەز نەخواندەڤانم، ئینا بۆ جارا سێیێ ئەز گرتم و ب نك خۆڤە كێشام، و ئەز ب هێز شداندم پاشی ئەز بەردام و گۆت بخوینە، ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ * ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴾).**

(١) نانكو: دەق و دەق دا بیتە راستی و چاوا ددیت وەسا دهات، و چو خەون نەددیتن ئەگەر سپێدە دەركەتبا وەكی وێ چێ نەببا.

**ب ڤان پەیڤان پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەگەریا و دلێ وی یێ خۆ دقوتیت، چۆ دەڤ خەدیجایا كچا خوەیلدی (رضي الله عنها) و گۆت: (من بنخێڤن من بنخێڤن)! ئەو نخافت و نڤین ب سەر دادان، هەتا ترس ب سەردا چۆیە خوار، وی گۆتە خەدیجایێ و سەرهاتی بۆ ڤەگێرا و گۆت: (ب راستی ئەز ژ خۆ دترسیام)، ئینا خەدیجایێ گۆت: نەخێر والله خودێ چو جاران تە شەرمزار ناكەت؛ چونكی تو یێ مرۆڤانییێیی، و هاریكارییا بارگرانی دكەی، و ددەیە خەلكێ نەیی و هەژار، و قەدرێ مێڤانان دگری، و هاریكارییا لێقەومییان دكەی.**

**خەدیجایێ پێغەمبەر (ﷺ) د گەل خۆ برە دەڤ وەرەقەیێ كورێ نەوفەلێ كورێ ئەسەدێ كورێ عەبدولعوزایی، كورێ مامێ خەدیجایێ، و ئەو مرۆڤەك بوو د نەزانینێدا ببوو فەلە، زمانێ عیبری دزانی و دنڤیسی، ڤێجا ئنجیل ب زمانێ عیبرانی دنڤیسی، هندی خودێ ئەوا خودێ ڤیایی بنڤیسیت و پیرەمێرەكێ مەزن بوو، و كۆرە ببوو، خەدیجایێ گۆتێ: پسمام گوهدارییا برازایێ خۆ بكە.**

**وەرەقەیی گۆتێ: برازا تە چ دیتیە؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەوا دیتی بۆ ڤەگێرا، ئینا وەرەقەیی گۆتێ: ئەو جبریلە خودانێ نهێنییا خێرێ ئەوە یێ خودێ بۆ مووسایی ئینایە خوارێ، خۆزی ئەز هێژ یێ گەنج و ل سەر خۆ بام، خۆزی ئەز یێ ساخبام دەمێ ملەتێ تە تە دەردئێخن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی ئەو دێ من دەرێخن)؟! گۆت: بەلێ؛ چونكی كەسەك ب ڤێ نەهاتییە یا تو پێ هاتی هەكە دژمناتییا وی نەهاتبیتە كرن، هەكە ئەز هەتا هینگێ بمینمە ساخ دێ ب هێز پشتەڤانییا تە كەم.**

٣٥٧٧ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ الأَنْصَارِيِّ أنه قَالَ. وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ. قَالَ (ﷺ): (بَيْنَا أَنَا أَمْشِي إِذْ سَمِعْتُ صَوْتاً مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي، فَإِذَا الْمَلَكُ الذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢﴾، إلى قَوْلِهِ: ﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥﴾[المدثر] . فَحَمِيَ الْوَحْيُ وَتَتَابَعَ). [خ٤/ م١٦١].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایێ ئەنساری ( خودێ ژ وان رازی بیت) وی گۆت - و ئەو د راستا راوەستیانا وەحییێدا دئاخفت - گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ل دەمەكی ئەز ب**

**رێ دچۆم من گوهـ ل دەنگەكی ژ عەسمانی بوو، من سەرێ خۆ بلند كر، من هند دیت ئەو ملیاكە تە ئەوێ ل حەرائێ هاتی یە دەڤ من، ل سەر كور سییەكێ د ناڤ بەرا عەرد و عەسمانان‌دا یێ روینشتی بوو، ئەز ژێ ترسیام، ئینا ئەز زڤریم و من گۆت: من بنخێڤن، من بنخێڤن، ئینا خودێ ئەڤ ئایە تە ئینا نە خوار: ﴿يا أَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنذِرْ﴾ هەتا گەهشتییە گۆتنا وی ﴿وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ﴾ ئێدی د دویڤدا وەحی گەرم و بەردەوام بوو).**

٣٥٧٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المؤمِنِينَ رضي الله عنها: أَنَّ الحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ رضي الله عنه سَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَحْيَاناً يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأَحْيَاناً يَتَمَثَّلُ لِيَ المَلَكُ رَجُلاً، فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ).**

قَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ، فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقاً. [خ٢/ م٢٣٣٣].

**ژ عائیشایێ دەیكا مە مو سلمانان (رضي الله عنها) گۆت: حار سێ كورێ هیشامی (رضي الله عنه) پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، چاوا وەحی بۆ تە دهێت؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هندەك جاران بۆ من وەكی زنگێنا زەنگلێ دهێت، و ئەڤە ژ هەمیان دژوارتر و گرانترە ل سەر من، پاشی دا جبریل (سلاڤ لێ بن) من هێلیت پشتی ئەوا وی دگۆت من هەمی ژ وی ژبەر دكر و وەردگرت و هندە جاران جبریل ب رەنگێ زەلامی دهاتە دەڤ من و د گەل من دئاخفت و ئەوا دگۆت من وەرد گرت و ژ بەر دكر).**

**عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من ئەو ددیت دەمێ وەحی بۆ دهات و ل رۆژەكا زێدە یا سار و دەمێ ژێ ب دویماهی دهات ئەنیا وی خوهـ پێدا دهاتە خوار.**

### ٣ ـ باب: قوله تعالى: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾

## بابەتێ: گۆتنا خودێ ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾.

٣٥٧٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَ أَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾[الشعراء] قَالَ: **(يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ . أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا . اشْتَرُوا**

أَنْفُسَكُمْ ، لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئاً. يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللهِ شَيْئاً. يَا عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللهِ شَيْئاً. وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللهِ لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً. وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَلِينِي ما شِئْتِ مِنْ مالِي، لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً). [خ٢٧٥٣/ م٢٠٦].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ خودایێ هەر ب هێز و مەزن ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ﴾ ئینایە خوارێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو و گۆت: **(گەلی قورەیشییان ـ یان پەیڤەكا وەكی وێ ـ خۆ رزگار بكەن ئەز نەشێم تشتەكی ژ دەڤ خودێ بگەهینمە هەوە یان تشتەكی ژ دەڤ خودێ ژ هەوە بدەمە پاش، گەلی بنەمالا عەبدی مەناف ئەز نەشێم تشتەكی ژ دەڤ خودێ بگەهینمە هەوە یان تشتەكی ژ دەڤ خودێ ژ هەوە بدەمە پاش، ئەی عەباسێ كورێ عەبدولموتەلب ئەز نەشێم تشتەكی ژ دەڤ خودێ بگەهینمە تە یان تشتەكی ژ دەڤ خودێ ژ تە بدەمە پاش، ئەی سەفییا مەتا پێغەمبەرێ خودێ ئەز نەشێم تشتەكی ژ دەڤ خودێ بگەهینمە تە یان تشتەكی ژ دەڤ خودێ ژ تە بدەمە پاش، و ئەی فاتما كچا موحەممەدی تە چ ژ مالێ من دڤێت ژ من بخوازە ئەز نەشێم تشتەكی ژ دەڤ خودێ بگەهینمە تە یان تشتەكی ژ دەڤ خودێ ژ تە بدەمە پاش).**

٣٥٨٠ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾ وَرَهْطَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ، خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَتَّى صَعِدَ الصَّفَا، فَهَتَفَ: (يَا صَبَاحَاهْ!). فَقَالُوا: مَنْ هَذَا؟ فَاجْتَمَعُوا إِلَيْهِ، فَقَالَ: (أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلاً تَخْرُجُ مِنْ سَفْحِ هَذَا الْجَبَلِ، أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ) ؟ قَالُوا: ما جَرَّبْنَا عَلَيْكَ كَذِباً، قَالَ: (فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ). قَالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبّاً لَكَ، ما جَمَعْتَنَا إِلاَّ لِهَذَا، ثُمَّ قَامَ، فَنَزَلَتْ: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ﴿١﴾﴾[المسد] وَقَدْ تَبَّ. هكَذَا قَرَأَهَا الأَعْمَشُ يَوْمَئِذٍ. [خ٤٩٧١ (١٣٩٤)/ م٢٠٨].

ژ ئیبن عەباسی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ هاتییە خوارێ و مرۆڤێت خۆ ژ وان یێت دلسۆز، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفت هەتا سەركەفتییە چیایێ (صفا)یێ و گازی كر و گۆت: **(یا صباحاه)**(1)، خەلك كۆم بوون،

---

(١) ئەڤە گۆتنەكە بۆ داخوازا خرڤەبوون و كۆمبوونا ب لەز یا خەلكی دهاتە ب كارئینان.

ئینا گۆت: **(ئەرێ ئەگەر ئەز بێژمە هەوە هندەك سویارێن هەسپان ل بنێ ڤی چیایی دێ دەر كەڤن و ب سەر وەدا گرن، ئەرێ هوین دێ ژ من باوەر كەن)؟** گۆتن: بەلێ، مە ژ راستییێ پێڤەتر ژ تە گوهـ لێ نەبوویە، ئینا گۆت: **(پا ئەز پێغەمبەرم و ژ لایێ خودێڤە هاتیمە هنارتن، ئەز هەوە ئاگەهدار دكەم و هەوە هشیار دكەم و دترسینم ژ عەزابەكا دژوار)**، ئینا ئەبو لەهەبی گۆت: قەدا ب تە بكەڤیت، دەست و لەپێن تە ب عەردی بكەڤن، و خوسارەتی بۆ تە بیت، تە ئەم كۆم نەكرینە بۆ ڤێ نەبیت، پاشی رابوو، ئینا ئەڤە هاتە خوارێ ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ و ئەو زیانمەند بوو، وێ رۆژێ ئەعمەش ب ڤی رەنگی ئەو ئایەت خواند؟

## ٤ . باب: المسلمون الأوائل

## بابەتێ: موسلمانێت ئێكێ.

٣٥٨١ - (خ) عَنْ عمار قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَمَا مَعَهُ؛ إِلاَّ خَمْسَةُ أَعْبُدٍ وَامْرَأَتَانِ، وَأَبُو بَكْرٍ. [خ٣٦٦٠]

**ژ عەمماری (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت كەس د گەل نەبوو پێنج بەندە و دو ژن و ئەبوبەكر نەبیت.**

## ٥ . باب: ما لقي النبي (ﷺ) وأصحابه بمكة

## بابەتێ: ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) و هەڤالێت وی ل مەكەهێ بەرهنگاربووینێ.

٣٥٨٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ، وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ، إِذْ قَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أَيُّكُمْ يَجِيءُ بِسَلَى جَزُورِ بَنِي فُلاَنٍ، فَيَضَعُهُ عَلَى ظَهْرِ مُحَمَّدٍ إِذَا سَجَدَ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَى الْقَوْمِ فَجَاءَ بِهِ، فَنَظَرَ حَتَّى إذا سَجَدَ النَّبِيُّ (ﷺ)، وَضَعَهُ عَلَى ظَهْرِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، وَأَنَا أَنْظُرُ لاَ أغني شَيْئاً، لَوْ كَانَ لِي مَنَعَةٌ ، قَالَ: فَجَعَلُوا يَضْحَكُونَ، وَيُحِيلُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) سَاجِدٌ لاَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، حَتَّى جَاءَتْهُ فَاطِمَةُ، فَطَرَحَتْ عَنْ ظَهْرِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ قَالَ: **(اللَّهُمَّ! عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ)**. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَشَقَّ عَلَيْهِمْ إِذْ دَعَا عَلَيْهِمْ. قَالَ: وَكَانُوا يُرَوْنَ أَنَّ الدَّعْوَةَ فِي ذَلِكَ الْبَلَدِ مُسْتَجَابَةٌ، ثُمَّ سَمَّى: **(اللَّهُمَّ! عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ، وَعَلَيْكَ بِعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ)**. وَعَدَّ السَّابِعَ فَلَمْ نَحْفَظْهُ، قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِينَ عَدَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) صَرْعَى، فِي الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ. [خ٢٤٠/ م١٧٩٤].

- ولفظ مسلم: وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَمِيلُ عَلَى بَعْضٍ.. فَلَمَّا سَمِعُوا صَوْتَهُ، ذَهَبَ عَنْهُمُ الضِّحْكُ، وَخَافُوا دَعْوَتَهُ.

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ ل كەعبێ دكر، و ئەبو جەهل و هندە هەڤالێت وی د روینشتی بوون، وی دەمی هندەكا ژ وان گۆ تە هندەكێت دی ژ وان: كی ژ هەوە دێ كەڤلێ ل سەر تێژكێت حێشترێ یێت حێشترێت فلان ب نەمالێ ئینیت و دانیتە سەر پشتا موحەممەدی دەمێ د چیتە سوجدەیێ؟ ئینا خرابێ وان ب لەز رابوو و ئەو كەڤلك ئینا و بەرێ خۆ دایێ هەتا پێغەمبەر (ﷺ) چۆیە سوجدەیێ دانانە سەر پشتا وی و د ناڤبەرا هەردو ملێت ویدا و من بەرێ خۆ ددایێ و ئەز نەدشیام تشتەكی بكەم، ئاخ خۆزی من پشتەك هەبایە، و گۆت: دەستهاڤێتنێ كرنە كەنی و هندەك ب سەر هندەكاندا د چن و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ د سوجدەیێدا و سەرێ خۆ بلند ناكەت، هەتا فاتیما هاتی و ژ سەر پشتا وی هاڤێتی و سەرێ خۆ راكر، پاشی سێ جاران گۆت: (ئەی خودا قورەیشییان ب ئێزادانێ بگرە) و ئەڤە ل سەر وان یا گران بوو و نفرین ل وان كرن و وان دزانی دوعایا وی یا قەبویلكریە، پاشی ناڤ ئینان (ئەی خودا ئەبی جەهلی ب ئێزایێ بگرە، و عوتبەیێ كورێ رەبیعەیی ب ئێزایێ بگرە و شەیبەیێ كورێ رەبیعەیی و ئومەییەیێ كورێ خەلەفی و عوقبەیێ كورێ ئەبی موعەیتی) و یێ حەفتێ گۆت مە ژبەر نەكر، گۆت: ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ئەوێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ناڤێت وان ئینایین من كوشتی د بیرا بەدرێدا دیتن.**

- **و بێژەیا موسلمی: ب سەر ئێكدودا خوار بوون و دەمێ وان گوه ل دەنگێ وی بوویی كەنیا وان نەما و ژ دوعایا وی ترسیان.**

٣٥٨٣ - (خ) عَنْ خَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَهْوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً لَهُ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، قُلْنَا لَهُ: أَلاَ تَسْتَنْصِرُ لَنَا؟ أَلاَ تَدْعُو اللهَ لَنَا؟ قَالَ: (**كانَ الرَّجُلُ فِيمَنْ قَبْلَكُمْ يُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ، فَيُجْعَلُ فِيهِ، فَيُجَاءُ بِالْمِنْشَارِ فَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُشَقُّ بِاثْنَتَيْنِ، وَمَا يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ. وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الحَدِيدِ ما دُونَ لَحْمِهِ مِنْ عَظْمٍ أَوْ عَصَبٍ، وَمَا يَصُدُّهُ ذلِكَ عَنْ دِينِهِ. وَاللهِ لَيُتِمَّنَّ**

هَذَا الأَمْرَ، حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مِنْ صَنْعَاءَ إِلَى حَضْرَمَوْتَ، لاَ يَخَافُ إِلاَّ اللهَ، أَوِ الذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ، وَلكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ). [خ٣٦١٢].

ژ خەبابێ كورێ ئەرەتتی، (ﷺ)، گۆت: مە گازندا خۆ برە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و وی پالا خۆ دابوو عەبایێ خۆ ل بەر سیبەرا كەعبێ، مە گۆت: ما تو داخوازا سەركەفتنێ بۆ مە ناكەی، ما تو دوعا بۆ مە ناكەی؟ گۆت **(ب راستی دا زەلامی ژ پێت بەری هەوە ئینن و دا عەردی بۆ كۆلن و كەنە تێدا و مشاری ئینن داننە سەر سەرێ وی و كەنە دو كەر، و دا گۆشت و هەستیێت وی ب شەهێت ئاسنی شەكەن، ئەڤێ ئەو ژ دینێ وی نەددا پاش، ئەز ب خودێ كەمە خودێ، دێ ڤی دینی تمام كەت هەتا سویار ژ سەنعائێ بێتە حەزرەمەوتێ ژ بلی خودێ و ژ گورگی ل سەر پەزێ خۆ ژ تشتەكێ دی نەترسیت بەلێ هوین لەزێ دكەن).**

٣٥٨٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: هَلْ يُعَفِّرُ مُحَمَّدٌ وَجْهَهُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ قَالَ: فَقِيلَ: نَعَمْ. فَقَالَ: وَاللاَّتِ وَالْعُزَّى لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذلِكَ لأَطَأَنَّ عَلَى رَقَبَتِهِ، أَوْ لأُعَفِّرَنَّ وَجْهَهُ فِي التُّرَابِ. قَالَ: فَأَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ يُصَلِّي . زَعَمَ . لِيَطَأَ عَلَى رَقَبَتِهِ، قَالَ: فَمَا فَجِئَهُمْ مِنْهُ؛ إِلاَّ وَهُوَ يَنْكِصُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَيَتَّقِي بِيَدَيْهِ، قَالَ: فَقِيلَ لَهُ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَخَنْدَقاً مِنْ نَارٍ وَهَوْلاً وَأَجْنِحَةً.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَوْ دَنَا مِنِّي لاَخْتَطَفَتْهُ الْمَلاَئِكَةُ عُضْواً عُضْواً). [م٢٧٩٧].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: ئەبو جەهلی گۆت: ئەرێ موحەممەد د ناڤ هەودا دچیت نڤێژێ دكەت و دچیتە سوجدەیێ؟ گۆت: گۆتنێ بەلێ، ئینا گۆت: سویند ب لات و عوززایی، ئەگەر ئەز ببینم وەدكەت دێ پێ ل ستۆیێ وی دانم، یان دێ ناڤچاڤێت وی د ئاخێرا تۆزەكی كەم، گۆت: و ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو یێ نڤێژێ دكەت، ئەبو جەهل چو دا پێ ل ستۆیێ وی دانیت، گۆت: وان هند دیت ئەو یێ پشت و پشت دهێت خۆ ب دەستێت خۆ دپارێزیت، ئینا گۆتنێ: تە خێرە؟ گۆت: د ناڤبەرا من و ویدا خەندەكەكا ئاگری و ترس و چەنگ هەبوون.

ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەگەر ئەو نێزیكی من ببا دا هەر ملیاكەتەك ئەندامەكێ وی ژێ كێشن).**

## ٦ . باب: إسلام أبي ذر

## بابەتێ: موسلمانبوونا ئەبی زەڕی

٣٥٨٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا بَلَغَ أَبَا ذَرٍّ مَبْعَثُ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ لأَخِيهِ: ارْكَبْ إِلَى هَذَا الْوَادِي، فَاعْلَمْ لِي عِلْمَ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، يَأْتِيهِ الْخَبَرُ مِنَ السَّمَاءِ، وَاسْمَعْ مِنْ قَوْلِهِ ثُمَّ ائْتِنِي. فَانْطَلَقَ الأَخُ حَتَّى قَدِمَهُ، وَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَبِي ذَرٍّ فَقَالَ لَهُ: رَأَيْتُهُ يَأْمُرُ بِمَكَارِمِ الأَخْلاَقِ، وَكَلاَماً ما هُوَ بِالشِّعْرِ.

فَقَالَ: ما شَفَيْتَنِي مِمَّا أَرَدْتُ. فَتَزَوَّدَ وَحَمَلَ شَنَّةً لَهُ فِيهَا ماءٌ، حَتَّى قَدِمَ مَكةَ، فَأَتَى المسْجِدَ، فَالْتَمَسَ النَّبِيَّ (ﷺ) وَلاَ يَعْرِفُهُ، وَكَرِهَ أَنْ يَسْأَلَ عَنْهُ حَتَّى أَدْرَكَهُ بَعْضُ اللَّيْلِ، فَرَآهُ عَلِيٌّ فَعَرَفَ أَنَّهُ غَرِيبٌ، فَلَمَّا رَآهُ تَبِعَهُ فَلَمْ يَسْأَلْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ احْتَمَلَ قِرْبَتَهُ وَزَادَهُ إِلَى المسْجِدِ، وَظَلَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ وَلاَ يَرَاهُ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى أَمْسَى، فَعَادَ إِلَى مَضْجَعِهِ، فَمَرَّ بِهِ عَلِيٌّ فَقَالَ: أَمَا نَالَ لِلرَّجلِ أَنْ يَعْلَمَ مَنْزِلَهُ؟ فَأَقَامَهُ فَذَهَبَ بِهِ مَعَهُ، لاَ يَسْأَلُ وَاحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شَيْءٍ، حَتَّى إِذَا كانَ يَوْمُ الثَّالِثِ، فَعَادَ عَلِيٌّ على مِثْلِ ذلِكَ، فَأَقَامَ مَعَهُ ثُمَّ قالَ: أَلاَ تُحَدِّثُنِي ما الَّذِي أَقْدَمَكَ؟ قالَ: إِنْ أَعْطَيْتَنِي عَهْداً وَمِيثَاقاً لَتُرْشِدَنَّنِي فَعَلْتُ، فَفَعَلَ، فَأَخْبَرَهُ، قالَ: فَإِنَّهُ حَقٌّ، وَهُوَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَإِذَا أَصْبَحْتَ فَاتْبَعْنِي، فَإِنِّي إِنْ رَأَيْتُ شَيْئاً أَخَافُ عَلَيْكَ قمْتُ كَأَنِّي أُرِيقُ الماءَ ، فَإِنْ مَضَيْتُ فَاتْبَعْنِي حَتَّى تَدْخُلَ مَدْخَلِي، فَفَعَلَ.

فَانْطَلَقَ يَقْفُوهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَدَخَلَ مَعَهُ، فَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ، وَأَسْلَمَ مَكَانَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): (**ارْجِعْ إِلَى قَوْمِكَ فَأَخْبِرْهُمْ حَتَّى يَأْتِيَكَ أَمْرِي**). قالَ: وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَصْرُخَنَّ بِهَا بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ. فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى المسْجِدَ، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، ثُمَّ قامَ الْقَوْمُ فَضَرَبُوهُ حَتَّى أَضْجَعُوهُ.

وَأَتَى الْعَبَّاسُ فأَكَبَّ عَلَيْهِ، قالَ: وَيْلَكُمْ! أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ مِنْ غِفَارٍ، وَأَنَّ طَرِيقَ تِجَارِكُمْ إِلَى الشَّامِ؟ فَأَنْقَذَهُ مِنْهُمْ. ثُمَّ عَادَ مِنَ الْغَدِ لِمِثْلِهَا، فَضَرَبُوهُ وَثَارُوا إِلَيْهِ، فَأَكَبَّ الْعَبَّاسُ عَلَيْهِ. [خ٣٨٦١ (٣٥٢٢)/ م٢٤٧٤].

**ژ ئیبن عەباسی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ بەحسێ هنارتنا پێغەمبەری (ﷺ) گەهشتییە ئەبی زەڕی، گۆتە برایێ خۆ: هەرە ڤێ نهالێ ( ئانكو مەكەهێ) بۆ من دەنگوباسێت ڤی زەلامی بزانە، ئەوێ دبێژیت: ئەز پێغەمبەرم و وەحی ژ عەسمانی بۆ دهێت، و گوهێ خۆ بدە ئاخفتنا وی و بۆ من بینە، برایێ وی دەركەفت و چۆ هەتا**

گەهشتییە مەكەهێ، و گوهێ خۆ دایە ئاخفتنا وی و پاشی زڤریڤە دەڤ ئەبی زەڕی و گۆتێ: من دیت فەرمانێ ب رەوشت و سنجێت بلند و باش دكەت و من ئاخفتنەك ژێ دیت نەهۆزانە.

ئینا گۆت: تە دلێ من هین نەكر ژ وێ یا من دڤیا، كارێ خۆ كر و مەشكەكا خۆ هەلگرت ئاڤ تێدا بوو هەتا هاتییە مەكەهێ، و هاتە مزگەفتێ و ل پێغەمبەری دگەریا و وی ئەو نەدنیاسی و نەدڤیا پرسیارا وی ژ ئێكی بكەت هەتا هندەك شەڤ ب سەردا هاتی، ئینا عەلی ئەو دیت و زانی یێ بیانییە ـ ڤێجا دەمێ دیتی دویڤرا چۆ و كەسێ ژ وان پرسیارا چو تشتی ژ هەڤالێ خۆ نەكر هەتا بوویە سپێدە، پاشی مەشكا خۆ و خوارنا خۆ هەلگرتن و چۆ مزگەفتێ و وێ رۆژێ ما و پێغەمبەری (ﷺ) نەدیت هەتا بوویە شەڤ، ئینا زڤری جهێ خۆ یێ نفستنێ، ئینا عەلی د بەررا بۆری و گۆت: ئەرێ ما دەم نەهاتییە ئەڤ زەلامە مالا خۆ بزانیت؟ د گەل خۆ راكر و د گەل وی چۆ و كەس ژ وان پرسیارا چو تشتی ژ هەڤالێ خۆ ناكەت هەتا بوویە رۆژا سێیێ هەر ب وی رەنگی عەلی هات و د گەل خۆ راكر و بر، و پاشی گۆت: تو بۆ من نابێژی چ تو ئینایە ڤێرێ؟ گۆت: ئەگەر دێ پەیمان و پەیمانەكا سویندخواری ل سەر دەیە من و رێكێ نیشا من دەی دێ بۆ تە بێژم، ئەو كر، ئینا بۆ گۆت، عەلی گۆت: بێ گۆمان ئەو راستییە و ئەو پێغەمبەرێ خودێیە (ﷺ) و ئەگەر سپێدە بوو ل دویڤ من وەرە و ئەگەر من تشتەك دیت ئەز پێ ژ تە بترسم دێ راوەستم هەروەكی ئەز ئاڤێ درێژم و ئەگەر ئەز چۆم ل دویڤ من وەرە هەتا دچییە وی جهێ ئەز دچمە تێڤە، وی ئەو كر.

ئەبو زەڕ چۆ و دویڤ ویڕا چۆ هەتا ئەو چۆیە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەو د گەل وی چۆیە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ژ ئاخفتنا وی گوه لێ بوو و ل وی جهی موسلمان بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: **(بزڤرە ناڤ مرۆڤێت خۆ و بۆ وان بێژە هەتا فەرمانا من دگەهیتە تە)**، گۆت: ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ئەز دێ پەیڤا ئێكبوونا خودێ و ئیسلامبوونا خۆ د ناڤ كۆما واندا ب دەنگێ بلند ئاشكەراكەم، دەركەفت هەتا هاتییە مزگەفتێ ب هەمی دەنگێ خۆ گازی كر: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ) پاش خەلك لێ رابوون و دانانێ هەتا درێژكری.

**و عەباس هات و خۆ ب سەردادا و گۆت: وەی نەخۆشی بۆ هەوە بیت ما هوین نوزانن ئەو ژ هۆزا غیفارە و ئەو رێكا بازرگانییا هەومیە بۆ شامێ؟ و ئەو ژ وان رزگار كر، پا شی رۆژا پا شتر هەر ز ڤری وی كاری، ئەو ژی را بوون و دا نانێ و ل سەر كۆم بوون، دیسا عەباسی خۆ ب سەردادا.**

**٧ . باب: إسلام عمرو بن عبسة**

**بابەتێ: موسولمانبوونا عەمرێ كورێ عەبسەیی**

٣٥٨٦ – (م) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ: قَالَ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ السُّلَمِيُّ: كُنْتُ وَأَنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، أَظنُّ أَنَّ النَّاسَ عَلَى ضَلاَلَةٍ، وَأَنَّهُمْ لَيْسُوا عَلَى شَيْءٍ، وَهُمْ يَعْبُدُونَ الأَوْثَانَ، فَسَمِعْتُ بِرَجُلٍ بِمَكَّةَ يُخْبِرُ أَخْبَاراً، فَقَعَدْتُ عَلَى رَاحِلَتِي، فَقَدِمْتُ عَلَيْهِ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُسْتَخْفِياً، جُرَءَاءُ عَلَيْهِ قَوْمُهُ، فَتَلَطَّفْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَيْهِ بِمَكَّةَ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا أَنْتَ؟ قَالَ: **(أَنَا نَبِيٌّ)** فَقُلْتُ: وَمَا نَبِيٌّ؟ قَالَ: **(أَرْسَلَنِيَ اللهُ)** فَقُلْتُ: وَبِأَيِّ شَيْءٍ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: **(أَرْسَلَنِي بِصِلَةِ الأَرْحَامِ، وَكَسْرِ الأَوْثَانِ، وَأَنْ يُوَحَّدَ اللهُ لاَ يُشْرَكُ بِهِ شَيْءٌ)** قُلْتُ لَهُ: فَمَنْ مَعَكَ عَلَى هَذَا؟ قَالَ: **(حُرٌّ وَعَبْدٌ)**. قَالَ: وَمَعَهُ يَوْمَئِذٍ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ مِمَّنْ آمَنَ بِهِ. فَقُلْتُ: إِنِّي مُتَّبِعُكَ. قَالَ: **(إِنَّكَ لاَ تَسْتَطِيعُ ذَلِكَ يَوْمَكَ هَذَا، أَلاَ تَرَى حَالِي وَحَالَ النَّاسِ؟ وَلَكِنِ ارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ، فَإِذَا سَمِعْتَ بِي قَدْ ظَهَرْتُ، فَأْتِنِي)**.

قَالَ: فَذَهَبْتُ إِلَى أَهْلِي، وَقَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمَدِينَةَ، وَكُنْتُ فِي أَهْلِي، فَجَعَلْتُ أَتَخَبَّرُ الأَخْبَارَ وَأَسْأَلُ النَّاسَ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ. حَتَّى قَدِمَ عَلَيَّ نَفَرٌ مِنْ أَهْلِ يَثْرِبَ مِنْ أَهْلِ المدِينَةِ، فَقُلْتُ: مَا فَعَلَ هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي قَدِمَ الْمَدِينَةَ؟ فَقَالُوا: النَّاسُ إِلَيْهِ سِرَاعٌ، وَقَدْ أَرَادَ قَوْمُهُ قَتْلَهُ فَلَمْ يَسْتَطِيعُوا ذلِكَ.

فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَتَعْرِفُنِي؟ قَالَ: **(نَعَمْ، أَنْتَ الَّذِي لَقِيتَنِي بِمَكَّةَ؟)** قَالَ: فَقُلْتُ: بَلَى. [م٨٣٢].

**ژ ئەبی ئومامە (رضي الله عنه) گۆت: عەمرێ كورێ عەبسەیێ سولەمی گۆت: دەمێ ئەز د نەزانینێدا من هزر دكر خەلك یێ د بەرزەبوونێدا و ئەو ل سەر چو نینن و ئەو بوتان دپەرێسن، ڤێجا من گوه لێ بوو زەلامەك ل مەكەهێ بەحسەكی ڤەدگێریت، ئینا ئەز ل حێشترا خۆ سویار بووم و ئەز هاتمە دەڤ، من دیت پێغەمبەرێ خودێ ژ بەر زێدەگاڤییا خەلكێ خۆ یا خۆ ڤەشارتی، من خۆ ڤەشارت هەتا ئەز ل مەكەهێ چۆیمە دەڤ، من گۆتێ:**

تو چی؟ گۆت: **(ئەز پێغەمبەرم)**، من گۆت: پێغەمبەر چییە؟ گۆت: **(خودێ ئەز یێ هنارتیم)**، من گۆت: ب چ تشتی تو هنارتییە؟ گۆت: **(ئەز ب باشیكرنێ د گەل مرۆڤێت مرۆڤی و ب شكاندنا سەنەم و بوتان و ب ئێككرنا خودێ و چو هەڤپشك بۆ نەئێنە چێكرن یێ هنارتیم)**. من گۆتێ: كی د گەل تەیە؟ گۆت: **(ئازا و بەندە)** گۆت: و وێ رۆژێ ئەبوبەكر و بیلال د گەل بوون ژ وان یێت باوەری پێ ئینایین، من گۆت: ب راستی ئەز دێ هێمە د گەل تە، گۆت: **(د ئەڤرۆدا تو نەشێی وە بكەی ما تو رەوشا من و خەلكی نابینی؟ بەلێ بزڤرە دەڤ خەلكێ خۆ ئەگەر تە گوه لێ بوو ئەز سەركەفتم وەرە دەڤ من)**.

گۆت: ئەز چۆمە دەڤ خەلكێ خۆ، و پێغەمبەرێ خۆدێ (ﷺ) هاتە مەدینەیێ و ئەز ل ناڤ خەلكێ خۆ بووم، و من دەست ب پرسیاركرنا دەنگوباسان كر و من پرسیارا خەلكی دكر دەمێ ئەو هاتییە مەدینەیێ، هەتا هندەك ژ خەلكێ مەدینەیێ هاتینە دەڤ من، من گۆت: ئەرێ وی زەلامی چ كر یێ هاتییە مەدینەیێ؟ گۆتن: خەلك ب لەز ب بەر ویڤە دچن و خەلكێ وی د ڤیان بكوژن بەلێ نەشیان.

ئەز هاتمە مەدینەیێ و ئەز چۆمە دەڤ، ئینا من گۆت: تو من دنیاسی ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: **(بەلێ تو ئەوی یێ ل مەكەهێ گەهشتییە من؟)** من گۆت بەلێ.

٨ - باب: إسلام عمر بن الخطاب

## بابەتێ: موسلمانبوونا عومەرێ كورێ خەتتابی.

٣٥٨٧ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: لَمَّا أَسْلَمَ عُمَرُ، اجْتَمَعَ النَّاسُ عِنْدَ دَارِهِ، وَقَالُوا: صَبَأَ عُمَرُ. وَأَنَا غُلَامٌ فَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِي. فَجَاءَ رَجُلٌ عَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْ دِيبَاجٍ، فقالَ: قَدْ صَبَأَ عُمَرُ، فَمَا ذَاكَ؟ فَأَنَا لَهُ جَارٌ، قَالَ: فَرَأَيْتُ النَّاسَ تَصَدَّعُوا عَنْهُ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: الْعَاصُ بْنُ وَائِلٍ. [خ٣٨٦٥ (٣٨٦٤)].

ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ عومەر موسلمان بووی خەلك ل دەڤ مالا وی كۆم بوون و گۆتن ژ دینێ خۆ دەركەفتییە - و ئەز بچویكەكێ فاما بووم ل سەر بانێ مالا خۆ بووم - زەلامەك هات و جلكەك ژ ئارمویشی ل بەر بوو، گۆت: عومەر یێ ژ دینێ خۆ دەركەفتی، ڤێجا ما ئەو چییە؟ ئەز پشتا ویمە، گۆت: من

**دیت خەلك ژ عومەری بەلاڤبوون و دویركەفتن، عەبدوللایی گۆت، من گۆت: ئەرێ ئەڤە كییە؟ گۆتن ئەو عاسێ كورێ وائلییە.**

٣٥٨٨ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: ما زِلْنَا أَعِزَّةً مُنْذ أَسْلَمَ عُمَرُ.[خ٣٦٨٤].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: بەردەوام ئەم ب هێزین ئەڤە ژ دەمێ عومەر موسلمان بوویی.**

## ٩ . باب: وفاة أَبي طالب

## بابەتێ: مرنا ئەبو تالبی.

٣٥٨٩ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ، جَاءَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلٍ وَعَبْدَ اللهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ المغِيرَةِ، فَقَالَ: (**أَيْ عَمِّ، قُلْ: لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، كَلِمَةً أُحَاجُّ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللهِ**). فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي أُمَيَّةَ: أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ؟! فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيُعِيدَانِهِ بِتِلْكَ المقَالَةِ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ ما كَلَّمَهُمْ: عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ المطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ: لاَ إِلهَ إِلاَّ الله، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**وَاللهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ مَا لَمْ أُنْهَ عَنْكَ**). فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾ [التوبة:١١٣] وَأَنْزَلَ اللهُ فِي أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾ [القصص:٥٦] . [خ٤٧٧٢ (١٣٦٠)/ م٢٤].

**ژ سەعیدێ كورێ موسەییەبی ژ بابێ خۆ (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەبو تالب كەفتییە بەر مرنێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ و ئەبو جەهل و عەبدوللایێ كورێ ئەبی ئومەیەیێ كورێ موغیرەیی ل دەڤ بوون، ئینا گۆت: ( ئەی مامێ من بێژە لاَ إِلهَ إِلاَّ الله، پەیڤەكە دێ بۆ تە ل دەڤ خودێ كەمە بەلگە)، ئینا ئەبو جەهلی و عەبدوللایێ كورێ ئەبی ئومەیەیی گۆتن: ئەرێ دێ پشتا خۆ دەیە دینێ عەبدولموتەلب و هێلی؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەردەوام ئەڤە بۆ دگۆت و وان ب وێ گۆتنا خۆ ئەو دزڤراندەڤە ـ هەتا ئەبو تالبی دویماهی ئاخفتن د گەل وان كری، ل سەر دینێ ئەبو تالبی، و نەڤیا ب بێژیت: (لاَ إِلهَ إِلاَّ الله) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( ئەز ب خودێ كەمە بەردەوام داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ تە خوازم هندی ئەز ژ هندێ نەهێمە پاشڤەلێدان)،**

**ئینا خودێ ئینا خوارێ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ﴾(1). و خودێ د راستا ئەبی تالبیدا ئینا خوارێ و گۆته پێغەمبەرێ خودێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ﴾(2).**

٣٥٩٠ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ)، وَذُكِرَ عِنْدَهُ عَمُّهُ فَقَالَ: **(لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُجْعَلُ فِي ضَحْضَاحٍ مِنَ النَّارِ يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ، يَغْلِي مِنْهُ دِمَاغُهُ)**. [خ٣٨٨٥/ م٢١٠].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) وی گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) و بەحسێ مامێ ل دەڤ هاتە كرن، ئینا گۆت: (بەلكی بەرهەڤانییا من رۆژا قیامەتێ مفایی ل وی بكەت، ڤێجا ژ بەر هندێ وی بكەنە د ئاگرەكێ تەنكدا بگەهیتە هەردو گۆزەكێت وی مەژیێ وی پێ دكەلیت).**

## ١٠ . باب: الذهاب إلى الطائف

## بابەتێ: چوونا تائیفێ.

٣٥٩١ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ: أَنَّهَا قالَتْ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ قالَ: **(لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ ما لَقِيتُ، وَكانَ أَشَدُّ ما لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلا وَأَنَا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي فَقَالَ: إِنَّ اللهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ اللهُ إِلَيْكَ مَلَكَ الجِبَالِ، لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، فَنَادَانِي مَلَكُ الجِبَالِ، فَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، فَقَالَ: ذلِكَ فِيمَا شِئْتَ، إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمِ الأَخْشَبَيْنِ؟)**، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللهَ وَحْدَهُ، لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً)**. [خ٣٢٣١/ م١٧٩٥].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، ـ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ـ وێ گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژەك ب سەر تەڕا هاتییە ژ رۆژا ئوحودێ گرانتر؟ گۆت: (ب راستی من گەلەك یا ژ مرۆڤێت تە دیتی، و یا ژ هەمیان گرانتر من ژ وان دیتی رۆژا عەقەبەیێ بوو(3)، من**

---

(١) رامان ب كورتی: نەدورستە بۆ پێغەمبەری و خودان باوەران، داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ موشركان بكەن.

(٢) رامان ب كورتی: تو نەشێی ئەوێ تە بڤێت راستەڕێ بكەی، بەلێ خودێیە یێ بڤێت راستەڕێ دكەت.

(٣) دبیت مەخسەد پێ ئەو رۆژ بیت یا چۆیە تائیفێ.

**هاریكاری ژ ئیبن عەبد یالێل كورێ عەبدی كولالی خواست بەرسڤا من بۆ تشتێ من دڤیا نەدا، ئەز دویڤ سەرێ خۆ چۆم و ئەز یێ خەمگین، ئەز نەهاتمە سەر هشێت خۆ ل جیاكێ رویڤییان نەبیت[1]، من سەرێ خۆ بلند كر، من هند دیت عەورەكی سیبەر یا ل من كری، من هۆ بەرێ خۆ دایێ، جبریل سلاڤ ل سەر بن تێدا بوو، گازی من كر، و گۆت: ب راستی خودێ گوهـ ل وێ ئاخفتنێ بوو ئەوا ملەتێ تە گۆتییە تە ، و چاوا بەرسڤا تە دان، و ب راستی ملیاكەتێ چیایان بۆ تە یێ هنارتی دا تو وێ فەرمانا تە بڤێت د راستا واندا لێ بكەی، ملیاكەتێ چیایان گازی من كر، و سلاڤ كرە من پاشی گۆت: یا موحەممەد ب راستی خودێ گوهـ ل وێ ئاخفتنێ بوو ئەوا ملەتێ تە گۆتییە تە، و ئەز ملیاكەتێ چیایانم و ئەز یێ هنارتیم دا تو وێ فەرمانا تە بڤێت د راستا واندا ل من بكەی، ھەكە تە بڤێت دێ ھەردو چیایێت دۆرماندۆری مەكەهێ ب سەر واندا گەهینمە ئێك)، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نەخێر، بەلكی ئەز هیڤی دكەم خودێ وی ژ پشتا وان دەربێخیت یێ خودێ ب تنێ بپەرێسیت و چو تشتان بۆ نەكەتە شریك).**

١١ ـ باب: الإسراء والمعراج

**بابەتێ: چۆنا ب شەڤ و بلندبوونا عەسمانان.**

٣٥٩٢ – ( ق) عَنْ أَنَس بن مالك، عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ رضي الله عنهما: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) حَدَّثَهُمْ عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِيَ بِهِ: **(بَيْنَما أَنَا فِي الحَطِيمِ، ـ وَرُبَّمَا قَالَ: فِي الْحِجْرِ ـ مُضْطَجِعاً، إِذْ أَتَانِي آتٍ فَقَدَّ ـ** قالَ: وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: **فَشَقَّ ـ ما بَيْنَ هذِهِ إِلَى هذِهِ ـ** فَقُلْتُ لِلْجَارُودِ وَهُوَ إِلَى جَنْبِي: ما يَعْنِي بِهِ؟ قَالَ: مِنْ ثُغْرَةِ نَحْرِهِ إِلَى شِعْرَتِهِ، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: مِنْ قَصِّهِ إِلَى شِعْرَتِهِ ـ **فَاسْتَخْرَجَ قَلْبِي، ثُمَّ أُتِيتُ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ مَمْلُوءَةٍ إِيمَاناً، فَغُسِلَ قَلْبِي، ثُمَّ حُشِيَ ثُمَّ أُعِيدَ، ثُمَّ أُتِيتُ بِدَابَّةٍ دُونَ البَغْلِ وَفَوْقَ الْحِمَارِ أَبْيَضَ ـ** فَقَالَ لَهُ الجَارُودُ: هُوَ الْبُرَاقُ يَا أَبَا حَمْزَةَ؟ قَالَ أَنَسٌ: نَعَمْ ـ **يَضَعُ خَطْوَهُ عِنْدَ أَقْصى طَرْفِهِ، فَحُمِلْتُ عَلَيْهِ.**

**فَانْطَلَقَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَاسْتَفْتَحَ، فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِهِ، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفُتِحَ،**

---

(١) ڤەرن: جیایێ بچویكە، ئەڤرۆ جهێ ئیحرام بەستنێیە بۆ خەلكێ نەجدێ.

فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا فِيها آدَمُ، فَقَالَ: هَذَا أَبُوكَ آدَمُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ السَّلاَمَ، ثُمَّ قَالَ: مَرْحَباً بِالاِبْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي، حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الثَّانِيَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِهِ، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفَتَحَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ إِذَا يَحْيَى وَعِيسى، وَهُمَا ابْنَا الخَالَةِ، قالَ: هذا يَحْيَى وَعِيسى فَسَلِّمْ عَلَيْهِمَا، فَسَلَّمْتُ، فَرَدَّا، ثُمَّ قَالاَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفُتِحَ. فَلَمَّا خَلَصْتُ إِذَا يُوسُفُ، قالَ: هذَا يُوسُفُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ وَالنبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الرَّابِعَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: أَوَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِه، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَفُتِحَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ إِلَى إِدْرِيسَ، قالَ: هَذَا إِدْرِيسُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثُمَّ قالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الخَامِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ (ﷺ)، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قِيلَ: مَرْحَباً بِه، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا هَارُونُ، قالَ: هَذَا هَارُونُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثمّ قالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ السَّادِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: مَنْ مَعَكَ؟ قالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: مَرْحَباً بِه، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا مُوسى، قَالَ: هَذَا مُوسَى فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ ثُمَّ قالَ: مَرْحَباً بِالأَخِ الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ، فَلَمَّا تَجَاوَزْتُ بَكى، قِيلَ لَهُ: ما يُبْكِيكَ؟ قَالَ: أَبْكِي لأَنَّ غُلاَماً بُعِثَ بَعْدِي يَدْخُلُ الجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِهِ أَكْثَرُ مِمَّنْ يَدْخُلُهَا مِنْ أُمَّتِي.

ثُمَّ صَعِدَ بِي إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ، قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ، قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: مَرْحباً بِهِ، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جاءَ، فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا إِبْرَاهِيمُ، قَالَ: هَذَا أَبُوكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ السَّلاَمَ، قَالَ: مَرْحَباً بِالابْنِ الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ.

ثُمَّ رُفِعَتْ لِي سِدْرَةُ الْمُنْتَهى، فَإِذَا نَبِقُهَا مِثْلُ قِلاَلِ هَجَرَ، وَإِذَا وَرَقُهَا مِثْلُ آذَانِ الْفِيَلَةِ، قَالَ: هذِهِ سِدْرَةُ الْمُنْتَهى، وَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ: نَهْرَانِ بَاطِنَانِ وَنَهْرَانِ ظَاهِرَانِ، فَقُلْتُ: ما هذَانِ يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: أَمَّا الْبَاطِنَانِ فَنَهَرَانِ فِي الجَنَّةِ، وَأَمَّا الظَّاهِرَانِ: فَالنِّيلُ وَالْفُرَاتُ.

ثُمَّ رُفِعَ لِيَ الْبَيْتُ المَعْمُورُ، ثُمَّ أُتِيتُ بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ، وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، وَإِنَاءٍ مِنْ عَسَلٍ، فَأَخَذْتُ اللَّبَنَ فَقَالَ: هِيَ الْفِطْرَةُ الَّتِي أَنْتَ عَلَيْهَا وَأُمَّتُكَ.

ثُمَّ فُرِضَتْ عَلَيَّ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ صَلاَةً كُلَّ يَوْمٍ، فَرَجَعْتُ، فَمَرَرْتُ عَلَى مُوسى، فَقَالَ: بِمَ أُمِرْتَ؟ قَالَ: أُمِرْتُ بِخَمْسِينَ صَلاَةً كُلَّ يَوْمٍ، قَالَ: إِن أُمَّتَكَ لاَ تَسْتَطِيعُ خَمْسِينَ صَلاَةً كُلَّ يَوْمٍ، وَإِنِّي وَاللهِ قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ، وَعَالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ الْمُعَالَجَةِ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ لأُمَّتِكَ، فَرَجَعْتُ، فَوَضَعَ عَنِّي عَشْراً، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ، فَوَضَعَ عَنِّي عَشْراً، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْراً، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ، فَأُمِرْتُ بِعَشْرِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ، فَرَجَعْتُ فَقَالَ مِثْلَهُ، فَرَجَعْتُ، فَأُمِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسى، فَقَالَ: بِمَا أُمِرْتَ؟ قُلْتُ: أُمِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كلَّ يَوْمٍ، قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لاَ تَسْتَطِيعُ خَمْسَ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ، وَإِنِّي قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ، وَعالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ الْمُعَالَجَةِ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التخْفِيفَ لأُمَّتِكَ، قَالَ: سَأَلْتُ رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ، وَلكِنْ أَرْضى وَأُسَلِّمُ. قَالَ: فَلَمَّا جاوَزْتُ نَادَى مُنَادٍ: أَمْضَيْتُ فَرِيضَتِي، وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي). [خ٣٨٨٧ (٣٢٠٧)/ م١٦٤].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی، ژ مالكێ كورێ سەعسەعەیی ( خودێ ژ وان رازی بيت) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەحسێ شەڤا ئیسراء پێ كری بۆ وان كر: **(د دەمەكێدا ئەز ل (حطيم) بووم ـ و دبيت گۆتبيت ل حيجرێ[1] بووم ـ يێ درێژكری بووم، ئێك هاتە دەڤ**

---

(١) حەتیم و حوجرە ئێك تشتە، و مەخسەد پێ ئەو دیوارێ ڤەوسە یێ ب رەخێ كەعبێڤە و پشكەكە ژ كەعبەیێ، و دەمێ عەرەبان ڤیاین كەعبەیێ ئاڤاكەن مالێ خۆ یێ ژ هەمی مالی حەلالتر بۆ كۆم كر بەلێ

من و د نافبەرا فێریێ بۆ فێریێ كەر كر، و من گوه لێ بوو دگۆت: شەق كر، من گۆتە جارودی و ئەو ب رەخ منڤە بوو: مەخسەدا وی چییە[1]؟ گۆت: ژ كۆركا حەفكا وی هەتا موییێت دویماهییێ ژ زكێ وی، و من گوه لێ بوو دگۆت: ژ سەر سینگێ وی هەتا موییێت دویماهییێ ژ زكێ وی، و دلێ من دەرئێخست پاشی تەستەك ژ زێری یا تژی باوەری بۆ من ئینا و دلێ من هاتە شویشتن پاشی دلێ من ب باوەرییێ داگرت و پاشی زڤراندە ڤە جهێ وی، پاشی بۆ من دەوارەكێ سپی ژ هێسترێ بچویكتر و ژ كەری مەزنتر ئینا، جارودی گۆتێ: ئەو بورا قە ئەی بابێ حەمزەیی؟ ئەنەسی گۆت: بەلێ، پێنگا ڤا خۆ ددانیتە دویماهییا چاڤێ وی ڤەتره دكەت و ئەز لێ سویار كرم.

ئینا جبریلی ئەز برم، هەتا هاتییە عەسمانێ دنیایێ، داخوازا ڤەكرنا دەرگەهی كر، گۆتێ ئەو كییە؟ گۆت: جبریلە و گۆت: و كی د گەل تەیە؟ گۆت: موحەممەدە، گۆت: هنارتییە دویڤرا؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خێر بێت و باشترین هاتن هاتنا وییە، و دەرگەه هاتە ڤەكرن ڤێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ من ئادەم تێدا دیت: ئینا گۆت: ئەڤە بابێ تە ئادەمە ـ سلاڤ بكێ ـ من سلاڤ كرێ و سلاڤا من ڤەگێڕا، پاشی گۆت: ب خێر بهێت كوڕێ كێرهاتی و پێغەمبەرێ كێرهاتی.

پاشی ئەز بلند كرم هەتا ئەو هاتییە عەسمانێ دووێ، داخوازا ڤەكرنا دەرگەهی كر، گۆتێ ئەو كییە؟ گۆت: جبریلە، و گۆت: و كی د گەل تەیە؟ گۆت: موحەممەدە، گۆت: هنارتییە دویڤرا؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خێر بێت و باشترین هاتن هاتنا وییە، و دەرگەه هاتە ڤەكرن، ڤێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ، یەحیا و عیسا ل وێرێ بوون و ئەو كوڕخالەتێت ئێكن، گۆت: ئەڤە یەحییا و عیسانە، سلاڤێ وان بكە من سلاڤ كرە وان، و وان سلاڤا من ڤەگێڕا، و پاشی گۆتن: ب خێر بهێت برایێ كێرهاتی و پێغەمبەرێ كێرهاتی.

تێرا وان نەكر وێ ژی بدەنە د گەل ئینا ئەو هێلا و هاتە نیشانكرن دا بەرزە نەبیت كو ئەو د بنیاتێ خۆدا پارچەكە ژ كەعبەیێ.

(١) ـ ئانكو: وی چو ژ گۆتنا خۆ مەبەستە ل ڤێرێ هەتا ڤێرێ.

پاشی ئەز بلند كرم هەتا هاتییە عەسمانێ سێیێ، داخوازا فەكرنا دەرگەهی كر، گۆتێ: ئەو كییە؟ گۆت: جبریلە و گۆت: و كی د گەل تەیە؟ گۆت: موحەممەدە، گۆت: هنارتییە دویڤرا؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خێر بهێت و باشترین هاتن هاتنا وییە، و دەرگەهـ هاتە فەكرن، فێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ یووسف ل وێرێ بوو، گۆت: ئەڤە یووسفە سلاڤ بكێ من سلاڤ كرێ، و سلاڤا من فەگێڕا، و پاشی گۆت: ب خێر بهێت برایێ كێرهاتی و پێغەمبەرێ كێرهاتی.

پاشی ئەز بلند كرم هەتا هاتییە عەسمانێ چوارێ، داخوازا فەكرنا دەرگەهی كر، گۆتێ: ئەو كییە؟ گۆت: جبریلە و گۆت: و كی د گەل تەیە؟ گۆت: موحەممەدە، گۆت: هنارتییە دویڤرا؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خێر بهێت و باشترین هاتن هاتنا وییە، و دەرگەهـ هاتە فەكرن، فێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ ئدریس ل وێرێ بوو، گۆت: ئەڤە ئدریسە - سلاڤ بكێ - من سلاڤ كرێ، سلاڤا من فەگێڕا، و گۆت: ب خێر بهێت برایێ كێرهاتی و پێغەمبەرێ كێرهاتی.

پاشی ئەز بلند كرم هەتا هاتییە عەسمانێ پێنجێ، داخوازا فەكرنا دەرگەهی كر، گۆتێ ئەو كییە؟ گۆت: جبریلە و گۆت: و كی د گەل تەیە؟ گۆت: موحەممەدە، گۆت: هنارتییە دویڤرا؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خێر بهێت و باشترین هاتن هاتنا وییە، و دەرگەهـ هاتە فەكرن، فێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ هاروون ل وێرێ بوو، گۆت: ئەڤە هاروونە - سلاڤ بكێ - من سلاڤ كرێ، و سلاڤا من فەگێڕا، و پاشی گۆت: ب خێر بهێت برایێ كێرهاتی و پێغەمبەرێ كێرهاتی.

پاشی ئەز بلند كرم هەتا هاتییە عەسمانێ حەفتێ، داخوازا فەكرنا دەرگەهی كر، گۆتێ ئەو كییە؟ گۆت: جبریلە و گۆت: و كی د گەل تەیە؟ گۆت: موحەممەدە، گۆت: هنارتییە دویڤرا؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خێر بهێت و باشترین هاتن هاتنا وییە، و دەرگەهـ هاتە فەكرن، فێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ مووسا ل وێرێ بوو، گۆت: ئەڤە مووسایە - سلاڤ بكێ - من سلاڤ كرێ و سلاڤا من فەگێڕا، پاشی گۆت: ب خێر بهێت برایێ كێرهاتی و پێغەمبەرێ كێرهاتی، و دەمێ ئەز ژێ بۆریم كرە گری، گۆتنێ: تو بۆ دكەیە گری؟ گۆت:

**ئەز دكەمە گری چونكی گەنجەك پشتی من بێ هاتیە هنارتن ئەوێت ژ ئوممەتا وی دچنە بەحەشتێ پتڕن ژ وان یێت ژ ئوممەتا من دچنە بەحەشتێ.**

**پاشی ئەز بلند كرم هەتا هاتییە عەسمانێ حەفتێ، داخوازا ڤەكرنا دەرگەهی كر، گۆتێ ئەو كییە؟ گۆت: جبریلە، و گۆت: و كی د گەل تەیە؟ گۆت: موحەممەدە، گۆت: هنارتییە دویڤڕا؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خێر بهێت و باشترین هاتن هاتنا ویە، و دەرگەهـ هاتە ڤەكرن، ڤێجا دەمێ ئەز گەهشتیمێ، ئیبراهیم ل وێرێ بوو، گۆت: ئەو بابێ تە ئیبراهیمە - سلاڤ بكێ - من سلاڤ كرێ، سلاڤ ل من ڤەگێڕا، و گۆت ب خێر بهێت كوڕێ كێرهاتی و پێغەمبەرێ كێرهاتی.**

**پاشی داركناریا خلاسییێ بۆ من هاتە نێزیككرن و بەرچاڤكرن، ڤێقییێ وێ وەكی جەرێت هەجەرن[1] و بەلگێت وێ وەكی گوهێت فیلانە و چوار رویبار بێت تێدا دو ژێر عەردن و دو سەر عەردن، من گۆت: ئەڤە چنە ئەی جبریل؟ گۆت: هندی ئەوێت ژێر عەردن رویبارێت بەحەشتێنە و ئەوێت ئاشكەرا ئەو نیل و فوراتن[2].**

**پاشی مالا ئاڤاكری[3] بۆ من هاتە نێزیككرن و بەرچاڤكرن، پاشی ئامانەكێ عەرەقێ و ئامانەكێ شیری و ئامانەكێ هنگڤینی بۆ من ئینان، من شیر هەلگرت گۆت: ئەڤە ئەو راست و دورستییە یا تو و ئوممەتا تە ل سەر.**

**پاشی نڤێژ ل سەر من هاتنە فەرزكرن، رۆژێ پێنجی نڤێژ، ئەز زڤڕیم د بەر مووسایڕا بۆریم، ئینا گۆت: فەرمانا تە ب چ هاتە كرن؟ گۆت: فەرمان ب پێنجی نڤێژان د رۆژێدا هاتە كرن، گۆت: ب راستی ئوممەتا تە نەشێت د رۆژێدا پێنجی نڤێژان بكەت، و**

---

(١) هندی د مەزنن، و هەجەر: گوندەكە دكەڤیتە دەڤ مەدینەیێ، نوكە دبێژنێ ئیحسا.

(٢) زانایان پتر ژ مەبەستەكێ ب ڤێ چەندێ دیار كرییە، ئێك: بنەتارێ ئێكێ ێ وان ژ بەحەشتێیە، یان مەرەم پێ وەكهەڤیكرنە (تەشبیهكرن) كا چاوا بەحەشت یا خۆش و ب بەرەكەتە ئەڤ رویبارە هۆسا ئاڤا وان یا خۆشە و ب بەرەكەتن.

(٣) هەر عەسمانەكی بەرامبەر كەعبەیێ مالەك یا هەی، ئەو مالا ل عەسمانێ حەفتێ دبێژنێ: (البيت المعمور) مالا ئاڤاكری، و ئەو مالا ل عەسمانێ دنیایێ راستا كەعبەیێ دبێژنێ: (بيت العزة)، و قەدرێ كەعبێ د عەردیدا كا چاوایە ئها ئەو قەدرێ (البيت المعمور)ە ل عەسمانان.

**ئەز ب خودێ كەمە من بەری تە خەلك یێ جەربەكری و ب هەمی هێزا چارەسەرییێ من چارەسەرییا ئیسرائیلییان یا كری، ڤێجا بزڤرە دەڤ خودایێ خۆ داخوازا سڤككرنێ بۆ ئوممەتا خۆ بكە، ئەز زڤریم، و دەهـ نڤێژ ژ سەر من راكرن، ئەز زڤریمە دەڤ مووسایی هەر ئەو ئاخفتن كر، و ئەز زڤریمەڤە و دەهـ نڤێژێت دی ژ سەر من راكرن، ئەز زڤریمە دەڤ مووسایی هەر ئەو ئاخفتن گۆت، ئەز زڤریم فەرمانا من ب دەهـ نڤێژان كر د رۆژێدا، ئەز زڤریمە دەڤ مووسایی و هەر ئەو ئاخفتن گۆت، ئەز زڤریمەڤە، فەرمانا من ب پێنج نڤێژان كر د رۆژێدا، ئەز زڤریمە دەڤ مووسایی ئینا گۆت: فەرمانا تە ب چ هاتە كرن؟ من گۆت: فەرمانا من ب پێنج نڤێژان هاتە كرن د هەر رۆژەكێدا، گۆت: ئوممەتا تە نەشێت پێنج نڤێژان د رۆژێدا بكەت، و من بەری تە خەلك یێ جەربەكری و من ب هێزترین چارەسەری چارەسەرییا ئیسرائیلییان كرییە، بزڤرە ڤە دەڤ خودایێ خۆ و داخوازا سڤككرنێ بۆ ئوممەتا خۆ بكە، گۆت: من هند داخواز ژ خودایێ خۆ كر ئەز شەرمێ ژێ د كەم بەلێ دێ رازی بم و خۆ رادەستدكەم، ڤێجا دەمێ ئەز ژ مووسایی بۆریم، گازیكەرەكی گازی كر، فەرزێت خۆ من بنەجە كرن، و من ل سەر بەندەیێت خۆ سڤك كر[1].**

٣٥٩٣ - (م) عن ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (أُتِيتُ بِالْبُرَاقِ. وَهُوَ دَابَّةٌ أَبْيَضُ طَوِيلٌ فَوْقَ الْحِمَارِ وَدُونَ الْبَغْلِ، يَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى طَرْفِهِ. قَالَ: فَرَكِبْتُهُ حَتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ. قَالَ: فَرَبَطْتُهُ بِالْحَلْقَةِ الَّتِي يَرْبِطُ بِهِ الأَنْبِيَاءُ. قَالَ: ثُمَّ دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَصَلَّيْتُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ. ثُمَّ خَرَجْتُ، فَجَاءَنِي جِبْرِيلُ عليه السلام بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ (ﷺ): اخْتَرْتَ الْفِطْرَةَ. وذكر مثل الحديث الذي قبله. [م١٦٢ (٢٥٩)]

ژ سابتێ بەنانی، ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (خودێ ژ وان رازی بیت) كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بوراق بۆ من ئینا ـ و ئەو دەوارەكێ سپی و درێژە، مەزنترە ژ كەری و ژ هێسترێ بچویكترە، پێنگاڤا خۆ ددانیتە دویماهییا چاڤێ وی قەترە دكەت ـ گۆت: ئەز لێ سویار بووم هەتا ئەز هاتیمە قودسێ. گۆت: من ب وێ خەلەكێ ڤە گرێدا یا**

---

(١) ئانكو: هەر نڤێژەك بۆ وان ب دەهانە هۆسا ب هەژمارا خۆ پێنجن و ب خێرا خۆ پێنجینە.

**پێغەمبەران پێڤە گرێ ددا، گۆت: پاشی ئەز چۆمە د مزگەفتێڤە من دو ركعەت تێڤە كرن، پاشی ئەز دەركەفتم، و جبریل سلاڤ ل سەر بن هاتە دەڤ من و ئامانەكێ عەرەقێ و ئامانەكێ شیری بۆ من ئینان، من شیر ژێ گرت، ئینا جبریلی ( ) گۆت: تە راستی و دورستی ژێ گرت)، و هەر ئەو فەرموودا بەری نوكە بەحس كر.**

٣٥٩٤ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي الْحِجْرِ، وَقُرَيْشٌ تَسْأَلُنِي عَنْ مَسْرَايَ، فَسَأَلَتْنِي عَنْ أَشْيَاءَ مِنْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ لَمْ أُثْبِتْهَا ، فَكُرِبْتُ كُرْبَةً مَا كُرِبْتُ مِثْلَهُ قَطُّ. قَالَ: فَرَفَعَهُ اللهُ لِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، مَا يَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلاَّ أَنْبَأْتُهُمْ بِهِ. وَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي جَمَاعَةٍ مِنَ الأَنْبِيَاءِ، فَإِذَا مُوسَى قَائِمٌ يُصَلِّي، فَإِذَا رَجُلٌ ضَرْبٌ جَعْدٌ كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ. وَإِذَا عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ عليه السلام قَائِمٌ يُصَلِّي، أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهاً عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ الثَّقَفِيُّ. وَإِذَا إِبْرَاهِيمُ عليه السلام قَائِمٌ يُصَلِّي، أَشْبَهُ النَّاسِ بِهِ صَاحِبُكُمْ . يَعْنِي: نَفْسَهُ . فَحَانَتِ الصَّلاَةُ فَأَمَمْتُهُمْ، فَلَمَّا فَرَغْتُ مِنَ الصَّلاَةِ، قَالَ قَائِلٌ: يَا مُحَمَّدُ، هَذَا مَالِكٌ صَاحِبُ النَّارِ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ، فَبَدأَنِي بِالسَّلاَمِ).[م١٧٢].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **( من خۆ ل حیجرێڤە دیت و قورەیشییان پرسیارا چۆنا من یا شەڤێ بۆ قودسێ ژ من دكر، پرسیارا هندە تشتان ل قودسێ ژ من كرن من ژبەر نەبوون، ڤێجا ئەز كەفتمە تەنگافییەكا تەنگاڤ چو جارا وەكی وێ ئەز تەنگاڤ نەبوویمە، گۆت: ئینا خودێ بۆ من قودس بلند كر ئەز بێ بەرێ خۆ ددەمێ، ڤێجا ئەو ج پرسیارا ژ من ناكەن ئەگەر ئەز بەرسڤا وان نەدەم، من خۆ د گەل كۆمەكا پێغەمبەران دیت[1]، من مووسا ژ پیاڤە دیت نڤێژ دكر، و ئەو زەلامەكێ زەعیف و پرچ خەلەك بوو هەروەكی زەلامەكە ژ شەنوئە[2]، و من عیسایێ كورێ مەریەمێ سلاڤ ل سەر بن دیت ژ پیاڤە نڤێژ دكر و نێزیكترین مرۆڤ وەكی وی بیت عوروەیێ كورێ مەسعودێ سەقەفییە، و من ئیبراهیم سلاڤ ل سەر بن ژ پیاڤە دیت نڤێژ دكر و یێ پتر وەكی وی هەڤالێ هەوەیە ـ مەخسادا وی ئەو ب خۆیە ـ بوو دەمێ نڤێژێ و**

---

(١) ل ڤێرێ پێغەمبەر (ﷺ) یێ بەحسێ چۆنا خۆ یا ب شەڤ بۆ قودسێ دكەت.

(٢) هۆزەكا یەمەنییە ژ قەحتانییان و ب درێژییێ د نافدارن.

**من پێشنڤێژیيا وان كر، دەمێ نڤێژ ب دویماهی هاتی ئێكی گۆت: ئەی موحەممەد ئەڤە ملياكەتە خەزنەدارێ ئاگرییە سلاڤ بكێ ئەز لێ زڤریم وی بەری سلاڤ كرە من).**

٣٥٩٥ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مسعودٍ قَالَ: لَمَّا أُسْرِيَ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) انْتُهِيَ بِهِ إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَهِيَ فِي السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، إِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُعْرَجُ بِهِ مِنَ الأَرْضِ، فَيُقْبَضُ مِنْها، وَإِلَيْهَا يَنْتَهِي مَا يُهْبَطُ بِهِ مِنْ فَوْقِهَا، فَيُقْبَضُ مِنْهَا. قَالَ: ﴿إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ١٦﴾ [النجم] قَالَ: فَرَاشٌ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: فَأُعْطِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ثَلاَثاً: أُعْطِيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَأُعْطِيَ خَوَاتِيمَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، وَغُفِرَ لِمَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِاللهِ مِنْ أُمَّتِهِ شَيْئاً، الْمُقْحِمَاتُ. [م١٧٣].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ ب شەڤ بۆ قودسێ هاتیە برن، گەهشتە داركێ‌را خلا سیێ، و ئەو دكەڤیتە عەسمانێ شەشێ، هەر تشتێ ژ عەسمانی بلند دبیت دگەهیتە وێرێ و ل وێرێ ملياكەت وەردگرن[1]، و ئەو تشتێ د سەر ویدا دهێت دگەهیتە وێرێ و ل وێرێ ملياكەت وەردگرن[2]، گۆت: ﴿إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ﴾ ئیبن مەسعودی گۆت: بەلاتینكێت زێری. گۆت: سێ تشت بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتنە دان: پێنج نڤێژ بۆ هاتنە دان، و دویماهیيا سۆرەتا بەقەرە بۆ هاتە دان، و ژێبرنا گونەهێت مەزن یێت هەر كەسەكێ ژ ئوممەتا وی شریك بۆ خودێ نەچێكرین.**

## ١٢ . باب: هل رأى (ﷺ) ربه في المعراج

## بابەتێ: ئەرێ دەمێ (ﷺ) چۆیە عەسمانا خودایێ خۆ دیت.

٣٥٩٦ - (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رضي الله عنها: يَا أُمَّتَاهُ، هَلْ رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ؟ فَقَالَتْ: لَقَدْ قَفَّ شَعْرِي مِمَّا قُلْتَ! أَيْنَ أَنْتَ مِنْ ثَلاَثٍ، مَنْ حَدَّثَكَهُنَّ فَقَدْ كَذَبَ: مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ مُحَمَّداً (ﷺ) رَأَى رَبَّهُ؛ فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ [الأنعام] ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾ [الشورى:٥١] ، وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ يَعْلَمُ ما في غَدٍ؛ فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ﴾ [لقمان:٣٤] ، وَمَنْ حَدَّثَكَ أَنَّهُ كَتَمَ؛ فَقَدْ كَذَبَ، ثُمَّ قَرَأَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا

---

(١) بۆ جهێ خودێ دڤێت دبەن.

(٢) بۆ وی جهی دبنەن یێ فەرمانا وان بێ دهێتە كرن.

ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ الآيَةَ [المائدة:٦٧] ، وَلكِنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ عليه السلام فِي صُورَتِهِ مَرَّتَيْنِ. [خ٤٨٥٥ (٣٢٣٤)/ م١٧٧].

**ژ مە سرووقی (رضي الله عنه) گۆت: من گۆ تە عائیـ شایێ (رضي الله عنها) ئەی دایـ كا من، ئەرێ موحەممەدی خودایێ خۆ دیتییە(1)؟ ئینا گۆت: پرچا سەرێ من شەق راوەستییا ژ ئاخفتنا تە گۆتی: تو ل كیڤەیی ژ سێ تشتان، یێ بەحسێ وان بۆ تە بكەت وی درەو كر: هەر كەسێ بێژیتە تە موحەممەدی خودایێ خۆ یێ دیتی بێ گۆمان ئەو یێ خەلەتە، پاشی ئەڤە خواند: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ﴾ ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ﴾ و هەر كەسێ بێژیتە تە ئەو دزانیت چ د سوبەهیدا هەیە بێ گۆمان وی درەو كر، پاشی ئەڤە خواند: ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً﴾ و هەر كەسێ گۆتە تە وی تشتەك ژ دینی یێ ڤەشارتی، بێ گۆمان وی درەو كر، و پاشی ئەڤە خواند ﴿يَٰأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ بەلێ وی جبریل دو جاران ل سەر رەنگێ وی ب خۆ یێ دیتی.**

٣٥٩٧ - (ق) عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ۝١٠﴾ [النجم].

قَالَ: حَدَّثَنا ابْنُ مَسْعُودٍ: أَنَّهُ رَأَى جِبْرِيلَ، لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ. [خ٣٢٣٢/ م١٧٤].

**ژ زیرێ كورێ حوبەیـشی (رضي الله عنه) د گۆتنا خودێدا: (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ).**

**گۆت: ئیبن مەسعودی گۆتە مە: وی جبریل دیت شەش سەد چەنگ هەبوون.**

٣٥٩٨ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ): هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ: (نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ). [م١٧٨].

**ژ ئەبی زەری (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیار ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر، تە خودایێ خۆ دیتییە(2)؟ گۆت: (رۆناهییە چاوا دێ بینم)(3).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(1) مەبەست ئەوە ل شەڤا تێدا چۆیە عەسمانان هەتا عەسمانێ حەفتێ خودایێ خۆ تێدا دیتییە.

(2) هەر پرسیار ژ شەڤا چۆنا عەسمانییە د وێ شەڤێدا تە خودایێ خۆ دیتییە.

(3) ئانكو: رۆناهی بوو پەردە و وی رۆناهی دیت.

## الفصل الثالث: الهجرة وما بعدها

## پشكا سێیێ: مشەختبوون و پشتی وێ

### ١ ـ باب: بدء الهجرة إلى المدينة

### بابەتێ: دەستپێكرنا مەشەختبوونێ بۆ مەدینەیێ

٣٥٩٩ - (خ) عَنِ البَرَاءِ بْنِ عازِبٍ رضي الله عنه قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، ثُمَّ قَدِمَ عَلَيْنَا عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ وَبِلاَلٌ رضي الله عنهم. [خ٣٩٢٤].

- وفي رواية: قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، وَكَانَا يُقْرِئُونَ النَّاسَ، فَقَدِمَ بِلاَلٌ وَسَعْدٌ وَعَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، ثُمَّ قَدِمَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ فِي عِشْرِينَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)، ثُمَّ قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَمَا رَأَيْتُ أَهْلَ المدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، حَتَّى جَعَلَ الإِمَاءُ يَقُلْنَ: قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَمَا قَدِمَ حَتَّى قَرَأْتُ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى۝١﴾[الأعلى] فِي سُوَرٍ مِنَ المفَصَّلِ. [خ٣٩٢٥].

**ژ بەرائێ كورێ عازبی (رضي الله عنه) گۆت: یێ ئێكێ هاتییە دەڤ مە، موسعەبێ كورێ عومەیری و ئیبن ئوم مەكتووم بوون، پاشی بیلال و عەممارێ كورێ یاسری (خودێ ژ وان رازی بیت) هاتنە دەڤ مە.**

- **و د ڤەگێرەكێدا: یێ ئێكێ هاتییە دەڤ مە موسعەبێ كورێ عومەیری و ئیبن ئوم مەكتووم بوون، و قورئان بۆ خەلكی دخواند و نیشا وان ددا، پاشی بیلال و سەعد و عەممارێ كورێ یاسری هاتن، و پاشی عومەرێ كورێ خەتتابی د گەل بیست هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) هاتن، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هات، من خەلكێ مەدینەیێ نەدیتییە كەیفا وان زێدە ب تشتەكی هاتبیت وەكی كەیفا وان ب هاتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتی، جارییان دگۆتن: پێغەمبەر (ﷺ) هات، و نەهات هەتا من سۆرەتا ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ د گەل هندە سۆرەتێت موفەسسەل خواندین و ژبەر كرین[1].**

---

(١) سۆرەتێت موفەسسەل ئەو سۆرەتن یێت كورت و نەدرێژ و دبێژنێ موفەسسەل، چونكی گەلەك بەسمەلە (بسم الله الرحمن الرحيم) دكەڤیتە د ناڤبەرا واندا و زانا نەلێكن كا ژ كیژ سۆرەتێ دەست پێ دكەن، بەلێ گەلەك دبێژن: ژ سۆرەتا قاف دەست پێ دكەن هەتا سۆرەتا (الناس) دویماهییا قورئانێ.

## ٢ - باب: هجرة النبي (ﷺ) إلى المدينة

## بابەتێ: مشەختبوونا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ مەدینەیێ

٣٦٠٠ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها - زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) - قَالَتْ: لَمْ أَعْقِلْ أَبَوَيَّ قَطُّ إِلاَّ وَهُمَا يَدِينَانِ الدِّينَ، وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْنَا يَوْمٌ إِلاَّ يَأْتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) طَرَفَيِ النَّهَارِ، بُكْرَةً وَعَشِيَّةً، فَلَمَّا ابْتُلِيَ المسْلِمُونَ خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ مُهَاجِراً نَحْوَ أَرْضِ الحَبَشَةِ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَرْكَ الْغِمَادِ لَقِيَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ، وَهْوَ سَيِّدُ الْقَارَةِ، فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ يَا أَبَا بَكْرٍ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْرَجَنِي قَوْمِي، فَأُرِيدُ أَنْ أَسِيحَ فِي الأَرْضِ وَأَعْبُدَ رَبِّي.

قَالَ ابْنُ الدَّغِنَةِ: فَإِنَّ مِثْلَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ لاَ يَخْرُجُ وَلاَ يُخْرَجُ، إِنَّكَ تَكْسِبُ المعْدُومَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ، فَأَنَا لَكَ جارٌ، ارْجِعْ وَاعْبُدْ رَبَّكَ بِبَلَدِكَ. فَرَجَعَ وَارْتَحَلَ مَعَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ.

فَطَافَ ابْنُ الدَّغِنَةِ عَشِيَّةً فِي أَشْرَافِ قُرَيْشٍ، فَقَالَ لَهُمْ: إِن أَبَا بَكْرٍ لاَ يَخْرُجُ مِثْلُهُ وَلاَ يُخْرَجُ، أَتُخْرِجُونَ رَجُلاً يَكْسِبُ المعْدُومَ، وَيَصِلُ الرَّحِمَ، وَيَحْمِلُ الكَلَّ، وَيَقْرِي الضَّيْفَ، وَيُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ؟! فَلَمْ تُكَذِّبْ قُرَيْشٌ بِجِوَارِ ابْنِ الدَّغِنَةِ، وَقَالُوا لابْنِ الدَّغِنَةِ: مُرْ أَبَا بَكْرٍ فَلْيَعْبُدْ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، فَلْيُصَلِّ فِيهَا، وَلْيَقْرَأْ ما شَاءَ، وَلاَ يُؤْذِينَا بِذلِكَ، وَلاَ يَسْتَعْلِنْ بِهِ، فَإِنَّا نَخْشَى أَنْ يَفْتِنَ نِسَاءَنَا وَأَبْنَاءَنَا. فَقَالَ ذلِكَ ابْنُ الدَّغِنَةِ لأَبِي بَكْرٍ، فَلَبِثَ أَبُو بَكْرٍ بِذلِكَ يَعْبُدُ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، وَلاَ يَسْتَعْلِنُ بِصَلاَتِهِ وَلاَ يَقْرَأُ فِي غَيْرِ دَارِهِ.

ثُمَّ بَدَا لأَبِي بَكْرٍ، فَابْتَنَى مَسْجِداً بِفِنَاءِ دَارِهِ، وَكَانَ يُصَلِّي فِيهِ، وَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَيَتَقَذَّفُ عَلَيْهِ نِسَاءُ المشْرِكِينَ وَأَبْنَاؤُهُمْ، وَهُمْ يَعْجَبُونَ مِنْهُ وَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ رَجُلاً بَكَّاءً، لاَ يَمْلِكُ عَيْنَيْهِ إِذَا قَرَأَ الْقُرْآنَ، وَأَفْزَعَ ذلِكَ أَشْرَافَ قُرَيْشٍ مِنَ المشْرِكِينَ، فَأَرْسَلُوا إِلَى ابْنِ الدَّغِنَةِ فَقَدِمَ عَلَيْهِمْ، فَقَالُوا: إِنَّا كُنَّا أَجَرْنَا أَبَا بَكْرٍ بِجِوَارِكَ، عَلَى أَنْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ، فَقَدْ جاوَزَ ذلِكَ، فَابْتَنَى مَسْجِداً بِفِنَاءِ دَارِهِ، فَأَعْلَنَ بِالصَّلاَةِ وَالْقِرَاءَةِ فِيهِ، وَإِنَّا قَدْ خَشِينَا أَنْ يَفْتِنَ نِسَاءَنَا وَأَبْنَاءَنَا، فَانْهَهُ، فَإِنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْتَصِرَ عَلَى أَنْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَعَلَ، وَإِنْ أَبَى؛ إِلاَّ أَنْ يُعْلِنَ بِذلِكَ، فَسَلْهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْكَ ذِمَّتَكَ، فَإِنَّا قَدْ كَرِهْنَا أَنْ نُخْفِرَكَ، وَلَسْنَا مُقِرِّينَ لأَبِي بَكْرٍ الاِسْتِعْلاَنَ.

قَالَتْ عائِشَةُ: فَأَتَى ابْنُ الدَّغِنَةِ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: قَدْ عَلِمْتَ الَّذِي عاقَدْتُ لَكَ عَلَيْهِ، فَإِمَّا أَنْ تَقْتَصِرَ عَلَى ذلِكَ، وَإِمَّا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيَّ ذِمَّتِي، فَإِنِّي لاَ أُحِبُّ أَنْ تَسْمَعَ الْعَرَبُ أَنِّي أُخْفِرْتُ فِي رَجُلٍ عَقَدْتُ لَهُ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَإِنِّي أَرُدُّ إِلَيْكَ جِوَارَكَ، وَأَرْضى بِجِوَارِ اللهِ عزّ وجل.

وَالنَّبِيُّ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ بِمَكَّةَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِلْمُسْلِمِينَ: **(إِنِّي أُرِيتُ دَارَ هِجْرَتِكُمْ، ذَاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لاَبَتَيْنِ)** . وَهُمَا الحَرَّتَانِ . فَهَاجَرَ مَنْ هَاجَرَ قِبَلَ المدِينَةِ، وَرَجَعَ عامَّةُ مَنْ كانَ هَاجَرَ بِأَرْضِ الحَبَشَةِ إِلَى المدِينَةِ، وَتَجَهَّزَ أَبُو بَكْرٍ قِبَلَ المدِينَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(عَلَى رِسْلِكَ ، فَإِنِّي أَرْجُو أَنْ يُؤْذَنَ لِي)**. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَلْ تَرْجُو ذلِكَ بِأَبِي أَنْتَ؟ قَالَ: **(نَعَمْ)**. فَحَبَسَ أَبُو بَكْرٍ نَفْسَهُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لِيَصْحَبَهُ، وَعَلَفَ رَاحِلَتَيْنِ كانَتَا عِنْدَهُ وَرَقَ السَّمُرِ . وَهُوَ الخَبَطُ . أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ.

قَالَتْ عائِشَةُ: فَبَيْنَما نَحْنُ يَوْماً جُلُوسٌ فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ ، قَالَ قَائِلٌ لأَبِي بَكْرٍ: هَذَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُتَقَنِّعاً ، فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَأْتِينَا فِيهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِدَاءٌ لَهُ أَبِي وَأُمِّي، وَاللهِ ما جاءَ بِهِ فِي هَذِهِ السَّاعَةِ إِلاَّ أَمْرٌ.

قالَتْ: فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَاسْتَأْذَنَ، فَأُذِنَ لَهُ فَدَخَلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لأَبِي بَكْرٍ: **(أَخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ)**. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا هُمْ أَهْلُكَ، بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ! قالَ: **(فَإِنِّي قَدْ أُذِنَ لِي فِي الخُرُوجِ)**. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: الصَّحَابَةَ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ! قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(نَعَمْ)**. قالَ أَبُو بَكْرٍ: فَخُذْ . بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ . إِحْدَى رَاحِلَتَيَّ هَاتَيْنِ، قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(بِالثَّمَنِ)**.

قالَتْ عائِشَةُ: فَجَهَّزْنَاهُمَا أَحَثَّ الْجِهَازِ ، وَصَنَعْنَا لَهُمَا سُفْرَةً فِي جِرَابٍ ، فَقَطَعَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ قِطْعَةً مِنْ نِطَاقِهَا ، فَرَبَطَتْ بِهِ عَلَى فَمِ الْجِرَابِ، فَبِذلِكَ سُمِّيَتْ ذَاتَ النِّطَاقَيْنِ. قَالَتْ: ثُمَّ لَحِقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَبُو بَكْرٍ بِغَارٍ فِي جَبَلِ ثَوْرٍ، فَكَمَنَا فِيهِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، يَبِيتُ عِنْدَهُمَا عَبْدُ اللهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، وَهْوَ غُلاَمٌ شَابٌّ، ثَقِفٌ لَقِنٌ ، فَيَدَّلِجُ مِنْ عِنْدِهِما بِسَحَرٍ، فَيُصْبِحُ مَعَ قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ كَبَائِتٍ، فَلاَ يَسْمَعُ أَمْراً يُكْتَادَانِ بِهِ إِلاَّ وَعاهُ، حَتَّى يَأْتِيَهُمَا بِخَبَرِ ذلِكَ حِينَ يَخْتَلِطُ الظَّلاَمُ، وَيَرْعَى عَلَيْهِمَا عامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ . مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ . مِنْحَةً مِنْ غَنَمٍ، فَيُرِيحُهَا عَلَيْهِمَا حِينَ تَذْهَبُ سَاعَةٌ مِنَ الْعِشَاءِ، فَيَبِيتَانِ فِي رِسْلٍ ، وَهْوَ لَبَنُ مِنْحَتِهِمَا وَرَضِيفِهِمَا ، حَتَّى يَنْعِقَ بِهَا عامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ بِغَلَسٍ، يَفْعَلُ ذلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ تِلْكَ اللَّيَالِي الثَّلاَثِ.

وَاسْتَأْجَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَبُو بَكْرٍ رَجُلاً مِنْ بَنِي الدِّيلِ، وَهْوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ بْنِ عَدِيٍّ، هَادِياً خِرِّيتاً . وَالْخِرِّيتُ: الماهِرُ بِالْهِدَايَةِ . قَدْ غَمَسَ حِلْفاً فِي آلِ الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ، وَهْوَ عَلَى دِينِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، فَأَمِنَاهُ فَدَفَعَا إِلَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا، وَوَاعَدَاهُ غارَ ثَوْرٍ بَعْدَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، فَأَتَاهُمَا بِرَاحِلَتَيْهِمَا صُبْحَ ثَلاَثٍ، وَانْطَلَقَ مَعَهُمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ، وَالدَّلِيلُ، فَأَخَذَ بِهِمْ طَرِيقَ السَّوَاحِلِ. [خ٣٩٠٥ (٤٧٦)].

ژ عائیشایێ (ﷺ) ـ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ـ گۆت: هندی بیرا من دهێت دا یك و بابێت من خودان دین بوون، رۆژەك د سەر مەرا نەدبۆری ئەگەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تێدا سەر و بنێت رۆژێ سپێدە و ئێڤاران نەهاتبایە دەڤ مە، ڤێجا دەمێ موسلمان بەرهنگاری ئەز یەت و نەخۆ شییێ بووین، ئەبو بەکر دەر کەفت دا مشەخت ببیتە حەبەشە، هەتا گەهشتییە بەرکا غیمادێ[1]. ئیبن دەغینە گەهشتێ و ئەو مەزنێ هۆزا قارە بوو، ئینا گۆت: دێ کیڤە چی ئەی ئەبا بەکر؟ ئینا ئەبوبەکری گۆت: خەلکێ من ئەز دەرئێخستم و من دڤێت د عەردیدا بچم و خودایێ خۆ بپەرێسم.

ئیبن دەغینەیی گۆت: ب راستی یێت وەکی تە نە دەردکەڤن و نە دهێنە دەرئێخستن، ب راستی تو ددەیە خەلکێ نەیی و هەژار و تو مرۆڤانییێ د گەهینی و هاریکاریێ یا بارگرانی دکەی و قەدرێ مێڤانان دگری و هاریکارییا لێقەومییان دکەی، ئەز پشتەڤانم بۆ تە، بزڤرە و خودایێ خۆ ل باژێرێ خۆ بپەرێسە، و زڤریڤە و ئیبن دەغینە د گەل هات.

ئیبن دەغینە ل سەر مەزنێت قورەیشییان گەریا، و گۆتە وان ب راستی ئەبوبەکر یێت وەکی نە دەردکەڤن و نە دهێنە دەرئێخستن، ئەرێ هوین زەلامەکی دەردئێخن هاریکارییێ ددەتە خەلکێ نەیی و هەژار و مرۆڤانییێ دگەهینیت و هاریکاریێ یا بارگرانی دکەت و قەدرێ مێڤانان دگریت و هاریکارییا لێقەومییان دکەت؟ ئینا قورەیشییان حەواندنا ئیبن دەغینە وەرگرت و گۆتنە ئیبن دەغینە: فەرمانا ئەبابەکری بکە بلا خودایێ خۆ د مالا خۆڤە بپەرێسیت و بلا نڤێژێ تێڤە بکەت و ئەو قورئانا دڤێت بلا تێڤە بخوینیت، و بلا ب ڤان کارا ئەزیەتا مە نەکەت و ئاشکەرا نەکەت، ب راستی ئەم دترسین ژنێت مە و عەیالێت مە پێ سەردا بچن ( ئانکو موسلمان ببن)، ئینا ئیبن دەغینە ئەڤە گۆتە ئەبوبەکری و ئەبوبەکر پشتی هنگی ما خودایێ خۆ د مالا خۆڤە دپەرست و نڤێژا خۆ ئاشکەرا نەدکر و قورئان نەدخواند د مالا خۆڤە نەبیت.

---

(١) جهەکە دکەڤیتە رۆژئاڤایا مەکەهێ و ٥٦٠ کم ژێ دویرە، و نەڤرۆ دبێژنێ پارێزگەها بەرك و مزگەفتا ئەبوبەکر ل وێ جهییە.

پاشی ئەبوبەكری وەسا دیت ئەو مزگەفتەكێ د حەوشا مالا خۆڤە ئاڤا بكەت، و نڤێژ تێڤە دكر و قورئان تێڤە دخواند، و ژنێت قورەیشییان و زارۆكێت وان ئێكدو پالدان و ل سەر كۆم دبوون، و ئەو ژێ حێبەتی دبوون و بەرێ خۆ ددانە وی، و ئەبو بەكر زەلا مەكێ دلنەرم و كزگر یۆك بوو نەدشیا چاڤێت خۆ دەمێ قورئان دخواند، و ئەڤێ چەندێ گرەگرێت قورەیشییان ژ هەڤپشكچێكەران ترساند، ئینا ڤرێكرنە دویڤ ئیبن دەغینەیرا و ئەو هاتە دەڤ وان، گۆتن: ب راستی مە رێ دا ئەبوبەكری ژ بەر بەخت و حەواندنا تە ل سەر هندێ ئەو د مالا خۆڤە خودایێ خۆ بپەرێسیت، بەلێ ب راستی ئەو ژ ڤێ بۆری و مزگەفتەك یا د حەوشا مالا خۆڤە ئاڤا كری[1] و نڤێژ و خواندنا خۆ یا قورئانێ ئاشكرا كر، و ب راستی ئەم ژ ژن و زارۆكێت خۆ دترسین موسلمان بكەت، ڤێجا وی ژ ڤێ چەندێ بدە پاش و ئەگەر وی ڤیا ئەو تنێ پەرستنا خودایێ خۆ د مالا خۆڤە بكەت بلا بكەت، و ئەگەر ب ڤێ رازی نەبوو و ڤیا هەر ئاشكرا بكەت، داخوازێ ژێ بكە بلا بەختێ تە دایێ بۆ تە بزڤرینیتە ڤە، ب راستی مە نەدڤیا بەختێ تە دایێ بشكێنین و خیانەتێ تێدا بكەین و ئەم رێكێ نادەینە ئەبوبەكری ئەو پەرستنا خۆ ئاشكەرا بكەت.

عائیشایێ گۆت: ئیبن دەغینە هاتە دەڤ ئەبی بەكری و گۆت: تو وێ دزانی ئەوا من بۆ تە پەیمان ل سەر وەرگرتی، ڤێجا یان خۆ ل سەر وێ تنێ بهێلە، یان بەختێ من دایە تە بۆ من بزڤرینە، ب راستی من نەڤێت عەرەبان گوهـ لێ ببیت بەخت و پەیمانا من دایە زەلامەكی هاتە شكاندن، ئینا ئەبو بەكری گۆت: ئەز حەواندنا تە بۆ تە دزڤرینمەڤە و ئەز ب حەواندنا خودایێ هەر ب هێز و مەزن رازیمە.

و پێغەمبەر (ﷺ) د وی دەمی یدا ل مەكەهێ بوو، و پێغەمبەری (ﷺ) گۆ تە موسلمانان: **(جهێ مشەختبوونا هەوە بێ نیشا من دای جهەكێ ب دارقەسپە د ناڤبەرا دو عەردێت رەشەبەركری)** ـ و ئەو دو جهن بەرەرەش لێ بوون ـ ڤێجا ئەوێت مشەخت بووین بۆ مەدینەیێ مشەخت بوون و پتریا ئەوێت مشەختبووینە حەبەشەیێ زڤرین و مشەختبوونە مەدینەیێ، و ئەبوبەكری كارێ خۆ كر دا بەرێ خۆ بدەتە مەدینەیێ، ئینا

---

(١) ئەڤە ژ مزگەفتا ئێكێ د ئیسلامێدا دهێتە هەژمارتن.

پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: **(لەزێ نەكە و من هیڤییە دەستویرییا من بهێتە دان)**، ئینا ئەبوبەكری گۆت: و ئەرێ تە ئەو هیڤی هەیە بابێ من گۆری تە بیت؟ گۆت: **(بەلێ)** ئینا ئەبوبەكری سەر خاترا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خۆ هێلا، دا هەڤالینییا وی بكەت، و دو حێشتر ل دەڤ وی بوون چوار هەیڤان بەلگێت دارا سەمەر[1] ئالف ددا نێ - و ئەو بەلگێت دارانە ئەوێت ب داری هاتینە وەراندن نە ئەو ب خۆ كەفتین -.

عائیشا دبێژیت: رۆژە كێ ئەم ل مالا ئەبو بەكری د روینشتی بووین د دە ستپێكا كەلێژانا نیڤرۆدا، ئێكی گۆتە ئەبوبەكری: ئەڤە پێغەمبەرێ خودێیە (ﷺ) سەرو چاڤێت خۆ ییێت گرتین، د دەمەكێدا بوو پێغەمبەرێ خودێ تێدا نەدها تە دەڤ مە، ئینا ئەبوبەكری گۆت: دایك و بابێت من گۆری وی بن ئەز ب خودێ كە مە ئەو د ڤی دەمیدا نەهاتییە ئەگەر كارەك نەبیت.

عائیشایێ گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هات و دەستویری خواست و دەستویری بۆ هاتە دان، و ب ژۆر كەفت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە ئەبی بەكری: **(ئەوێت ل دەڤ تە دەربێخە)** ئینا ئەبو بەكری گۆت: ئەڤە خەلكێ تە نە بابێ من گۆری تە بیت ئەی پێغەمبەرێ خودێ! گۆت: **(دەستویرییا من ب دەركەفتنێ هاتە دان)** ئینا ئەبو بەكری گۆت: من دڤێت هەڤالینییا تە بكەم بابێ من گۆری تە بیت، ئەی پێغەمبەرێ خودێ! پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(بلا)** ئینا ئەبوبەكری گۆت: بابێ من گۆری تە بیت ئەی پێغەمبەرێ خودێ، پا ئێك ژ ڤان هەردو حێشترێت من وەرگرە، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب بهایێ وێ)**.

عائیشا دبێژیت: مە ب لەزوبەز كارێ وان كر، و مە خوارنەك بۆ وان كرە د جەرەكیدا، ئینا ئەسمائا كچا ئەبو بەكری پارچەك ژ شویتكا خۆ یا پشتا خۆ ژێ ڤەكر و دەرۆكێ جەری پێ گرێدا، ژ بەر ڤێ دبێژنێ: خودانا دو شویتكا، گۆت: پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبو بەكر چۆنە شكەفتەكێ ل چیایێ سەور، و سێ شەڤان ل وێرێ مان، عەبدوللایێ كوڕێ ئەبی بەكری شەڤێ دما د گەل وان و لاوەكێ گەنج بوو و تێگەهشتی

---

(١) دارەكە ل چۆلستانێ شین دبیت و بەلگێت وێ هێزێ ددەنە دەواری.

بوو و زوی وەردگرت و تێ دگەهشت دویماهیێیا شەڤێ ژ دەڤ وان دەردكەفت و سپێدە د گەل قورەیشیان ل مەكەهێ دبر، وەكی وی یێ ب شەڤ ل وێرێ مایی، ڤێجا وی چ ئاخفتن د راستا پیلانگێرانا واندا گوه لێ نەدبوو ئەگەر ژبەر نەكربا، هەتا بەحس و خەبەرێت وێ رۆژێ بۆ ئینا بان دەمێ شەڤ تاری د بوو، و عامرێ كورێ فەهیرەیی - ئازاكرییێ ئەبوبەكری - پەزەكا ب شیر پشتی عەیشا بۆ وان دبر، ڤێجا شەڤ سەردا دچۆ و شیرێ نوی ل دەڤ وان بوو و شیرێ بەرێت كەل د ناڤدا دا خاڤی و بێهنا شیری نەمینیت و دا ئەو پەز مینیت هەتا دویماهییا شەڤێ د تاریاتییێدا عامر لێ دخورِی و دبر و وان سێ شەڤان هەر شەڤ ئەڤ كارە دكر.

پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبو بەكری زەلامەك ژ دەیلییان ب كرێ گرت، و ئەو زەلامەك بوو ژ بنەمالا عەبدێ كورێ عودەیی وەك رێنیشاندەر و رێزان، وی زەلامی پەیمان د گەل مالا عاسێ كورێ وائیلی گرێدابوو[1] و ژ بەر هندێ باوەریا خۆ دانێ و هەردو حێشترێت خۆ دانە ڤ وی و ژ ڤان دا یێ پشتی سێ شەڤان ئەو ل شكەفتا سەور بگەهنە ئێك، سپێدەیا رۆژا سێیێ هەردو حێشتر بۆ وان ئینان و عامرێ كورێ فەهیرەیی و شارەزاییێ رێكێ د گەل وان چۆن، و رێكا كنارێ دەریایی دانە بەر خۆ.

٣٦٠١ - (خ) عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ جُعْشُمٍ قَالَ: جاءَنَا رُسُلُ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، يَجْعَلُونَ فِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَأَبِي بَكْرٍ، دِيَةَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا، لِمَنْ قَتَلَهُ أَوْ أَسَرَهُ، فَبَيْنَمَا أَنَا جالِسٌ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ قَوْمِي بَنِي مُدْلِجٍ، إِذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، حَتَّى قامَ عَلَيْنَا وَنَحْنُ جُلُوسٌ، فَقَالَ: يَا سُرَاقَةُ، إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ آنِفاً أَسْوِدَةً بِالسَّاحِلِ، أُرَاهَا مُحَمَّداً وَأَصْحَابَهُ، قالَ سُرَاقَةُ: فَعَرَفْتُ أَنَّهُمْ هُمْ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُمْ لَيْسُوا بِهِمْ، وَلكِنَّكَ رَأَيْتَ فُلاَناً وَفُلاَناً، انْطَلَقُوا بِأَعْيُنِنَا ، ثُمَّ لَبِثْتُ فِي الْمَجْلِسِ سَاعَةً، ثُمَّ قُمْتُ فَدَخَلْتُ، فَأَمَرْتُ جارِيَتِي أَنْ تَخْرُجَ بِفَرَسِي - وَهْيَ مِنْ وَرَاءِ أَكَمَةٍ - فتَحْبِسَهَا عَلَيَّ، وَأَخَذْتُ رُمْحِي.

---

(١) قد غمس حلفا: عەدەتێ عەرەبان ئەو بوو ئەگەر پەیمانەك گرێدابا ئامانەكێ گولاڤێ یان یێ خوینێ یان یێ خوەلییێ دئینا و پشتی پەیمانێ دەستێت خۆ دكرنە د ناڤدا نیشانا هندێیە نەڤ پەیمانە یا موكمە لەوا دەربرِین هۆسا هات دەستێ خۆ كربوو د پەیمانێدا (قد غمس حلفا) ئانكو: د وی ئامانیدا یێ پشتی پەیماندانێ دئینن.

فَخَرَجْتُ بِهِ مِنْ ظَهْرِ الْبَيْتِ، فَخَطَطْتُ بِزُجِّهِ الأَرْضَ، وَخَفَضْتُ عَالِيَهُ، حَتَّى أَتَيْتُ فَرَسِي فَرَكِبْتُهَا، فَرَفَعْتُهَا تُقَرِّبُ بِي، حَتَّى دَنَوْتُ مِنْهُمْ.

فَعَثَرَتْ بِي فَرَسِي، فَخَرَرْتُ عَنْهَا، فَقُمْتُ فَأَهْوَيْتُ يَدِي إِلَى كِنَانَتِي، فَاسْتَخْرَجْتُ مِنْهَا الأَزْلاَمَ، فَاسْتَقْسَمْتُ بِهَا: أَضُرُّهُمْ أَمْ لاَ، فَخَرَجَ الَّذِي أَكْرَهُ، فَرَكِبْتُ فَرَسِي، وَعَصَيْتُ الأَزْلاَمَ، تُقَرِّبُ بِي حَتَّى إِذَا سَمِعْتُ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَهْوَ لاَ يَلْتَفِتُ، وَأَبُو بَكْرٍ يُكْثِرُ الاَلْتِفَاتَ، سَاخَتْ يَدَا فَرَسِي فِي الأَرْضِ، حَتَّى بَلَغَتَا الرُّكْبَتَيْنِ، فَخَرَرْتُ عَنْهَا، ثُمَّ زَجَرْتُهَا فَنَهَضَتْ، فَلَمْ تَكَدْ تُخْرِجُ يَدَيْهَا. فَلَمَّا اسْتَوَتْ قَائِمَةً، إِذَا لأَثَرِ يَدَيْهَا عُثَانٌ سَاطِعٌ فِي السَّمَاءِ مِثْلُ الدُّخَانِ، فَاسْتَقْسَمْتُ بِالأَزْلاَمِ، فَخَرَجَ الَّذِي أَكْرَهُ.

فَنَادَيْتُهُمْ بِالأَمَانِ فَوَقَفُوا، فَرَكِبْتُ فَرَسِي حَتَّى جِئْتُهُمْ، وَوَقَعَ فِي نَفْسِي حِينَ لَقِيتُ ما لَقِيتُ مِنَ الحَبْسِ عَنْهُمْ، أَنْ سَيَظْهَرُ أَمْرُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)فَقُلْتُ لَهُ: إِنْ قَوْمَكَ قَدْ جَعَلُوا فِيكَ الدِّيَةَ، وَأَخْبَرْتُهُمْ أَخْبَارَ ما يُرِيدُ النَّاسُ بِهِمْ، وَعَرَضْتُ عَلَيْهِمُ الزَّادَ وَالمَتَاعَ، فَلَمْ يَرْزَآنِي وَلَمْ يَسْأَلاَنِي، إِلاَّ أَنْ قَالَ: (**أَخْفِ عَنَّا**). فَسَأَلْتُهُ أَنْ يَكْتُبَ لِي كِتَابَ أَمْنٍ، فَأَمَرَ عامِرَ بْنَ فُهَيْرَةَ فَكَتَبَ فِي رُقْعَةٍ مِنْ أَدِيمٍ، ثُمَّ مَضَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ).

قال ابن شهاب: فأخبرني عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) لَقِيَ الزُّبَيْرَ فِي رَكْبٍ مِنَ المسْلِمِينَ، كانُوا تِجاراً قافِلِينَ مِنَ الشَّامِ، فَكَسَا الزُّبَيْرُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ ثِيَابَ بَيَاضٍ.

وَسَمِعَ المسْلِمُونَ بِالمدِينَةِ بِمَخْرَجِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنْ مَكَّةَ، فَكَانُوا يَغْدُونَ كُلَّ غَدَاةٍ إِلَى الحَرَّةِ، فَيَنْتَظِرُونَهُ حَتَّى يَرُدَّهُمْ حَرُّ الظَّهِيرَةِ، فَانْقَلَبُوا يَوْماً بَعْدَ ما أَطَالُوا انْتِظَارَهُمْ، فَلَمَّا أَوَوْا إِلَى بُيُوتِهِمْ، أَوْفَى رَجُلٌ مِنْ يَهُودَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِهِمْ، لأَمْرٍ يَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَبَصُرَ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَأَصْحَابِهِ مُبَيَّضِينَ يَزُولُ بِهِمُ السَّرَابُ، فَلَمْ يَمْلِكِ الْيَهُودِيُّ أَنْ قَالَ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: يَا مَعَاشِرَ الْعَرَبِ، هَذَا جَدُّكُمُ الَّذِي تَنْتَظِرُونَ، فَثَارَ المسْلِمُونَ إِلَى السِّلاَحِ، فَتَلَقَّوْا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بِظَهْرِ الحَرَّةِ، فَعَدَلَ بِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ، حَتَّى نَزَلَ بِهِمْ فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، وَذَلِكَ يَوْمَ الاثْنَيْنِ مِنْ شَهْرِ رَبِيعٍ الأَوَّلِ.

فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ لِلنَّاسِ، وَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) صَامِتاً، فَطَفِقَ مَنْ جاءَ مِنَ الأَنْصَارِ ـ مِمَّنْ لَمْ يَرَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) ـ يُحَيِّي أَبَا بَكْرٍ، حَتَّى أَصَابَتِ الشَّمْسُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَأَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى ظَلَّلَ عَلَيْهِ بِرِدَائِهِ، فَعَرَفَ النَّاسُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عِنْدَ ذلِكَ. فَلَبِثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، وَأُسِّسَ المسْجِدُ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى، وَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ، فَسَارَ يَمْشِي مَعَهُ النَّاسُ حَتَّى بَرَكَتْ عِنْدَ مَسْجِدِ الرَّسُولِ (ﷺ) بِالمدِينَةِ، وَهْوَ يُصَلِّي فِيهِ يَوْمَئِذ رِجَالٌ مِنَ

المسْلِمِينَ، وَكَانَ مِرْبَداً لِلتَّمْرِ، لِسُهَيْلٍ وَسَهْلٍ غُلاَمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِ أَسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَ بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ: (**هذَا إِنْ شَاءَ اللهُ المَنْزِلُ**).

ثُمَّ دَعَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْغُلاَمَيْنِ فَسَاوَمَهُمَا بِالمِرْبَدِ لِيَتَّخِذَهُ مَسْجِداً، فَقَالاَ: لاَ، بَلْ نَهَبُهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ! فَأَبَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ يَقْبَلَهُ مِنْهُمَا هِبَةً حَتَّى ابْتَاعَهُ مِنْهُمَا، ثُمَّ بَنَاهُ مَسْجِداً، وَطَفِقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَنْقُلُ مَعَهُمُ اللَّبِنَ فِي بُنْيَانِهِ وَيَقُولُ، وَهُوَ يَنْقُلُ اللَّبِنَ:

هذا الحِمالُ لا حِمَالُ خيبرْ    هذَا أَبَرُّ رَبَّنَا وأَطْهَرْ

ويقول:

اللَّهُمَّ! إِنَّ الأَجْرَ أَجْرُ الآخِرَهْ    فَارْحَمِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ

فَتَمَثَّلَ بِشِعْرِ رَجُلٍ مِنَ المسْلِمِينَ لَمْ يُسَمَّ لِي.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَلَمْ يَبْلُغْنَا فِي الأَحَادِيثِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) تَمَثَّلَ بِبَيْتِ شِعْرٍ تَامٍّ غَيْرِ هذه الأبيات. [خ٣٩٠٦].

**ژ سوراقەیێ كورێ جوعشومی (رضي الله عنه) گۆت: هنارتییێ گاورێت قورەیشییان هاتە دەڤ من، و خوینەك[1] ل سەر هەر ئێك ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبو بەكری دانابوو، بۆ وی یێ بكوژیت یان ئێخسیر بكەت، وەختەكی ئەز ل دیوانەكێ ژ دیوانێت خەلكێ خۆ مەدلجییان یێ روینشتی بووم، زەلامەك ژ وان پێش مەڤە هات هەتا هاتییە هنداڤ سەرێ مە و ئەم د روینشتی بووین، ئینا گۆت: ئەی سوراقە، ب راستی من بەری نوكە رەشاتییەك ل كنارێ دەریایی دیتن، ئەز دبینم ئەو موحەممەد و هەڤالێت وینە، سوراقەیی گۆت: من زانی ئەو ئەون، ئینا من گۆتە وی: نەخێر ئەو نەئەون بەلێ تە فلان و فلان یێت دیتین ئەو پێش چاڤێت مە یێت چۆین، پاشی بێهنەكێ ئەز ل دیوانێ مام و ئەز رابووم چۆمە مال و ب زۆر كەفتم و من فەرمان ل جارییا خۆ كر ئەو هەسپێ من دەربێخیتە پشت گركەكی ل وێرێ بۆ من بهێلیت و من روما خۆ هەلگرت.**

(١) ئانكو: سەد حێشتر.

من د گەل خۆ بر و ژ پشتا خانیڤە دەركەفتم و من سەرێ وێ نزم كر و ئاسنكێ وێ د عەردیڕا خشاند هەتا ئەز هاتیمە دەڤ هەسپێ خۆ و ئەز لێ سویار بووم و من ب لەز هاژۆت دا من نێزیكی وان بكەت، هەتا ئەز نێزیكی وان بوویم.

هەسپێ من هەلنگفت و ئەز ژێ كەتمە خوارێ، من دەستێ خۆ برە تیرداناكا خۆ و من تیرێت بێ پەڕ و بێ سەرك ئینانە دەر و من پێ داخوازا دیاركرنا خێرێ ژ خرابیێ كر و من قورعە پێ كر ئەرێ زیانا وان بكەم یان نە، ئینا ئەو دەركەفت یا من نەدڤیا[1] و ئەز ل هەسپێ خۆ سویار بووم و من گوهێ خۆ نەدا قورعەیێ و هەسپ من نێزیك دكەت هەتا من گوه ل خواندنا پێغەمبەرێ خودێ بوویی (ﷺ) و ئەو ل دۆر خۆ نەدزڤری، و ئەبوبەكر گەلەك دزڤری، دەستێت هەسپێ من د عەردیدا چۆن هەتا گەهشتییە گۆزەكان و ئەز ب سەردا چۆم و كەفتم، پاشی ئەز لێ خوڕیم و ڕا بوو و نێزیك بوو نەشێت دەستێت خۆ دەربێخیت، ڤێجا دەمێ ل سەر دەست و پێت خۆ ڕاوەستای، من ل شویندەستێت وی تۆزەكا ئاشكەرا وەكی دویكێلی لێ دیت بلندبوو عەسمانی، من تیرێت بێ پەڕ و بێ سەرك ئینانە دەر من پێ داخوازا دیاركرنا خێرێ ژ خرابیێ كر و من قورعە پێ كر ئینا ئەو دەركەفت یا من نەدڤیا.

من گازی وان كر و ئێمناهی دایێ، ئینا ڕاوەستان و ئەز ل هەسپێ خۆ سویار بووم هەتا هاتیمە دەڤ وان، و ئەو كەفتە د دلێ مندا دەمێ ئەز بەرهنگار بیمە وێ یا ئەز بەرهنگار بوویمێ ژ هەزڤا ندن و ڤەگرتنا من ژ وان دێ كارێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەر سەركەڤیت، ئینا من گۆتە وی: ب ڕاستی خەلكێ تە خوینەك بۆ تە یا دانای، و دەنگ و بەحسێ خەلكی ژ وان دڤێت من بۆ وان گۆت، و من خوارن و متا ل سەر وی بەرچاڤ كر، بەلێ وی نە چو ژێ ڕاكر و نە چو داخوازی ژ من كر، ئەو نەبیت گۆت: **(مە ل خەلكێ ڤەشێرە)**، من داخواز ژێ كر ئەو نڤیسانەكا ئێمناهییێ بۆ من بنڤیسیت، ئینا فەرمان ل عامرێ كوڕێ فەهیرەیی كر ل سەر پارچەكا پیستی نڤیسی پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ.

---

(١) ئانكو: ئەو دەركەفت ئەز وان بهێلم و ڕێكێ لێ نەگرم.

ئیبن شیهابی گۆت: عوروەیێ كوڕێ زوبەیری گۆتە من: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گەهشتە زوبەیری ل ناڤ كاروانەكی موسلمانان بازرگان بوون و ژ شامێ دزڤرین، ئینا زوبەیری جلكەكێ سپی كرە بەر پێغەمبەری (ﷺ) و ئەبوبەكری.

و موسلمانان ل مەدینەیێ گوه ل دەركەفتنا پێغەمبەری بوون (ﷺ) ژ مەكەهێ، ڤێجا هەمی سپێدەییان دەردكەفتنە جهێ بەرەڕەشكان و چاڤرێیا وی دكر، هەتا گەرماتییا نیڤرۆ ئەو زڤراندبان، رۆژەكێ ژ ڤرین پشتی چاڤەرێكرنەكا دویر و درێژ كرین، ڤێجا دەمێ هاتینەڤە مالێت خۆ، زەلامەكێ جوهی ب سەر كەلهەكێ ژ كەلهێت وان سەركەفت بەرێ خۆ بدەتە كارەكێ خۆ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤالێت وی دیتن جلكێت سپی ل بەر بوون و لەیلانێ ئەو دڤەشارتن، مرۆڤێ جوهی نەشیا خۆ و ب هەمی دەنگێ خۆ یێ بلند گازی كر: گەلی عەرەبان ئەڤە بەختێ هەوە و سەروەرێ هەوە یە یێ هوین چاڤەرێیا وی دكەن، موسلمانان دەست هاڤێتنە چەكێت خۆ و ئەو ل پشت جهێ شیشەبەرێت رەش گەهشتنە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، پێغەمبەری (ﷺ) بەرێ وان دا لایێ راستێ هەتا ئینایینە دەڤ بەنی عەمرێ كوڕێ عەوفی، و ئەڤە ژی رۆژا دوشەمبی بوو ژ هەیڤا رەبیع ئەلئەووەل.

ئەبوبەكر د ناڤ خەلكیدا ژ پیاڤە راوەستا، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب بێدەنگی یێ روینشتی بوو، خەلكەكی ژ ئەنسارا ژ وان یێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەدیتی دەستهاڤێتنێ خێرهاتن ب ئەبوبەكری كرن، هەتا هەتاڤ گەهشتییە پێغەمبەرێ خودێ ئینا ئەبوبەكری بەرێ خۆ دایێ و ب كراسێ خۆ سیبەر لێ كر، ژ ڤێ خەلكێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نیاسی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەه شەڤ و چەندەكان[1] ل دەڤ بەنی عەمرێ كوڕێ عەوفی ما، ئەو مزگەفتا ل سەر بنیاتێ خودێپەرێسییێ هاتییە ئاڤاكرن ئاڤا كر و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژ تێڤە كر، پاشی ل حێشترا خۆ سویار بوو و خەلك د گەل وی چۆن هەتا حێشترا وی دانا یە جهێ مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) ل مەدینەیێ، و ژ وێ رۆژێ خەلكەك ژ موسلمانان نڤێژان تێڤە دكەن و ئەو جهێ هشككرنا

(١) چەندەك دكەڤیتە د ناڤبەرا سێیان هەتا نەهاندا.

قەسپان بوو یێت سوهەیلی و سەهلی و ئەو دو لاوێت ئێتیم بوون و ل دەڤ ئەسعەدێ كورێ زورارەی بوون، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ حێشترا وی دانایی دادایی گۆت: (ب ئانەهییا خودێ ئەڤە ئەو جهە یێ ئەم دێ لێ بین و مینین).

پا شی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گازی وان هەردو لاوان كر و بازارێ جهێ قەسپ هشكرنێ د گەل وان كر دا بكەتە مزگەفت، ئینا گۆتن: نافرۆشین بەلكی دێ كەینە دیاری بۆ تە ئەی پێغەمبەرێ خودێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رازی نەبوو ئەو دیاری ژ وان وەرگریت هەتا ژ وان كڕی، پاشی ئەو مزگەفت ل سەر ئاڤا كر و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستهاڤێتێ لبنە د گەل وان ڤەدگوهازتن بۆ ئاڤاهی و وی لبنە ڤەدگوهازتن و دگۆت:

ئەڤ بارە بارەكێ ب قەدرە چونكی بۆ ئاڤاكرنا مزگەفتێیە

نە بەر و بەرهەمێ خەیبەرێ ئەڤە ل دەڤ خودێ ب خێرتر و باشترە

و دگۆت:

یا خودێ خەلات خەلاتێ ئاخرەتێیە ڤێجا دلۆڤانییێ ب ئەنسار و مشەختان ببە

نموونە ب هۆزانا زەلامەكی ژ موسلمانان ئینا و ناڤێ وی بۆ من نەئینا.

ئیبن شیهابی گۆت: د فەرموودەیا ندا نەگەهشتییە مە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب مالكەكا تەمام ژ هۆزانەكێ نموونە ئینابیت ژ بلی ڤان مالكان.

## ٣ . باب: فِي بيت أَبِي أيوب

### بابەتێ: ل مالا ئەبی ئەیووبی.

٣٦٠٢ - (م) عَنْ أَبِي أَيُّوبَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَزَلَ عَلَيْهِ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي السُّفْلِ، وَأَبُو أَيُّوبَ فِي الْعُلْوِ. قَالَ: فَانْتَبَهَ أَبُو أَيُّوبَ لَيْلَةً فَقَالَ: نَمْشِي فَوْقَ رَأْسِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)! فَتَنَحَّوْا، فَبَاتُوا فِي جَانِبٍ. ثُمَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**السُّفْلُ أَرْفَقُ**) ، فَقَالَ: لاَ أَعْلُو سَقِيفَةً أَنْتَ تَحْتَهَا، فَتَحَوَّلَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي الْعُلْوِ، وَأَبُو أَيُّوبَ فِي السُّفْلِ. فَكَانَ يَصْنَعُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) طَعَاماً، فَإِذَا جِيءَ بِهِ إِلَيْهِ، سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِهِ، فَيَتَتَبَّعُ مَوْضِعَ أَصَابِعِهِ. فَصَنَعَ لَهُ طَعَاماً فِيهِ ثُومٌ، فَلَمَّا رُدَّ إِلَيْهِ، سَأَلَ عَنْ مَوْضِعِ أَصَابِعِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقِيلَ لَهُ: لَمْ يَأْكُلْ! فَفَزِعَ، وَصَعِدَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَحَرَامٌ هُوَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**لاَ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُهُ**) قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَهُ مَا تَكْرَهُ . أَوْ مَا كَرِهْتَ . قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُؤْتَى. [م٢٠٥٣].

**ژ ئەبی ئەیووبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوو مێڤانێ مە، پێغەمبەر (ﷺ) چۆ قاتێ بنی و ئەبو ئەیووب چۆ قاتێ سەری، ئەبو ئەیووب شەڤەكێ هشیار بوو و هزرێت خۆ كرن، ئینا گۆت: ئەم هنداڤ سەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتن و چۆنێ دكەین، وان خۆ دا پاش و شەڤا خۆ ل رەخەكێ مالێ برنە سەری، پاشی ئەڤ چەندە گۆتە پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (قاتێ خوارێ بۆ من ساناهیترە) ئینا گۆت: ئەز سەرناكڤمە بانەكی تو د بندا بی، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) سەركەفتە سەری، و ئەبو ئەیووب هاتە بنی، ڤێجا خوارن بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دورست دكر، ڤێجا ئەگەر بۆ بر با و هاتبا ڤە دا پر سیارا جهێت تبلێت وی كەت و ژ جهێ تبلێت وی د خوار، و وی خوارنەك بۆ دورست كر سیر تێدا بوون، ڤێجا دەمێ بۆ هاتییە زڤراندن پرسیارا جهێ تبلێت پێغەمبەری (ﷺ) كر، گۆتێ: پێغەمبەری (ﷺ) نەخوار، ئینا ترسیا و سەركەفتە دەڤ وی و گۆت: ما ئەو یێ حەرامە؟ ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (نەخێر، بەلێ ئەز حەژێ ناكەم)، گۆت: ئەوا تو حەژێ نەكەی ئەز حەژێ ناكەم، گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ملیاكەت دهاتنە دەڤ.**

**٤ . باب: إسلام عبد الله بن سلام رضي الله عنه**

**بابەتێ: موسلمانبوونا عەبدوللایێ كورێ سەلامی (رضي الله عنه).**

٣٦٠٣ – (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قالَ: بَلَغَ عَبْدَ اللهِ بْنَ سَلاَمٍ مَقْدَمُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) المدِينَةَ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ ثَلاَثٍ لاَ يَعْلَمُهُنَّ إِلاَّ نَبِيٌّ: مَا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ؟ وَمَا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الجَنَّةِ؟ وَمِنْ أَيِّ شَيْءٍ يَنْزِعُ الْوَلَدُ إِلَى أَبِيهِ؟ وَمِنْ أَيِّ شَيْءٍ يَنْزِعُ إِلَى أَخْوَالِهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**خَبَّرَنِي بِهِنَّ آنِفاً جِبْرِيلُ**). قالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: ذَاكَ عَدُوُّ الْيَهُودِ مِنَ الملاَئِكَةِ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَمَّا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: فَنَارٌ تَحْشُرُ النَّاسَ مِنَ المَشْرِقِ إِلَى المَغْرِبِ، وَأَمَّا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الجَنَّةِ: فَزِيَادَةُ كَبِدِ حُوتٍ، وَأَمَّا الشَّبَهُ فِي الْوَلَدِ: فَإِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَشِيَ المَرْأَةَ فَسَبَقَهَا ماؤُهُ كانَ الشَّبَهُ لَهُ، وَإِذَا سَبَقَ ماؤُهَا كانَ الشَّبَهُ لَهَا**). قالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ.

ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ اليَهُودَ قَوْمٌ بُهُتٌ، إِنْ عَلِمُوا بِإِسْلاَمِي قَبْلَ أَنْ تَسْأَلَهُمْ بَهَتُونِي عِنْدَكَ، فَجَاءَتِ الْيَهُودُ وَدَخَلَ عَبْدُ اللهِ الْبَيْتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَيُّ رَجُلٍ فِيكُمْ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ**) ؟

قَالُوا: أَعْلَمُنَا، وَابْنُ أَعْلَمِنَا، وَأَخْيَرُنَا، وَابْنُ أَخْيَرِنا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَفَرَأَيْتُمْ إِنْ أَسْلَمَ عَبْدُ اللهِ)**؟ قالُوا: أَعاذَهُ اللهُ مِنْ ذلِكَ! فَخَرَجَ عَبْدُ اللهِ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، فَقَالُوا: شَرُّنَا، وَابْنُ شَرِّنَا، وَوَقَعُوا فِيهِ. [خ٣٣٢٩].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: بەحسێ هاتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ مەدینەیێ گەهشتە عەبدوللایێ كوڕێ سەلامی، ئینا هاتە دەڤ و گۆتێ: ئەز دێ پرسیارا سێ تشتان ژ تە كەم، كەس وان نوزانیت پێغەمبەر نەبیت: نیشانا ئێكێ یا رۆژا قیامەتێ چییە؟ و خوارنا ئێكێ یا خەلكێ بەحشتێ دخۆن چییە؟ و ب چ تشتی زارۆك ب بابێ خۆڤە دچیت و ب چ تشتی زارۆك ب خالێت خۆڤە دچیت؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەها نوكە جبریلی بۆ من گۆتن)، گۆت: ئینا عەبدوللایی گۆت: ئەو دژمنێ جوهیانە ژ ملیاكەتان.**

**ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هندیكە نیشانا ئێكێیە یا رۆژا قیامەتێ ئاگرەكە خەلكێ ژ رۆژهەلاتی بۆ رۆژئاڤایی كۆم دكەت، و خوارنا ئێكێ خەلكێ بەحەشتێ دخۆن زێدەهییا مێلاكا نەهەنگییە، و هندیكە پێڤەچۆنا زارۆكییە: ئەگەر زەلام چۆ دەڤ ژنێ و ئاڤا وی پێش ئاڤا ژنێ كەفت زارۆك دێ ب ویڤە چیت، و ئەگەر ئاڤا ژنێ پێش ئاڤا زەلامی كەفت ئەو زارۆك دێ ب وێڤە چیت)، عەبدوللایی گۆت: ئەز شەهدەیێ ددەم تو پێغەمبەرێ خودێیی.**

**پاشی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ: ب راستی جوهی ملەتەكێ بێ بەختن، ئەگەر ئەو ب موسلمانبوونا من بزانن بەری تو پرسیارا من ژ وان بكەی دێ بێبەختییا ل دەڤ تە ب دویڤ منڤەنن، ڤێجا جوهی هاتن و عەبدوللا چۆ د ژۆرڤە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (عەبدوللایێ كوڕێ سەلامی د ناڤ هەوەدا چ زەلامە)؟ گۆتن: زاناترینێ مەیە و كوڕێ زاناترینێ مەیە، و باشترینێ مەیە و كوڕێ باشترینێ مەیە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (پا هوین چ دبێژن ئەگەر عەبدوللا موسلمان ببیت)، گۆتن: خودێ وی ژ هندێ بپارێزیت! ئینا عەبدوللا هاتە دەڤ وان و گۆت: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ)، ئینا گۆتن خرابترینێ مە و كوڕێ خرابترینێ مە، و ئاخفتنێت درەو و نەدورست د راستا ویدا گۆتن.**

## ٥ ـ باب: أول مولود في الإسلام

### بابەتێ: بچویكێ ئێكێ د ئیسلامێدا ژ دایك بووی.

٣٦٠٤ – (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما: أَنَّهَا حَمَلَتْ بِعَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِمَكَّةَ، قالَتْ: فَخَرَجْتُ وَأَنَا مُتِمٌّ ، فَأَتَيْتُ المدِينَةَ فَنَزَلْتُ قُبَاءً، فَوَلَدْتُ بِقُبَاءٍ، ثمَّ أَتَيْتُ بِهِ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ، ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ فَمَضَغَهَا، ثُمَّ تَفَلَ فِي فِيهِ، فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ دَخَلَ جَوْفَهُ رِيقُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، ثُمَّ حَنَّكَهُ بِالتَّمْرَةِ، ثُمَّ دَعَا لَهُ وَبَرَّكَ عَلَيْهِ، وَكَانَ أَوَّلَ مَوْلُودٍ وُلِدَ فِي الإِسْلاَمِ، فَفَرِحُوا بِهِ فَرَحاً شَدِيداً؛ لِأَنَّهُمْ قِيلَ لَهُمْ: إِنَّ الْيَهُودَ قَدْ سَحَرَتْكُمْ فَلاَ يُولَدُ لَكُمْ. [خ٥٤٦٩ (٣٩٠٩)/ م٢١٤٦]

**ژ ئەسمائا كچا ئەبی بەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) ئەو ل مەكەهێ ب عەبدوللایێ كورێ زوبەیری یا ب حال بوو، گۆت: ئەز ژ مەكەهێ دەركەفتم و دەمێ من یێ تمام بووی، ئەز یا ل سەر رۆژێت خۆ، ئەز هاتمە مەدینەیێ و ئەم ل قوبایێ ماین و ل قوبایێ من بچویك بوو، پاشی من ئینا دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و من دانا د كۆشا ویدا، پاشی داخوازا قەسپەكێ كر و د ناڤ دەڤێ خۆدا جوی، پاشی كرە د دەڤێ ویدا، ڤێجا تشتێ ئێكێ چۆیە د زكێ ویدا خازیا پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ)، پاشی ب قەسپێ مێژكۆیی كر، پاشی دوعا بۆ كرن، و گۆتێ خودێ بەرەكێ بدەتە تە، و ئەو بچویكێ ئێكێ بوو د ئیسلامێدا بووی، لەوا پێ دلخۆش بوون دلخۆشییەكا زێدە، چونكی گۆتبوو وان جوهییان سێر یا ل هەوە كری و هەوە بچویك نابن.**

## ٦ ـ باب: التأريخ بالهجرة

### بابەتێ: دیرۆككرن ب مشەختبوونێ.

٣٦٠٥ – (خ) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: ما عَدُّوا مِنْ مَبْعَثِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَلاَ مِنْ وَفَاتِهِ، ما عَدُّوا إِلاَّ مِنْ مَقْدَمِهِ المدِينَةَ. [خ٣٩٣٤].

**ژ سەهلێ كورێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: نە ژ هنارتنا پێغەمبەری (ﷺ) و نە ژ مرنا وی هژمارتن كرن، هژمارتن نەكرن ژ هاتنا وی بۆ مەدینەیێ نەبیت.**

## ٧ . باب: مرض بعض الصحابة بعد هجرتهم

## بابەتێ: نەساخییا هندەك سەحابان پشتی مشەختبوونا وان.

٣٦٠٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) المدِينَةَ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْرِئٍ مُصَبَّحٌ فِي أَهْلِهْ     وَالمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهْ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ الحُمَّى يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ يَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً     بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ

وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْماً مِيَاهَ مَجَنَّةٍ     وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ

وَقَالَ: اللَّهُمَّ الْعَنْ شَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَعُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، كما أَخْرَجُونَا مِنْ أَرْضِنَا إِلَى أَرْضِ الْوَبَاءِ. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا المَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ. اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا، وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الجُحْفَةِ)**.

قَالَتْ: وَقَدِمْنَا المدِينَةَ وَهْيَ أَوْبَأُ أَرْضِ اللهِ، قَالَتْ: فَكَانَ بُطْحَانُ يَجْرِي نَجْلاً. تَعْنِي: مَاءً آجِناً.[خ١٨٨٩/ م١٣٧٦].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتییە مەدینەیێ، تا هاتە ئەبوبەكری و بیلالی، و ئەبوبەكری دەمێ تایێ دگرت دگۆت:**

**هەر مرۆڤەك سپێدێ مالا وی سپێدەباشییێ لێ دكەن     و مرن بۆ وی ژ قەیتانا شمكا وی نێزیكترە**

**و بیلالی ئەگەر تایێ بەردابا دەنگێ خۆ بلند دكر و دگۆت:**

**خۆزی من زانیبایە دێ شەڤەكێ ل نهالا     مەكەهێ مینم و ئیزخیر و جەلیل[1] دۆرماندۆرێت من بن**

**و كا دێ رۆژەكێ هێمە سەر ئاڤا میجەن[2]     و كا دێ چیاكێ شامە و تەفیل[3] ب بەر چاڤێت من كەڤن**

---

(١) دو شینكاتییێت بێهنخۆشن ل مەكەهێ شین دبن.

(٢) میجەن: ناڤەكە ل عوكازێ بوو و ب چەند میلەكێت كێم دویری مەكەهێیە ژ لایێ زەهرانێڤە و سویكەكا سەردەمێ نەزانینێ لێ بوو.

(٣) دو چیانە ب رەخێكڤە و دكەڤنە باشوورێ رۆژئاڤایێ مەكەهێ و (٩٠) كم ژێ دویرە.

و گۆت: ئەی خودا نەفرەتان ل شەیبەیێ كورێ رەبیعەیی و عوتبەیێ كورێ رەبیعەیی و ئومەییە كورێ خەلەفی بكە هەروەكی وان ئەم ژ عەردێ مە بۆ جهێ نەخۆشییان دەرئێخستین، پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەی خودا مەدینەیێ ل بەر مە خۆشڤی بكە وەكو خۆشڤیاتییا مە بۆ مەكەهێ یان پتر، یا خودێ بەرەكەتێ بۆ مە بێخە د ساعا مەدا و د مستا مەدا[1] و بۆ مە ساخلەم بكە و تایا وێ ڤەگوهێزە جوحفەیێ[2])**.

عائیشایێ گۆت: ئەم هاتینە مەدینەیێ و ئەو پڕ نەخۆشترین عەردێ خودێ بوو، و گۆت: و بوتحانێ ئاڤەكا پیس تێدا دهاتە خوارێ، ئانكو: ئاڤەكا گەنی.

## ٨ . باب: بناء المسجد النبوي الشريف

## بابەتێ: ئاڤاكرنا مزگەفتا پێغەمبەری یا پیرۆز

[انظر: ١٠٦٨ وما بعده].

## ٩ . باب: المؤاخاة بين المهاجرين والأنصار

## بابەتێ: برایەتیكرن د ناڤبەرا مشەختی و ئەنساراندا.

٣٦٠٧ - (خ) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمٰنِ بْنِ عَوْفٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا قَدِمْنَا المَدِينَةَ آخى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ، فَقَالَ سَعْدُ بْنُ الرَّبِيعِ: إِنِّي أَكْثَرُ الأَنْصَارِ مَالاً، فَأَقْسِمُ لَكَ نِصْفَ مَالِي، وَانْظُرْ أَيَّ زَوْجَتَيَّ هَوِيتَ نَزَلْتُ لَكَ عَنْهَا، فَإِذَا حَلَّتْ تَزَوَّجْتَهَا، قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمٰنِ: لاَ حَاجَةَ لِي فِي ذٰلِكَ، هَلْ مِنْ سُوقٍ فِيهِ تِجَارَةٌ؟ قَالَ: سُوقُ قَيْنُقَاعَ، قَالَ: فَغَدَا إِلَيْهِ عَبْدُ الرَّحْمٰنِ، فَأَتَى بِأَقِطٍ وَسَمِنٍ، قَالَ: ثُمَّ تَابَعَ الْغُدُوَّ، فَمَا لَبِثَ أَنْ جَاءَ عَبْدُ الرَّحْمٰنِ عَلَيْهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(تَزَوَّجْتَ)** ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: **(وَمَنْ)**. قَالَ: امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: **(كَمْ سُقْتَ)** ؟ قَالَ: زِنَةَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، أَوْ نَوَاةً مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ)**. [خ٢٠٤٨].

ژ عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ ئەم هاتینە مەدینەیێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) برایەتی د ناڤبەرا من و سەعدێ كورێ رەبیعە یدا كر، ئینا

---

(١) هەردو ئالاڤێت پیڤانێنە و هەر ساعەك منەكە و دبیتە چوار دو مستێن زەلامان و مست ژی یا ئاشكەرایە.

(٢) ناڤێ جوحفەیێ ئینا، چونكی وی دەمی ئەو جهێ موشركان بوو و هاریكارییا قورەیشییان دكرن دا ب خۆڤە مژویل ببن و هاریكارییا دژمنان نەكەن، و ئەو جهەكە دكەڤیتە د ناڤبەرا مەكەهێ و مەدینەیێدا و (١٩٠) كم ژ مەكەهێ دویرە.

**سەعدێ كورێ رەبیعەی گۆت: ب راستی من د ناڤ ئەنسارانددا پتر ین مال یێ هەی، ڤێجا ئەز دێ نیڤا مالێ خۆ بۆ تە جودا كەم، و بەرێ خۆ بدە هەڤژینێت من تە كیژك ڤیا دێ بۆ تە بەردەم و دەمێ ژ ژڤانان خلاس بوو مارە بكە، گۆت: عەبدولرەحمانی گۆت: من هەوجەیی ب ڤێ چەندێ نینە، بازارەك هەیە بازرگانی تێدا بهێتە كرن؟ گۆت: سویكا قەینوقاع، گۆت: سپێدێ عەبدولرەحمان چۆیێ و كەشك و رو ین ئینان، گۆت: پاشی بەردەوام چۆنا بازاری كر و چویێ وەسا نەما هەتا عەبدولرەحمان هات و نیشانێت زەراتییێ پێڤە بوون، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( تە ژن ئینا یە)؟ گۆت: بەلێ، گۆت: (كی یە)؟ گۆت: ژنەكە ژ ئەنساران، گۆت: ( تە چەند مەهر دا یە)؟ گۆت: كێشا بەركەكێ قەسپێ ژ زێری یان بەركەكێ قەسپێ ژ زێری، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خوارنەكێ چێكە بلا ب پەزەكێ ژی بیت).**

٣٦٠٨ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) آخَى بَيْنَ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ وَبَيْنَ أَبِي طَلْحَةَ.[م٢٥٢٨].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) برایەنی د ناڤ بەرا ئەبی عوبەیدەیی و ئەبی تەلحەییدا پێك ئینا.**

١٠ . باب: زواج النبي (ﷺ) عائشة

**بابەتێ: هەڤژینگرییا پێغەمبەری (ﷺ) ب عائیشایێ.**

٣٦٠٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**رَأَيْتُكِ فِي الْمَنَامِ، يَجِيءُ بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَقَالَ لِي: هذِهِ امْرَأَتُكَ، فَكَشَفْتُ عَنْ وَجْهِكِ الثَّوْبَ فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَقُلْتُ: إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللهِ يُمْضِهِ**). [خ٥١٢٥ (٣٨٩٥)/ م٢٤٣٨].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: ( من تو د خەونێدا دیتی ملیاكەتەك تە د پارچەكا ئارمویشیدا دئینت و گۆتە من: ئەڤە هەڤژینا تەیە، و من ژی جلك ژ سەروچاڤێت تە راكر من دیت تویی، ئینا من گۆت: ئەگەر ئەڤە ل دەڤ خودێ بیت دێ ب رێ ئێخیت).**

٣٦١٠ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَنَا بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، فَوُعِكْتُ فَتَمَرَّقَ شَعَرِي فَوَفَى جُمَيْمَةً، فَأَتَتْنِي أُمِّي أُمُّ رُومانَ، وَإِنِّي لَفِي أُرْجُوحَةٍ، وَمَعِي صَوَاحِبُ لِي، فَصَرَخَتْ بِي، فَأَتَيْتُهَا، لاَ أَدْرِي مَا تُرِيدُ بِي؟ فَأَخَذَتْ بِيَدِي

حَتَّى أَوْقَفَتْنِي عَلَى بَابِ الدَّارِ، وَإِنِّي لأُنْهَجُ حَتَّى سَكَنَ بَعْضُ نَفَسِي، ثُمَّ أَخَذَتْ شَيْئاً مِنْ ماءٍ فَمَسَحَتْ بِهِ وَجْهِي وَرَأْسِي، ثُمَّ أَدْخَلَتْنِي الدَّارَ، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْبَيْتِ، فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِنَّ، فَأَصْلَحْنَ مِنْ شَأْنِي، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ضُحى، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ. [خ٣٨٩٤/ م١٤٢٢].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز مارەکرم و ئەز کچەکا شەش سالی بووم، و ئەم هاتینە مەدینەیێ و چۆینە دەڤ بنەمالا حارسێ کورێ خەزرەجی و تایێ ئەز گرتم و نەساخ بووم و موییێت سەرێ من وەریان و هاتنەڤە و درێژ بوو هەتا سەر ملی، دایکا من ئوم رومان هاتە من و ئەز د هێزکەکێدا بووم و هەڤالێت من د گەل من بوون، گازی من کر، ئەز هاتمە دەڤ، و ئەز نوزانم وێ چ ژ من دڤێت؟ دەستێ من گرت هەتا ئەز ل بەر دەرێ خانی راوەستاندیم، و بێنا من یا خۆ دقوتیت هەتا بێهنا من راوەستای، پاشی پیچەك ژ ئاڤێ هەلگرت و ناڤچاڤێت من و سەرێ من پێ ڤەمالین، و پاشی ئەز کرمە د ژۆرڤە من کۆمەکا ژنان ژ پێت ئەنساران ل مال دیتن، گۆتن: سەرخێرێ و بەرکەت و بەختێ باش بیت، و ئەز رادەستی وان کرم، و وان کارێ من کر و ئەز ب سەروبەر کرم و چو موفاجەئە بۆ چێ نەبوو ئەو نەبیت من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل تێشتەگەهێ دیت و ئەز رادەستی وی کرم و د وێ رۆژێدا ئەز کچەکا نەهـ سالی بووم.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

الفصل الرابع: غزوة البدر وما بعدها

## پشكا چوارێ: خەزایا بەدرێ و یا پشتی وێ

### ١ . باب: فضل من شهد بدراً

### بابەتێ: ڤەدرێ وی یێ پشكداری د بەدرێدا كری.

٣٦١١ - (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ عَبْداً لِحَاطِبٍ جَاءَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَشْكُو حَاطِباً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَيَدْخُلَنَّ حَاطِبٌ النَّارَ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (كَذَبْتَ! لاَ يَدْخُلُهَا، فَإِنَّهُ شَهِدَ بَدْراً وَالْحُدَيْبِيَةَ). [م٢٤٩٥].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: بەندە یەكێ حاتبی ها تە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گازندە ژ حاتبی كرن و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ حاتب دێ چیتە جەهەنەمێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( تو درەوان د كەی نا چیتە جەهەنەمێ، ب راستی وی پشكداری یا د بەدرێ و حودەیبییێدا كری).**

### ٢ . باب: الشورى قبل المعركة

### بابەتێ: مشێورەتێ بەری شەڕی.

٣٦١٢ - (خ) عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: شَهِدْتُ مِنَ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ مَشْهَداً؛ لأَنْ أَكُونَ صَاحِبَهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا عُدِلَ بِهِ، أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) وَهُوَ يَدْعُو عَلَى الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: لاَ نَقُولُ كما قالَ قَوْمُ مُوسى: اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلاَ، وَلكِنَّا نُقَاتِلُ عَنْ يَمِينِكَ وَعَنْ شِمَالِكَ وَبَيْنَ يَدَيْكَ وَخَلْفَكَ. فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) أَشْرَقَ وَجْهُهُ وَسَرَّهُ. يَعْنِي: قَوْلَهُ. [خ٣٩٥٢]

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: هەلویستەك من ژ میقدادێ كوڕێ ئەسوەدی دیت، ئەگەر ئەز خودانێ وی هەلویستی بم ب دنیایێ هەمییێ ناگوهۆرم، ها تە دەڤ پێغەمبەرێ خۆدێ (ﷺ) و ئەو یێ نفرینان ل هەڤپشكچێكەران د كەت، ئینا گۆت، ئەم وێ نابێژین یا ملەتێ مووسایی گۆتی: تو و خودایێ خۆ هەرن شەڕی بكەن، بەلكی ل رەخێ تە یێ راستێ و ل رەخێ تە یێ چەپێ و ل بەرسینگێ تە و ل پشت تە دێ شەڕی كەین، ئینا من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت ناڤچاڤێت وی گەش بوون و دلێ وی پێ خۆش بوو، ئانكو: ب ئاخفتنا وی.**

٣٦١٣ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) شَاوَرَ، حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَ: فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ. فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا.

قَالَ: فَنَدَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) النَّاسَ، فَانْطَلَقُوا حَتَّى نَزَلُوا بَدْراً. وَوَرَدَتْ عَلَيْهِمْ رَوَايَا قُرَيْشٍ، وَفِيهِمْ غُلاَمٌ أَسْوَدُ لِبَنِي الْحَجَّاجِ، فَأَخَذُوهُ، فَكَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَسْأَلُونَهُ عَنْ أَبِي سُفْيَانَ وَأَصْحَابِهِ؟ فَيَقُولُ: مَا لِي عِلْمٌ بِأَبِي سُفْيَانَ، وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ. فَإِذَا قَالَ ذلِكَ، ضَرَبُوهُ. فَقَالَ: نَعَمْ، أَنَا أُخْبِرُكُمْ، هَذَا أَبُو سُفْيَانَ. فَإِذَا تَرَكُوهُ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: مَا لِي بِأَبِي سُفْيَانَ عِلْمٌ، وَلكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ، وَعُتْبَةُ، وَشَيْبَةُ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فِي النَّاسِ. فَإِذَا قَالَ هَذَا أَيْضاً، ضَرَبُوهُ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) قَائِمٌ يُصَلِّي. فَلَمَّا رَأَى ذلِكَ انْصَرَفَ، قَالَ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَضْرِبُوهُ إِذَا صَدَقَكُمْ، وَتَتْرُكُوهُ إِذَا كَذَبَكُمْ**).

قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**هَذَا مَصْرَعُ فُلاَنٍ**) قَالَ: وَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ، هَاهُنَا وَهَاهُنَا. قَالَ: فَمَا مَاطَ أَحَدُهُمْ عَنْ مَوْضِعِ يَدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [م١٧٧٩].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ هاتنا ئەبی سوفیانی ژ شامێ گەهشتییە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مەشێورەت كر: ئەبو بەكر ئاخفت بەرێ خۆ ژێ وەرگێرا، پاشی عومەر ئاخفت پشتا خۆ دایێ، سەعدێ كورێ عوبادە رابوو: ئینا گۆت: تە ئەم دڤێین ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستیدا ئەگەر تو فەرمانا مە بكەی ب هەسپان بدەینە د ناڤ دەریاییێدا دێ دەینە د ناڤدا، و ئەگەر تو فەرمانا مە بكەی ئەم ب هێز و لەز بچین هەتا جهێ بەرەك و لغەمادێ دێ وەكەین.**

**گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گازی خەلكی كر دەركەفتن و چۆن هەتا هاتینە بەدرێ، و ئاڤكێشێت قورەیشیان هاتنە دەڤ وان، و خز مەتكارەكێ رەش یێ ب نەمالا حەجاجی د گەل بوو، و وان ئەو گرت، و هەڤالێت پێغەمبەری پرسیارا ئەبو سوفیانی و هەڤالێت وی ژێ دكر؟ وی دگۆت: من چو زانین ب ئەبی سوفیانی نینە، بەلێ ئەڤە ئەبو جەهل و عوتبە و شەیبە و ئومەییە كورێ خەلەفینە، ڤێجا دەمێ وی ئەڤە دگۆت ئەو دقوتا، ئینا گۆت: باشە دێ بێژمە هەوە: ئەڤە ئەبو سوفیانە، و ئەگەر وان ئەو دهێلا و**

پرسار ژێ دكرەڤە دگۆت: من چو زانين ب ئەبى سوفيانى نينە بەلێ ئەڤە ئەبو جەهل و عوتبە و شەيبە و ئومەيیە كورێ خەلەفينە د گەل خەلكى، و ئەگەر وى ديسا ئەڤە دگۆت دقوتا، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ پيانڤە بوو نڤێژ دكر، ڤێجا دەمێ خلاس كرى گۆت: **(ئەز ب وى كەمە يێ جانێ من د دەستێ ويدا هوين وى د قوتن ئەگەر راستى بۆ هەوە گۆت و هوين وى دهێلن ئەگەر درەو د گەل هەوە كر).**

گۆت: پێغەمبەرێ خودێ گۆت: **(ئەڤە شوينا كوشتنا فلانىيە)** گۆت: و دا دەستێ خۆ دانيتە سەر عەردى ئها ل ڤێرێ و ل ڤێرێ، گۆت: هيچ كەسەك ژ وان ل شوينا دەستێ پێغەمبەرێ خودێ مرنا وان دوير نەكەفت.

### ٣ . باب: دعاء قبل المعركة

### بابەتێ: دوعايا بەرى شەرى.

٣٦١٤ – (خ) عَنْ اِبْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَهُوَ فِي قُبَّةٍ: **(اللَّهُمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ، اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْدَ اليَوْمِ)** فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: حَسْبُكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَدْ أَلْحَحْتَ عَلى رَبِّكَ، وَهُوَ فِي الدِّرْعِ، فَخَرَجَ وَهُوَ يَقُولُ ﴿سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ۝٤٥ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ۝٤٦﴾ [القمر:٤٥، ٤٦] . وفي رواية: في قبة يوم بدر. [خ٢٩١٥، ٤٨٧٥].

ژ ئيبن عەباس (خودێ ژ وان رازى بيت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: و ئەو د گومبەتكەكێڤە بوو: **(ئەى خودا ئەز داخوازا پەيمانا تە و ژڤانا تە ژ تە دكەم، ئەى خودا ئەگەر تە بڤێت ژ ئەڤرۆ وێڤە ناهێيە پەرستن).** ئينا ئەبوبەكرى دەستێ وى گرت و گۆت: بەسى تەيە ئەى پێغەمبەرێ خودێ، تە درێژەدانا دوعايێ د گەل خودايێ خۆ كر، و كونزرییەك ل بەر بوو و ها تە دەر ڤە و گۆت ﴿سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾[1]، و د ڤەگێرەكێدا د گومبەتكەكێڤە بوو رۆژا بەدرێ.

---

(١) رامان ب كورتى: نێزيك نەدوير، ئەو كۆم دێ شكێت و دێ رەڤيت و ئەڤە رۆژا بەدرێ چێ بوو و ژڤانێ ئيزادانا وان پشتى بەدرێ رۆژا قيامەتێيە، و رۆژا قيامەتێ هێز مەزنتر و تەحلترە ژ ئيزايا دنيايێ.

٤ . باب: بدء المعركة بالمبارزة

## بابەتێ: دەستپێكرنا شەڕی ب بەرسینگگرتنا هەڤدو.

٣٦١٥ - (خ) عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ يَجْثُو بَيْنَ يَدَيِ الرَّحْمنِ لِلْخُصُومَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ قَيْسٌ: وَفِيهِمْ نَزَلَتْ: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمْ﴾ [الحج:١٩] قَالَ: هُمُ الَّذِينَ بَارَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ: عَلِيٌّ وَحَمْزَةُ وَعُبَيْدَةُ، وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَعُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ. [خ٤٧٤٤ (٣٩٦٥)].

**ژ قەیسێ كوڕێ عوبادەیی (رحمه الله) ژ عەلییێ كوڕێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) گۆت: رۆژا قیامەتێ ئەز یێ ئێكێمە بەرامبەر خودێ بۆ هەڤڕكییێ دكەڤم سەر چۆكان. قەیسی گۆت: و د راستا واندا ئەڤە هاتە خوارێ ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمْ﴾[1]، گۆت: و ئەو ئەون یێت بەرسینگگرتن رۆژا بەدرێ كرین عەلی و حەمزە و عوبەیدە و شەیبەیێ كوڕێ ڕەبیعەیی و عوتبەیێ كوڕێ ڕەبیعەیی و وەلیدێ كوڕێ عوتبەیی.**

٥ . باب: وصف عام للمعركة

## بابەتێ: ڕەوشا گشتی یا شەڕی.

٣٦١٦ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عباس قَالَ: حدثني عمر بن الخطاب قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ نَظَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ، وَأَصْحَابُهُ ثَلاَثُمِائَةٍ وَتِسْعَةَ عَشَرَ رَجُلاً. فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) الْقِبْلَةَ، ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ: **(اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي. اللَّهُمَّ آتِ مَا وَعَدْتَنِي. اللَّهُمَّ إِنْ تُهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةَ مِنْ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ تُعْبَدْ فِي الأَرْضِ)** فَمَا زَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ، مَادّاً يَدَيْهِ، مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ مَنْكِبَيْهِ.

فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ، وَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، كَذَاكَ مُنَاشَدَتَكَ رَبَّكَ، فَإِنَّهُ سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ. فَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ [الأنفال] فَأَمَدَّهُ اللهُ بِالْمَلاَئِكَةِ.

---

**(١) ئانكو: ئەڤە دو جوینێت هەڤڕكن، جوینا موسلمانان و جوینا گاوران د راستا خودایێ خۆدا ب هەڤڕك چۆینە.**

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ يَشْتَدُّ فِي أَثَرِ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ أَمَامَهُ، إِذْ سَمِعَ ضَرْبَةً بِالسَّوْطِ فَوْقَهُ، وَصَوْتَ الْفَارِسِ يَقُولُ: أَقْدِمْ حَيْزُومُ، فَنَظَرَ إِلَى الْمُشْرِكِ أَمَامَهُ فَخَرَّ مُسْتَلْقِياً، فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ خُطِمَ أَنْفُهُ، وَشُقَّ وَجْهُهُ كَضَرْبَةِ السَّوْطِ، فَاخْضَرَّ ذلِكَ أَجْمَعُ. فَجَاءَ الأَنْصَارِيُّ فَحَدَّثَ بِذَلِكَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ). فَقَالَ: (**صَدَقْتَ. ذلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ**) فَقَتَلُوا يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ، وَأَسَرُوا سَبْعِينَ.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَلَمَّا أَسَرُوا الأُسَارَى، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: (**مَا تَرَوْنَ فِي هَؤُلاَءِ الأُسَارَى**) ؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا نَبِيَّ اللهِ، هُمْ بَنُو الْعَمِّ وَالْعَشِيرَةِ، أَرَى أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُمْ فِدْيَةً، فَتَكُونَ لَنَا قُوَّةً عَلَى الْكُفَّارِ، فَعَسَى اللهُ أَنْ يَهْدِيَهُمْ لِلإِسْلاَمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا تَرَى يَا ابْنَ الْخَطَّابِ؟**) قُلْتُ: لاَ وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَرَى الَّذِي رَأَى أَبُو بَكْرٍ، وَلَكِنِّي أَرَى أَنْ تُمَكِّنَّا فَنَضْرِبَ أَعْنَاقَهُمْ، فَتُمَكِّنَ عَلِيّاً مِنْ عَقِيلٍ فَيَضْرِبَ عُنُقَهُ، وَتُمَكِّنِّي مِنْ فُلاَنٍ. نَسِيباً لِعُمَرَ. فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ، فَإِنَّ هَؤُلاَءِ أَئِمَّةُ الْكُفْرِ وَصَنَادِيدُهَا. فَهَوِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ، وَلَمْ يَهْوَ مَا قُلْتُ.

فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَبُو بَكْرٍ قَاعِدَيْنِ يَبْكِيَانِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَخْبِرْنِي مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَبْكِي أَنْتَ وَصَاحِبُكَ؟ فَإِنْ وَجَدْتُ بُكَاءً بَكَيْتُ، وَإِنْ لَمْ أَجِدْ بُكَاءً تَبَاكَيْتُ لِبُكَائِكُمَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَبْكِي لِلَّذِي عَرَضَ عَلَيَّ أَصْحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمُ الْفِدَاءَ، لَقَدْ عُرِضَ عَلَيَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هذِهِ الشَّجَرَةِ**). شَجَرَةٍ قَرِيبَةٍ مِنْ نَبِيِّ اللهِ (ﷺ). وَأَنْزَلَ اللهُ عزّ وجل: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِۚ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًاۚ﴾ [الأنفال:٦٧ - ٦٩] فَأَحَلَّ اللهُ الْغَنِيمَةَ لَهُمْ. [م١٧٦٣]

**ژ عەبدوللایێ کوڕێ عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەرێ کوڕێ خەتتابی بۆ من گۆت: دە مێ بوو یە رۆژا بەدرێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ دا هەڤپشکچێکەران و ئەو هزار بوون و هەڤالێت وی سێ سەد و نوازدە زەلام بوون، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) بەرێ خۆ دا قیبلەیێ و پاشی دەستێت خۆ بلند کرن و دەستهاڤێتێ هەواری خودایێ خۆ کر (ئەی خودا ئەوا تە ژڤان پێ دایە من ب جه بینە و ئەی خودا ئەوا تە ژڤان پێ دایە (کو سەرکەفتنە) بینە، ئەی خودا ئەگەر تو ڤێ کۆمێ ژ موسلمانان ژ ناڤ ببەی تو د عەرد یدا ناهێیە پەرستن) و بەردوام هەواری خودایێ خۆ د کر و**

دەستێت خۆ بلند دكرن و بەرێ وی ل قیبلەیێ بوو، هەتا عەبایێ وی ژ سەر ملێت وی كەفتی.

ئینا ئەبوبەكر هاتە دەڤ و عەبایێ وی راكر و دانا سەر ملێت وی پاشی ژ پشتڤە گرت و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دوعا و هەوارێت تە ژ خودایێ خۆ كرین بەسی تەنە، بێ گۆمان ژڤانا دایە تە دێ ب جھ ئینیت، ئینا خودایێ هەر ب هێز و مەزن ئینا خوارێ : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾[1]، خودێ ب ملیاكەتان پشتەڤانییا وی كر.

ئیبن عەبا سی گۆت: د وەختەكێدا د وێ رۆژێدا زەلا مەكی ژ مو سلمانان د دو یڤ هەڤپشكچێكەرەكێرا د كرە غار ل بەر سینگێ وی بوو، گوھ ل دەنەگێ دربەكی ل سەر هەڤپشك چێكەری بوو و دەنگێ سویاری د گۆت: پێ شكەڤە حەیزوم[2] و بەرێ خۆ دا هەڤپشكچێكەری ل بەر سینگێ خۆ پاتك و پاتك كەفت و بەرێ خۆ دایێ دیت دفنا وی یا نیشان بووی و روییێ وی شەق ببوو وەكی جھێ قامچیییێیە، ئەو جھ هەمی رەش و شین ببوون، ئەو زەلامێ ئەنساری هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ و ئەڤە بۆ ڤەگێرا، ئینا گۆت: (تو راست دبێژی ئەو هاریكاریا عەسمانێ سێیێ بوو) د وێ رۆژێدا حەفتێ كوشتن و حەفتێ ئێخسیر كرن.

ئیبن عەباسی گۆت: ڤێجا دەمێ ئێخسیر هاتینە ئێخسیركرن، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە ئەبوبەكری و عومەری: **(هوین چ د راستا ڤان ئێخسیراندا دبینن)؟** ئەبوبەكری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو پسمام و عەشیرەتا مەنە، ئەز دبینم تو خوینێ ژ وان وەرگری ئەو خوین دێ بۆ مە بیتە هێز ل سەر گاوران، و هیڤییە خودێ بەرێ وان بدەتە ئیسلامێ. ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەی كورێ خەتتابی تو چ دبینی)؟** من گۆت: نە ب خودێ كەمە ئەز وێ نابینم یا ئەبوبەكری دیتی، بەلێ ئەز دبینم تو رێكێ

---

(١) ئانكو: بیننە بیرا خۆ وەختێ د شەرێ بەدرێدا لاڤلاڤ و هەوار هەوارا هەوە: هەوە سەركەفتن و هاریكاری ژ خودایێ خۆ دخواست، ئینا بەرسڤا هەوە دا، ب راستی ئەز دێ ب هزار ملیاكەتێت ل دویف ئێك پشتەڤانییا هەوە كەم.

(٢) ئەو دەنگێ دربا ملیاكەتی بوو و حەیزووم ناڤێ هەسپێ ملیاكەتییە.

بدەيە مە ئەم ل ستۆيێ وان بدەين، رێكێ بدە عەلی د عەقيليدا ئەو ل ستۆيێ وی بدەت، و رێكێ بدە من د فلانیدا - خز مەكێ عو مەری بوو - ئەز ل ستۆيێ وی بدەم، ئەڤە سەرێت گاورا نە و گرە گر و خۆشمێر ێت وا نن، ئێ نا پێغەمبەرێ خودێ حەژ ئەوا ئەبوبەكری گۆتی كر و باش دانا و حەژ يا من گۆتی نەكر.

ڤێجا دە مێ بوو يە رۆژا پاشتر ئەز هاتم من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەبو بەكر ديتن د روينشتی بوون دكرنە گری، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ژ چ تو و هەڤالێ خۆ دكەنە گری؟ ئەگەر گر يا من بيذيت دێ گريم و ئەگەر گر يا من نەئينيت دێ بۆ گريانا هەوە كەمە گری، ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەز بۆ وێ دكەمە گری يا هەڤالێت من ل سەر من پێشنيار كری ژ وەرگرتنا خوينێ، ب راستی ئيزا يا وان بۆ من هاتە ديتن ژ ڤێ دارێ نێزيكتر)** دارەكا نێزيكی پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) و خودايێ هەر ب هێز و مەزن ئينا خوارێ ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ هەتا گۆتنا وی: ﴿فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلاً طَيِّباً﴾(١)، ئينا خودێ دەستكەفت بۆ وان حەلال و دورست كر.

٣٦١٧ – (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بُسَيْسَةَ عَيْناً يَنْظُرُ مَا صَنَعَتْ عِيرُ أَبِي سُفْيَانَ، فَجَاءَ وَمَا فِي الْبَيْتِ أَحَدٌ غَيْرِي وَغَيْرُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). قَالَ: لاَ أَدْرِي مَا اسْتَثْنَى بَعْضَ نِسَائِهِ. قَالَ: فَحَدَّثَهُ الْحَدِيثَ. قَالَ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَتَكَلَّمَ، فَقَالَ: **(إِنَّ لَنَا طَلِبَةً، فَمَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِراً فَلْيَرْكَبْ مَعَنَا)** فَجَعَلَ رِجَالٌ يَسْتَأْذِنُونَهُ فِي ظُهْرَانِهِمْ فِي عِلْوِ الْمَدِينَةِ. فَقَالَ: **(لاَ، إِلاَّ مَنْ كَانَ ظَهْرُهُ حَاضِراً)**.

---

(١) رامانا وان ئايەتان ب كورتی: بۆ چو پێغەمبەران دورست نينە ئێخسير هەبن [و بەدەلێ بەرانبەر وەرگرن]، هەتا كوشتنەكا زێدە د عەرديدا نەكەن [دا گاور رسوا ببن و پشتەڤانێت وان كێم ببن] و هەوە [ب وەرگرتنا بەدەلێ بەرانبەر ئازاكرنا وان]، پەرتال و متايێ دنيايێ دڤێت، و خودێ خێرا ئاخرەتێ بۆ هەوە دڤێت، و خودێ ب خۆ سەردەست و كاربنەجهە. و ئەگەر ژ بەر حوكمێ خودێ يێ بەری نوكە نەبايە [كو خودێ ژ بەر ئجتيهادا خەلەت كەسێ ئيزا نادەت]، دا ئيزايەكا مەزن ژ بەر بەدەلا هەوە وەرگرتی، هەوە هنگێڤيت. ڤێجا ژ وی مالێ ب دەست هەوە كەفتی [كو غەنيمەيە] بخۆن، حەلال و پاقژە، و [ژ نوكە وێڤە] ژ خودێ بترسن [و نەدەنە سەر وی تشتی يێ خودێ دەستويری پێ نەدايی] و خودێ گونەهـ ژێبەر و زێدە دلۆڤانە.

فَانْطَلَقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ، حَتَّى سَبَقُوا الْمُشْرِكِينَ إِلَى بَدْرٍ، وَجَاءَ الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ يُقَدِّمَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلَى شَيْءٍ حَتَّى أَكُونَ أَنَا دُونَهُ**) فَدَنَا الْمُشْرِكُونَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ**).

قَالَ: يَقُولُ عُمَيْرُ بْنُ الْحُمَامِ الأَنْصَارِيُّ: يَا رَسُولَ اللهِ، جَنَّةٌ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضُ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) قَالَ: بَخٍ بَخٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا يَحْمِلُكَ عَلَى قَوْلِكَ بَخٍ بَخٍ**) قَالَ: لاَ وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، إِلاَّ رَجَاءَةَ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِهَا، قَالَ: (**فَإِنَّكَ مِنْ أَهْلِهَا**). فَأَخْرَجَ تَمَرَاتٍ مِنْ قَرْنِهِ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ مِنْهُنَّ. ثُمَّ قَالَ: لَئِنْ أَنَا حَيِيتُ حَتَّى آكُلَ تَمَرَاتِي هَذِهِ، إِنَّهَا لَحَيَاةٌ طَوِيلَةٌ. قَالَ: فَرَمَى بِمَا كَانَ مَعَهُ مِنَ التَّمْرِ، ثُمَّ قَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ. [م١٩٠١].

**ژ ئەنەه سێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بوسەیـ سه زێرەڤان هنارت، زێرەڤانییا كاروانێ ئەبی سوفیانی بكەت، و هاتە دەڤ وی و كەس ل مالێ نەبوو ژ بلی من و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ـ گۆت: ئەز نوزانم هندە هەڤژینێت وی ڤەدەركرن یان نە[1] ـ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفت و ئاخفت و گۆت: (ب راستی مە داخوازەك یا هەی هەر كەسێ دەوارێ وی پێ ئامادە بیت بلا د گەل مە سویار ببیت)، هندە زەلامان دەستویری ژێ خوسات دەرفەت هەبیت بچن دەوارێت خۆ ژ سەرێ مەدینەیێ بینن دا د گەل وان بچن، ئینا گۆت: (نەخێر، تنێ ئەو یێت دەوارێت وان ئامادە).**

**و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤالێت خۆ چۆن هەتا بەری هەڤپشكچێكەران گەهشتینە جهێ بەدرێ، و پاشی هەڤپشكچێكەر هاتن، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (كەس ژ هەوە بەری من نەچیتە چو شۆلان حەتا ئەز بەری وی نەبم)، هەڤپشكچێكەر نێزیك بوون، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (رابنە بەحەشتەكێ بەرفرەهییا وێ بەرفرەهییا عەرد و عەسمانا نە)، گۆت: عومەیرێ كورێ حەمامێ ئەنسارى ( خەلكێ مەدینێ) (ﷺ) گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ: بەحەشتەكێ بەرفرەهییا وێ بەرفرەهییا عەرد و عەسمانان، گۆت: (بەلێ)، گۆت: وەی وەی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (چ وەل**

(١) ئانكو: دەمێ ب نهێنی د گەل ئاخفتی هەڤژینێت وی ئاگەه ژێ هەبوو یان جودا كرن.

**تە کر تو بێژی وەی وەی)، گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ ئومێدا هندێ ئەز خەلکێ وێ بم، گۆت: ( تو ژ خەلکێ وێ یی). هندە ڤەسپ ژ کاڤلانکەکێ خۆ یێ تیران دەرێخستن، و دەستهاڤێتێ خوارن، پاشی گۆت: هەکە ئەز مامە ساخ هەتا ئەز ڤان ڤەسپێت خۆ د خۆم، ئەڤ ژیانە چەندا درێژە، ڤەسپێت خۆ هاڤێتن و شەڕ کر هەتا هاتییە کوشتن.**

٦ . باب: شهود الملائكة معركة بدر

**بابەتێ: ئامادەبوونا ملیاکەتان ل شەڕێ بەدرێ.**

٣٦١٨ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ يَوْمَ بَدْرٍ: (**هَذَا جِبْرِيلُ، آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ، عَلَيْهِ أَدَاةُ الحَرْبِ**). [خ٣٩٩٥].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا بەدرێ گۆت: (ئەڤە جبریلە، سەرێ هەسپێ خۆ یێ گرتی و ئامویرێت شەڕی یێت ل سەر).**

٧ . باب: مقتل أَبي جهل

**بابەتێ: کوشتنا ئەبی جەهلی.**

٣٦١٩ - (ق) عَنْ عبدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: بَيْنَا أَنَا وَاقِفٌ فِي الصَّفِّ يَوْمَ بَدْرٍ، فَنَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي وَشِمَالِي، فَإِذَا أَنَا بِغُلَامَيْنِ مِنَ الأَنْصَارِ، حَدِيثَةٍ أَسْنَانُهُمَا، تَمَنَّيْتُ أَنْ أَكُونَ بَيْنَ أَضْلَعَ مِنْهمَا، فَغَمَزَنِي أَحَدُهُمَا فَقَالَ: يَا عَمِّ هَلْ تَعْرِفُ أَبَا جَهْلٍ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، مَا حَاجَتُكَ إِلَيْهِ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ يَسُبُّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَئِنْ رَأَيْتُهُ لاَ يُفَارِقُ سَوَادِي سَوَادَهُ حَتَّى يَمُوتَ الأَعْجَلُ مِنَّا، فَتَعَجَّبْتُ لِذلِكَ، فَغَمَزَنِي الآخَرُ، فَقَالَ لِي مِثْلَهَا.

فَلَمْ أَنْشَبْ أَنْ نَظَرْتُ إِلَى أَبِي جَهْلٍ يَجُولُ فِي النَّاسِ، قُلْتُ: أَلاَ، إِنَّ هَذَا صَاحِبُكُمَا الَّذِي سَأَلْتُمَانِي، فَابْتَدَرَاهُ بِسَيْفَيْهِمَا، فَضَرَبَاهُ حَتَّى قَتَلاَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَأَخْبَرَاهُ، فَقَالَ: (**أَيُّكُمَا قَتَلَهُ**) ؟ قَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا: أَنَا قَتَلْتُهُ، فَقَالَ: (**هَلْ مَسَحْتُمَا سَيْفَيْكُمَا**) ؟ قَالاَ: لاَ، فَنَظَرَ فِي السَّيْفَيْنِ، فَقَالَ: (**كِلاَكُمَا قَتَلَهُ، سَلَبُهُ لِمُعَاذِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الجَمُوحِ**). وَكَانَا مُعَاذَ بْنَ عَفْرَاءَ وَمُعَاذَ بْنَ عَمْرِو بْنِ الجَمُوحِ. [خ٣١٤١/ م١٧٥٢].

**ژ عەبدولرەحمانێ کوڕێ عەوفی (رضي الله عنه) ل رۆژا بەدرێ د دەمەکیدا ئەز ل رێزێ یێ راوەستای بووم، من بەرێ خۆ دا لایێ خۆ یێ راستێ و لایێ خۆ یێ چەپێ من دیت ئەز**

یێ د ناڤبەرا دو لاوێت ئەنسارانداهێژ گەنج بوون، من هیڤی خواست ئەز د ناڤبەرا هندەكێت ژ وان ب هێزتربامە، ئێكی ژ وان چاڤكرە من و گۆت: مام تو دزانی كیژكە ئەبو جەهل؟ من گۆت: بەلێ، تە چ هەوجەیی پێ هەیە؟ گۆت: یا گەهشتییە من ئەو خەبەرا دبێژیتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ئەگەر ئەز وی ببینم ئەز وی بەرنادەم و كەساتییا من كەساتییا وی ناهێلیت هەتا یێ ئەجەلا وی ژ من وی نێزیكتر نەمریت، ئەز ب ڤێ حێبەتی بووم، و یێ دووێ چاڤكرە من و وەكی وی گۆت.

ئەز هند نەمام، من بەرێ خۆدا ئەبو جەهل یێ د ناڤ خەلكیدا دئێت و د چیت، من گۆت: ئها ویهەیە هەڤالێ هەوە ئەوێ هەوە پرسیارا وی ژ من كری، ئینا هەردوكان لەز ب شیرێ خۆ كرن و چۆنێ و لێدان هەتا كوشتی، پاشی هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئینا گۆت: **(كێ ژ هەوە كوشتییە)؟** هەر ئێكی ژ وان گۆت: من یێ كوشتی، ئینا گۆت: **(هەوە شیرێت خۆ پاقژكرینە)؟** گۆتن: نەخێر، ئینا بەرێ خۆ دا هەردو شیران و گۆت: (هەوە هەردوكا یێ كوشتی و تشتێت وی بۆ مەعازێ كورێ عەمرێ كورێ جەموحینە) و ئەو هەردو لاوە موعازێ كورێ عەفرائێ بوو و موعازێ كورێ عەمرێ كورێ جەموحی بوو.

### ٨ . باب: وقوفه (ﷺ) على القليب

### بابەتێ: راوەستانا وی (ﷺ) ل سەر بیرێ.

٣٦٢٠ - (ق) عَنْ أَبِي طَلْحَةَ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) أَمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ بِأَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلاً مِنْ صَنَادِيدَ قُرَيْشٍ، فَقُذِفُوا فِي طَوِيٍّ مِنْ أَطْوَاءِ بَدْرٍ خَبِيثٍ مُخْبِثٍ. وَكَانَ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاَثَ لَيَالٍ، فَلَمَّا كَانَ بِبَدْرٍ الْيَوْمَ الثَّالِثَ أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا، ثُمَّ مَشَى، وَاتَّبَعَهُ أَصْحَابُهُ وَقَالُوا: ما نُرَى يَنْطَلِقُ إِلاَّ لِبَعْضِ حَاجَتِهِ، حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ، فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ بِأَسْمَائِهِمْ، وَأَسْمَاءِ آبَائِهِمْ: **(يَا فُلاَنُ ابْنَ فُلاَنٍ! وَيَا فُلاَنُ ابْنَ فُلاَنٍ! أَيَسُرُّكُمْ أَنَّكُمْ أَطَعْتُمُ اللهَ وَرَسُولَهُ، فَإِنَّا قَدْ وَجَدْنَا ما وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّاً، فَهَلْ وَجَدْتُمْ ما وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقّاً؟)**. قالَ: فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ما تُكَلِّمُ مِنْ أَجْسَادٍ لاَ أَرْوَاحَ لَهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ ما أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ)**. [خ٣٩٧٦ (٣٠٦٥)/ م٢٨٧٥].

ژ ئەبی تەلحەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا بەدرێ فەرمان د راستا بیست و چوار گرەگر و خۆشمێرێت قورەیشییان دا، هاتنە هاڤێتن د بیرەكێدا ژ بیرێت بەدرێ یا ئاڤ هەرمی و ئاڤێ دهەرمینیت، و پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ب سەر هندە كەسان سەركەفتبا سێ شەڤان ل مەیدانەكا دەشت دما، ڤێجا دەمێ بوویە رۆژا سێیێ ژ بەدرێ، فەرمان ب حێشترا خۆ كر و كورتانێ وێ لێهاتە شداندن، پاشی چۆ و هەڤالێت وی د دویڤ ویرا چۆن، و گۆتن: ئەم نابینین چۆ بیت بۆ هندە هەوجەیییا خۆ نەبیت، هەتا ل سەر رەخێ بیرێ راوەستای دەستهاڤێتێ ب ناڤێت وان و ب ناڤێت بابێت وان گازی وان كرن: (**ئەی فلانێ كورێ فلانی و ئەی فلانێ كورێ فلانی! ئەرێ هەوە پێ خۆش بوو هەوە گوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی كربایە، ب راستی ئەو ژڤانا خودایێ مە دایە مە راست و دورست دیت، ڤێجا ئەو ژڤانا خودایێ هەوە دایە هەوە، هەوە راست و دورست دیت**)، گۆت: ئینا عومەری گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو د گەل هندە لەشان د ئاخڤی جان تێدا نینە؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**ئەز ب وی كە مە پێ جانێ موحەممەدی د دەستیدا ئەوا ئەز دبێژم هوین باشتر ژ وان نابهیسن**).

٣٦٢١ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: إِنَّمَا قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّهُمْ لَيَعْلَمُونَ الآنَ أَنَّ ما كنْتُ أَقُولُ حَقٌّ**). وَقَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ [النمل:٨٠] .[خ١٣٧١/ م٩٣٢].

**ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: ئەوا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتی: (ب راستی ئەو ڤێ گاڤێ دزانن ئەوا من دگۆت راستە) و خودایێ هەر بلند گۆت: (إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ).**

٩ ـ باب: فداء الأَسرى

**بابەتێ: خوینا ئێخسیران.**

٣٦٢٢ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ رِجَالاً مِنَ الأَنْصَارِ، اسْتَأْذَنُوا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالُوا: ائْذَنْ لَنا فَلْنَتْرُكْ لاِبْنِ أُخْتِنَا عَبَّاسٍ فِدَاءَهُ، فَقَالَ: (**لاَ تَدَعُونَ مِنْهُ دِرْهَماً**). [خ٢٥٣٧].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: هندە زەلامان ژ ئەنساران دەستویری ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خواست و گۆتن: دەستویرییێ بدە مە ئەم خوینا خوارزایێ خۆ عەباسی بۆ بهێلین، ئینا گۆت: (هوین دەرهەمی ژێ بۆ ناهێلن).**

٣٦٢٣ - (خ) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ فِي أُسَارَى بَدْرٍ: (**لَوْ كَانَ الْمُطْعِمُ بْنُ عَدِيٍّ حَيّاً، ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هؤُلاَءِ النَّتْنى، لَتَرَكْتُهُمْ لَهُ**). [خ٣١٣٩].

**ژ جو بەیرێ كورێ موتعیمی (ڕەزیا خودێ لێ بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) د راستا ئێخسیرێت بەدرێدا گۆت: (ئەگەر موتعیمێ كورێ عودەیی یێ ساخبایە پاشی د راستا ڤان گەنییاندا د گەل من ئاخفتبایە دا وان بۆ وی هێلم).**

**١٠ ـ باب: عدد أهل بدر.**

**بابەتێ: هژمارا خەلكێ بەدرێ.**

٣٦٢٤ - (خ) عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ: اسْتُصْغِرْتُ أَنَا وَابْنُ عُمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ، وَكَانَ المهَاجِرُونَ يَوْمَ بَدْرٍ نَيِّفاً عَلَى سِتِّينَ، وَالأَنْصَارُ نَيِّفاً وَأَرْبَعِينَ وَمِائَتَيْنِ. [خ٣٩٥٦ (٣٩٥٥)].

**ژ بەرائی (ڕەزیا خودێ لێ بیت) گۆت: ئەز و ئیبن عومەر رۆژا بەدرێ بچویك هاتینە دانان[1] و مشەخت رۆژا بەدرێ شێست و تشتەك بوون و ئەنسار خەلكێ مەدینەیێ دوسەد و چل و تشتەك بوون.**

**١١ ـ باب: ظهور النفاق بإسلام ابن أُبَيّ**

**بابەتێ: ئاشكەرابوونا دوروویاتییێ ژ موسلمانبوونا كورێ ئوبەیی.**

٣٦٢٥ - (ق) عَنْ أُسَامَةَ بْن زَيْدٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ، عَلَى قَطِيفَةٍ فَدَكِيَّةٍ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَرَاءَهُ، يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي الحَارِثِ بْنِ الخَزْرَجِ، قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ. قَالَ: حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ، وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَإِذَا فِي الْمَجْلِسِ أَخْلاَطٌ مِنَ المسْلِمِينَ وَالمشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ، وَالْيَهُودِ وَالمسْلِمِينَ، وَفِي الْمَجْلِسِ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ.

فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ، خَمَّرَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيٍّ أَنْفَهُ بِرِدَائِهِ، ثُمَّ قَالَ: لاَ تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا، فَسَلَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَيْهِمْ ثُمَّ وَقَفَ، فَنَزَلَ فَدَعاهُمْ إِلَى اللهِ، وَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ: أَيُّهَا المرْءُ! إِنَّهُ لاَ أَحْسَنَ مِمَّا تَقُولُ إِنْ كَانَ حَقّاً، فَلاَ تُؤْذِنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا، ارْجِعْ إِلَى رَحْلِكَ، فَمَنْ جاءَكَ فَاقْصُصْ عَلَيْهِ.

---

(١) ئانكو: نەهێلان پشكدارییێ بكەین، چونكی ئەم بچویك دیتن.

فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ! فَاغْشَنَا بِهِ فِي مَجَالِسِنَا، فَإِنَّا نُحِبُّ ذلِكَ. فَاسْتَبَّ الْمُسْلِمُونَ وَالمُشْرِكُونَ وَالْيَهُودُ حَتَّى كادُوا يَتَثَاوَرُونَ، فَلَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ (ﷺ) يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَنُوا.

ثم رَكِبَ النَّبِيُّ (ﷺ) دابَّتَهُ، فَسَارَ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): (**يَا سَعْدُ أَلَمْ تَسْمَعْ ما قالَ أَبُو حُبَابٍ . يُرِيدُ عَبْدَ اللهِ بْنَ أُبَيٍّ . قالَ: كَذَا وَكَذَا**). قالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ، اعْفُ عَنْهُ، وَاصْفَحْ عَنْهُ، فَوَالَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ، لَقَدْ جاءَ اللهُ بِالْحَقِّ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ، لَقَدِ اصْطَلَحَ أَهْلُ هذِهِ الْبُحَيْرَةِ عَلَى أَنْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُوهُ بِالْعِصَابَةِ ، فَلَمَّا أَبَى اللهُ ذلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَ اللهُ شَرِقَ بِذلِكَ، فَذلِكَ فَعَلَ بِهِ ما رَأَيْتَ. فَعَفَا عَنْهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ).

وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ يَعْفُونَ عَنِ المُشْرِكِينَ وَأَهْلِ الْكِتَابِ كما أَمَرَهُمُ اللهُ، وَيَصْبِرُونَ عَلَى الأَذى، قالَ اللهُ عزّ وجل: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًاۚ﴾ الآيَةَ [آل عمران:١٨٦] ، وَقَالَ اللهُ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ [البقرة:١٠٩]

وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَتَأَوَّلُ الْعَفْوَ ما أَمَرَهُ اللهُ بِهِ، حَتَّى أَذِنَ اللهُ فِيهِمْ، فَلَمَّا غَزَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَدْراً، فَقَتَلَ اللهُ بِهِ صَنَادِيدَ كُفَّارِ قُرَيْشٍ، قالَ ابْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ المُشْرِكِينَ وَعَبَدَةِ الأَوْثَانِ: هَذَا أَمْرٌ قَدْ تَوَجَّهَ، فَبَايَعُوا الرَّسُولَ (ﷺ) عَلَى الإِسْلاَمِ فَأَسْلَمُوا. [خ٤٥٦٦ (٢٩٨٧)/ م١٧٩٨].

**ژ ئوسامەیێ كوڕێ زەیدی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل كەرەكی سویار بوو، مەرشكەكێ دوریاركری و ب رویشەلۆك یێ فەدەكی[1] ل سەر بوو، و ئوسامەیێ كوڕێ زەیدی ل پشت خۆ سویار كربوو، چۆ سەرا سەعدێ كوڕێ عوبادەیی بدەت، ل بنەمالا حارسێ كوڕێ خەزرەجی بەری شەڕێ بەدرێ. گۆت: د بەر دیوانەكێڕا بۆری عەبدوللایێ كوڕێ ئوبەیێ كوڕێ سەلوولی لێ بوو، و ئەڤە بەری عەبدوللایێ كوڕێ ئوبەیی موسلمان ببیت، ئەو دیوان یا تێكەل بوو ژ هەڤپشكچێكەر و بوتپەرستان، و جوهیان و موسلمانان و عەبدوللایێ كوڕێ رەواحەیی د دیوانێدا بوو.**

---

(١) فەدەك: جهەكە نێزیكی خەیبەرێیە و (١٤٠) كم ژ مەدینەیێ دویرە.

ڤێجا دەمێ تۆزا دەوارى ب سەر ديوانێدا چۆيى، عەبدوللایێ كوڕێ ئوبەى دفنا خۆ ب عەبايێ خۆ گرت، و پاشى گۆت: تۆزێ ب سەر مەدا نەبەردە، ئينا پێغەمبەرى (ﷺ) سلاڤ كرە وان، و پاشى راوەستا و هاتە خوارێ و گازيكرنە رێكا خودێ، و قورئان بۆ وان خواند، ئينا عەبدوللایێ كوڕێ ئوبەيێ كوڕێ سەلوولى گۆت: هۆ كابرا، چ تشت ژ وێ باشتر نينە ژ وێ يا تو دبێژى ئەگەر يا راست بيت، بەس ب ڤێ[1] ئەزيەتا مە د ديوانێت مەدا نەكە، بزڤرە جهێ تو لێ ل مالا خۆ هەر كەسێ ب دلێ خۆ هاتە دەڤ تە ب سەر ويدا بخوينە.

ئينا عەبدوللایێ كوڕێ رەواحەيى گۆت: بەلێ ئەى پێغەمبەرێ خودێ ب ڤێ قورئانێ وەرە ديوانێت مە، ب راستى ئەم حەژ وێ چەندێ دكەين، موسلمان و هەڤپشكچێكەر و جوهييان ئاخفتن گۆتنە ئێكدو هەتا نێزيك بوويى رابنە ئێكدو، بەردەوام پێغەمبەرى (ﷺ) ئەو ئينانە خوارێ هەتا بێ دەنگ بووين.

پاشى پێغەمبەر (ﷺ) ل دەوارێ خۆ سويار بوو و چۆ هەتا چۆيە دەڤ سەعدێ كوڕێ عوبادەى، ئينا پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: **(ئەى سەعد تە گوه لێ بوو بابێ حوبابى چ گۆت؟ - مەبەستا وى عەبدوللایێ كوڕێ ئوبەيە - ئەڤە و ئەڤە گۆت)** سەعدێ كوڕێ عوبادەى گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ ئازاكە و لێ ببۆرە، ئەز ب وى كەمەيێ قورئان بۆ تە ئينايە خوارێ، خودێ ئەو راستى هنارت ئەوا بۆ تە ئينايە خوارێ و خەلكێ ڤى باژێركى رێككەفتبوون ئەو شاشكا شاهاتييێ داننە سەر سەرێ وى، و دەمێ خودێ ئەڤە بۆ نەڤيايى ب وێ راستييا خودێ دايە تە، گەريا وى ب ڤێ هاتە گرتن و وێ وەلێ كر يا تە ديتى، ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) لێ بۆرى.

و پێغەمبەرێ خودێ و هەڤالێت وى ژ هەڤپشكچێكەر و خودان كتێبان د بۆرين هەروەكى خودايێ وان فەرمانا وان كرى و بێهنا خۆ ل سەر ئەزيەتا وان فرەهـ دكر، خودايێ هەر ب هێز و مەزن گۆت: ﴿وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ

---

(١) مەبەست ب خواندنا قورئانێ بۆ مە.

أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗا﴾[1]، و خودێ گۆت: ﴿وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِكُمۡ كُفَّارًا حَسَدٗا مِّنۡ عِندِ أَنفُسِهِم﴾ هەتا دویماهییا ئایەتێ[2].

و پێغەمبەرێ خودی (ﷺ) هندی خودێ فەرمان پێ دكر لێبۆرین پێش دئێخست هەتا خودێ دەستویرییا شەڕكرنێ د گەل وان دایی، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەزا بەدرێ كری و خودێ ب وی گرەگر و خۆشمێرێت گاورێت قورەیشییان كوشتین، كوڕێ ئو بەیێ كوڕێ سەلوولی و هەڤپشكچێكەرێت د گەل و بوتپەرستان گۆتن: ئەڤە كارەكە روییێ راست لێ ئاشكرا بوو و بەیعەت ل ئیسلامێ دانە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و موسلمان بوون.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

---

(١) رامان ب كورتی: هوین دێ گەلەك ئیزا و نەخۆشییێ ژ وان بینن یێت بەری هەوە كتێب بۆ هاتین و ژ وان یێت هەڤال و هۆگر بۆ خودێ چێكرین.

(٢) رامانا ئایەتێ ب كورتی: گەلەك ژ خودان كتێبان [جوهی و فەلەیان] ژ زكرەشی پێ خۆشە [و دخوازن] پشتی باوەرییئینان و موسلمانبوونا هەوە، و پشتی هەقی و راستی بۆ وان [ب خۆ ژی] دیار و ئاشكەرا بوویی، هەوە ڤەگەڕیننەڤە سەر گاورییێ، ڤێجا هوین ل وان ببۆرن و چاڤێت خۆ ژ وان بگرن، هەتا خودێ فەرمانا خۆ [ب جیهادێ] دهنێریت. [ب راستی] خودێ ل سەر هەمی تشتان شیاندار و دەستهەلاتدارە.

الفصل الخامس: غزوة أحد وما بعدها

## پشكا پێنجێ: خەزايا ئوحودێ و يا پشتى وێ.

### ١ . باب: الشورى ورجوع المنافقين

### بابەتێ: مشێورەت و زڤرينا دوروييان.

٣٦٢٦ - (ق) عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رضي الله عنه قالَ: لَمَا خَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَى أُحُدٍ، رَجَعَ نَاسٌ مِمَّنْ خَرَجَ مَعَهُ، وَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (ﷺ) فِرْقَتَيْنِ: فِرْقَةٌ تَقُولُ: نُقَاتِلُهُمْ، وَفِرْقَةٌ تَقُولُ: لاَ نُقَاتِلُهُمْ، فَنَزَلَتْ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓا۟﴾[النساء:٨٨] وَقَالَ: (**إِنَّهَا طَيْبَةُ، تَنْفِي الذُّنُوبَ، كما تَنْفِي النَّارُ خَبَثَ الْفِضَّةِ**). [خ٤٠٥٠ (١٨٨٤)/ م٢٧٧٦]

**ژ زەيدێ كورێ سابتى (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفتىيە ئوحودێ هندەك ژ وى خەلكێ د گەل دەركەفتين ز ڤرين[1] و هەڤاليێت پێغەمبەرى (ﷺ) د راستا واندا بوونە دو جوين، جوينەكى دگۆت: دێ شەڕێ وان كەين، و جوينەكى د گۆت: ئەم شەڕێ وان ناكەين، ئينا ئەڤە هاتە خوارێ ﴿فَمَا لَكُمْ فِي ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓا۟﴾[2]، و پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (ئەڤە مەدينەيە[3] گونەهان ژێ د بەت هەروەكى ئاگر ڤرێژا زيڤى دبەت)[4].**

٣٦٢٧ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَخَذَ سَيْفاً يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: (**مَنْ يَأْخُذُ مِنِّي هَذَا**) ؟ فَبَسَطُوا أَيْدِيَهُمْ، كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ يَقُولُ: أَنَا، أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ يَأْخُذُهُ بِحَقِّهِ**) ؟ قَالَ: فَأَحْجَمَ الْقَوْمُ، فَقَالَ سِمَاكُ بْنُ خَرَشَةَ، أَبُو دُجَانَةَ: أَنَا آخُذُهُ بِحَقِّهِ. قَالَ: فَأَخَذَهُ فَفَلَقَ بِهِ هَامَ الْمُشْرِكِينَ. [م٢٤٧٠].

**ژ ئەنەسى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژا ئوحودێ شيرەك هەلگرت، ئينا گۆت: (كى دێ ڤى ژ من وەرگريت)، ئينا دەستێت خۆ درێژ كرن هەر مرۆڤەكى ژ وان**

---

(١) ئەو ژى دوروى بوون عەبدوللايێ كورێ ئوبەيێ كورێ سەلوولى و هەڤاليێت وى.

(٢) رامان ب كورتى: هەوە خێرە هوين هۆ د راستا دوروييان‌دا بووينە دو جوين؟ و خودێ ئەو ژ بەر كار و كرياريێت كرين ڤەگەڕاندنەڤە [گاوريێ].

(٣) تيبە، ناڤەكە ژ ناڤێت مەدينەيێ بازێرێ پێغەمبەرى (ﷺ).

(٤) ئانكو: مەدينە گونەهكار و خرابكاران ئاشكەرا دكەت و وان ژ باوەرداران جودا دكەت دا زەلال بمينن هەروەكى ئاگر زيڤى زەلال دهێليت.

**دگۆت: ئەز، ئەز. گۆت: (كی دێ ب مافێ وی وەرگریت)، وان خۆ قەكێشا، ئینا سیماكێ كورێ خەرەشەیی، ئەبو دوجانەیی گۆت: ئەز دێ ب مافێ وی وەرگرم، گۆت: وی وەرگرت و سەرێ گاوران پێ كرنە دو فلق.**

## ٢ . باب: وصف المعركة

## بابەتێ: سالۆخەتكرنا شەڕی.

٣٦٢٨ - (خ) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عازِبٍ رضي الله عنهما قالَ: جَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى الرَّجَّالَةِ يَوْمَ أُحُدٍ. وَكَانُوا خَمْسِينَ رَجُلاً. عَبْدَ اللهِ بْنَ جُبَيْرٍ فَقَالَ: (**إِنْ رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ، فَلاَ تَبْرَحُوا مَكَانَكُمْ هَذَا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ، وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا القَوْمَ وَأَوْطَأْنَاهُمْ، فَلاَ تَبْرَحُوا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ**). فَهَزَمُوهُمْ، قَالَ: فَأَنَا وَاللهِ رَأَيْتُ النِّسَاءَ يَشْتَدِدْنَ، قَدْ بَدَتْ خَلاَخِلُهُنَّ وَأَسْوُقُهُنَّ، رَافِعَاتٍ ثِيَابَهُنَّ.

فَقَالَ أَصْحَابُ عَبْدِ اللهِ بْنِ جُبَيْرٍ: الْغَنِيمَةَ أَيْ قَوْمِ الْغَنِيمَةَ، ظَهَرَ أَصْحَابُكُمْ فَمَا تَنْتَظِرُونَ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ جُبَيْرٍ: أَنَسِيتُمْ ما قالَ لَكُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)؟ قالُوا: وَاللهِ! لَنَأْتِيَنَّ النَّاسَ فَلَنُصِيبَنَّ مِنَ الْغَنِيمَةِ. فَلَمَّا أَتَوْهُمْ صُرِفَتْ وُجُوهُهُمْ فَأَقْبَلُوا مُنْهَزِمِينَ، فَذَاكَ إِذْ يَدْعُوهُمُ الرَّسُولُ فِي أُخْرَاهُمْ، فَلَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) غَيْرُ اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلاً، فَأَصَابُوا مِنَّا سَبْعِينَ، وَكَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ أَصَابَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يَوْمَ بَدْرٍ أَرْبَعِينَ وَمِائَةً، سَبْعِينَ أَسِيراً وَسَبْعِينَ قَتِيلاً.

فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: أَفِي الْقَوْمِ مُحَمَّدٌ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ يُجِيبُوهُ، ثُمَّ قَالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ الخَطَّابِ؟ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَمَّا هَؤُلاَءِ فَقَدْ قُتِلُوا.

فَمَا مَلَكَ عُمَرُ نَفْسَهُ، فَقَالَ: كَذَبْتَ وَاللهِ يَا عَدُوَّ اللهِ! إِنَّ الَّذِينَ عَدَدْتَ لأَحْيَاءٌ كُلُّهُمْ، وَقَدْ بَقِيَ لَكَ ما يَسُوؤُكَ. قالَ: يَوْمٌ بِيَوْمِ بَدْرٍ، وَالحَرْبُ سِجَالٌ، إِنَّكُمْ سَتَجِدُونَ فِي الْقَوْمِ مُثْلَةً، لَمْ آمُرْ بِهَا وَلَمْ تَسُؤْنِي. ثُمَّ أَخَذَ يَرْتَجِزُ: أُعْلُ هُبَلْ، أُعْلُ هُبَلْ، قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَلاَ تُجِيبُونَهُ**) ؟ قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ ما نَقُولُ؟ قالَ: (**قُولُوا: اللهُ أَعْلَى وأَجَلُّ**). قَالَ: إِنَّ لَنَا الْعُزَّى وَلاَ عُزَّى لَكُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**أَلاَ تُجِيبُونَهُ**) ؟ قالَ: قالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ ما نَقُولُ؟ قَالَ: (**قُولُوا: اللهُ مَوْلاَنا وَلاَ مَوْلَى لَكُمْ**).[خ٣٠٣٩].

- وفي رواية: جَعَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى الرُّمَاةِ يَوْمَ أُحُدٍ عَبْدَ اللهِ بْنَ جُبَيْرٍ... [خ٣٩٨٦].

**ژ بەرائێ كورێ عازبی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: رۆژا ئو حودێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عەبدوللایێ كورێ جو بەیری دا نا سەر وان ئەوێت پەیادە، و هەژمارا وان**

پێنجی زەلام بوون، و گۆت: **(ئەگەر هەوە ئەم دیتین بالندە یێ خۆ ل مە ددەن و مە ب لەز دبەن[1] هوین جهێ خۆ بەرنەدەن، هەتا ئەز فرێدكەمە دویڤ هەوەرا، و ئەگەر هەوە دیت مە ئەو شكاندن و ئەم ب سەر واندا چۆین جهێ خۆ بەرنەدەن هەتا ئەز فرێدكەمە دویڤ هەوەرا)** موسلمانان ئەو شكاندن، گۆت: ئەز ب خودێ كەمە من ژن دیتن دكرنە غار و ب لەز دچۆن و خلخالێت وان و باقێت وان دركەفتبوون و جلكێت خۆ بلند كربوون.

ئینا هەڤالێت عەبدوللایێ كورێ جوبەیری گۆتن: دەستكەفت ئەی برا یان دەستكەفت، هەڤالێت هەوە سەركەفتن هوین خۆ ل هیڤیا چ دگرن؟ ئینا عەبدوللایێ كورێ جوبەیری گۆت: ما هەوە ژبیر كر كا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چ گۆتییە هەوە؟ گۆتن: ب خودێ ئەم دێ چینە وی خەلكی و گەهینە پشكا خۆ یا دەستكەفتی، ڤێجا دەمێ ئەو هاتینە دەڤ روییێت وان هاتنە وەرگێران[2] و حێبەتی بوون و نەزانین كا دێ بەرێ خۆ دەنە كیرێ، هاتن و شكەستن، ئەڤە رویدا، و دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) گازی دكەتە كۆمێت وان یێت ڤەمایی بزڤرن و خۆ بدەنە د گەل من و كەس د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەما دوازدە زەلام نەبن، و وان حەفتێ ژ مە شەهید كرن و پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤالێت وی سەد و چل ژ هەڤپشكچێكەران هنگافتبوون، حەفتێ كوشتی و حەفتێ ئێخسیر.

ئینا ئەبو سوفیانی گۆت: ئەرێ موحەممەد د ناڤ هەوەدا مایە؟ سێ جاران ئەڤە گۆت، پێغەمبەری (ﷺ) ئەو پاشڤە لێدان ئەو بەرسڤا وی بدەن، پاشی گۆت: ئەرێ ئیبن ئەبی قوحافە د ناڤ هەوەدا مایە؟ سێ جاران ئەڤە گۆت، پاشی گۆت: ئەرێ كورێ خەتتابی د ناڤ هەوەدا مایە؟ سێ جاران ئەڤە گۆت، پاشی زڤری هەڤالێت خۆ و گۆت: هندیكە ئەڤەنە یێت هاتینە كوشتن.

عومەر نەشیا خۆ ئینا گۆت: ئەز ب خودێ كەمە، تە درەو كر، ئەی دژمنێ خودێ، ئەوێت تە هەژمارتین و ناڤێت وان ئینایین هەمی ساخن، و بێ گۆمان ئەو بۆ تە یێت ماین تە بئێشینن. ئەبو سوفیانی گۆت: ئەڤرۆ ب رۆژا بەدرێیە، و شەر د ناڤبەرا مەدا رۆژەك بەرامبەری رۆژەكێیە و ب راستی هوین دێ د ناڤ كوشتییاندا هندە كەسان بینن

---

(١) ئانكو: ئەم شكەستین.

(٢) ژ بەر نەگوهدارییا وان و دەركەفتنا وان ژ فەرمانا پێغەمبەری.

**هاتینە كرێتكرن[1]، من فەرمان پێ نەكرییە، و ئەز پێ نەخۆش نەبوو یمە ژی، پا شی ب شێوێ هۆزانێ ئاخفت: هوبەلی بلند بكەن و هوبەلی بلند بكەن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هوین بەرسڤا وی نادەن)؟ گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چ بێژین؟ گۆت: (بێژن: خودێ بلندتر و مەزنترە) ئەبو سوفیانی گۆت: ب راستی مە عیززا یێ هەی و هەوە عیززا نینە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هوین بەرسڤا وی نادەن)؟ گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ چ بێژین؟ گۆت: (بێژن: خودێ هاریكارێ مەیە و هەوە هاریكار نینە).**

**و د ڤەگێرەكێدا: پێغەمبەری (ﷺ) عەبدوللایێ كورێ جوبەیری ل سەر تیرڤانان دانا.**

٣٦٢٩ – (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: غابَ عَمِّي أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ عَنْ قِتَالِ بَدْرٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، غِبْتُ عَنْ أَوَّلِ قِتَالٍ قاتَلْتَ المشْرِكِينَ، لَئِنِ اللهُ أَشْهَدَنِي قِتَالَ المشْرِكِينَ لَيَرَيَنَّ اللهُ ما أَصْنَعُ. فَلَمَّا كانَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَانْكَشَفَ المسْلِمُونَ، قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هؤُلاءِ - يَعْنِي: أَصْحَابَهُ -، وَأَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هؤُلاَءِ - يَعْنِي: المشْرِكِينَ -.

ثُمَّ تَقَدَّمَ فَاسْتَقْبَلَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ: يَا سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ الْجَنَّةَ وَرَبِّ النَّضْرِ! إِنِّي أَجِدُ رِيحَهَا مِنْ دُونِ أُحُدٍ، قالَ سَعْدٌ: فَمَا اسْتَطَعْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ما صَنَعَ. قالَ أَنَسٌ: فَوَجَدْنَا بِهِ بِضْعاً وَثَمَانِينَ: ضَرْبَةً بِالسَّيْفِ أَوْ طَعْنَةً بِرُمْحٍ أَوْ رَمْيَةً بِسَهْمٍ، وَوَجَدْنَاهُ قَدْ قُتِلَ وَقَدْ مَثَّلَ بِهِ المشْرِكُونَ، فَمَا عَرَفَهُ أَحَدٌ إِلاَّ أُخْتُهُ بِبَنَانِهِ.

قالَ أَنَسٌ: كُنَّا نَرَى - أَوْ نَظُنُّ - أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَشْبَاهِهِ: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾إِلَى آخِرِ الآيَةِ [الأحزاب:٢٣] [خ٢٨٠٥/ م١٩٠٣].

**ژ ئەنەسی (ﷺ)، گۆت: مامێ من ئەنەسێ كورێ نەزری (ﷺ)، شەرێ بەدرێ نەهاتبوو، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز شەرێ ئێكێ یێ تە د گەل هەڤپشكچێكەران كری نەهاتبووم، و هەكە خودێ شەرێ هەڤپشكچێكەران ب رزقێ من كر، دێ خودێ بینیت كا ئەز دێ چ كەم، ڤێجا دەمێ بوویە رۆژا ئوحودێ، موسلمان پاشڤە چۆن و شكەستن، گۆت: یا خودێ ئەز داخوازا لێبۆرینێ ژ تە دكەم ژ ڤێ یا ڤان كری مەخسەد پێ هەڤالێت وینە، و ئەز یێ بەریمە ژ ڤێ یا ڤان كری مەخسەد پێ هەڤپشكچێكەرن، پاشی**

---

(١) زكێ وان هاتییە دڕاندن یان دفنا وان هاتییە ژێڤەكرن یان گوهێت وان هاتینە برین.

**پێشڤە چۆ، سەعدێ كوڕێ مەعازی كەفتە بەرسینگێ وی، گۆت: یا سەعدێ كوڕێ مەعازی ئەڤە بەحەشتە ئەز ب خودایێ كەعبێ كەمە، ب راستی بێهنا بەحەشتێ ل ئوحودێ یا دهێتە من. سەعدی گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ ئەز نەشیام وێ بكەم یا وی كری، ئەنەسی گۆت: مە هەشتێ و تشتەك برین لێ دیتن ب دربێت شیری، یان ب لێدانا رومێ یان ب هاڤێتنا تیرێ، و مە دیت یێ هاتییە كوشتن و هەڤپشكچێكەران تەرمێ وی زێدە كرێت كربوو، (ئانكو: ئەندامێت لەشێ وی گوهۆری بوون و ژێڤە كربوون) كەسەكێ نەنیاسی خویشكا وی نەبیت ب سەرێ تلێت وی نیاسی.**

**ئەنەسی گۆت: مە ددیت یان مە هزر دكر ئەڤ ئایەتە د راستا وی و یێت وەكی ویدا یا هاتییە خوارێ ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجالٌ صدقُوا ما عَاهَدُوا اللَّه علَيهِ﴾ و هەتا دویماهییا ئایەتێ. د ناڤ خودان باوەراندا هندەك زەلام یێت هەین ئەو پەیمانا وان د گەل خودێ دایی، ب جه ئینا.**

٣٦٣٠ – (ق) وَعَنْهُ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا كانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْهَزَمَ النَّاسُ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَأَبُو طَلْحَةَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ (ﷺ) مُجَوِّبٌ عَلَيْهِ بِحَجَفَةٍ لَهُ، وَكانَ أَبُو طَلْحَةَ رَجُلاً رَامِياً شَدِيدَ النَّزْعِ، كَسَرَ يَوْمَئِذٍ قَوْسَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، وَكَانَ الرَّجُلُ يَمُرُّ مَعَهُ بِجَعْبَةٍ مِنَ النَّبْلِ، فَيَقُولُ: (**انْثُرْهَا لأَبِي طَلْحَةَ**).

قالَ: وَيُشْرِفُ النَّبِيُّ (ﷺ) يَنْظُرُ إِلَى الْقَوْمِ، فَيَقُولُ أَبُو طَلْحَةَ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي! لاَ تُشْرِفْ، يُصِبْكَ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ الْقَوْمِ، نَحْرِي دُونَ نَحْرِكَ. وَلَقَدْ رَأَيْتُ عائِشَةَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ وَأُمَّ سُلَيْمٍ، وَإِنَّهُمَا لَمُشَمِّرَتَانِ، أَرَى خَدَمَ سُوقِهِمَا، تَنْقُزَانِ الْقِرَبَ عَلَى مُتُونِهِمَا، تُفْرِغَانِهِ فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ، ثُمَّ تَرْجِعَانِ فَتَمْلآنِهَا، ثُمَّ تَجِيئَانِ فَتُفْرِغانِهِ فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ، وَلَقَدْ وَقَعَ السَّيْفُ مِنْ يَدِ أَبِي طَلْحَةَ، إِمَّا مَرَّتَيْنِ وَإِمَّا ثَلاَثاً. [خ٤٠٦٤ (٢٨٨٠)/ م١٨١١].

**و ژ وی (رضي الله عنه): دە مێ بوو یە شەرێ ئو حودێ خەلكی پێغەمبەر (ﷺ) هێلان و رەڤین، و ئەبو تەلحە ل بەر سینگێ وی بوو و مەتا لەكێ كەڤلی دا بوو بەر پێغەمبەری (ﷺ). و ئەبو تەلحە زەلامەكێ تیرهاڤێژ بوو و ب هێز ب كار دئینا، وێ رۆژێ دو كەڤان یان سێ شكاندن، و ئەگەر زەلام د بەرڕا بۆرِیبا و تیردانكێ تیران د گەل با د گۆت: (دەربێخە و دانە بەردەستێ ئەبو تەلحەی).**

**گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خۆ ئاشكرا دكر بەرێ خۆ ددا وان، و ئەبو تەلحەی دگۆت: بابێ من و دایكا من گۆری تە بن، خۆ ئاشكەرا نەكە، دێ تیرەك ژ تیرەكا وان ژ تە**

گریت، گەردەنا من پێشی گەردەنا تەیە سینگێ من بۆ خۆ بکە مەتال. و من عائیشایا کچا ئەبوبەکری و ئوم سەلیم دیتن جلکێت خۆ هە لدابوون و من خلخالێت پێت وان دد یتن لەز د کرن و مە شکێت ئاڤێ ل پشتا خۆ هە لدگرتن و ب دە ڤێ خەلکیدا د کرن، پا شی دزڤرین و تژی دکرنەڤە، پاشی دهاتنەڤە و ب دەڤێ خەلکیدا دکرن، و شیر دو جاران یان سێ جاران ژ دەستێ ئەبی تەلحەی کەفت.

٣ . باب: ما أصاب النبي (ﷺ) من الجراح

**بابەتێ: ئەوا گەهشتییە پێغەمبەری (ﷺ) ژ برینان.**

٣٦٣١ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلَى قَوْمٍ فَعَلُوا بِنَبِيِّهِ ـ يُشِيرُ إِلَى رَبَاعِيَتِهِ ـ، اشْتَدَّ غَضَبُ اللهِ عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي سَبِيلِ اللهِ**). [خ٤٠٧٣/ م١٧٩٣].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(تۆڕەبوونا خودێ ل سەر هندە کەسان زێدە بوو، ئەڤە ب سەرێ پێغەمبەرێ خۆ ئینایی ـ نیشان کرە ددانێت خۆ یێت بەرێ دەڤێ خۆ ـ ، تۆڕەبوونا خودێ ل سەر مرۆ ڤەکی زێدە بوو پێغەمبەرێ خودێ وی د رێیا خودێدا بکوژیت).**

٣٦٣٢ - (ق) عَنْ سَهْلٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ جُرْحِ النَّبِيِّ (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: جُرِحَ وَجْهُ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ، وَهُشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِهِ، فَكَانَتْ فاطِمَةُ عليها السلام تَغْسِلُ الدَّمَ، وَعَلِيٌّ يُمْسِكُ، فَلَمَّا رَأَتْ أَنَّ الدَّمَ لاَ يَزِيدُ إِلاَّ كَثْرَةً، أَخَذَتْ حَصِيراً فَأَحْرَقَتْهُ حَتَّى صَارَ رَمَاداً، ثُمَّ أَلْزَقَتْهُ، فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ. [خ٢٩١١ (٢٤٣)/ م١٧٩٠].

ژ سەهلی (رضي الله عنه) پرسیار ل سەر برینا پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا ئوحودێ ژێ هاتە کرن، گۆت: ناڤ چاڤێت پێغەمبەری (ﷺ) بریندار بوون و ددانێت وی یێت پێشییێ شکەستبوون و کونزرییێ ل سەر سەری هاتبوو هەرشاندن، و فاتمایێ سلاڤ ل سەر بن خوین ژێ دشویشت و عەلی دەستێ خۆ دانابوو سەر برینێ، ڤێجا دەمێ دیتی خوین هەر یا زێدە دبیت، حێسیلکەك هەلگرت و سۆت هەتا بوویە خۆلی، پاشی ئەو خۆلییە دانا سەر برینێ ئینا خوین راوەستا.

## ٤ . باب: مقتل حمزة رضي الله عنه

## بابەتێ: كوشتنا حەمزەی (رضي الله عنه).

٣٦٣٣ - (خ) عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ قالَ: قَالَ وَحْشِي: إِنَّ حَمْزَةَ قَتَلَ طُعَيْمَةَ بْنَ عَدِيِّ بْنِ الْخِيَارِ بِبَدْرٍ، فَقَالَ لِي مَوْلَايَ جُبَيْرُ بْنُ مُطْعِمٍ: إِنْ قَتَلْتَ حَمْزَةَ بِعَمِّي فَأَنْتَ حُرٌّ، قالَ: فَلَمَّا أَنْ خَرَجَ النَّاسُ عامَ عَيْنَيْنِ وَعَيْنَيْنِ جَبَلٌ بِحِيَالِ أُحُدٍ، بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ وَادٍ. خَرَجْتُ مَعَ النَّاسِ إِلَى الْقِتَالِ، فَلَمَّا أَنِ اصْطَفُّوا لِلْقِتَالِ، خَرَجَ سِبَاعٌ فَقَالَ: هَلْ مِنْ مُبَارِزٍ؟ قالَ: فَخَرَجَ إِلَيْهِ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمطَّلِبِ، فَقَالَ: يَا سِبَاعُ! يَا ابْنَ أُمِّ أَنْمَارٍ مُقَطِّعَةِ الْبُظُورِ، أَتُحَادُّ اللهَ وَرَسُولَهُ (ﷺ)؟ قَالَ: ثُمَّ شَدَّ عَلَيْهِ، فَكَانَ كَأَمْسِ الذَّاهِبِ، قَالَ: وَكَمَنْتُ لِحَمْزَةَ تَحْتَ صَخْرَةٍ، فَلَمَّا دَنَا مِنِّي رَمَيْتُهُ بِحَرْبَتِي، فَأَضَعُهَا فِي ثُنَّتِهِ حَتَّى خَرَجَتْ مِنْ بَيْنِ وَرِكَيْهِ، قالَ: فَكَانَ ذَاكَ الْعَهْدَ بِهِ. فَلَمَّا رَجَعَ النَّاسُ رَجَعْتُ مَعَهُمْ، فَأَقَمْتُ بِمَكَّةَ حَتَّى فَشَا فِيهَا الإِسْلَامُ، ثُمَّ خَرَجْتُ إِلَى الطَّائِفِ، فَأَرْسَلُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) رَسُولاً، فَقِيلَ لِي: إِنَّهُ لاَ يَهِيجُ الرُّسُلَ، قالَ: فَخَرَجْتُ مَعَهُمْ حَتَّى قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا رَآنِي قالَ: (**آنْتَ وَحْشِيٌّ**) ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قالَ: (**أَنْتَ قَتَلْتَ حَمْزَةَ**) ؟ قُلْتُ: قَدْ كانَ مِنَ الأَمْرِ ما بَلَغَكَ، قالَ: (**فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُغَيِّبَ وَجْهَكَ عَنِّي**)؟ قالَ: فَخَرَجْتُ.

فَلَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَخَرَجَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ، قُلْتُ: لأَخْرُجَنَّ إِلَى مُسَيْلِمَةَ، لَعَلِّي أَقْتُلُهُ فَأُكَافِئَ بِهِ حَمْزَةَ، قالَ: فَخَرَجْتُ مَعَ النَّاسِ، فَكَانَ مِنْ أَمْرِهِ ما كانَ، قالَ: فَإِذَا رَجُلٌ قَائِمٌ فِي ثَلْمَةِ جِدَارٍ، كَأَنَّهُ جَمَلٌ أَوْرَقُ، ثَائِرُ الرَّأْسِ، قالَ: فَرَمَيْتُهُ بِحَرْبَتِي، فَأَضَعُهَا بَيْنَ ثَدْيَيْهِ حَتَّى خَرَجَتْ مِنْ بَيْنِ كَتِفَيْهِ، قالَ: وَوَثَبَ إِلَيْهِ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَضَرَبَهُ بِالسَّيْفِ عَلَى هَامَتِهِ. [خ٤٠٧٢].

**ژ جەعفەرێ كورێ عەمرێ كورێ ئومەییە یێ زومەری (رضي الله عنه) گۆت: وەحشی گۆت: حەمزەی توعەیمەیێ كورێ عەدییێ كورێ خیياری رۆژا بەدرێ كوشت، ئینا خودانێ من جوبەیرێ كورێ موتعمی گۆت: ئەگەر تە حەمزە ب مامێ كوشت تو یێ ئازایی، ڤێجا دەمێ خەلك سالا عەنینییێ دەركەفتین ـ عەنین چیایەكە ل راستا ئوحودێ و د ناڤەرا وی و ئوحودێدا نهالەكە ـ ئەز د گەل خەلكی دەركەفتمە شەڕی، ڤێجا دەمێ خەلك بۆ شەڕی ریز بووین، سیباع دەركەفت و گۆت: ئێك هەیە بەرسینگێ من بگریت، گۆت حەمزەیێ كورێ عەبدولموتەلبی گۆت: ئەی سیباع یا كورێ دایكا ئەنمارێ ژێڤەكەرا زێدە**

یا ژنان[1] ئەرێ تو دژمنیا خودێ و پێغەمبەرێ وی دکەی؟ پاشی هێرش کرێ وەکی دوهییا چۆیی نەما[2]، گۆت: و من خۆ بۆ حەمزەی ل بن بەرەکی ڤەنویسا، ڤێجا دەمێ نێزیکی من بووی من روما خۆ هاڤێتێ من ل بن ناڤکا وی دا هەتا د ناڤبەرا هەردو قۆڤلکێت را نێ وی دەرکەفتی، گۆت: ئەڤە ئەگەرێ مرنا وی بوو، ڤێجا دەمێ خەلك هاتینەڤە ئەز د گەل وان زڤریم، و ئەز ل مەکەهێ مام هەتا موسلمانەتی لێ بەلاڤ بووی، پاشی ئەز چۆمە تائیفێ، ئینا وان هنارتییەك هنارتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتنە من: پێغەمبەر هنارتییان ئەزیەت نادەت، گۆت: ئەز د گەل وان دەرکەفتم هەتا ئەز هاتیمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ڤێجا دەمێ ئەز دیتیم: گۆت: **(تو وەحشی)؟** من گۆت: بەلێ، گۆت: **(تە حەمزە کوشتییە)؟** من گۆت: ئەو کار وەسایە وەکی گەهشتییە تە[3]، گۆت: **(ئەرێ تو دشێی ناڤچاڤێت خۆ ل من بەرزە بکەی)؟** گۆت: ئەز دەرکەفتم.

ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر کری موسەیلەمەیێ درەوین دەرکەفت، من گۆت ئەز دێ دەرکەڤم چمە موسەیلەمەیێ درەوین، بەلکی ئەز بکوژم و کوشتنا وی ب بەر کوشتنا حەمزەی بێخم، گۆت: ئەز د گەل خەلکی دەرکەفتم، و کارێ وی ب ڤی رەنگی بوو، گۆت: من د کونەکا دیواریرا زەلامەکێ راوەستایی دیت هەروەکی حێشترەکا رەنگ خۆلییە و یێ سەرڤژەڤژ بوو، گۆت: من روما خۆ هاڤێتێ من د ناڤبەرا هەردو چچکێت وی دا و د ناڤبەرا هەردو ملێت ویدا دەرکەفت، گۆت: و زەلامەکی ژ ئەنساران خۆ هاڤێتێ و شیر داوەشاندە نیڤا سەرێ وی.

## ٥ . باب: نزول الملائكة يوم أُحد

## بابەتێ: هاتنەخوارا ملیاکەتان رۆژا ئوحودێ.

٣٦٣٤ - (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ، وَمَعَهُ رَجُلاَنِ يُقَاتِلاَنِ عَنْهُ، عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيضٌ، كَأَشَدِّ الْقِتَالِ، ما رَأَيْتُهُمَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ. [خ٤٠٥٤/ م٢٣٠٦].

---

(١) ئانکو: کورێ ژنا سونەتکەرا ژنان.

(٢) ئانکو: دەملدەست و نێك سەر بێ گیروبوون کوشت.

(٣) ئانکو: بەلێ.

ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه) گۆت: من رۆژا ئوحودێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د یت و دو زەلام د گەل بوون بەرەڤانی ژ وی د كرن و شەرەكێ دژوار د كرن و جلكێت سپی ل بەر بوون، من ئەو بەری نوكە و پشتی نوكە نەدیتینە.

## ٦ . باب: [ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ]

## بابەتێ: ئەوێت ـ پشتی برینداری و نەخۆشییا ئوحودێ ژی ب سەردا هاتی ـ هەر گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری كرین.

٣٦٣٥ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ [آل عمران] قالَتْ لِعُرْوَةَ: يَا ابْنَ أُخْتِي، كانَ أَبَوَاكَ مِنْهُمْ: الزُّبَيْرُ وَأَبُو بَكْرٍ، لَمَّا أَصَابَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) ما أَصَابَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَانْصَرَفَ عَنْهُ المشْرِكُونَ، خافَ أَنْ يَرْجِعُوا، قالَ: (**مَنْ يَذْهَبُ فِي إِثْرِهِمْ**) ؟ فَانْتَدَبَ مِنْهُمْ سَبْعُونَ رَجُلاً، قَالَ: كانَ فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَالزُّبَيْرُ. [خ٤٠٧٧/ م٢٤١٨].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾[1]، گۆتە عوروەیی: ئەی خوارزایێ من هەردو بابێت تە ژ وان بوون، زوبەیر و ئەبوبەكر، دەمێ ئەو گەهشتییە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یا ل رۆژا ئوحودێ گەهشتییێ و هەڤپشكچێكەر چۆین، پێغەمبەر (ﷺ) ترسیا بزڤرنەڤە، گۆت: (**كی دێ د دویڤ واندا چیت**) حەفتێ زەلامان ژ وان گوهداری كر، گۆت: ئەبو بەكر و زوبەیر ژ وان بوون.

---

(١) راڤەكرنا ئایەتێ ب كورتی: ئەوێت پشتی برینداری و نەخۆشییا ئوحودێ ژی ب سەردا هاتی هەر ژ گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری دەرنەكەفتین، و د گەل پێغەمبەری ل دویڤ ئەبو سوفیان و لەشكەرێ وی هاتن پشتی ژ ئوحودێ زڤرین، بۆ وان ئەوێت ڤەنجی كرین و پارێزكاری كرین خەلاتەكێ مەزن هەیە.

## ٧ . باب: يوم الرجيع

## بابەتێ: رۆژا رەجیعێ.

٣٦٣٦ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَشْرَةَ رَهْطٍ سَرِيَّةً عَيْناً، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيَّ . جَدَّ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ .، فَانْطَلَقُوا حَتَّى إِذَا كانُوا بِالْهَدْأَةِ، وَهُوَ بَيْنَ عُسْفَانَ وَمَكَّةَ، ذُكِرُوا لِحَيٍّ مِنْ هُذَيْلٍ، يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو لِحْيَانَ، فَنَفَرُوا لَهُمْ قَرِيباً مِنْ مِائَتَيْ رَجُلٍ كُلُّهُمْ رَامٍ، فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ حَتَّى وَجَدُوا مَأْكَلَهُمْ تَمْراً تَزَوَّدُوهُ مِنَ المدِينَةِ، فَقَالُوا: هَذَا تَمْرُ يَثْرِبَ، فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ، فَلَمَّا رَآهُمْ عاصِمٌ وَأَصْحَابُهُ لَجَؤُوا إِلى فَدْفَدٍ، وَأَحاطَ بِهِمُ الْقَوْمُ، فَقَالُوا لَهُمْ: انْزِلُوا وَأَعْطُونَا بِأَيْدِيكُمْ، وَلَكُمُ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ، وَلاَ نَقْتُلُ مِنْكُمْ أَحَداً.

فَقَالَ عاصِمُ بْنُ ثَابِتٍ أَمِيرُ السَّرِيَّةِ: أَمَّا أَنَا فَوَاللهِ لاَ أَنْزِلُ الْيَوْمَ فِي ذِمَّةِ كافِرٍ. اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا نَبِيَّكَ، فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ، فَقَتَلُوا عاصِماً فِي سَبْعَةٍ.

فَنَزَلَ إِلَيْهِمْ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ بِالْعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ، مِنْهُمْ خُبَيْبٌ الأَنْصَارِيُّ وَابْنُ دَثِنَةَ وَرَجُلٌ آخَرُ، فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ أَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَأَوْثَقُوهُمْ، فَقَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ: هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ، وَاللهِ لاَ أَصْحَبُكُمْ، إِنَّ فِي هَؤُلاَءِ لأُسْوَةً . يُرِيدُ الْقَتْلَى .، فَجَرَّرُوهُ وَعالجُوهُ عَلَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ، فَأَبى، فَقَتَلُوهُ.

فَانْطَلَقُوا بِخُبَيْبٍ وَابْنِ دَثِنَةَ حَتَّى بَاعُوهُمَا بِمَكَّةَ بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَابْتَاعَ خُبَيْباً بَنُو الحَارِثِ بْنِ عامِرِ بْنِ نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ قَتَلَ الحَارِثَ بْنَ عامِرٍ يَوْمَ بَدْرٍ، فَلَبِثَ خُبَيْبٌ عِنْدَهُمْ أَسِيراً.

فَأَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بْنِ عِيَاضٍ: أَنَّ بِنْتَ الحَارِثِ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهُمْ حِينَ اجْتَمَعُوا اسْتَعَارَ مِنْهَا مُوسى يَسْتَحِدُّ بِهَا فَأَعارَتْهُ، فَأَخَذَ ابْناً لِي وَأَنَا غَافِلَةٌ حِينَ أَتَاهُ، قَالَتْ: فَوَجَدْتُهُ مُجْلِسَهُ عَلَى فَخِذِهِ وَالموسى بِيَدِهِ، فَفَزِعْتُ فَزْعَةً عَرَفَهَا خُبَيْبٌ فِي وَجْهِي، فَقَالَ: تَخْشَيْنَ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ ما كُنْتُ لأَفْعَلَ ذلِكَ. وَاللهِ ما رَأَيْتُ أَسِيراً قَطُّ خَيْراً مِنْ خُبَيْبٍ، وَاللهِ لَقَدْ وَجَدْتُهُ يَوْماً يَأْكُلُ مِنْ قِطْفِ عِنَبٍ فِي يَدِهِ، وَإِنَّهُ لَمُوثَقٌ فِي الحَدِيدِ، وَمَا بِمَكَّةَ مِنْ ثَمَرٍ، وَكَانَتْ تَقُولُ: إِنَّهُ لَرِزْقٌ مِنَ اللهِ رَزَقَهُ خُبَيْباً. فَلَمَّا خَرَجُوا مِنَ الحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ فِي الحِلِّ، قالَ لَهُمْ خُبَيْبٌ: ذَرُونِي أَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، فَتَرَكُوهُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: لَوْلاَ أَنْ تَظُنُّوا أَنَّ ما بِي جَزَعٌ لَطَوَّلْتُهَا، اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَداً

وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِماً عَلَى أَيِّ شِقٍّ كانَ للهِ مَصْرَعِي

وَذلِكَ فِي ذَاتِ الإلهِ وَإِنْ يَشَأْ يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ

فَقَتَلَهُ ابْنُ الحَارِثِ، فَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ سَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ لِكُلِّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ قُتِلَ صَبْراً.

فَاسْتَجَابَ اللهُ لِعَاصِمِ بْنِ ثَابِتٍ يَوْمَ أُصِيبَ، فَأَخْبَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَصْحَابَهُ خَبَرَهُمْ وَمَا أُصِيبُوا. وَبَعَثَ نَاسٌ مِنْ كُفَّارِ قُرَيْشٍ إِلَى عاصِمٍ حِينَ حُدِّثُوا أَنَّهُ قُتِلَ لِيُؤْتَوْا بِشَيْءٍ مِنْهُ يُعْرَفُ، وَكَانَ قَدْ قَتَلَ رَجُلاً مِنْ عُظَمَائِهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ، فَبُعِثَ عَلَى عاصِمٍ مِثْلُ الظُّلَّةِ مِنَ الدَّبْرِ، فَحَمَتْهُ مِنْ رَسُولِهِمْ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى أَنْ يَقْطَعُوا مِنْ لَحْمِهِ شَيْئاً. [خ٣٠٤٥].

ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەھ زەلام بۆ سەح و سوییان د سریەكێدا هنارتن و عاسمێ كورێ سابتێ ئەنساری ـ باپیرێ عاسمێ كورێ عومەرێ كورێ خەتتابی ـ دانا سەر سەرێ وان (ﷺ)، دەركەفتن هەتا هاتینە هوداتێ مابەینا عەسەفان و مەكەهێ، بەحسێ وان بۆ پشكەكێ ژ هوزەیلییان هاتە كرن، دبێژنێ بەنی لەحیان نێزیكی دو سەد زەلامێت تیرهاڤێژ دویڤڕا دەركەفتن و دویف شوین پێت وانڕا چۆن، هەتا بەركێت وان قەسپان دیتین ئەوێت وان ل مەدینەیێ بۆ خۆ ئینابین، گۆتن ئەڤە قەسپێت مەدینەیێنە، و شوین پێت وان چۆن، ڤێجا دەمێ عاسم و هەڤالێت خۆ پێ حەسیاین خۆ دانە گركەكێ هنداڤ وان، و وان دۆرما ندۆرێت وان گرتن، گۆتن: وەرنە خوارێ و دەستێت خۆ داهێلن و عەهد و پەیمان بۆ هەوە بن ئەم كەسێ ژ هەوە نەكوژین.

ئینا عاسمێ كورێ سابتی گۆت: گەلی مرۆڤان هندیكە ئەزم ئەز ل سەر بەختێ چو گاوران ناهێمە خوارێ. یا خودێ بەحسێ مە بگەهینە پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ)، تیر هاڤێتنێ وان د گەل عاسمی حەفت كەس كوشتن.

ئینا سێ كەس ل سەر سۆز و پەیمانا وان هاتنە خوارێ، خوبەیبێ ئەنساری و كورێ دیسینەی و زەلامەكێ دی، ڤێجا دەمێ سەر زال بووین و شیاینێ بەندكێت كڤانێت خۆ ڤەكرن و پێ گرێدان، زەلامێ سێیێ گۆت: ئەڤە سەرێ غەدرێیە، ب خودێ ئەز د گەل هەوە ناهێم و ئەڤە بۆ من جهێ چاڤلێكرنێنە مەخسەدا وی كوشتینە، خڕاندن و ڤیان چارەكێ لێ بكەن، قەبویل نەكر د گەل وان بچیت ئینا كوشت.

ڤێجا وان خوبەیب و كورێ دیسینە برن هەتا هەردو ل مەكەهێ فرۆتین پشتی شەڕێ بەدرێ، كورێت حارسێ كورێ عامرێ كورێ نەوفەلێ كورێ عەبدی مەنافی خوبەیب كڕی

و خوبەیبی ل شەڕێ بەدرێ حارسێ كوڕێ عامری كوشتبی، خوبەیب بوو ئێخسیر ما ل دەڤ وان.

عوبەیدوللایێ كوڕێ عیازی گۆتە من: كچا حارسی گۆتە وی دەمێ ئەو ل سەر كوشتنا وی كۆم بووین، خوبەیبی دەڤمووسەك ژ كچەكا حارسی وەرگرت دا هندە موییێت لەشێ خۆ بتراشیت، بچویكەكێ من هەلگرت و من های ژ خۆ نەبوو دەمێ هاتییە دەڤ خوبەیبی، گۆت: من هۆ دیت یێ روینشتییە ل سەر چۆكا وی و دەڤمووس یێ د دەستێ ویدا، ئەز ترسیام ترسیانەكا وەسا خوبەیبی ژ ناڤچاڤێت من زانی، ئینا گۆت: تو دترسی ئەز بكوژم؟ ئەز نەئەوم یێ وەبكەت، وێ گۆت: ئەز ب خودێ كەم چو ئێخسیر ژ خوبەیبی باشتر من نەدیتینە، ئەز ب خودێ كەمە من ل رۆژەكێ دیت ژ ئوێشییێت تری د دەستێت ویدا د خۆت، و دەستێت وی یێت گرێدای بوون و فێقییەك ل مەكەهێ نەبوو، و د گۆت: ب راستی ئەو رزقەك بوو خودێ ب رزقێ خوبەیبی كربوو، ڤێجا دەمێ ژ تخوبێت مەكەهێ دەرێخستی بری یە دەر ڤەی مەكەهێ دا بكوژن، خوبەیبی گۆت من بهێلن دا ئەز دو ركعەتان بكەم، هێلان، دو ركعەت كرن، و گۆت: هەكە هەوە هزر نەكربا ئەز دترسم دا پتر كەم (یان دا درێژكەم): یا خودێ هەژمارا وان هەمیان بزانە و ئێك ئێكە بكوژە و كەسێ ژ وان نەهێلە.

و گۆت:

من خەم نینە دەمێ ئەز موسلمان دهێمە كوشتن ل سەر هەر لایێ بیت مرنا من بۆ خودێ

و ئەو د رازیبوونا خودێدا و هەكە بڤێت دێ بەرەكەتێ ئێخیتە ئەندامێت لەشێ ژێك پەرتی

ئینا كوڕێ حارسی ئەو كوشت و خوبەیبی بۆ هەر موسلمانەكێ گرێدایی دهێتە كوشتن سونەتا نڤێژكرنێ دەرێخست. ئینا خودێ دوعایا عاسمێ كوڕێ سابتی قەبویل كر و پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا ئەو ب سەرێ وان هاتی بەحسێ وان بۆ هەڤالێت خۆ كر و كا چ ب سەرێ وان هات. و هندە مرۆڤ ژ قورەیشییان هنارتنە عاسمێ كوڕێ سابتی دەمێ بۆ وان هاتییە گۆتن یێ هاتییە كوشتن دا تشتەكی ژێ بینن پێ بێتە نیاسین، و عاسمی ل رۆژا

بەدرێ زەلامەك ژ كەنكەنێت وان كوشتبوو، خودێ مێشێت هنگڤینی وەكی عەورەكی بۆ عاسمی هنارتن ژ ڤاسدێت وان پاراست، نەشیان چو ژێڤەكەن.

**٨ . باب: يوم بئر معونة**

**بابەتێ: رۆژا بیرا مەعوونەیێ.**

٣٦٣٧ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قالَ: دَعَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى الَّذِينَ قَتَلوا أَصحَابَ بِئْرِ مَعُونَةَ ثَلاثِينَ غَدَاةً، عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ، عَصَتِ اللهَ وَرَسُولَهُ. [خ٢٨١٤ (١٠٠١)/ م٦٧٧].

وفي رواية لمسلم: قَالَ: جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالُوا: أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالاً يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُمُ: الْقُرَّاءُ، فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ، يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ، وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَيَحْتَطِبُونَ فَيَبِيعُونَهُ، وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لأَهْلِ الصُّفَّةِ، وَلِلْفُقَرَاءِ. فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيْهِمْ، فَعَرَضُوا لَهُمْ فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ. فَقَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا؛ أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ، وَرَضِيتَ عَنَّا. قَالَ: وَأَتَى رَجُلٌ حَرَاماً، خَالَ أَنَسٍ، مِنْ خَلْفِهِ فَطَعَنَهُ بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ. فَقَالَ حَرَامٌ: فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَصْحَابِهِ: (إِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا، وَإِنَّهُمْ قَالُوا: **اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا؛ أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ، وَرَضِيتَ عَنَّا**). [م: الإمارة ٦٧٧ (١٤٧)].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سیه سپێدەییان دوعا ل خودانێت بیرا مەعوونە كرن، ل ریعلێ و زەكوان و عوسەیی كرن، وان نەگوهدارییا خودێ و پێغەمبەرێ وی كرن.**

**و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: گۆت: هندە خەلك هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتن: هندەك زەلامان د گەل مە بهنێرە قورئانێ و حەدیسا تە نیشا مە بدەن، حەفتێ زەلام ژ خەلكێ مەدینێ ژ ئەنساران د گەل هنارتن، دگۆتنێ قورئانخوین، حەرام خالێ من ژ وان بوو، قورئان دخواندن و ب شەڤێ د ناڤبەرا ئێك و دودا دخواند زانینا خۆ زێدە دكرن، و ب رۆژێ ئاڤ دئینان ددانانە مزگەفتێ، و دار دئینان دفرۆتن بۆ هەژار و خەلكێ**

سوففێ خوارن پێ دکری[1]، پێغەمبەری (ﷺ) هنارتن، هاتنە د رێکا واندا، کوشتن بەری بگەهنە وی جهی، گۆتن: یا خودێ ژ مە بگەهینە پێغەمبەرێ مە، ئەم گەهشتینە تە و ئەم ژ تە رازی بووین و تو ژ مە رازی بووی، و زەلامەك ژ پشتێڤە هاتە حەرامی خالێ ئەنەسی و رومەك لێ دا هەتا زکێ وی دەرێخستی، ئینا حەرامی گۆت: ئەز ب خودانێ کەعبێ کەم ئەز سەرکەفتم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی برایێت هەوە هاتنە کوشتن، و وان ب راستی گۆتن: یا خودێ ژ مە بگەهینە پێغەمبەرێ مە، ئەم گەهشتینە تە و ئەم ژ تە رازی بووین و تو ژ مە رازی بووی).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) خەلکێ سوففە: ئەو بوون یێت مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) یێت هەژار و بێ کەس و کار و ل سەر سەدەقەیێت خەلکێ مەدینێ دژیان.

## الفصل السادس: غزوة الخندق وما بعدها

## پشكا شەشێ: خەزايا خەندەكێ و يا پشتى وێ.

### ١ . باب: حفر الخندق

### بابەتێ: كۆلانا خەندەكێ.

٣٦٣٨ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِلَى الخَنْدَقِ، فَإِذَا المهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ فِي غَدَاةٍ بَارِدَةٍ، فَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ عَبِيدٌ يَعْمَلُونَ ذلِكَ لَهُمْ، فَلَمَّا رَأَى ما بِهِمْ مِنَ النَّصَبِ وَالجوعِ، قالَ: (**اللَّهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ، فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالمُهَاجِرَهْ**). فَقَالُوا مُجِيبِينَ لَهُ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدا عَلَى الجِهَادِ ما بَقِينَا أَبَدا. [خ٢٨٣٤/ م١٨٠٥].

**ژ ئەنەسى (رضي الله عنه) گۆت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفتە خەندەكێ، د يت مشەخت و ئەنسار ل سپێدەكا سار يێ خەندەكێ دكۆلن، وان خزمەتكار و بەندە نەبوون بۆ وان شۆل بكەن، ڤێجا دەمێ ديتى كا چ تێهناتى و برساتى وان گرتييە گۆت: (ئەى خودا ب راستى ژيان ژيانا ئاخرەتێيە ڤێجا ل ئەنسار و مشەختان خۆش ببە) ئيـنا د بەرسڤدانا ويدا گۆتن:**

**ئەم ئەوين يێت مە بەيعەت دايە موحەممەدى ل سەر جيهادێ هندى ئەم مابين هەتا هەتا**

٣٦٣٩ - (ق) عَنِ البَرَاءِ رضي الله عنه قالَ: كانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَنْقُلُ التُّرَابَ يَوْمَ الخَنْدَقِ، حَتَّى أَغْمَرَ بَطْنُهُ، أَوِ اغْبَرَّ بَطْنُهُ، يَقُولُ:

**(وَاللهِ! لَوْلاَ اللهُ ما اهْتَدَيْنَا وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا**

**فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا**

**إِنَّ الأُلَى قَدْ بَغَوْا عَلَيْنَا إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا)**

وَرَفَعَ بِهَا صَوْتَهُ: (أَبَيْنَا أَبَيْنَا). [خ٤١٠٤ (٢٨٣٦)/ م١٨٠٣]

**ژ بەرائى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا خەندەكێ ئاخ ڤەدگوهازت هەتا هەمى زكێ وى ئاخێ گرتى يان زكێ وى تۆزەكى بووى و دگۆت:**

**(ئەز ب خودێ كەمە ئەگەر خودێ نەبا ئەم راستەرێ نەدبووین و نە مە سەدەقە ددان و نە مە نفێژ دكرن فێجا تەناهییێ ب سەر مەدا داڕێژە و مە راگرە ئەگەر كەفتینە بەرامبەر دژمنی ئەڤە ستەمێ ل مە دكەن ئەگەر وان دڤێت مە ژ دینێ مە ڤەكەن ئەم رازی نابین).**

**و پێغەمبەری (ﷺ) دەنگێ خۆ ب (رازی نابین رازی نابین) بلند دكر.**

## ٢ . باب: طعام جابر

## بابەتێ: خوارنا جابری.

٣٦٤٠ - (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قالَ: لَمَّا حُفِرَ الخَنْدَقُ رَأَيْتُ بِالنَّبِيِّ (ﷺ) خَمَصاً شَدِيداً، فَانْكَفَأْتُ إِلَى امْرَأَتِي، فَقُلْتُ: هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ فَإِنِّي رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) خَمَصاً شَدِيداً، فَأَخْرَجَتْ إِلَيَّ جِرَاباً فِيهِ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَلَنَا بُهَيْمَةٌ دَاجِنٌ فَذَبَحْتُهَا، وَطَحَنَتِ الشَّعِيرَ، فَفَرَغَتْ إِلَى فَرَاغِي، وَقَطَّعْتُهَا فِي بُرْمَتِهَا، ثُمَّ وَلَّيْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: لاَ تَفْضَحْنِي بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَبِمَنْ مَعَهُ، فَجِئْتُهُ فَسَارَرْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا وَطَحَنَّا صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ كَانَ عِنْدَنَا، فَتَعَالَ أَنْتَ وَنَفَرٌ مَعَكَ، فَصَاحَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: (**يَا أَهْلَ الخَنْدَقِ! إِنَّ جابِراً قَدْ صَنَعَ سُوراً، فَحَيَّ هَلاً بِكُمْ**). فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تُنْزِلُنَّ بُرْمَتَكُمْ، وَلاَ تَخْبِزُنَّ عَجِينَكُمْ حَتَّى أَجِيءَ**).

فَجِئْتُ وَجَاءَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقْدُمُ النَّاسَ حَتَّى جِئْتُ امْرَأَتِي، فَقَالَتْ: بِكَ وَبِكَ، فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ الَّذِي قُلْتِ، فَأَخْرَجَتْ لَهُ عَجِيناً فَبَصَقَ فِيهِ وَبَارَكَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى بُرْمَتِنَا فَبَصَقَ وَبَارَكَ، ثُمَّ قَالَ: (**ادْعُ خابِزَةً فَلْتَخْبِزْ مَعِي، وَاقْدَحِي مِنْ بُرْمَتِكُمْ وَلاَ تُنْزِلُوهَا**). وَهُمْ أَلْفٌ، فَأُقْسِمُ بِاللهِ لَقَدْ أَكَلُوا حَتَّى تَرَكُوهُ وَانْحَرَفُوا، وَإِنَّ بُرْمَتَنَا لَتَغِطُّ كَمَا هِيَ، وَإِنَّ عَجِينَنَا لَيُخْبَزُ كَمَا هُوَ. [خ٤١٠٢ (٣٠٧٠)/ م٢٠٣٩].

ولفظ مسلم: (**ادْعِي خَابِزَةً، فَلْتَخْبِزْ مَعَكِ..**).

وفي رواية للبخاري: قَالَ: إِنَّا يَوْمَ الخَنْدَقِ نَحْفِرُ، فَعَرَضَتْ كُدْيَةٌ شَدِيدَةٌ، فَجَاؤُوا النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالُوا: هذِهِ كُدْيَةٌ عَرَضَتْ فِي الخَنْدَقِ، فَقَالَ: (**أَنَا نَازِلٌ**). ثُمَّ قَامَ وَبَطْنُهُ مَعْصُوبٌ بِحَجَرٍ، وَلَبِثْنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ لاَ نَذُوقُ ذَوَاقاً، فَأَخَذَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمِعْوَلَ فَضَرَبَ فِي الْكُدْيَةِ، فَعَادَ كَثِيباً أَهْيَلَ، أَوْ أَهْيَمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ائْذَنْ لِي إِلَى الْبَيْتِ.. وذكر الحديث. [خ٤١٠١].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ خەندەك هاتییە كۆلان، من برسەكا زێدە ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت، ئەز زڤریمە دەڤ كابانییا خۆ و من گۆتێ: تشتەك دەڤ تە هەیە؟ ب راستی من برسەكا زێدە ل دەڤ پێغەمبەرێ**

خودێ (ﷺ) دیت، تویر كەك بۆ من دەرێخست مـنەكا جەهی تێ بوو، و مە كەوالەكێ خودانكری هەبوو من ڤەكوشت، خلاس بوو و من گۆشت هویركرە د قازانا وێدا، پاشی من پشتا خۆ دایێ دا بچمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: من د گەل پێغەمـبەری (ﷺ) و یێت د گەل شەرمزار نەكە، ئەز هاتمە دەڤ، ب نهێنیڤە من گۆتێ: ئەی پێغەمـبەرێ خودێ مە كەوالكەكێ خۆ یێ ڤەكوشتی، و منەكا جەهی مە یا هێرای، تو و چەندەك د گەل تە وەرن، پێغەمـبەری (ﷺ) كرە گازی و گۆت: **(گەلی خەلكێ خەندەكێ جابری شیلانەك یا دانای كەرەمكەن)** و پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(قازانا خۆ نەدانن و نانێ خۆ نەپێژن هەتا ئەز دهێم)**. ئەز هاتم، و پێغەمـبەرێ خودێ (ﷺ) بەری خەلكێ كەفت و هات، هەتا ئەز گەهشتیمە كابانیـیا خۆ، ئینا گۆت: هندە هندە ژ تەبن[1]، من گۆت: ب راستی تە چ گۆت من وەكر، و هەڤیر دەرێخست پفكرێ یان تفكرێ و پیرۆز كر پاشی بەرێ خۆ دا قازانكا مە پفكرێ یان تفكرێ و پیرۆز كر، پاشی گۆت: **(گازی نانپێژەكا دی بكە بلا د گەل من بپێژیت، و ژ قازانا خۆ خالیكەن، و نەئینـنە خوارێ)** و ئەو هزار بوون، ئەز ب خودێ سویند دخۆم، هەمیان خوار و چۆن و قازانا مە دەنگێ كەلا وێ وەكی خۆ بوو و هەڤیرێ مە دهاتە پاتن وەكی خۆ بوو.

و بێژەیا موسلمی: **(گازی نانپێژەكێ بكە بلا د گەل تە بپێژیت)**.

و د ڤەگێرەكێدا یا بوخاری : گۆت: مە ل رۆژا خەندەكێ عەرد دكۆلا، عەردەكێ جهگیر بۆ مە دەر كەفت، هاتـنە دەڤ پێغەمـبەری (ﷺ) گۆتن: جهگیرەكێ بۆ مە د خەندەكێدا دەركەفتی، گۆت: **(ئەز دێ چمە خوارێ)**، پاشی رابوو و زكێ وی بەر ل سەر گرێدا بوو، و سێ رۆژان ئەم ماین مە تام نەكرە خوارنەكێ، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تەڤر هەلگرت، و دانایێ بوو گرەكێ نەرم، من گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ دەستویرییا من بدە بچمە مال... و فەرمودە گۆت.

---

(١) نانكو: ئاخفتن گۆتنێ ژ ترسا هندێدا بكەڤنە شەرمێ خەلك گەلەكە و خوارن پیچەكە.

### ٣ ـ باب: ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ﴾

## بابەتێ: (إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ).

٣٦٤١ – (م) عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ حُذَيْفَةَ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَوْ أَدْرَكْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَاتَلْتُ مَعَهُ وَأَبْلَيْتُ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: أَنْتَ كُنْتَ تَفْعَلُ ذلِكَ؟ لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) لَيْلَةَ الأَحْزَابِ، وَأَخَذَتْنَا رِيحٌ شَدِيدَةٌ وَقُرٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَلاَ رَجُلٌ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟**) فَسَكَتْنَا، فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ. ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ رَجُلٌ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟**) فَسَكَتْنَا، فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ. ثُمَّ قَالَ: (**أَلاَ رَجُلٌ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ، جَعَلَهُ اللهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟**) فَسَكَتْنَا، فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ، فَقَالَ: (**قُمْ يَا حُذَيْفَةُ! فَأْتِنَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ**) فَلَمْ أَجِدْ بُدًّا، إِذْ دَعَانِي بِاسْمِي، أَنْ أَقُومَ. قَالَ: (**اذْهَبْ، فَأْتِنِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ، وَلاَ تَذْعَرْهُمْ عَلَيَّ**) فَلَمَّا وَلَّيْتُ مِنْ عِنْدِهِ جَعَلْتُ كَأَنَّمَا أَمْشِي فِي حَمَّامٍ، حَتَّى أَتَيْتُهُمْ، فَرَأَيْتُ أَبَا سُفْيَانَ يَصْلِي ظَهْرَهُ بِالنَّارِ، فَوَضَعْتُ سَهْماً فِي كَبِدِ الْقَوْسِ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْمِيَهُ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): (**وَلاَ تَذْعَرْهُمْ عَلَيَّ**) وَلَوْ رَمَيْتُهُ لأَصَبْتُهُ، فَرَجَعْتُ وَأَنَا أَمْشِي فِي مِثْلِ الْحَمَّامِ.

فَلَمَّا أَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِ الْقَوْمِ، وَفَرَغْتُ، قُرِرْتُ، فَأَلْبَسَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنْ فَضْلِ عَبَاءَةٍ كَانَتْ عَلَيْهِ يُصَلِّي فِيهَا، فَلَمْ أَزَلْ نَائِماً حَتَّى أَصْبَحْتُ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ قَالَ: (**قُمْ يَا نَوْمَانُ!**). [م١٧٨٨].

**ژ ئیبراهیمێ تەیمی ژ بابێ وی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەم ل دەڤ حوزیفە بووین، ئینا زەلامەكی گۆت: ئەگەر ئەز گەهشتبامە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دا شەڕی د گەل كەم و دا زێدە بەرەڤانیێ ژێ كەم، ئەبو حوزەیفە گۆت: تو دا وێ كەی؟! ئەگەر تە ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شەڤا شەڕێ هەڤپەیمانان دیتباینە كا چ تەنگاڤی بوو[1]، هورەبایێ دژوار و سەرمایێ ئەم گرتبووین، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ زەلامەك هەیە سەحوسوییا وان بۆ من بینیت خودێ وی بكەتە هەڤالێ من رۆژا قیامەتی)؟ مە خۆ بێدەنگ كر و كەسێ ژ مە بەرسڤا وی نەدا. پاشی گۆت: (ئەرێ زەلامەك هەیە سەحوسوییا وان بۆ من بینیت خودێ وی بكەتە هەڤالێ من رۆژا قیامەتی)؟ مە خۆ بێدەنگ كر و كەسێ ژ مە بەرسڤا وی نەدا، ئینا گۆت: (ئەی حوزەیفە**

---

(١) ئانكو: ئەگەر تە ئەو تەنگاڤیا د وێ شەڤێدا دیتبایە تە ئەڤ ئاخفتنە نەدكر.

**رابە سەحوسوییێت وان بۆ مە بینە)** من چو چارە نەدیتن ئەز نەرابم دەمێ ب ناڤ گازی من كری، گۆت: **(سەحوسوییێت وان بۆ من بینە و وان ل سەر مە نەلڤینە)**[1]، ڤێجا دەمێ ئەز ژ دەڤ وی چۆیم، هەروەكی ئەز یێ ل سەر ئاڤا گەرم د چم[2]، هەتا ئەز هاتیمە دەڤ وان، من ئەبو سوفیان دیت پشتا خۆ ب ئاگری گەرم دكر، ئینا من تیرەك كرە د نیڤا كڤانیدا من دڤیا ئەز باڤێژمێ، بەلێ بیرا من هاتە گۆتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) **(و وان ل سەر مە نەلڤینە)** و ئەگەر من هاڤێتبایێ دا لێدەم، و ئەز زڤریم دیسا هەروەكی ئەز ل سەر ئاڤا گەرم دچم.

ڤێجا دەمێ ئەز هاتیمە دەڤ و من سەحوسوییێت وان بۆ گۆتین، و ئەز ب دویماهی هاتم، من ساربووڤە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عەبایەكێ زێدە ل سەر ملی بوو، كرە بەر من وی نڤێژ تێدا دكر، ڤێجا ئەز بەردەوام مامە نڤستی هەتا سپێدە ل من بووی، ڤێجا دەمێ ل من بوویە سپێدە گۆت: (رابە خەوینۆ).

## ٤. باب: انشغال المسلمين عن الصلاة

## بابەتێ: بێئاگەهبوونا موسلمانان ژ نڤێژێ.

٣٦٤٢ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ جَاءَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا كِدْتُ أُصَلِّي الْعَصْرَ، حَتَّى كَادَتِ الشَّمْسُ تَغْرُبُ، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(واللهِ مَا صَلَّيْتُهَا)**. فَقُمْنَا إِلَى بُطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ لِلصَّلَاةِ وَتَوَضَّأْنَا لَهَا، فَصَلَّى الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا الْمَغْرِبَ. [خ٥٩٦/ م٦٣١].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەرێ كورێ خەتتابی ل رۆژا شەرێ خەندەكێ هات پشتی رۆژ ئاڤا بووی، ئینا دەستهاڤێتی خەبەر گۆتنە گاورێت قورەیشییان، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من نڤێژا ئێڤاری نەكر هەتا نێزیك بووی رۆژ ئاڤا بووی، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب خودێ كەمە من نەكرییە)**، ئەم

---

(١) ئانكو: هشیاربی ب تە نەحەسن دا ئەزیەتا تە نەكەن و ب تە من بنێشینن، چونكی تو هنارتییێ منی.

(٢) ئانكو: ئەو سەرما ژ بەر بەرەكەتا دوعایا پێغەمبەری (ﷺ) نەما.

چۆینە بوتحانێ[1] دەستنڤێژا خۆ بۆ نڤێژێ گرت و مە ژی بۆ وێ دەستنڤێژ گرت و نڤێژا ئێڤاری كر پشتی رۆژ ئاڤا بووی، پاشی پشتی وێ نڤێژا مەغرەب كر.

٥ . باب: آخر غزوة تقوم بها قريش

**بابەتێ: دویماهی خەزا قورەیشی پێ رادبن.**

٣٦٤٣ - (خ) عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ، حِينَ أَجْلَى الأَحْزَابُ عَنْهُ: (**الآنَ نَغْزُوهُمْ وَلاَ يَغْزُونَنَا، نَحْنُ نَسِيرُ إِلَيْهِمْ**). [خ٤١١٠ (٤١٠٩)].

**ژ سولەیمانێ كورێ سەردی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: دەمێ هەڤپەیمان چۆین: (ژ ڤێرێ وێڤە ئەم دێ هێرشی وان كەین و ئەو هێرشی مە ناكەن، ئەم دێ چینە وان).**

٦ . باب: صلاة العصر في بني قريظة

**بابەتێ: كرنا نڤێژا ئێڤاری ل بەنی قورەیزە**

٣٦٤٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لَنَا لَمَّا رَجَعَ مِنَ الأَحْزَابِ: (**لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ**). فَأَدْرَكَ بَعْضَهُمُ الْعَصْرُ فِي الطَّرِيقِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهَا، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي، لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذلِكَ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَلَمْ يُعَنِّفْ وَاحِداً مِنْهُمْ. [خ٩٤٦/ م١٧٧٠].

**ژ ئیبن عومەری ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ ژ شەرێ هەڤپەیمانان زڤری، گۆت: (كەس نڤێژا ئێڤاری نەكەت ل بەنی قورەیزە نەبیت)، نڤێژا ئێڤاری د رێكێدا ل هندەكان بوو، ئینا هندەكان گۆت: ئەم نڤێژا ئێڤاری ناكەین هەتا دگەهینە وێرێ، و هندەكان گۆت: بەلكی ئەم دێ كەین، و ئەو ژ مە نەڤیایە ئەم نەكەین، ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە گۆتن، ئینا زڤری ل كەسێ ژ وان نەكر.**

٧ . باب: موت سعد بن معاذ رضي الله عنه

**بابەتێ: مرنا سەعدێ كورێ مەعازی (رضي الله عنه).**

٣٦٤٥ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: أُصِيبَ سَعْدٌ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، رَمَاهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ، يُقَالُ لَهُ: حِبَّانُ بْنُ الْعَرِقَةِ، رَمَاهُ فِي الأَكْحَلِ، فَضَرَبَ النَّبِيُّ (ﷺ) خَيْمَةً فِي الْمَسْجِدِ لِيَعُودَهُ مِنْ قَرِيبٍ،

---

(١) نهالەكا بەفرەهە ل مەدینەیێ و ئاڤ تێرا دهات.

فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنَ الخَنْدَقِ، وَضَعَ السِّلاَحَ وَاغْتَسَلَ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عليه السلام وَهُوَ يَنْفُضُ رَأْسَهُ مِنَ الْغُبَارِ، فَقَالَ: قَدْ وَضَعْتَ السِّلاَحَ، وَاللهِ ما وَضَعْتُهُ، اخْرُجْ إِلَيْهِمْ. قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(فَأَيْنَ)**. فَأَشَارَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ، فَأَتَاهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَنَزَلُوا عَلَى حُكْمِهِ، فَرَدَّ الحكْمَ إِلَى سَعْدٍ، قالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ: أَنْ تُقْتَلَ المقَاتِلَةُ، وَأَنْ تُسْبَى النِّسَاءُ وَالذُّرِّيَّةُ، وأَنْ تُقْسَمَ أَمْوَالُهُمْ.

وَعَنْها: أَنَّ سَعْداً قالَ: اللَّهُمَّ! إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أُجَاهِدَهُمْ فِيكَ، مِنْ قَوْمٍ كَذَّبُوا رَسُولَكَ (ﷺ) وَأَخْرَجُوهُ. اللَّهُمَّ! فَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّكَ قَدْ وَضَعْتَ الحَرْبَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ، فَإِنْ كَانَ بَقِيَ مِنْ حَرْبِ قُرَيْشٍ شَيْءٌ فَأَبْقِنِي لَهُ، حَتَّى أُجَاهِدَهُمْ فِيكَ، وَإِنْ كُنْتَ وَضَعْتَ الحَرْبَ فَافْجُرْهَا وَاجْعَلْ مَوْتَتِي فِيهَا، فَانْفَجَرَتْ مِنْ لَبَّتِهِ، فَلَمْ يَرُعْهُمْ، وَفِي المسْجِدِ خَيْمَةٌ مِنْ بَنِي غِفَارٍ، إِلاَّ الدَّمُ يَسِيلُ إِلَيْهِمْ، فَقَالُوا: يَا أَهْلَ الخَيْمَةِ! مَا هَذَا الَّذِي يَأْتِينَا مِنْ قِبَلِكُمْ؟ فَإِذَا سَعْدٌ يَغْذُو جُرْحُهُ دَماً، فَمَاتَ مِنْهَا رضي الله عنه. [خ٤١٢٢ (٤٦٣)/ م١٧٦٩].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: سەعد[1] ل رۆژا شەڕێ خەندەكێ بریندار بوو زەلا مەكی ژ قورەیشیيان د گۆتنێ حیبانێ كوڕێ عەریقەیی تیرەك هاڤێتێ ل رهازەندكا وی دا بوو، پێغەمبەری (ﷺ) خیڤەتەك بۆ ل مزگەفتێ ڤەدا، دا نێزیك سەرا بدەت، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل شەڕێ خەندەكێ زڤری، چەك دانا و سەرێ خۆ شویشت، ئینا جبریل هاتە دەڤ و وی تۆز ژ سەرێ خۆ دادقوتا، ئینا گۆت: تە چەك دانا، ئەز ب خودێ كەمە من نەدانایە، هەرە وان، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (كیڤە) ئینا نیشان كرە قورەیزیيان، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە وان ئەو ب فەرمانا وی رازی بوون، ئینا وی فەرمان بۆ سەعدی زڤراند، گۆت: ئەز فەرمانێ د واندا دكەم: شەڕكەرێت وان بكوژن و ژن و زارۆكێت وان ئێخسیر بكەن و مالێ وان بهێتە لێكڤەكرن.**

**و ژ وێ گۆت: سەعدی گۆت: ئەی خودا ب راستی تو دزانی چو تشت تە مەتی وێ ل دەڤ من خۆشڤیتر نینە ئەز بۆ تە جیهادێ د گەل هندەكان بكەم پێغەمبەرێ تە درەو ین دانایی و دەرئێخستی، ئەی خودا ئەز هزر دكەم تە شەڕ د ناڤبەرا مە و واندا ب دویماهی ئینا، ڤێجا ئەگەر هندەك ژ شەڕێ قورەیشیيان مابیت من بۆ بهێلە هەتا ئەز بۆ تە جیهادێ د گەل وان بكەم، و ئەگەر تە شەڕ ب دویماهی ئینایە برینا من بپەقینە و مرنا من بكە تێدا، ئینا ژ سەرێ سینگێ وی پەقی[2] و چو ئەو نەترساندن، و ل مەزگەفتێ خیڤەتەكا غیفاریيان هەبی ئەو**

---

(١) مەبەست: سەعدێ كوڕێ مەعازییە مەزنێ ئەوسییان.

(٢) برینا وی ژ رها زەندكی دابوو بن خۆ هەتا سەر سینگێ وی.

نەبیت خوین دچۆ دڤ وان، ئینا گۆتن: ئەی خودانێ خیڤەتێ ئەو چییە ژ لایێ هەوڤە دهێتە دڤ مە؟ هند دیتن سەعدی برینا وی خوینا ژێ درژیت و ئەو ب وێ برینێ مر (رضي الله عنه).

٨. باب: زواج النبي (ﷺ) زينب ونزول الحجاب

**بابەتێ: هەڤژینگیریا پێغەمبەری (ﷺ) د گەل زەینەبێ و هاتنە خوارا پەردەپۆشییێ.**

٣٦٤٦ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ دَعَا الْقَوْمَ فَطَعِمُوا، ثُمَّ جَلَسُوا يَتَحَدَّثُونَ، وَإِذَا هُوَ كَأَنَّهُ يَتَهَيَّأُ لِلْقِيَامِ فَلَمْ يَقُومُوا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَامَ، فَلَمَّا قَامَ قَامَ مَنْ قَامَ وَقَعَدَ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِيَدْخُلَ فَإِذَا الْقَوْمُ جُلُوسٌ، ثُمَّ إِنَّهُمْ قَامُوا، فَانْطَلَقْتُ فَجِئْتُ، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) أَنَّهُمْ قَدِ انْطَلَقُوا، فَجَاءَ حَتَّى دَخَلَ، فَذَهَبْتُ أَدْخُلُ، فَأَلْقَى الْحِجَابَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿يا أيها ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ﴾ الآيَةَ [الأحزاب:٥٣]. [خ٤٧٩١/ م١٤٢٨].

ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەینەبا كچا جەحشی مارە كری خەلك گازی كر و خوارن دایێ، پاشی روینشتن و سوحبەت كرن، و وی كارێ خۆ كر هەروەكی دڤێت رابیت، بەلێ ئەو هەر نەرابوون، دەمێ ئەڤە ژ وان دیتی رابوو، ڤێجا دەمێ رابووی ئەو رابوو یێ رابووی و سێ كەس مانە روینشتی، پێغەمبەر (ﷺ) هات دا بهێتە ژۆر هێژ ئەو خەلك یێ روینشتی بوو، پاشی ئەو ژی رابوون، ئەز چۆم و هاتم پێژمە پێغەمبەری (ﷺ)، ئەو چۆن، ئینا هات هەتا ب ژۆر كەفتی، ئەز چۆم دا بچمە ژۆر پەردە دانا د نافبەرا من خۆدا و خودێ ئەڤە ئینا خوارێ: ﴿يا أيها ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ﴾ ئایەت[1].

❀❀❀❀❀❀❀❀❀

(١) رامانا ئایەتێ ب كورتی: گەلی خودان باوەران نەچنە د خانییێت پێغەمبەریڤە، ژ بلی هندێ ئەو دەستویرییا هەوە بدەت بۆ خوارنەكێ، بەلێ وەختەكێ وەسا نەبیت خوارن نەیا حازر بیت و هوین خۆ ل هیڤییێ بگرن [هەتا چێ دبیت]، بەلێ ئەگەر هوین هاتنە داخوازكرن بۆ خوارنێ هەرن، و ئەگەر هەوە خوارن خوار ڤەرەڤن (بەلاڤ ببن) و نەمیننە روینشتی بميننە ب ئاخفتنێڤە، ب راستی كارێ هەوە ئەڤە [چۆنا مالا پێغەمبەری بێ دەستویری یان ژی مانا ل هیڤییا خوارنێ ل وێرێ هەتا چێ دبیت یان ژی مانا ب ئاخفتنێڤە] ئەزیەتێ بۆ پێغەمبەری چێ دكەت، ڤێجا ئەو شەرم ژ هەوە دكەت [ڤێ بۆ هەوە بێژیت]، بەلێ خودێ شەرم ژ دیاركرنا هەقییێ ناكەت، و هەر وەختێ هەوە هەوجەییەك ژ ژنێت پێغەمبەری خواست یان هەوە ڤیا وان باخێڤن، ڤێجا ل پشت پەردەیێ ژێ بخوازن یان باخێڤن، ئەڤە بۆ دلێ هەوە و دلێ وان ژی چێتره، و د بنیڕا بۆ هەوە نەدورستە هوین ئەزیەتێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ چێكەن.

## الفصل السابع: غزوة بني المصطلق

## پشكا حەفتێ: خەزايا بەنى موستەليق

### ١ . باب: الإغارة على بني المصطلق

### بابەتێ: لەشكەركێشييا ل سەر بەنى موستەليق.

٣٦٤٧ - (ق) عَنِ ابْنِ عَوْنٍ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ، فَكَتَبَ إِلَيَّ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَغَارَ عَلَى بَنِي المصْطَلِقِ وَهُمْ غَارُّونَ، وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الماءِ، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ، وَسَبَى ذَرَارِيَّهُمْ، وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَةَ. حَدَّثَنِي بِهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، وَكَانَ فِي ذلِكَ الجَيْشِ. [خ٢٥٤١/ م١٧٣٠].

- وعند مسلم: قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ أَسْأَلُهُ عَنِ الدُّعَاءِ قَبْلَ الْقِتَالِ، قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ قَدْ أَغَارَ..

**ژ ئيبن عەونى (رحمه الله) گۆت: من بۆ نافعى نڤيسى و وى بۆ من نڤيسى كو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هێرش كرە بەنى موستەليق و وان ئاگەه ژ خۆ نەبوو[1]، و گيانەوەرێت وان ل سەر ئاڤێ ئاڤ ددان، شەڕكەرێت وان كوشتن و زارۆكێت وان ئێخسير كرن و جوەيرييە ژ وان بوو، عەبدوللايى ئەڤە بۆ من گۆت: ئەو ژ وى لەشكەرى بوو.**

- **و ل دەڤ موسلمى: گۆت: من بۆ نافعى نڤيسى، من پرسيارا گازيكرنا بەرى شەڕى ژێ دكر، گۆت: ئەو د دەستپێكا ئيسلامێدا بوو[2] و پێغەمبەرى (ﷺ) هێرش كرە ..... تماميا حەديسێ.**

### ٢ . باب: (دعوها فإنها منتنة).

### بابەتێ: بهێلن ئەو يا گەنييە

٣٦٤٨ - (ق) عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَقَدْ ثَابَ مَعَهُ نَاسٌ مِنَ المهَاجِرِينَ حَتَّى كَثُرُوا، وَكَانَ مِنَ المهَاجِرِينَ رَجُلٌ لَعَّابٌ، فَكَسَعَ أَنْصَارِيّاً، فَغَضِبَ الأَنْصَارِيُّ غَضَباً شَدِيداً حَتَّى تَدَاعَوْا، وَقَالَ الأَنْصَارِيُّ: يَا لَلأَنْصَارِ! وَقَالَ المهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ!

---

(١) چونكى ناخفتنەكا پشتراستكرى گەهشتبوو پێغەمبەرى (ﷺ) ئەو بێ كارێ خۆ دكەن دا ب سەر موسلماناندا بگرن.

(٢) ئانكو: هێز ئيسلام نەگەهشتييە خەلكى، و پشتى گەهشتييە وان و وان هەميان ئاگەه ژ ئيسلامێ بوويى پێدڤى گازيكرنێ نينە، و ب راستى ئەڤە جهێ نەلێكييێيە د ناڤ زانايانداا.

فَخَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: **(ما بَالُ دَعْوَى أَهْلِ الجَاهِلِيَّةِ؟ ثُمَّ قَالَ: ما شَأْنُهُمْ)**؟ . فَأُخْبِرَ بِكَسْعَةِ المُهَاجِرِيِّ الأَنْصَارِيَّ، قالَ: فَقَالَ: النَّبِيُّ (ﷺ): **(دَعُوهَا، فَإِنَّهَا خَبِيثَةٌ)**.

وَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلولَ: أَقَدْ تَدَاعَوْا عَلَيْنَا، لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى المَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ، فَقَالَ عُمَرُ: أَلاَ نَقْتُلُ يَا رَسُولَ اللهِ هذَا الخَبِيثَ؟ لِعَبْدِ اللهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّهُ كانَ يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ)**. [خ٣٥١٨/ م٢٥٨٤].

**ژ جابرى (ﷺ) گۆت: مە خەزايەك د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر و خەلكەك ژ مشەختان د گەل زڤرین، هەتا بووینە گەلەك، و ژ مشەختان زەلامەكى ترانەكەر هەبوو، تەپەك ل پاشییا ئێكێ ئەنسارى دا[1]، ئینا یێ ئەنسارى تۆڕە بوو تۆڕەبوونەكا زێدە هەتا داخوازییا پشتەڤانییا ئێكدو كرى، و یێ ئەنسارى گۆت: هەوارە گەلى ئەنساران! و یێ مشەخت گۆت: هەوارە گەلى مشەختان!**

**ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفت و گۆت: (ئەڤە گازییا نەزانینێ چییە؟ پاشى گۆت: هەوە خێرە)، ئینا بەحسێ تەپلێدانا ل پاشییا یێ ئەنسارى ژ لایێ مشەختیڤە بۆ كر، گۆت: ئینا گۆت: (بهێلن ئەو كارەكێ پیسە).**

**و عەبدوللایێ كوڕێ ئوبەیێ كوڕێ سەلوولى گۆت: مادەم پشتەڤانییا ئێكدو دژى مە خواست، ئەگەر ئەم زڤرینە مەدینەیێ ئەوێت خودان قەدر و ماقویل و دەستهەلاتدار[2] دێ بێ قەدر و بێ دەستهەلاتان[3] دەرئێخن، ئینا عومەرى گۆت: ئەرێ ئەى پێغەمبەرێ خودێ ئەم ڤى پیسى نەكوژین؟ عەبدوللایى، ئینا پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (بلا خەلك نەبێژیت: ئەو هەڤالێت خۆ دكوژیت).**

## ٣ . باب: حديث الإفك

## بابەتێ: سەرهاتییا درەوا بێبەخت.

٣٦٤٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا أَرَادَ سَفَراً أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَعَهُ. قَالَتْ عائِشَةُ: فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا،

---

(١) ب دەستێ خۆ یا ب پێ خۆ یان ب شیرێ خۆ.

(٢) مەخسەدا وان ئەو ب خۆنە.

(٣) مەخسەدا وان پێغەمبەر و مشەختن.

فَخَرَجَ فِيهَا سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) بَعْدَ ما أُنْزِلَ الْحِجَابُ، فَكُنْتُ أُحْمَلُ فِي هَوْدَجِي وَأُنْزَلُ فِيهِ، فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ وَقَفَلَ، وَدَنَوْنَا مِنَ المَدِينَةِ قَافِلِينَ، آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ، فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ، فَمَشَيْتُ حَتَّى جاوَزْتُ الْجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى رَحْلِي، فَلَمَسْتُ صَدْرِي فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ ظَفَارِ قَدِ انْقَطَعَ، فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي، فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ.

قَالَتْ: وَأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذِينَ كانُوا يَرْحَلُونَ لِي، فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ عَلَيْهِ، وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنِّي فِيهِ، وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافاً لَمْ يَهْبُلْنَ، وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ، إِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ الْقَوْمُ خِفَّةَ الْهَوْدَجِ حِينَ رَفَعُوهُ وَحَمَلُوهُ، وَكُنْتُ جارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الْجَمَلَ فَسَارُوا، وَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَما اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنَازِلَهُمْ وَلَيْسَ بِهَا مِنْهُمْ دَاعٍ وَلاَ مُجِيبٌ، فَتَيَمَّمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ فِيهِ، وَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونَنِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ.

فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ فِي مَنْزِلِي، غَلَبَتْنِي عَيْنِي فَنِمْتُ، وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ المُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ، فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي، فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَعَرَفَنِي حِينَ رَآنِي، وَكَانَ رَآنِي قَبْلَ الْحِجَابِ، فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عَرَفَنِي، فَخَمَّرْتُ وَجْهِي بِجِلْبَابِي، وَوَاللهِ ما تَكَلَّمْنَا بِكَلِمَةٍ، وَلاَ سَمِعْتُ مِنْهُ كَلِمَةً غَيْرَ اسْتِرْجَاعِهِ، وَهَوَى حَتَّى أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، فَوَطِئَ عَلَى يَدِهَا، فَقُمْتُ إِلَيْهَا فَرَكِبْتُهَا، فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِيَ الرَّاحِلَةَ حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ مُوغِرِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ وَهُمْ نُزُولٌ.

قَالَتْ: فَهَلَكَ فِيَّ مَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى كِبْرَ الإِفْكِ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ.

قَالَ عُرْوَةُ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ كانَ يُشَاعُ وَيُتَحَدَّثُ بِهِ عِنْدَهُ، فَيُقِرُّهُ وَيَسْتَمِعهُ وَيَسْتَوْشِيهِ.

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقَدِمْنَا المَدِينَةَ، فَاشْتَكَيْتُ حِينَ قَدِمْتُ شَهْراً، وَالنَّاسُ يُفِيضُونَ فِي قَوْلِ أَصْحَابِ الإِفْكِ، لاَ أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذلِكَ، وَهُوَ يُرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لاَ أَعْرِفُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) اللُّطْفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَشْتَكِي، إِنَّمَا يَدْخُلُ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَيُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُولُ: (**كَيْفَ تِيكُمْ؟**)، ثُمَّ يَنْصَرِفُ، فَذلِكَ يَرِيبُنِي وَلاَ أَشْعُرُ بِالشَّرِّ. حَتَّى خَرَجْتُ حِينَ نَقَهْتُ، فَخَرَجْتُ مَعَ أُمِّ مِسْطَحٍ قِبَلَ المَنَاصِعِ، وَكَانَ مُتَبَرَّزَنَا، وَكُنَّا لاَ نَخْرُجُ إِلاَّ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ، وَذلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيباً مِنْ بُيُوتِنَا.

قَالَتْ: وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الأُوَلِ فِي الْبَرِّيَّةِ قِبَلَ الْغَائِطِ، وَكُنَّا نَتَأَذَّى بِالْكُنُفِ أَنْ نَتَّخِذَهَا عِنْدَ بُيُوتِنَا.

قَالَتْ: فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ، وَهْيَ ابْنَةُ أَبِي رُهْمِ بْنِ المطَّلِبِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَأُمُّهَا بِنْتُ صَخْرِ بْنِ عامِرٍ خالَةُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَابْنُهَا مِسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ بْنِ عَبَّادِ بْنِ المطَّلِبِ، فَأَقْبَلْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ

قِبَلَ بَيْتِي حِينَ فَرَغْنَا مِنْ شَأْنِنَا، فَعَثَرَتْ أُمُّ مِسْطَحٍ فِي مِرْطِهَا فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ ما قُلْتِ، أَتَسُبِّينَ رَجُلاً شَهِدَ بَدْراً؟ فَقَالَتْ: أَيْ هَنْتَاهُ! وَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالَ؟ قَالَتْ: وَقُلْتُ: وَمَا قَالَ؟ فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ، قَالَتْ: فَازْدَدْتُ مَرَضاً عَلَى مَرَضِي. فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: (**كَيْفَ تِيكُمْ**)؟ فَقُلْتُ لَهُ: أَتَأْذَنُ لِي أَنْ آتِيَ أَبَوَيَّ؟ قَالَتْ: وَأُرِيدُ أَنْ أَسْتَيْقِنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا.

قَالَتْ: فَأَذِنَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ لأُمِّي: يَا أُمَّتَاهُ ماذَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ؟ قَالَتْ: يا بُنَيَّةُ هَوِّنِي عَلَيْكِ، فَوَاللهِ لَقَلَّمَا كانَتِ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةً عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا، لَهَا ضَرَائِرُ، إِلاَّ أَكْثَرْنَ عَلَيْهَا. قَالَتْ: فَقُلْتُ: سُبْحَانَ اللهِ، أَوَلَقَدْ تَحَدَّثَ النَّاسُ بِهذَا؟ قَالَتْ: فَبَكَيْتُ تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ، وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، ثُمَّ أَصْبَحْتُ أَبْكِي...

قالَتْ: فَبَكَيْتُ يَوْمِي ذلِكَ كُلَّهُ لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ. قَالَتْ: وَأَصْبَحَ أَبَوَايَ عِنْدِي، وَقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْماً، لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، حَتَّى إِنِّي لأَظُنُّ أَنَّ الْبُكَاءَ فالِقٌ كَبِدِي، فَبَيْنَا أَبَوَايَ جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي، فَاسْتَأْذَنَتْ عَلَيَّ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا، فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي. قالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذلِكَ دَخَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَيْنَا، فَسَلَمَ ثُمَّ جَلَسَ، قَالَتْ: وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مُنْذ قِيلَ ما قِيلَ قَبْلَهَا، وَقَدْ لَبِثَ شَهْراً لاَ يُوحى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي بِشَيْءٍ، قالَتْ: فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَ جَلَسَ، ثُمَّ قالَ: (**أَمَّا بَعْدُ، يَا عِائِشَةُ إِنَّهُ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً، فَسَيُبَرِّئُكِ اللهُ، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ، فَاسْتَغْفِرِي اللهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ ثُمَّ تابَ، تَابَ اللهُ عَلَيْهِ**).

قَالَتْ: فَلَمَّا قَضى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَقَالَتَهُ، قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى ما أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً، فَقُلْتُ لأَبِي: أَجِبْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَنِّي فِيما قالَ، فَقَالَ أَبِي: وَاللهِ ما أَدْرِي ما أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ لأُمِّي: أَجِيبِي رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِيما قال، قالَتْ أُمِّي: وَاللهِ ما أَدْرِي ما أَقُولُ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَقُلْتُ، وَأَنَا جارِيَةٌ حَدِيثَةِ السِّنِّ لاَ أَقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ كَثِيراً: إِنِّي وَاللهِ لَقَدْ عَلِمْتُ: لَقَدْ سَمِعْتُمْ هَذَا الْحَدِيثَ حَتَّى اسْتَقَرَّ فِي أَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، فَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ: إِنِّي بَرِيئَةٌ، لاَ تُصَدِّقُونَنِي، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ، وَاللهُ يَعْلَمُ أَنِّي مِنْهُ بَرِيئَةٌ، لَتُصَدِّقُنِّي! فَوَاللهِ لاَ أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلاً إِلاَّ أَبَا يُوسُفَ حِينَ قَالَ: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ [يوسف:١٨].

ثُمَّ تَحَوَّلْتُ وَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِي، وَاللهُ يَعْلَمُ أَنِّي حِينَئِذٍ بَرِيئَةٌ، وَأَنَّ اللهَ مُبَرِّئِي بِبَرَاءَتِي، وَلَكِنْ وَاللهِ ما كُنْتُ أَظُنُّ أَنَّ اللهَ مُنْزِلٌ فِي شَأْنِي وَحْياً يُتْلَى، لَشَأْنِي فِي نَفْسِي كَانَ أَحْقَرَ مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللهُ فِيَّ بِأَمْرٍ، وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللهُ بِهَا. فَوَاللهِ مَا رَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مَجْلِسَهُ، وَلاَ خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ، حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِنَ الْعَرَقِ مِثْلُ الجُمَانِ، وَهْوَ فِي يَوْمٍ شَاتٍ، مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْهِ، قَالَتْ: فَسُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَهْوَ يَضْحَكُ، فَكَانَتْ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ: (**يَا عائِشَةُ، أَمَّا اللهُ فَقَدْ بَرَّأَكِ**).

قَالَتْ: فَقَالَتْ لِي أُمِّي: قُومِي إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: وَاللهِ لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ، فَإِنِّي لاَ أَحْمَدُ إِلاَّ اللهَ عزّ وجل.

قَالَتْ: وَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾[النور:١١] الْعَشْرَ الآيَاتِ، ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ هذَا فِي بَرَاءَتِي. [خ٤١٤١/ م٢٧٧٠].

**ژ عائيشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر وەغەرەك ل بەر با پشككانێ د ناڤبەرا هەڤژینێت خۆدا دكر، ڤێجا پشكا كێ دەركەفتبا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو دگەل خۆ دبر. عائيشایێ گۆت: پشككانێ د خەزايەكێدا د ناڤبەرا مەدا كر، پشكا من دەركەفت، ئەز دگەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفتم پشتی فەرمانا پەردەپۆشییێ هاتی، و ئەز ب معا فا منڤە هەلدگرتم و ددانام، ڤێجا ئەم چۆین هەتا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ وێ خەزايا خۆ ب دویماهی هاتی و زڤری، و ئەم نێزیكی مەدینەیێ بووین، و د زڤرینێدا د شەڤەكێدا ب چۆنێ ئاگەهدار كرن، ئەز رابووم دەمێ ئاگەهداركرن ب چۆنێ دایی و ئەز چۆم هەتا ژ لەشكەری بۆریم، ڤێجا دەمێ من هەوجەییا خۆ قەتاندی ئەز هاتمە جهێ خۆ من دەستێ خۆ كرە سینگێ خۆ من دیت رستكا من یا مۆریكێت زیفارێ (گوندەكێ یەمەنێیە) یا قەتیای، ئینا ئەز زڤریم ل رستكا خۆ گەریام و داخوازا رستكێ ئەز راگرتم و گیرۆ كرم.**

عائیشایێ گۆت: ئەو كۆما[1] مرۆڤان ئەوێت معافا من بار دكر، معافا من بار كر دانا سەر پشتا وێ حێشترا ئەز لێ سویار دبووم و وان هزر دكر ئەز یا تێدا، و د وی دەمیدا ژن د سڤك و لاواز بوون و تێر گۆشت و بەز نەبوون، چونكی وان كێمەك ژ خوارنێ دخوار، و گۆشتی نەگرتبوون، و د قەلەو نەبوون، و ب سڤكییا معافا من وان نەزانی ئەز نەتێدا مە، و ئەز كچەكا كێم عەمر بووم، و وان حێشتر راكر و چۆن، و من رستكا خۆ دیت بەلێ پشتی لەشكەر چۆی، و ئەز هاتمە جهێ وان و كەس ژ وان ل وێرێ نەبوو گازی بكەت یان بەرسڤێ بدەت، و من بەرێ خۆ دا وی جهێ ئەز لێ، و من هزر كر دێ پرسیارا من كەن و دێ ل من زڤرن؟

د دەمەكیدا ئەز ل جهێ خۆ یا روینشتی بووم ئەز نەشیامە چاڤێت خۆ و ئەز نڤستم، و سەفوانێ كورێ موعەتتیلێ سولەمی پاشی یێ زەكوانی ل پشت لەشكەری بوو، سپێدێ هاتە دەڤ جهێ من، رەشاتییەكا مرۆڤەكێ نڤستی دیت، دەمێ ئەز دیتیم ئەز نیاسیم، وی بەری فەرزبوونا پەردەپۆشییێ ئەز دیتبووم، و ب گۆتنا وی: (إنا لله وإنا إليه راجعون) ئەز هشیار بووم، دەمێ ئەز نیاسیم من ناڤچاڤێت خۆ ب عەبایێ خۆ گرتن، و ئەز ب خودێ كەمە ب پەیڤەكێ ئەم نەئاخفتین، و من پەیڤەك ژ وی گوه لێ نەبوو، پشتی گۆتنا وی: (إنا لله وإنا إليه راجعون)، و لەز كر هەتا حێشترا خۆ دانای، و پێ ل دەستێ وێ دانا[2] و ئەز رابووم لێ سویار بووم و چۆ و سەرێ حێشترێ كێشا هەتا ئەم د گەرمەگەرما رۆژێدا گەهشتینە لەشكەری، و وان دانابوو بێهنا خۆ ڤەددا.

عائیشایێ گۆت: ئەو ژ ناڤ چۆن یێت درەو ب سەر منڤە نای و بێبەختی كری و یێ سەركێشیا بێبەختییێ كری عەبدوللایێ كورێ ئوبەیێ كورێ سەلوولی بوو.

عوروەیی گۆت: گەهشتە من ئەو بێبەختی دهاتە بەلاڤكرن و ل دەڤ وی سوحبەت دهاتە كرن و پەسند دكر و گوهێ خۆ ددا یێ و ل دویڤ د چۆ و پتر ئاخفتن ژ وی دەردئێخستن یێ ئەڤ سوحبەتە دكر.

---

(١) ژ سێ كەسان پێك دهاتن هەتا دەهان.

(٢) دا هەوجەی وی نەبیت دەمێ ل حێشترێ سویار دبیت.

عائیشەیێ گۆت: ئەم هاتینە مەدینەیێ و دەمێ ئەم هاتین، ئەز هەیڤەكێ نەساخ بووم، و خەلكی ئاخفتنا خودانێت بێبەختییێ دگۆت، و من هەست ب تشتەكی ژ هندێ نەكر، و تشتێ گۆمان بۆ من چێ كری ئەز وێ باشی و نەرمییێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نابینم ئەوا من ژێ ددیت دەمێ ئەز نەساخ دبووم، بەس پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دا هێتە دەڤ من و پاشی دگۆت: **(تو یا چاوایی)؟** پاشی دا چیت، ئەڤێ ئەز ب گۆمان ئێخستم و من هەست ب خرابییێ نەدكر، هەتا ئەز دەركەفتیم پشتی ئەز پیچەكێ ب سەرخۆڤە هاتیم و ل سەر من سڤك بووی، ئەز د گەل دایكا میستەحی بۆ لایێ مەناسع دەركەفتین، و ئەو جهێ دەستئاڤێت مە بوو، و ئەم دەرنەدكەفتین شەڤێ بۆ شەڤێ نەبیت، و ئەڤە بەری ئەم جهێ دەستئاڤان یێت گرتی نێزیكی مالێت خۆ چێ كەین. عائیشایێ گۆت: و رەوشا مە وەكی رەوشا عەرەبێت بەرێ بوو ل دەشتێ كا چاوا د چۆنە دەستئاڤا، و ئەز یەتا مە دبوو دەمێ مە جهێ دەستئاڤان ل نێزیكی مالێت خۆ چێكربان.

عائیشایێ گۆت: ئەز و دایكا میستەحی دەركەفتین و چۆین و ئەو كچا ئەبی روهمێ كورێ موتتەلبێ كورێ عەبد مەنافییە، و دایكا وێ كچا سەخرێ كورێ عامرییە خالەتا ئەبی بەكرێ سەددیقییە و كورێ وێ میستەحێ كورێ ئوسا سەیێ كورێ عەببادێ كورێ موتتەلبییە، و ئەز و دایكا میستەحی بەرەڤ مالا مەڤە هاتین دەمێ مە هەوجەییا خۆ ڤەتاندی، دایكا میستەحی ل پاتێ سەر خۆ هەلنگفت ئینا گۆت: میستەح ژ ناڤ بچیت، (د هیلاك بچیت ) ئینا من گۆت: خرابترین تشت بوو تە گۆتی: تو خەبەرا دبێژییە زەلامەكی پشكداری د بەدرێدا كری. ئینا گۆت: ئەی فلا نێ ما تە گوه لێ نەبوویە كا چ گۆتییە؟ عائیشایێ گۆت: و من گۆت: و ما چ گۆتییە؟ ئینا ئاخفتنا خودانێت بێبەختییێ بۆ من گۆت، عائیشایێ گۆت: نەساخییەكا دی ل سەر نەساخییا من زێدە بوو، ڤێجا دەمێ ئەز زڤریمە مالا خۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ من و سلاڤ كر و پاشی گۆت: **(تو یا چاوایی)؟** ئینا من گۆتێ: دەستویرییا من بدە بچمە دەڤ دایبابێت خۆ؟ و من دڤیا ئەز راستییا ڤێ ئاخفتنێ ژ وان بزانم.

عائیشایێ گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستویرییا من دا، ئینا من گۆتە دایكا خۆ، ئەی دایكا من خەلك ب چ دئاخڤیت؟ گۆت: ئەی كچا من ل سەر خۆ سڤك بكە، ئەز

ب خودێ كەمە كێم ژن یێت هەین یێت جوان بن و ل دەڤ زەلامەكی بن حەژێ بكەت و وێ هەوی هەبن ئەڤ ئاخفتنێت زێدە ل سەر نەكەن، عائیشایێ گۆت: ئینا من گۆت: پاكی و پاقژی بۆ خودێ بن ئەرێ خەلك ب ڤێ ژی ئاخفتییە؟! گۆت: وێ شەڤێ هەمییێ ئەز مام و من هەتا سپێدێ دكرە گری و رۆندكێت من نەدراوەستان و خەو نەكەفتە چاڤێ من، پاشی سپێدە ل من بوو و هەر من كرە گری.

عائیشایێ گۆت: وێ رۆژێ هەمییێ من دكرە گری و رۆندكێت من نەرادوەستیان، و خەو ب چاڤێ من نەكەڤت، عائیشایێ گۆت: و دایبابێت من ل دەڤ من بوون، و دو شەڤ و رۆژەكان من دكرە گری، و رۆندكێت من نەرادوەستان و خەو ب چاڤێت من ناكەڤیت، هەتا من هزر كر، گری دێ مێلاكا من كەركەت، وەختەكی دایبابێت من ل دەڤ من د روینشتی بوون، و من دكرە گری ژ نەكا ئەنساری دەستویری خواست بهێتە دەڤ، من دەستویری دایێ، هات روینشت و دگەل من كرە گری و ئەم د هۆسا بووین، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە ژۆر دەڤ مە، و سلاڤ كر و پاشی روینشت، عائیشایێ گۆت: و بەری نوكە ل دەڤ من نەدروینشت ل وی دەمێ ئەو بێبەختی هاتییە گۆتن، و ئەز هەیڤەكێ مام وەحی د راستا مندا بۆ نەهات، گۆت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ روینشتی شەهدە دا و پاشی گۆت: **(و پاشی ڤێ: ئەی عائیشا ئەڤە و ئەڤە د راستا تەدا یا گەهشتییە من، ڤێجا ئەگەر تو یا بێ گونەهی خودێ دێ بێگونەهییا تە دیار كەت، و ئەگەر تە گونەهەك ژی كربیت داخوازا گونەهـ ژێبرنێ ژ خودێ بكە، و ل خودێ بزڤرە، ب راستی ئەگەر بەندەیی گونەهـ ل سەر خۆ ئاشكەرا كر و پاشی تۆبە كر خودێ دێ تەوبەیێ دەتە سەر)**.

گۆت: ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئاخفتنا خۆ ب دویماهی ئینای رۆندكێت من هشك بوون، و هەتا من هەست ب چیكەكێ ژی نەما، ئینا من گۆتە بابێ خۆ: پێش منڤە بەرسڤا پێغەمبەرێ خودێ بدە ل سەر وێ ئاخفتنا گۆتی، ئینا بابێ من گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەز نوزانم دێ چ بێژمە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا من گۆتە دایكا خۆ: پێش منڤە بەرسڤا پێغەمبەرێ خودێ بدە ل سەر وێ ئاخفتنا گۆتی، دایكا من گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەز نوزانم دێ چ بێژمە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا من گۆت و ئەز كچەكا بچویك بووم من گەلەك ژ قورئانێ نەخواندبوو: ئەز ب خودێ كەمە ب راستی

ئەز دزانم هەوە ئەو سوحبەت يا گوهـ لێ بووی و د هزرا هەوەدا يا بنەجهـ بووی و هەوە يا ژێ باوەر كری، و ئەگەر ئەز بێژمە هەوە: ئەز يا بێگونەهم هوين باوەر ژ من ناكەن، و ئەگەر ئەز كارەكی ل سەر خۆ بحەقينم و خودێ دزانيت ئەز يا ژێ بەريمە دێ باوەر ژ من كەن، و ئەز ب خودێ كەمە ئەز بۆ خۆ و بۆ هەوە چو مەتەلان نابينم ئەو نەبيت يا بابێ يووسفی دەمێ گۆتی: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ).

پاشی من بەرێ خۆ وەرگێرا و من خۆ ل سەر نڤينێت خۆ درێژ كر، و خودێ دزانيت ئەز د وی دەميدا يا بێگونەهم و خودێ دێ من بەريكەت، بەلێ ئەز ب خودێ كەمە من هزر نەدكر خودێ دێ قورئانێ د راستا مندا ئينيتە خوارێ و بهێتە خواندن، كارێ من د هزرا مندا ژ هندێ كێمترە خودێ د راستا مندا باخڤيت، بەلێ من هيڤی هەبوو پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەونەكێ ببينيت خودێ من پێ بێگونەهـ ئاشكەرا بكەت، ئەز ب خودێ كەمە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) جهێ خۆ بەرنەدا و كەسەك ژ مالێ دەرنەكەفت هەتا وەحی بۆ هاتييە خوارێ، ڤێجا وی ئەو گرت يا ژ دژوارييێ دگرت ژ هاتنا وەحييێ هەتا چيكێت خوهێ وەكی مۆركێت لولو يان ڤێدا دهاتن، و ئەو ل رۆژەكا زڤستانێ ژ گرانييا وێ وەحيا بۆ دهاتە خوارێ، عائيشايێ گۆت: وەحييێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەردا و وی دكرە كەنی، ئينا ئاخفتنا ئێكێ پێ ئاخفتی گۆت: **(ئەی عائيشا، ئەز ب خودێ كەمە خودێ تو بەری و بێگونەهـ كری).**

عائيشايێ گۆت: ئينا دايكا من گۆتە من: پێش پێغەمبەريڤە رابە، ئينا من گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەز بۆ وی نارابم، ب راستی ئەز سوپاسی و حەمدا ئێكی ناكەم يا خودايێ هەر ب هێز و مەزن نەبيت.

عائيشايێ گۆت: و خودايێ بلند ئەڤە ئينا خوارێ (إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْۚ) هەتا دەهـ ئايەتان و پاشی خودێ ئەڤە د بێگونەهييا مندا ئينانە خوار.

## ٤ . باب: سرية سيف البحر

## بابەتێ: سريا بەر رەخێ دەريايی.

٣٦٥٠ – (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ (ﷺ) ثَلاَثَمِائَةِ رَاكِبٍ، وَأَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ، نَرْصُدُ عِيراً لِقُرَيْشٍ، فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ حَتَّى أَكَلْنَا الخَبَطَ، فَسُمِّيَ جَيْشَ الخَبَطِ، وَأَلْقَى الْبَحْرُ حُوتاً يُقَالُ لَهُ الْعَنْبَرُ، فَأَكَلْنَا نِصْفَ شَهْرٍ وَادَّهَنَّا بِوَدَكِهِ، حَتَّى صَلَحَتْ أَجْسَامُنَا. قَالَ: فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلَعاً مِنْ أَضْلاَعِهِ فَنَصَبَهُ، فَمَرَّ الرَّاكِبُ تَحْتَهُ. وَكَانَ فِينَا رَجُلٌ، فَلَمَّا اشْتَدَّ الجُوعُ نَحَرَ ثَلاَثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ ثَلاَثَ جَزَائِرَ، ثُمَّ نَهَاهُ أَبُو عُبَيْدَةَ. [خ٥٤٩٤ (٢٤٨٣)/ م١٩٣٥].

وفي رواية للبخاري: قال: فَخَرَجْنَا، وَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ فَنِيَ الزَّادُ، فَأَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِأَزْوَادِ الجَيْشِ فَجُمِعَ، فَكَانَ مِزْوَدَيْ تَمْرٍ، فَكَانَ يُقَوِّتُنَا كُلَّ يَوْمٍ قَلِيلاً قَلِيلاً حَتَّى فَنِيَ، فَلَمْ يَكُنْ يُصِيبُنَا إِلاَّ تَمْرَةٌ تَمْرَةٌ، فَقُلْتُ: ما تُغْنِي عَنْكُمْ تَمْرَةٌ؟ فَقَالَ: لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَنِيَتْ، ثُمَّ انْتَهَيْنَا إِلَى الْبَحْرِ، فإذا حوتٌ مثلُ الظَّرِبِ. [خ٤٣٦٠].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللايی (خودێ ژ وان رازی بيت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ئەم سێ سەد سويار هنارتين و سەردارێ مە ئەبو عوبەيدە بوو مە زێرەڤانيا كاروانەكێ قورەيشيیان دكر، بر سەكا دژوار ئەم گرتين هەتا مە بەلگ خوارين، ئەو لەشكەر ب لەشكەرێ بەلگەيان هاتە ناڤكرن، و دەريایی نەهەنگەكێ مەزن هاڤێتبوو دگۆتنێ عەنبەر، ئينا مە نيڤ هەيڤێ خوار و مە بەزێ وی بۆ خۆ كرە روين هەتا لەشێت مە ساخلەم بووين، گۆت: ئەبو عوبەيدەیی پەراسييەك ژ پەراسييێت وی هەلگرت و چكلاند سويار د بنڕا چۆ، و زەلامەك د گەل مە بوو، ڤێجا دەمێ برس دژوار بووی سێ حێشتر ڤەكوشتن، پاشی سێ حێشترێت دی، پاشی ئەبو عوبەيدەی پاشڤە لێدا.**

**و د ڤەگێڕەكا بوخاريدا: گۆت: ئەم دەركەفتين و ئەم د پشكەكا رێكێدا بووين، خوارن نەما، ئينا ئەبو عوبەيدە فەرمان دا خوارنا لەشكەری بينن و كۆم كر و خوارنا من قەسپ بوون، ڤێجا هەرۆ كێمەك ژێ ددا مە هەتا ئەو ژی نەمای، و ژ قەسپەكێ پێڤەتر نەدگەهشتە مە، من گۆت: ما قەسپەكێ چ مفا دگەهاندە هەوە؟ ئينا گۆت: دەمێ قەسپ نەماين ژ نوی ئەم ب نەمانا وان حەسياين و كا چ مفا هەبوو، پاشی ئەم گەهشتينە دەريای مە هند ديت نەهەنگەكێ وەكی چيايەكێ بچويكە.**

❀❀❀❀❀❀❀❀❀❀

## الفصل الثامن: صلح الحديبية وما بعده

## پشكا هەشتێ: پێكهاتنا حودەیبییێ و ئەڤا پشتی وێ

### ١ . باب: فضل أصحاب بيعة الرضوان

### بابەتێ: بهایێ خودانێت بەیعەتا رزوان.

٣٦٥١ - (خ) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قالَ: تَعُدُّونَ أَنْتُمُ الْفَتْحَ فَتْحَ مَكَّةَ، وَقَدْ كانَ فَتْحُ مَكَّةَ فَتْحاً، وَنَحْنُ نَعُدُّ الْفَتْحَ بَيْعَةَ الرِّضْوَانِ يَوْمَ الحُدَيْبِيَةِ، كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً، وَالْحُدَيْبِيَةُ بِئْرٌ، فَنَزَحْنَاهَا فَلَمْ نَتْرُكْ فِيهَا قَطْرَةً، فَبَلَغَ ذلِكَ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَتَاهَا، فَجَلَسَ عَلَى شَفِيرِهَا، ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ ماءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَدَعَا ثُمَّ صَبَّهُ فِيهَا، فَتَرَكْنَاهَا غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ إِنَّهَا أَصْدَرَتْنَا ما شِئْنَا نَحْنُ وَرِكَابَنَا.

[خ٤١٥٠ (٣٥٧٧)].

**ژ بەرائی (رضي الله عنه) گۆت: هوین ڤەكرنا مەكەهێ ڤەكرن ددانن، و ب راستی ڤەكرنا مەكەهێ ڤەكرنەك بوو، و مە بەیعەتا رزوان ڤەكرن دهەژمارت، ئەم هزار و چوار سەد د گەل پێغەمبەری بووین (ﷺ)، و حودەیبییە بیرەك بوو و مە ئاڤا وێ كێشا و مە چپكەك تێدا نەهێلا، ئەڤە گەهشتە پێغەمبەری (ﷺ)، هاتە سەر بیرێ و ل سەر لێڤا وێ روینشت و پاشی داخوازا ئامانەكێ ئاڤێ كر و دەستنڤێژا خۆ گرت و پاشی ئاڤ د دەڤێ خۆ وەردا و دوعا كرن، و پاشی ئەو ئاڤ كرە د بیرێدا و مە هێلا دەمەكێ نەیێ درێژ، پاشی ئەو زڤراند ئەو ئاڤا مە و حێشترێت مە ڤیایی دا مە.**

٣٦٥٢ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي أُمُّ مُبَشِّرٍ: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ عِنْدَ حَفْصَةَ: (**لاَ يَدْخُلُ النَّارَ إِنْ شَاءَ اللهُ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ أَحَدٌ، الَّذِينَ بَايَعُوا تَحْتَهَا**) قَالَتْ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ! فَانْتَهَرَهَا. فَقَالَتْ حَفْصَةُ: ﴿وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ [مريم:٧١] فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**قَدْ قَالَ اللهُ عزّ وجل**: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيّٗا﴾ [مريم]). [م٢٤٩٦].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دایكا موبەشیری گۆتە وی: وێ گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) وی ل دەڤ حەفسایێ د گۆت: (ئێك ژ هەڤالێت دارێ ب ئانەهیا خودێ نا چیتە جەهنەمێ ئەوێت ل بن وێ پەیمان دایی). حەفسایێ گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ دێ چن! ئینا پاشڤە بر، حەفسایێ گۆت:**

**﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ ئیـنا پێغەمـبەری (ﷺ) گۆت: ( خودایێ هەر ب هێز و مەزن گۆتییە: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيّاً﴾[١].**

٣٦٥٣ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ: (أَنْتُمْ خَيْرُ أَهْلِ الأَرْضِ) وَكُنَّا أَلْفاً وَأَرْبَعَمَائَةٍ، وَلَوْ كُنْتُ أُبْصِرُ الْيَوْمَ لأَرَيْتُكُمْ مَكَانَ الشَّجَرَةِ.[خ٤١٥٤ (٣٥٧٦)/ م١٨٥٦].

**ژ جابرێ كوڕێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا حودەیبییێ گۆتە مە: (هوین باشترینێ خەلكێ عەردینە) و ئەم هزار و چوار سەد بووین، و ئەگەر من دیتبا ئەز دا جهێ وێ دارێ نیشا هەوە دەم.**

٣٦٥٤ - (ق) عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ: عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى الموْتِ. [خ٤١٦٩ (٢٩٦٠)/ م١٨٦٠].

**ژ یەزیدێ كوڕێ ئەبی عوبەیدی (رحمه الله) گۆت: من گۆتە سەلەمەیێ كوڕێ ئەكوەعی هەوە ل سەر چ ل رۆژا حودەیبییێ پەیمان دانە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)؟ گۆت: ل سەر مرنێ.**

٣٦٥٥ - (م) عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي يَوْمَ الشَّجَرَةِ، وَالنَّبِيُّ (ﷺ) يُبَايِعُ النَّاسَ، وَأَنَا رَافِعٌ غصْناً مِنْ أَغْصَانِهَا عَنْ رَأْسِهِ، وَنَحْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً. قَالَ: لَمْ نُبَايِعْهُ عَلَى الْمَوْتِ، وَلَكِنْ بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لاَ نَفِرَّ. [م١٨٥٨].

**ژ مەعقیلێ كوڕێ یەساری (رضي الله عنه) گۆت: ئەگەر تە ئەز رۆژا دارێ دیتبام و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) پەیمان ژ خەلكی وەردگرت، و من تایەك ژ تایێت وێ ژ هنداڤی سەرێ وی بلند كربوو، و ئەم هزار و چوار سەد بووین، گۆت: مە پەیمان ل سەر مرنێ نەدابوویێ بەلێ مە پەیمان ل سەر نەرەڤینێ دابوویێ.**

---

(١) حەفسایێ (رضي الله عنها) ژ تێگەهشتنا خۆ بۆ وێ ئایەتێ دیار كر دێ چنە جەهنەمێ، بەلێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) باشڤە بر و تێگەهشتنا وێ ب ئایەتا دی بۆ دورست كر.

## ٢ . باب: مفاوضات الصلح وكتابته

## بابەتێ: دانوستاندنێت پێكهاتنێ و نڤیسینا وێ.

٣٦٥٦ - (خ) عَنْ مَعْمَرٍ قالَ: أَخْبَرَنِي الزُّهْرِيُّ قالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ وَمَرْوَانَ . يُصَدِّقُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا حَدِيثَ صَاحِبِهِ . قَالاَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) زَمَنَ الحُدَيْبِيَةِ، حَتَّى إذا كانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ خالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ بِالْغَمِيمِ، في خَيْلٍ لِقُرَيْشٍ طَلِيعَةً، فَخُذُوا ذَاتَ الْيَمِينِ)**.

فَوَاللهِ ما شَعَرَ بِهِمْ خَالِدٌ حَتَّى إِذَا هُمْ بِقَتَرَةِ الجَيْشِ، فَانْطَلَقَ يَرْكُض نَذِيراً لِقُرَيْشٍ، وَسَارَ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى إِذَا كانَ بِالثَّنِيَّةِ الَّتِي يُهْبَطُ عَلَيْهِمْ مِنْهَا، بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ، فَقَالَ النَّاسُ: حَلْ حَلْ، فَأَلَحَّتْ، فَقَالُوا خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ، خَلأَتِ القَصْوَاءُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(ما خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ، وَمَا ذَاكَ لَهَا بِخُلُقٍ، وَلكِنْ حَبَسَهَا حابِسُ الْفِيلِ)**. ثُمَّ قَالَ: **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يَسْأَلُونَنِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُماتِ اللهِ؛ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا)** ، ثُمَّ زَجَرَهَا فَوَثَبَتْ.

قالَ: فَعَدَلَ عَنْهُمْ حَتَّى نَزَلَ بِأَقْصى الحُدَيْبِيَةِ عَلَى ثَمَدٍ قَلِيلِ الماءِ، يَتَبَرَّضُهُ النَّاسُ تَبَرُّضاً، فَلَمْ يُلَبِّثْهُ النَّاسُ حَتَّى نَزَحُوهُ، وَشُكِيَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الْعَطَشُ، فَانْتَزَعَ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِهِ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهُ فِيهِ، فَوَاللهِ ما زَالَ يَجِيشُ لَهُمْ بِالرِّيِّ حَتَّى صَدَرُوا عَنْهُ.

فَبَيْنَمَا هُمْ كَذلِكَ، إِذْ جاءَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ الخُزَاعِيُّ فِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِهِ مِنْ خُزَاعَةَ . وَكَانُوا عَيْبَةَ نُصْحِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنْ أَهْلِ تِهَامَةَ . فَقَالَ: إِنِّي تَرَكْتُ كَعْبَ بْنَ لُؤَيٍّ وَعَامِرَ بْنَ لُؤَيٍّ نَزَلُوا أَعْدَادَ مِيَاهِ الحُدَيْبِيَةِ، وَمَعَهُمُ الْعُوذُ المطَافِيلُ ، وَهُمْ مُقَاتِلُوكَ وَصَادُّوكَ عَنِ الْبَيْتِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّا لَمْ نَجِئْ لِقِتَالِ أَحَدٍ، وَلكِنَّا جِئْنَا مُعْتَمِرِينَ، وَإِنَّ قُرَيْشاً قَدْ نَهِكَتْهُمُ الحَرْبُ، وَأَضَرَّتْ بِهِمْ، فَإِنْ شَاؤُوا مادَدْتُهُمْ مُدَّةً، وَيُخَلُّوا بَيْنِي وَبَيْنَ النَّاسِ، فَإِنْ أَظْهَرْ: فَإِنْ شَاؤُوا أَنْ يَدْخُلُوا فِيمَا دَخَلَ فِيهِ النَّاسُ فَعَلُوا؛ وَإِلاَّ فَقَدْ جَمُّوا، وَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأُقَاتِلَنَّهُمْ عَلَى أَمْرِي هَذَا حَتَّى تَنْفَرِدَ سَالِفَتِي، وَلَيُنْفِذَنَّ اللهُ أَمْرَهُ)**. فَقَالَ بُدَيْلٌ: سَأُبَلِّغُهُمْ ما تَقُولُ.

قَالَ: فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى قُرَيْشاً، قالَ: إِنَّا قَدْ جِئْنَاكُمْ مِنْ هَذَا الرَّجُلِ، وَسَمِعْنَاهُ يَقُول قَوْلاً، فَإِنْ شِئْتُمْ أَنْ نَعْرِضَهُ عَلَيْكُمْ فَعَلْنَا، فَقَالَ سُفَهَاؤُهُمْ: لاَ حاجَةَ لَنَا أَنْ تُخْبِرَنَا عَنْهُ بِشَيْءٍ، وَقَالَ ذَوُو الرَّأْيِ مِنْهُمْ: هَاتِ ما سَمِعْتَهُ يَقُولُ، قالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا، فَحَدَّثَهُمْ بِمَا قالَ النَّبِيُّ (ﷺ).

فَقَامَ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ، أَلَسْتُمْ بِالْوَالِدِ؟ قالُوا: بَلَى، قالَ: أَوَلَسْتُ بِالْوَلَدِ؟ قالُوا: بَلَى، قالَ: فَهَلْ تَتَّهِمُونَنِي؟ قالوا: لاَ، قالَ: أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنِّي اسْتَنْفَرْتُ أَهْلَ عُكَاظٍ، فَلَمَّا بَلَّحُوا عَلَيَّ جِئْتُكُمْ بِأَهْلِي وَوَلَدِي وَمَنْ أَطَاعَنِي؟ قالُوا: بَلَى، قالَ: فَإِنَّ هذَا قَدْ عَرَضَ لَكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ، اقْبَلُوهَا وَدَعُونِي آتِيهِ، قالُوا: ائتِهِ، فَأَتَاهُ، فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) نَحْواً مِنْ قَوْلِهِ لِبُدَيْلٍ، فَقَالَ عُرْوَةُ عِنْدَ ذلِكَ: أَيْ مُحَمَّدُ، أَرَأَيْتَ إِنِ اسْتَأْصَلْتَ أَمْرَ قَوْمِكَ، هَلْ سَمِعْتَ بِأَحَدٍ مِنَ الْعَرَبِ اجْتَاحَ أَهْلَهُ قَبْلَكَ؟ وَإِنْ تَكُنِ الأُخْرَى، فَإِنِّي وَاللهِ لا أَرَى وُجُوهاً، وَإِنِّي لأَرَى أَشْوَاباً مِنَ النَّاسِ خَلِيقاً أَنْ يَفِرُّوا وَيَدَعُوكَ. فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: امْصُصْ بِبَظْرِ اللاَّتِ، أَنَحْنُ نَفِرُّ عَنْهُ وَنَدَعُهُ؟ فَقَالَ: مَنْ ذَا؟ قالُوا: أَبُو بَكْرٍ، قالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلاَ يَدٌ كانَتْ لَكَ عِنْدِي لَمْ أَجْزِكَ بِهَا لأَجَبْتُكَ. قَالَ: وَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَكُلَّمَا تَكَلَّمَ أَخَذَ بِلِحْيَتِهِ، وَالمغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قائِمٌ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَمَعَهُ السَّيْفُ وَعَلَيْهِ الْمِغْفَرُ، فَكُلَّمَا أَهْوَى عُرْوَةُ بِيَدِهِ إِلَى لِحْيَةِ النَّبِيِّ (ﷺ) ضَرَبَ يَدَهُ بِنَعْلِ السَّيْفِ، وَقَالَ لَهُ: أَخِّرْ يَدَكَ عَنْ لِحْيَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَرَفَعَ عُرْوَةُ رَأْسَهُ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: المغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَقَالَ: أَيْ غُدَرُ! أَلَسْتُ أَسْعَى فِي غَدْرَتِكَ.

وَكَانَ المغِيرَةُ صَحِبَ قَوْماً فِي الجَاهِلِيَّةِ فَقَتَلَهُمْ، وَأَخَذَ أَمْوَالَهُمْ، ثُمَّ جاءَ فَأَسْلَمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَمَّا الإِسْلاَمَ فَأَقْبَلُ، وَأَمَّا المَالَ فَلَسْتُ مِنْهُ فِي شَيْءٍ)**.

ثُمَّ إِنَّ عُرْوَةَ جَعَلَ يَرْمُقُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِعَيْنَيْهِ، قالَ: فَوَاللهِ ما تَنَخَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) نُخَامَةً؛ إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ، وَإِذَا أَمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ، وَإِذَا تَوَضَّأَ كادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ، وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ، وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيماً لَهُ.

فَرَجَعَ عُرْوَةُ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: أَيْ قَوْمِ، وَاللهِ لَقَدْ وَفَدْتُ عَلَى الملُوكِ، وَوَفَدْتُ عَلَى قَيْصَرَ وَكِسْرَى وَالنَّجَاشِيِّ. وَاللهِ إِنْ رَأَيْتُ مَلِكاً قَطُّ يُعَظِّمُهُ أَصْحَابُهُ مَا يُعَظِّمُ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) مُحَمَّداً. وَاللهِ إِنْ تَنَخَّمَ نُخَامَةً؛ إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ، وَإِذَا أَمَرَهُمُ ابْتَدَرُوا أَمْرَهُ، وَإِذَا تَوَضَّأَ كادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ، وَإِذَا تَكَلَّمَ خَفَضُوا أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَهُ، وَمَا يُحِدُّونَ إِلَيْهِ النَّظَرَ تَعْظِيماً لَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ عَرَضَ عَلَيْكُمْ خُطَّةَ رُشْدٍ فَاقْبَلُوهَا.

فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي كِنَانَةَ: دَعُونِي آتِيهِ، فَقَالُوا: ائْتِهِ، فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَأَصْحَابِهِ، قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(هَذَا فُلاَنٌ، وَهْوَ مِنْ قَوْمٍ يُعَظِّمُونَ الْبُدْنَ، فَابْعَثُوهَا لَهُ)**. فَبُعِثَتْ لَهُ، وَاسْتَقْبَلَهُ

النَّاسُ يُلَبُّونَ، فَلَمَّا رَأَى ذلِكَ قالَ: سُبْحَانَ اللهِ! ما يَنْبَغِي لِهؤُلاَءِ أَنْ يُصَدُّوا عَنِ الْبَيْتِ، فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى أَصْحَابِهِ قالَ: رَأَيْتُ الْبُدْنَ قَدْ قُلِّدَتْ وَأُشْعِرَتْ، فَمَا أَرَى أَنْ يُصَدُّوا عَنِ الْبَيْتِ.

فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ، يُقَالُ لَهُ مِكْرَزُ بْنُ حَفْصٍ، فَقَالَ: دَعُونِي آتِيهِ، فَقَالُوا ائْتِهِ، فَلَمَّا أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ، قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(هَذَا مِكْرَزٌ، وَهْوَ رَجُلٌ فاجِرٌ)**. فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَبَيْنَما هُوَ يُكَلِّمُهُ إِذْ جاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو.

قالَ مَعْمَرٌ: فَأَخْبَرَنِي أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ: أَنَّهُ لَمَّا جاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لَقَدْ سَهُلَ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ)**.

قَالَ مَعْمَرٌ: قالَ الزُّهْرِيُّ فِي حَدِيثِهِ: فَجَاءَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فَقَالَ: هَاتِ اكْتُبْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَاباً، فَدَعا النَّبِيُّ (ﷺ) الْكَاتِبَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ)**. قالَ سُهَيْلٌ: أَمَّا الرَّحْمنُ، فَوَاللهِ مَا أَدْرِي مَا هُوَ، وَلكِنِ اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ كما كُنْتَ تَكْتُبُ، فَقَالَ المسْلِمُونَ: وَاللهِ لاَ نَكْتُبُهَا إِلاَّ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اكْتُبْ بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ)**. ثُمَّ قالَ: **(هَذَا ما قاضى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)**. فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللهِ لَوْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللهِ مَا صَدَدْنَاكَ عَنِ الْبَيْتِ وَلاَ قاتَلْنَاكَ، وَلكِنِ اكْتُبْ: مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(وَاللهِ إِنِّي لَرَسُولُ اللهِ وَإِنْ كَذَّبْتُمُونِي، اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللهِ)**.

قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَذلِكَ لِقَوْلِهِ: **(لاَ يَسْأَلُونَنِي خُطَّةً يُعَظِّمُونَ فِيهَا حُرُماتِ اللهِ؛ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا)**.

فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): **(عَلَى أَنْ تُخَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الْبَيْتِ فَنَطُوفَ بِهِ)**. فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَاللهِ لاَ تَتَحَدَّثُ الْعَرَبُ أَنَّا أُخِذْنَا ضُغْطَةً، وَلكِنْ ذلِكَ مِنَ الْعَامِ المقْبِلِ، فَكَتَبَ، فَقَالَ سُهَيْلٌ: وَعَلَى أَنَّهُ لاَ يَأْتِيكَ مِنَّا رَجُلٌ، وَإِنْ كانَ عَلَى دِينِكَ؛ إِلاَّ رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا. قالَ المسْلِمُونَ: سُبْحَانَ اللهِ، كَيْفَ يُرَدُّ إِلَى المشْرِكِينَ وَقَدْ جاءَ مُسْلِماً؟!

فَبَيْنَمَا هُمْ كَذلِكَ، إِذْ دَخَلَ أَبُو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو يَرْسُفُ فِي قُيُودِهِ، وَقَدْ خَرَجَ مِنْ أَسْفَلِ مَكَّةَ حَتَّى رَمى بِنَفْسِهِ بَيْنَ أَظْهُرِ المسْلِمِينَ، فَقَالَ سُهَيْلٌ: هَذَا يَا مُحَمَّدُ أَوَّلُ ما أُقَاضِيكَ عَلَيْهِ أَنْ تَرُدَّهُ إِلَيَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّا لَمْ نَقْضِ الْكِتَابَ بَعْدُ)**. قالَ: فَوَاللهِ إِذاً لَمْ أُصَالِحْكَ عَلَى شَيْءٍ أَبَداً، قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(فَأَجِزْهُ لِي)**. قالَ: مَا أَنَا بِمُجِيزِهِ لَكَ، قالَ: **(بَلَى فَافْعَلْ)**. قالَ: مَا أَنَا بِفَاعِلٍ، قالَ مِكْرَزٌ:

بَلْ قَدْ أَجَزْنَاهُ لَكَ، قالَ أَبُو جَنْدَلٍ: أَيْ مَعْشَرَ المسْلِمِينَ، أُرَدُّ إِلَى المشْرِكِينَ وَقَدْ جِئْتُ مُسْلِماً، أَلاَ تَرَوْنَ مَا قَدْ لَقِيتُ؟ وَكَانَ قَدْ عُذِّبَ عَذَاباً شَدِيداً فِي اللهِ.

قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: فَأَتَيْتُ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: أَلَسْتَ نَبِيَّ اللهِ حَقًّا؟ قَالَ: (**بَلَى**). قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: (**بَلَى**). قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذاً؟ قَالَ: (**إِنِّي رَسُولُ اللهِ، وَلَسْتُ أَعْصِيهِ، وَهُوَ نَاصِرِي**). قُلْتُ: أَوَلَيْسَ كُنْتَ تُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي البَيْتَ فَنَطُوفُ بِهِ؟ قَالَ: (**بَلَى، فَأَخْبَرْتُكَ أَنَّا نَأْتِيهِ العَامَ**) ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: (**فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمُطَّوِّفٌ بِهِ**). قَالَ: فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ فَقُلْتُ: يَا أَبَا بَكْرٍ، أَلَيْسَ هَذَا نَبِيَّ اللهِ حَقًّا؟ قَالَ: بَلَى، قُلْتُ: أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَعَدُوُّنَا عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: بَلَى، قُلْتُ: فَلِمَ نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا إِذاً؟ قَالَ: أَيُّهَا الرَّجُلُ، إِنَّهُ لَرَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَلَيْسَ يَعْصِي رَبَّهُ، وَهْوَ نَاصِرُهُ، فَاسْتَمْسِكْ بِغَرْزِهِ، فَوَاللهِ إِنَّهُ عَلَى الْحَقِّ، قُلْتُ: أَلَيْسَ كَانَ يُحَدِّثُنَا أَنَّا سَنَأْتِي الْبَيْتَ وَنَطُوفُ بِهِ؟ قَالَ: بَلَى، أَفَأَخْبَرَكَ أَنَّكَ تَأْتِيهِ العَامَ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَإِنَّكَ آتِيهِ وَمَطَّوِّفٌ بِهِ.

قَالَ عُمَرُ: فَعَمِلْتُ لِذلِكَ أَعْمَالاً.

قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قَضِيَّةِ الْكِتَابِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَصْحَابِهِ: (**قُومُوا فَانْحَرُوا، ثُمَّ احْلِقُوا**). قَالَ: فَوَاللهِ ما قَامَ مِنْهُمْ رَجُلٌ، حَتَّى قَالَ ذلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا لَمْ يَقُمْ مِنْهُمْ أَحَدٌ دَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَذَكَرَ لَهَا مَا لَقِيَ مِنَ النَّاسِ، فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا نَبِيَّ اللهِ أَتُحِبُّ ذلِكَ؟ اخْرُجْ، ثم لاَ تُكَلِّمْ أَحَداً مِنْهُمْ كَلِمَةً، حَتَّى تَنْحَرَ بُدْنَكَ، وَتَدْعُوَ حَالِقَكَ فَيَحْلِقَكَ.

فَخَرَجَ فَلَمْ يُكَلِّمْ أَحَداً مِنْهُمْ حَتَّى فَعَلَ ذلِكَ، نَحَرَ بُدْنَهُ، وَدَعَا حَالِقَهُ فَحَلَقَهُ، فَلَمَّا رَأَوْا ذلِكَ قَامُوا فَنَحَرُوا، وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَحْلِقُ بَعْضاً، حَتَّى كَادَ بَعْضُهُمْ يَقْتُلُ بَعْضاً غَمًّا.

ثُمَّ جاءَهُ نِسْوَةٌ مُؤْمِنَاتٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ﴾، حَتَّى بَلَغَ: ﴿بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ [الممتحنة:١٠] فَطَلَّقَ عُمَرُ يَوْمَئِذٍ امْرَأَتَيْنِ، كَانَتَا لَهُ فِي الشِّرْكِ، فَتَزَوَّجَ إِحْدَاهما مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ، وَالأُخْرَى صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ.

ثُمَّ رَجَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَى المدِينَةِ فَجَاءَهُ أَبُو بَصِيرٍ . رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ وَهْوَ مُسْلِمٌ .، فَأَرْسَلُوا فِي طَلَبِهِ رَجُلَيْنِ، فَقَالُوا: الْعَهْدَ الَّذِي جَعَلْتَ لَنَا، فَدَفَعَهُ إِلَى الرَّجُلَيْنِ، فَخَرَجَا بِهِ حَتَّى بَلَغَا ذَا الحُلَيْفَةِ، فَنَزَلُوا يَأْكُلُونَ مِنْ تَمْرٍ لَهُمْ، فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ لأَحَدِ الرَّجُلَيْنِ: وَاللهِ إِنِّي لأَرَى سَيْفَكَ هَذَا يَا فُلاَنُ جَيِّداً، فَاسْتَلَّهُ الآخَرُ، فَقَالَ: أَجَلْ، وَاللهِ إِنَّهُ لَجَيِّدٌ، لَقَدْ جَرَّبْتُ بِهِ، ثُمَّ جَرَّبْتُ، فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ: أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْهِ، فَأَمْكَنَهُ

مِنْهُ، فَضَرَبَهُ، حَتَّى بَرَدَ، وَفَرَّ الآخَرُ حَتَّى أَتَى المدِينَةَ، فَدَخَلَ المسْجِدَ يَعْدُو، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حِينَ رَآهُ: (**لَقَدْ رَأَى هَذَا ذُعْراً**). فَلَمَّا انْتَهى إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: قُتِلَ وَاللهِ صَاحِبِي وَإِنِّي لَمَقْتُولٌ، فَجَاءَ أَبُو بَصِيرٍ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، قَدْ وَاللهِ أَوْفَى اللهُ ذِمَّتَكَ، قَدْ رَدَدْتَنِي إِلَيْهِمْ، ثُمَّ أَنْجَانِي اللهُ مِنْهُمْ، قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**وَيْلُ أُمِّهِ! مِسْعَرَ حَرْبٍ، لَوْ كَانَ لَهُ أَحَدٌ**). فَلَمَّا سَمِعَ ذلِكَ عَرَفَ أَنَّهُ سَيَرُدُّهُ إِلَيْهِمْ، فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى سِيفَ الْبَحْرِ.

قَالَ: وَيَنْفَلِتُ مِنْهُمْ أَبو جَنْدَلِ بْنُ سُهَيْلٍ، فَلَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ، فَجَعَلَ لاَ يَخْرُجُ مِنْ قُرَيْش رَجُلٌ قَدْ أَسْلَمَ؛ إِلاَّ لَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ، حَتَّى اجْتَمَعَتْ مِنْهُمْ عِصَابَةٌ، فَوَاللهِ ما يَسْمَعُونَ بِعِيرٍ خَرَجَتْ لِقُرَيْشٍ إِلَى الشَّامِ؛ إِلاَّ اعْتَرَضُوا لَهَا، فَقَتَلُوهُمْ وَأَخَذُوا أَمْوَالَهُمْ. فَأَرْسَلَتْ قُرَيْشٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) تُنَاشِدُهُ بِاللهِ وَالرَّحِمِ لَمَّا أَرْسَلَ فَمَنْ أَتَاهُ فَهْوَ آمِنٌ، فَأَرْسَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيْهِمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾، حَتَّى بَلَغَ: ﴿حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ [الفتح:٢٤ . ٢٦] وَكَانَتْ حَمِيَّتُهُمْ أَنَّهُمْ لَمْ يُقِرُّوا أَنَّهُ نَبِيُّ اللهِ، وَلَمْ يُقِرُّوا بِبِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، وَحالُوا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْبَيْتِ. [خ٢٧٣١ و٢٧٣٢ (١٦٩٤ و١٦٩٥)].

**ژ مەعمەری (رحمه الله) گۆت: زو هری گۆ تە من، گۆت: عوروەیێ كورێ زو بەیری ژ میسوەرێ كورێ مەخرەمەیی و مەروانی ـ و هەر ئێك ژ وان ئاخافتنا هەڤالێ خۆ راست دەردئێخیت، گۆتن: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا حودەیبییێ دەركەفت هەتا ئەو ل سەر هندە رێكێ بوون، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ب راستی خالدێ كورێ وەلیدی یێ ل غەمیمێ[1] د گەل سویارێت قورەیشییان و ئەو پێشییا وانن ڤێجا لایێ راستێ بگرن).**

**ئەز ب خودێ كەمە خالد ب وان نەحەسیا، هەتا تۆزا رەشا لەشكەری دیتی، ئینا چۆ و د كرە غار[2] دا قورەیشییان هشیار بكەت، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەتا گەهشتییە سەنییێ[3] ئەوا ل وێرێ لێ دهێنە خوار بۆ مەكەهێ، حێشترا وی دادا، خەلكی گۆتێ: حێ**

---

(١) دبێژنێ: كوراعا غەمیمێ، جهەكە د ناڤبەرا مەكەهێ و مەدینەیێدا.

(٢) ئانكو: پێت خۆ ل بن زكێ هەسپی دان و راكرە غارێ.

(٣) سەنییە: ئەو جیایە یێ رێك تێرا دهێتە مەكەهێ و دكەڤیتە د ناڤبەرا مەكەهێ و مەدینەیێدا.

حیّ[١]، د جهدا ما، ئینا گۆتن: قەسواء [٢]، عنرِی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (**قەسواء نەعنرِییە و ئەو نە رەوشتێ وێیە بەلێ بەندکەرێ فیلی ئەو بەند کر**). پاشی گۆت: (**ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا، ئەو چو سالۆخەتان ژ من دا خواز نا کەن پێ فەرمانێن خودێ مەزن رابگرن ئەگەر ئەز وێ نەدە مە وان**)، پاشی لێ حەیتی ئێکسەر رابوو.

گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) رێکا خۆ یا مەکەهێ گوهۆری هەتا هاتییە سەرێ حودەیبییێ ل سەر بیرەکا کێم ئاڤ و خەلکی پیچ پیچە ئاڤا وێ دکێشا، و خەلك هند نەما هەتا ئاڤا وێ هەمی کێشایی و گازندا تێناتییێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینای، ئینا تیرەك ژ تیردانکێ خۆ ئینا دەر و پاشی فەرمانا وان کر ئەو وێ تیرێ بکەنە د بیرێدا، و ئەز ب خودێ کەمە بەردەوام ئاڤێ دهەلاڤێت تێرا ڤەخوارنا وان کر و هەتا ئەو ژ بیرێ ز ڤرین و ئەو د رازی.

و د دەمەکیدا ئەو وەسا بوون بودەیلێ کورێ وەرقائێ خوزاعی د گەل چەند کەسەکان ژ مرۆڤێت خۆ ژ خوزاعییان هاتە دەڤ - و ئەو جهێ نهێنی و شیرەتا پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) - و ئەو ژ تیهامە[٣] بوو، ئینا گۆت: ب راستی من کەعبێ کورێ لوئەیی و عامرێ کورێ لوئەیی یێت پاش خۆ هێلاین و وان یا دانایە سەر ئاڤا نەراوەستیت ئاڤا حودەیبییێ و حێشترێت ب شیر و دایکێت ب شیر د گەل بچویکێت وان یێت د گەل وان، و ئەو دێ شەرێ تە کەن و رێکێ بۆ کەعبەیێ ل تە گرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**ب راستی ئەم بۆ شەرێ کەسەکێ نەهاتینە، بەلێ ئەم یێت هاتین عومرێ بکەین، و ب راستی شەری قورەیشی یێت بێهێزکرین و وەستاندین و زیان یا ل وان کری، ئەگەر وان بڤێت دێ مۆلەتێ ب دەمەکی دەمە وان و بلا د ناڤبەرا من و خەلکیدا بهێلن، و ئەگەر ئەز ب سەر وان کەفتم، ئەگەر وان ڤیا بهێنە د وێدا یا خەلك هاتییە تێدا بلا وەبکەن و**

(١) ئاخفتنەکە دهێتە گۆتن بۆ راکرن و هاژۆتنا حێشترێ.

(٢) قەسواء، ناڤێ حێشترا پێغەمبەرییە (ﷺ) و دبێژنێ قەسواء: چونکی رەخێ گوهێ وێ یێ برِی بوو.

(٣) تیهامە، دهێتە گۆتن بۆ خەلکێ مەکەهێ و گوندێت دۆرماندۆرێت وان.

**ئەگەر ئەز ب سەر وان نەكەفتم و ئەو شیانە من[1] ئەڤە وان بێهنا خۆ ڤەدا و ئەگەر ئەو ب ڤێ رازی نەبوون ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا ئەز دێ شەڕێ وان ل سەر كارێ خۆ كەم هەتا ستۆیێ من ژ لەشی' من جودا دبیت، و سویند ب خودێ، خودێ دێ هەر كارێ خۆ ب جه ئینیت و سەرئێخیت)** ئینا بودەیلی گۆت: ئەوا تە گۆتی دێ گەهینمە وان.

گۆت: ئەو چۆ هەتا هاتییە دەڤ قورەیشییان، گۆت: ئەز یێ ژ دەڤ وی زەلامی هاتیم، و ئەو یێ ئاخفتنەكێ دبێژیت، ئەگەر هەوە بڤێت بۆ هەوە بێژم دێ بێژم، ئینا ساویلكێت وان گۆت: مە هەوجەیی نینە تو تشتەكی ژ وی بۆ مە بێژی، و خودان دیتن و بۆچۆنان ژ وان گۆت: ئەوا تە گوه لێ بوویی بێژە، گۆت: من گوه لێ بوو ئەڤە و ئەڤە دگۆت، ئەوا پێغەمبەری (ﷺ) بۆ گۆتی گەهاند و بۆ وان گۆت.

ئینا عوروەیێ كوڕێ مەسعودی رابوو و گۆت: ئەی خەلكینۆ ما هوین بۆ من ل جهێ بابێ نینن؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: ما ئەز ل جهێ كوڕی نینم بۆ هەوە؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: ما هوین من گونەهبار دكەن؟ گۆتن: نەخێر، گۆت: ما هوین نوزانن من بۆ پشتەڤانییا هەوە گازی خەلكێ عوكازێ كر[2]، ڤێجا دەمێ ل دویف گازییا من نەهاتین من مرۆڤێت خۆ و عەیالێ خۆ و یێ گوهدارییا من كری بۆ پشتەڤانییا هەوە نەئینان، گۆتن بەلێ، گۆت: ئەڤە یێ سالۆخەتەكا خێرێ و باشییێ دئێخیتە بەرۆكا هەوە، قەبویل بكەن، و من بهێلن بچمە دەڤ، گۆتن: هەرە دەڤ، هاتە دەڤ و دەست ب ئاخفتنێ كر د گەل پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) وەكی گۆتنا گۆتییە بودەیلی گۆتە وی، ئینا وی دەمی عوروەیی گۆت: ئەی موحەممەد بێژە من، ئەگەر تە كارێ خەلكێ خۆ بنبڕ كر، ما تە ژ ئێكی ژ عەرەبان گوه لێ بوویە بەری تە خەلكێ خۆ بنبڕ كربیت، و ئەگەر یا دی بیت خەلكێ تە ب سەر تە كەفت تو دێ زانی كا دێ چ ل تە كەن، و ب راستی و ب خودێ ئەز یێ هندە سەروچاڤان و مرۆڤان دبینم[3]، و ئەز یێ هندە تێكەلۆكان دبینم، راستییا وان برەڤن و

(١) نەڤە شەڕ ژ وان ڤەبوو و وان بێهنا خۆ ڤەدا.

(٢) عوكاز: سویكەكە ل رەخەكێ مەكەهێ بوو و عەرەب هەر سال جارەكێ ل وێرێ كۆم دبوون.

(٣) ئانكو: ئەز هندەك كەسان دبینم نە زەلامێت شەڕینە و خۆ ناڕاگرن و پشت ب وان ناهێتە گەرمكرن.

تە ب تنێ بهێلن، ئینا ئەبوبەكری گۆت: تیتلكا لاتێ بمێژە، ئەم دێ رەڤین و وی هێلین؟ ئینا گۆت: ئەڤە كییە؟ گۆتن: ئەبوبەكرە، گۆت: ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ و یدا ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا یە تە قەنجییەكا ل من كری و من بەرامبەر بۆ تە نەزڤراندییە، دا بەرسڤا تە دەم، گۆت: و دەست ب ئاخفتێ كر د گەل پێغەمبەری (ﷺ)، و هەر گا ڤا ئاخفتبا رهێت پێغەمبەری (ﷺ) د گرتن، و موغیرە ل هنداڤ سەرێ پێغەمبەری (ﷺ) یێ راوەستای بوو، و شیر د گەل بوو د كاڤلانكیدا بوو، ڤێجا هەر گاڤا عوروەیی دەستێ خۆ بربا رهێت پێغەمبەری (ﷺ) ب دەستكێ شیری ل دەستێت وی ددا و دگۆتە وی: دەستێ خۆ ژ رهێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دویربێخە، ئینا عوروەیی سەرێ خۆ بلند كر و گۆت: ئەڤە كییە؟ گۆتن: موغیرەیێ كورێ شوعبەیە، ئینا گۆت: ئەی غەدرباز! ما هێژ ئەز چارەسەرییا غەدرا تە ب دانا مالی ناكەم؟[1].

و موغیرەیی د نەزانینێدا هەڤالینییا هندە مرۆڤان كربوو، ئەو كوشتن و مالێ وان ژی بربوو، پاشی موسلمان بوو، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هندیكە موسلمانەتییا تە یە ئەز دێ قەبویل كەم، و هندیكە مالە مە چو ژێ نینە).**

پاشی عوروەیی ب هەردو چاڤێت خۆ د هەڤالێت پێغەمبەریدا (ﷺ) ئینا دەر و دیت، گۆت: ئەز ب خودێ كەمە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تفەك تف نەكرییە ئەگەر نەكەتبا د دەستێ زەلامەكی ژ واندا و سەروچاڤ و پیستێ خۆ پێ ڤەدمالی، و ئەگەر فەرمانەك كربا لەز بجهئینانا فەرمانا وی دكرن، و ئەگەر دەستنڤێژ گرتبا نێزیك بوون شەڕی ل سەر ئاڤا وی یا دەستنڤێژێ بكەن، و ئەگەر ئاخفتبا دەنگێت خۆ ل دەڤ وی نزم دكرن، و راست و راست بەرێ خۆ نەددانە وی، مەزن ڕاگرتن بۆ وی.

ئینا عوروە زڤری دەڤ هەڤالێت خۆ، گۆت: ئەی گەلی خەلكی، ئەز ب خودێ كەمە ئەز یێ چۆیمە دەڤ شاهان، و ئەز یێ چۆیمە دەڤ قەیسەر و كیسرا و نەجاشی و ئەز ب خودێ كەمە من شاهەك نەدیتییە هەڤالێت وی وی مەزن راگرن وەكی مەزن راگرتنا هەڤالێت موحەممەدی بۆ موحەممەدی، ئەز ب خودێ كەمە وی تفەكێ تف نەكرییە ئەگەر نەكەتبا

---

(١) موغیرە مرۆڤێ وی بوو بەلكی برازایێ وی بوو و وی باجا خەلەتیێت وی ددا ئەو خەلەتییێت هێژ موسلمان نەبوویی كرین.

د دەستێ زەلامەكی ژ واندا و سەرو چاڤ و پیستێ خۆ پێ ڤەدمالی، و ئەگەر فەرمانەك كربا لەز بجهئینانا فەرمانا وی دكرن، و ئەگەر دەستنڤێژ گرتبا نێزیك بوون شەڕی ل سەر ئاڤا وی یا دەستنڤێژێ بكەن، و ئەگەر ئاخفتبا دەنگێت خۆ ل دەڤ نزم دكرن، و راست و راست بەرێ خۆ نەددانە وی، مەزن راگرتن بۆ وی، و وی سالۆخەتەكێ خێرێ و باشییێ ئێخستییە بەرۆكا هەوە ڤێجا قەبویل بكەن.

ئینا زەلامەكی ژ كینانە گۆت: بهێلن ئەز بچمە دەڤ، ئینا گۆتن: هەرە دەڤ، دەمێ ئەو بۆ پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤالێت وی دیار بووی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەڤە فلانە و ئەو ییێ ژ هۆزەكێ قوربانان مەزن دبینن، قوربانان بهنێرنە بەرۆكا وی و قوربان بۆ هاتنە هنارتن)**، و خەلكی ب تەلبییان[1] پێشوازییا وی كرن، ڤێجا دەمێ ئەڤە دیتی گۆت: سوبحان الله خەلكەكێ هۆسا نەدورستە رێگرییا وان ژ مالا خودێ بهێتە كرن، ڤێجا دەمێ زڤرییە دەڤ هەڤالێت خۆ گۆت: من قوربان دیتن یێت هاتینە رستككرن و نیشانكرن و ئەز نابینم رێگرییا وان ژ مالا خودێ بهێتە كرن.

ئینا زەلامەك ژ وان رابوو، دگۆتنێ میكرەزێ كوڕێ حەفسی و گۆت: بهێلن ئەز بچمە دەڤ، ئینا گۆتن: هەرە دەڤ، ڤێجا دەمێ بۆ موسلمانان دیار بووی، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەڤە میكرەزە، و ئەو زەلامەكێ خرابكارە)** دەست ب ئاخفتنێ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) كر و دەمێ ئەو د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دئاخفت سوهەیلێ كوڕێ عەمری هات.

مەعمەری گۆت: ئەیووبی گۆتە من ژ عیكرەمەیی: دەمێ سوهەیلێ كوڕێ عەمری هاتی: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(كارێ هەوە بۆ هەوە هاتە سانا‌هیكرن)**.

مەعمەری گۆت: زوهری د فەرمووودا خۆدا گۆت: سوهەیلێ كوڕێ عەمری هات ئینا گۆت: بینە نڤیسارەكێ د ناڤبەرا مە و خۆدا بنڤیسە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گازی نڤیسەری كر و پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: بنڤیسە (بسم الله الرحمن الرحیم) سوهەیلی گۆت: هندیكە رەحمانە ئەز ب خودێ كەمە ئەز نوزانم ئەو كییە، بەلێ بنڤیسە: ب ناڤێ تە ئەی خودا، هەروەكی هەر جار تە دنڤیسی، ئینا موسلمانان گۆتن: ب خودێ كەین ئەم

(١) گۆتنا: لبیك اللهم لبیك.

ژ بلی (بسم الله الرحمن الرحيم) چو یێ دی نانڤیسین، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(بنڤیسە ب ناڤێ تە ئەی خودا)** پاشی گۆت: **(ئەڤە ئەوە یا موحەممەد پێغەمبەرێ خودێ پێكهاتن ل سەر كری)**، ئینا سوهەیلی گۆت: ئەگەر مە زانیبا تو پێغەمبەرێ خودێیی مە رێگری ل تە نەدكر ژ مالا خودێ، و مە شەڕێ تە نەدكر، بەلێ بنڤیسە موحەممەدێ كوڕێ عەبدوللایی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب خودێ كەمە ئەز پێغەمبەرێ خودێمە خۆ ئەگەر هوین باوەرییێ ژی ب من نەئینن، بنڤیسە موحەممەدێ كوڕێ عەبدوللایی)**.

زوهری گۆت: و ئەڤەژی ژبەر گۆتنا وی: **(ئەو چو سالۆخەتان ژ من داخواز ناكەن پێ فەرمانێن خودێ مەزن رابگرن ئەگەر ئەز وێ نەدەمە وان)**.

ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(بەلێ ل سەر هندێ هوین د ناڤبەرا مە و مالا خودێدا بهێلن و ئەم تەوافێ ل دۆر بكەین)**. ئینا سەهلی گۆت: نەخێر ئەز ب خودێ كەمە، ڤێجا عەرەب بێژن خورتی ل مە هاتە كرن، بەلێ ئەڤە دێ بۆ سالا بهێت بیت، ئینا ئەو هاتە نڤیسین[١] و سوهەیلی گۆت: و ل سەر هندێ چو زەلام ژ مە ناهێنە دەڤ تە خۆ ئەگەر ل سەر دینێ تە ژی بیت ئەگەر تو بۆ مە نەزڤرینی. موسلمانان گۆت: (سبحان الله) چاوا دێ بۆ هەڤپشكچێكەران هێتە زڤراندن و ئەو موسلمان یێ هاتی.

ڤێجا ئەو د وەسا بوون هند دیت ئەبو جەندەلێ كوڕێ سوهەیلێ كوڕێ عەمرێ یەرسوفی ب قەیدێت خۆڤە هاتە د ناڤواندا و ئەو ژ بنێ مەكەهێڤە دەركەفتبوو هەتا خۆ هاڤێتییە د ناڤ موسلماناندا، ئینا سوهەیلی گۆت: ئەی موحەممەد ئەڤە یێ ئێكێیە ئەز دا خوازا ب جهكرنا پێكهاتنێ د گەل تە د كەم، تو بۆ من بزڤرینییە ڤە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(هێژ ئەم ژ نڤیسینێ ب دویماهی نەهاتینە)**، گۆت: ئەز ب خودێ كەمە پا ئەز پێكهاتنێ ل سەر چو تشتان د گەل تە ناكەم، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(بۆ من بهێلە)** گۆت: ئەز وی بۆ تە ناهێلم، گۆت: **(بەلێ وەبكە)** گۆت: ئەز وەناكەم، میكرەزی

(١) ئانكو: سالا بهێت دێ رێ ب هەوە هێتە دان هوین تەوافا مالا خودێ بكەن.

گۆت: بەلێ مە ئەو بۆ تە هێلا[1]، ئەبو جەندەلی گۆت: ئەی گەلی موسلمانان ئەز دێ بۆ هەڤپشك چێكەران هێ مە زڤرا ندن و ئەز موسلمان یێ هاتیم؟! ما هوین نابینن یا بەرهنگاری بوویمێ؟ و ئەو بۆ رێكا خودێ ب ئێزایەكێ دژوار هاتبوو ئێزادان.

گۆت: عومەرێ كورێ خەتتابی گۆت: ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا من گۆت: ما تو ب راستی پێغەمبەرێ خودێ نینی؟ گۆت: (**بەلێ**) من گۆت: ما ئەم ل سەر راستییێ نینین و دژمنێ مە ل سەر چونەیێ؟ گۆت: (**بەلێ**)، من گۆت: پا بۆ چی دێ كێماتی و شكەستنێ د دینێ خۆدا قەبویل كەین؟! گۆت: (**ب راستی ئەز پێغەمبەرێ خودێمە و ئەز نەگوهدارییا وی ناكەم و ئەو دێ من سەرئێخیت**)، من گۆت: ما تە نەگۆتییە مە ئەم دێ هێین كەعبەیێ و تەوافا وێ كەین؟ گۆت: (**بەلێ، بەس ما من گۆتییە ئەڤ سالە دێ هێینە كەعبەیێ**)؟ گۆت: من گۆت: نەخێر، گۆت: (**ب راستی دێ هێی و دێ تەوافێ ل دۆر كەی**)، گۆت: ئەز هاتمە دەڤ ئەبوبەكری ئینا من گۆت: ما ئەڤە ب راستی پێغەمبەرێ خودێ نینە؟ گۆت: (بەلێ) من گۆت: ما ئەم ل سەر راستییێ نینین و دژمنێ مە ل سەر چونەیێ؟ گۆت: (بەلێ)، من گۆت: پا بۆ چی دێ كێماتی و شكەستنێ د دینێ خۆدا قەبویل كەین؟ گۆت: زەلام ب راستی ئەو پێغەمبەرێ خودێیە، و ئەو نەگوهدارییا خودایێ خۆ ناكەت، و ئەو دێ وی سەرئێخیت، ڤێجا خۆ ب فەرمانا ویڤە بگرە، ئەز ب خودێ كەمە ئەو یێ ل سەر هەقییێ، من گۆت: ما وی نەگۆتبوو مە ئەم دێ هێینە كەعبەیێ و تەوافا وێ كەین؟ گۆت: بەلێ، ئەرێ ما گۆتییە تە ئەڤ سالە دێ هێینە كەعبەیێ؟ من گۆت: نەخێر، گۆت: ب راستی دێ هێی و دێ تەوافێ ل دۆر كەی.

عومەری گۆت: من بۆ ڤی كاری گەلەك كار كرن[2].

ڤێجا دەمێ ژ بابەتێ نڤیسانێ ب دویماهی هاتی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆ تە هەڤالێت خۆ: (**رابن قوربانان ڤەكوژن پاشی سەرێت خۆ بتراشن**)، گۆت: ئەز ب خودێ كەمە زەلامەك ژ وان نەرابوو، هەتا ئەڤە سێ جاران دوبارە كری، ڤێجا دەمێ كەس ژ وان

---

(١) نەهاتییە زانین كا سوهەیلێ كورێ عەمری ج بەرسڤا وی دا، بەلێ یا ئاشكەرا دەستهەلاتا ئیمزاكرنا پێكهاتنێ ب سوهەیلی هاتبوو دان نە ب میكرەزی، و ئاخفتن یا وییە نە یا میكرەزی.

(٢) وەك ژێبەر و كەفارەت بۆ وێ ئاخفتنا من د گەل پێغەمبەری (ﷺ) و ئەبوبەكری كری.

نەرابووی چۆ دەڤ ئوم سەلەمەیێ، ئەو بۆ وێ گۆت یا ژ خەلكی دیتی، ئینا وێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە ئەو دڤێت؟ دەركەڤە و پاشی ب پەیڤەكێ ژی د گەل كەسەكێ ژ وان نەئاخڤە هەتا تو قوربانێ خۆ نەڤەكوژی و تو گازی سەرتراشێ خۆ نەكەی.

ئینا پێغەمبەر (ﷺ) دەركەفت و د گەل كەسێ ژ وان نەئاخفت هەتا وەكری، حێشترا خۆ ڤەكوشت و گازی سەرتراشێ خۆ كر و سەرێ وی تراشت، ڤێجا دەمێ وان ئەڤە دیتی قوربانێن خۆ ڤەكوشتن و هندەكان سەرێ هندەكێت دی تراشتن و نێزیك بوو ژ قەهرا ندا هندەك هندەكان بكوژن.

پاشی هندە ژنێت باوەریدار هاتن، ئینا خودایێ بلند ئینا خوارێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ﴾ هەتا گەهشتییە ﴿بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ ئینا عومەری وێ رۆژێ دو ژن بەردان ل سەر شیركێ بوون، ئێكێ ژ وان شوی ب موعاویەیێ كورێ ئەبی سوفیانی كر و یا دی شوی ب سەفوانێ كورێ ئومەیەیی كر.

پاشی پێغەمبەر (ﷺ) ز ڤری مەدینەیێ، ئینا ئەبو بەسیر ـ زەلامەك بوو ژ قورەیشییان موسلمان ببوو ـ هاتە دەڤ، ئینا وان دو زەلام هنارتن داخوازییا وی بكەن، ئەو پەیمانا تە دایە مە[1]، ئینا ئەو داڤ وان هەردو زەلامان، ئەوان ژی ئەو بر هەتا گەهاندییە زیلحولەیفە، هاتنە خوارێ هندە قەسپێت خۆ بخۆن، ئینا ئەبو بەسیری گۆتە ئێكی ژ وان زەلامان: ب خودێ ب راستی ئەز شیرێ تە باش دبینم ئەی فلان، ئینا شیر ژ كاڤلانكی دەرئێخست و گۆت: بەلێ ئەز ب خودێ كەمە ئەو یێ باشە، من یێ جەرباندی و پاشی جەرباندی، ئینا ئەبو بەسیری گۆت: كا نیشا من بدە بەرێ خۆ بدەمێ، ئینا شیر دا ڤێ وی ژی دانایێ هەتا سار كری و یێ دی رەڤی هەتا هاتییە مەدینەیێ و هاتە د مزگەفتێڤە و یێ دكەتە غار، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ دیتی گۆت: (**ئەڤی ترسەكا دژوار یا دیتی**)، ڤێجا دەمێ هاتییە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: ئەز ب خودێ كەمە هەڤالێ من هاتە كوشتن، و ئەز ژی یێ كوشتیمە، ئینا ئەبو بەسیر هات و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ گەردەنا تە پاك كر، تە ئەز بۆ وان زڤراندم، پاشی خودێ ئەز ژ وان

(١) ئانكو: ئەو پەیمانا تە ل حودەیبییێ دایی ب جه بینە و بۆ مە بزڤرینە.

**رزگارکرم، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (وەی بۆ وی هەلکەرێ ئاگرێ شەڕییە ئەگەر وی ئێك هەبا)**، ڤێجا دەمێ وی ئەڤە گوهـ لێ بووی زانی ئەو دێ وی زڤرینیتە دەڤ وان، ئینا دەرکەفت هەتا هاتییە بەر رەخێ دەریایێ.

گۆت: و ئەبو جەندەلێ کوڕێ سوهەیلی ژی ژ دەستێت وان دەرد کەڤیت و دگەهیتە ئەبو بەسیری، ڤێجا نینە زەلامەك ژ قورەیشییان دەرکەتبا موسلمانببا ئەگەر نەگەهشتبا ئەبی بەسیری، هەتا کۆمەك ژ وان ل دەڤ کۆم بووین، ئەز ب خودێ کەمە وان گوهـ لێ نەدبوو کاروانەکێ قورەیشییان بۆ شامێ یێ دەرکەفتی ئەگەر رێ لێ نەگرتبا و دا وان کوژن و مالێ وان بەن، ئینا قورەیشییان هنارتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ب خودێ و ب مرۆڤانییێ دا خواز ژێ کر، ئەو بهنێریتە دویڤ وانڕا هەر کەسێ بهێتە دەڤ ئەو یێ ئێمنە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) هنارتە دویڤ وانڕا، ئینا خودایێ بلند ئەڤە ئینا خوارێ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ عَنۡهُم بِبَطۡنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ هەتا گەهشتییە ﴿حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ﴾[1]، و دەمارگیری و رکا وان یا نەزانینێ ئەو بوو پێغەمبەراتییا

(١) کورتییا رامانا وان ئایەتان: و خودێ نەهێلا دەستێت وان بگەهنە هەوە و دەستێت هەوە بگەهنە وان ل حودەیبییێ، پشتی هوین ب سەر وان ئێخستین [و هەوە هەژمارەك ژ وان ئێخسیر کری، ئەوێت ل بەر گەڕیاین ب سەر هەوەدا بگرن]، و خودێ ئاگەهـ ژ وێ هەیە یا هوین دکەن.

ئەون گاور بووین و ڕێکا کەعبەیێ ل هەوە گرتین، و نەهێلاین قوربانێت بەرهەڤکری [ئانکو تەرشێت هاتینە گرتن بۆ قوربانییێ] بگەهنە جهێ خۆ یێ ڤەکوشتنێ، و ئەگەر ژ بەر هندەك زەلامێت خودان باوەر و ژنێت خودان باوەر [ئەوێت د ناڤ مەکەهێدا، و باوەرییا خۆ دیار نەکرین] نەبایە - کو هوین وان نانیاسن - دەمێ هوین ب سەر واندا بگرن بکەڤنە بەر پێپێت هەوە، ڤێجا بێی کو هوین بزانن هوین عەیبدار ببن و زیان بگەهیتە هەوە، و خوین بکەڤیتە سەر هەوە [خودێ دەستێ هەوە ل سەر وان ڕانەدکر، و دا هەوە سەردەستی وان کەت، و خودێ ئەڤە کر و هۆسا هوین ژێکڤەکرن] دا ئەوێ خودێ بڤێت ب بەر دلۆڤانییا خۆ بێخیت، و ئەگەر ئەو [گاور و خودان باوەرێت د مەکەهێدا] ژێکڤە ببانە [و ژێك هاتبانە نیاسین]، ئەم دا ئەوێت گاور بووین ژ وان، ب ئیزادانەکا دژوار و ب ژان، ئیزا دەین.

وەختێ ئەوێت گاور بووین ڕکا نەزانینێ کرینە د دلێ خۆدا [ڕێکا سەرەدانا کەعبەیێ ل هەوە گرتین]، ئینا خودێ دلرەحەتییا خۆ ب سەر پێغەمبەری و ب سەر خودان باوەراندا داڕێت، و پەیڤا پارێزکارییێ (لا إله إلا

**پێغەمبەری (ﷺ) نەحەڤاند و ب (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) نەحەڤاند و رێگری د ناڤبەرا وان و مالا خودێدا كرن.**

### ٣ . باب: نزول: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُّبِيناً﴾

### بابەتێ: هاتنا خوارا (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُّبِيناً).

٣٦٥٧ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَوْزًا عَظِيمًا ۝﴾ [الفتح:١ . ٥] مَرْجِعَهُ مِنَ الْحُدَيْبِيَةِ وَهُمْ يُخَالِطُهُمُ الْحُزْنُ وَالْكَآبَةُ، وَقَدْ نَحَرَ الْهَدْيَ بِالْحُدَيْبِيَةِ، فَقَالَ: (لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آيَةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا جَمِيعاً). [م١٧٨٦].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكى (ﷺ) گۆت: دەمێ ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحاً مُّبِيناً لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ﴾ هەتا گۆتنا وى ﴿فَوْزًا عَظِيماً﴾ ل دەمێ زڤرینا ژ حودەیبییێ هاتیيە خوارێ، و ئەو د خەمگین و دامایی و دلشكەستی و وى قوربان ل حودەیبییێ ڤەكوشتی، ئینا گۆت: (ب راستی ئايەتەكا بۆ من هاتییە خوارێ ئەو ل دەڤ من ژ هەمی دنیایێ خۆشڤیترە).**

### ٤ . باب: مكان الشجرة

### بابەتێ: جهێ دارێ.

٣٦٥٨ - (ق) عَنْ سَعِيدِ بْنِ المسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ الشَّجَرَةَ، ثُمَّ أَتَيْتُهَا بَعْدُ فَلَمْ أَعْرِفْهَا. [خ٤١٦٢/ م١٨٥٩].

- وفي رواية لهما: عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدِ الرحمن قَالَ: انْطَلَقْتُ حَاجًّا، فَمَرَرْتُ بِقَوْمٍ يُصَلُّونَ، قُلْتُ: ما هَذَا المسْجِدُ؟ قالُوا: هَذِهِ الشَّجَرَةُ، حَيْثُ بَايَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَيْعَةَ الرِّضْوَانِ، فَأَتَيْتُ سَعِيدَ بْنَ المسَيَّبِ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ سَعِيدٌ: حَدَّثَنِي أَبِي: أَنَّهُ كانَ فِيمَنْ بَايَعَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) تَحْتَ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَلَمَّا خَرَجْنَا مِنَ الْعَامِ المقْبِلِ أُنْسِينَاهَا، فَلَمْ نَقْدِرْ عَلَيْهَا.

فَقَالَ سَعِيدٌ: إِنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) لَمْ يَعْلَمُوهَا، وَعَلِمْتُمُوهَا أَنْتُمْ؟ فَأَنْتُمْ أَعْلَمُ! [خ٤١٦٣].

---

**الله محمد رسول الله) بۆ وان هەلبژارت، و ئەو بۆ ڤێ پەیڤێ هێژاتر بوون و خودانێت وێ بوون، و خودێ ئاگەهـ ژ هەر تشتەكی هەیە.**

ژ سەعیدێ كوڕێ موسەیبەبی (ﷺ) ژ بابێ وی، گۆت: من دار دیتبوو، پاشی ئەز هاتمەڤە دەڤ من نەزانی كیژكە.

- و د ڤەگێرەكا ویندا: ژ تارقێ كوڕێ عەبدولرەحمانی (ﷺ) گۆت: ئەز بۆ حەجێ چۆم، ئینا ئەز د بەر هندەكانڕا بۆریم نڤێژ دكرن، من گۆت: ئەڤە چ مزگەفتە؟! گۆتن ئەڤە ئەو دارە و ئەو جهە یێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەیعەتا رزوان لێ وەرگرتی، ئینا سەعیدی گۆت: بابێ من بۆ من گۆت: ئەو ژ وان بوو یێت بەیعەت ل بن دارێ دایە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، گۆت: ڤێجا دەمێ سالا پاشتر ئەم دەركەفتین و هاتین ئەو دار ژ بیرا مە هاتە برن و ئەم نەشیاین دەستنیشان بكەین.

ئینا سەعیدی گۆت: هەڤالێت موحەممەدی (ﷺ) نەزانییە كیژ دارە هوین ژ وان زاناترن!

٥. باب: كتبه (ﷺ) إلى ملوك الكفار يدعوهم إلى الإسلام

**بابەتی: نامەیێت وی (ﷺ) بو شاهێت گاوران گازییا وان بۆ ئیسلامێ دكەت.**

٣٦٥٩ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) كَتَبَ إِلَى كِسْرَى، وَإِلَى قَيْصَرَ، وَإِلَى النَّجَاشِي، وَإِلَى كُلِّ جَبَّارٍ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللهِ تَعَالَى، وَلَيْسَ بِالنَّجَاشِي الَّذِي صَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ). [م١٧٧٤].

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نامە بۆ كیسرا و بۆ قەیسەری و بۆ نەجاشی و بۆ هەر مەزنەكێ زۆردار نڤیسی ئەو بۆ خودێ بلند گازی دكرن، و ئەو نە ئەو نەجاشی بوو یێ پێغەمبەری (ﷺ) نڤێژ ل سەر كری.

٣٦٦٠ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بَعَثَ بِكِتَابِهِ إِلَى كِسْرَى، مَعَ عَبْدِ اللهِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ الْبَحْرَيْنِ، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ إِلَى كِسْرَى، فَلَمَّا قَرَأَهُ مَزَّقَهُ. فَحَسِبْتُ أَنَّ ابْنَ المسَيَّبِ قالَ. فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ. [خ٤٤٢٤ (٦٤)].

ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نامەیا خۆ بۆ كیسرایی د گەل عەبدوللایێ كوڕێ حوزافەیێ سەهمی هنارت، و فەرمانا وی كر ئەو بدەتە دەستێ مەزنێ بەحرەینێ، و مەزنێ بەحرەینێ دا دەستێ كیسرایی، ڤێجا دەمێ نامە خواندی دڕاند. ئەز هزر دكەم كوڕێ ئیبن موسەییەبی گۆت. ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نفرین ل وان كرن: بهێنە پارچە پارچەكرن.

٣٦٦١ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ مِنْ فِيهِ إِلَى فِيَّ قالَ: انْطَلَقْتُ فِي المُدَّةِ الَّتِي كانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، قالَ: فَبَيْنَا أَنَا بِالشَّامِ، إِذْ جِيءَ بِكِتَابٍ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى هِرَقْلَ، قالَ: وَكانَ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ جاءَ بِهِ، فَدَفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ بُصْرَى إِلَى هِرَقْلَ، قالَ: فَقَالَ هِرَقْلُ: هَلْ هَاهُنَا أَحَدٌ مِنْ قَوْمِ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ.

قالَ: فَدُعِيتُ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَدَخَلْنَا عَلَى هِرَقْلَ، فَأُجْلِسْنَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَباً مِنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلْتُ: أَنَا، فَأَجْلَسُونِي بَيْنَ يَدَيْهِ، وَأَجْلَسُوا أَصْحَابِي خَلْفِي، ثُمَّ دَعَا بِتَرْجُمَانِهِ، فَقَالَ: قُلْ لَهُمْ: إِنِّي سَائِلٌ هَذَا عَنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعَمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ، قالَ أَبُو سُفْيَان: وَايْمُ اللهِ! لَوْلاَ أَنْ يُؤْثِرُوا عَلَيَّ الْكَذِبَ لَكَذَبْتُ.

ثُمَّ قالَ لِتَرْجُمَانِهِ: سَلْهُ كَيْفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قالَ: قُلْتُ: هُوَ فِينَا ذو حَسَبٍ، قالَ: فَهَلْ كَانَ مِنْ آبائِهِ مَلِكٌ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، قالَ: فَهَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ ما قالَ؟ قُلْتُ: لاَ، قالَ: أَيَتَّبِعُهُ أَشْرَافُ النَّاسِ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ قالَ: قُلْتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، قالَ: يَزِيدُونَ أَوْ يَنْقُصُونَ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، بَلْ يَزِيدُونَ، قالَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، قالَ: فَهَلْ قاتَلْتُمُوهُ؟ قالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، قالَ: فَكَيْفَ كانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ؟ قالَ: قُلْتُ: تَكُونُ الحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ سِجَالاً، يُصِيبُ مِنَّا وَنُصِيبُ مِنْهُ، قالَ: فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قالَ: قُلْتُ: لاَ، وَنَحْنُ مِنْهُ فِي هذِهِ المُدَّةِ لاَ نَدْرِي ما هُوَ صَانِعٌ فِيهَا.

- قَالَ: وَاللهِ ما أَمْكَنَنِي مِنْ كَلِمَةٍ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئاً غَيْرَ هذِهِ -.

قَالَ: فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ؟ قُلْتُ: لاَ.

ثُمَّ قَالَ لِتُرْجُمَانِهِ: قُلْ لَهُ: إِنِّي سَأَلْتُكَ عَنْ حَسَبِهِ فِيكُمْ، فَزَعَمْتَ أَنَّهُ فِيكُمْ ذُو حَسَبٍ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي أَحْسَابِ قَوْمِهَا، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ كانَ فِي آبَائِهِ مَلِكٌ، فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ كانَ مِنْ آبائِهِ مَلِكٌ، قُلْتُ: رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِهِ، وَسَأَلْتُكَ عَنْ أَتْبَاعِهِ: أَضُعَفَاؤُهُمْ أَمْ أَشْرَافُهُمْ؟ فَقُلْتَ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ ما قالَ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ يَذْهَبَ فَيَكْذِبَ عَلَى اللهِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ، فَزَعَمْتَ أَنْ لا، وَكَذلِكَ الإِيمَانُ إِذا خالطَ بَشَاشَةَ الْقُلُوبِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدونَ، وَكَذلِكَ الإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ قاتَلْتُمُوهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّكُمْ قاتَلْتُمُوهُ، فَتَكُونُ الحَرْبُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سِجَالاً، يَنَالُ مِنْكُمْ وَتَنَالُونَ مِنْهُ، وَكَذلِكَ

الرُّسُلُ تُبْتَلَى، ثُمَّ تَكُونُ لَهُمُ الْعَاقِبَةُ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَغْدِرُ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ لاَ يَغْدِرُ، وَكَذلِكَ الرُّسُلُ لاَ تَغْدِرُ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ قَالَ أَحَدٌ هذَا الْقَوْلَ قَبْلَهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ كانَ قالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ، قُلْتُ: رَجُلٌ ائْتَمَّ بِقَوْلٍ قِيلَ قَبْلَهُ.

قَالَ: ثُمَّ قَالَ: بِمَ يَأْمُرُكُمْ؟ قالَ: قُلْتُ: يَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ، وَالزَّكَاةِ، وَالصِّلَةِ، وَالْعَفَافِ.

قَالَ: إِنْ يَكُ ما تَقُولُ فِيهِ حَقًّا فَإِنَّهُ نَبِيٌّ، وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خارِجٌ، وَلَمْ أَكُ أَظُنُّهُ مِنْكُمْ، وَلَوْ أَنِّي أَعْلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إِلَيْهِ لأَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عَنْ قَدَمَيْهِ، وَلَيَبْلُغَنَّ مُلْكُهُ ما تَحْتَ قَدَمَيَّ، قَالَ: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَرَأَهُ، فَإِذَا فِيهِ:

**(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، أَمَّا بَعْدُ: فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الأَرِيسِيِّينَ، وَ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾**، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾ [آل عمران:٦٤]).

فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ، ارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ عِنْدَهُ وَكَثُرَ اللَّغَطُ، وَأُمِرَ بِنَا فَأُخْرِجْنَا، قَالَ: فَقُلْتُ لأَصْحَابِي حِينَ خَرَجْنَا: لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، إِنَّهُ لَيَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ، فَما زِلْتُ مُوقِناً بِأَمْرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللهُ عَلَيَّ الإِسْلاَمَ.

قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَدَعَا هِرَقْلُ عُظَمَاءَ الرُّومِ، فَجَمَعَهُمْ فِي دَارٍ لَهُ، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ الرُّومِ! هَلْ لَكُمْ فِي الْفَلاَحِ وَالرَّشَدِ آخِرَ الأَبَدِ، وَأَنْ يَثْبُتَ لَكُمْ مُلْكُكُمْ؟ قالَ: فَحَاصُوا حَيْصَةَ حُمُرِ الْوَحْشِ إِلَى الأَبْوَابِ، فَوَجَدُوهَا قَدْ غُلِّقَتْ، فَقَالَ: عَلَيَّ بِهِمْ، فَدَعَا بِهِمْ فَقَالَ: إِنِّي إِنَّمَا اخْتَبَرْتُ شِدَّتَكُمْ عَلَى دِينِكُمْ، فَقَدْ رَأَيْتُ مِنْكُمُ الَّذِي أَحْبَبْتُ، فَسَجَدُوا لَهُ وَرَضُوا عَنْهُ. [خ٤٥٥٣ {[٧]}/ م١٧٧٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەبو سوفیانی ژ دەڤێ خۆ بۆ دەڤێ من بەحەس کر، گۆت: د دەمێ سولحا حودەیبییەدا ئەوا د ناڤبەرا من و پێغەمبەرێ خودێدا (ﷺ) ئەز چۆمە شامێ، و ئەو دەمێ ئەز ل شامێ نامەیەك ژ پێغەمبەری (ﷺ) بۆ هیرەقلی هات، و دوحیەیێ کەلبی ئینابوو، دا دەستێ مەزنێ بوسرایێ و مەزنێ بوسرایێ دا دەستێ هیرەقلی، گۆت: هیرەقلی گۆت: ئەرێ کەسەك ل ڤێرێ هەیە ژ ملەتێ ڤی زەلامی بیت یێ خۆ ب پێغەمبەر ددانیت؟ ئینا گۆتن: بەلێ.**

ئەبو سوفیانی گۆت: ئەز د گەل هندەك كەسان ژ قورەیشییان هاتمە گازیكرن، ئینا ئەم چۆینە دەڤ هیرەقلی، ئەم ل بەرامبەری وی هاتینە دانان، ئینا گۆت: كیژ ژ هەوە بنەمالا وی بۆ وی زەلامێ خۆ پێغەمبەر ددانیت نێزكترە؟ ئەبو سوفیانی گۆت: من گۆت: ئەز، ئینا ئەز دانامە بەرسینگێ وی و هەڤالێت من دانانە پشت من، پاشی گازی وەرگێرێ خۆ كر، ئینا گۆت: بێژە وان: ئەز دێ پرسیارا ڤی ژ وی زەلامی كەم یێ خۆ ب پێغەمبەر ددانیت، ئەگەر درەو كر هوین ئاشكەرا بكەن، ئەبو سوفیانی گۆت: و ئەز ب خودێ كەمە ئەگەر وان درەو ژ من نەڤەگوهازتبا دا درەوێ كەم(١).

پاشی گۆتە وەرگێرێ خۆ: پرسیارێ ژێ بكە بنەمالا وی د ناڤ هەوەدا یا چاوایە؟ گۆت: من گۆت: ئەو د ناڤ مەدا یێ خودان بنەمالە، گۆت: ئێك ژ باب و باپیرێت وی شاه بوو؟ گۆت: من گۆت: نەخێر، گۆت: هەوە ب دەرەوێ تۆمەتبار دكر بەری ئەو وێ بێژیت یا دبێژیت؟ گۆت: من گۆت: نەخێر، گۆت: ئەرێ مەزنێت خەلكی (ئانكو: گرە گر و زەنگین) ب دویڤ دكەڤن یان لاوازێت وان ( هەژارێت وان)؟ گۆت: من گۆت: بەلكی لاوازێت وان، گۆت: ئەرێ ئەو زێدە دبن یان كێم دبن؟ گۆت: من گۆت: كێم نابن، بەلكی زێدە دبن، گۆت: ئەرێ ئێك ژ وان ژ دینێ خۆ لێڤە دبیت پشتی چۆیە تێدا ژ نەڤیانا وی بۆ وی دینی؟ گۆت: من گۆت: نەخێر، گۆت: هەوە شەڕێ وی كرییە؟ گۆت: من گۆت: بەلێ، گۆت: شەڕێ هەوە د گەل یێ چاوا بوو؟ گۆت: من گۆت: شەڕ د ناڤبەرا مە و ویدا جار ب جارە جار ئەو ب سەر مە دكەڤیت و جار ئەم ب سەر وی دكەڤین، گۆت: ئەرێ غەدرێ دكەت؟ گۆت: من گۆت: نەخێر، و ئەم یێت د ڤێ پێكهاتنا حودەیبییێدا ئەم نوزانین كا دێ چ تێدا كەت.

ئەبو سوفیانی گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەز نەشیام ئاخفتنەكێ بێخمە د ناڤ ئاخفتنا خۆدا وی پێ بشكێنم ئەڤە نەبیت.

هیرەقلی گۆت: ئەرێ ئێكێ دی بەری وی ئەڤە گۆتییە؟ من گۆت: نەخێر.

---

(١) ئانكو: ژ ناڤێ خۆ ترسیا ئەو ڤەگوهێزن بێژن ئەبو سوفیانی درەو كر ئەگەر ژ هندێ نەبا دا درەوێ كەت.

پاشی گۆتە وەرگێرێ خۆ: بێژە وی: من پرسیارا بنەمالا وی د ناڤ هەوەدا ژ تە کر، تە گۆت: ئەو خودان بنەما لە و هۆسا پێغەمبەر ژ بنەمالێت بلند ژ ملەتێت خۆ دهێنە هنارتن، و من پرسیار ژ تە کر: ئەرێ ئێك ژ باب و باپیرێت وی شاه هەبوو؟ تە گۆت: نەخێر، من گۆت: ئەگەر ئێك ژ باب و باپیرێت وی شاه با یە دا بێژم ئەو زەلامەکە شاهاتیا باب و باپیرێت خۆ دخوازیت، و من پرسیارا دویڤچۆیێت وی ژ تە کر: لاوازێت وانن یان مەزنێت وانن؟ تە گۆت: بەلکی لاوازێت وانن، و ئەو دویڤچۆیێت پێغەمبەرانن، و من پرسیار ژ تە کر: ئەرێ هەوە ب درەوێ تۆ مەتبار دکر بەری ئەو وێ بێژیت یا دبێژیت؟ تە گۆت: نەخێر، من زانی ئەو نە ئەوە درەوێ د گەل خەلکی بهێلیت و بچیت درەوێ ل سەر خودێ بکەت، و من پرسیار ژ تە کر ئەرێ ئێك ژ دینێ وی ڤەدبیت پشتی چۆیە تێدا ژ نەڤیانا دینێ وی، تە گۆت: نەخێر، و کارێ باوەرییێ ئەڤە یە ئەگەر د خۆشیا دلاندا تێکەل بوو، و من پرسیار ژ تە کر: ئەرێ زێدە دبن یان کێم دبن؟ تە گۆت: ئەو زێدە دبن، هۆسا باوەری ژی زێدە دبیت هەتا تمام دبیت، و من پرسیار ژ تە کر ئەرێ هوین شەڕێ وی دکەن؟ تە گۆت: هەوە شەڕێ وی یێ کری و شەڕ د ناڤبەرا هەوەدا جار جارە جار هوین ب سەرد وی دکەڤن جار ئەو ب سەر هەوە دکەڤیت؟ و هۆسا پێغەمبەر ژی دهێنە جەربەکرن پاشی دویماهی بۆ وانە، و من پرسیار ژ تە کر: ئەرێ غەدرێ دکەت؟ تە گۆت ئەو غەدرێ ناکەت، و هۆسا پێغەمبەر ژی غەدرێ ناکەن، و من پرسیار ژ تە کر: ئەرێ ئێکی بەری وی ئەڤە گۆتییە؟ تە گۆت: نەخێر، من گۆت: ئەگەر ئێکی بەری وی ئەڤ گۆتنە گۆتبایە دا بێژم زەلامەکە ل دویف ئاخفتنەکێ دچیت بەری وی یا هاتییە گۆتن.

هیرەقلی گۆت: ئەو ب چ فەرمانێ ل هەوە دکەت؟ گۆت: من گۆت: فەرمانا مە ب کرنا نڤێژان و دانا زەکاتێ و مرۆڤانییێ و دەهمەن پاقژییێ دکەت.

هیرەقلی گۆت: ئەگەر ئەوا تو د راستا و یدا دبێژی یا راست بیت، ب راستی ئەو پێغەمبەرە، و بێ گۆمان من دزانی ئەو دێ دەرکەڤیت، و من هزر نەدکر دێ ژ هەوە بیت، و ئەگەر من زانیبا ئەز دێ گەهمە وی دا حەز کەم من ئەو دیتبا، و ئەگەر ئەز ل دەڤ وی

بامە دا ب ئافا پێت وی سەروچافێت خۆ شۆم، و ملكداریا وی دێ گەهیتە جهێ بن پێت من، گۆت: پاشی داخوازا نامەیا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) كر و خواند و ئەڤە تێدا بوو:

(ب نافێ خودایێ دلۆڤان و د لۆڤین، ژ موحەممەد پێغەمبەرێ خودێ بۆ هیرەقلی مەزنێ رۆمێ، سلاڤ ل سەر وی بن یێ رێكا راستەرێیێ دگریت، و پشتی ڤێ: ئەز تە داخواز دكەمە پەیڤا تە موسلمان دكەت (كو پەیڤا شەهدەدانێیە: أَشْـهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ۞ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رسولُ اللَّهِ) موسلمان ببە دێ سلامەت بی و موسلمان ببە خودێ دێ دوجار كرێ خێرا تە دەتە تە، و ئەگەر پشتا خۆ بدەیێ و باوەرییێ نەئینی ب راستی هینگێ گونەها گەلێ تە د ستۆیێ تە یە و ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ هەتا گۆتنا وی ﴿ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ﴾[1].

ڤێجا دەمێ خواندنا نامەیێ ب دویماهی هاتی، دەنگ ل دەڤ وی بلند بوون و قەربالغ زێدە بوو، و فەرمان ب مە هاتە كرن و ئەم هاتینە دەرئێخستن، گۆت: دەمێ ئەم دەركەفتین من گۆتە هەڤالێت خۆ: كارێ كورێ ئەبی كەبشەیی[2] ب راستی شاهێ رۆمێ ژ وی دترسیت، پشتی ڤێ من باوەرییەكا موكم ب دینێ پێغەمبەری هەبوو خودێ دێ هەر ب سەر ئێخیت هەتا خودێ ئیسلام كرییە د دلێ مندا.

زوهری گۆت: ئینا هیرەقلی مەزنێت رۆمێ گازیكرن و ل مالەكا خۆ كۆم كرن، ئینا گۆت: گەلی رۆمییا ئەرێ هەوە سەرفەرازی و رێكا راست بۆ هەتا هەتایێ دڤێت، و خودێ ملكداریا هەوە بنە جە بكەت و بهێلیت؟ ئینا ئازر یان، ئازریا نا كەرێت كویڤی بۆ دەرگەهان چۆن؟ بەلێ دیتن یێت هاتینە گرتن. ئینا گۆت: بۆ من بینن، بۆ وی ئینان، ئینا

---

(١) رامانا ئایەتێ ب كورتی: هەی موحەممەد بێژە وان: گەلی خودان كتێبان (جوهی و فەلەیان)، وەرنە سەر وێ ناخفتنێ یا ئەم و هوین تێدا ئێك، كو ئەم و هوین ژ خودێ پێڤەتر چو نەپەرێسین، و چو هەڤال و هەڤپشكان بۆ چێ نەكەین، و هندەك ژ مە هندەكان نەدانن جهێ خودێ و بۆ داچەمن، ڤێجا ئەگەر رویێ خۆ وەرگێران و پشت تێ كرن، بێژنە وان: ئەڤە هوین شاهد كو ئەم موسلمانین و مە سەرێ كوهدارییێ بۆ خودێ چەماند.

(٢) مەبەست پێ پێغەمبەرە (ﷺ) و ئەبی كەبشە هەڤژینێ دەیكا وی یا شیری بوو، و بۆ كێمكرن ب ڤی نافی هاتە نافكرن.

گۆت: من موكومییا هەوە ل سەر دینێ هەوە جەربە دكر، و ب راستی من ئەو ژ هەوە دیت یا من دڤیا، ئینا هەمی بۆ چۆنە سوجدەیێ و ژێ رازی بوون.

٦ . باب: غزوة ذاتِ القَرَد

بابەتێ: خەزایا زات قەرەد.

٣٦٦٢ - (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ قَالَ: خَرَجْتُ قَبْلَ أَنْ يُؤَذَّنَ بِالأُولَى، وَكَانَتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) تَرْعَى بِذِي قَرَدٍ، قالَ: فَلَقِيَنِي غُلامٌ لِعَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ عَوْفٍ فَقَالَ: أُخِذَتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، قُلْتُ: مَنْ أَخَذَهَا؟ قَالَ: غَطَفَانُ، قَالَ: فَصَرَخْتُ ثَلاثَ صَرَخَاتٍ: يَا صَبَاحَاهُ! قَالَ: فَأَسْمَعْتُ ما بَيْنَ لابَتَيِ المدِينَةِ، ثُمَّ انْدَفَعْتُ عَلَى وَجْهِي حَتَّى أَدْرَكْتُهُمْ وَقَدْ أَخَذُوا يَسْتَقُونَ مِنَ الماءِ، فَجَعَلْتُ أَرْمِيهِمْ بِنَبْلِي، وَكُنْتُ رَامِياً، وأَقُولُ:

أَنَا ابْنُ الأَكْوَعْ      وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعِ

وَأَرْتَجِزُ، حَتَّى اسْتَنْقَذْتُ اللِّقَاحَ مِنْهُمْ، وَاسْتَلَبْتُ مِنْهُمْ ثَلاثِينَ بُرْدَةً. قَالَ: وَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَالنَّاسُ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ! قَدْ حَمَيْتُ الْقَوْمَ الماءَ وَهُمْ عِطَاشٌ، فَابْعَثْ إِلَيْهِمُ السَّاعَةَ، فَقَالَ: (**يَا ابْنَ الأَكْوَعِ! مَلَكْتَ فَأَسْجِحْ**). قَالَ: ثُمَّ رَجَعْنَا وَيُرْدِفُنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى نَاقَتِهِ حَتَّى دَخَلْنَا المدِينَةَ. [خ٤١٩٤ (٣٠٤١)/ م١٨٠٦].

ژ سەلەمەیێ كورێ ئەكوەعی (رضي الله عنه) گۆت: بەری بانگێ سپێدێ بهێتە دان ئەز دەركەفتم، و حێشترێت شیری یێت پێغەمبەری (ﷺ) ل زی قەرەد[1] دهاتنە چەراندن، گۆت: خزمەتكارەكێ عەبدولرەحمانێ كورێ عەوفی گەهشتە من و گۆت: حێشترێت شیری یێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتنە برن، من گۆت: كێ برن؟ گۆت غەتەفانییان، گۆت من سێ هەوار ب دەنگێ بلند كرن و (یا صباحاه)[2] ئانكو: هەوارە، گۆت: من هەردو لایێت مەدینەیێ گوه لێ كرن، پاشی ل راستا سەرێ خۆ من ب لەز غاردا هەتا گەهشتیمە وان و وان دەستهاڤێتبوویێ ئاڤ ڤەدخوار، ئینا من دەستهاڤێتێ و ب تیرێت خۆ ئەو تیربارانكرن و ئەز یێ تیرڤان بووم و من دگۆت:

ئەز كورێ ئەكوەعیمە      و ئەڤرۆ رۆژا نەمانا بێخێرانە

(١) زی قەرەد: ئاڤەكە ڤۆناغا رۆژەكێ ژ مەدینەیێ دویرە دكەڤیتە لایێ هۆزا غەتەفان.

(٢) ئاخفتنەكە بۆ هەوارا ب لەز و قەومینەكا مەزن دهاتە گۆتن دا زوی هەوارهاتن بهێن.

و من هۆزان دگۆتن هەتا من ئەو حێشترێت شیری ژ وان ستاندین و من دەست ب سەر سیه عەبایا ندا گرت. گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ و خەلك هاتن. من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من ئاڤ ژ وان ڤەگرت و ئەو د تێهنینە ڤێجا نو كە دو یڤ وا نرا بهنێرە، ئینا گۆت: (ئەی كورێ ئەكوەعی تو ب سەر وان كەفتێ[1] ڤێجا یێ نەرم بە) گۆت: پاشی ئەم زڤرین و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز ل پشت خۆ سویار كرم ل سەر حێشترا خۆ هەتا ئەم هاتینە د مەدینەیێدا.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) مەلەكتە: مەتەلە، ئانكو: تە ئەو ب مولكی ب دەست خۆڤە ئینان ڤێجا یێ نەرم بە.

## الفصل التاسع: غزوة خيبر وما بعدها

## پشكا نەهێ: خەزایا خەیبەرێ و یا پشتی وێ

### ١ . باب: الخروج إلى خيبر وفتحها

### بابەتێ: دەركەفتن بۆ خەیبەرێ و ڤەكرنا وێ

٣٦٦٣ - (ق) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) غَزَا خَيْبَرَ، فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلاَةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ، فَرَكِبَ نَبِيُّ اللهِ (ﷺ)، وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ، وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ، فَأَجْرَى نَبِيُّ اللهِ (ﷺ) فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ، وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذَ نَبِيِّ اللهِ (ﷺ)، ثُمَّ حَسَرَ الإِزَارَ عَنْ فَخِذِهِ، حَتَّى إِنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِ فَخِذِ نَبِيِّ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ: (**اللهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ، فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ**). قَالَهَا ثَلاَثاً.

قَالَ: وَخَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ، فَقَالُوا: مُحَمَّدٌ. قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: وَقَالَ بَعْضُ أَصحَابِنَا: وَالْخَمِيسُ؛ يَعْنِي: الْجَيْشَ ..

قَالَ: فَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً، فَجُمِعَ السَّبْيُ، فَجَاءَ دِحْيَةُ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ! أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ، قَالَ: (**اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً**). فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ! أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ، لاَ تَصْلُحُ إِلاَّ لَكَ، قَالَ: (**ادْعُوهُ بِهَا**). فَجَاءَ بِهَا، فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ (ﷺ) قَالَ: (**خُذْ جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ غَيْرَهَا**). قَالَ: فَأَعْتَقَهَا النَّبِيُّ (ﷺ)، وَتَزَوَّجَهَا.

فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا أَصْدَقَهَا؟ قَالَ: نَفْسَهَا، أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا. حَتَّى إِذَا كَانَ بِالطَّرِيقِ، جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَرُوساً، فَقَالَ: (**مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ**). وَبَسَطَ نِطَعاً، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ، قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَدْ ذَكَرَ السَّوِيقَ، قَالَ: فَحَاسُوا حَيْساً، فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ).[خ٣٧١/ م: النكاح ١٣٦٥ (٨٤)].

- وفي رواية للبخاري: أَنَّهُ أَقْبَلَ هُوَ وَأَبُو طَلْحَةَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَمَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) صَفِيَّةُ مُرْدِفَهَا عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا كَانُوا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَثَرَتِ النَّاقَةُ، فَصُرِعَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَالمرْأَةُ، وَإِنَّ أَبَا طَلْحَةَ ـ قَالَ: أَحْسِبُ قَالَ ـ اقْتَحَمَ عَنْ بَعِيرِهِ، فَأَتَى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللهِ، جَعَلَنِي اللهُ فِدَاءَكَ، هَلْ أَصَابَكَ مِنْ شَيْءٍ؟ قَالَ: (**لاَ، وَلكِنْ عَلَيْكَ بِالمرْأَةِ**). فَأَلْقَى أَبُو طَلْحَةَ ثَوْبَهُ عَلَى وَجْهِهِ فَقَصَدَ قَصْدَهَا، فَأَلْقَى ثَوْبَهُ عَلَيْهَا، فَقَامَتِ المرْأَةُ، فَشَدَّ لَهُمَا عَلَى رَاحِلَتِهِمَا فَرَكِبَا، فَسَارُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِظَهْرِ المدِينَةِ ـ أَوْ قَالَ:

أَشْرَفُوا عَلَى المدِينَةِ. قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (آيِبُونَ تَائِبُونَ عابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ). فَلَمْ يَزَلْ يَقُولُهَا، حَتَّى دَخَلَ المدِينَةَ. [خ٣٠٨٦].

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەزایا خەیبەرێ کر و مە ل تارییێ نڤێژا سپێدێ ل وێرێ کر، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سویار بوو و ئەبو تەلحە سویار بوو و ئەز ل پشت ئەبی تەلحەیی بووم، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەوارێ خۆ حێل ل کۆلانێت خەیبەرێ هاژۆت و چۆکێ من یێ ب چۆکێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د کەڤیت، پا شی پێغەمبەری (ﷺ) ئێزار ( قەدا خوارێ یا جلکێ ناڤ تەنگێ وێ ڤە دڤە شێریت) ژ سەر رانێ خۆ را کر هەتا ئەز یێ بەرێ خۆ ددەمە سپیاتییا رانێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ڤێجا دەمێ چۆیە د گوندیدا گۆت: **(مەزنی بۆ خودێ، خەیبەر هەرفت و بۆ مە هاتە ڤەکرن، ڤێجا ئەگەر ئەم هاتینە د مەیدانا هندەکا ندا، ڤێجا نەخۆزییا سپێدەهییا وان، ئەوێت هاتینە ئاگەهدارکرن و پێڤە نەچۆین)**. سێ جار ئەڤە گۆت.

گۆت: و جوهییێت خەیبەرێ دەرکەفتبوونە کارێت خۆ، و گۆتن. ئەڤە موحەممەد ب تنێ یێ هاتی، و هندە هەڤالێت مە گۆتن: وان گۆت: موحەممەدە و لەشکەرە.

گۆت: مە ب خورتی و ب زۆری خەیبەر ڤەکر و ئێخسیر هاتنە کۆمکرن، ئینا دوحیەیێ کەلبی هات و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ جارییەکێ ژ ئێخسیران بدە من، گۆت: **(هەرە جارییەکێ ببە)** ئینا سەفییەیا کچا حویەیی بر، ئینا زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، تە سەفییە کچا حویەیی خانما قورەیزە و نەزیران دایە دوحیەیی، ئەو تنێ کێر تە دهێت، گۆت: **( گا وێ بۆ من گازیکەن)** بۆ هاتە ئینان، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرێ خۆ دایێ گۆت: **(جارییەکا دی ژ بلی وێ ژ ئێخسیران ببە)** گۆت: ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئازا کر و مارە کر.

ئینا سابتی گۆت: ئەی بابێ حەمزەیی چ کرە مەهرا وێ؟ گۆت ئازاکرنا وێ، ئازا کر و مارە کر، هەتا د رێکێدا ئوم سەلیمێ بۆ کارێ وێ کر و ب شەڤ بۆ پێشکێش کر و سپێدە ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) و ئەو زاڤا، ئینا گۆت: **(هەر کەسێ تشتەکێ خوارنێ هەبیت بلا**

**بینیت)** و سەرهەڤیركەك ژ كەڤلی رائێخست، زلام هەبوو قەسپ ئینان و زلام هەبوو روین ئینا، گۆت: ئەز هزر دكەم بەحسێ سەویقێ ژی كر (سەویق: ئارێ هویرایە یێ جەهی یان گەنمی و قەلاندی) گۆت: و ژ ڤان حەیس چێ كر (قەسپ و روین و سەویق تێكەل كرن) و ئەو خوارنا دەواتا پێغەمبەری بوو (ﷺ).

- و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: ئەنەس و ئەبو تەلحە د گەل پێغەمبەری (ﷺ) هاتن و سەفییە د گەل پێغەمبەری بوو (ﷺ) ل پشت خۆ ل سەر حێشترا خۆ سویار كربوو، ڤێجا د رێكێدا حێشترا پێغەمبەری (ﷺ) هەلنگفت، پێغەمبەر (ﷺ) و سەفییە كەفتن، و ئەبو تەلحەیی- ئەز هزر دكەم گۆت- خۆ د حێشترا خۆدا هاڤێت و هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، خودێ من گۆری تە بكەت، تشتەك ل تە هات؟ گۆت: **(نەخێر بەلێ هەرە بەرێ خۆ بدە سەفییەیێ)** ئینا ئەبو تەلحەیی كراسێ خۆ دا بەر چاڤێت خۆ دا وێ نەبینیت و ل راستا وێ چۆ و جلكێ خۆ هاڤێتە سەر وێ، ئینا سەفییە رابوو، و كورتان بۆ وان لاو ل سەر حێشترێ گرێدا، و سویار بوون هەتا هاتینە پێش مەدینەیێڤە، یان گۆت: نێزیكی بۆ مەدینەیێ دیار بووین پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەم زڤرین و تەوبەدارین و خودێ پەرێسین و شوكرا خودایێ خۆ ب تنێ دكەین)**، ڤێجا بەردەوام ئەڤە دگۆت هەتا هاتییە د مەدینەیێدا.

٣٦٦٤ - (ق) عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى خَيْبَرَ، فَسِرْنَا لَيْلاً، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ لِعَامِرٍ: يَا عَامِرُ، أَلاَ تُسْمِعُنَا مِنْ هُنَيْهَاتِكَ؟ وَكَانَ عَامِرٌ رَجُلاً شَاعِراً، فَنَزَلَ يَحْدُو بِالْقَوْمِ يَقُولُ:

اللَّهُمَّ لَوْلاَ أَنْتَ ما اهْتَدَيْنَا ... وَلاَ تَصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَا

فَاغْفِرْ فِدَاءً لَكَ مَا اتَّقَيْنَا ... وَثَبِّتِ الأَقْدَامَ إِنْ لاَقَيْنَا

وَأَلْقِيَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا ... إِنَّا إِذَا صِيحَ بِنَا أَبَيْنَا

وَبِالصِّيَاحِ عَوَّلُوا عَلَيْنَا

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَنْ هَذَا السَّائِقُ)** ؟ قَالُوا: عَامِرُ بْنُ الأَكْوَعِ، قَالَ: **(يَرْحَمُهُ اللهُ)**. قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: وَجَبَتْ يَا نَبِيَّ اللهِ، لَوْلاَ أَمْتَعْتَنَا بِهِ؟

فَأَتَيْنَا خَيْبَرَ فَحَاصَرْنَاهُمْ حَتَّى أَصَابَتْنَا مَخْمَصَةٌ شَدِيدَةٌ، ثُمَّ إِنَّ اللهَ تَعَالَى فَتَحَهَا عَلَيْهِمْ، فَلَمَّا أَمْسَى النَّاسُ مَسَاءَ الْيَوْمِ الَّذِي فُتِحَتْ عَلَيْهِمْ، أَوْقَدُوا نِيرَاناً كَثِيرَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(مَا هذِهِ النِّيرَانُ؟ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ تُوقِدُونَ)** ؟ قَالُوا: عَلَى لَحْمٍ، قَالَ: **(عَلَى أَيِّ لَحْمٍ)** ؟ قَالُوا: لَحْمُ حُمُرِ الإِنْسِيَّةِ، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَهْرِيقُوهَا وَاكْسِرُوهَا)**. فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَوْ نُهَرِيقُهَا وَنَغْسِلُهَا؟ قَالَ: **(أَوْ ذَاكَ)**.

فَلَمَّا تَصَافَّ الْقَوْمُ، كَانَ سَيْفُ عامِرٍ قَصِيراً، فَتَنَاوَلَ بِهِ سَاقَ يَهُودِيٍّ لِيَضْرِبَهُ، وَيَرْجِعُ ذُبَابُ سَيْفِهِ، فَأَصَابَ عَيْنَ رُكْبَةِ عامِرٍ فَمَاتَ مِنْهُ. قَالَ: فَلَمَّا قَفَلُوا قَالَ سَلَمَةُ: رَآنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِي قَالَ: **(مَا لَكَ)** ؟ قُلْتُ لَهُ: فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، زَعَمُوا أَنَّ عَامِراً حَبِطَ عَمَلُهُ؟ قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(كَذَبَ مَنْ قَالَهُ، إِنَّ لَهُ لأَجْرَيْنِ ـ وَجَمَعَ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ ـ إِنَّهُ لَجَاهِدٌ مُجَاهِدٌ، قَلَّ عَرَبِيٌّ مَشَى بِهَا مِثْلَهُ)**. حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ: حَدَّثَنَا حَاتِمٌ، قَالَ: **(نَشَأَ بِهَا)**. [خ٤١٩٦ (٢٤٧٧)/ م١٨٠٢].

**ژ سەلەمەیێ كورێ ئەكوەعی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفتینە خەیبەرێ و ئەم ب شەڤ چۆین، ئینا زەلامەكی ژ ناڤ مە گۆتە عامری: ئەی عامر تو هندە لێكئینانێت خۆ ب بەر گوهێ مە نائێخی؟ و عامر زەلامەكێ هۆزانڤان بوو، ئینا هاتە خوار و ب ستران بۆ خەلكی گۆت:**

**ئەی خودا ئەگەر تو نەبایە ئەم راستەرێ نەدبووین و مە نە سەدەقە ددان و نە نڤێژ دكرن**

**گونەهان ژێ ببە گۆری تە بین هندی تشتێ مە ژ بەر تە هێلا یی و پێن مە موكم بكە ئەگەر ئەم و دژمن كەفتینە بەرێك**

**و تەناهی و ئارامییێ ب سەر مەدا بینە و ئەگەر ئەم بۆ نەهەقییێ هاتینە گازیكرن ئەم ناچین**

**و ب ڤێژییا هەوارا ل سەر مە دكەن.**

**ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەڤە كییە حێشتران ب سترانا دهاژۆت)؟ گۆتن: عامرێ كورێ ئەكوەعییە: گۆت: (خودێ دلۆڤانییێ پێ ببەت)، ئینا ئێكی ژ وی خەلكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەوا تە گۆتی شەهیدبوونە بۆ واجب بوو، ئەگەر تە بۆ مە هێلابایە دا بۆ مە ب دەنگێ خۆ خۆشی چێكربا.**

ئەم هاتینە خەیبەرێ و مە دۆرماندۆرێت وان گرتن، هەتا بر سەكا دژوار ئەم گرتین، پاشی خودێ بۆ مە ڤەكر، ڤێجا دەمێ ل خەلكی بوو یە ئێڤار خودێ بۆ وان ڤەكری، گەلەك ئاگر هەلكرن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەڤە چ ئاگرن؟ هوین ئاگری ل بن چ هەل د كەن)؟** گۆت: ل بن گۆشتی، گۆت: **(گۆشتێ چ)؟** گۆتن: گۆشتێ كەرێت كەهی، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(بر ێژن و ڤازا نان ب شكێنن)**، ئێ نا زەلا مەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، یان برێژین و بشۆیین؟ گۆت: **(یان وێ)**.

ڤێجا دەمێ خەلك بەرامبەر دژمنی رێز بووین، شیرێ عامری یێ كورت بوو، هەلگرت دا دانیتە پێ جوهییەكی، سەرێ وی زڤری ب چۆكێ عامری كەفت و پێ مر، گۆت: ڤێجا دەما زڤرین، سەلەمەیی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ من گرتبوو گۆتە من: **(تە خێرە)؟** من گۆتێ: دایك و بابێت من گۆری تە بن، دبێژن: عامری كارێ خۆ پویچ كر[1]؟ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەو خەلەت بوو یێ وەگۆتی، بۆ وی دو خێر یێت هەین - و هەردو تلێت خۆ گەهاندنە ئێك - ئەو عیبادەتكەر و خەزاكەرە و كێم عەرەب یێت هەین وەكی وی چۆبن)**، قوتەیبەیی گۆتە مە: حاتمی گۆتە مە، گۆت: **(ل سەر هندێ رابیت)**[2].

٢ . باب: تحريم متعة النساء ولحوم الحمر الأهلية

**بابەتێ: حەرامكرنا میتعەیا ژنان و گۆشتێ كەرێت كەهی.**

٣٦٦٥ - (ق) عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ أَكْلِ لُحُومِ الحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. [خ٤٢١٦/ م١٤٠٧].

- وفي رواية لهما، واللفظ لمسلم: أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يُلَيِّنُ فِي مُتْعَةِ النِّسَاءِ فَقَالَ: مَهْلاً، يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) نَهَى عَنْهَا يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. [خ٦٩٦١].

---

(١) چونكی ئەو بوو ئەگەرێ كوشتن و مرنا خۆ.

(٢) ئانكو: كێم عەرەب یێت هەین ل سەر وێ رابن یا عامر ل سەر رابوویی، عیبادەتكەر و جیهادكەر بیت.

ژ عەلييێ كورێ ئەبى تالبى (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا خەيبەرێ پاشفەلێدان ژ ميتعەيا[1] ژنان كر و ژ خوارنا گۆشتێ كەرێت كەهى.

و د ڤەگێرەكا واندا و بێژە يا موسلميە: وى گوه ل ئيبن عەباسى بوو وى نەرماتى د ميتعەيا ژناندا دكر، ئينا گۆت: راوەستە ئەى ئيبن عەباس، ب راستى پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا خەيبەرێ پاشفەلێدان يا ژێ كرى و ژ گۆشتێ كەرێت كەهى.

## ٣ . باب: الشاة المسمومة

## بابەتێ: پەزا ژەهركرى.

٣٦٦٦ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ أُهْدِيَتْ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) شَاةٌ فِيهَا سُمٌّ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اجْمَعُوا إِلَيَّ مَنْ كَانَ هَاهُنَا مِنْ يَهُودَ)**. فَجُمِعُوا لَهُ، فَقَالَ: **(إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ)**؟ . فَقَالُوا: نَعَمْ، قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ): **(مَنْ أَبُوكُمْ)** ؟ قَالُوا: فُلاَنٌ، فَقَالَ: **(كَذَبْتُمْ، بَلْ أَبُوكُمْ فُلاَنٌ)**. قَالُوا: صَدَقْتَ، قَالَ: **(فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُ عَنْهُ)** ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا الْقَاسِمِ! وَإِنْ كَذَبْنَا عَرَفْتَ كَذِبَنَا كَمَا عَرَفْتَهُ فِي أَبِينَا، فَقَالَ لَهُمْ: **(مَنْ أَهْلُ النَّارِ)**؟ قَالُوا: نَكُونُ فِيهَا يَسِيراً، ثُمَّ تَخْلُفُونَا فِيهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اخْسَؤُوا فِيهَا، وَاللهِ لاَ نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَداً)**. ثُمَّ قَالَ: **(هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ، إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ)** ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ، يَا أَبَا الْقَاسِمِ، قَالَ: **(هَلْ جَعَلْتُمْ فِي هذِهِ الشَّاةِ سُمّاً)** ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: **(ما حَمَلَكُمْ عَلَى ذلِكَ)** ؟ قَالُوا: أَرَدْنَا إِنْ كُنْتَ كَاذِباً نَسْتَرِيحُ، وَإِنْ كُنْتَ نَبِيّاً لَمْ يَضُرَّكَ. [خ٣١٦٩].

ژ ئەبى هورەيرە، (ﷺ) گۆت: دەمێ خەيبەر هاتييە ڤەكرن، پەزەكا ژەهر كرى بۆ پێغەمبەرى (ﷺ) هاتە دياريكرن، ئينا پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: **(ئەوێت ل ڤێرێ بۆ من كۆم كەن ژ جوهييان)**، ئينا بۆ هاتنە كۆمكرن، ئينا گۆت: **(ئەز دێ پرسيارا تشتەكى ژ هەوە كەم ئەرێ دێ راستييێ بۆ من ژێ بێژن)**؟ ئينا گۆتن: بەلێ، پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: **(بابێ هەوە كييە)** گۆتن: فلانە[2]، ئينا گۆت: **(هەوە درەو كر بەلكى بابێ هەوە**

---

(١) و مەبەست ژ ميتعەيێ: ئەڤەيە ژن بۆ دەمەكێ دەستنيشانكرى بۆ خۆشيێبرنێ بهێتە مارەكرن و ب پەيڤا تەمەتوعێ ئانكو: ب خۆشيێبرنێ، و ئەڤە د دەستپێكا ئيسلامێدا يا حەلال بوو پاشى ل رۆژا خەيبەرێ پاشفەلێدان ژێ هاتە كرن و هاتە حەرامكرن هەتا رۆژا قيامەتێ.

(٢) ژ مەبەست درەو كرن دا پێغەمبەرى (ﷺ) بجەربينن.

**فلانە)**[1]، **گۆتن: تو راست دبێژی گۆت: (ئەرێ دێ راستییێ بێژن ئەگەر من پرسیارا تشتەکی ژ هەوە کر)؟ ئینا گۆتن: بەلێ ئەی بابێ قاسمی و ئەگەر مە درەو کر دێ درەوا مە زانی هەروەکی تە د بابێ مەدا زانی، ئینا گۆتە وان: (کی خەلکێ جەهنەمێیە)؟ گۆتن: ئەم دێ دەمەکێ کێم تێدا بین، و پاشی هوین دێ جهێ مە گرن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بێدەنگ بن تێدا، ئەز ب خودێ کەمە د بنیرا ئەم جهێ هەوە ناگرین)، گۆت: (ئەرێ دێ راستییێ بێژن ئەگەر من پرسیارا تشتەکی ژ هەوە کر)؟ ئینا گۆتن بەلێ ئەی بابێ قاسمی، گۆت: (ئەرێ هەوە ژەهر کرییە د ڤی پەزیدا)؟ گۆتن: بەلێ، گۆت: (چ هوین پالدان ڤی کاری بکەن)؟ گۆتن: مە دڤیا ئەگەر تو یێ درەوین بی دێ ژ تە تەنابین**[2]، **و ئەگەر تو پێغەمبەر ژی بی ژەهر زیانێ ل تە ناکەت.**

## ٤ . باب: إجلاء يهود خيبر بعد غدرهم

## بابەتێ: دەرئێخستنا جوهییێت خەیبەرێ پشتێ خیانەتا وان

٣٦٦٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا فَدَع أَهْلُ خَيْبَرَ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ، قامَ عُمَرُ خَطِيباً فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كانَ عامَلَ يَهُودَ خَيْبَرَ عَلَى أَمْوَالِهِمْ، وَقَالَ: **(نُقِرُّكُمْ ما أَقَرَّكُمُ اللهُ)** ، وَإِنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ خَرَجَ إِلَى مالِهِ هُنَاكَ، فَعُدِيَ عَلَيْهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَفُدِعَتْ يَدَاهُ وَرِجْلاهُ، وَلَيْسَ لَنَا هُنَاكَ عَدُوٌّ غَيْرُهُمْ، هُمْ عَدُوُّنا وَتُهْمَتُنَا، وَقَدْ رَأَيْتُ إِجْلاَءَهُمْ.

فَلَمَّا أَجْمَعَ عُمَرُ عَلَى ذلِكَ، أَتَاهُ أَحَدُ بَنِي أَبِي الْحُقَيْقِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ المؤْمِنِينَ! أَتُخْرِجُنَا، وَقَدْ أَقَرَّنَا مُحَمَّدٌ (ﷺ)، وَعَامَلَنَا عَلَى الأَمْوَالِ، وَشَرَطَ ذلِكَ لَنَا. فَقَالَ عُمَرُ: أَظَنَنْتَ أَنِّي نَسِيتُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): **(كَيْفَ بِكَ إِذَا أُخْرِجْتَ مِنْ خَيْبَرَ تَعْدُو بِكَ قَلوصُكَ لَيْلَةً بَعْدَ لَيْلَةٍ)**. فَقَالَ: كانَتْ هذِهِ هُزَيْلَةً مِنْ أَبِي الْقَاسِمِ، قالَ: كَذَبْتَ يَا عَدُوَّ اللهِ! فَأَجْلاَهُمْ عُمَرُ، وَأَعْطَاهُمْ قِيمَةَ ما كانَ لَهُمْ مِنَ الثَّمَرِ، مالاً وَإِبِلاً وَعُرُوضاً مِنْ أَقْتَابٍ وَحِبَالٍ وَغَيْرِ ذلِكَ. [خ٢٧٣٠].

**ژ ئیبن عومەری ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ خەلکێ خەیبەرێ دەست و پێت عەبدوللایێ کوڕێ عومەری ژ جهێت وان ئینایەدەر، عومەر رابوو و گۆتار دا و**

---

(١) یەعقووب پێغەمبەرە (ﷺ).

(٢) دێ ب ژەهرێ مری.

**گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رێككەفتن د گەل جوهییێت خەیبەرێ كر بوو و گۆت: (دێ هەوە هێلین هەتا وی دەمێ خودێ بۆ هەوە دیار كری) و عەبدوللایێ كورێ عومەری یێ دەركەفتییە د ناڤ مالێ خۆدا، ل وێرێ و ب شەڤ دەستدرێژی یا ل سەر هاتییە كرن، و دە ستێت وی و پ ێت وی ژ جهـ ئینا نە دەرێ، و مە چو دژ من ژ ب لی وان ن ینن و ئەو دژمنێت مەنە و جهێ تۆمەتبارییا منە و ئەز دەرئێخستنا وان دبینم.**

**ڤێجا دەمێ عومەر رژد بووی و بریارا هندێ دایی، ئێك ژ بەنی ئەبی حو قەیقی ها تە دەڤ و گۆت: ئەی میرێ باوەر یداران دێ مە درئێ خی و موحە ممەدی (ﷺ) ئەم ی ێت هێلاینە ل ڤێرێ و رێككەفتن یا د گەل مە كری ل سەر مالێ مە، و بۆ مە یێ ب نیڤی كری؟ ئینا عومەری گۆت: ما تو هزر دكەی من ئاخفتنا پێغەمبەری (ﷺ) ژ بیر كری یە؟ (دێ رەوشا تە یا چاوا بیت ئەگەر تو ژ خەیبەرێ هاتییە دەرئێخستن، حێشترا تە یا ب لەز تە دبەت شەڤ دویف شەڤێ)، گۆت: ئەو ترانەكۆكەك بوو ژ بابێ قاسمی، گۆت: تو درەوا دكەی ئەی دژمنێ خودێ، و عومری ژ وێرێ راكرن و بهایێ فێقییێ وان مال و حێشتر و كەلوپەل دانێ ژ كورتانێت حێشتران و وەریسان و تشتێ دیتر.**

## ٥ . باب: عودة مهاجري الحبشة

## بابەتێ: زڤرینا مشەختێت حەبەشەیێ.

٣٦٦٨ – (ق) عَنْ أَبِي مُوسى رضي الله عنه قَالَ: بَلَغْنَا مَخْرَجُ النَّبِيِّ (ﷺ) وَنَحْنُ بِالْيَمَنِ، فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ إِلَيْهِ أَنَا وَأَخَوَانِ لِي أَنَا أَصْغَرُهُمْ، أَحَدُهُمَا أَبُو بُرْدَةَ وَالآخَرُ أَبُو رُهْمٍ، إِمَّا قَالَ: فِي بِضْعٍ، وَإِمَّا قَالَ: فِي ثَلاَثَةٍ وَخَمْسِينَ، أَوِ اثْنَيْنِ وَخَمْسِينَ رَجلاً مِنْ قَوْمِي، فَرَكِبْنَا سَفِينَةً، فَأَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا إِلَى النَّجَاشِيِّ بِالحَبَشَةِ، فَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَأَقَمْنَا مَعَهُ حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعاً، فَوَافَقْنَا النَّبِيَّ (ﷺ) حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ، وَكَانَ أُنَاسٌ مِنَ النَّاسِ يَقُولُونَ لَنَا ـ يَعْنِي: لِأَهْلِ السَّفِينَةِ ـ: سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ.

وَدَخَلَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ، وَهِيَ مِمَّنْ قَدِمَ مَعَنَا، عَلَى حَفْصَةَ ـ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) ـ زَائِرَةً، وَقَدْ كَانَتْ هَاجَرَتْ إِلَى النَّجَاشِيِّ فِيمَنْ هَاجَرَ، فَدَخَلَ عُمَرُ عَلَى حَفْصَةَ، وَأَسْمَاءُ عِنْدَهَا، فَقَالَ عُمَرُ حِينَ رَأَى أَسْمَاءَ: مَنْ هذِهِ؟ قَالَتْ: أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ، قَالَ عُمَرُ: آلحَبَشِيَّةُ هذِهِ، آلْبَحْرِيَّةُ هذِهِ؟ قَالَتْ أَسْمَاءُ: نَعَمْ، قَالَ: سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ، فَنَحْنُ أَحَقُّ بِرَسُولِ اللهِ مِنْكُمْ، فَغَضِبَتْ وَقَالَتْ: كَلاَّ وَاللهِ، كُنْتُمْ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يُطْعِمُ جَائِعَكُمْ، وَيَعِظُ جَاهِلَكُمْ، وَكُنَّا فِي دَارٍ ـ أَوْ فِي أَرْضِ ـ الْبُعَدَاءِ الْبُغَضَاءِ بِالحَبَشَةِ، وَذلِكَ فِي

اللهِ وَفِي رَسُولِهِ (ﷺ). وَايْمُ اللهِ! لاَ أَطْعَمُ طَعَاماً، وَلاَ أَشْرَبُ شَرَاباً، حَتَّى أَذْكُرَ مَا قُلْتَ لِرَسُولِ اللهِ، وَنَحْنُ كُنَا نُؤْذَى وَنُخَافُ، وَسَأَذْكُرُ ذلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) وَأَسْأَلُهُ، وَاللهِ لاَ أَكْذِبُ، وَلاَ أَزِيغُ، وَلاَ أَزِيدُ عَلَيْهِ.

فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللهِ! إِنَّ عُمَرَ قَالَ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: **(فَمَا قُلْتِ لَهُ)** ؟. قَالَتْ: قُلْتُ لَهُ: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: **(لَيْسَ بِأَحَقَّ بِي مِنْكُمْ، وَلَهُ وَلأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ، وَلَكُمْ أَنْتُمْ أَهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَانِ)**. قَالَتْ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسى وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ يَأْتُونَنِي أَرْسَالاً، يَسْأَلُونَنِي عَنْ هَذَا الحَدِيثِ، مَا مِنَ الدُّنْيَا شَيْءٌ هُمْ بِهِ أَفْرَحُ وَلاَ أَعْظَمُ فِي أَنْفُسِهِمْ مِمَّا قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ).

قَالَ: أَبُو بُرْدَةَ: قَالَتْ أَسْمَاءُ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسى وَإِنَّهُ لَيَسْتَعِيدُ هذَا الْحَدِيثَ مِنِّي.

[خ٤٢٣٠ و٤٢٣١ (٣١٣٦)/ م٢٥٠٢ و٢٥٠٣].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: دەركەفتنا پێغەمبەری (ﷺ) گەهشتە مە، و ئەم ل یەمەنێ بووین، و ئەم دەركەفتین مشەخت ببینە دەڤ ئەز و دو برایێت خۆ، و ئەز بچویكتر بووم ژ وان هەردوكان، ئێك ژ وان ئەبو بوردە بوو و یێ دی ئەبو روهەم بوو، یان گۆت د گەل چەندەكان یان گۆت: د گەل سێ سەد و پێنجییان یان د گەل پێنجی و دو زەلامان ژ مرۆڤێت خۆ، و ئەم ل گەمییەكێ سویار بووین، ئینا پاپۆرا مە ئەم برینە دەڤ نەجاشی ل حەبەشەیێ، و ئەم گەهشتینە جەعفەرێ كورێ ئەبی تالبی، و ئەم ماینە ل دەڤ وی هەتا ئەم هەمی پێكڤە هاتین، و ئەم گەهشتینە پێغەمبەری (ﷺ) دەمێ خەیبەر ڤەكری، و هندەك مرۆڤان ژ خەلكی دگۆتە مە - ئەم خەلكێ گەمییێ - مە ب مشەختبوونێ د بەری هەوەڕا كر.**

**و ئەسمائا كچا عومەیسی ژی ژ وان بوو یا د گەل مە هاتی، ب سەرەدان چۆ دەڤ حەفسایێ - هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) -، و ئەو ژ وان مشەختییان بوو یێت مشەختبووینە دەڤ نەجاشی، ئینا عومەر هاتە دەڤ حەفسایێ و ئەسماء ل دەڤ وێ بوو، و دەمێ عومەری ئەسماء دیتی گۆت: ئەڤە كییە؟ گۆت: ئەسمائا كچا عومەیسییە، عومەری گۆت: ئەڤە یا حەبەشییە ئەڤە یا دەریاییە؟ ئینا ئەسمائێ گۆت: بەلێ، گۆت: مە ب مشەختبوونێ د بەری هەوەڕا كر و ئەم بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ هەوە هەژیترن، ئینا تۆرە بوو و گۆت: نەخێر ئەز ب خودێ كەمە هوین د گەل پێغەمبەرێ خودێ بوون، برسییێ هەوە تێر دكر و نەزانێ هەوە شیرەت دكر و ئەم ل جهەكی، یان ل عەردەكی**

**دو یر و نەخۆش بووین و ئە ڤە ژی بۆ خودێ و پێغەمبەرێ وی بوو (ﷺ) و ئەز ب خودێ سویند دخۆم نە ئەز خوارنەکێ دخۆم و نە ئاڤاکێ ڤەدخۆم هەتا ئەوا تە گۆتی ئەز نەبێژمە پێغەمبەرێ خودێ، و ئەم دهاتینە ئەزیەتدان و ترساندن، و ئەز دێ ڤێ بۆ پێغەمبەری (ﷺ) بێژم و پرسیارا وی کەم، و ئەز ب خودێ کەمە ئەز درەوێ ناکەم و ئەز چو ل شوینێ نادانم و چو ل سەر زێدە ناکەم.**

**ڤێجا دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتی: گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی عومەری ئەڤە و ئەڤە گۆت؟ گۆت: (و تە چ گۆتێ)؟ گۆت: من ئەڤە و ئەڤە گۆتێ، گۆت: (ئەو ژ هەوە بۆ من هەژیتر نینن، بۆ وی و هەڤالێت وی مشەختبوونەك یا هەی، و بۆ هەوە خەلکێ گەمییێ دو مشەختبوون پێت هەین)، وێ گۆت: ڤێجا من ئەبو مووسا و هەڤالێت وی دیتن دەست دهاتنە دەڤ من و پرسیارا ڤێ فەرموودەیێ ژ من دکرن، ل دەڤ وان چو تشت ژ دنیایێ دلخۆشتر و خۆشڤیتر نەبوو ژ وێ یا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتی.**

**ئەبو بوردەیی گۆت: ئەسمائێ گۆت: و من ئەبو مووسا دیت دا خوازا دوبارەکرنا ڤێ فەرموودەیێ ژ من دکر.**

## ٦ . باب: رد المهاجرين إلى الأنصار منائحهم

## بابەتێ: ڤەگەراندنا مشەختان تشتێت ئەنساران ئەوێت بۆ مفا ژێ وەرگرتنێ داینێ.

٣٦٦٩ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا قَدِمَ المهَاجِرُونَ المدِينَةَ مِنْ مَكَّةَ، وَلَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ ـ يَعْنِي: شَيْئاً ـ، وَكَانَتِ الأَنْصَارُ أَهْلَ الأَرْضِ وَالعَقَارِ، فَقَاسَمَهُمُ الأَنْصَارُ عَلَى أَنْ يُعْطُوهُمْ ثِمَارَ أَمْوَالِهِمْ كُلَّ عَامٍ، وَيَكْفُوهُمُ الْعَمَلَ وَالمؤُونَةَ، وَكَانَتْ أُمُّهُ أُمُّ أَنَسٍ أُمُّ سُلَيْمٍ، كَانَتْ أُمَّ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، فَكَانَتْ أَعْطَتْ أُمُّ أَنَسٍ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عِذَاقاً، فَأَعْطَاهُنَّ النَّبِيُّ (ﷺ) أُمَّ أَيْمَنَ مَوْلاَتَهُ أُمَّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ.

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمَّا فَرَغَ مِنْ قِتَالِ أَهْلِ خَيْبَرَ، فَانْصَرَفَ إِلَى المدِينَةِ، رَدَّ المهَاجِرُونَ إِلَى الأَنْصَارِ مَنَائِحَهُمُ الَّتِي كَانُوا مَنَحُوهُمْ مِنْ ثِمَارِهِمْ، فَرَدَّ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَى أُمِّهِ عِذَاقَهَا، وَأَعْطَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أُمَّ أَيْمَنَ مَكانَهُنَّ مِنْ حَائِطِهِ. [خ٢٦٣٠/ م١٧٧١].

**ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ مشەخت ژ مەکەهێ هاتینە مەدینەیێ چو تشت د دەستێ واندا نەبوو، و ئەنسار خودانێت عەردی و دارقەسپا بوون، و ئەنساران**

ئەو پشكداری نیڤا فێقی و بەرهەمێ مالێ خۆ كرن و هەر سال، و بەلا كاری و مەزاختنێ ژی ژ وان ڤەكرن، و دایكا وی دایكا ئەنەسی دایكا سەلیمی و ئەو دایكا عەبدوللایێ كوڕێ ئەبو تەلحەیی بوو، وێ هندە دارقەسپێت ب بەر دابوونە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو دانە ئوم ئەیمەنێ ئازاكریا وی دایكا ئوسامەیێ كوڕێ زەیدی.

ئیبن شیهابی گۆت: ئەنەسێ كوڕێ مالكی گۆتە من: دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) ژ شەڕێ خەلكێ خەیبەرێ ب دویماهی هاتی هاتە مەدینەیێ و ئەو تشتێت ئەنساران ژ دارێت خۆ یێت فێقی دایینە مشەختان بۆ مفا ژێ وەرگرتنێ بۆ زڤرا ندن، پێغەمبەری (ﷺ) دارقەسپێت دایكا وی بۆ زڤراندن، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) شوینا وان هندەكێت دی ژ بیستانێ خۆ دانە ئوم ئەیمەنێ.

٣٦٧٠ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ قُلْنَا: الآنَ نَشْبَعُ مِنَ التَّمْرِ. [خ٤٢٤٢].

ژ عائیشایێ (ﷺ) گۆت: دەمێ خەیبەر ڤەبووی، مە گۆت: ژ نوی ئەم دێ ژ قەسپان تێر بین.

## ٧ . باب: كيف كان عيش النَّبِي (ﷺ) وأَصحابه

## بابەتێ: ژیارا پێغەمبەری (ﷺ) و هەڤالێت وی یا چاوا بوو.

٣٦٧١ - (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ: أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا أُنَاساً فُقَرَاءَ، وَأَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِثٍ، وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَامِسٌ أَوْ سَادِسٌ). وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلاثَةٍ، فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِعَشَرَةٍ. [خ٦٠٢/ م٢٠٥٧].

ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ ئەبی بەكرێ سەددیق (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: خەلكێ سوففێ هندە مرۆڤێت هەژار بوون، و پێغەمبەری (ﷺ) جارەكێ گۆت: (هەر كەسێ خوارنا دووا هەبیت بلا یێ سێیێ د گەل خۆ ببەت، و یێ خوارنا چاران هەبیت بلا یێ پێنجێ یان یێ شەشێ ببەت)، و ئەبوبەكری (ﷺ) سێ د گەل خۆ ئینان و پێغەمبەری (ﷺ) دەهـ د گەل خۆ برن.

٣٦٧٢ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: رَأَيْتُ سَبْعِينَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ، مَا مِنْهُمْ رَجُلٌ عَلَيْهِ رِدَاءٌ، إِمَّا إِزَارٌ وَإِمَّا كِسَاءٌ، قَدْ رَبَطُوا فِي أَعْنَاقِهِمْ، فَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ نِصْفَ السَّاقَيْنِ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ الْكَعْبَيْنِ، فَيَجْمَعُهُ بِيَدِهِ كَرَاهِيَةَ أَنْ تُرَى عَوْرَتُهُ. [خ٤٤٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: من حەفتێ كەس ژ خەلكێ سوففە[1] یێت دیتین زەلامەك ژ وان نەبوو عەبایەك ل بەر بیت، یان پاتەكێ د خۆوەركرنێ بوو یان هەما پارچەكا پاتەی بوو، ل ستۆیێت خۆ گرێدابوون، هندەكا ژ وان دگەهەشتنە نیڤا لنگان و هندەك دگەهشتنە گۆزەكان، و دەستێ خۆ دهاڤێتنێ دئینا سەرێك ترسا هندێ شەرمینگەها وی بێتە دیتن.**

٣٦٧٣ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: قَالَ: آللهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ، إِنْ كُنْتُ لأَعْتَمِدُ بِكَبِدِي عَلَى الأَرْضِ مِنَ الجُوعِ، وَإِنْ كُنْتُ لأَشُدُّ الحَجَرَ عَلَى بَطْنِي مِنَ الجُوعِ. وَلَقَدْ قَعَدْتُ يَوْماً عَلَى طَرِيقِهِمُ الَّذِي يَخْرُجُونَ مِنْهُ، فَمَرَّ أَبُو بَكْرٍ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ، مَا سَأَلْتُهُ إِلاَّ لِيُشْبِعَنِي، فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ. ثُمَّ مَرَّ بِي عُمَرُ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ، مَا سَأَلْتُهُ إِلاَّ لِيُشْبِعَنِي، فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ. ثُمَّ مَرَّ بِي أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ)، فَتَبَسَّمَ حِينَ رَآنِي، وَعَرَفَ مَا فِي نَفْسِي وَمَا فِي وَجْهِي، ثُمَّ قَالَ: (**يَا أَبَا هِرٍّ**) ! قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**الْحَقْ**) ، ومَضَى فاتَّبَعْتُهُ، فَدَخَلَ، فَاسْتَأْذَنَ، فَأَذِنَ لِي، فَدَخَلَ، فَوَجَدَ لَبَناً فِي قَدَحٍ، فَقَالَ: (**مِنْ أَيْنَ هَذَا اللَّبَنُ**) ؟ قالوا: أَهْدَاهُ لَكَ فُلاَنٌ أو فُلاَنَةٌ، قال: (**أَبَا هِرٍّ**) ، قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**الْحَقْ إِلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ فَادْعُهُمْ لِي**).

- قَالَ: وَأَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيَافُ الإِسْلاَمِ، لاَ يَأْوُونَ عَلَى أَهْلٍ وَلاَ مَالٍ وَلاَ عَلَى أَحَدٍ، إِذَا أَتَتْهُ صَدَقَةٌ بَعَثَ بِهَا إِلَيْهِمْ، وَلَمْ يَتَنَاوَلْ مِنْهَا شَيْئاً، وَإِذَا أَتَتْهُ هَدِيَّةٌ أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ وَأَصَابَ مِنْهَا وَأَشْرَكَهُمْ فِيهَا .، فَسَاءَنِي ذلِكَ، فَقُلْتُ: وَمَا هَذَا اللَّبَنُ فِي أَهْلِ الصُّفَّةِ؟ كُنْتُ أَحَقَّ أَنَا أَنْ أُصِيبَ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ شَرْبَةً أَتَقَوَّى بِهَا، فَإِذَا جَاؤوا أَمَرَنِي، فَكُنْتُ أَنَا أُعْطِيهِمْ، وَمَا عَسَى أَنْ يَبْلُغَنِي مِنْ هَذَا اللَّبَنِ، وَلَمْ يَكُنْ مِنْ طَاعَةِ اللهِ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ (ﷺ) بُدٌّ، فَأَتَيْتُهُمْ فَدَعَوْتُهُمْ فَأَقْبَلُوا، فَاسْتَأْذَنُوا فَأَذِنَ لَهُمْ، وَأَخَذُوا مَجَالِسَهُمْ مِنَ الْبَيْتِ، قَالَ: (**يَا أَبَا هِرٍّ**) ، قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**خُذْ فَأَعْطِهِمْ**). قَالَ: فَأَخَذْتُ الْقَدَحَ، فَجَعَلْتُ أُعْطِيهِ

(١) خەلكێ سوفە: ئەو بوون یێت مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) یێت هەژار و بێ كەس و كار و ل سەر سەدەقێت خەلكێ مەدینێ دژیان.

الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ، فَأُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى، ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ.

حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وَقَدْ رَوِيَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ، فَأَخَذَ الْقَدَحَ فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ، فَنَظَرَ إِلَيَّ فَتَبَسَّمَ، فَقَالَ: (**أَبَا هِرٍّ**) ، قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**بَقِيتُ أَنَا وَأَنْتَ**). قُلْتُ: صَدَقْتَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**اقْعُدْ فَاشْرَبْ**). فَقَعَدْتُ فَشَرِبْتُ، فَقَالَ: (**اشْرَبْ**). فَشَرِبْتُ، فَمَا زَالَ يَقُولُ: (**اشْرَبْ**). حَتَّى قُلْتُ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَجِدُ لَهُ مَسْلَكاً، قَالَ: (**فَأَرِنِي**). فَأَعْطَيْتُهُ الْقَدَحَ، فَحَمِدَ اللهَ وَسَمَّى وَشَرِبَ الْفَضْلَةَ. [خ٦٤٥٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ)، گۆت: ئەز ب خودێ کەم یێ کو چو خودا و پەرستی یێت راست و دورست نە ئەو نەبیت، من ژ برساندا زکێ خۆ ب ئاخێ دڤەنا، و من ژ برساندا بەر ل سەر زکێ خۆ دگڤاشتن، رۆژەکێ ئەز د رێکا واندا روینشتم یا ئەو لێ دەردکەفتن، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر منرا بۆری، وەختێ ئەز دیتیم گرنژی، و زانی چ ل سەر و چاڤێت من دیارە و کا چ د دلێ مندایە، پاشی گۆت: (یا ئەبا هیڕ)، من گۆت: بەلێ پاشی بەلێ یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (بگەهە من)، و چۆ و ئەز د دویڤرا چۆم، چۆ د ژۆرڤە و دەستویری خواست، و دەستویرییا من دا و ئەز چۆمە د ژۆرڤە، هندە شیر د پەرداغەکیدا دیت، ئینا گۆت: (ئەڤ شیرە ژ کیرێیە)؟ گۆتن: بێڤانی یان بێڤانێ بۆ تە کرە دیاری، گۆت: (یا ئەبا هیڕ)، من گۆت: بەلێ پاشی بەلێ یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (بگەهە خەلکێ سوففێ وان گازیکە)، گۆت: و خەلکێ سوففێ مێڤانێت ئیسلامێ بوون نەدچۆنە دەڤ چو کەس و کاران و نە چو مالان و نە کەسێ، هەکە سەدەقەك بۆ هاتبا بۆ وان دهنارت، و چو ژێ نەهەلدگرت، و هەکە دیارییەك بۆ هاتبا هندەك ژێ رادکر و یا دی بۆ وان دهنارت و پشکدار دکرن، بۆ من ئەڤە (گازیکرنا خەلکێ سوففێ) یا نەخۆش بوو و من گۆت: ما ئەڤ شیرە دێ چ ل خەلکێ سوففێ کەت؟ ئەز پێدڤیتر بووم فرەکا ڤی شیری ڤەخۆم پێ ب هێز بکەڤم، و هەکە هاتن دێ ئەمرێ من کەت ئەز بدەمە وان و ما دێ چ گەهیتە من ژ ڤی شیری، بەلێ چو رێك نەبوون دڤێت گوهدارییا خودێ و گوهدارییا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بکەم، ئەز چۆمە دەڤ وان و من گازیکرن، هاتن و دەستویری خواستن، ئینا دەستویرییا وان دا و ل جهێت خۆ ژ مالێ**

رووینشتنە خوارێ، گۆت: **(یا ئەبا هیڕ)**، من گۆت: بەلێ پاشی بەلێ یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(بگرە بدە وان)**، گۆت من پەرداغ هەلگرت و من دەست پێ كر من ددا زەلامی ڤەدخوار هەتا تێر دبوو، پاشی دا بۆ من زڤرینیت، دا دەمە ئێكێ دی دا ڤەخۆت هەتا تێر دبوو پاشی دا پەرداغی بۆ من زڤرینیت، هەتا ئەز گەهشتیمە پێغەمبەری (ﷺ) و هەمیا تێر ڤەخواری، پەرداغ هەلگرت و دانا سەر دەستێ خۆ، و بەرێ خۆ دا من و گرنژی، گۆت: **(یا ئەبا هیڕ)**، من گۆت: بەلێ پاشی بەلێ یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(ئەز و تو یێت ماین)**، من گۆت: راست دبێژی یا پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: **(روینە خوارێ و ڤەخۆ)**، ئەز رووینشتمە خوار و من ڤەخوار، گۆت: **(ڤەخۆ)**، من ڤەخوار، و هەر دگۆت: **(ڤەخۆ)**، و من ڤەدخوار هەتا من گۆتی: ئەز ب وی كەمە یێ تو ب حەقییێ هنارتی ئەز چو جها بۆ نابینم بچیتێ، ئینا گۆت، **(كا نیشا من بدە)**، من پەرداغ دا ڤێ حەمدا خودایێ مەزن كر و ناڤێ وی ئینا و یا مای ڤەخوار.

٣٦٧٤ - (م) عَنِ الْمِقْدَادِ قَالَ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَصَاحِبَانِ لِي، وَقَدْ ذَهَبَتْ أَسْمَاعُنَا وَأَبْصَارُنَا مِنَ الْجَهْدِ، فَجَعَلْنَا نَعْرِضُ أَنْفُسَنَا عَلى أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْهُمْ يَقْبَلُنَا. فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ (ﷺ)، فَانْطَلَقَ بِنَا إِلَى أَهْلِهِ، فَإِذَا ثَلاَثَةُ أَعْنُزٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(احْتَلِبُوا هَذَا اللَّبَنَ بَيْنَنَا)**. قَالَ: فَكُنَّا نَحْتَلِبُ، فَيَشْرَبُ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنَّا نَصِيبَهُ، وَنَرْفَعُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) نَصِيبَهُ. قَالَ: فَيَجِيءُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيُسَلِّمُ تَسْلِيماً لاَ يُوقِظُ نَائِماً، وَيُسْمِعُ الْيَقْظَانَ. قَالَ: ثُمَّ يَأْتِي الْمسْجِدَ فَيُصَلِّي، ثُمَّ يَأْتِي شَرَابَهُ فَيَشْرَبُ.[م٢٠٥٥].

ژ میقدادی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز و دو هەڤالێت خۆ هاتین و گوه و چاڤێت مە ژ برس و وەستیانێ یێت چۆین، و ئەم هاتین مە خۆ بۆ هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بەرچاڤ كر بەلێ كەسێ ژ وان ئەم قەبویل نەكرین، ئینا ئەم هاتینە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و وی ئەم برینە دەڤ مالا خۆ و سێ بزن ل وێرێ بوون، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(شیرێ ڤان د ناڤبەرا مەدا بدۆشن)**، گۆت: و مە دۆتن و هەر ئێكی ژ مە بارا خۆ ڤەدخوار و بارا پێغەمبەری (ﷺ) مە بۆ رادكر، گۆت: ڤێجا ب شەڤ دا هێت و دا سلاڤ كەت سلاڤەكا وەسا نڤستی هشیار نەدكر و هشیاری گوه لێ دبا. گۆت: پاشی دهاتە مزگەفتێ نڤێژ دكر، پاشی دهاتە شیرێ خۆ و ڤەدخوار.

٣٦٧٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ ـ أَوْ لَيْلَةٍ ـ، فَإِذَا هُوَ بِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقَالَ: (**مَا أَخْرَجَكُمَا مِنْ بُيُوتِكُمَا هَذِهِ السَّاعَةَ**)؟ قَالاَ: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: (**وَأَنَا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لأَخْرَجَنِي الَّذِي أَخْرَجَكُمَا. قُومُوا**) فَقَامُوا مَعَهُ.

فَأَتَى رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَإِذَا هُوَ لَيْسَ فِي بَيْتِهِ، فَلَمَّا رَأَتْهُ الْمَرْأَةُ قَالَتْ: مَرْحَباً وَأَهْلاً، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَيْنَ فُلاَنٌ**)؟ قَالَتْ: ذَهَبَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا مِنَ الْمَاءِ. إِذْ جَاءَ الأَنْصَارِيُّ فَنَظَرَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَصَاحِبَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ للهِ، مَا أَحَدٌ الْيَوْمَ أَكْرَمَ أَضْيَافاً مِنِّي. قَالَ: فَانْطَلَقَ فَجَاءَهُمْ بِعِذْقٍ فِيهِ بُسْرٌ وَتَمْرٌ وَرُطَبٌ، فَقَالَ: كُلُوا مِنْ هَذِهِ، وَأَخَذَ الْمُدْيَةَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِيَّاكَ وَالْحَلُوبَ**) فَذَبَحَ لَهُمْ، فَأَكَلُوا مِنَ الشَّاةِ، وَمِنْ ذَلِكَ الْعِذْقِ، وَشَرِبُوا. فَلَمَّا أَنْ شَبِعُوا وَرَوُوا، قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: (**وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُسْأَلُنَّ عَنْ هَذَا النَّعِيمِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمُ الْجُوعُ، ثُمَّ لَمْ تَرْجِعُوا حَتَّى أَصَابَكُمْ هَذَا النَّعِيمُ**). [م٢٠٣٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژەکێ دەرکەفت، ئەبوبەکری و عومەری (خودێ ژ هەردووان رازی بیت) دبینیت، ئینا گۆت: (چ هوین ڤی دەمی ژ مالێت هەوە دەرئێخستن)؟ گۆتن: برسێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ، گۆت: (و ئەز، ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستیدا، وێ ئەز یێ دەرئێخستیم یا هوین دەرئێخستین، کا رابن)، د گەل رابوون، هاتنە دەڤ زەلامەکێ ئەنساری خەلکێ مەدینێ، ئەو ل مال نەبوو، وەختێ ژنا وی دیتین، گۆت: ب خێر بێن، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (کا فلان)؟ گۆت: یێ چۆی ئاڤا شرین بۆ مە بینیت، وی دەمی یێ ئەنساری هات، بەرێ خۆ دا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەردو هەڤالێت وی، گۆت: (الحمد لله) کەس ئەڤرۆ ژ من مێڤان قەدر گرانتر و پیرۆزتر نینە، چۆ ئویشییەکێ قەسپان بۆ ئینا و روتەبێت نەزەربووی و روتەب و قەسپ پێکڤە بوون، و گۆت: بخۆن، و کێرەك هەلگرت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: (هشیاری یا ب شیر بی)[1] بۆ وان ڤەکوشت، ژ وی گیسکی خوار و ژ وی ئویشی، و ئاڤ ڤەخوار، ڤێجا پشتی تێر خوارین و تێر ڤەخوارین، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە ئەبوبەکری و عومەری (خودێ ژ هەردووان رازی بیت): (ئەز ب وی کەمە یێ**

(١) ئانكو: یا ب شیر نەڤەکوژی.

**جانێ من د دەستێ ویدا، رۆژا قیامەتێ پرسیارا ڤێ خۆشییێ دێ ژ وە هێتە کرن، برسێ هوین ژ مالێت هەوە دەرێخستن، پاشی هوین نەزڤرین هەتا ئەڤ خۆشییە گەهشتییە هەوە).**

٨. باب: غزوة ذات الرقاع

**بابەتێ: خەزایا زاتولریقاع.**

٣٦٧٦ - (ق) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسى رضي الله عنه قالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) في غَزَاةٍ وَنَحْنُ سِتَّةُ نَفَرٍ، بَيْنَنَا بَعِيرٌ نَعْتَقِبُهُ، فَنَقِبَتْ أَقْدَامُنَا، وَنَقِبَتْ قَدَمَايَ، وَسَقَطَتْ أَظفَارِي، وَكُنَّا نَلفُّ عَلَى أَرْجُلِنَا الخِرَقَ، فَسُمِّيَتْ غَزْوَةَ ذَاتِ الرِّقَاعِ، لِمَا كُنَّا نَعْصِبُ مِنَ الخِرَقِ عَلَى أَرْجُلِنَا. وَحَدَّثَ أَبُو مُوسى بِهَذَا، ثُمَّ كَرِهِ ذَاكَ، قالَ: ما كُنْتُ أَصْنَعُ بِأَنْ أَذْكُرَهُ، كَأَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَكُونَ شَيْءٌ مِنْ عَمَلِهِ أَفْشَاهُ. [خ٤١٢٨/ م١٨١٦].

**ژ ئەبی بوردەی ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ خەزایەکێ دەرکەفتین، و ئەم شەش کەس ب حێشترەکێ بووین مە ئێك و دو دگوهۆری، پێت مە پەق پەق بوون، و پێت من ژی پەق پەق بوون، و نینۆکێت من کەفتن، مە پاتە دئێخستنە پێت خۆ، هاتە ناڤکرن خەزایا خودان پنیك، هندی مە پاتە د پێت خۆ وەرکربوون. ئەبو بوردەی گۆت: ئەبو مووسایی ئەڤ حەدیسە گۆت، پاشی پێ نەخۆش بوو، و گۆت: من نەدڤیا یا من کری بێژم، گۆت: هەروەکی پێ نەخۆش بوو تشتەك ژ کارێ کری ئاشکرا بکەت.**

٩ . باب: عمرة القضاء

**بابەتێ: خەزایا عومرەیا ڤەزایێ.**

٣٦٧٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَرَجَ مُعْتَمِراً، فَحالَ كُفَّارُ قُرَيْشٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، فَنَحَرَ هَدْيَهُ، وَحَلَقَ رَأْسَهُ بِالحُدَيْبِيَةِ، وَقَاضَاهُمْ عَلَى: أَنْ يَعْتَمِرَ الْعَامَ المقْبِلَ، وَلاَ يَحْمِلَ سِلاَحاً عَلَيْهِمْ إِلاَّ سُيُوفاً، وَلاَ يُقِيمَ بِهَا إِلاَّ ما أَحَبُّوا. فَاعْتَمَرَ مِنَ الْعَامِ المقْبِلِ، فَدَخَلَهَا كَما كَان صَالَحَهُمْ، فَلَما أَقَامَ بِهَا ثَلاَثاً، أَمَرُوهُ أَنْ يَخْرُجَ فَخَرَجَ. [خ٢٧٠١]

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەرکەفت عومرێ بکەت، گاورێت ڤورەیشییان کەفتنە د ناڤبەرا وی و مالا خودێدا، ئینا ڤوربانێ خۆ ڤەکوشت و سەرێ خۆ ل حودەیبییێ تراشت، و د گەل وان پێکهات ئەو ل سالا بهێت**

**عومرێ بكەت، و چەكی نە هەلگریت شیر نەبیت، و ل وێرێ نەمینیت هند نەبیت وان بڤێت، و سالا دی عومرە كر، و وەسا چۆ د مەكەهێدا وەكی د گەل وان پێكهاتی، ڤێجا دەمێ سێ رۆژان مایە تێدا، فەرمان لێ كر دەركەڤیت ئینا دەركەڤت.**

٣٦٧٨ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَاعْتَمَرْنَا مَعَهُ، فَلَمَّا دَخَلَ مَكَّةَ طَافَ وَطُفْنَا مَعَهُ، وَأَتَى الصَّفَا وَالمَرْوَةَ وَأَتَيْنَاهُمَا مَعَهُ، وَكُنَّا نَسْتُرُهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ أَنْ يَرْمِيَهُ أَحَدٌ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبٌ لِي: أَكَانَ دَخَلَ الْكَعْبَةَ؟. قَالَ: لاَ. [خ١٧٩١ (١٦٠٠)].

**ژ عەبدوللایێ كورێ ئەبی ئەوفایی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عومرە كر، و مە ژی عومرە د گەل كر، ڤێجا دەمێ چۆیە د مەكەهێدا تەواف كر و مە ژی تەواف د گەل كر، و هاتە سەفا و مەروایێ و ئەم ژی د گەل هاتینە سەفا و مەروایێ، و مە پێغەمبەر (ﷺ) ژ خەلكێ مەكەهێ دڤەشارت ترسا هندێ ئێك تیرەكێ باڤێژیتێ، ئینا هەڤالەكێ من گۆتێ: ئەرێ چۆبوو د كەعبێڤە؟ گۆت: نەخێر.**

## ١٠ . باب: غزوة مؤتة

## بابەتێ: خەزایا موئتە.

٣٦٧٩ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَمَّرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ مُؤْتَةَ زَيْدَ بْنَ حارِثَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنْ قُتِلَ زَيْدٌ فَجَعْفَرٌ، وَإِنْ قُتِلَ جَعْفَرٌ فَعَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ**).

قَالَ عَبْدُ اللهِ: كُنْتُ فِيهِمْ فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ، فَالْتَمَسْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَوَجَدْنَاهُ فِي الْقَتْلَى، وَوَجَدْنَا مَا فِي جَسَدِهِ بِضْعاً وَتِسْعِينَ، مِنْ طَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ. [خ٤٢٦١ (٤٢٦٠)].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زەیدێ كورێ حاریسەیی ل خەزایا موئتە كرە سەردار، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر زەید هاتە كوشتن جەعفەرە و ئەگەر جەعفەر هاتە كوشتن عەبدوللایێ كورێ رەواحەیە).**

**عەبدوللایی گۆت: ئەز د گەل وان بووم د ڤێ خەزایێدا، ئەم ل جەعفەرێ كورێ ئەبی تالبی گەریاین مە د ناڤ كوشتییاندا دیت، و مە نۆت و تشتەك برین د لەشێ وی دیتن ژ لێدانا شیری و هاڤێتنا رمێ و تیرێ.**

٣٦٨٠ - (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: (أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا جَعْفَرٌ فأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا عَبْدُ اللهِ بْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا خالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ عَنْ غَيْرِ إِمْرَةٍ، فَفُتِحَ عَلَيْهِ، وَمَا يَسُرُّنِي، أَوْ قَالَ: ما يَسُرُّهُمْ، أَنَّهُمْ عِنْدَنا). وَقَالَ: وَإِنَّ عَيْنَيْهِ لَتَذْرِفَانِ. [خ٣٠٦٣ (١٢٤٦)].

ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتار دا و گۆت: **(زەیدی ئالا هەلگرت و هاتە كوشتن، پاشی جەعفەری هەلگرت و ئەو هاتە كوشتن، پاشی عەبدوللایێ كوڕێ رەواحەی هەلگرت، و هاتە كوشتن، پاشی خالدێ كوڕێ وەلیدی بێی فەرمان ل سەر سەرداریيا وی هەبیت هەلگرت ئینا خودێ ل سەر دەستێ وی ڤەكر، و من پێخۆش نینە یان گۆت؛ وان پێخۆش نینە ئەو ل دەڤ مە بان و شەهید نەبان)**، و ئەنەسی گۆت: و هەردو چاڤێت وی رۆندك دباراندن.

٣٦٨١ - (خ) عَنْ خالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ قالَ: لَقَدِ انْقَطَعَتْ فِي يَدِي يَوْمَ مُؤْتَةَ تِسْعَةُ أَسْيَافٍ، فَمَا بَقِيَ فِي يَدِي إِلاَّ صَفِيحَةٌ يَمَانِيَةٌ. [خ٤٢٦٥].

ژ خالدێ كوڕێ وەلیدی (رضي الله عنه) گۆت: ل رۆژا موئتە نەهـ شیر د دەستێ مندا شكەستن، چو خۆ د دەستێ مندا نەگرت شیرەكێ یەمەنی یێ درێژ نەبیت.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

## الفصل العاشر: فتح مكة وما تبعه

## پشكا دەهێ: ڤەكرنا مەكەهێ و ئەوا د دویڤدا هاتی

### ١. باب: رسالة حاطب رضي الله عنه

### بابەتێ: نامەیا حاتبی (رضي الله عنه).

٣٦٨٢ - (ق) عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالمِقْدَادَ فَقَالَ: (**انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خاخٍ، فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ، فَخُذُوهُ مِنْهَا**). قَالَ: فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ، فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ، قُلْنَا لَهَا: أَخْرِجِي الْكِتَابَ، قَالَتْ: ما معِي كِتَابٌ، فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ، أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، قالَ: فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا، فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَإِذَا فِيهِ: مِنْ حاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ، إِلَى نَاسٍ بِمَكَّةَ مِنَ المشْرِكِينَ، يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يَا حَاطِبُ، مَا هَذَا**) ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقاً فِي قُرَيْشٍ. يَقُولُ: كُنْتُ حَلِيفاً. وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا، وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ المهَاجِرِينَ، مَنْ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ، فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذلِكَ مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ، أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَداً يَحْمُونَ قَرَابَتِي، وَلَمْ أَفْعَلْهُ ارْتِدَاداً عَنْ دِينِي، وَلاَ رِضاً بِالْكُفْرِ بَعْدَ الإِسْلاَمِ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكُمْ**). فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ! دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا المنَافِقِ. فَقَالَ: (**إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْراً، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَ اطَّلَعَ عَلَى مَنْ شَهِدَ بَدْراً فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ**). فَأَنْزَلَ اللهُ السُّورَةَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَآءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِٱلْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلْحَقِّ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ [الممتحنة:١] . [خ٤٢٧٤ (٣٠٠٧)/ م٢٤٩٤].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز و زوبەیر و میقداد هنارتین و گۆت: (هەرن هەتا هوین دگەهنە مێرگا خاخ[1] ژنەكا رێڤینگ یا ل وێرێ و نامەیەكا د گەل وێ نامێ ژێ وەرگرن)، گۆت: ئەم دەركەفتین و هەسپێت مە مە ب غار دبەن هەتا ئەم هاتینە وێ مێرگێ، و مە ئەو ژنا رێڤیگ دیت، مە گۆتێ: وێ نامەیێ دەربێخە، گۆت: چو نامە ڤ من نینن، مە گۆت: یان دێ نامەیێ دەرئێخی یان دێ جلكێت خۆ ئێخی، گۆت:**

---

(١) جهەكە دكەڤیتە د ناڤبەرا مەكەهێ و مەدینەیێدا و بۆ مەدینەیێ نێزیكترە.

ئينا ژ ناڤ گەزيا خۆ دەرئێخست، مە ئينا دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە تێدا بوو: ژ حاتبێ كوڕێ ئەبى بەلتەعەيى بۆ هندەك خەلكێت مەكەهێ ژ قورەيشييان، وى ئەو ب هندە كارێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئاگەهدار كرن، ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەى حاتب ئەڤە چييە)؟** گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ لەزێ ل فەرمانێ ل سەر من نە كە، ئەز مرۆ ڤەك ب قورەيشيانڤە گر ێداى بووم و ئەز هەڤ پەيمان بووم د گەل قورەيشييان و ئەز ب خۆ نە ژ وان بووم، و ئەوێت د گەل تە ژ مشەختان وان مرۆڤێت خۆ هەين خەلكێ وان و مالێ وان بپارێزيت و من دڤيا ئەگەر ئەڤە ژ من چۆ ژ مالباتييێ د ناڤ واندا ئەز قەنجييەكێ ل وان بكەم مرۆڤێت من پێ بپارێزن، و من ئەڤە ژ زڤرينا ژ دينێ خۆ و رازيبوون ب گاورييێ پشتى ئيسلامێ نەكرييە.

ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هنديكە ئەڤە يە ب راستى وى راستى د گەل هەوە گۆت)**، ئينا عومەرى گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ: من بهێلە ئەز ل ستۆيێ ڤى دوڕوى بدەم، ئينا پێغەمەرى (ﷺ) گۆت: **(وى پشكدارى يا د بەدرێدا كرى ما تو چ دزانى دبيت خودێ بەرێ خۆ دابيتە خەلكێ بەدرێ و گۆتبيت: هەر تشتێ هەوە دڤێت بكەن ب راستى من گونەهێت هەوە پێت ژێ برين)**، ئينا خودێ ئەڤ سۆرەتە ئينا خوارێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ﴾ هەتا گۆتنا خودێ ﴿فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾(١).

---

(١) راڤەكرنا ئايەتێ ب كورتى: گەلى خودان باوەران، نەيارێ من و نەيارێ خۆ نەكەنە دۆست و هەڤال، هوين لەزێ ل حەژێكرنا وان دكەن و ئەو ب خۆ باوەرييێ ب دينى و قورئانا بۆ هەوە هاتى نائينن، و پشتا خۆ ددەنێ چونكى هەوە باوەرى ب خودايێ خۆ ئينابوو، هوين و پێغەمبەر [ژ مەكەهێ] دەرئێخستن، ژ بەر وێ باوەرييا هەوە ب خودێ ئينايى، خودايێ خۆ [ڤێجا چاوا هوين حەژ وان دكەن؟] و ئەگەر هوين بۆ جيهادێ و رازيبوونا من دەركەفتبن [دۆستينى و حەژێكرنا وان نەكەن] هوين ب دزيڤە ژ بەر وێ حەژێكرنێ، دەنگ و بەحسان دگەهيننە وان، و ئەز چێتر دزانم هوين چ ڤەدشێرن و چ ئاشكەرا دكەن، و هەر كەسێ ژ هەوە هەڤالينيیا وان بكەت [نهێنييێت موسلمانان بۆ وان ئاشكەرا بكەت]، ب سويند وى رێكا راست بەرزە كر.

## ٢ . باب: غزوة الفتح في رمضان

### بابەتێ: خەزایا ڤەكرنا مەكەهێ د رەمەزانێدا.

٣٦٨٣ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ فِي رَمَضَانَ مِنَ المَدِينَةِ وَمَعَهُ عَشَرَةُ آلاَفٍ، وَذلِكَ عَلَى رَأْسِ ثَمَانِ سِنِينَ وَنِصْفٍ مِنْ مَقْدَمِهِ المَدِينَةَ، فَسَارَ هُوَ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ المُسْلِمِينَ إِلَى مَكَّةَ، يَصُومُ وَيَصُومُونَ، حَتَّى بلغ الْكَدِيدَ، وَهُوَ مَاءٌ بَيْنَ عُسْفَانَ وَقُدَيْدٍ، أَفْطَرَ وَأَفْطَرُوا. [خ٤٢٧٦ (١٩٤٤)/ م١١١٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) پێغەمبەر (ﷺ) د رەمەزانێدا ژ مەدینەیێ دەركەفت و دەه هزار د گەل بوون، و ئەڤە ژی پشتی هەشت سال و نیڤان ل سەر هاتنا وی بۆ مەدینەیێ، ئەو و ئەوێت د گەل ژ موسلمانان چۆنە مەكەهی، وی رۆژی دگرت و وان ژی رۆژی دگرتن، هەتا گەهشتییە كەدیدێ و ئەو ئاڤەكە دكەڤیتە د ناڤبەرا عوسفان و قودەیدێدا، ئینا رۆژی خوار و وان ژی خوار.**

## ٣ . باب: دخول مكة

### بابەتێ: هاتنا د ناڤ مەكەهێدا.

٣٦٨٤ - (خ) عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: لَمَّا سَارَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عامَ الْفَتْحِ، فَبَلَغَ ذلِكَ قُرَيْشاً، خَرَجَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ، وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ، وَبُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ، يَلْتَمِسُونَ الْخَبَرَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَقْبَلُوا يَسِيرُونَ حَتَّى أَتَوْا مَرَّ الظَّهْرَانِ، فَإِذَا هُمْ بِنِيرَانٍ كَأَنَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ، فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: ما هذِهِ، لَكَأَنَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ؟ فَقَالَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ: نِيرَانُ بَنِي عَمْرٍو، فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: عَمْرٌو أَقَلُّ مِنْ ذلِكَ، فَرَآهُمْ نَاسٌ مِنْ حَرَسِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَدْرَكُوهُمْ فأَخَذُوهُمْ، فَأَتَوْا بِهِمْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَأَسْلَمَ أَبُو سُفْيَانَ، فَلَمَّا سَارَ قَالَ لِلْعَبَّاسِ: (**احْبِسْ أَبَا سُفْيَانَ عِنْدَ خَطْمِ الْجَبَلِ، حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى الْمُسْلِمِينَ**).

فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: يَا عَبَّاسُ! حَبَّذَا يَوْمُ الذِّمَارِ. ثُمَّ جاءَتْ كَتِيبَةٌ، وَهْيَ أَقَلُّ الْكَتَائِبِ، فِيهِمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَأَصْحَابُهُ، وَرَايَةُ النَّبِيِّ (ﷺ) مَعَ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، فَلَمَّا مَرَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِأَبِي سُفْيَانَ قَالَ: أَلَمْ تعْلَمْ مَا قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ؟ قَالَ: (**مَا قَالَ**) ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: (**كَذَبَ سَعْدٌ، ولكِنْ هَذَا يَوْمٌ يُعَظِّمُ اللهُ فِيهِ الْكَعْبَةَ، وَيَوْمٌ تُكْسى فِيهِ الْكَعْبَةُ**). قَالَ: وَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنْ تُرْكَزَ رَايَتُهُ بِالْحَجُونِ...

قَالَ: وَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ أَنْ يَدْخُلَ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ مِنْ كَدَاءٍ، وَدَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ كُدًا، فَقُتِلَ مِنْ خَيْلِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ رضي الله عنه يَوْمَئِذٍ رَجُلانِ: حُبَيْشُ بْنُ الأَشْعَرِ، وَكُرْزُ بْنُ جابِرٍ الْفِهْرِيُّ. [خ٤٢٨٠ (٢٩٧٦)]

**ژ عوروەیی (رضي الله عنه) گۆت: دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) ل سالا ڤەکرنا مەکەهێ دەر کەفتی، ئەڤە گەهشتە قورەیشییان، ئەبو سوفیان و حەکیمێ کوڕێ حیزامی و بودەیلێ کوڕێ وەرقائی دەرکەفتن دویڤچۆنا وی بەحسی ژ پێغەمەرێ خودێ (ﷺ) هاتی بکەن، هاتن و بەردەوام چۆن هەتا گەهشتینە مەرڕا زەهران[1]، ڤێجا وان هندەك ئاگر دیتن، وەکی ئاگرێت عەرەفێنە، ئینا ئەبو سوفیانی گۆت: ئەڤە چییە هەروەکی ئاگرێت عەرەفێنە؟ ئینا بودەیلێ کوڕێ وەرقائی گۆت: ئەڤە ئاگرێت بەنی عەمرن، ئینا ئەبو سوفیانی گۆت: بەنی عەمر ژ هندێ کێمترن، ئینا هندەك زێرەڤانێت پێغەمبەری (ﷺ) ئەو دیتن، ئینا گەهشتنە وان و ئەو گرتن و ئینانە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا ئەبو سوفیان موسلمان بوو، ڤێجا دەمێ چۆی، پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە عەباسی: (ئەبو سوفیانی ل گەلیکێ چیای راوەستینە دا بەرێ خۆ بدەتە موسلمانان).**

**ئینا ئەبو سوفیانی گۆت: ئەی عەباس ئەڤرۆ رۆژا ژ ناڤچۆنێیە خۆزی من هێز هەبایە من ملەتێ خۆ پاراستبا، پاشی ڤۆلەك هات و ئەو کێمترین ڤۆل بوو، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و هەڤالێت وی د گەل بوون، و ئالایێ پێغەمبەری (ﷺ) د گەل زوبەیرێ کوڕێ عوامی بوو، ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د بەر ئەبی سوفیانیڕا بۆری، گۆت: تە نەزانییە کا سەعدێ کوڕێ عوبادەیی چ گۆت؟ گۆت: (چ گۆت)؟ گۆت: ئەڤە و ئەڤە گۆت، ئینا گۆت: (سەعد خەلەت بوو بەلێ ئەڤە رۆژەکە خودێ دێ کەعبێ تێدا مەزن کەت و رۆژەکە کەعبە تێدا دێ هێتە کارکرن ) گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) فەرمان کر ئالا ل حجوونێ بهێتە چکلاندن[2].**

**گۆت: و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وێ رۆژێ فەرمان ل خالدێ کوڕێ وەلیدی کر ئەو د کەدائێڕا ل سەرێ مەکەهێ بچیتە د ناڤدا و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل کودایێ (ل بنێ**

---

(١) نهالەکا بەرفرەهە و (٢١٠) کم یا درێژە و ژ تائیفێ دەست پێ دکەت و ل جەددە ب دویماهی دهێت.

(٢) جهەکە ل سەرێ مەکەهێ.

**مەكەهێ) هاتە د ناڤدا، و شەرێ خالدی هاتە كرن، و دو ژ سویارێت وی هاتنە كوشتن، حوبەیشێ كورێ ئەشعەری، و كورزێ كورێ جابرێ فیهری.**

## ٤. باب: إزالة الأَصنام

## بابەتێ: نەهێلانا بوتان.

٣٦٨٥ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ، وَحَوْلَ الْبَيْتِ سِتُّونَ وَثَلاَثُمِائَةِ نُصُبٍ، فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ فِي يَدِهِ ويَقُولُ: (﴿جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُۚ﴾[الإسراء:٨١] ، ﴿جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ [سبأ:٤٩]).

[خ٤٢٨٧ (٢٤٧٨)/ م١٧٨١].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا ڤەكرنێ هاتە د مەكەهێدا و سێ سەد و شێست بوت دۆرماندۆرێت كەعبێ بوون، و دارەك د دەستێ ویدا بوو لێ ددا و دگۆت: ﴿جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُۚ﴾[1] ﴿جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾[2].**

## ٥ . باب: لا هجرة بعد الفتح

## بابەتێ: مشەختبوون پشتی ڤەكرنا مەكەهێ نینە.

٣٦٨٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: (لاَ هِجْرَةَ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا). [خ٣٠٧٧ (١٣٤٩)/ م١٣٥٣].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) ل رۆژا ڤەكەرنا مەكەهێ گۆت: (پشتی ڤەكرنا مەكەهێ، مشەختبوون نەما[3]، بەلێ جیهاد و نیەتە[4]، و هكە ژ وە خواست هەمی پێكڤە بۆ جیهادێ رابن پێكڤە رابن).**

---

(١) رامان ب كورتی: هەقی و ئیسلام و ئەو ژڤانێ خودێ ب سەركەفتنا وان دایی هات، و پویچی و شیرك چۆ نەما.

(٢) رامان ب كورتی: راستی هات كو ئێكینییا خودێیە و ئیسلام و قورئانە، و پویچی نەما، ژ نوی پێڤە نازڤریتەڤە.

(٣) مەخسەد مشختبوون ژ مەكەهێ بۆ مەدینێ.

(٤) ئانكو: هێلانا وەلاتی بۆ جیهادێ و ئنیەتا خێرێ یا بەردەوامە.

٣٦٨٧ - (خ) عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: زُرْتُ عائِشَةَ مَعَ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، فَسَأَلْهَا عَنِ الْهِجْرَةِ، فَقَالَتْ: لاَ هِجْرَةَ الْيَوْمَ، كانَ المؤْمِنُ يَفِرُّ أَحَدُهُمْ بِدِينِهِ إِلَى اللهِ وَإِلَى رَسُولِهِ (ﷺ)، مَخَافَةَ أَنْ يُفْتَنَ عَلَيْهِ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَقَدْ أَظْهَرَ اللهُ الإِسْلاَمَ، فَالمؤْمِنُ يَعْبُدُ رَبَّهُ حَيْثُ شَاءَ، وَلكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ. [خ٤٣١٢ (٣٠٨٠)].

**ژ عەتائێ كوڕێ رەباحی (ﷺ) گۆت: من د گەل عوبەیدێ كوڕێ عومەیری سەرەدانا عائیشایێ كر، پرسیارا مشەختبوونێ ژێ كر، ئینا گۆت: ئەڤرۆ مشەختبوون نینە، د وەختێ خۆدا باوەریدار ئێك ژ وان ب دینێ خۆڤە بۆ دەڤ خودێ و پێغەمبەرێ وی (ﷺ) درەڤی، ترسا هندێ بهێتە ئێزادان و وی ژ دینێ وی ڤەكەن، بەلێ ئەڤرۆ ئیسلام سەركەفت و باوەریدار هەر جهێ بڤێت خودایێ خۆ دپەرێسیت، بەلێ جیهاد و ئنیەتە[1].**

## ٦ . باب: انتظار العرب بإسلامهم إسلام أهل مكة

## بابەتێ: چاڤەرێكرنا عەرەبان بۆ موسلمانبوونا خەلكێ مەكەهێ.

٣٦٨٨ - (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: كُنَّا بِمَاءٍ مَمَرَّ النَّاسِ، وَكَانَ يَمُرُّ بِنَا الرُّكْبَانُ فَنَسْأَلُهُمْ: مَا لِلنَّاسِ، مَا لِلنَّاسِ؟ مَا هَذَا الرَّجُلُ؟ فَيَقُولُونَ: يَزْعَمُ أَنَّ اللهَ أَرْسَلَهُ، أَوْحى إِلَيْهِ . أَوْ: أَوْحى اللهُ بِكَذَا . فَكُنْتُ أَحْفَظُ ذلِكَ الْكَلاَمَ، وَكَأَنَّمَا يُقَرُّ فِي صَدْرِي، وَكَانَتِ الْعَرَبُ تَلَوَّمُ بِإِسْلاَمِهِمِ الْفَتْحَ، فَيَقُولُونَ: اتْرُكُوهُ وَقَوْمَهُ، فَإِنَّهُ إِنْ ظَهَرَ عَلَيْهِمْ فَهُوَ نَبِيٌّ صَادِقٌ. فَلَمَّا كَانَتْ وَقْعَةُ أَهْلِ الْفَتْحِ، بَادَرَ كُلُّ قَوْمٍ بِإِسْلاَمِهِمْ، وَبَدَرَ أَبِي قَوْمِي بِإِسْلاَمِهِمْ، فَلَمَّا قَدِمَ قَالَ: جِئْتُكُمْ وَاللهِ مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) حَقّاً. [خ٤٣٠٢].

**ژ عەمرێ كوڕێ سەلەمەیی (ﷺ) گۆت: ئەم ل سەر ئاڤەكێ بووین رێ و رێبارا خەلكی بوو، و سویار د دەڤ مەرا دبۆرین، و مە پرسیار ژێ دكر خەلكی چییە؟ خەلكی چییە؟ ئەڤە چ زەلامە؟ دگۆتن: دبێژیت: خودێ ئەو یێ هنارتی، یان وەحی یێ بۆ هاتی ـ یان: خودێ ئەڤە و ئەڤە وەحی یێ بۆ ئینای ـ و من ئەو ئاخفتن ژبەر دكرن، و هەروەكی د دلێ مندا دهێنە بنەجهكرن، و عەرەبان د موسلمانبوونا خۆدا خۆ ل ڤەكرنا مەكەهێ د گرت، و د گۆتن: وی و ملەتێ وی بهێلن، و ئەگەر ئەو سەركەفت ئەو پێغەمبەرە و راستگۆیە، ڤێجا دەمێ رویدانا ڤەكرنا مەكەهێ چێ بووی هەر ئێكی لەز ل موسلمانبوونا**

**(١) ئانكو: هێلانا وەلاتی بۆ جیهادێ و ئنیەتا خێرێ یا بەردەوامە.**

خۆ كر و بابێ من ب موسلمانبوونا خۆ د بەری هۆزا مەڕا كر، ڤێجا دەمێ زڤرییە ڤە و هاتی، گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەز یێ ژ دەڤ پێغەمبەرەكێ راست هاتیمە دەڤ هەوە.

### ٧. باب: غزوة حنين

### بابەتێ: خەزایا حونەین.

٣٦٨٩ - (م) عَنِ العباس رضي الله عنه قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَوْمَ حُنَيْنٍ، فَلَزِمْتُ أَنَا وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، فَلَمْ نُفَارِقْهُ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ بَيْضَاءَ، أَهْدَاهَا لَهُ فَرْوَةُ بْنُ نُفَاثَةَ الْجُذَامِيُّ. فَلَمَّا الْتَقَى الْمُسْلِمُونَ وَالْكُفَّارُ، وَلَّى الْمُسْلِمُونَ مُدْبِرِينَ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَرْكُضُ بَغْلَتَهُ قِبَلَ الْكُفَّارِ.

قَالَ عَبَّاسٌ: وَأَنَا آخِذٌ بِلِجَامِ بَغْلَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَكُفُّهَا إِرَادَةَ أَنْ لاَ تُسْرِعَ، وَأَبُو سُفْيَانَ آخِذٌ بِرِكَابِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَيْ عَبَّاسُ، نَادِ أَصْحَابَ السَّمُرَةِ)**. فَقَالَ عَبَّاسٌ. وَكَانَ رَجُلاً صَيِّتاً .: فَقُلْتُ بِأَعْلَى صَوْتِي: أَيْنَ أَصْحَابُ السَّمُرَةِ؟ قَالَ: فَوَاللهِ لَكَأَنَّ عَطْفَتَهُمْ، حِينَ سَمِعُوا صَوْتِي، عَطْفَةُ الْبَقَرِ عَلَى أَوْلاَدِهَا، فَقَالُوا: يَا لَبَّيْكَ! يَا لَبَّيْكَ! قَالَ: فَاقْتَتَلُوا وَالْكُفَّارَ، وَالدَّعْوَةُ فِي الأَنْصَارِ يَقُولُونَ: يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! قَالَ: ثُمَّ قُصِرَتِ الدَّعْوَةُ عَلى بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ. فَقَالُوا: يَا بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ! يَا بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ! فَنَظَرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ عَلَى بَغْلَتِهِ، كَالْمُتَطَاوِلِ عَلَيْهَا، إِلَى قِتَالِهِمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(هَذَا حِينَ حَمِيَ الْوَطِيسُ)**. قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَصَيَاتٍ فَرَمَى بِهِنَّ وُجُوهَ الْكُفَّارِ. ثُمَّ قَالَ: **(انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ!)** قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ فَإِذَا الْقِتَالُ عَلَى هَيْئَتِهِ فِيمَا أَرَى. قَالَ: فَوَاللهِ! مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَمَاهُمْ بِحَصَيَاتِهِ، فَمَا زِلْتُ أَرَى حَدَّهُمْ كَلِيلاً وَأَمْرَهُمْ مُدْبِراً. [م١٧٧٥]

- وفي رواية: قَالَ: وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) يَرْكُضُ خَلْفَهُمْ عَلَى بَغْلَتِهِ. وفيها: **(انْهَزَمُوا وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، انْهَزَمُوا وَرَبِّ الْكَعْبَةِ)** حَتَّى هَزَمَهُمُ اللهُ.

**ژ عەباسی (رضي الله عنه)، گۆت: ئەز شەڕێ حونەینێ[1] د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووم (ﷺ) من و ئەبو سوفیانێ كوڕێ حارسێ كوڕێ عەبدولموتتەلبی پێغەمبەر گرتبوو و مە نەهێلا، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر هێسترەكا سپی بوو. ڤێجا دەمێ موسلمان و**

(١) حونەین: نهالەكە د ناڤبەرا مەكەهێ و تائیفێدا و (٢٦) كم ژ مەكەهێ دویرە.

**هەڤپشكچێكەر گەهشتینە ئێك موسلمان رەڤین، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستهاڤێتێ هێسترا خۆ راكرە غارێ بۆ راستا گاوران و من هەڤسارێ هێسترا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گرتبوو دا خۆش نە چیت، و ئەبو سوفیانی ركێ با پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گرتبوو، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی عەباس گازی خوداندێت دارا سەمورێ بكە)[1] عەباسی گۆت: - و زەلامەكێ ب دەنگ بوو - من ب هەمی دەنگێ خۆ گۆت كا خوداندێت دارا سەمورەی، ئەز ب خودێ كەمە زڤرینا وان دەمێ گوه ل دەنگێ من بووین وەكی زڤرینا چێلێ بۆ تێژكێت خۆ، گۆتن: لەبێ پاشی لەبێ پاشی لەبێ، و وان و گاوران شەڕ كرن، و گازی خەلكێ مەدینێ دهاتە كرن، دگۆتن: گەلی خەلكێ مەدینێ، پاشی تایبەت گازی بەنی حارس ژ خەزرەجان هاتە كرن، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر هێسترا خۆ بەرێ خۆ دایێ وەكی وی یێ خۆ دكێشیت بۆ شەڕێ وان، ئەڤە گۆت دەمێ شەڕ گەرم بووی. پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هندە حەسحاسك هەلگرتن و هاڤێتنە سەرو چاڤێت گاوران، پاشی گۆت: (رەڤین ئەز ب خودایێ موحەممەد كەمە)، ئەز چۆم بەرێ خۆ بدەمێ وەكی خۆیە وەكی ئەز دبینم، ئەز ب خودێ كەمە چو وەسا نەچۆ هەتا حەسحاسێ خۆ هاڤێتە وان، بەردەوام من هێزا وان لاواز و كارێ وان رەڤ دیت.**

- **و د ڤەگێرەكێدا: گۆت: و هەروەكی ئەز یێ بەرێ خۆ ددەمێ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو ب غار ل سەر هێسترا خۆ یێ دچیت و یێ دبێژیت: (ئەز ب خودانێ كەعبێ كەمە ئەو رەڤین، ئەو رەڤین ئەز ب خودانێ كەعبێ كەمە) هەتا خودێ ئەو شكاندین.**

٨ ـ باب: سرية أوطاس

**بابەتێ: سریا ئەوتاس.**

٣٦٩٠ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا فَرَغَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ حُنَيْنٍ بَعَثَ أَبَا عَامِرٍ عَلَى جَيْشٍ إِلَى أَوْطَاسٍ، فَلَقِيَ دُرَيْدَ بْنَ الصِّمَّةِ، فَقُتِلَ دُرَيْدٌ وَهَزَمَ اللهُ أَصْحَابَهُ. قَالَ أَبُو مُوسى: وَبَعَثَنِي مَعَ أَبِي عامِرٍ، فَرُمِيَ أَبُو عَامِرٍ فِي رُكْبَتِهِ، رَمَاهُ جُشَمِيٌّ بِسَهْمٍ فَأَثْبَتَهُ فِي رُكْبَتِهِ، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا عَمِّ مَنْ رَمَاكَ؟ فَأَشَارَ إِلَى أَبِي مُوسى فَقَالَ: ذَاكَ قَاتِلِي الَّذِي رَمَانِي، فَقَصَدْتُ لَهُ فَلَحِقْتُهُ، فَلَمَّا رَآنِي

---

(١) ئانكو: ئەوێت پەیمان ل بن وێ دارێ داینە پێغەمبەری (ﷺ).

وَلَّى، فَاتَّبَعْتُهُ وَجَعَلْتُ أَقُولُ لَهُ: أَلاَ تَسْتَحِي، أَلاَ تَثْبُتُ، فَكَفَّ. فَاخْتَلَفْنَا ضَرْبَتَيْنِ بِالسَّيْفِ فَقَتَلْتُهُ، ثُمَّ قُلْتُ لأَبِي عَامِرٍ: قَتَلَ اللهُ صَاحِبَكَ، قَالَ: فَانْزِعْ هَذَا السَّهْمَ، فَنَزَعْتُهُ، فَنَزَا مِنْهُ الماءُ، قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي! أَقْرِئِ النَّبِيَّ (ﷺ) السَّلاَمَ، وَقُلْ لَهُ: اسْتَغْفِرْ لِي، وَاسْتَخْلَفَنِي أَبُو عَامِرٍ عَلَى النَّاسِ، فَمَكُثَ يَسِيراً ثُمَّ مَاتَ.

فَرَجَعْتُ، فَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فِي بَيْتِهِ عَلَى سَرِيرٍ مُرْمَلٍ وعَلَيْهِ فِرَاشٌ، قَدْ أَثَّرَ رِمَالُ السَّرِيرِ بِظَهْرِهِ وَجَنْبَيْهِ، فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِنَا وَخَبَرِ أَبِي عَامِرٍ، وَقَالَ: قُلْ لَهُ اسْتَغْفِرْ لِي، فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ! اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عَامِرٍ**)، وَرَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ! اجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ مِنَ النَّاسِ**). فَقُلْتُ: وَلِي فَاسْتَغْفِرْ، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ! اغْفِرْ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ، وَأَدْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلاً كَرِيماً**).

قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: إِحْدَاهُمَا لأَبِي عامِرٍ، والأُخْرَى لأَبِي مُوسى.   [خ٤٣٢٣ (٢٨٨٤)/ م٢٤٩٨].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) ژ حونەینێ ب دویماهی هاتی، ئەبو عامر ل سەر لەشكەرەكی ڤرێكرە ئەوتاس[1]، گەهشتە دورەیدێ كورێ سوممەیی، و دورەید هاتە كوشتن، و هەڤالێت وی رەڤین، ئەبو مووسایی گۆت: و ئەز د گەل ئەبی عامری هنارتم، و تیرەك د چۆكێ وی وەركرن، جوشنی تیرەك هاڤێتێ و ل چۆكێ وی چكلاند، ئەز چۆمە دەڤ من گۆتێ: مام كێ هاڤێتە تە؟ نیشان كرە ئەبو مووسایی و گۆت: وێهە كوژەكێ منە یێ تیر هاڤێتیە من، من بەرێ خۆ دایێ و ئەز چۆمێ و ئەز ڤێرا گەهشتم، ڤێجا دەمێ ئەز دیتیم رەڤی، و ئەز دویڤرا چۆم و من دگۆتێ: ما تو شەرم ناكەی؟ ما تو خو ناگری؟ ئینا راوەستا و من و وی دو دربە ب شیری دانانە ئێكدو، من ئەو كوشت، پاشی من گۆتە ئەبی عامری، خودێ كوژەكێ تە كوشت، گۆت: تیرێ بینە دەرێ، من ئینا دەر، ئینا خوینێ هەلاڤێت، گۆت: ئەی برازا سلاڤان ل پێغەمبەری بكە (ﷺ) و بێژێ بلا دوعا گونەهژێبرنێ بۆ من بكەت، و ئەبو عامر ئەز ل جهێ خۆ ل سەر لەشكەری ل سەر خەلكی دانام و دەمەكێ كێم ما و مر.**

---

(١) ئەوتاس: نهالەكە دكەڤیتە وارێ هەوازن د ناڤبەرا تائیف و مەكەهێدا، و دەمێ هەوازن ل حونەینێ شكەستین هندەك ژ وان رەڤین و ل ئەوتاسێ كۆم بوون و دڤیان ل وێرێ بۆ شەرێ موسلمانان جارەكا دی خۆ رێك بێخن و ژ بەر هندێ پێغەمبەری (ﷺ) لەشكەرەك ڤرێكرە وان دا ئارمانجا وان ب جه نەهێت.

ئینا ئەز ژ فریم چۆمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو ل سەر تەختەکێ ب پەرێت دارقەسپان نەخشەکری بوو و نڤینەك ل سەر بوو و بەلگێت قەسپان جهێ خۆ د پشت و تەنشتا ویدا کربوون، و من بەحسێ خۆ و بەحسێ ئەبو عامری کر و گۆت: بێژە وی بلا دوعا گونەهژێبرنێ بۆ من بکەت، ئینا داخوازا ئاڤێ کر و دەستنڤێژا خۆ شویشت و پاشی دەستێت خۆ بلند کرن و گۆت: **(ئەی خودا گونەهێت ئەبی عامری ژێ ببە)**، و من سپیاتیا بنکەفشێت وی دیت، و پاشی گۆت: **(ئەی خودا رۆژا قیامەتێ وی ل سەر گەلەك ژ چێکرییێت خۆ ژ مرۆڤان دانە)**، ئینا من گۆت: و بۆ من ژی دوعا گونەهژێبرنێ بکە، ئینا گۆت: **(ئەی خودا گونەهێت عەبدوللایێ کورێ قەیسی ژێ ببە و رۆژا قیامەتێ وی ببە جهەکێ خۆش و بلند)**.

ئەبو بوردەیی گۆت: ئێك ژ وان بۆ ئەبی عامری بوو و یا دی بۆ ئەبو مووسایی بوو.

٩ . باب: غزوة الطائف

**بابەتێ: خەزایا تائیفێ.**

٣٦٩١ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: حَاصَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَهْلَ الطَّائِفِ فَلَمْ يَفْتَحْهَا، فَقَالَ: **(إِنَّا قَافِلُونَ غَداً إِنْ شَاءَ اللهُ)**. فَقَالَ المسْلِمُونَ: نَقْفُلُ وَلَمْ نَفْتَحْ، قالَ: **(فَاغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ)**. فَغَدَوْا، فَأَصَابَتْهُمْ جِرَاحَاتٌ، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّا قَافِلُونَ غَداً إِنْ شَاءَ اللهُ)**. فَكَأَنَّ ذلِكَ أَعْجَبَهُمْ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). [خ٤٨٠ (٤٣٢٥)/ م١٧٧٨].

ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) خەلکێ تائیفێ دۆرپێچ کر، و نەڤەکر، ئینا گۆت: **(ب ئانەهییا خودێ سوبەهی ئەم دێ زڤرین)**، ئینا موسلمانان گۆت: دێ زڤرین و مە نەڤەکر! گۆت: **(سوبەهی سپێدێ هەرنە شەڕی)**، سپێدێ چۆن و چەندین برینداری گەهشتنە وان، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب ئانەهییا خودێ سوبەهی ئەم دێ زڤرین)** هەروەکی وان ئەڤە پێخۆش بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کرنژی.

١٠ . باب: المطالبة بتقسيم غنائم حنين

**بابەتێ: داخوازا لێكڤەكرنا دەستكەفتێت حونەینێ.**

٣٦٩٢ - (خ) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ: أَنَّهُ بَيْنَما هُوَ يَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَمَعَهُ النَّاسُ، مَقْفَلَهُ مِنْ حُنَيْنٍ، فَعَلِقَهُ النَّاسُ يَسْأَلُونَهُ، حَتَّى اضْطَرُّوهُ إِلَى سَمُرَةٍ، فَخَطِفَتْ رِدَاءَهُ، فَوَقَفَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: **(أَعْطُونِي رِدَائِي، لَوْ كَانَ لِي عَدَدُ هذِهِ الْعِضَاهِ نَعَماً لَقَسَمْتُهُ بَيْنَكُمْ، ثُمَّ لاَ تَجِدُونِي بَخِيلاً، وَلاَ كَذُوباً، وَلاَ جَبَاناً)**. [خ٢٨٢١].

**ژ جوبەیرێ كورێ موتعەمی (رضي الله عنه) گۆت: د دەمەكیدا ئەو د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دچۆ وەختێ ژ حونەینێ زڤرین، كۆچەرە عەرەب پێڤە مان و خوازۆكی ژێ كرن، حەتا برییە بن دارەكا ب سترى و چاكیتێ وى مایە پێڤە، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) راوەستا و گۆت: (چاكیتێ من بدەنە ڤ من، ھەكە من ھندى ڤێ دارا ب سترى تەرش ھەبان دا د مابەینا ھەوەدا لێكڤەكەم پاشى ھەوە ئەز نەددیتم نە یێ ڤەلس و نە یێ درەوین و نەیێ ترسنۆك).**

١١ . باب: عتب الأَنصار بشأن القسمة.

**بابەتێ: گازندەیا ئەنساران ل دۆر لێكڤەكرنا دەستكەفتان.**

٣٦٩٣ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ، آثَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) أُنَاساً فِي الْقِسْمَةِ، فَأَعْطَى الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ، وَأَعْطَى عُيَيْنَةَ مِثْلَ ذلِكَ، وَأَعْطَى أُنَاساً مِنْ أَشْرَافِ الْعَرَبِ، فَآثَرَهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْقِسْمَةِ. قَالَ رَجُلٌ: وَاللهِ إِنَّ هذِهِ الْقِسْمَةَ ما عُدِلَ فِيهَا، وَمَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللهِ. فَقُلْتُ: وَاللهِ لأُخْبِرَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: **(فَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ يَعْدِلِ اللهُ وَرَسُولُهُ؟! رَحِمَ اللهُ مُوسى، قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ)**. [خ٣١٥٠/ م١٠٦٢].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه)، گۆت: وەختێ بوویە رۆژا حونەینێ پێغەمبەری (ﷺ) ھندە مرۆڤ ب لێكڤەكرنێ ب سەر ھندەكێت دی دانان: سەد حێشتر دانە ئەقرەعێ كورێ حابسی، و ھندی وان دانە عویەینێ كورێ حوسەینی، و دانە ھندە مرۆڤان ژ رویسپییێت عەرەبان، و وێ رۆژێ ئەو ب لێكڤەكرنێ پێش ئێخستن. زەلامەكی گۆت: ب خودێ كەمە ئەڤە لێكڤەكرنەكە دادپەروەری تێدا نەھاتییە كرن، و رازیبوونا خودێ تێدا نەھاتییە خواستن. من گۆت: پا ب خودێ كەمە ئەز دێ پێغەمبەری (ﷺ)**

**پێ حەسینم! ئەز هاتمە دەڤ من گۆتێ كا چ گۆتییە، گۆت: (پا كی دێ دادپەروەرییێ كەت هەكە خودێ و پێغەمبەرێ وی دادپەروەرییێ نەكەن، خودێ دلۆڤانییێ ب مووسایی ببەت، پتر ژ ڤێ هاتە ئێشاندن، بێهنا خۆ فرەه كر و سەبر كێشا).**

٣٦٩٤ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ: أَنَّ نَاساً مِنَ الأَنْصَارِ قَالُوا لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، حِينَ أَفَاءَ اللهُ عَلَى رَسُولِهِ (ﷺ) مِنْ أَمْوَالِ هَوَازِنَ ما أَفَاءَ، فَطَفِقَ يُعْطِي رِجالاً مِنْ قُرَيْشٍ الْمِائَةَ مِنَ الإِبِلِ، فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللهُ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، يُعْطِي قُرَيْشاً وَيَدَعُنَا، وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ!

قَالَ أَنَسٌ: فَحُدِّثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِمَقَالَتِهِمْ، فَأَرْسَلَ إِلَى الأَنْصَارِ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ، وَلَمْ يَدْعُ مَعَهُمْ أَحَداً غَيْرَهُمْ، فَلَمَّا اجْتَمَعُوا جاءَهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: **(ما كَانَ حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ)** ؟ قالَ لَهُ فُقَهَاؤُهُمْ: أَمَّا ذَوُو آرَائِنَا يَا رَسُولَ اللهِ فَلَمْ يَقُولُوا شَيْئاً، وَأَمَّا أُنَاسٌ مِنَّا حَدِيثَةٌ أَسْنَانُهُمْ، فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللهُ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ)، يُعْطِي قُرَيْشاً، وَيَتْرُكُ الأَنْصَارَ، وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنِّي أُعْطِي رِجَالاً حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ، أَما تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالأَمْوَالِ، وَتَرْجِعُوا إِلَى رِحَالِكُمْ بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَوَاللهِ ما تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ)**. قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ قَدْ رَضِينَا، فَقَالَ لَهُمْ: **(إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً شَدِيدَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوُا اللهَ تَعَالَى وَرَسُولَهُ (ﷺ) عَلَى الْحَوْضِ)**. قَالَ أَنَسٌ: فَلَمْ نَصْبِرْ. [خ٣١٤٧ (٣١٤٦)/ م١٠٥٩].

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: هندەك خەلكێ ژ ئەنساران گۆتنە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ خودێ ئەو مال بۆ پێغەمبەری (ﷺ) زڤراندی ژ مالێ هەوازن ژ وی یێ زڤراندی، دەستهاڤێتێ سەد حێشتر دانە هندەك زەلامان ژ قورەیشییان، گۆتن: خودێ گونەهێت پێغەمبەری (ﷺ) ژێ ببەت، ددەتە قورەیشییان و مە دهێلیت، و شیرێت مە خوینا وان یا پێدا دهێت.**

**ئەنەسی گۆت: ئاخفتنا وان گەهاندە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا ڤرێكرە دویڤ ئەنسارانڕا و هەمی ل بن گومبەتەكا پیستی كۆم كرن و نەهێلا كەسێ دی د گەل وان بیت، ڤێجا دەمێ كۆم بووین پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە دەڤ وان و گۆت: (ئەو چ ئاخفتنە ژ هەوە گەهشتییە من)؟ تێگەهشتییێت وان گۆتە وی: هندیكە خودان بۆچوونێت مەنە چو نەگۆتییە ئەی پێغەمبەرێ خودێ، و هندیكە هندەك خەلكە ژ مە د كێم عومرن گۆتن: خودێ گونەهێت پێغەمبەری (ﷺ) ژێ ببەت ددەتە قورەیشییان و**

ئەنساران دهێلیت، و شیرێت مە خوینا وان یا پێدا دهێت. ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ئەز ددەمە هندە زەلامان ژ نوی گاوری یا هێلای، ما هوین د رازی نینن خەلك ب مالی بچیت و هوین ب پێغەمبەرێ خودێ بزڤرنە جهێت خۆ، ئەز ب خودێ كەمە ئەوا هوین دبەنەڤە ژ وێ باشترە یا ئەو دبنەڤە)**، گۆتن بەلێ، ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەم د رازینە، ئینا گۆتە وان: **(ب راستی هوین پێشئێخستنا نەمافدار و نەهەژییان زێدە دێ بینن، ڤێجا بێهنا خۆ فرەهـ كەن و سەبرێ خۆ بكێشن، هەتا هوین ل سەر ئاڤا كەوسەرێ دگەهنە خودێ و پێغەمبەرێ وی)**.

## ١٢ . باب: رد السبي على هوازن

## بابەتێ: زڤراندنا ئێخسیرێت هەوازن.

٣٦٩٥ - (خ) عَنْ مَرْوَانَ وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَامَ حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ مُسْلِمِينَ، فَسَأَلُوهُ: أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَعِي مَنْ تَرَوْنَ، وَأَحَبُّ الحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَاخْتَارُوا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ: إِمَّا السَّبْيَ، وَإِمَّا المَالَ، وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ بِكُمْ)**. وَكَانَ أَنْظَرَهُمْ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً حِينَ قَفَلَ مِنَ الطَّائِفِ، فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) غَيْرُ رَادٍّ إِلَيْهِمْ إِلاَّ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ، قَالُوا: فَإِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا، فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي المُسْلِمِينَ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: **(أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ جَاؤُونَا تَائِبِينَ، وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذلِكَ؛ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللهُ عَلَيْنَا؛ فَلْيَفْعَلْ)**.

فَقَالَ النَّاسُ: قَدْ طَيَّبْنَا ذلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّا لاَ نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ فِي ذلِكَ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ)**. فَرَجَعَ النَّاسُ، فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ قَدْ طَيَّبُوا، وَأَذِنُوا. [خ٤٣١٨ (٢٣٠٧)].

**ژ مەروانێ كورێ میسوەرێ كورێ مەخرەمەیی (رضي الله عنهما) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو دەمێ شاندەكێ هەوازنییان موسلمان هاتینە دەڤ، دا خواز ژێ كر ئەو مالێ وان و ئێخسیرێت وان بۆ بزڤرینیت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە وان: (ئەوێت هوین دبینن (ژ هەڤال و هۆگران) د گەل منن، و خۆشڤیترین ئاخفتن ل دەڤ من**

**راستگۆترین ئاخفتنە، ئێك ژ دو تشتا بۆ خۆ هەلبژێرن یان ئێخسیران یان مالی، و ب راستی من خۆ ل هەوە گرتبوو)**، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەه و تشتەك شەڤان خۆ ل وان گرت دەمێ ژ تائیفێ زڤری، ڤێجا دەمێ بۆ وان ئاشكەرا بووی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ وان نازڤرینیت ئێك ژ وان تشتان نەبیت، گۆتن: ئەم ئێخسیرێت خۆ هەلدبژێرین، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ناڤ موسلماناندا رابوو و پەسنا خودێ كر وەكی ئەو هەژی و پاشی گۆت: **(پشتی ڤێ: ب راستی برایێت هەوە ب تۆبەداری یێت هاتینە دەڤ مە، و ئەز وەسا دبینم ئەز ئێخسیرێت وان بۆ وان بزڤرینم، هەر كەسێ ژ هەوە ژ دل پێخۆشە وەبكەت بلا وەبكەت، و هەر كەسێ ژ هەوە پێخۆشە ل سەر بارا خۆ بمینیت هەتا ئەم پێشڤە ژ دەستكەفتێ ئێكێ خودێ ددەتە مە پێشڤە بدەینێ بلا بمینیت)**.

ئینا خەلكی گۆتن: مە ب دل ئەو پێخۆشە ئەی پێغەمبەرێ خودێ، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ئەم نوزانین كێ ژ هەوە دەستویری دا و كێ دەستویری نەدا، بزڤرن هەتا مەزن و رویسپییێت هەوە كارێ هەوە دگەهینە مە)**، خەلك زڤرین، مەزن و رویسپییێت وان د گەل وان ئاخفتن، پاشی زڤرینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆتەوی ئەوان پێ خۆشە و دەستویرێ ژی ددەن.

## ١٣ . باب: سرية ذي الخلصة

## بابەتێ: سریا زیلخەلەسە.

٣٦٩٦ - (ق) عَنْ جُرَيْرٍ الجَبَلِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ بَيْتٌ فِي الجَاهِلِيَّةِ يُقَالُ لَهُ: ذُو الخَلَصَةِ، وَالْكَعْبَةُ الْيَمَانِيَةُ، وَالْكَعْبَةُ الشَّامِيَّةُ، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ (ﷺ): **(أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الخَلَصَةِ)**. فَنَفَرْتُ فِي مِائَةٍ وَخَمْسِينَ رَاكِباً فَكَسَرْنَاهُ، وَقَتَلْنَا مَنْ وَجَدْنَا عِنْدَهُ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ، فَدَعَا لَنَا وَلأَحْمَسَ.

[خ٤٣٥٥ (٣٠٢٠)/ م٢٤٧٦].

ژ جەریرێ جەبەلی (رضي الله عنه) گۆت: خانیەك د نەزانینێدا هەبوو د گۆتنێ: زیلخەلەسە و كەعبا یەمانی و كەعبا شامی، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(تو دلێ من ژ**

**زیلخەلەسەیی[1] تەنا ناكەی) ئینا ئەز ب سەد و پێنجی سویارانڤە دەركەفتم و مە شكاند و یێ مە ل دەڤ دیتی مە كو شت، و ئەز ها تمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) من ئاخفتن گەهاندێ، ئینا دوعا بۆ مە و بۆ ئەحمەس كرن[2].**

## ١٤ . باب: تخيير النبي (ﷺ) نساءه

## بابەتێ: سەرپشككرنا هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) ژ لایێ ویڤە

٣٦٩٧ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: مَكَثْتُ سَنَةً أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ عَنْ آيَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجّاً فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا رَجَعْتُ وَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، عَدَلَ إِلَى الأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ، قَالَ: فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ، ثُمَّ سِرْتُ مَعَهُ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) مِنْ أَزْوَاجِهِ؟ فَقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ وَعَائِشَةُ، قَالَ: فَقُلْتُ: وَاللهِ إِنْ كُنْتُ لأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ، قَالَ: فَلاَ تَفْعَلْ، مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَاسْأَلْنِي، فَإِنْ كَانَ لِي عِلْمٌ خَبَّرْتُكَ بِهِ. [خ٤٩١٣ (٨٩)/ م١٤٧٩].

- وفي رواية لهما: قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ، مَنِ المَرْأَتَانِ مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، اللَّتَانِ قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾؟ [التحريم:٤] قَالَ: وَاعَجَباً لَكَ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! هُمَا عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ.

ثُمَّ اسْتَقْبَلَ عُمَرُ الحَدِيثَ يَسُوقُهُ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَجَارٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ، وَهُمْ مِنْ عَوَالِي المَدِينَةِ، وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَيَنْزِلُ يَوْماً وَأَنْزِلُ يَوْماً، فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِمَا حَدَثَ مِنْ خَبَرِ ذلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الْوَحْيِ أَوْ غَيْرِهِ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذلِكَ.

وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى الأَنْصَارِ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَطَفِقَ نِسَاؤُنَا يَأْخُذْنَ مِنْ أَدَبِ نِسَاءِ الأَنْصَارِ، فَصَخِبْتُ عَلَى امْرَأَتِي فَرَاجَعَتْنِي، فَأَنْكَرْتُ أَنْ تُرَاجِعَنِي، قَالَتْ: وَلِمَ تُنْكِرُ أَنْ أُرَاجِعَكَ؟ فَوَاللهِ إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (ﷺ) لَيُرَاجِعْنَهُ، وَإِنَّ إِحْدَاهُنَّ لَتَهْجُرُهُ الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ، فَأَفْزَعَنِي ذلِكَ وَقُلْتُ لَهَا: قَدْ خَابَ مَنْ فَعَلَ ذلِكَ مِنْهُنَّ، ثُمَّ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي، فَنَزَلْتُ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ حَفْصَةُ! أَتُغَاضِبُ إِحْدَاكُنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) الْيَوْمَ حَتَّى اللَّيْلِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، فَقُلْتُ: قَدْ خِبْتِ

---

**(١) ئەو خانییەك بوو ل یەمەنێ، و هۆزا خەسعەم و بجیلە شیرك تێڤە دكر.**

**(٢) هۆزا ویيە، چونكی ئەو سەد و پێنجییێت د گەل چۆین ژ وێ هۆزێ بوون.**

وَخَسِرْتِ، أَفَتأْمَنِينَ أَنْ يَغْضَبَ اللهُ لِغَضَبِ رَسُولِهِ (ﷺ) فَتَهْلِكِي؟ لاَ تَسْتَكْثِرِي النَّبِيَّ (ﷺ) وَلاَ تُرَاجِعِيهِ فِي شَيْءٍ وَلاَ تَهْجُرِيهِ، وَسَلِينِي ما بَدَا لَكِ، وَلاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كانَتْ جارَتُكِ أَوْضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) . يُرِيدُ عائِشَةَ ..

قَالَ عُمَرُ: وَكُنَّا قَدْ تَحَدَّثْنَا أَنَّ غَسَّانَ تُنْعِلُ الْخَيْلَ لِغَزْوِنَا، فَنَزَلَ صَاحِبِي الأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ، فَرَجَعَ إِلَيْنَا عِشَاءً فَضَرَبَ بَابِي ضَرْباً شَدِيداً، وَقَالَ: أَثَمَّ هُوَ؟ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ حَدَثَ الْيَوْمَ أَمْرٌ عَظِيمٌ، قُلْتُ: ما هُوَ، أَجاءَ غَسَّانُ؟ قالَ: لاَ، بَلْ أَعْظَمُ مِنْ ذلِكَ وَأَهْوَلُ، طَلَّقَ النَّبِيُّ (ﷺ) نِسَاءَهُ، فَقُلْتُ: خَابَتْ حَفْصَةُ وَخَسِرَتْ، قَدْ كُنْتُ أَظُنُّ هَذَا يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ، فَجَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي، فَصَلَّيْتُ صَلاَةَ الْفَجْرِ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَدَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَشْرُبَةً لَهُ فَاعْتَزَلَ فِيهَا، وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي، فَقُلْتُ: مَا يُبْكِيكِ؟ أَلَمْ أَكُنْ حَذَّرْتُكِ هَذَا، أَطَلَّقَكُنَّ النَّبِيُّ (ﷺ)؟ قَالَتْ: لاَ أَدْرِي، هَا هُو ذَا مُعْتَزِلٌ فِي المشْرُبَةِ.

فَخَرَجْتُ فَجِئْتُ إِلَى الْمِنْبَرِ، فَإِذَا حَوْلَهُ رَهْطٌ يَبْكِي بَعْضُهُمْ، فَجَلَسْتُ مَعَهُمْ قَلِيلاً، ثُمَّ غَلَبَنِي ما أَجِدُ، فَجِئْتُ المشْرُبَةَ الْتِي فِيهَا النَّبِيُّ (ﷺ)، فَقُلْتُ لِغُلاَمٍ لَهُ أَسْوَدَ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ الْغُلاَمُ فَكَلَّمَ النَّبِيَّ (ﷺ) ثُمَّ رَجَعَ. فَقَالَ: كَلَّمْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وَذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ، فَانْصَرَفْتُ حَتَّى جَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي ما أَجِدُ فَجِئْتُ فَقُلْتُ لِلْغُلاَمِ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ، فَرَجَعْتُ فَجَلَسْتُ مَعَ الرَّهْطِ الَّذِينَ عِنْدَ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ غَلَبَنِي ما أَجِدُ، فَجِئْتُ الْغُلاَمَ فَقُلْتُ: اسْتَأْذِنْ لِعُمَرَ، فَدَخَلَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيَّ فَقَالَ: قَدْ ذَكَرْتُكَ لَهُ فَصَمَتَ، فَلَمَّا وَلَّيْتُ مُنْصَرِفاً، قالَ: إِذَا الْغُلاَمُ يَدْعُونِي، فَقَالَ: قَدْ أَذِنَ لَكَ النَّبِيُّ (ﷺ).

فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَإِذَا هُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى رِمَالِ حَصِيرٍ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فِرَاشٌ، قَدْ أَثَّرَ الرِّمَالُ بِجَنْبِهِ، مُتَّكِئاً عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ فَرَفَعَ إِلَيَّ بَصَرَهُ فَقَالَ: (لاَ). فَقُلْتُ: اللهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ أَسْتَأْنِسُ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوْ رَأَيْتَنِي وَكُنَّا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ نَغْلِبُ النِّسَاءَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا المدِينَةَ إِذَا قَوْمٌ تَغْلِبُهُمْ نِسَاؤُهُمْ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ (ﷺ)، ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ رَأَيْتَنِي وَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَقُلْتُ لَهَا: لاَ يَغُرَّنَّكِ أَنْ كانَتْ جارَتُكِ أَوضَأَ مِنْكِ وَأَحَبَّ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) . يُرِيدُ عائِشَةَ .، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ (ﷺ) تَبَسُّمَةً أُخْرَى، فَجَلَسْتُ حِينَ رَأَيْتُهُ تَبَسَّمَ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي فِي بَيْتِهِ، فَوَاللهِ ما رَأَيْتُ فِي بَيْتِهِ شَيْئاً يَرُدُّ الْبَصَرَ، غَيْرَ أَهَبَةٍ ثَلاَثَةٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ فَلْيُوَسِّعْ عَلَى أُمَّتِكَ، فَإِنَّ فَارِسَ وَالرُّومَ قَدْ وُسِّعَ عَلَيْهِمْ وَأُعْطُوا الدُّنْيَا، وَهُمْ لاَ يَعْبُدُونَ

اللهَ، فَجَلَسَ النَّبِيُّ (ﷺ) وَكَانَ مُتَّكِئاً فَقَالَ: (**أَوَ فِي هَذَا أَنْتَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ؟! إِنَّ أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلُوا طَيِّبَاتِهِمْ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا**). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ اسْتَغْفِرْ لِي.

فَاعْتَزَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) نِسَاءَهُ مِنْ أَجْلِ ذلِكَ الحَدِيثِ حِينَ أَفْشَتْهُ حَفْصَةُ إِلَى عائِشَةَ تِسْعاً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ قالَ: (**ما أَنَا بِدَاخِلٍ عَلَيْهِنَّ شَهْراً**). مِنْ شِدَّةِ مَوْجِدَتِهِ عَلَيْهِنَّ حِينَ عاتَبَهُ اللهُ.

فَلَمَّا مَضَتْ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً دَخَلَ عَلَى عائِشَةَ فَبَدَأَ بِهَا، فَقَالَتْ لَهُ عائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّكَ كُنْتَ قَدْ أَقْسَمْتَ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْراً، وَإِنَّمَا أَصْبَحْتَ مِنْ تِسْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً أَعُدُّهَا عَدّاً، فَقَالَ: (**الشَّهْرُ تِسعٌ وَعِشْرُونَ**). فَكَانَ ذلِكَ الشَّهْرُ تِسْعاً وَعِشْرِينَ لَيْلَةً. قالَتْ عائِشَةُ: ثُمَّ أَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى آيَةَ التَّخَيُّرِ، فَبَدَأَ بِي أَوَّلَ امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ فَاخْتَرْتُهُ، ثُمَّ خَيَّرَ نِسَاءَهُ كُلَّهُنَّ، فَقُلْنَ مِثْلَ مَا قَالَتْ عائِشَةُ. [خ٥١٩١].

**ژ ئیبن عەباسی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: سالەكێ ئەز مام من دڤیا پرسیارا ئایەتەكێ ژ عومەرێ كوڕێ خەتتابی بكەم و ئەز ژبەر هەیبەتا وی نەدشیام، هەتا ئەو بۆ حەجێ دەركەفتی، و ئەز د گەل وی چۆم، ڤێجا دەمێ ز ڤری و ئەم د پشكەكا رێكێدا بووین ل رێكی دەركەفت و چۆ پشت دارەكا ئەراكێ بۆ هەوجەییەكێ، گۆت: ئەز ل هیڤیا وی مام هەتا خلاس بووی، پاشی ئەز د گەل چۆم، ئینا من گۆتێ: ئەی میرێ باوەریداران ئەو كی بوون هەردو هەڤژینێت پێغەمبەری ئەوێت هاریكارییا ئێكدو ل سەر پێغەمبەرێ خودێ كرین؟ ئینا گۆت: ئەو عائیشە و حەفسە بوون، گۆت: من گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ئەڤە سالەكە من دڤێت ئەز پرسیارا ڤێ ژ تە بكەم، و ژ ترسێت تەدا ئەز نەدشیام ؟ گۆت: وێ نەكە، هەر گاڤا تە هزر كر زانینەكا ل دەڤ من هەی پرسیارێ ژ من بكە، ئەگەر زانینەك من هەبیت دێ بۆ تە بێژم.**

- **و د ڤەگێرەكا واندا: گۆت: من گۆت ئەی میرێ باوەریداران ئەو هەردو ژن كی بوون ژ هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) ئەوێت خودێ د راستا واندا گۆتی: (إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ) گۆت: وەی تو عەجێبی ئەی كوڕێ عەباسی[1] ئەو عائیشا و حەفسەنە.**

---

**(١) ئانكو: چەوا ئەڤە ل بەر تە بەرزەبوویە.**

پاشی عومەری دەست ب ئاخفتنێ كر، دبێژیت: گۆت: ئەز و جیرانەكێ خۆ ژ ئەنساران ژ بابكێ ئومەییەیێ كورێ زەیدی و ئەو ل سەرێ مەدینەیێ بوو ب گەهانێ[1] ئەم دهاتینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئەو رۆژەكێ دهاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و ئەز رۆژەكێ دهاتم، ڤێجا ئەگەر ئەز هاتبام كا چ ل وێ رۆژێ چێ بوویە ژ وەحییێ و تشتێ دیتر من بۆ دگۆت، و ئەگەر ئەو هاتبا وی ژی وەكی وێ دكر.

و ئەم خەلكێ قورەیشی ل سەر ژنان د زال بووین، ڤێجا دەمێ ئەم هاتینە دەڤ ئەنساران ژنێت وان ل سەر وان د زال بوون، ژنێت مە دەستهاڤێتێ رەو شتێ ژنێت ئەنساران وەرگرتن، من ژنا خۆ پاشڤە بر بەرسڤا من دا، ئەز نەرازی بووم بەرسڤا من بدەت، وێ گۆت: تو بۆ چی یێ نەرازی ئەز بەرسڤا تە بدەم؟ ئەز ب خودێ كە مە هە ڤژنێت پێغەمبەری (ﷺ) بەرسڤا وی ددەن، و ئێك ژ وان پشتا خۆ ب رۆژ ددەتێ هەتا شەڤێ، ئەڤێ چەندێ ئەز ترساندم و من گۆتە وێ: یا ژ وان وەبكەت ئەو خوسارەت بوو، پاشی من جلكێت خۆ ل سەر خۆ كۆم كرن[2] و ئەز دەركەفتم و چۆمە دەڤ حەفسایێ، ئینا من گۆتێ: ئەی حەفسا، ئەرێ ئێك ژ هەوە پێغەمبەری (ﷺ) تۆرە دكەت ب رۆژ هەتا شەڤێ؟ گۆت: بەلێ، ئینا من گۆت: تو نەگەهشتییە هیڤیا خۆ و تو خوسارەت بوویی ما تو پشتراست بووی خودێ تۆرە ببیت بۆ تۆرەبوونا پێغەمبەرێ خۆ (ﷺ) ڤێجا تو ژ ناڤ بچی؟ گەلەك داخوازا ژ پێغەمبەری (ﷺ) نەكە، و بەرسڤا وی نەدە و ژێ سل نەبە، و هەر تشتێ تە دڤێت ژ من بخوازە، و خۆ نەخاپینە هەویا تە ژ تە جوانترە و ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) خۆشڤیترە، مەبەستا وی عائیشایە.

عومەری گۆت: و مە دگۆت: غەسسانییان هەسپێت خۆ یێت نال كرین دا هێرشێ بكەنە مە، هەڤالێ منێ ئەنساری د گەهها خۆدا چۆ دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و زڤری و ب هێز دەرێ مە قوتا و گۆت: ئەرێ ئەو ل ڤێرێیە؟ ئینا ئەز ترسیام و ئەز دەركەفتمە دەڤ وی، گۆت: ئەڤرۆ تشتەكێ مەزن یێ چێ بووی، من گۆت: ئەو چییە، ما غەسسانی هاتن؟ گۆت: بەلكی ژ هندێ مەزنتر و زێدەترە، پێغەمبەری (ﷺ) هەڤژنێت خۆ بەردان، ئینا

---

(١) ب دۆرانێ رۆژەكێ ئەز و رۆژەكێ ئەو.

(٢) ئانكو: من كارێ خۆ كر.

من گۆت: حەفسا بێهیڤی و خوسارەت بوو، من ئەڤ هزرە دكر نێزیكە ئەڤە دێ چێ بیت، من جلكێت خۆ كرنە بەر خۆ و كارێ خۆ كر، و من نڤێژ سپێدێ د گەل پێغەمبەری (ﷺ) كر، و چۆ د ژۆرەكا خۆ یا بلندڤە و خۆ تێدا ڤەدەر كر و ئەز چۆمە دەڤ حەفسایێ و ئەو یا دكەتە گری، من گۆت: تو بۆ چ دكەیە گری؟ ما من تو ژ ڤێ هشیار نەكربی، ما پێغەمبەری (ﷺ) هوین بەردانە؟ گۆت: ئەز نوزانم، و ئها ئەوێ هە یە د ژۆرا بلندڤە یا خۆ ڤەدەركری.

و ئەز دەركەفتم هاتمە دەڤ مینبەرێ، كۆمەكا زەلامان ل دۆرما ندۆر بوون و هندەكان دكرنە گری، ئەز پێچەكێ ل دەڤ وان روینشتم، پاشی ئەز نەشیامە خۆ ژ بەر ئەوا د سەرێ مندا، ئەز هاتمە دەڤ وێ ژۆرێ ئەوا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تێڤە، ئینا من گۆتە خزمەتكارەكێ وی یێ رەش بوو: دەستویرییێ بۆ عومەری بخوازە، خزمەتكار چۆ ژۆر د گەل پێغەمبەری (ﷺ) ئاخفت، و پاشی زڤری و گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەری (ﷺ) ئاخفتم و من بەحسێ تە كر و ئەو بێدەنگ بوو، ئەز چۆم هەتا هاتیمە دەڤ وێ كۆما ل دەڤ مینبەرێ، پاشی ئەز نەشیامە خۆ ژ بەر ئەوا د سەرێ مندا ئەز هاتمە دەڤ خزمەتكاری و من گۆتێ دەستویرییێ بۆ عومەری بخوازە، خزمەتكار چۆ ژۆر د گەل پێغەمبەری (ﷺ) ئاخفت و پاشی زڤری و گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەری (ﷺ) ئاخفتم و من بەحسێ تە كر و ئەو بێدەنگ بوو، ئەز چۆم هەتا هاتیمە دەڤ وێ كۆما ل دەڤ مینبەرێ پاشی ئەز نەشیامە خۆ ژ بەر ئەوا د سەرێ مندا، ئەز هاتمە دەڤ خزمەتكاری و من گۆتێ دەستویرییێ بۆ عومەری بخوازە، خزمەتكار چۆ ژۆر د گەل پێغەمبەری (ﷺ) ئاخفت و پاشی زڤری و گۆت: ئەز د گەل ئاخفتم و من بەحسێ تە كر و ئەو بێدەنگ بوو، ڤێجا دەمێ ئەز زڤریم دا بچم گۆت: خزمەتكاری گازی من كر و گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) دەستویرییا تە دا.

ئەز چۆمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) من دیت یێ درێژكری بوو ل سەر حێسیلەكا پەرێت دارقەسپێ، و چو نڤین د ناڤبەرا وی و حێسیلێدا نەبوون، و حێسیلێ جهێ خۆ د تەنشتا ویدا كربوو، و پالدابوو بالیفكەكا كەڤلێ گەماركری و نافكا وێ رویشێ دارقەسپێ بوو، من سلاڤ كرە سەر، و پاشی من گۆت و ئەز یێ ژ پیاڤە مە: ئەی پێغەمبەرێ خودێ

تە هەڤژینێت خۆ بەردیانە؟ بەرێ خۆ دا من و گۆت: (**نەخێر**) ئینا من گۆت: ئەللاهو ئەكبەر، پاشی من گۆت: ئەز یێ ژ پێڤە هزر دكەم كا دێ پێغەمبەر (ﷺ) ژ تۆڕەبوونا خۆ هێتە خوارێ و رازی بیت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر تە ئەز دیتبام و ئەم خەلكێ قورەیشی دشیاینە ژنان و ئەم هاتینە مەدینەیێ و مە خەلكەك دیت ژنێت وان دشێنە وان، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) گرنژی، پاشی من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەگەر تە ئەز دیتبام ئەز چۆمە دەڤ حەفسایێ و من گۆتێ: خۆ نەخاپینە هەویا تە ژ تە جوانترە و ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خۆشڤیترە ـ مەبەستا وی عائیشایە ـ ئینا پێغەمبەر (ﷺ) گرنژینەكا دی گرنژی، ئینا ئەز روینشتم دەمێ من دیتی گرنژی، من چاڤێ خۆ ل مالا وی گێڕا ئەز ب خودێكەمە من چو نەدیت چاڤ ببینن ژبلی سێ كەڤلێت گەمارگری، ئینا من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ: دوعا ژ خودێ بكە ل سەر ئوممەتا تە بەرفرەھ بكەت، ب راستی فارس و رۆمێ ل سەر وان یێ بەرفرەھ كری و دنیا یا دایە وان، و ئەو خودێ ناپەرێسن، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) روینشتە خوارێ و بەری هینگێ یێ درێژكری بوو و گۆت: (**ما تو یێ ب گۆمانی ئەی كوڕێ خەتتابی**[1]**؟! ب راستی ئەو خەلكەكن خودێ خۆشییێت وان د دنیایێدا بۆ وان ڕێت پێشئێخستین**)، ئینا من گۆت: داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ بكە ئەی پێغەمبەرێ خودێ.

ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ژ بەر وێ ئاخفتنێ خۆ ژ ژنێن خۆ ڤەدەر كر دەمێ حەفسایێ ئەو ئاخفتن بۆ عائیشایێ دیار كری، بیست و نەھ شەڤان و وی گۆتبوو (ئەز هەیڤەكێ ناچمە دەڤ وان) ژ بەر دژوارییا خەما وی دەمێ خودێ گازندە ژێ كری.

ڤێجا دەمێ بیست و نەھ شەڤ بۆرین، چۆ دەڤ عائیشایێ و دەست ب وێ كر، ئینا عائیشایێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە سویند خواربی تو هەیڤەكێ نەهێیە دەڤ مە، و تو یێ د شەڤا بیست و نەهێدا و ئەز ئێك ئێكە دهەژمێرم، ئینا گۆت: (**هەیڤ بیست و نەھ شەڤە**) و ئەو هەیڤ بیست و نەھ شەڤ بوو، عائیشایێ گۆت: پاشی خودێ ئایەتا هەلبژارتنێ ئینا خوار و ب من دەست پێ كر هەڤژینا ئێكێ ژ هەڤژینێت وی و من ئەو

---

(١) ئانكو: ما تو یێ ب گۆمانی كو خۆشی و بەرفرەهییا ئاخرەتێ چێترە ژ خۆشی و بەرفرەهییا دنیایێ.

هەڵ بژارت، و پا شی هەمی هە ڤژینێت خۆ هەڵ بژارتن دا نێ، و هەمیان ئەو گۆت یا عائیشایێ گۆتی.

٣٦٩٨ - (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَوَجَدَ النَّاسَ جُلُوساً بِبَابِهِ، لَمْ يُؤْذَنْ لأَحَدٍ مِنْهُمْ. قَالَ: فَأُذِنَ لأَبِي بَكْرٍ فَدخَلَ، ثُمَّ أَقْبَلَ عُمَرُ فَاسْتَأْذَنَ فَأُذِنَ لَهُ، فَوَجَدَ النَّبِيَّ (ﷺ) جَالِساً، حَوْلَهُ نِسَاؤهُ، وَاجِماً سَاكِتاً. قَالَ: فَقَالَ: لأَقُولَنَّ شَيْئاً أُضْحِكُ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ رَأَيْتَ بِنْتَ خَارِجَةَ سَأَلَتْنِي النَّفَقَةَ، فَقُمْتُ إِلَيْهَا فَوَجَأْتُ عُنُقَهَا، فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَقَالَ: **(هُنَّ حَوْلِي كَمَا تَرَى، يَسْأَلْنَنِي النَّفَقَةَ)**.

فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى عَائِشَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا، فَقَامَ عُمَرُ إِلَى حَفْصَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا، كِلاَهُمَا يَقُولُ: تَسْأَلْنَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَا لَيْسَ عِنْدَهُ، فَقُلْنَ: وَاللهِ لاَ نَسْأَلُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) شَيْئاً أَبَداً لَيْسَ عِنْدَهُ. ثُمَّ اعْتَزَلَهُنَّ شَهْراً أَوْ تِسْعاً وَعِشْرِينَ. ثُمَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ﴾، حَتَّى بَلَغَ: ﴿لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب:٢٨، ٢٩] قَالَ: فَبَدَأَ بِعَائِشَةَ، فَقَالَ: **(يَا عَائِشَةُ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَعْرِضَ عَلَيْكِ أَمْراً أُحِبُّ أَنْ لاَ تَعْجَلِي فِيهِ حَتَّى تَسْتَشِيرِي أَبَوَيْكِ)** قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَتَلاَ عَلَيْهَا الآيَةَ. قَالَتْ: أَفِيكَ، يَا رَسُولَ اللهِ أَسْتَشِيرُ أَبَوَيَّ؟ بَلْ أَخْتَارُ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ. وَأَسْأَلُك أَنْ لاَ تُخْبِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِكَ بِالَّذِي قُلْتُ، قَالَ: **(لاَ تَسْأَلُنِي امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ إِلاَّ أَخْبَرْتُهَا. إِنَّ اللهَ لَمْ يَبْعَثْنِي مُعَنِّتاً وَلاَ مُتَعَنِّتاً، وَلَكِنْ بَعَثَنِي مُعَلِّماً مُيَسِّراً)**. [م١٤٧٨].

**ژ جابرێ كوڕێ عه بدوللایی ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: ئەبو بەكر هات دە ستویریێ بخواز یت ب چیتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، د یت خەلك یێ ل بەر دەر گەهی روینشتینە و دە ستویری بۆ كە سێ ژ وان نەهاتیە دان، و دە ستویری بۆ ئەبو بەكری ها تە دان و چۆ د ژۆر ڤە، پا شی عو مەر هات و دە ستویری خوا ست و دەستویری بۆ ها تە دان، د یت پێغەمبەر (ﷺ) یێ روینشتییە و هە ڤژینێت وی یێت ل دۆرماندۆرێت وی و ژ زێدەخەمیێدا یێ بێدەنگە، عو مەری د دلێ خۆدا گۆت: ئەز دێ تشتەكی بێژم كەنیا پێغەمبەری (ﷺ) بینم، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ: ئە گەر تە زانیبا كچا خاریجەیی (هەڤژینا وی) مەزاختنەكا زێدە ژ من خوا ست، ئەز را بوومێ و**

ژ ئەنەسێ كورێ مالكێ ئەنساری (رضي الله عنه) ـ و ئەو د گەل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) و خز مەتا وی د كر و هەڤالینییا وی د كر ـ گۆت: ئەبو بەكری د نە ساخییا پێغەمبەریدا (ﷺ) ئەوا تێدا مری نڤێژ ل بەری موسلمانان دكر، هەتا رۆژا دوشەمبێ و ئەو د نڤێژێدا یێت ریز بوون، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) پەردا ژۆرێ راكر و بەرێ خۆ ددا مە و ئەو ژ پیانڤە بوو، دێ بێژی ناڤچاڤێت وی پەڕەكێ سپی و گەشن، پاشی گرنژی و دكەنی، نێزیك بوو ئەم نڤێژا خۆ ژ كەیفا دیتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەلەت بكەین، ئینا ئەبوبەكر پشت و پشت هات دا بهێت بگەهیتە ریزێ، و هزر كر پێغەمبەر (ﷺ) دێ دەركەڤیت هێتە نڤێژێ، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) نیشان كرە مە نڤێژا خۆ تمام بكەن و پەردە بەرداڤە وی وێ رۆژێ وەغەر كر.

٦. باب: آخر ما تكلم به النبي (ﷺ)

## بابەتێ: دویماهی ئاخفتنا پێغەمبەر (ﷺ) پێ ئاخفتی.

٣٧١٤ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ وَهُوَ صَحِيحٌ: (**إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الجَنَّةِ، ثُمَّ يُخَيَّرَ**). فَلَمَّا نَزَلَ بِهِ، وَرَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي، غُشِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى سَقْفِ الْبَيْتِ، ثُمَّ قَالَ: (**اللَّهُمَّ! الرَّفِيقَ الأَعْلَى**). فَقُلْتُ: إِذاً لاَ يَخْتَارُنَا، وَعَرَفْتُ أَنَّهُ الحَدِيثُ الَّذِي كَانَ يُحَدِّثُنَا وَهْوَ صَحِيحٌ، قَالَتْ: فَكَانَتْ آخِرَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا: (**اللَّهُمَّ! الرَّفِيقَ الأَعْلَى**)(١).
[خ٤٤٦٣ (٤٤٣٥)/ م٢٤٤٤].

---

(١) شێخ سالحێ شامی ئەڤ فەرمووده و هەر ب ڤێ ژمارێ د مالپەرێ خۆدا ئینایە.

٣٧١٤ - (م) عَنْ عَلِيّ بنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: كَانَ آخِرُ كَلاَمِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ): (**الصَّلاَةَ الصَّلاَةَ، اتَّقُوا اللهَ فِيمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ**). [د٥١٥٦/جه٢٦٩٨]

* صحيح.

ژ عەلییێ كورێ ئەبی تالبی (رضي الله عنه) گۆت: دویماهی ئاخفتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە بوو: **(هشیاری نڤێژێ بن هشیاری نڤێژێ بن و د بەندەمیێت خۆدا ژ خودێ بترسن).**

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆت: و ئەو یێ ساخلەم: **(ب راستی چو پێغەمبەر نەمرینە هەتا ئەو جهێ خۆ ل بەحەشتێ نەبینیت، پاشی هەلبژارتن ددا وی بژیت یان وەغەر بکەت)**، ڤێجا دەمێ کەفتییە بەر مرنێ و سەرێ وی ل سەر چۆکێ من بوو، نەهش بوو و پاشی هشیار بوو و بەرێ خۆ دا بانێ مالێ و پاشی گۆت: **(ئەی خودا جهێ بلندێ تایبەت)**، ئینا من گۆت: دیارە ئەو مە ناهەلبژێریت و من زانی ئەڤە ئەو فەرموودەیە یا وی د ساخلەمییا خۆدا بۆ مە دگۆت، گۆت: **(ئەی خودا جهێ بلندێ تایبەت)**، دویماهی پەیڤ بوو پێ ئاخفتی.

٧. باب: وفاة النبي (ﷺ) وبيعة أَبي بكر

**بابەتێ: وەغەرکرنا پێغەمبەری (ﷺ) و هەلبژارتن و بەیعەتدانا ئەبوبەکری**

٣٧١٥ - (خ) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) .، قَالَتْ: أَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه عَلَى فَرَسِهِ مِنْ مَسْكَنِهِ بِالسُّنْحِ، حَتَّى نَزَلَ فَدَخَلَ المسْجِدَ، فَلَمْ يُكَلِّمِ النَّاسَ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ رضي الله عنها، فَتَيَمَّمَ النَّبِيَّ (ﷺ) وَهُوَ مُسَجًّى بِبُرْدِ حِبَرَةٍ، فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ أَكَبَّ عَلَيْهِ فَقَبَّلَهُ، ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: بِأَبِي أَنْتَ يَا نَبِيَّ اللهِ، لاَ يَجْمَعُ اللهُ عَلَيْكَ مَوْتَتَيْنِ، أَمَّا المَوْتَةُ الَّتِي كُتِبَتْ عَلَيْكَ فَقَدْ مُتَّهَا. [خ١٢٤١].

- وفي رواية: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مَاتَ وَأَبُو بَكْرٍ بِالسُّنْحِ . قَالَ إِسْمَاعِيلُ: يَعْنِي: بِالْعَالِيَةِ . فَقَامَ عُمَرُ يَقُولُ: وَاللهِ ما مَاتَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ). قَالَتْ: وَقَالَ عُمَرُ: وَاللهِ ما كَانَ يَقَعُ فِي نَفْسِي إِلاَّ ذَاكَ، وَلَيَبْعَثَنَّهُ اللهُ، فَلَيَقْطَعَنَّ أَيْدِيَ رِجالٍ وَأَرْجُلَهُمْ. فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ فَكَشَفَ عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَقَبَّلَهُ، قالَ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، طِبْتَ حَيّاً وَمَيْتاً، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يُذِيقُكَ اللهُ المَوْتَتَيْنِ أَبَداً.

ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: أَيُّهَا الحَالِفُ عَلَى رِسْلِكَ، فَلَمَّا تَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ جَلَسَ عُمَرُ، فَحَمِدَ اللهَ أَبُو بَكْرٍ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: أَلاَ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ مُحَمَّداً (ﷺ) فَإِنَّ مُحَمَّداً قَدْ مَاتَ، وَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللهَ فَإِنَّ اللهَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ. وَقَالَ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾[الزمر] وَقَالَ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ [آل عمران] فَنَشَجَ النَّاسُ يَبْكُونَ.

قَالَ: وَاجْتَمَعَتِ الأَنْصَارُ إِلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَقَالُوا: مِنَّا أَمِيرٌ وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ، فَذَهَبَ إِلَيْهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ، فَذَهَبَ عُمَرُ يَتَكَلَّمُ فَأَسْكَتَهُ أَبُو بَكْرٍ، وَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ: وَاللهِ ما أَرَدْتُ بِذلِكَ إِلاَّ أَنِّي قَدْ هَيَّأْتُ كَلاَماً قَدْ أَعْجَبَنِي، خَشِيتُ أَنْ لاَ يَبْلُغَهُ أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ تَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَتَكَلَّمَ أَبْلَغَ النَّاسِ، فَقَالَ فِي كَلاَمِهِ: نَحْنُ الأُمَرَاءُ وَأَنْتُمُ الْوُزَرَاءُ، فَقَالَ حُبَابُ بْنُ الْمُنْذِرِ: لاَ وَاللهِ لاَ نَفْعَلُ، مِنَّا أَمِيرٌ، وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: لاَ، وَلكِنَّا الأُمَرَاءُ، وَأَنْتُمُ الْوُزَرَاءُ، هُمْ أَوْسَطُ الْعَرَبِ دَاراً، وَأَعْرَبُهُمْ أَحْسَاباً، فَبَايِعُوا عُمَرَ أَوْ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ، فَقَالَ عُمَرُ: بَلْ نُبَايِعُكَ أَنْتَ، فَأَنْتَ سَيِّدُنَا، وَخَيْرُنَا، وَأَحَبُّنَا إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ). فَأَخَذَ عُمَرُ بِيَدِهِ فَبَايَعَهُ، وَبَايَعَهُ النَّاسُ، فَقَالَ قَائِلٌ: قَتَلْتُمْ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، فَقَالَ عُمَرُ: قَتَلَهُ اللهُ. [خ٣٦٦٧ و٣٦٦٨].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) ـ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ـ گۆت: ئەبوبەكر (رضي الله عنه) ل سەر هەسپی ل مالا خۆ ل سونەحێ[1] هات، هاتە خواری و چۆ د مزگەفتێڤە، و د گەل خەلكی نەئاخفت هەتا چۆیە دەڤ عائیشایێ (رضي الله عنها) و بەرێ خۆ دا پێغەمبەری (ﷺ) و ئەو ب پاتەكێ یەمەنی یان كتانی یێ خیچ خیچ هاتبوو رائێخستن ناڤچاڤێت وی ئاشكەرا كرن، پاشی خۆ هاڤێتە ب سەردا و ماچی كر، و پاشی كرە گری، و گۆت: دایك و بابێت من گۆری تە بن، ئەی پێغەمبەرێ خودێ، خودێ دو مرنا ل سەر تە كۆم ناكەت[2] هندیكە ئەو مرنا ل سەر تە هاتییە نڤیسین ئەڤە تو وێ مری.**

**و د ڤەگێڕەكێدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مر و ئەبوبەكر ل سونەحێ بوو ـ ئیسماعیل گۆت: ئانكو ل سەرێ مەدینەیێ ـ ئینا عومەری گۆت: ئەز ب خودێ كەمە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەمرییە، وێ گۆت: عومەری گۆت: ئەز ب خودێ كەمە ژ ڤێ پێڤەتر نەدهاتە سەر هزرا من و خودێ دێ وی هنێریتەڤە و دێ دەست و پێیت هندە زەلامان بڕیت، ئەبوبەكر هات و ژ سەر ناڤچاڤێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڕاكر و ماچی كر و**

---

(١) سەنوحە: سەرێ مەدینێیە.

(٢) ئانكو: خودێ نەخۆشییا پشتی مرنی نادەتە تە، یان خودێ تە د گۆڕیدا ساخ ناكەتەڤە و تە بمرینیتەڤە و تو نەخۆشییان ببەی، یان خودێ تە ساخ ناكەتەڤە هەروەكی هندەك دبێژن دا دەستێ دوروییان ببڕی و وان سزا بدەی و هۆسا دو مرنان بمری.

گۆت: دایك و بابێت من گۆری تە بن تو یێ بێهنخۆشی ساخ بی یان مری، ئەز ب وی کەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا خودێ قەت دو مرنان ل سەر تە کۆم ناکەت.

پاشی دەرکەفت، ئینا گۆت: هێدی هێدی ئەی سویندخوەر، ڤێجا دەمێ ئەبو بەکر ئاخفتی عومەر روینشت، ئینا ئەبوبەکری سوپاسییا خودێ کر و پەسنا وی کر و گۆت: بزانن هەر کەسێ موحەممەد (ﷺ) دپەرست ب راستی موحەممەدی وەغەر کر، و خواند: (إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ)[1]، و خواند: (وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيَجْزِي ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ)[2]. خەلکی دەست ب گریانا رەحەت کرن.

گۆت: و خەلکێ مەدینەیێ (ئەنسار) ل دەڤ سەعدێ کورێ عوبادەیی ل بن کەپرا بەنی ساعیدە کۆم بوون، ئینا گۆتن: ئەمیرەك ژ مەیە و ئەمیرەك ژ هەوەیە، ئینا ئەبو بەکر و عومەر و ئەبو عوبەیدەیێ کورێ جەراحی چۆنە دەڤ وان، عومەری دەستهاڤێتێ دا باخڤیت، ئینا ئەبوبەکری ئەو بێدەنگ کر، و عومەری دگۆت: ئەز ب خودێ کەمە من چو ژ هندێ نەدڤیا ئەز بەراهییێ باخڤم ژ بەر هندێ نەبیت من هندە ئاخفتن بەرهەڤ کربوون من حەژێ کر، و ئەز دترسیام ئەبو بەکر نەگەهینیت، پاشی ئەبو بەکر ئاخفت رەوانبێژترین کەس ئاخفت و د ئاخفتنا خۆدا گۆت: ئەم قورەیشی میرین و هوین هاریکارن ئینا حەبابێ کورێ مونزری گۆت: نە ب خودێ کەمە ئەم وەنا کەین، میرەك ژ مە و میرەك ژ هەوەیە، ئینا ئەبوبەکری گۆت: نەخێر بەلێ میر ژ مەیە (مە قورەیشییان) و هوین هاریکارن، و ئەو بلندترین و باشترین هۆزن و ناڤدارترین عەرەبن، ڤێجا پەیمانێ بدەنە عومەرێ کورێ خەتتابی یان ئەبو عوبەیدەیێ کورێ جەراحی، ئینا عومەری گۆت: بەلکی دێ پەیمانێ دەینە تە تو سەرداری مەیی و باشترینێ مەیی و خۆشڤیترینێ مە

---

(۱) ئانکو: بێ گۆمان تو دێ مری و ئەو ژی دێ مرن کەس نینە نەمریت.

(۲) راڤەکرن ب کورتی: و موحەممەد پێغەمبەرەکە ژ پێغەمبەران، و گەلەك پێغەمبەر بەری وی هاتینە و چۆینە، ڤێجا ئەگەر مر، یان هاتە کوشتن، هوین دێ پاشڤە زڤرن، [و هلگەڕنە سەر گاورییێ] و هەچییێ ژ هەوە پاشڤە بزڤریتەڤە [و گاور ببیت] چو زیانێ ناگەهینیتە خودێ، و خودێ دێ خەلاتێ سوپاسداران [ئەوێت خۆ ڕاگرتین و پاشڤە نەزڤرین] دەتێ.

**بووی ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا عومەری دەستێ وی گرت و پەیمان دایێ و خەلكێ ژی پەیمان دایێ، ئینا ئێكی گۆت: هەوە سەعدێ كوڕێ عوبادەیی كوشت، ئینا عومەری گۆت: خودێ ئەو كوشت.**

## ٨. باب: فاطمة ترثي النبي (ﷺ)

## بابەتێ: فاتیما ب پێغەمبەری (ﷺ) دبێژیت.

٣٧١٦ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ (ﷺ) جَعَلَ يَتَغَشَّاهُ، فَقَالَتْ فاطِمَةُ عليها السلام: وَاكَرْبَ أَبَاهُ! فَقَالَ لَهَا: (**لَيْسَ عَلَى أَبِيكِ كَرْبٌ بَعْدَ الْيَوْمِ**). فَلَمَّا ماتَ قَالَتْ: يَا أَبَتَاه أَجابَ رَبًّا دَعَاهُ. يَا أَبَتَاهُ مَنْ جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْوَاهُ. يَا أَبَتَاهُ إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعَاهُ. فَلَمَّا دُفِنَ قَالَتْ فاطِمَةُ عليها السلام: يَا أَنَسُ، أَطَابَتْ أَنْفُسُكُمْ أَنْ تَحْثُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) التُّرَابَ. [خ٤٤٦٢].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه)، گۆت: وەختێ نەساخی ل سەر پێغەمبەری (ﷺ) گران بووی، نەخۆشییێ دگرت، ئینا فاتیمایێ (رضي الله عنها) گۆت: وەی نەخۆشییا بابێ من! ئینا گۆت: (پشتی ئەڤرۆ نەخۆشی ل سەر بابێ تە نابیت)[1]، ڤێجا وەختێ مری، گۆت: یا بابێ من گاز یا خودێ ب جهـ ئینای، یا بابێ مـنێ بەحەشتا فیردەوسێ جهێ وی، یا بابێ من خەبەرێ مرنا تە ئەم ددەینە جبریلی، و وەختێ ڤەشارتی فاتیمایێ (رضي الله عنها) گۆت: چاوا دلێ وە گرت هوین ئاخێ رادەنە سەر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)؟!.**

## ٩. باب: عمر النبي (ﷺ) يوم قبض

## بابەتێ: ژییێ پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا وەغەر كری.

٣٧١٧ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) تُوُفِّيَ وَهْوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [خ٤٤٦٦ (٣٥٣٦)/ م٢٣٤٩]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر كر و ئەو كوڕێ شێست و سێ سالییێ بوو.**

٣٧١٨ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قُبِضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. وَأَبُو بَكْرٍ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. وَعُمَرُ وَهُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَسِتِّينَ. [م٢٣٤٨].

---

(١) چونكی دێ چیتە دەڤ خودایێ خۆ.

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر كر و ئەو كورێ شێست و سێ سالییێ بوو، و ئەبوبەكری و ئەو كورێ شێست و سێ سالییێ بوو و عومەری و ئەو كورێ شێست و سێ سالییێ بوو.

### ١٠. باب: عدد غزوات النبي (ﷺ)

### بابەتێ: هژمارا خەزایێت پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧١٩ – (ق) عَنْ أَبِي إِسحاقَ: كُنْتُ إِلَى جَنْبِ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ، فَقِيلَ لَهُ: كَمْ غَزَا النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ غَزْوَةٍ؟ قَالَ: تِسْعَ عَشْرَةَ، قِيلَ: كَمْ غَزَوْتَ أَنْتَ مَعَهُ؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ، قُلْتُ: فَأَيُّهُمْ كَانَتْ أَوَّلَ؟ قَالَ: الْعُشَيْرُ أَوِ الْعُسَيْرَةُ، فَذَكَرْتُ لِقَتَادَةَ فَقَالَ: الْعُشَيْرَةُ. [خ٣٩٤٩/ م: الجهاد ١٢٥٤ (١٤٣)].

ژ ئەبی ئیسحاقی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ب رەخ زەیدێ كورێ ئەرقەمیڤە بووم، ئینا ئێكی گۆتێ: پێغەمبەری (ﷺ) چەند خەزا كرینە؟ گۆت: نوازدە، گۆت: چەند خەزا تە د گەل كرینە؟ گۆت: هەفدەیان، من گۆت: كیژ یا ئێكێ بوو؟ گۆت: عوشەیرە [1] یان عوسەیرە، من ئەڤە بۆ قەتادەیی گۆت: گۆت: عوشەیرەیە.

### ١١. باب: دفن النبي (ﷺ)

### بابەتێ: گۆڕكرنا پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧٢٠ – عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، اخْتَلَفُوا فِي دَفْنِهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) شَيْئاً مَا نَسِيتُهُ، قَالَ: (**مَا قَبَضَ اللهُ نَبِيّاً؛ إِلاَّ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ**). ادْفِنُوهُ فِي مَوْضِعِ فِرَاشِهِ. [ت١٠١٨].

* صحيح.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر كری، جوداهی ل سەر ڤەشارتنا وی كەفتە د ناڤبەرا وان دا، ئینا ئەبو بەكری گۆت: من تشتەك یێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهـ لێ بووی و من ژ بیر نەكریە، گۆت: ( جانێ چو

---

(١) عوشەیرە: جهەكە دكەڤیتە دەڤ یەنبوعێ، موسلمان دەركەفتبوون دا رێكا كاروانێ قورەیشییان بگرن و ئەویێت مەرەما وان شام بەلێ نەكەفتە د رێكا موسلمانان دا.

**پێغەمبەران نەهاتییە كێشان ل وی جهی نەبیت ئەوێ وی دڤێت لێ بهێتە ڤەشارتن). ل جهێ نڤینێت وی ڤەشێرن.**

**١٢. باب: المدينة بعد وفاته (ﷺ)**

## بابەتێ: مەدینەیێ پشتی وەغەرکرنا وی (ﷺ).

٣٧٢١ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمَدِينَةَ، أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا نَفَضْنَا عَنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الْأَيْدِي، وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا. [ت٣٦١٨/ جه١٦٣١/ مي٨٨].

* صحيح.

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: رۆژا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتیە مەدینەیێ هەمی تشت ژێ رۆن بوون، و رۆژا تێدا وەغەر كری هەمی تشت ژێ تاری بوون، و هێژ مە دەستێ خۆ ژ ڤەشارتنا پێغەمبەری (ﷺ) نەداڤوتاین و ئەم دێیت ب ڤەشارتنا ویڤە دلێت مە وەكی خۆ نەمان.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

# الكتاب الثالث

# الشمائل الشريفة

# كتێبا سێیێ

# رەوشتێت شرين و بلند يێت پێغەمبەری (ﷺ)

## الفصل الأول: أسماؤه (ﷺ) وكمال خلقه

## پشكا ئێكێ: ناڤێت وی (ﷺ) تامیا رەوشتێ وی

### ١. باب: أسماؤه (ﷺ)

### بابەتێ: ناڤێت وی (ﷺ)

٣٧٢٢ - (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لِي خَمْسَةُ أَسْمَاءٍ: أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ**). [خ٣٥٣٢/ م٢٣٥٤].

**ژ جوبەیرێ كورێ موتعمی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من پێنج ناڤ یێت هەین: ئەز موحەممەدم و ئەحمەدم، و ئەز ماحیمە (ژێبەرم) خودێ ب من گاورییێ ژێ دبەت و ئەز حاشرم (كۆمكەرم) ئەوێ خەلك لێ كۆم دبن، و ئەز عاقبم (دویماهیمە)[1].**

### ٢. باب: صفات جسمه (ﷺ)

### بابەتێ: سالۆخەتێت لەشێ وی (ﷺ).

٣٧٢٣ - (ق) عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَرْبُوعاً ، بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، لَهُ شَعَرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ، رَأَيْتُهُ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ، لَمْ أَرَ شَيْئاً قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ.[خ٣٥٥١/ م٢٣٣٧].

- وفي رواية لهما: قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ وَجْهاً، وَأَحْسَنَهُ خَلْقاً، لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلاَ بِالْقَصِيرِ. [خ٣٥٤٩].

**ژ بەرائێ كورێ عازبی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ بەژن ناڤنجی بوو (نە یێ درێژ بوو و نە یێ كورت) و ناڤملێت وی د پان بوون، پرچێ وی دگەهشتە نەرمییا هەردو گوهێت وی، و من جلكەكێ بەر و بەتن ژ ئێك یێ سۆر ل بەر دیت، تشتێ ژ وی جوانتر چو جار من نەدیتبوو.**

---

(١) ئانكو: دویماهی پێغەمبەرم.

- و د ڤەگێرەكا واندا: گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ هەمی خەلكی نافچاڤ جوانتر بوو و ژ هەمی مرۆڤان سنج و رەوشت پاك و باشتر بوو، نە بەژن درێژەكێ ديار بوو و نە يێ كورت بوو.

## ٣. باب: صفة شعر النبي (ﷺ)

## بابەتێ: سالۆخەتێ پرچێ پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧٢٤ - (ق) عَنْ قتادةَ قالَ: سأَلتُ أَنَسَ بْنَ مالك عن شعر رَسُول اللهِ (ﷺ) فَقَالَ: كانَ شَعْرُ رَسُول اللهِ (ﷺ) رَجِلاً، لَيْسَ بالسَّبْطِ ولا الجَعْدِ، بين أُذنيه وعاتِقِهِ. [خ٥٩٠٥ (٥٩٠٣)/ م٢٣٣٨].

ژ قەتادەيی (رحمه الله) گۆت: من پرسيارا پرچێ پێغەمبەری (ﷺ) ژ ئەنەسێ كورێ مالكی كر، ئينا گۆت: پرچێ پێغەمبەری (ﷺ) دهاتە خوار و نەيێ حولی حولی بوو و نە يێ خەلەك بوو، و بۆ درێژييێ دگەهشتە گوهێت وی و سەر ملێت وی.

٣٧٢٥ - (ق) عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قالَ: سَأَلْتُ أَنساً: أَخَضَبَ النَّبِيُّ (ﷺ)؟ قالَ: لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ إِلاَّ قَلِيلاً. [٥٨٩٤ (٣٥٥٠)/ م٢٣٤١].

ژ موحەممەدێ كورێ سيرينی (رحمه الله) گۆت: من پرسيارا ئەنەسی كر: ئەرێ پێغەمبەری (ﷺ) سەرێ خۆ بۆياغ دكر؟ گۆت: هند سپی نەببوو كێمەك نەبيت[1].

## ٤. باب: طيب رائحته (ﷺ)

## بابەتێ: بێهنخۆشييا پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧٢٦ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قالَ: ما مَسِسْتُ حَرِيراً وَلاَ دِيبَاجاً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَلاَ شَمِمْتُ رِيحاً قَطُّ، أَوْ عَرْفاً قَطُّ أَطْيَبَ مِنْ رِيحِ أَوْ عَرْفِ النَّبِيِّ (ﷺ). [خ٣٥٦١ (١١٤١)/ م٢٣٣٠].

ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: من دەست نەكرييە كراسەكێ ئارمويشی و ئارمويشەكی ب خۆ ژی ژ دەستێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەرمتر، و من چو جارا بێهن نەكرييە بێهنخۆشييەكێ ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بهێنخۆشتر.

---

(١) ئانكو: هند سەرێ وی سپی نەببوو هەوجەی بۆياغێ ببيت.

٣٧٢٧ - (ق) عَنْ ثُمَامَةَ، عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ أُمَّ سُلَيْمٍ كَانَتْ تَبْسُطُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) نِطْعاً، فَيَقِيلُ عِنْدَهَا عَلَى ذلِكَ النِّطْعِ، قَالَ: فَإِذَا نَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَخَذَتْ مِنْ عَرَقِهِ وَشَعرِهِ، فَجَمَعَتْهُ فِي قَارُورَةٍ، ثُمَّ جَمَعَتْهُ فِي سُكٍّ. قالَ: فَلَمَّا حَضَرَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ الْوَفَاةُ، أَوْصى إِلَيَّ أَنْ يُجْعَلَ فِي حَنُوطِهِ مِنْ ذلِكَ السُّكِّ، قالَ: فَجُعِلَ فِي حَنُوطِهِ. [خ٦٢٨١/ م٢٣٣١، ٢٣٣٢].

**ژ سومامەیی (ﷺ) ژ ئەنەسی: ئوم سولەیمێ رائێخەكا پێستی بۆ پێغەمبەری (ﷺ) رادئێخست و ل دەڤ وێ دەمێ نیڤرۆ ل سەر وێ رائێخێ دنڤست،[1] ڤێجا ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) نڤستبا خوها وی و موییێت وی رادكرن و د شیشەكێدا كۆم دكر، پاشی د گەل بێهنخۆشییەكا دی تێكەل دكر، سومامەیی گۆت: ڤێجا دەمێ ئەنەسێ كورێ مالكی كەفتییە بەر مرنێ وەسیەتا من كر ئەز وێ بێهنخۆشییا تێكەلۆك بكەمە د ناڤ وێ بێهنخۆشییا د لەشەێ وی دهێتە دان، ئینا كرە د ناڤ وێ بێهنخۆشییێدا.**

**٥. باب: مشيه (ﷺ)**

## بابەتێ: ب رێڤەچوونا وی (ﷺ).

٣٧٢٨ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا مَشَى، مَشَى أَصْحَابُهُ أَمَامَهُ، وَتَرَكُوا ظَهْرَهُ لِلْمَلَائِكَةِ. [جه٢٤٦].

* صحيح.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ پێغەمبەر (ﷺ) دچۆ، هەڤالێت وی ل پێشییا وی دچۆن، و پشتا وی بۆ ملیاكەتان دهێلا.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ئوم سولەیم و خویشكا وێ ئوم حەرام كچێت میلحانی مەحرەمێت پێغەمبەرێ خودێ بوون (ﷺ) ب شیردانێڤە و دبوونە خالەتێت وی.

## الفصل الثاني: عظيم اخلاقة (ﷺ )

## پشکا دووێ: رەوشت مەزنییا وی (ﷺ).

### ١. باب: حسن خلقه (ﷺ).

### بابەتێ: رەوشت باشی و جوانییا وی (ﷺ).

٣٧٢٩ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ (ﷺ) فاحِشاً وَلاَ مُتَفَحِّشاً، وَكَانَ يَقُولُ: (إِنَّ مِنْ خِيَارِكُمْ أَحْسَنَكُمْ أَخْلاَقاً). [خ٣٥٥٩/ م٢٣٢١].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عەمری (خودێ ژ هەردووان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) نە یێ ئاخفتن و کار و کریار کەشەفرێت بوو و نە یێ کەشەفرێتخواز بوو د گۆتن و کار و کریارێت خۆدا، و دگۆت: (ب راستی باشێت هەوە ئەون، یێت سنج و رەوشتێت وان باشتر).**

٣٧٣٠ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا قَالَ لِي: أُفٍّ، وَلاَ: لِمَ صَنَعْتَ؟ وَلاَ: أَلاَ صَنَعْتَ؟ [خ٦٠٣٨ (٢٧٦٨)/ م٢٣٠٩].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: من دەه سالان خزمەتا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یا کری، و جارەکێ نەگۆتییە من ئۆف (ئاخفتنەکا بێزارییێیە)، و نەگۆتییە تشەکێ من کری: تە بۆچی کر؟ و تشتەکێ من نەکری، بلا تە ئەڤە کربا.**

٣٧٣١ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقاً. [م٢٣١٠].

**و ژ ئەنەسێ کورێ مالکی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ هەمی مرۆڤان سنج و رەوشت پاك و باشتر بوو.**

### ٢. باب: حياؤه (ﷺ)

### بابەتێ: شەرمینییا وی (ﷺ).

٣٧٣٢ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدْرِيِّ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، فَإِذَا رَأَى شَيْئاً يَكْرَهُهُ عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ. [خ٦١٠٢ (٣٥٦٢)/ م٢٣٢٠].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ كچا نەشویكری یا د بن پەرییێڤە شەرمینتر بوو[1]. هەكە تشتەكێ پێ نەخۆش دیتبا مە ژ نافچاڤێت وی دزانی.**

**٣. باب: ما انتقم (ﷺ) لنفسه**

**بابەتێ: وی (ﷺ) بۆ خۆ ب خۆ تۆلێت خۆ نەڤەكرینە.**

٣٧٣٣ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ؛ إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا ما لَمْ يَكُنْ إِثْماً، فَإِنْ كانَ إِثْماً كانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) لِنَفْسِهِ؛ إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللهِ، فَيَنْتَقِمَ للهِ بِهَا. [خ٣٥٦٠/ م٢٣٢٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها)، گۆت: چو جارا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د مابەینا دو تشتاندا (كارێ دنیایێ بیت یان یێ دینی) ژێگرتن بۆ نەهاتییە دان هەكە یێ ساناهیتر نەگرتبیت هندی گونەهـ نەبیت، هەكە گونەهـ با ئەو ژ هەمی مرۆڤان ژێ دویرتر بوو، و د چو تشتاندا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بۆ خۆ تۆل نەڤەكرییە ژ بلی ئەمر و نەهییێت خودێ هاتبانە شكاندن هینگێ تۆل بۆ خودێ دستاند.**

٣٧٣٤ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) شَيْئاً قَطُّ بِيَدِهِ، وَلاَ امْرَأَةً، وَلاَ خَادِماً؛ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللهِ. وَمَا نِيلَ مِنْهُ شَيْءٌ قَطُّ، فَيَنْتَقِمَ مِنْ صَاحِبِهِ؛ إِلاَّ أَنْ يُنْتَهَكَ شَيْءٌ مِنْ مَحَارِمِ اللهِ، فَيَنْتَقِمَ للهِ عزّ وجل. [م٢٣٢٨].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چو جارا ب دەستێ خۆ ل چو تشتان نەدایە و نە ژنەكێ و نە خزمەتكارەكی ژبلی ئەو جیهادێ د رێكا خودێدا بكەت، و كەسەكێ چو جارا تشت نەگەهاندییێ و تۆل ل خودانێ وی تشتی ڤەكربیت ژبلی كو تشتەك ژ ئەمر و نەهییێت خودێ هاتبانە شكاندن هینگێ تۆل بۆ خودێ دستاند.**

---

(١) نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: زانا دبێژن: راستییا شەرمێ سنجەكە پالدانێ دكەت ل سەر هێلانا خرابییێ و ناهێلیت كێماسی د مافێ خودانێ مافیدا بێتە كرن. و مە ژ ئەبی قاسمی جونەیدی ڤەگێرای خودێ دلۆڤانییێ پێ ببەت گۆت: شەرم: دیتنا خۆشی نیعمەتانە و دیتنا تەخسیرییێیە، د نافبەرا هەردوكاندا كراسەك پەیدا دبیت دبێژنێ: شەرم.

## ٤ . باب: حلمه (ﷺ)

## بابەتێ: نەرم و حەلیمیا وی (ﷺ)؟

٣٧٣٥ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) وَعَلَيْهِ بُرْدٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَذَبَهُ جَذْبَةً شَدِيدَةً، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عاتِقِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَدْ أَثَّرَتْ بِهِ حاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَذْبَتِهِ، ثُمَّ قالَ: مُرْ لِي مِنْ مالِ اللهِ الَّذِي عِنْدَكَ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ فَضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ. [خ٣١٤٩/ م١٠٥٧].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دچۆم و عەبایەكێ نەجرانی یێ لفك ستویر و زڤر ل بەر بوو، كۆچەرە عەرەبەك گەهشتێ، ب عەبایێ ویڤە كێشا كێشانەكا ب هێز، من بەرێ خۆ دا روییێ پاتكا پێغەمبەری (ﷺ) لفكا عەبای جهێ خۆ تێدا كربوو، ژ كێشانا وی یا ب هێز، پاشی گۆت: یا موحەممەد ئەمری ب مالێ خودێ یێ ل دەڤ تە بۆ من بكە، لێ زڤری و كرە كەنی، پاشی فەرمان ب دانەكێ بۆ كر.**

## ٥. باب: كرمه (ﷺ)

## بابەتێ: مەردینییا وی (ﷺ).

٣٧٣٦ - (ق) عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: ما سُئِلَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ شَيْءٍ قَطُّ فَقَالَ: لاَ. [خ٦٠٣٤/ م٢٣١١]

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: چو تشت ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهاتییە خواستن و گۆتبیت: نە.**

٣٧٣٧ - (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى الإِسْلاَمِ شَيْئاً إِلاَّ أَعْطَاهُ. قَالَ: فَجَاءَه رَجُلٌ فَأَعْطَاهُ غَنماً بَيْنَ جَبَلَيْنِ، فَرَجَعَ إِلَى قَوْمِهِ، فَقَالَ: يَا قَوْمِ! أَسْلِمُوا، فَإِنَّ مُحَمَّداً يُعْطِي عَطَاءً لاَ يَخْشَى الْفَاقَةَ. [م٢٣١٢].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه)، گۆت: چو تشت ل سەر ئیسلامێ (ئانكو: بۆ شرینكرنا ئیسلامێ) ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەهاتییە خواستن و نەدابیتێ، و ب راستی زەلامەك هاتە دەڤ پەز مابەینا دو چیایاندا دایێ، زڤری ناڤ مرۆڤێت خۆ و گۆت: گەلێ من موسلمان ببن، ب راستی موحەممەد دانەكێ ددەت ژ هەژارییێ ناترسیت ژ هەژارییێ نەترسیت.**

٦. باب: شجاعته (ﷺ)

## بابەتێ: مێرخاسییا وی (ﷺ).

٣٧٣٨ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قالَ: كانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ، وَأَجْوَدَ النَّاسِ، وَأَشْجَعَ النَّاسِ، قالَ: وَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ المدِينَةِ لَيْلَةً، سَمِعُوا صَوْتاً، قالَ: فَتَلَقَّاهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى فَرَسٍ لأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، وَهُوَ مُتَقَلِّدٌ سَيْفَهُ، فَقَالَ: (لَمْ تُرَاعُوا لَمْ تُرَاعُوا). ثُمَّ قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (وَجَدْتُهُ بَحْراً). يعني: الْفَرَسَ. [خ٣٠٤٠ (٢٦٢٧)/ م٢٣٠٧].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) باشترینێ خەلكی و مەردترینێ خەلكی و وێرەكترینێ خەلكی بوو، گۆت: شەڤەكێ خەلكێ مەدینەیێ ترسیان و گوهـ ل دەنگەكی بوون، گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) ل سەر هەسپەكێ ئەبی تەلحەیی یێ رویس و نەزینكری ئەو دیتن[1] و شیرێ خۆ د بەر خۆدا دانابوو، ئینا گۆت: (بۆچی دترسن بۆ چی دترسن)[2] پاشی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (من ئەو دەریا دیت) ئانكو: هەسپ[3].**

٧. باب: تواضعه (ﷺ) ورحمته

## بابەتێ: خۆنەمەزنكرن و دلۆڤانییا وی (ﷺ).

٣٧٣٩ - (م) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ امْرَأَةً كَانَ فِي عَقْلِهَا شَيْءٌ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً، فَقَالَ: (يَا أُمَّ فُلاَنٍ! انْظُرِي أَيَّ السِّكَكِ شِئْتِ، حَتَّى أَقْضِيَ لَكِ حَاجَتَكِ) فَخَلاَ مَعَهَا فِي بَعْضِ الطُّرُقِ، حَتَّى فَرَغَتْ مِنْ حَاجَتِهَا. [م٢٣٢٦].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: ژ نەكێ تشتەك د عەقلێ وێدا هەبوو، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ من هەوجەییەكا ب تە هەی، ئینا گۆت: (ئەی دایكا فلانی بەرێ خۆ بدەیێ تە كیژ رێك دڤێت دا هەوجەییا تە بقەتینم)، ئینا د هندە رێكێدا ما ل دەڤ وێ هەتا هەوجەییا وێ قەتاندی.**

---

(١) ئانكو: پێغەمبەر (ﷺ) ل پێشییا وان و ب تنێ ل دویف وی دەنگی چۆبوو، و دەمێ خەلكێ مەدینەیێ چۆین دا بزانن كا ئەو چ دەنگە پێغەمبەر (ﷺ) دزڤری و ئەو دیتن.

(٢) ئانكو نەترسن نەترسن.

(٣) مەبەست ئەوە ئەو هەسپ گەلەك یێ سڤك بوو د گەل كو د بنیاتێ خۆدا هەسپەكێ تەمبەل و پێگران بوو و ب بەرەكەتا پێغەمبەری (ﷺ) وەسا یێ سڤك بوو.

٣٧٤٠ - عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ، فَكَلَّمَهُ، فَجَعَلَ تُرْعَدُ فَرَائِصُهُ، فَقَالَ لَهُ: **(هَوِّنْ عَلَيْكَ، فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ، إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ)**. [جه٣٣١٢].

* صحيح.

[وانظر: ٢٤٠٢، ٢٤٠٣] .

**ژ ئیبن مە سعودی (رضي الله عنه) گۆت: زەلا مەك ها تە دەڤ پێغەمـ بەری (ﷺ) و د گەل ئاخفت ژ ترسادا گۆشتێ د ناڤبەرا تەنشت و ملێت ویدا دلەرزی، ئینا گۆتێ: (ل سەر خۆ سڤك بکە، ئەز نە شاهم، ئەز کورێ ژنەکێمە گۆشتێ هشککری دخوار).**

٨. باب: طريقته (ﷺ) في الكلام

## بابەتێ: شێوازێ ئاخفتنا وی (ﷺ).

٣٧٤١ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يُحَدِّثُ حَدِيثاً لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لأَحْصَاهُ. [خ٣٥٦٧/ م٣٢٤٩٣م/ زهد ٧١]

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب ئاخفتنەکێ دئاخفت ئەگەر ئێکی ڤیابا ئاخفتنا وی بهەژمێریت دا هەژمێریت.**

٣٧٤٢ - (خ) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلاَثاً، حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ، وَإِذَا أَتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، سَلَّمَ عَلَيْهِمْ ثَلاَثاً. [خ٩٥ (٩٤)].

[وانظر: ٢١٣١، ٣٧٧٩.

وانظر في مزاحه (ﷺ): ٣٤٣٥، ٣٤٣٦] .

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەکە ب ئاخفتنەکێ ئاخفتبا سێ جاران دگۆتەڤە، هەتا ژێ هاتبا تێگەهشتن، و هەکە د بەر هندەکانرا بۆریبا سێ جاران سلاڤ دکرە وان.**

٩. باب: ضحكه (ﷺ)

## بابەتێ: کەنیا وی (ﷺ).

٣٧٤٣ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) مُسْتَجْمِعاً قَطُّ ضَاحِكاً، حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ، إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ. [خ٦٠٩٢ (٤٨٢٨)/ م٨٩٩].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چو جارا نەدیتییە بەردابیتە كەنی (ئانكو: زێدە كەنی بیت) هەتا پانكا دەڤێ وی دەركەفتبیت بەلێ بەس دگرنژی.**

٣٧٤٤ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَكْثَرَ تَبَسُّماً مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ).[ت٣٦٤١].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كورێ حارسێ كورێ جەزئی (رضي الله عنه) گۆت: من كەس نەدیتییە گرنژینا وی پتر بیت ژ یا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ).**

**١٠. باب: من سبَّه النبي (ﷺ)**

**بابەتێ: یێ پێغەمبەری (ﷺ) خەبەر گۆتبنێ.**

٣٧٤٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(اللَّهُمَّ! فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ سَبَبْتُهُ، فَاجْعَلْ ذَلِكَ لَهُ قُرْبَةً إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).** [خ٦٣٦١/ م٢٦٠١].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: وی گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (ئەی خودا هەر باوەریدارەكێ من خەبەر گۆتبنێ تو وێ بۆ بكە نێزیكبوون ژ خۆ رۆژا قیامەتێ.**

**١١. باب: كان (ﷺ) يقيد من نفسه**

**بابەتێ: پێغەمبەری (ﷺ) تۆل ژ خۆ ڤەدكر.**

٣٧٤٦ - عَنْ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ ـ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ ـ قَالَ: بَيْنَمَا هُوَ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ، وَكَانَ فِيهِ مِزَاحٌ، بَيْنَا يُضْحِكُهُمْ، فَطَعَنَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي خَاصِرَتِهِ بِعُودٍ، فَقَالَ: أَصْبِرْنِي فَقَالَ: **(اصْطَبِرْ)** ، قَالَ: إِنَّ عَلَيْكَ قَمِيصاً، وَلَيْسَ عَلَيَّ قَمِيصٌ، فَرَفَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ قَمِيصِهِ، فَاحْتَضَنَهُ وَجَعَلَ يُقَبِّلُ كَشْحَهُ، قَالَ: إِنَّمَا أَرَدْتُ هَذَا يَا رَسُولَ اللهِ. [د٥٢٢٤].

* إسناده صحيح.

**ژ ئو سەیدێ كورێ حوزەیری (رضي الله عنه) ـ زەلا مەك ژ ئەنساران بوو ـ گۆت: دە مێ ئو سەید بۆ خەلكی دئاخفت و مرۆڤەكێ ترانە كەر بوو، دە مێ وی كەنیا وان دئینا پێغەمبەری (ﷺ) دارەك ل تەنشتا وی دا، ئینا گۆت: (تۆلێت من ژ خۆ ڤەكە)[1]، ئینا**

---

(١) یان: خۆ راگرە و رێكێ بدە من تۆلێت خۆ ژ تە ڤەكەم.

پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(مافێ خۆ وەرگرە)**[1]، ئینا ئوسەیدی گۆت: كراس یێ ل بەر تە و كراس ل بەر من نینە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) كراسێ خۆ راكر، ئینا پێغەمبەر گرت و دەستهاڤێتێ بن پەراسییێت وی رەخێ تەنشتێڤە ماچی كر و گۆت: ب راستی من بەس ئەڤە دڤیا ئەی پێغەمبەرێ خودێ.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ئانكو: تۆلێت خۆ ژ من ڤەكە.

الفصل الثالث: طرف من معيشته (ﷺ)

## پشکا سێیێ: هندەك ژ ژین و ژیارا پێغەمبەری (ﷺ)

١. باب: قوله (ﷺ): (ما لي وللدنيا)

## بابەتێ: گۆتنا وی (ﷺ) (من و دنیایێ چ ژێکە).

٣٧٤٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ (ﷺ) بَيْتَ فَاطِمَةَ فَلَمْ يَدْخُلْ عَلَيْهَا، وَجَاءَ عَلِيٌّ فَذَكَرَتْ لَهُ ذلِكَ، فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: **(إِنِّي رَأَيْتُ عَلَى بَابِهَا سِتْراً مَوْشِيّاً)** ، فَقَالَ: **(ما لِي وَلِلدُّنْيَا)**. فَأَتَاهَا عَلِيٌّ فَذَكَرَ ذلِكَ لَهَا، فَقَالَتْ: لِيَأْمُرْنِي فِيهِ بِمَا شَاءَ، قَالَ: **(تُرْسِلُ بِهِ إِلَى فُلاَنٍ، أَهْلِ بَيْتٍ بِهِمْ حَاجَةٌ)**. [خ٢٦١٣].

**ژ ئیبن عومەری ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مالا فاتیمایێ و نەچۆ ژۆر، و عەلی هات و ئەڤ چەندە بۆ گۆت، و وی ئەڤە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) فەگێرا[1]، گۆت: (ب راستی من پەردەکا رەنگین و نەخشکری دیت) و گۆت: (ما من و دنیایێ چ ژێکە)، ئینا عەلی هاتە دەڤ و ئەڤە گەهاندێ، ئینا گۆت: بلا فەرمانا من تێدا بکەت ب وی تشتێ وی دڤێت، گۆت: (بلا فرێکەت فلان مالێ خەلکێ مالێ هەوجەیی یا پێ هەی).**

٣٧٤٨ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بن مَسْعُودٍ قَالَ: نَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَى حَصِيرٍ، فَقَامَ وَقَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ اتَّخَذْنَا لَكَ وِطَاءً، فَقَالَ: **(مَا لِي وَمَا لِلدُّنْيَا، مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلاَّ كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ، ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا)**. [ت٢٣٧٧/ جه٤١٠٩]

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ کورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر حێسیلەکێ دنڤست جهێ خۆ د تەنشتا ویدا کربوو، مە گۆت: یا پێغەمبەرێ خودێ هەکە مە بۆ تە دۆشەکەکا خۆش ئینابا، ئینا گۆت: (من و دنیایێ چ ژێکە؟ ئەز د دنیایێدا وەکی سویارەکی پێڤەتر نینم خۆ دابیتە بن سیبەرا دارەکێ پاشی چۆبیت و هێلابیت).**

---

(١) ئانکو: ل سەر فاتیمایێ یا گران بوو چاوا تو چۆیە بەر دەرگەهێ مالا وێ و تو نەچۆیە ژۆر.

## ٢. باب: ما كان يأكل (ﷺ)

## بابەتێ: خوارنا پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧٤٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا أَكَلَ آلُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) أَكْلَتَيْنِ فِي يَوْمٍ؛ إِلاَّ إِحْدَاهُمَا تَمْرٌ. [خ٦٤٥٥/ م٢٩٧١]

**ژ عائيشايێ (رضي الله عنها) گۆت: مالا موحەممەدی (ﷺ) د رۆژەكێدا دو خوارن نەخوارينە ئەگەر ئێك ژ وان قەسپ نەبيت.**

٣٧٥٠ - (ق) وَعَنْهَا رضي الله عنها قَالَتْ: ما شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ (ﷺ)، مُنْذُ قَدِمَ المَدِينَةَ، مِنْ طَعَامِ الْبُرِّ ثَلاَثَ لَيَالٍ تِبَاعاً، حَتَّى قُبِضَ. [خ٥٤١٦/ م٢٩٧٠].

**ژ عائيشايێ (رضي الله عنها) گۆت: مالا موحەممەدی (ﷺ) پشتی هاتييە مەدينەيێ سێ شەڤان ل سەرێك تێر نانێ گەنمی نەخوارييە هەتا چۆيە بەر دلۆڤانييا خودێ.**

٣٧٥١ - (ق) وَعَنْهَا رضي الله عنها، أَنَّهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: ابْنَ أُخْتِي، إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلاَلِ، ثُمَّ الْهِلاَلِ، ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَتْ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) نَارٌ. فَقُلْتُ: يَا خَالَةُ، ما كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتِ: الأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ وَالماءُ؛ إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ كانَ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) جِيرَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ، كَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ ، وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) مِنْ أَلْبَانِهِمْ فَيَسْقِينَا. [خ٢٥٦٧/ م٢٩٧٢].

**ژ وێ (رضي الله عنها) گۆتە عوروەيی: كورێ خويشكا من، مە بەرێ خۆ ددا هەيڤێ (ئانكو: هەلاتنا وێ) پاشی هەيڤێ، پاشی هەيڤێ سێ هەلاتن د دو هەيڤاندا، و ئاگرەك د مالێت پێغەمبەريڤە (ﷺ) نەهاتە هەلكرن، من گۆتێ: خالەت پا ژيانا هەوە ل سەر چ بوو؟ گۆت: قەسپا و ئاڤێ، بەلێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هندە جيران ژ ئەنساران خەلكێ مەدينێ هەبوون و وان تەرش و كەواليێت ب شير هەبوون[1] شيرێ وان بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دهنارت و وی ددا مە، مە ڤەدخوار.**

٣٧٥٢ - (خ) وَعَنْهَا رضي الله عنها قَالَتْ: ما شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) مِنْ خُبْزِ بُرٍّ مَأْدُومٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ. [خ٦٦٨٧ (٥٤٢٣)].

---

(١) خەلكی دابوونێ مفای بۆ خۆ ژ شيرێ وان بكەن هەتا شيرێ وان نەمينيت جارەكا دی بۆ خودانان بزڤرينن.

**ژ وێ (رضي الله عنها) گۆت: مالا موحەممەدی (ﷺ) سێ رۆژان ل سەرێك تێر نانێ گەنمی و پێخوارن ل گەل نەخوارییە هەتا چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ.**

٣٧٥٣ - (خ) عَنْ قَتَادَةَ قالَ: كُنَّا نَأْتِي أَنَسَ بْنَ مالِكٍ رضي الله عنه وَخَبَّازُهُ قَائِمٌ، قالَ: كُلُوا، فَمَا أَعْلَمُ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى رَغِيفاً مُرَقَّقاً حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ، وَلاَ رَأَى شَاةً سَمِيطاً بِعَيْنِهِ قَطُّ. [خ٥٤٢١ (٥٣٨٥)].

**ژ قەتادەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم دهاتینە دەڤ ئەنەسێ كوڕێ مالكی (رضي الله عنه) و نانپێژێ وی یێ راوەستای بوو، گۆت: بخۆن، بیرا من ناهێت پێغەمبەری (ﷺ) نانەكێ نەرم و باش دیتبیت هەتا گەهشتییە خودایێ خۆ، یان جارەكێ گیسكەكێ كەڤلكری [1] و هاتبیتە بژارتن چو جارا ب چاڤێ خۆ نەدیتییە.**

٣٧٥٤ - (خ) عَنْ أَبِي حازِمٍ قالَ: سَأَلْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ فَقُلْتُ: هَلْ أَكَلَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) النَّقِيَّ؟ فَقَالَ سَهْلٌ: ما رَأَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) النَّقِيَّ، مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللهُ حَتَّى قَبَضَهُ اللهُ. قالَ: فَقُلْتُ: هَلْ كَانَتْ لَكُمْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَنَاخِلُ؟ قَالَ: ما رَأَى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُنْخُلاً، مِنْ حِينَ ابْتَعَثَهُ اللهُ حَتَّى قَبَضَهُ. قالَ: قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَأْكُلُونَ الشَّعِيرَ غَيْرَ مَنْخُولٍ؟ قالَ: كُنَّا نَطْحَنُهُ وَنَنْفُخُهُ، فَيَطِيرُ ما طَارَ، وَمَا بَقِيَ ثَرَّيْنَاهُ فَأَكَلْنَاهُ. [خ٥٤١٣ (٥٤١٠)].

**ژ ئەبی حازمی (رضي الله عنه) گۆت: من پرسیارا سەهلێ كوڕێ سەعدی كر ئەرێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ ئارێ سفر خوارییە؟ ئینا گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە خودایێ مەزن هنارتی هەتا خودێ برییە دەڤ خۆ نانێ ئارێ سفر نەدیتییە، گۆتنێ هەوە ل سەر وەختێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مۆخلك هەبوون؟ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەڤە خودایێ مەزن هنارتی هەتا خودێ برییە دەڤ خۆ مۆخلك نەدیتییە، گۆتنێ: پا هەوە چاوا جەهێ نەمۆخلكری دخوار؟! گۆت: مە دهێرا و مە ددا بای یێ دفڕی دفڕی و یێ دما مە تەڕ دكر و مە دكرە هەڤیر و مە دخوار.**

٣٧٥٥ - (خ) عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: ما عَلِمْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) أَكَلَ عَلَى سُكْرُجَةٍ قَطُّ، وَلاَ خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ قَطُّ، وَلاَ أَكَلَ عَلَى خِوَانٍ قَطُّ. قِيلَ لِقَتَادَةَ: فَعَلَى ما كَانُوا يَأْكُلُونَ؟ قَالَ: عَلَى السُّفَرِ. [خ٥٣٨٦].

---

**(١) ئانكو: د ناڤا گەرمدا موییێ وی هاتبیتە ژێڤەكرن.**

ژ قەتادەیی (رحمه الله) ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: من نەزانییە پێغەمبەری (ﷺ) قەت د سێنیكێت بچویكدا یان تشتێت دلڤەكەر دلی ببەنە خوارنێ خواربن، و قەت نانێ نەرم و باش بۆ نەهاتییە پاتن، و قەت ل سەر مێزە و خانكان نەخوارییە، من گۆتە قەتادەیی: پا وان ل سەر چ دخوار؟ گۆت: ل سەر سفرا رائێخستی ل سەر عەردی.

### ٣. باب: فراشه (ﷺ)

### بابەتێ: نڤینێت وی (ﷺ).

٣٧٥٦ - (ق) عَنْ عائِشَةَ قَالَتْ: كانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مِنْ أَدَمٍ، وَحَشْوُهُ مِنْ لِيفٍ.

[خ٦٤٥٦/ م٢٠٨٢]

- وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: كَانَ وَسَادَةُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، الَّتِي يَتَّكِئُ عَلَيْهَا، مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: نڤینێت پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ژ كەڤلی بوون ب رویشالۆكێت دارقەسپێ هاتبوونە داگرتن.

- و د ڤەگێرەكا موسلمیدا: بالیفكا پێغەمبەری (ﷺ) ئەوا پالا خۆ ددایێ ژ كەڤلی بوو ب رویشالۆكێت دارقەسپێ هاتبوو داگرتن.

### ٤. باب: أحب الشراب إليه (ﷺ)

### بابەتێ: خۆشترین ڤەخوارن ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧٥٧ - عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الشَّرَابِ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الْحُلْوَ الْبَارِدَ. [ت١٨٩٥].

* صحيح.

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: خۆشترین ڤەخوارن ل دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) یا شرین و سار بوو.

الفصل الرابع: تركته (ﷺ) وميراثه

## پشکا چوارێ: پاشمایێ وی (ﷺ) و میراتێ وی.

### ١. باب: ما تركه (ﷺ)

### بابەتێ: پاشمایێ وی (ﷺ).

٣٧٥٨ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَمَا فِي بَيْتِي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ، إِلاَّ شَطْرَ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ. [خ٣٠٩٧/ م٢٩٧٣].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ بەر دلۆڤانییا خودێ: و تشتەك د مالا مندا نەبوو خودان ر حەك بخۆت پیچەكا جەهی نەبیت ل سەر دەپەكی بوو، و من ژێ دخوار هەتا ل سەر من درێژ بووی، پاشی من كێشا (كا چەند مایە) ئینا خلاس بوو.**

٣٧٥٩ - (خ) عَنْ عَمْرِو بْنِ الحَارِثِ . خَتَنِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، أَخِي جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الحَارِثِ ، قَالَ: ما تَرَكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عِندَ مَوْتِهِ دِرْهَماً، وَلاَ دِيناراً، وَلاَ عَبْداً، وَلاَ أَمَةً، وَلاَ شَيْئاً؛ إِلاَّ بَغْلَتَهُ البَيْضَاءَ، وَسِلاَحَهُ، وَأَرْضاً جَعَلَهَا صَدَقَةً. [خ٢٧٣٩].

**ژ عومەرێ كورێ حارسی، خزمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) برایێ جووەیرییا كچا حارسی دایكا موسلمانان خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆیە بەر دلۆڤانییا خودێ، نە دینارەك نە دەرهەمەك نە كۆلەیەك و نە جارییەك و نە تشتەك، پاش خۆ نەهێلابوو، هێسترا خۆ یا سپی نەبیت ئەوا لێ سویار دبوو و چەكێ خۆ و عەردەك ئەو ژی كربوو سەدەقە.**

### ٢. باب: قدح النبي (ﷺ)

### بابەتێ: پەرداغێ پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧٦٠ - (خ) عَنْ عاصِمٍ الأَحْوَلِ قَالَ: رَأَيْتُ قَدَحَ النَّبِيِّ (ﷺ) عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ، وَكَانَ قَدِ انْصَدَعَ فَسَلْسَلَهُ بِفِضَّةٍ، قالَ: وَهُوَ قَدَحٌ جَيِّدٌ عَرِيضٌ مِنْ نُضارٍ.

قالَ: قالَ أَنَسٌ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِي هَذَا الْقَدَحِ أَكْثَرَ مِنْ كَذَا وَكَذَا.

قَالَ: وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: إِنَّهُ كانَ فِيهِ حَلْقَةٌ مِنْ حَدِيدٍ، فَأَرَادَ أَنَسٌ أَنْ يَجْعَلَ مَكانَهَا حَلْقَةً مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ، فَقَالَ لَهُ أَبُو طَلْحَةَ: لاَ تُغَيِّرَنَّ شَيْئاً صَنَعَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَتَرَكَهُ. [خ٥٦٣٨ (٣١٠٩)].

ژ عاسمێ ئەحوەل (رضي الله عنه) گۆت: من پەرداغێ پێغەمبەری (ﷺ) ل دەڤ ئەنەسێ کورێ مالکی دیت بوو و دەرزی بوو، ڤێجا ب زنجیرە کا زیڤی چێ کر بوو، گۆت: ئەو پەرداغەکێ باش و فرەھ و ژ دارێ نەززار بوو.

گۆت: ئەنەسی گۆت: من پتر ژ ھندە ھندە جاران ئاڤ یا ب ڤی پەرداغی دا یە پێغەمبەری (ﷺ).

گۆت: و ئیبن سیرین گۆت: خەلەکەکا ئاسنی پێڤە بوو، و ئەنەسی دڤیا ئەو خەلەکەکا زێری یان یا زیڤی ل شوینا وێ دانیت، ئینا ئەبو تەلحەیی گۆتێ: تشتەك پێغەمبەری (ﷺ) دورست کربیت نەگوھۆرە، ئینا وەکی خۆ ھێلا.

## ٣. باب: في الكساء والنعل

## بابەتێ: جلك و شمكان.

٣٧٦١ - (ق) عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عائِشَةُ كِسَاءً وَإِزَاراً غَلِيظاً، فَقَالَتْ: قُبِضَ رُوحُ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي هذَيْنِ. [خ٥٨١٨ (٣١٠٨)/ م٢٠٨٠].

ژ ئەبی بوردەیی (رضي الله عنه) گۆت: عائیشایێ (رضي الله عنها) جلکەك و ئیزارەکێ[1] ستویر بۆ مە دەرێخستن، و گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د ڤان ھەردووواندا ئەمرێ خودێ کر.

٣٧٦٢ - (خ) عَنْ عِيسى بْنِ طَهْمَانَ قَالَ: أَخْرَجَ إِلَيْنَا أَنَسٌ نَعْلَيْنِ جَرْدَاوَيْنِ لَهُمَا قِبَالاَنِ. فَحَدَّثَنِي ثَابِتٌ البُنَانِيُّ بَعْدُ عَنْ أَنَسٍ: أَنَّهُمَا نَعْلاَ النَّبِيِّ (ﷺ). [خ٣١٠٧].

ژ عیسایێ کورێ تەھمانی (رضي الله عنه) گۆت: ئەنەسی جۆتەکێ شمکێت کەڤلی یێت بێ موی بۆ مە دەرئێخست و دو جھێت ناڤتلان لێ بوون، و پاشی سابتێ بەنانی ژ ئەنەسی گۆتە مە: ئەو شمکێت پێغەمبەری بوون (ﷺ).

## ٤. باب: قوله (ﷺ): (لا نورث)

## بابەتێ: گۆتنا وی (ﷺ): (میراتگرییا مە ناھێتە کرن).

٣٧٦٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: **(لاَ يَقْتَسِمُ وَرَثَتِي دِيناراً، ما تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمُؤْنَةِ عامِلِي، فَهْوَ صَدَقَةٌ)**. [خ٦٧٢٩ (٢٧٧٦)/ م١٧٦٠].

---

(١) ئیزار ئەو پاتەیە یێ د خۆ وەردکەن ژ ناڤکێ پێڤە.

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (میراتخۆر ێت من دینارەكێ لێكڤە ناكەن، ئەوا من ل پاش خۆ هێلای پشتی خەرجییێ هەڤژینێت من و تێچۆییێ كاركەرێ[1] من بێ دی سەدەقەیە).**

٣٧٦٤ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (ﷺ) حِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، أَرَدْنَ أَنْ يَبْعَثْنَ عُثْمَانَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ يَسْأَلْنَهُ مِيرَاثَهُنَّ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَلَيْسَ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ**؟!). [خ٦٧٣٠ (٤٠٣٤)/ م١٧٥٨].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: دە مێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) وەغەر كری هەڤژینێت پێغەمبەری (ﷺ) ڤیان عوسمانی بهنێرنە دەڤ ئەبو بەكری دا خوازا میراتێ خۆ بكەن، ئینا عائیشایێ گۆت: ما پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەگۆتییە: (میراتگرییا مە ناهێتە كرن، ئەوا ئەم دهێلین سەدەقەیە؟!).**

## ٥. باب: قرابته (ﷺ)

## بابەتێ: مرۆڤێت وی (ﷺ).

٣٧٦٥ - (خ) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قَالَ: مَشَيْتُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَعْطَيْتَ بَنِي المطَّلِبِ وَتَرَكْتَنَا، وَنَحْنُ وَهُمْ مِنْكَ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّمَا بَنُو الْمُطَّلِبِ وَبَنُو هَاشِمٍ شَيْءٌ وَاحِدٌ**). [خ٣١٤٠].

**ژ جوبەیرێ كورێ موتعمی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز و عوسمانێ كورێ عەففانی چۆینە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تە دا موتتەلبییان و تە ئەم هێلاین، و ئەم و ئەو بۆ تە وەكی ئێكین؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (هندیكە موتتەلب و هاشمینە ئێكن).**

❀❀❀❀❀❀❀❀❀❀

(١) هاتییە گۆتن: كاركەر: ئەوە یێ سەرپەرشتییا سەدەقەیان دكەت، یان ئەوە یێ د عەردێ ویدا شۆل دكەت و سەخبێر دكەت، یان ئەوە یێ پشت وی جهێ وی دگریت و دبیتە دەستهەلاتدار ل سەر موسلمانان.

## الفصل الخامس: في بركة النبي (ﷺ)

## پشكا پێنجێ: د بەرمكەتێت پێغەمبەریدا (ﷺ).

٣٧٦٦ - (خ) عَنْ إِسْرَائِيلَ بْنِ يُونُسَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: أَرْسَلَنِي أَهْلِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ . وَقَبَضَ إِسْرَائِيلُ ثَلاَثَ أَصَابِعَ . مِنْ قُصَّةٍ ، فِيهَا شَعْرٌ مِنْ شَعْرِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَكَانَ إِذَا أَصَابَ الإِنْسَانَ عَيْنٌ أَوْ شَيْءٌ بَعَثَ إِلَيْهَا مِخْضَبَهُ، فَاطَّلَعْتُ فِي الْجُلْجُلِ، فَرَأَيْتُ شَعَرَاتٍ حُمْراً. [خ٥٨٩٦].

- وفي رواية: قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ، فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا شَعْراً مِنْ شَعْرِ النَّبِيِّ (ﷺ) مَخْضُوباً.[خ٥٨٩٧].

**ژ ئیسرائیلێ كورێ یوونسی (رحمه الله) ژ عوسمانێ كورێ عەبدوللایێ كورێ مەوهەبی گۆت: مالا من ئەز ب پەرداغەكا ئاڤێ هنارتمە دەڤ ئوم سەلەمەیێ. ئیسرائیلی سێ تلێت خۆ گرتن[1]. پار چەكا موی ژ موییێت پێغەمبەری (ﷺ) تێدا بوو، و ئەگەر چاڤان مرۆڤەك هنگافتبا یان تشتەكێ دی ئامانێ خۆ دهنارتنە دەڤ دا وان موییان ژ زەنگلێ دەرئێخیت و د گەل تێكەل كەت، من بەرێ خۆ دا وێ زەنگلێ من موییێت سۆر تێدا دیتن.**

- **و د ڤەگێرەكێدا: گۆت: ئەز چۆمە دەڤ ئوم سەلەمەیێ، ئێنا موییەك ژ موییێت پێغەمبەری (ﷺ) یێت بۆیاغكری بۆ مە دەرئێخست.**

٣٧٦٧ - (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ، فَيُبَرِّكُ عَلَيْهِمْ ، وَيُحَنِّكُهُمْ. [م٢١٤٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: بچویك دئینانە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دوعا خێرێ و بەرەكەتێ بۆ دكرن و مێژكۆیی دكرن[2].**

٣٧٦٨ - (م) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إِذَا صَلَّى الْغَدَاةَ جَاءَ خَدَمُ الْمَدِينَةِ بِآنِيَتِهِمْ فِيهَا الْمَاءُ، فَمَا يُؤْتَى بِإِنَاءٍ إِلاَّ غَمَسَ يَدَهُ فِيهَا، فَرُبَّمَا جَاؤُوهُ فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ فَيَغْمِسُ يَدَهُ فِيهَا. [م٢٣٢٤].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەگەر نڤێژا سپێدێ كربایە، خزمەتكارێت مەدینەیێ ب ئامانێت خۆڤە دهاتن و ئاڤ تێدا بوون، ڤێجا چو**

(١) نیشان بۆ بچویكییا پەرداغی.

(٢) مێژكۆیی: نەڤەیە پێغەمبەر (ﷺ) دا قەسپێ هەلگریت و جویت و پاشی، ژ دەڤێ خۆ دئینا دەرێ و دكرە د دەڤێ بچویكیدا، پاشی د پانییا دەڤێ وی یا سلال دهوسی.

**ئامان بۆ نەدهاتن ئەگەر دەستێ خۆ نەکربا تێدا، و دبیت سپێدەکا سار ژێ ئینابا یە وی هەر دەستێ خۆ دکرە تێدا.**

٣٧٦٩ - (ق) عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ، وَرَأَيْتُ بِلاَلاً أَخَذَ وَضُوءَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَرَأَيْتُ النَّاسَ يَبْتَدِرُونَ ذَاكَ الوَضُوءَ، فَمَنْ أَصَابَ مِنْهُ شَيْئاً تَمَسَّحَ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ شَيْئاً أَخَذَ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ. [خ٣٧٦ (١٨٧)/ م٥٠٣].

**ژ ئەبی جوحەیفەیی (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل بن گومبەتەکا سۆر یا کەڤلیڤە دیت، و من بیلال دیت ئاڤا دەستنڤێژێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)ئینا، و من خەلك دیت خۆ دهاڤێژنە وێ ئاڤا دەستنڤێژێ، ڤێجا هەر کەسێ تشتەك گەهشتبایێ خۆ پێ ڤەدمالی و یێ چو ت شت ژێ نەگەهشتبایێ ژ تەڕاتییا دەستێ هەڤالێ خۆ وەردگرت.**

٣٧٧٠ - (خ) عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ: حَدَّثَنَا شَبِيبُ بْنُ غَرْقَدَةَ قَالَ: سَمِعْتُ الحَيَّ يُحَدِّثُونَ، عَنْ عُرْوَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَعْطَاهُ دِيناراً يَشْتَرِي لَهُ بِهِ شَاةً، فَاشْتَرَى لَهُ بِهِ شَاتَيْنِ، فَبَاعَ إِحْدَاهُمَا بِدِينَارٍ، وَجَاءَهُ بِدِينَارٍ وَشَاةٍ، فَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ فِي بَيْعِهِ، وَكَانَ لَوِ اشْتَرَى التُّرَابَ لَرَبِحَ فِيهِ. [خ٣٦٤٢].

**ژ سوفیانێ کوڕێ عویەینەیی (رحمه الله) شەبیبێ کوڕێ غەرقەدی بۆ مە گۆت، گۆت: من ژ هۆزا وی گوه لێ بوو دگۆتن ژ عوروەیی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دینارەك دا ڤێ پەزەکێ بۆ پێ بکڕیت، ئینا دو بۆ پێ کڕین، ئینا ئێك ژ وان ب دینارەکێ فرۆت، و دینارەك و پەزەك بۆ ئینان، ئینا دوعایێت بەرەکەتێ د بازارێ ویدا بۆ کرن، ڤێجا ئەگەر وی ئاخ فرۆتبایە مفا تێدا دکر.**

٣٧٧١ - (م) عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ أُمَّ مَالِكٍ كَانَتْ تُهْدِي لِلنَّبِيِّ (ﷺ) فِي عُكَّةٍ لَهَا سَمْناً، فَيَأْتِيهَا بَنُوهَا فَيَسْأَلُونَ الأُدْمَ، وَلَيْسَ عِنْدَهُمْ شَيْءٌ، فَتَعْمِدُ إِلَى الَّذِي كَانَتْ تُهْدِي فِيهِ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَتَجِدُ فِيهِ سَمْناً، فَمَا زَالَ يُقِيمُ لَهَا أُدْمَ بَيْتِهَا حَتَّى عَصَرَتْهُ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: (**عَصَرْتِيهَا**)؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: (**لَوْ تَرَكْتِيهَا مَا زَالَ قَائِماً**). [م٢٢٨٠].

**ژ جابری (رضي الله عنه) گۆت: دایکا مالکی روین د مەشکەکا خۆدا بۆ پێغەمبەری (ﷺ) د کرە دیاری، ڤێجا کوڕێت وێ دا هێن و دا خوازا پێخوارنێ ژێ کەن، و چو ل دەڤ وان نەبوو، ڤێجا دا بەرێ خۆ دەتە وێ مەشکا روین تێدا بۆ پێغەمبەری (ﷺ) د کرە دیاری،**

**ڤێجا دا هندە روینی تێدا بینیت، ڤێجا بەردەوام پێخوارنا مالا وێ ژێ دهات هەتا گڤاشتی، پشتی گڤاشتی هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا گۆتێ: (تە ئەو گڤاشت)؟ گۆت: بەلێ: گۆت: (ئەگەر تە ئەو هێلابا دا بەردەوام تێدا هەبیت).**

٣٧٧٢ - (م) وَعَنْهُ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) يَسْتَطْعِمُهُ، فَأَطْعَمَهُ شَطْرَ وَسْقِ شَعِيرٍ، فَمَا زَالَ الرَّجُلُ يَأْكُلُ مِنْهُ وَامْرَأَتُهُ وَضَيْفُهُمَا، حَتَّى كَالَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: (**لَوْ لَمْ تَكِلْهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ، وَلَقَامَ لَكُمْ**). [م٢٢٨١].

[وانظر: ٢٧٣٧].

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: زەلامەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) داخوازا خوارنێ ژێ كر، ئینا نیڤ باری[1] جەهی دایێ و بەردەوام وی زەلامی و ژ نا وی و مێڤانێت وان ژێ د خوار هەتا وان پیڤایی، و ئەو هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆتێ: (ئەگەر تە نەپیڤابا دا ژێ خۆن و دا یا بەردەوام بیت بۆ هەوە).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ویسقەك: بارمكە، و هەر ویسقەك ب كێشا سەردەم دبیتە (١٣٠,٥) كغم.

## الفصل السادس: الخصائص

## پشكا شەشێ: تایبەتمەندی

### ١. باب: تفضيله (ﷺ) على جميع الخلائق

### بابەتێ: سەرئێخستنا وی (ﷺ) ب سەر هەمی چێكرییاندا.

٣٧٧٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ، وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ). [م٢٢٧٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( ئەز سەرداریێ دویندەها ئادەمیمە، و یێ ئێكێمە گۆڕ بۆ ددەرز یت و بەرڤانیێ ئێكێمە و و بەرڤانی وەرگریێ ئێكێمە).**

٣٧٧٤ - (خ) وَعَنْهُ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (بُعِثْتُ مِنْ خَيْرِ قُرُونِ بَنِي آدَمَ، قَرْناً فَقَرْناً، حَتَّى كُنْتُ مِنَ الْقَرْنِ الَّذِي كُنْتُ فِيهِ). [خ٣٥٥٧].

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( ئەز ژ باشترین دویندەها ئادەمی هاتمە هنارتن، دویندەهـ ل دویڤ دویندەهێ، هەتا ئەو دویندەها ئەز تێدا).**

٣٧٧٥ - (ق) وَعَنْهُ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتاً، فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ؛ إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هذِهِ اللَّبِنَةُ؟ قَالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتِمُ النَّبِيِّينَ). [خ٣٥٣٥/ م٢٢٨٦].

**و ژ وی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( ب راستی مەتەلا من و پێغەمبەرێت بەری من وەكی مەتەلا زەلامەكییە خانییەكی ئاڤا بكەت، باش و جوان بكەت، و جهێ لبنەكی تنێ د كوژییەكیڕا بمینیت، ڤێجا خەلك ل دۆر بزڤرن و پێ ڤە حێبەتی ببن، و بێژن بۆچی ئەڤ لبنە ژی نەدهاتە دانان؟ ئێدا ئەز ئەو لبنەمە و ئەز دویماهییێ پێغەمبەرانم).**

## ٢. باب: إثبات خاتم النبوة

## بابەتێ: ئاشكراكرنا مۆرا پێغەمبەراتییێ.

٣٧٧٦ – عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ، فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، مِثْلَ زِرِّ الحَجَلَةِ. [خ١٩٠/ م٢٣٤٥].

**ژ سائیبێ كورێ یەزیدی (رضي الله عنه) گۆت: خالەتا من ئەز برمە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ)، ئینا وێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، خوارزایێ من یێ نەساخە، ئینا سەرێ من ڤەمالی، و دوعا خێرێ بۆ من كر، پاشی دەستنڤێژا خۆ شویشت و من ژ ئاڤا دەستنڤێژا وی ڤەخوار، پاشی ئەز پشت وی راوەستام من بەرێ خۆ دا مۆرا پێغەمبەراتییێ د ناڤەرا هەردو ملێت ویدا وەكی هێكا كەوی بوو.**

## ٣. باب: إسلام شيطان النبي (ﷺ)

## بابەتێ: موسلمانبوونا شەیتانێ پێغەمبەری (ﷺ).

٣٧٧٧ – (م) عَنْ عَائِشَةَ . زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) .:أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا لَيْلاً. قَالَتْ: فَغِرْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ فَرَأَى مَا أَصْنَعُ، فَقَالَ: (**مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ أَغِرْتِ؟**) فَقُلْتُ: وَمَا لِي لاَ يَغَارُ مِثْلِي عَلَى مِثْلِكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَقَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ**)؟ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَوَ مَعِيَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) قُلْتُ: وَمَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ؟ قَالَ: (**نَعَمْ**) قُلْتُ: وَمَعَكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، وَلَكِنْ رَبِّي أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ**). [م٢٨١٥].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) ـ هەڤژینا پێغەمبەری (ﷺ) ـ گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب شەڤ ژ دەڤ وێ چۆ، گۆت: غیرەتێ ئەز گرتم[1]، ئینا هات و دیت كا ئەز چ دكەم، ئینا گۆت: (تە خێرە ئەی عائیشە، غیرەتێ تو گرتی)؟ من گۆت: ئەرێ چاوا ئێكا وەكی من ل سەر ئێكێ وەكی تە د غیرەت نا چیت؟ ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەرێ شەیتانێ تە هاتییە تە)؟ گۆت: ما شەیتانەك د گەل من هەیە؟ گۆت: (بەلێ) وێ گۆت: و**

---

(١) ئەز ترسیام چۆبیتە دەڤ ئێك ژ هەڤژینێت خۆ یێت دی.

**د گەل هەر مرۆڤەکی؟ گۆت: ( بەلێ) من گۆت: و د گەل تە ژی؟ گۆت: ( بەلێ، بەلێ خودایێ من هاریکارییا من ل سەر وی کر هەتا موسلمان بووی).**

## ٤. باب: النبي (ﷺ) أمان لأصحابه

## بابەتێ: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەڤالێت خۆ ئێمناهییە.

٣٧٧٨ - (م) عَنْ أَبِي موسى الأشعري قَالَ: صَلَّيْنَا الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، ثمَّ قُلْنَا: لَوْ جَلَسْنَا حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَهُ الْعِشَاءَ، قَالَ: فَجَلَسْنَا، فَخَرَجَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: (**مَا زِلْتُمْ هاهُنَا**) ؟ قلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ، صَلَّيْنَا مَعَكَ الْمَغْرِبَ ثُمَّ قُلْنَا: نَجْلِسُ حَتَّى نُصَلِّيَ مَعَكَ الْعِشَاءَ. قَالَ: (**أَحْسَنْتُمْ أَوْ أَصَبْتُمْ**) قَالَ: فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، وَكَانَ كَثِيراً مِمَّا يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: (**النُّجُومُ أَمَنَةٌ لِلسَّمَاءِ، فَإِذَا ذَهَبَتِ النُّجُومُ أَتَى السَّمَاءَ مَا تُوعَدُ. وَأَنَا أَمَنَةٌ لأَصْحَابِي، فَإِذَا ذَهَبْتُ أَتَى أَصْحَابِي مَا يُوعَدُونَ. وَأَصْحَابِي أَمَنَةٌ لأُمَّتِي، فَإِذَا ذَهَبَ أَصْحَابِي أَتَى أُمَّتِي مَا يُوعَدُونَ**). [م٢٥٣١].

**ژ ئەبی موو سایێ ئە شعەری (رضي الله عنه) گۆت: مە نڤێژا مەغرەب د گەل پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ) و پاشی مە گۆت: ئەگەر ئەم روینینە خوارێ هەتا نڤێژا عەیشا ژی د گەل بکەین، گۆت: ئەم روینشتین هەتا هاتییە دەڤ مە و گۆت: (هێژ هوین ل ڤێرێنە)؟ مە گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مە نڤێژا مەغرەب د گەل تە کر، و پاشی مە گۆت: دێ روینین هەتا نڤێژا عەیشا ژی د گەل تە بکەین، گۆت: (هەوە باش کر یان یا دورست کر) گۆت: ئینا سەرێ خۆ بلندکرە عەسمانی و وی گەلەك بەرێ خۆ ددا عەسمانی و گۆت: (ستێر نیشانا ئەمانێنە بۆ عەسمانی ڤێجا ئەگەر ستێر چۆن ئەوا بۆ عەسمانی بۆ عەسمانی هات یا ژڤان بۆ هاتییە دان، و ئەز نیشانا ئەمانێمە بۆ هەڤالێت خۆ، ڤێجا ئەگەر ئەز چۆم ئەو بۆ هەڤالێت من هات یا ژڤان بۆ وان هاتییە دان، و هەڤالێت من نیشانا ئەمانێنە بۆ ئوممەتا من، و ئەگەر هەڤالێت من چۆن ئەو بۆ ئوممەتا من هات یا ژڤان بۆ وان هاتییە دان).**

## ٥. باب: خصائص متنوعة

## بابەتێ: تایبەتمەندییێت جودا جودا.

٣٧٧٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (فُضِّلْتُ عَلَى الأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِي الْغَنَائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ طَهُوراً وَمَسْجِداً، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ). لفظ مسلم. [خ٢٩٧٧/ م٥٢٣].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ب شەش تشتان ئەز ب سەر پێغەمبەران هاتیمە ئێخستن: (پەیڤێت كورت و پڕ رامان داینە من، و ب ترسێ ئەز سەرئێخستیمە، و دەستكەفت بۆ من هاتینە دور ستكرن، و عەرد بۆ من كریە مزگەفت و پاك كرییە[1]، و ئەز بۆ هەمی خەلكی هاتیمە هنارتن، و پێغەمبەر ب من ب دویماهی هاتینە). و ئەڤە بێژەیا موسلمییە.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ئانكو: هەر جهێ نڤێژ ل موسلمانی بوو دشێت نڤێژا خۆ بكەت، و مەرج نینە ل مزگەفتێ بیت، و ئەگەر ئاڤ نەبوو ئەو دشێت ب ئاخێ تەیەمومێ بكەت.

## الفصل السابع: المعجزات

## پشكا حەفتێ: موعجیزە

### ١. باب: نبع الماء من بين أصابعه (ﷺ) وتكثيره

### بابەتێ: زانا ئاڤێ ژ ناڤ تلێت وی (ﷺ) و زێدەبوونا وێ.

٣٧٨٠ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، وَحَانَتْ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَالْتَمَسَ النَّاسَ الْوَضُوءَ فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِوَضُوءٍ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي ذَلِكَ الإِنَاءِ يَدَهُ، وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّؤُوا مِنْهُ. قَالَ: فَرَأَيْتُ الماءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ، حَتَّى تَوَضَّؤُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ. [خ١٦٩/ م٢٢٧٩].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی: (رضي الله عنه) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت، و دەمێ نڤێژا ئێڤاری هاتبوو، و خەلك ل ئاڤێ دگەریان دەستنڤێژا خۆ پێ بگرن و نەدیت، ئینا ئاڤ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئینا، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستێ خۆ كرە د وی ئامانیدا و فەرمانا خەلكی كر ئەو دەستنڤێژا خۆ پێ بشۆن، ئەنەسی گۆت: من بەرێ خۆ دایێ ئاڤ د ناڤبەرا تلێت ویدا دزا، هەتا یێ دویماهییێ دەستنڤێژا خۆ پێ شویشتی.**

٣٧٨١ - (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قالَ: كُنَّا نَعُدُّ الآيَاتِ بَرَكَةً، وَأَنْتُمْ تَعُدُّونَهَا تَخْوِيفاً، كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فَقَلَّ الماءُ، فَقَالَ: (**اطْلُبُوا فَضْلَةً مِنْ مَاءٍ**). فَجَاؤُوا بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ قَلِيلٌ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ، ثُمَّ قَالَ: (**حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ المُبَارَكِ، وَالْبَرَكَةُ مِنَ اللهِ**). فَلَقَدْ رَأَيْتُ الماءَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَلَقَدْ كُنَّا نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ وَهْوَ يُؤْكَلُ. [خ٣٥٧٩].

**ژ عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: مە موعجیزە وەك بەرەكەت ددیتن، و هوین ب ترس دزانن، ئەم د وەغەرەكێدا د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ)، ئاڤ كێم بوو، ئینا گۆت: (پیچەكا ئاڤێ داخواز بكەن)، ئامانەك ئینا پیچەكا ئاڤێ تێدا بوو، دەستێ خۆ كرە د ئامانیدا و پاشی گۆت: (وەرنە ئاڤا پاككەرا پیرۆز و پیرۆزی ژ خودێیە)، ب سویند من دیت ئاڤ د ناڤبەرا تلێت پێغەمبەرێ خودێدا (ﷺ) دزا، و ب سویند مە گوهـ ل تەسبیحا خوارنێ دبوو دەمێ ئەو دهاتە خوارن.**

## ٢. باب: تكثير الطعام

## بابەتێ: زۆربوونا خوارنێ.

٣٧٨٢ - (ق) عَنْ عَبْدِ الرَّحْمنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ثَلاَثِينَ وَمِائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ**) ؟ فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ، ثُمَّ جاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ، مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ، بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**بَيْعاً أَمْ عَطِيَّةً، أَوْ قَالَ: أَمْ هِبَةً**). قَالَ: لاَ، بَلْ بَيْعٌ، فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً، فَصُنِعَتْ، وَأَمَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِسَوَادِ الْبَطْنِ أَنْ يُشْوَى. وَايْمُ اللهِ، مَا فِي الثَّلاَثِينَ وَالْمِائَةِ إِلاَّ قَدْ حَزَّ النَّبِيُّ (ﷺ) لَهُ حُزَّةً مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا، إِنْ كانَ شَاهِداً أَعْطَاهَا إِيَّاهُ، وَإِنْ كانَ غائِباً خَبَأَ لَهُ، فَجَعَلَ مِنْهَا قَصْعَتَيْنِ، فَأَكَلُوا أَجْمَعُونَ وَشَبِعْنَا، فَفَضَلَتِ الْقَصْعَتَانِ، فَحَمَلْنَاهُ عَلَى الْبَعِيرِ، أَوْ كما قالَ. [خ٢٦١٨ (٢٢١٦)/ م٢٠٥٦].

**ژ عەبدولرەحمانێ کوڕێ ئەبوبەکری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ئەم سەد و سیهـ د گەل پێغەمبەرێ بووین (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەرێ خوارنەك د گەل ئێکی ژ هەوە هەیە)؟ من هند دیت منەکا خوارنێ یان نێزیکی وێ د گەل زەلامەکێ بوو، هاتە هەڤیرکرن، پاشی زەلامەکێ هەڤپشکچێکەر یێ درێژ و سەر قژەڤژ هات یێ پەزی دهاژۆت، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (دێ فرۆشییە مە یان دێ دەیە مە یان گۆت: دێ کەیە دیاری بۆ مە)؟ گۆت: نەخێر، بەلکی فرۆتنە، ئینا پەزەك ژێ کری و هاتە دورست کرن، و پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان کر مێلاك و تشتێت د زکیدا بهێنە بژارتن، و ئەز ب خودێ کەمە نینە ئێك ژ وان سەد و سیهان ئەگەر پێغەمبەری (ﷺ) پارچەك ژ تشتێ د ناڤ زکێ وێدا نەدابیتێ، ئەگەر یێ ئامادە بیت دا ڤێ، و ئەگەر نە یێ ئامادە بیت بۆ هەلگرت، و کرە دو سێنی هەمیان ژێ خوار و تێر بوون و د وان سێنییاندا ما و مە ل سەر حێشترێ هەلگرت یان هەروەکی گۆتی.**

٣٧٨٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَوْ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ. شَكَّ الأَعْمَشُ. قَالَ: لَمَّا كَانَ غَزْوَةُ تَبُوكَ، أَصَابَ النَّاسَ مَجَاعَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ أَذِنْتَ لَنَا فَنَحَرْنَا نَوَاضِحَنَا فَأَكَلْنَا وَادَّهَنَّا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**افْعَلُوا**). قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنْ فَعَلْتَ قَلَّ الظَّهْرُ، وَلكِنِ ادْعُهُمْ بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ، ثُمَّ ادْعُ اللهَ لَهُمْ عَلَيْهَا بِالْبَرَكَةِ، لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَجْعَلَ فِي ذلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**نَعَمْ**).

قَالَ: فَدَعَا بِنِطَعٍ فَبَسَطَهُ، ثُمَّ دَعَا بِفَضْلِ أَزْوَادِهِمْ، قَالَ: فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِكَفِّ ذُرَةٍ، قَالَ: وَيَجِيءُ الآخَرُ بِكَفِّ تَمْرٍ، قَالَ: وَيَجِيءُ الآخَرُ بَكِسْرَةٍ، حَتَّى اجْتَمَعَ عَلَى النِّطَعِ مِنْ ذلِكَ شَيْءٌ يَسِيرٌ، قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَلَيْهِ بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ قَالَ: (**خُذُوا فِي أَوْعِيَتِكُمْ**) قَالَ: فَأَخَذُوا فِي أَوْعِيَتِهِمْ، حَتَّى مَا تَرَكُوا فِي الْعَسْكَرِ وِعَاءً إِلاَّ مَلَؤُوهُ. قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، وَفَضَلَتْ فَضْلَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ، لاَ يَلْقَى اللهَ بِهِمَا عَبْدٌ، غَيْرَ شَاكٍّ، فَيُحْجَبَ عَنِ الْجَنَّةِ**).[م٢٧].

**ژ ئەبی هورەیرە یان ژ ئەبی سەعیدێ خودری، (خودێ ژ هەردووان رازی بیت) - ئەعمەش ب گۆمان کەتییە[1] - گۆت: وەختێ غەزوا تەبووکێ برس بۆ خەلکی چێ بوو، گۆتن: یا پێغەمبەرێ خودێ هەکە تە دەستویرییا مە دابا مە حێشترێت خۆ فەکوشتبان دا خۆین و بۆ خۆ دوهنی ژی (ژ بەزێ وان) گرین؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (وەبکەن). عومەر (رضي الله عنه) هات، گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ، هەکە تو دەستویرییێ بدەی، دەوار دێ کێم بن، بەلێ گازی وان بکە زادێ وان یێ مای بلا بینن، پاشی دوعا بۆ وان ب بەرەکەتێ ل سەر بکە، هیڤییە خودێ بەرەکەتێ بێخیتە دڤێدا. پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بلا).**

**کەڤلەك ئینا و رائێخست، پاشی داخوازا خوارنا وان یا مای کر، زەلام هات مستەکا گەنمۆکا ئینا و ئێکێ دی هات مستەکا قەسپا ئینا و ئێکێ دی ب پرتەکا نانی هات، هەتا تشتەکێ کێم ل سەر کەڤلی کۆم بووی، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دوعا بەرەکەتێ کر، پاشی گۆت: (ب ئامانێت خۆ راکەن)، ئامانێت خۆ تژی کرن، هەتا ئامان د ناڤ لەشکەریدا نەماین تژی نەکرین، و هەمیان خوار هەتا تێر بووین، و ژ بەر وان زێدە ژی کر، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەز شەهدە ددەم کو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن خودێ نەبیت و ئەز پێغەمبەرێ ویمە، نینە بەندەیەك ب ڤێ ب بێگۆمان بگەهیتە خودێ، و ئەو ژ بەحەشتێ بێتە پاشڤەدان).**

---

(١) نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: گۆمان بۆ ڤەگێری یا چێ بووی، بەلێ گۆمان د هەڤالێ پێغەمبەریدا زیانێ ناکەت، چونکی هەمی د دادپەروەرن.

## ٣. باب: الإخبار عن المستقبل

## بابەتێ: خەبەردان ژ ئایندەی.

٣٧٨٤ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قالَ: شَهِدْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ لِرَجُلٍ مِمَّنْ يَدَّعِي الإِسْلاَمَ: **(هَذَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ)**. فَلَمَّا حَضَرَ الْقِتَالُ قَاتَلَ الرَّجُلُ قِتَالاً شَدِيداً، فَأَصَابَتْهُ جِرَاحَةٌ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، الَّذِي قُلْتَ إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَإِنَّهُ قَدْ قَاتَلَ الْيَوْمَ قِتَالاً شَدِيداً وَقَدْ مَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِلَى النَّارِ)**. قَالَ: فَكَادَ بَعْضُ النَّاسِ أَنْ يَرْتَابَ، فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذلِكَ إِذْ قِيلَ: إِنَّهُ لَمْ يَمُتْ، وَلكِنَّ بِهِ جِرَاحاً شَدِيداً، فَلَمَّا كانَ مِنَ اللَّيْلِ لَمْ يَصْبِرْ عَلَى الْجِرَاحِ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِذلِكَ فَقَالَ: **( اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنِّي عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ)**. ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَنَادَى بِالنَّاسِ: **(إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَإِنَّ اللهَ لَيُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ)**. [خ٣٠٦٢/ م١١١].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ)، ئینا گۆتە زەلامەكی ژ وان یێت خۆ موسلمان ددانا: (ئەڤە خەلكێ جەهنەمێیە)، ڤێجا دەمێ شەڕی دەست پێ كری وی زەلامی شەڕەكێ دژوار كر، و بریندار بوو، ئێكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەوێ تە گۆتی: ئەو خەلكێ ئاگرییە، ب راستی وی ئەڤرۆ شەڕەكێ دژوار كر و ئەو مر، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (بۆ جەهنەمێ)، نێزیك بوو بۆ هندەكان گۆمان چێ ببیت، ڤێجا ئەو د هۆسا بوون هاتە گۆتن: ئەو نەمرییە بەلێ برینێت گران یێت لێ بووین، ڤێجا دەمێ بوویە شەڤ بێهنا خۆ ل سەر برینان نەكێشا و خۆ ل بەر نەگرت، ئینا خۆ كوشت، و ئەڤ چەندە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) هاتە گۆتن، ئینا گۆت: (خودێ یێ مەزنە و ئەز شەهدەیێ ددەم ئەز بەندەیێ خودێمە و پێغەمبەرێ ویمە) و پاشی فەرمانا بیلالی كر ئەو د ناڤ خەلكیدا گازی كەت: (ب راستی كەس ناچیتە بەحەشتێ یێ موسلمان نەبیت، و ب راستی خودێ پشتگرییا ڤی دینی ب زەلامێ خراب دكەت).**

٣٧٨٥ – (ق) وَعَنْهُ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: **(هَلَكَ كِسْرَى، ثُمَّ لاَ يَكُونُ كِسْرَى بَعْدَهُ، وَقَيْصَرٌ لَيَهْلِكَنَّ ثُمَّ لاَ يَكُونُ قَيْصَرٌ بَعْدَهُ، وَلَتُقْسَمَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللهِ)**. [خ٣٠٢٧/ م٢٩١٨].

**و ژ وی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (كیسرا مر و پاشی پشتی وی كیسرا نابن و قەیسەر دێ مریت و پاشی پشتی وی قەیسەر نابن، و ب سویند گەنجینەیێت وان دێ د رێكا خودێدا هێنە لێكفەكرن).**

٣٧٨٦ – (خ) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: انْطَلَقَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ مُعْتَمِراً، قَالَ: فَنَزَلَ عَلَى أُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ أَبِي صَفْوَانَ، وَكَانَ أُمَيَّةُ إِذَا انْطَلَقَ إِلَى الشَّامِ فَمَرَّ بِالمدِينَةِ نَزَلَ عَلَى سَعْدٍ، فَقَالَ أُمَيَّةُ لِسَعْدٍ: انْتَظِرْ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ النَّهَارُ وَغَفَلَ النَّاسُ انْطَلَقْتَ فَطُفْتَ. فَبَيْنَا سَعْدٌ يَطُوفُ إِذَا أَبُو جَهْلٍ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا الَّذِي يَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ؟ فَقَالَ سَعْدٌ: أَنَا سَعْدٌ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: تَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ آمِناً، وَقَدْ آوَيْتُمْ مُحَمَّداً وَأَصْحَابَهُ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَتَلاحَيَا بَيْنَهُمَا، فَقَالَ أُمَيَّةُ لَسَعْدٍ: لاَ تَرْفَعْ صَوْتَكَ عَلَى أَبِي الحَكَمِ، فَإِنَّهُ سَيِّدُ أَهْلِ الْوَادِي. ثُمَّ قَالَ سَعْدٌ: وَاللهِ لَئِنْ مَنَعْتَنِي أَنْ أَطُوفَ بِالْبَيْتِ لأَقْطَعَنَّ مَتْجَرَكَ بِالشَّامِ.

قالَ: فَجَعَلَ أُمَيَّةُ يَقُولُ لِسَعْدٍ: لاَ تَرْفَعْ صَوْتَكَ، وَجَعَلَ يُمْسِكُهُ، فَغَضِبَ سَعْدٌ فَقَالَ: دَعْنَا عَنْكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ مُحَمَّداً (ﷺ) يَزْعَمُ أَنَّهُ قاتِلُكَ، قالَ: إِيَّايَ؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: وَاللهِ ما يَكْذِبُ مُحَمَّدٌ إِذَا حَدَّثَ. فَرَجَعَ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: أَمَا تَعْلَمِينَ ما قالَ لِي أَخِي الْيَثْرِبِيُّ؟ قالَتْ: وَمَا قالَ؟ قالَ: زَعَمَ أَنَّهُ سَمِعَ مُحَمَّداً يَزْعُمُ أَنَّهُ قاتِلِي، قالَتْ: فَوَاللهِ ما يَكْذِبُ مُحَمَّدٌ. قَالَ: فَلَمَّا خَرَجُوا إِلَى بَدْرٍ، وَجاءَ الصَّرِيخُ، قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ: أَمَا ذَكَرْتَ ما قَالَ لَكَ أَخُوكَ الْيَثْرِبِيُّ؟ قَالَ: فَأَرَادَ أَنْ لاَ يَخْرُجَ، فَقَالَ لَهُ أَبُو جَهْلٍ: إِنَّكَ مِنْ أَشْرَافِ الْوَادِي فَسِرْ يَوْماً أَوْ يَوْمَيْنِ، فَسَارَ مَعَهُمْ، فَقَتَلَهُ اللهُ. [خ٣٦٣٢].

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: سەعدێ كوڕێ مەعازی دەركەفت بچیتە عومرەیێ، ب مێڤانی چۆ دەڤ ئومەیە كوڕێ خەلەفێ كوڕێ ئەبی سەفوانی، و ئومەیە ئەگەر چۆبا شامێ و د مەدینەیێرا بۆریبا دچۆ دەڤ سەعدی، ئینا ئومەیە گۆتە سەعدی: خۆ بگرە هەتا دبیتە نیڤا رۆژێ و خەلك بێ ئاگەهـ دبیت، دەركەڤە تەوافێ بكە، و د دەمەكیدا سەعد یێ تەوافێ دكەت، ئەبو جەهلی دیت، ئینا گۆت: ئەڤە كییە تەوافێ ل دۆر كەعبەیێ دكەت؟ ئینا سەعدی گۆت: ئەز سەعدم، ئینا ئەبو جەهلی گۆت: تو پشتراست و ئێمن تەوافێ دكەی، و هەوە موحەممەد و هەڤالێت وی یێت حەواندین؟ گۆت: بەلێ، هەردو ب هەڤرك چۆن، ئینا ئومەیە گۆتە سەعدی، دەنگێ خۆ ل سەر بابێ حەكەمی بلند نەكە، ب راستی ئەو سەردارێ خەلكێ مەكەهێیە. پاشی سەعدی گۆت: ئەز**

ب خودێ كەمە ئەگەر رێكا تەوافا ل دۆر كەعبەیێ ل من بگری، ئەز دێ رێكا بازرگانییا تە ل شامێ گرم.

گۆت: ئومەیە دەستهافێتێ دگۆتە سەعدی: دەنگێ خۆ بلند نەكە و دەستهافێتێ ئەو دگرت، ئینا سەعد تۆرە بوو و گۆت: بەرەڤانییا خۆ بۆ ئەبو جەهلی بهێلە[1]، ب راستی من گوه ل موحەممەدی بوو (ﷺ) دگۆت: ئەو دێ تە كوژیت، ئینا گۆت: من؟ گۆت: بەلێ، گۆت: ب خودێ موحەممەد درەوا ناكەت ئەگەر ئاخفت، ئینا زڤری ل دەڤ ژنا خۆ و گۆت: ئەرێ تە زانییە كا برایێ من یێ یەسربی[2] چ گۆت؟ وێ گۆت: و چ گۆت؟ گۆت: من گوه ل موحەممەدی بوو دگۆت: ئەو دێ من كوژیت، ئینا وێ گۆت: ئەز ب خودێ كەمە موحەممەد درەوا ناكەت، گۆت: ڤێجا دەمێ بۆ بەدرێ دەركەفتین و گازیكەر ب هەوارێ هاتی، ژنا وی گۆتە وی، ما بیرا تە ناهێتە وێ یا برایێ تە یێ یەسربی گۆتییە تە؟ گۆت: ڤیا نەدەركەڤیت، ئینا ئەبو جەهلی گۆتێ: تو ژ مەزنێت مەكەهێیی رۆژەكێ یان دو رۆژان هەرە و ئەو د گەل وان چۆ و خودێ ئەو كوشت.

## ٤. باب: حنين الجذع

## بابەتێ: نالێنا ڤورمی.

٣٧٨٧ - (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَتْ لِرَسُولِ اللهِ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللهِ! أَلاَ أَجْعَلُ لَكَ شَيْئاً تَقْعُدُ عَلَيْهِ، فَإِنَّ لِي غُلاَماً نَجَّاراً. قَالَ: (**إِنْ شِئْتِ**). قَالَ: فَعَمِلَتْ لَهُ الْمِنْبَرَ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ الجُمُعَةِ، قَعَدَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى الْمِنْبَرِ الَّذِي صُنِعَ، فَصَاحَتِ النَّخْلَةُ الَّتِي كَانَ يَخْطُبُ عِنْدَهَا، حَتَّى كَادَتْ أَنْ تَنْشَقَّ، فَنَزَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى أَخَذَهَا فَضَمَّهَا إِلَيْهِ، فَجَعَلَتْ تَئِنُّ أَنِينَ الصَّبِيِّ الَّذِي يُسَكَّتُ، حَتَّى اسْتَقَرَّتْ، قَالَ: (**بَكَتْ عَلَى مَا كَانَتْ تَسْمَعُ مِنَ الذِّكْرِ**). [خ٢٠٩٥ (٤٤٩)].

ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ژ نەكێ ژ ئەنساران گۆتە پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ ئەز بۆ تە تشتەكی دورست نەكەم تو ل سەر روینییە خوارێ ب راستی من خز مەتكارەكێ دارتراش یێ هەی، گۆت: (ئەگەر تە بڤێت) گۆت: ئینا مینبەر بۆ چێ كر، ڤێجا دەمێ بوو یە رۆژا خوتبە،

(١) ئاخفتن ئاراستە كرییە بۆ ئومەیێ كورێ خەلەفی.

(٢) ئانكو: خەلكێ مەدینەیێ.

پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر مینبەرێ روینشتە خوار، ئینا ئەو دارقەسپا خۆ دبە ل دەڤ دخواند كرە ڤێژی هەتا نێزیك بووی كەر ببیت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هاتە خوار هەتا گرتی و كێشایە بەر خۆڤە، دەست پێ كر نالی نالێنا بچویكان یێت دهێنە هایشكرن هەتا بێ دەنگ بووی، گۆت: (كرە گری ژبەر زكرێ گوهـ لێ دبوو).

٥. باب: انشقاق القمر

**بابەتێ: كەربوونا هەیڤێ.**

٣٧٨٨ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً، فَأَرَاهُمُ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ. [خ٣٦٣٧/ م٢٨٠٢].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: خەلكێ مەكەهێ داخواز ژ پێغەمبەرێ خودێ كر (ﷺ) ئەو نیشانەكێ ل سەر راستیا خۆ نیشا وان بدەت، ئینا كەربوونا هەیڤێ نیشا وان دا.**

٣٧٨٩ - (م) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِلْقَتَيْنِ، فَسَتَرَ الْجَبَلُ فِلْقَةً، وَكَانَتْ فِلْقَةٌ فَوْقَ الْجَبَلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (اللَّهُمَّ! اشْهَدْ). [م٢٨٠١].

وفي رواية: فقال: (اشْهَدُوا، اشْهَدُوا).

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: هەیڤ ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) بوو دو كەر، چیایی كەرەك ڤەشارت (كەفتە پشت چیای) و كەرەك هنداڤی چیای بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی خودا شاهد بە).**

**و د ڤەگێرەكێدا: ئینا گۆت: (بەرێ خۆ بدەنێ بەرێ خۆ بدەنێ).**

٦. باب: مرتد لفظته الأرض

**بابەتێ: خرپایەك عەرد وی دهاڤێژیت.**

٣٧٩٠ - (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَجُلٌ نَصْرَانِيًّا فَأَسْلَمَ، وَقَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ، فَكَانَ يَكْتُبُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَعَادَ نَصْرَانِيًّا، فَكَانَ يَقُولُ: ما يَدْرِي مُحَمَّدٌ إلا ما كَتَبْتُ لَهُ، فَأَمَاتَهُ اللهُ فَدَفَنُوهُ، فَأَصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَقَالُوا: هَذَا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ، نَبَشُوا عَنْ صَاحِبِنَا فَأَلْقَوْهُ، فَحَفَرُوا لَهُ فَأَعْمَقُوا، فَأَصْبَحَ وَقَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَقَالُوا: هَذَا فِعْلُ مُحَمَّدٍ وَأَصْحَابِهِ، نَبَشُوا

عَنْ صَاحِبِنَا لَمَّا هَرَبَ مِنْهُمْ فَأَلْقَوْهُ، فَحَفَرُوا لَهُ وَأَعْمَقُوا لَهُ فِي الأَرْضِ ما اسْتَطَاعُوا، فَأَصْبَحَ قَدْ لَفَظَتْهُ الأَرْضُ، فَعَلِمُوا: أَنَّهُ لَيْسَ مِنَ النَّاسِ، فَأَلْقَوْهُ. [خ٣٦١٧/ م٢٧٨١].

**ژ ئەنە سی (رضي الله عنه) گۆت: زەلا مەكێ فە لە مو سلمان ب بوو و سۆرەتا بە قەرە و ئالیعیمران خواندبوون، و وی بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دنڤیسی، ز ڤری بوو ڤە فە لە، فێجا دگۆت: موحەممەد چو نوزانیت ئەو نەبیت یا من بۆ نڤیسی، ئینا خودێ ئەو مراند و وان ڤەشارت، سپێدە بوو و عەردی ئەو هاڤێتبوو دەرڤە، گۆتن: ئە ڤە كارێ موحەممەد و هەڤالێت وییە دەمێ ژ وان رەڤی گۆڕێ هەڤالێ مە یێ كۆلای و هاڤێتی، ئینا گۆڕەكێ دی كۆلا و كویر كۆلا، سپێدە بوو و عەردی ئەو هاڤێتبوو دەر ڤە، گۆتن: ئە ڤە كارێ موحەممەد و هەڤالێت وییە دەمێ ژ وان رەڤی گۆڕێ هەڤالێ مە یێ كۆلای و هاڤێتی، ئینا گۆڕەكێ دی كۆلا و هندی شیاین كویر كر، سپێدە بوو و عەردی ئەو هاڤێتبوو دەرڤە، ئینا زانین: ئەڤ چەندە نە ژ خەلكییە، ئینا هاڤێتن.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

## الفصل الأول: فضل الصحابة وفضل قرنهم

### پشكا ئێكێ: باشییا سەحابەییان و باشییا چەرخێ وان.

٣٧٩١ - (ق) عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ**). قَالَ عِمْرَانُ: لاَ أَدْرِي، أَذَكَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) بَعْدَ قَرْنِهِ قَرْنَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنَّ بَعْدَكُمْ قَوْماً يَخُونُونَ وَلاَ يُؤْتَمَنُونَ، وَيَشْهَدُونَ وَلاَ يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلاَ يَفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ**). [خ٢٦٥١/ م٢٥٣٥].

ژ عیمرانێ كورێ (حصین)ی، (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(چێترینێ هەوە (چێترینێ مرۆڤان) خەلكێ سەردەمێ منن[1] پاشی یێت دویڤ وانرا پاشی یێت دویڤ وانرا)**، عیمرانی گۆت: من نەزانی كا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دو جاران گۆت یان سێ جاران، **(پاشی پشتی وان هندەك دێ ئێن، خیانەتێ دكەن و باوەری پێ ناهێتە ئینان، و ژ نك خۆ شادەییێ ددەن و شادەییدان ژ وان نائێت خواستن، و نەزرا دكەن و نادەن، و حەژ خوارن و ڤەخوارنێ دكەن یا ڤەلەوییێ پێ چێ دبیت)**.

٣٧٩٢ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**يَأْتِي زَمَانٌ يَغْزُو فِئَامٌ مِنَ النَّاسِ، فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ النَّبِيَّ (ﷺ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ عَلَيْهِ، ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ، فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ، ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ، فَيُقَالُ: فِيكُمْ مَنْ صَحِبَ صَاحِبَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) ؟ فَيُقَالُ: نَعَمْ، فَيُفْتَحُ**).[خ٢٨٩٧/ م٢٥٣٢].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(دەمەك دێ هێت كۆمەكا خەلكی دێ خەزایێ كەن دێ هێتە گۆتن: ئەرێ د ناڤ هەوەدا هەنە هەڤالینییا پێغەمبەری (ﷺ) كربیت؟ دێ هێتە گۆتن: بەلێ، ژ بەر وان خودێ دێ بۆ وان ڤەكەت، پاشی دێ دەمەك هێت، دێ هێتە گۆتن: ئەرێ د ناڤ هەوەدا هەنە هەڤالینییا هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) كربیت؟ دێ هێتە گۆتن: بەلێ، ژ بەر وان خودێ دێ بۆ وان ڤەكەت،**

---

(١) ئانكو: هاریكار ـ ئەنسار خەلكێ مەدینەیێ ـ و مشەختن ئەوێت باوەری ئینایین و خۆ و مالێ خۆ قوربانی دینێ خۆ كرین.

**پاشی دێ دەمەك هێت، دێ هێتە گۆتن: ئەرێ د ناڤ هەوەدا هەنە هەڤالینییا هەڤالێ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) كربیت؟ دێ هێتە گۆتن: بەلێ، ژ بەر وان خودێ دێ بۆ وان ڤەكەت).**

٣٧٩٣ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً، ما بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلاَ نَصِيفَهُ)**.[خ٣٦٧٣/ م٢٥٤١].

ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(خە بەرا نەبێژنە هەڤالێت من، ئەگەر ئێك ژ هەوە هندی چیایێ ئو حودێ زێری بكەتە خێر ئەو خێر ناگەهیتە مستەكا ئێك ژ وان یان نیڤا وێ).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

## الفصل الثاني: فضل الأنصار

## پشكا دووێ: باشيیا ئەنساران.

### ١. باب: حب الأنصار ومكانتهم

### بابەتێ: حەژێكرنا ئەنساران و بهایێ وان.

٣٧٩٤ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، أَوْ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (الأَنْصَارُ لاَ يُحِبُّهُمْ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يُبْغِضُهُمْ إِلاَّ مُنَافِقٌ، فَمَنْ أَحَبَّهُمْ أَحَبَّهُ اللهُ، وَمَنْ أَبْغَضَهُمْ أَبْغَضَهُ اللهُ).[خ٣٧٨٣/ م٧٥].

**ژ بەرائێ كورێ عازبى (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرى (ﷺ) بوو يان گۆت: پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (ئەنساران كەس حەژ وان ناكەت موسلمان و باوەريدار نەبيت، و نەڤيانێ ژ وان راناكەت دوروويەك نەبيت، يێ حەژ وان بكەت خودێ حەژ وى دكەت، و يێ ئەو نەڤێن خودێ ئەو نەڤێت).**

٣٧٩٥ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (آيَةُ الإِيمَانِ حُبُّ الأَنْصَارِ، وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الأَنْصَارِ). [خ١٧/ م٧٤].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكى (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەرى (ﷺ) گۆت: (نیشانا باوەرییێ حەژێكرنا ئەنسارانە، و نیشانا دوروویاتییێ نەڤیانا ئەنسارانە).**

٣٧٩٦ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (لَوْلاَ الْهِجْرَةُ لَكُنْتُ امْرَأً مِنَ الأَنْصَارِ، وَلَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِياً وَسَلَكَتِ الأَنْصَارُ وَادِياً، أَوْ شِعْباً، لَسَلَكْتُ وَادِيَ الأَنْصَارِ، أَوْ شِعْبَ الأَنْصَارِ). [خ٧٢٤٤ (٣٧٧٩)].

**ژ ئەبى هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەگەر مشەختییاتی نەبایە دا ئەز زەلامەك ژ ئەنساران بم، و ئەگەر خەلك نهالەكێ بگرن و ئەنسار نهالەكێ بگرن یان گەلییەكی ئەز دێ نهالا ئەنساران یان گەلییێ وان گرم).**

۲. باب: الوصية بالأنصار خيراً

**بابەتێ: وەسیەتكرنا خێرێ ب ئەنساران.**

۳۷۹۷ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قالَ: (**الأَنْصَارُ كَرِشِي وَعَيْبَتِي ، وَالنَّاسُ سَيَكْثُرُونَ، وَيَقِلُّونَ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ، وَتَجَاوَزُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ**).[خ۳۸۰۱ (۳۷۹۹)/ م۲۵۱۰].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەو سار ج ھات و تایبەتێت منن، و خەلك ژ خەلك دێ زێدە بن و ئەو دێ كێم بن، فێجا ژ باشێ وان وەرگرن و ل خرابێ وان ببۆرن).**

۳. باب: فضل دور الأنصار

**بابەتێ: باشییا مالێت ئەنساران.**

۳۷۹۸ - (ق) عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**إِنَّ خَيْرَ دُورِ الأَنْصَارِ دَارُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ عَبْدِ الأَشْهَلِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي الحَارِثِ، ثُمَّ بَنِي سَاعِدَةَ، وَفِي كُلِّ دُورِ الأَنْصَارِ خَيْرٌ**). فَلَحِقْنَا سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أَلَمْ تَرَ أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (ﷺ) خَيَّرَ الأَنْصَارَ، فَجَعَلَنَا أَخِيراً؟ فَأَدْرَكَ سَعْدٌ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، خُيِّرَ دُورُ الأَنْصَارِ فَجُعِلْنَا آخِراً، فَقَالَ: (**أَوَلَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الخِيَارِ**).　　[خ۳۷۹۱ (۱٤۸۱)/ م: الفضائل ۱۳۹۲ (۱۱)].

ژ ئەبی حومەیدێ ساعدی (رضي الله عنه) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ب راستی باشترین مالێت ئەنساران مالا بەنی نەجارە، پاشی مالا عەبد ئەشهەلی، پاشی مالا بەنی حارسی، پاشی مالا بەنی ساعیدەیە، و د هەمی مالێت ئەنساراندا باشی هەیە).** ئینا ئەم گەهشتینە سەعدێ كورێ عوبادەیی، ئینا ئەبو ئوسەیدی گۆت: تە زانییە پێغەمبەری (ﷺ) باشێت ئەنساران دیار كرن و ئەم دانایینە دویماهییێ؟ ئینا سەعد گەهشتە پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ باشێت مالێت ئەنساران هاتنە دیاركرن و ئەم ل دویماهییێ هاتینە دانان، ئینا گۆت **(ما بەسی هەوە نینە هوین ژ باشا بن).**

## ٤. باب: حسن صحبة الأَنصار

## بابەتێ: باش هەڤالینییا ئەنساران.

٣٧٩٩ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: صَحِبْتُ جَرِيرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، فَكَانَ يَخْدُمُنِي وَهْوَ أَكْبَرُ مِنْ أَنَسٍ. قالَ جَرِيرٌ: إِنِّي رَأَيْتُ الأَنْصَارَ يَصْنَعُونَ شَيْئاً، لا أَجِدُ أَحَداً مِنْهُمْ إِلاَّ أَكْرَمْتُهُ. [خ٢٨٨٨/ م٢٥١٣].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: من هەڤالینیا جەریرێ كورێ عەبدوللایی دكر و وی خزمەتا من دكر و ئەو ژ ئەنەسی مەزنتر بوو، جەریری گۆت: من ئەنسار دیتن تشتەك دكر[1] ئەز كەسێ ژ وان نابینم ئەگەر ئەز قەدرێ وی نەگرم.**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ئانكو: من دیت كا وان چاوا خزمەتا پێغەمبەری (ﷺ) دكرن ژ بەر هندێ وێ دڤیا خزمەتا وان بكەت یێت خزمەتا پێغەمبەرێ (ﷺ) دكرن.

## الفصل الثالث: ذكر فضائل بعض المهاجرين

## پشكا سێیێ: بەحسكرنا هندەك ژ باشییێت مشەختییان.

### ١. باب: فضل أبي بكر الصديق رضي الله عنه

### بابەتێ: باشییا ئەبی بەکرێ سەدیق (رضي الله عنه).

٣٨٠٠ – (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنه قالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) وَأَنَا في الْغَارِ: لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ تَحْتَ قَدَمَيْهِ لأَبْصَرَنَا، فَقَالَ: (**ما ظَنُّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ بِاثْنَيْنِ اللهُ ثَالِثُهُمَا**). [خ٣٦٥٣/ م٢٣٨١].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) ژ ئەبی بەکری (رضي الله عنه) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ و ئەز د شکەفتێڤە بووم، ئەگەر ئێك ژ وان بەرێ خۆ بدەتە بن پێت خۆ دێ مە بینیت. گۆت: (تو چ هزر دکەی ئەی ئەبوبەکر بۆ دووا سێ یێ وان خودێ بیت).**

٣٨٠١ – (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: (**إِنَّ عَبْداً خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا ما شَاءَ، وَبَيْنَ ما عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ ما عِنْدَهُ**). فَبَكى أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا. فَعَجِبْنَا لَهُ، وَقَالَ النَّاسُ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا الشَّيْخِ، يُخْبِرُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ عَبْدٍ خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا وَبَيْنَ ما عِنْدَهُ، وَهُوَ يَقُولُ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا! فَكَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) هُوَ الْمُخَيَّرَ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ هُوَ أَعْلَمَنَا بِهِ. [خ٣٩٠٤ (٤٦٦)/ م٢٣٨٢].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر مینبەرێ روینشتە خوارێ و گۆت: (ب راستی خودێ بەندەیەکی هەلبژارتن دایێ د ناڤبەرا هندی وی خۆشی و جوانییا دنیایێ بڤێت بدەتێ و د ناڤبەرا ئەوا ل دەڤ خۆ بدەتێ، ئینا یا ل دەڤ وی هەلبژارت)، ئینا ئەبوبەکری کرە گری و گۆت: بابێت مە و دایکێت مە گۆری تە ببن، ئینا ئەم ژێ حێبەتی بووین، و خەلکی گۆت: بەرێ خۆ بدەنە ڤی پیرەمێری، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) یێ بەحسێ بەندەیەکی دکەت خودێ هەلبژارتن دایێ د ناڤبەرا خۆشی و جوانییا دنیایێ و یا ل دەڤ خۆ بدەتێ، و ئەو دبێژیت، بابێت مە و دایکێت مە گۆری تە بن، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەو بوو یێ هەلبژارتن دایێ، و ئەبوبەکر ژ مە هەمیان زاناتر بوو.**

٣٨٠٢ – (ق) عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ قالَ: أَتَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، قَالَتْ: أَرَأَيْتَ إِنْ جِئْتُ وَلَمْ أَجِدْكَ؟ كَأَنَّهَا تَقُولُ: المَوْتَ، قَالَ (ﷺ): (**إِنْ لَمْ تَجِدِينِي، فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ**). [خ٣٦٥٩/ م٢٣٨٦].

**ژ جو بەیریێ كوڕێ موتعیمی (ﷺ) گۆت: ژ نەك ها تە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و فەرمانا وێ كر ئەو بزڤریتە دەڤ وی، گۆت: بێژە من ئەگەر ئەز هاتم و من تو نەدیتی؟ هەروەكی یا دبێژیت: مرن[1]، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر تە ئەز نەدیتم ومرە دەڤ ئەبی بەكری).**

٣٨٠٣ - (ق) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلاَسِلِ، فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: (**عائِشَةُ**) ، فَقُلْتُ: مِنَ الرِّجالِ؟ فَقَالَ: (**أَبُوهَا**). قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: (**ثُمَّ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ**). فَعَدَّ رِجالاً. [خ٣٦٦٢/ م٢٣٨٤].

**ژ عەمریێ كوڕێ عا سی (ﷺ) پێغەمبەری (ﷺ) ئەو ل سەر لە شكەرێ زاتولسەلاسل هنارت، ئینا ئەز ها تمە دەڤ و من گۆتێ: كیژ كەس ل دەڤ تە خۆشڤیترە؟ گۆت: (عائیشا) ئینا من گۆت: ژ زەلامان؟ گۆت: (بابێ وێ) من گۆت: پا شی كیژك؟ گۆت: (پاشی عومەرێ كوڕێ خەتتابی) و هندە زەلام هەژمارتن.**

٣٨٠٤ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، عَاصِباً رَأْسَهُ بِخِرْقَةٍ، فَقَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (**إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ النَّاسِ أَحَدٌ أَمَنَّ عَلَيَّ فِي نَفْسِهِ وَمَالِهِ مِنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي قُحَافَةَ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً مِنَ النَّاسِ خَلِيلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، وَلَكِنْ خُلَّةُ الإِسْلاَمِ أَفْضَلُ، سُدُّوا عَنِّي كُلَّ خَوْخَةٍ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ، غَيْرَ خَوْخَةِ أَبِي بَكْرٍ**). [خ٤٦٧].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د نە ساخییا خۆدا یا تێدا مری و سەرێ خۆ ب پا تەكی گرێدا بوو، ل سەر مینبەرێ روینشت و سوپاسییا خودێ كر و پەسنا وی كر و پاشی گۆت: (ب راستی ژ خەلكێ كەسێ وەكی ئەبی بەكرێ كوڕێ قوحافەیی مەردانی د گەل من نەكرییە د خۆدا و د مالێ خۆدا، و ئەگەر من خۆشڤییەكێ خۆسەر هەلبژارتبا دا ئەبوبەكری كەمە خۆشڤییێ خۆ یێ خۆسەر[2]**

---

(١) ئانكو: پا ئەگەر ئەز هاتم و تو نەمابی و مربی بهێمە دەڤ كێ؟

(٢) دا ڤیانا خۆ هەمییێ دەمێ.

**بەلێ خۆشڤیاتییا خۆسەر یا ئیسلامێ باشترە، هەمی دەرکێت ڤێ مزگەفتێ ل من بگرن دەرکێ ئەبی بەکری نەبیت)**[1].

٣٨٠٥ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي مَرَضِهِ: (**ادْعِي لِي أَبَا بَكْرٍ وَأَخَاكِ، حَتَّى أَكْتُبَ كِتَاباً، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَمَنَّى مُتَمَنٍّ وَيَقُولَ قَائِلٌ: أَنَا أَوْلَى، وَيَأْبَى اللهُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلاَّ أَبَا بَكْرٍ**). [م٢٣٨٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د نەساخییا خۆدا گۆتە من: (بۆ من گازی ئەبو بەکری و برایێ خۆ بکە، دا ئەز نڤیسارەکێ بنڤیسم**[2]**، ب راستی ئەز دترسم هیڤیخوازەك هیڤیا بخوازیت**[3]**، یان ئاخفتنکەرەك باخڤیت بێژیت: ئەز ژ وی هەژیترم، و خودێ و باوەریداران هەر بۆ ئەبوبەکری دڤێت.**

٣٨٠٦ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِماً**) ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً**) ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِيناً**) ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ: (**فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضاً**) ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**مَا اجْتَمَعْنَ فِي امْرِئٍ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ**). [م: الزكاة ١٠٢٨ (٨٧)/ فضائل الصحابة ١٠٢٨ (١٢)].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (کی ئەڤرۆ یێ ب رۆژییە)؟ ئەبوبەکری گۆت: ئەز، گۆت: (کی ئەڤرۆ د گەل مرییەکێ چۆیە)؟ ئەبو بەکری گۆت: ئەز، گۆت: (کێ ئەڤرۆ خوارن دایە هەژارەکی)؟ ئەبوبەکری گۆت: من، گۆت: (کێ ئەڤرۆ سەرا نەساخەکی دایە)؟ ئەبو بەکری گۆت: من، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەڤە هەمی ل دەڤ هەر مرۆڤەکی کۆم ببن دێ چیتە بەحەشتێ).**

---

(١) گەلەك کەسا ژ لایێ مالا خۆڤە دەرکەکێ بچویك بۆ خۆ ڤەکربوو تێرا دهاتنە د مزگەفتێڤە، پێغەمبەری (ﷺ) فەرمان کر ئەو دەرگەهـ و دەرك هەمی بهێنە گرتن ئەو دەرگەهـ نەبیت یێ ئەبوبەکری بۆ خۆ ڤەکری تێرا دهاتە د مزگەفتێڤە.

(٢) ئانکو: جهگری بدانم.

(٣) ئانکو: دا کەس نەبێژیت ئەز ژ ئەبوبەکری هەژیترم یان ب دویف خۆزییان بکەڤیت و بێژیت: خۆزی ئەز بام.

## ٢. باب: فضل أبي بكر وعمر وعثمان (رضي الله عنهم).

## بابەتێ: باشییا ئەبی بەكری و عومەری و عوسمانی (خودێ ژ وان رازی بیت).

٣٨٠٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، رَأَيْتُنِي عَلَى قَلِيبٍ عَلَيْهَا دَلْوٌ، فَنَزَعْتُ مِنْهَا ما شَاءَ اللهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ، فَنَزَعَ بِهَا ذَنُوباً أَوْ ذَنُوبَيْنِ، وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ، وَاللهُ يَغْفِرُ لَهُ ضَعْفَهُ. ثُمَّ اسْتَحَالَتْ غَرْباً، فَأَخَذَهَا ابْنُ الخَطَّابِ، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيّاً مِنَ النَّاسِ يَنْزِعُ نَزْعَ عُمَرَ، حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ).** [خ٣٦٦٤/ م٢٣٩٢]

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: من گوه ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) د گۆت: (د دەمەكیدا ئەز یێ نفستی بووم، من خۆ ل سەر بیرەكێ دیت دۆلكەك ل سەر بوو، هندی خودێ ڤیای من ژێ كێشا، پاشی كورێ ئەبی ڤوحافەیی هەلگرت دۆلكەك یان دو دۆلك ژێ كێشان و د كێشانا ویدا لاوازی هەبوو و خودێ ل لاوازییا وی ببۆریت، پاشی بوو دۆلكەكێ مەزن و كورێ خەتتابی هەلگرت، من چو سەردار ژ خەلكێ نەدیتینە وەكی كێشانا عومەری بكێشن، هەتا خەلكی حێشترێت خۆ ئاڤدابن و زڤراندینە مەخلێت وان).**

٣٨٠٨ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ: أَنَّهُ تَوَضَّأَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ خَرَجَ، فَقُلْتُ: لأَلْزَمَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)، ولأَكُونَنَّ مَعَهُ يَوْمِي هَذَا، قَالَ: فَجَاءَ المسْجِدَ، فَسَأَلَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالُوا: خَرَجَ وَوَجَّه هَاهُنَا، فَخَرَجْتُ عَلَى إِثْرِهِ، أَسْأَلُ عَنْهُ، حَتَّى دَخَلَ بِئْرَ أَرِيسٍ، فَجَلَسْتُ عِنْدَ البَابِ. وَبَابُهَا مِنْ جَرِيدٍ. حَتَّى قَضى رَسُولُ اللهِ (ﷺ) حَاجَتَهُ فَتَوَضَّأَ، فَقُمْتُ إِلَيْهِ، فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ عَلَى بِئْرِ أَرِيسٍ وَتَوَسَّطَ قُفَّهَا، وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلاَّهُمَا فِي الْبِئْرِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ فَجَلَسْتُ عِنْدَ البَابِ، فَقُلْتُ: لأَكُونَنَّ بَوَّابَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) الْيَوْمَ.

فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ فَدَفَعَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: **(ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ)**. فَأَقْبَلْتُ حَتَّى قُلْتُ لأَبِي بَكْرٍ: ادْخُلْ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) يُبَشِّرُكَ بِالجَنَّةِ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَجَلَسَ عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَعَهُ فِي الْقُفِّ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ كما صَنَعَ النَّبِيُّ (ﷺ)، وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ.

ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، وَقَدْ تَرَكْتُ أَخِي يَتَوَضَّأُ وَيَلْحَقُنِي، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللهُ بِفُلاَنٍ خَيْراً. يُرِيدُ أَخَاهُ. يَأْتِ بِهِ، فَإِذَا إِنْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، ثُمَّ جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: **(ائْذَنْ لَهُ**

**وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ).** فَجِئْتُ فَقُلْتُ: ادْخُلْ، وَبَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالجَنَّةِ، فَدَخَلَ فَجَلَسَ مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي الْقُفِّ عَنْ يَسَارِهِ، وَدَلَّى رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ.

ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللهُ بِفُلاَنٍ خَيْراً يَأْتِ بِهِ، فَجَاءَ إِنْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَقُلْتُ عَلَى رِسْلِكَ، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: **(ائْذَنْ لَهُ وَبَشِّرْهُ بِالجَنَّةِ، عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ).** فَجِئْتُهُ، فَقُلْتُ لَهُ: ادْخُلْ، وَبَشَّرَكَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالجَنَّةِ، عَلَى بَلْوَى تُصِيبُكَ، فَدَخَلَ فَوَجَدَ الْقُفَّ قَدْ مُلِئَ، فَجَلَسَ وُجَاهَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ.

قَالَ سَعِيدُ بْنُ المسَيَّبِ: فَأَوَّلْتُهَا قُبُورَهُمْ. [خ٣٦٧٤/ م٢٤٠٣].

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه)، وی دەستنڤێژا خۆ ل مال شویشت، پاشی دەرکەفت و گۆت: ئەز دێ د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بم و ڤێ رۆژا خۆ هەمییێ دێ ل دەڤ وی بم، هاتە مزگەفتێ پرسیارا پێغەمبەرێ خودێ کر (ﷺ) گۆتن: هۆسا یێ چۆی، گۆت: ئەز د دویڤ ویرا چۆم و من پرسیارا وی دکر، هەتا چۆیە سەر بیرا ئەریس، ئەز روینشتمە دەڤ دەرگەهی، هەتا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەستنڤێژا خۆ خۆش کری، و دەستنڤێژا خۆ شویشتی، ئەز رابووم چۆمە دەڤ، ئەو روینشتە سەر نیڤەکا دۆشکێ دۆرماندۆری بیرێ، و لنگێت خۆ رویس کرن و د بیرێدا بەردان، من سلاڤ کرێ پاشی ئەز چۆم. ئەز ل دەڤ دەرگەهی روینشتم، من گۆت: ئەڤرۆ ئەز دێ بمە دەرگەهڤانێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ).**

**ئینا ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هات دەرگەهـ پالدا، من گۆت: کییە؟ گۆت: ئەبوبەکرە، من گۆت: هێدیبە، پاشی ئەز چۆم من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە ئەبوبەکرە دەستویرییێ دخوازیت، ئینا گۆت: (دەستوریيا وی بدە، و مزگینییێ ب بەحەشتێ بدەیێ). ئەز هاتم حەتا من گۆتە ئەبوبەکری: ب ژۆرکەڤە، پێغەمبەرێ خودێ مزگینییێ ب بەحەشتێ ددەتە تە، ئەبوبەکر ب ژۆر کەفت، هەتا رەخێ راستێ یێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر لێڤا بیرێ روینشتیە خوارێ و پێت خۆ د بیرێدا بەردانە خوارێ هەروەکی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) کری و لنگێت خۆ رویس کرن.**

**پا شی ئەز ز ڤریم و روینشتم، و من برا یێ خۆ هێلا بوو دە ستنڤێژا خۆ ب شۆت و بگەهیتە من، من گۆت: هەکە خودێ خێر بۆ ڤیابیت ـ مەخسەدا وی برایێ وییە ـ دێ ڤێ**

گاڤێ ئینیت. من هند دیت مرۆڤەك یێ دەرگەهی دلڤلڤینیت، من گۆت: ئەڤە كییە؟ گۆت: عومەرێ كورێ خەتتابییە، من گۆت: هێدیبە، پاشی ئەز چۆم من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە عومەرە دەستویرییێ دخوازیت، ئینا گۆت: **(دەستوریيا وی بدە، و مزگینییێ ب بەحەشتێ بدەیێ)**. ئەز هاتم حەتا من گۆتە عومەری: ب ژۆركەڤە، و پێغەمبەرێ خودێ مزگینییێ ب بەحەشتێ ددەتە تە، عومەر ب ژۆر كەفت، هەتا رەخێ چەپێ یێ پێغەمبەرێ خودێ ل سەر لێڤا بیرێ روینشتییە خوارێ و پێت خۆ د بیرێدا بەردانە خوارێ.

پاشی ئەز زڤریم و روینشتم، و من برایێ خۆ هێلابوو دەستنڤێژا خۆ بشۆت و بگەهیتە من، من گۆت: هەكە خودێ خێر بۆ ڤیابیت ـ مەخسەدا وی برایێ وییە ـ دێ ڤێ گاڤێ ئینیت. مرۆڤەك هات دەرگەه لڤلڤاند، من گۆت: ئەڤە كییە؟ گۆت: عوسمانێ كورێ عەڤانییە، من گۆت: هێدیبە، پاشی ئەز چۆمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) من گۆتێ، ئینا گۆت: **(دەستویریيا وی بدە، و مزگینییێ ب بەحەشتێ بدەیێ د گەل بەلایەكێ دێ ب سەری هێت)**. ئەز هاتم من گۆتێ: ب ژۆركەڤە، و پێغەمبەرێ خودێ مزگینییێ ب بەحەشتێ ددەتە تە د گەل بەلایەكێ دێ ب سەرێ تە هێت، ب ژۆر كەفت، دیت دۆشكێ دۆرماندۆر بیرێ یێ قەپات بووی ئینا بەرامبەری وان روینشتە خوارێ.

سەعیدێ كورێ موسەییەبی گۆت: من ب گۆڕێت وان راڤە كر[1].

٣٨٠٩ – (خ) عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رضي الله عنه قالَ: صَعِدَ النَّبِيُّ (ﷺ) أُحُداً، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ، فَرَجَفَ بِهِمْ، فَضَرَبَهُ بِرِجْلِهِ وقالَ: **(اثْبُتْ أُحُدُ، فَمَا عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ شَهِيدَانِ)**. [خ٣٦٨٦ (٣٦٧٥)].

ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب سەر ئوحودێ كەفت، و ئەبوبەكر و عومەر و عوسمان د گەل بوون، ئینا د بن وانڤە هەژیا، ئینا پێ خۆ دانایێ و گۆت: **(ئەی ئوحود راوەستە، كەس ل سەر تە نینە پێغەمبەرەك یان راستگۆیەك یان دو شەهید نەبن)**.

---

(١) نانكو: گۆڕێت وان پێت بەرامبەری ئێك و جهێ هەمیان ل ئێك جه نەكر.

٣٨١٠ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كُنَّا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) لاَ نَعْدِلُ بِأَبِي بَكْرٍ أَحَداً، ثُمَّ عُمَرَ، ثمَّ عُثْمَانَ، ثُمَّ نَتْرُكُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ) لاَ نُفَاضِلُ بَيْنَهُمْ.[خ٣٦٩٧ (٣٦٥٥)].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) مە كەس نەدئینا رێزا ئەبی بەكری پاشی عومەری و پاشی عوسمانی و پاشی مە هەڤالێت دی یێت پێغەمبەری (ﷺ) دهێلان و مە ب سەر ئێكدو نەدئێخستن.**

**٣. باب: فضائل عمر بن الخطاب رضي الله عنه**

**بابەتێ: باشییێت عومەرێ كورێ خەتتابی (رضي الله عنه).**

٣٨١١ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا دُونَ ذَلِكَ، وَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ**). قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**الدِّينَ**). [خ٢٣/ م٢٣٩٠].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (د دەمەكیدا ئەز یێ نڤستی بووم، من خەلك دیت نیشا من دهاتنە دان، و ڤەمیس ل بەر وان بوون، هندەك ژ وان دگەهشتنە سینگێ وان، و هندەكان ژ هندێ كێمتر بوون، و عومەرێ كورێ خەتتابی نیشا من هاتە دان و ڤەمیسەك ل بەر بوو دخڕاند) گۆتنێ: تە ب چ ئەو راڤە كر ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (ب دینی).**

٣٨١٢ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ، فَشَرِبْتُ حَتَّى إِنِّي لأَرَى الرِّيَّ يَخْرُجُ فِي أَظْفَارِي، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ**). قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: (**الْعِلْمَ**). [خ٨٢/ م٢٣٩١]

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو گۆت: (د دەمەكیدا ئەز یێ نڤستی بووم، پەرداغەكێ شیری بۆ من هاتە ئینان، من ڤەخوار هەتا من نیشانا تێر بوونێ ژ شیری دیتی ل بن نینۆكێت من دەرد كەڤیت، پاشی من بەرمایكێ خۆ دا عومەرێ كورێ خەتتابی)، گۆتن: تە ب چ راڤە كر ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ گۆت: (ب زانینێ).**

٣٨١٣ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: وُضِعَ عُمَرُ عَلَى سَرِيرِهِ، فَتَكَنَّفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُصَلُّونَ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وَأَنَا فِيهِمْ، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلاَّ رَجُلٌ آخِذٌ مَنْكِبِي، فَإِذَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ وَقَالَ: ما خَلَّفْتَ أَحَداً أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللهَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ مِنْكَ. وَايْمُ اللهِ إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ أَنْ يَجْعَلَكَ اللهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ، وَحَسِبْتُ: أَنِّي كُنْتُ كَثِيراً أَسْمَعُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: **(ذَهَبْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَدَخَلْتُ أَنَا وأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَخَرَجْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ)**. [خ٣٦٨٥ (٣٦٧٧)/ م٢٣٨٩].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەر هاتە دانان ل سەر تەختێ وی، ڤێجا خەلك ل دۆرما ندۆر كۆم بوون، دوعا دكرن و دا خوازا دلۆڤانییێ بۆ دكرن بەری بهێتە راكرن و ڤەشارتن، و ئەز ل ناڤ وان بووم، و چو ئەز نەترساندم ئەو نەبیت من هند دیت زەلامەكی ملێ من یێ گرتی، من بەرێ خۆ دایێ عەلییێ كورێ ئەبی تالبییە، داخوازا دلۆڤانییێ بۆ عومەری كر و گۆت: تە كەسەك ل پاش خۆ نەهێلایە من پێ خۆش بیت و حەز بكەم ب وەكی كارێ وی ئەز بگەهمە خودێ ژ بلی خۆ، و ئەز سویند دخۆم ب خودێ ئەز هزر دكەم خودێ تە بگەهینیتە هەردو هەڤالێت تە، و ئەز وەسا دزانم: من گەلەك جاران گوه ل پێغەمبەری (ﷺ) دبوو دگۆت: (ئەز و ئەبوبەكر و عومەر چۆین، ئەز و ئەبوبەكر و عومەر ب ژۆر كەفتین، ئەز و ئەبوبەكر و عومەر دەركەفتین).**

٣٨١٤ - (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَعِنْدَهُ نِسَاءٌ مِنْ قُرَيْشٍ يُكَلِّمْنَهُ وَيَسْتَكْثِرْنَهُ، عالِيَةً أَصْوَاتُهُنَّ، فَلَمَّا اسْتَأْذَنَ عُمَرُ قُمْنَ يَبْتَدِرْنَ الْحِجَابَ، فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) ورَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَضْحَكُ، فَقَالَ عُمَرُ: أَضْحَكَ اللهُ سِنَّكَ يَا رَسُولَ اللهِ! قالَ: **(عَجِبْتُ مِنْ هؤُلاءِ اللاَّتِي كُنَّ عِنْدِي، فَلَمَّا سَمِعْنَ صَوْتَكَ ابْتَدَرْنَ الْحِجَابَ)**. قالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللهِ كُنْتَ أَحَقَّ أَن يَهَبْنَ، ثُمَّ قالَ: أَيْ عَدُوَّاتِ أَنْفُسِهِنَّ، أَتَهَبْنَنِي وَلاَ تَهَبْنَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ)؟ قُلْنَ: نَعَم، أَنْتَ أَفَظُّ وَأَغْلَظُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). قالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، ما لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ قَطُّ سَالِكاً فَجّاً؛ إِلاَّ سَلَكَ فَجّاً غَيْرَ فَجِّكَ)**. [خ٣٢٩٤/ م٢٣٩٦].

**ژ سەعدێ كورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه) گۆت: عومەرێ كورێ خەتتابی دەستویری خواست بچیتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و هندەك ژنێت قورەیشییان ل دەڤ بوون، د گەل د ئاخفتن و دا خوازا زێدەتر ژ وی دكرن، و دەنگێت وان یێت بلند بوون، ڤێجا دەمێ عومەری دەستویری خواستی دەستهاڤێتنە سەروبەرێ خۆ دورست كرن، ئینا پێغەمبەرێ**

خودێ دەستویری دا یێ، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دكەتە كەنی، ئینا عومەری گۆت: خودێ دلێ تە بەردەوام خۆش كەت ئەی پێغەمبەرێ خودێ! گۆت: **(ئەز حێبەتی بووم ژ ڤان ژنان ئەڤێت ل دەڤ من دەمێ گوه ل دەنگێ تە بووین دەستهاڤێتنە جلكێت خۆ سەروبەر كرن)**، عومەری گۆت: یا تو ئەی پێغەمبەرێ خودێ هێژاتری ترس بۆ تە هەبیت، پاشی گۆت: ئەی دژمنێت خۆ ب خۆ هوین ژ من دترسن و ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ناترسن؟ گۆتن بەلێ، تو هشكتر و رەقتری ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ)، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: **(ئەز ب وی كەمە یێ جانێ من د دەستێ ویدا تو د بنیرا چو رێكان ناگری ئەگەر شیتان رێكەكا دی نە رێكا تە نەگریت)**.

٣٨١٥ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): قَالَ: **(إِنَّهُ قَدْ كَانَ فِيمَا مَضى قَبْلَكُمْ مِنَ الأُمَمِ مُحَدَّثُونَ، وَإِنَّهُ إِنْ كَانَ فِي أُمَّتِي هذِهِ مِنْهُمْ فَإِنَّهُ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ)**.[خ٣٤٦٩].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی د ملەتێت بەری هەوەدا خودان ئیلهام هەبوون، هەكە ژ ئوممەتا من ئێك هەبیت ئەو عومەرە)[1].**

**٤. باب: فضائل عثمان بن عفان رضي الله عنه**

## بابەتێ: باشییێت عوسمانێ كورێ عەففانی (رضي الله عنه).

٣٨١٦ - (خ) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ وَحَجَّ الْبَيْتَ، فَرَأَى قَوْماً جُلُوساً، فَقَالَ: مَنْ هؤُلاَءِ الْقَوْمُ؟ فَقَالُوا: هؤُلاَءِ قُرَيْشٌ، قَالَ: فَمَنِ الشَّيْخُ فِيهِمْ؟ قَالُوا: عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، قالَ: يَا ابْنَ عُمَرَ، إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ شَيْءٍ فَحَدِّثْنِي: هَلْ تَعْلَمُ أَنَّ عُثْمَانَ فَرَّ يَوْمَ أُحُدٍ؟ قالَ: نَعَمْ. فَقَالَ: تَعْلَمُ أَنَّهُ تَغَيَّبَ عَنْ بَدْرٍ وَلَمْ يَشْهَدْ؟ قالَ: نَعَمْ. قالَ: تَعْلَمُ أَنَّهُ تَغَيَّبَ عَنْ بَيْعَةِ الرُّضْوَانِ فَلَمْ يَشْهَدْها؟ قالَ: نَعَمْ. قالَ: اللهُ أَكْبَرُ.

قالَ ابْنُ عُمَرَ: تَعَالَ أُبَيِّنْ لَكَ، أَمَّا فِرَارُهُ يَوْمَ أُحُدٍ فَأَشْهَدُ أَنَّ اللهَ عَفَا عَنْهُ وَغَفَرَ لَهُ. وَأَمَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَدْرٍ فَإِنَّهُ كانَتْ تَحْتَهُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَكَانَتْ مَرِيضَةً، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّ لَكَ أَجْرَ رَجُلٍ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً وَسَهْمَهُ)**. وأَمَّا تَغَيُّبُهُ عَنْ بَيْعَةِ الرِّضْوَانِ، فَلَوْ كانَ أَحَدٌ أَعَزَّ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ عُثْمَانَ

---

(١) ئەون یێت دلێت وان ب راستییێ بۆ شادە ددەن و هزرا ئەو دكەن راست دەردكەڤیت.

لَبَعَثَهُ مَكَانَهُ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) عُثْمَانَ، وَكَانَتْ بَيْعَةُ الرِّضْوَانِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ عُثْمَانُ إِلَى مَكَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِيَدِهِ الْيُمْنَى: (**هذِهِ يَدُ عُثْمَانَ**) ، فَضَرَبَ بِهَا عَلَى يَدِهِ، فَقَالَ: (**هذِهِ لِعُثْمَانَ**)، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: اذْهَبْ بِهَا الآنَ مَعَكَ. [خ٣٦٩٨ (٣١٣٠)].

**ژ عو سمانێ کورێ عە بدوللایێ کورێ وە هەبی (رضي الله عنه) گۆت: زەلا مەك ژ خەلکێ مسرێ هات و تەواف ل دۆر کەعبێ کر، هندە کەسێت روینشتی دیتن، ئینا گۆت: ئەڤە چ کەسن؟ گۆت: ئەڤە قورەیشینە، گۆت: ئەو پیرێ ژ وان کییە؟ گۆتن: عە بدوللایێ کورێ عومەرییە، گۆت: ئەی کورێ عومەری، ئەز دێ پرسیارا تشتەکی ژ تە کەم بۆ من بێژە: ئەرێ تو دزانی عوسمان ل رۆژا ئوحودێ رەڤی بوو؟ گۆت: بەلێ، ئینا گۆت: تو دزانی ل رۆژا بەدرێ نەیێ ئامادەبوو و پشکداری نەکربوو؟ گۆت: بەلێ، گۆت: تو دزانی ل پەیمانا ریزوانێدا یێ ئامەدە نەبوو و پشکداری تێدا نەکرییە؟ گۆت: بەلێ، ئینا گۆت: الله اکبر.**

**ئیبن عو مەری گۆت: وەرە دا بۆ تە ئا شکەرا بکەم، هندیکە رەڤینا ویە ل رۆژا ئوحودێ، ئەز شەهدەییێ ددەم ب راستی خودێ ئەو ئازا کر و لێ بۆری و گونەها وی ژێ بر، و هندیکە نەئامادەبوونا وی ژ بەدرێ، کچا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل دەڤ وی بوو، و یا نەساخ بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتێ: ( بۆ تە خێرا زەلامەکێ ل بەدرێ ئامەدە بوویی و پشکا وی ژ دەستکەفتی هەیە)، و هندیکە نەئامادەبوونا ویە ل پەیمانا ریزوان، ئەگەر ئێك ژ عوسمانی پشتەڤانی زۆرتر و ب هێزتر هەبا یە د ناڤ مەکەهییاندا دا وی ل جهێ وی هنێریت، پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) عوسمان هنارت و پەیمانا ریزوان پشتی چۆنا عوسمانی بوو بۆ مەکەهێ، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب دەستێ خۆ یێ راستێ گۆت: (ئەڤە دەستێ عوسمانییە)، و دانا سەر دەستێ خۆ و گۆت: (ئەڤە بۆ عوسمانی)، ئینا ئیبن عومەری گۆت: ب ڤێ هەرە دگەل خۆ ببە.**

٣٨١٧ - (م) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) مُضْطَجِعاً فِي بَيْتِي، كَاشِفاً عَنْ فَخِذَيْهِ، أَوْ سَاقَيْهِ. فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ، فَأَذِنَ لَهُ، وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَتَحَدَّثَ. ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ فَأَذِنَ لَهُ، وَهُوَ كَذَلِكَ، فَتَحَدَّثَ. ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَسَوَّى ثِيَابَهُ. قَالَ مُحَمَّدٌ: وَلاَ أَقُولُ ذلِكَ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ. فَدَخَلَ، فَتَحَدَّثَ. فَلَمَّا خَرَجَ قَالَتْ عَائِشَةُ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ،

ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ، وَلَمْ تُبَالِهِ. ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ، فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ! فَقَالَ: (أَلاَ أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلاَئِكَةُ). [م٢٤٠١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مالا من یێ درێژكری بوو، و رانێت خۆ یان باقێت خۆ دیار كربوون، ئینا ئەبو بەكری دەستوری خواست و دەستویری دایێ و ئەو هەر یێ وەسا بوو، ئاخفت، پاشی عومەری دەستویری خواست و دەستویری دا یێ و ئەو هەر یێ وەسا بوو، ئاخفت، پاشی عوسمانی دەستویری خواست، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو روینشتە خوارێ و جلكێ خۆ دورست كر، موحەممەدی گۆت: و ئەز نابێژم ئەڤە د رۆژەكێ تنێدا بوو ـ هاتە ژۆر و ئاخفت ڤێجا دەمێ دەركەفتی عائیشایێ گۆت: ئەبوبەكر هاتە ژۆر تو د گەل یێ گەرم نەبووی و تە ب چوڤە وەرنەگرت، و پاشی عومەر هاتە ژۆر تو د گەل یێ گەرم نەبووی و تە ب چوڤە وەرنەگرت، پاشی عوسمان هاتە ژۆر تو روینشتی و تە جلكێ خۆ دورست كر! ئینا گۆت: (ما ئەز شەرمێ ژ وی نەكەم یێ ملیاكەت شەرمێ ژێ دكەن).**

**٥. باب: فضائل علي رضي الله عنه**

## بابەتێ: باشییێت عەلی (رضي الله عنه).

٣٨١٨ – (ق) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: **(لأُعْطِيَنَّ هذِهِ الرَّايَةَ غَداً رَجُلاً يَفْتَحُ اللهُ عَلَى يَدَيْهِ، يُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ، وَيُحِبُّهُ اللهُ وَرَسُولُهُ)**. قَالَ: فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكُونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَا؟ فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّاسُ غَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) كُلُّهُمْ يَرْجُو أَنْ يُعْطَاهَا، فَقَالَ: **(أَيْنَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ)** ؟ فَقِيلَ: هُوَ يَا رَسُولَ اللهِ يَشْتَكِي عَيْنَيْهِ، قَالَ: **(فَأَرْسِلُوا إِلَيْهِ)**. فَأُتِيَ بِهِ، فَبَصَقَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فِي عَيْنَيْهِ وَدَعَا لَهُ، فَبَرَأَ حَتَّى كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِهِ وَجَعٌ، فَأَعْطَاهُ الرَّايَةَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: يَا رَسُولَ اللهِ، أُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا؟ فَقَالَ: **(انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، وَأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللهِ فِيهِ. فَوَاللهِ لأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِكَ رَجُلاً وَاحِداً، خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ)**. [خ٤٢١٠ (٢٩٤٢)/ م٢٤٠٦].

**ژ سەهلێ كورێ سەعدی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل رۆژا خەیبەرێ گۆت: (بێ شك سوبەهی ئەز دێ ئالای دەمەڤ زەلامەكی، خودێ دێ ب سەر**

**دەستێ وی ڤەکەت، حەژ خودێ و پێغەمبەرێ وی دکەت و خودێ و پێغەمبەر ژی حەژێ دکەن)،** خەلکی شەڤا خۆ ب تێکهاتن و تێکچۆن برنە سەری، کا دێ دەتەف کێ ژ وان، ڤێجا دەمێ ل خەلکێ بوویە سپێدە هاتنە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) هەر ئێکی هیڤییا وی ئەوە بدەتەف وی، گۆت: **(کا عەلییێ کورێ ئەبی تالبی)؟** گۆتن: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو گازندێ ژ چاڤێت خۆ دکەت، (ئانکو: چاڤێت وی کولن)، گۆت: **(ڤرێکەنە دویڤرا)**، ئینا دەڤ، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تفکرە هەردو چاڤێت وی، چێ بوون هەر وەکی چو جار چو لێ نەهاتین، و ئالا دا ڤێ، عەلی (رضي الله عنه) گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز شەرێ وان بکەم هەتا وەکی مە لێ دهێن (ئانکو: موسلمان دبن)؟ گۆت: **(هێدی هێدی هەرە هەتا تو دگەهییە وان، پاشی وان گازیکە ئیسلامێ، و بێژە وان کا چ حەقێ خودێ تێدایە، ئەز ب خودێ کەمە هەکە خودێ ئێکی ل سەر دەستێ تە راستەرێ بکەت بۆ تە ژ حێشترێت سۆر چێترە)**.

٣٨١٩ - (ق) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) خَرَجَ إِلَى تَبُوكَ، وَاسْتَخْلَفَ عَلِيّاً، فَقَالَ: أَتُخَلِّفُنِي فِي الصِّبْيَانِ وَالنِّسَاءِ؟ قالَ: **(أَلاَ تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسى، إِلاَّ أَنَّهُ لَيْسَ نَبِيٌّ بَعْدِي)**. [خ٤٤١٦ (٣٧٠٦)/ م٢٤٠٤]

ژ سەعدێ کورێ ئەبی وەققاس (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەرکەفتە تەبووکێ، و عەلی ل جهێ خۆ هێلا، ئینا گۆت: تو من ل ناڤ بچویك و ژنا ندا دهێلی؟ گۆت: **(ما تو پێ رازی نینی جهێ تە ل دەڤ من وەکی جهێ هاروونی بیت ژ مووسایی، بەلێ پا چو پێغەمبەر پشتی من نینن)**.

٣٨٢٠ - (م) عَنْ زِرٍّ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ: وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، إِنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ (ص) إِلَيَّ: **(أَنْ لاَ يُحِبَّنِي إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ يُبْغِضَنِي إِلاَّ مُنَافِقٌ)**. [م٧٨].

ژ زیرری (رضي الله عنه) گۆت: عەلی گۆت: ئەز ب وی سویند دخۆم یێ تۆڤ دەرزاندی و شین کری و مرۆڤ و جان داین ئەڤە پەیمانە ژ پێغەمبەرێ نەخوینیت و نەنڤیسیت بۆ من **(کەس حەژ من ناکەت باوەریدار نەبیت و کەسێ کەرب ژ من ڤەنابن ئەگەر دوڕوی نەبیت)**.

٣٨٢١ - (م) عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ رضي الله عنه قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَوْماً فِينَا خَطِيباً، بِمَاءٍ يُدْعَى خُمّاً، بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَوَعَظَ وَذَكَّرَ. ثُمَّ قَالَ: **(أَمَّا بَعْدُ، أَلاَ أَيُّهَا النَّاسُ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ يُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ رَبِّي فَأُجِيبَ. وَأَنَا تَارِكٌ فِيكُمْ ثَقَلَيْنِ: أَوَّلُهُمَا كِتَابُ اللهِ فِيهِ الْهُدَى وَالنُّورُ، فَخُذُوا بِكِتَابِ اللهِ، وَاسْتَمْسِكُوا بِهِ)** فَحَثَّ عَلَى كِتَابِ اللهِ، وَرَغَّبَ فِيهِ. ثُمَّ قَالَ: **(وَأَهْلُ بَيْتِي، أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي. أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي. أُذَكِّرُكُمُ اللهَ فِي أَهْلِ بَيْتِي)**. فَقَالَ لَهُ حُصَيْنٌ: وَمَنْ أَهْلُ بَيْتِهِ يَا زَيْدُ، أَلَيْسَ نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ؟ قَالَ: نِسَاؤُهُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، وَلكِنْ أَهْلُ بَيْتِهِ مَنْ حُرِمَ الصَّدَقَةَ بَعْدَهُ. قَالَ: وَمَنْ هُمْ؟ قَالَ: هُمْ آلُ عَلِيٍّ، وَآلُ عَقِيلٍ، وَآلُ جَعْفَرٍ، وَآلُ عَبَّاسٍ. قَالَ: كُلُّ هؤُلاَءِ حُرِمَ الصَّدَقَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ. [م٢٤٠٨].

**ژ زەیدێ كورێ ئەرقەمی (رضي الله عنه) گۆت: رۆژەكێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتارخوین د ناڤ مەدا رابوو، شوكر و حەمدا خودێ كر، و پەسن و مەدحێت وی كرن، و شیرەت كرن و بیرئینان كر، پاشی گۆت: (و پشتی ڤێ: بزانن گەلی مرۆڤان، ب راستی ئەز مرۆڤم[1] و نێزیكە ڤاسدێ خودێ بێت و ئەز بەرسڤا وی بدەم (مەخسەد پێ مرنە) و من دو گران یێت[2] د ناڤ هەوەدا هێلاین: یا ئێكێ كتێبا خودێیە (كو قورئانە) راستەرێیی و رۆناهی یا تێدا، ڤێجا كتێبا خودێ وەرگرن و خۆ پێڤە بگرن). و قورئان دا شرینكرن و پالدانا قورئانێ كر، پاشی گۆت: (و خەلكێ مالا من، ئەز خودێ ل بیرا هەوە دئینم د خەلكێ مالا خۆدا، ئەز خودێ ل بیرا هەوە دئینم د خەلكێ مالا خۆدا). ئینا (حصین)ی گۆتە وی: و كینە خەلكێ مالا وی ئەی زەید؟ ما هەڤژینێت وی ژ خەلكێ مالا وی نینن؟ گۆت: هەڤژینێت وی ژ خەلكێ مالا وینە بەلێ خەلكێ مالا وی ئەون یێت زەكات ل سەر وان حەرام، گۆت: و ئەو كینە؟ گۆت: ئەو مالا عەلینە، و مالا جەعفەرینە، و مالا عەباسی، گۆت: ئەرێ زەكات ل سەر ڤان هەمییان هاتییە حەرامكرن؟ گۆت: بەلێ.**

---

(١) ئانكو: مرن بۆ من ژی یا هەی وەكی بۆ هەر مرۆڤەكی هەی.

(٢) چونكی هندی هند د مەزنن.

## ٦. باب: مناقب الحسن والحسين رضي الله عنهما

## بابەتێ: نافدێرییا حەسنی و حوسەینی (خودێ ژ هەردویان رازی بیت).

٣٨٢٢ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)، والحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ عَلَى عاتِقِهِ، يَقُولُ: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ، فَأَحِبَّهُ**). [خ٣٧٤٩/ م٢٤٢٢].

**ژ بەرائی (ﷺ) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت و حەسەنێ کورێ عەلی ل سەر ملێ وی بوو و دگۆت: (ئەی خودا ب راستی ئەز حەژێ دکەم ڤێجا حەژێ بکە).**

٣٨٢٣ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ الدَّوْسِيِّ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي طَائِفَةِ النَّهَارِ، لاَ يُكَلِّمُنِي وَلاَ أُكَلِّمُهُ، حَتَّى أَتَى سُوقَ بَنِي قَيْنُقَاعَ، فَجَلَسَ بِفِنَاءِ بَيْتِ فَاطِمَةَ، فَقَالَ: (**أَثَمَّ لُكَعُ ، أَثَمَّ لُكَعُ**). فَحَبَسَتْهُ شَيْئاً، فَظَنَنْتُ أَنَّهَا تُلْبِسُهُ سِخَاباً أَوْ تُغَسِّلُهُ، فَجَاءَ يَشْتَدُّ حَتَّى عَانَقَهُ وَقَبَّلَهُ، وَقَالَ: (**اللَّهُمَّ أَحِبَّهُ، وَأَحِبَّ مَنْ يُحِبُّهُ**). [خ٢١٢٢/ م٢٤٢١].

**ژ ئەبی هورەیرەیێ دەو سی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەر (ﷺ) د دەمەکێ رۆژ ێدا دەرکەفت، نە ئەو د گەل من ئاخفت و نە ئەز د گەل ئاخفتم، هەتا هاتییە سویکا بەنی قەینوقاع، ئینا ل راستا دەرگەهێ مالا فاتیمایێ روینشتە خوارێ و گۆت: (ئەوێ بچویك ل وێرێیە، ئەوێ بچویك ل وێرێیە)، تشتەکی ئەو ڤەگرت، من هزر کر ئەو رستکەکا تشتێت بێهنخۆشییان دکەتە بەر یان یا وی دشۆت، و ب لەز هات، هەتا دانا یە بەر سینگێ خۆ و ماچی کری و گۆت: (ئەی خودا حەژێ بکە و حەژ وی بکە یێ حەژ وی دکەت).**

٣٨٢٤ - (خ) عَنْ أَنَسٍ قالَ: لَمْ يَكُنْ أَحَدٌ أَشْبَهَ بِالنَّبِيِّ (ﷺ) مِنَ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ. [خ٣٧٥٢].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: کەس وەکی حەسەنێ کورێ عەلی ب پێغەمبەریڤە (ﷺ) نەچۆیە.**

٣٨٢٥ - (خ) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَلَى الْمِنْبَرِ، وَالحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ إِلَى جَنْبِهِ، وَهْوَ يُقْبِلُ عَلَى النَّاسِ مَرَّةً وَعَلَيْهِ أُخْرَى، وَيَقُولُ: (**إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ**). [خ٢٧٠٤].

**ژ ئەبی بەکرەتە (ﷺ) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر میذبەرێ دیت و حەسەنێ کورێ عەلی ب رەخ ویڤە بوو، و وی جارەکێ بەرێ خۆ ددا خەلکی، و جارەکێ**

**بەرێ خۆ ددا وی و دگۆت: (ب راستی ئەڤە كورێ من سەرداره، و دبیت خودێ ب وی د ناڤبەرا دو كۆمێت موسلمانانندا پێت مەزن خۆش بكەت).**

٣٨٢٦ - (خ) عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ قالَ: كُنْتُ شَاهِداً لِابْنِ عُمَرَ، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ دَمِ الْبَعُوضِ، فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ فَقَالَ: مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ، قالَ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا، يَسْأَلُنِي عَنْ دَمِ الْبَعُوضِ، وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَسَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (هُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنَ الدُّنْيَا). [خ٥٩٩٤ (٣٧٥٣)].

**ژ ئەبی نەعیمی (رحمه الله) گۆت: ئەز ل دەڤ ئیبن عومەری بووم، و زەلامەكی پرسیارا كوشتنا پێشییێ ژێ كر، ئینا گۆتێ: تو خەلكێ كیڤەیی ؟ گۆت: ژ خەلكێ عیراقێ، گۆت: بەرێ خۆ بدەنە ڤی پرسیارا كوشتنا پێشییێ ژ من دكەت و وان نەڤییێ پێغەمبەری (ﷺ) یێ كوشتی، و من گوهـ ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (ئەو هەردو (حەسەن و حوسەین) رحانێت منن ژ دنیایێ).**

٣٨٢٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهم قَالَ: ارْقُبُوا مُحَمَّداً (ﷺ) فِي أَهْلِ بَيْتِهِ. [خ٣٧١٣].

**ژ ئیبن عومەری ژ ئەبی بەكری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: موحەممەدی (ﷺ) د خەلكێ مالا ویدا بپارێزن.**

٣٨٢٨ - (م) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) غَدَاةً وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مُرَحَّلٌ، مِنْ شَعْرٍ أَسْوَدَ. فَجَاءَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ فَأَدْخَلَهُ. ثُمَّ جَاءَ الْحُسَيْنُ فَدَخَلَ مَعَهُ. ثُمَّ جَاءَتْ فَاطِمَةُ فَأَدْخَلَهَا. ثُمَّ جَاءَ عَلِيٌّ فَأَدْخَلَهُ. ثُمَّ قَالَ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ [الأحزاب:٣٣]. [م٢٤٢٤].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سپێدەكێ دەر كەفت و پاتەكێ نەقشكری و ژ موییێ رەش ل بەر بوو، ئینا حەسەنێ كورێ عەلی هات و كرە د بنڤە، و پاشی حوسەین هات ئەو د گەل چۆ د بنڤە، پاشی فاتیمە هات و كرە د بنڤە،**

**پاشی عەلی هات و کرە د بنڤە، پاشی گۆت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا﴾[1].**

## ٧. باب: مناقب جعفر رضي الله عنه

## بابەتێ: ناڤدێرییا جەعفەری (رضي الله عنه).

٣٨٢٩ - (خ) عَنِ البَرَاءِ بْنِ عازِبٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِجَعْفَرٍ: (**أَشْبَهْتَ خَلْقِي وخُلُقِي**). [خ٤٢٥١]

**ژ بەرائێ کوڕێ عازبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە جەعفەری: (تە یێ دایە ب سیما و رەوشتێ منڤە).**

٣٨٣٠ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّاسَ كانُوا يَقُولُونَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ، وَإِنِّي كُنْتُ أَلْزَمُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بِشِبَعِ بَطْنِي، حِينَ لاَ آكُلُ الخَمِيرَ، وَلاَ أَلْبَسُ الحَبِيرَ، وَلاَ يَخْدُمُنِي فُلاَنٌ وَلاَ فُلاَنَةُ، وَكُنْتُ أُلْصِقُ بَطْنِي بِالحَصْبَاءِ مِنَ الجُوعِ، وَإِنْ كُنْتُ لأَسْتَقْرِئُ الرَّجُلَ الآيَةَ، هِيَ مَعِي، كَيْ يَنْقَلِبَ بِي فَيُطْعِمَنِي، وَكَانَ أَخْيَرَ النَّاسِ لِلْمَسَاكِينِ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، كَانَ يَنْقَلِبُ بِنَا فَيُطْعِمُنَا ما كانَ في بَيْتِهِ، حَتَّى إِنْ كَانَ لَيُخْرِجُ إِلَيْنَا الْعُكَّةَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَيْءٌ، فَنَشُقُّهَا فَنَلْعَقُ ما فِيهَا. [خ٣٧٠٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: خەلکێ دگۆت: ئەبو هورەیرە زێدە فەرموودەیان دبێژیت، و ئەز ب تێراتییا زکێ خۆ ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ بووم[2] و نە من نانێ ترشکری دخوار و نە جلکێ نەخشکری دکرە بەر خۆ و نە من خزمەتکارەکێ زەلام هەبوو نە یا ژن، و من زکێ خۆ د برسا دزواردا ب حەسحاسیڤە دنا، و من هندەك جاران داخوازا ئایەتەکێ ژ ئێکی دکر، و من ئەو ژ بەر بوو، دا د گەل وی بچم خوارنێ بدەتە من، و باشترینێ خەلکی بۆ هەژان جەعفەرێ کوڕێ ئەبی تالبی بوو، ئەم د گەل خۆ دبرین و چ ل مالا وی هەبوو ددا مە، هەتا هندە جارا دا ئامانێ روینی بۆ مە درئێخیت و چو تێدا نەبوو، و ئەم دا کەرکەین ئەوا تێدا ئالیسین.**

---

(١) رامانا ئایەتێ ب کورتی: گەلی خەلکێ ڤێ مالێ ب راستی خودێ دڤێت هەوە ژ قرێژا گونەهان بشۆت، و پاقژییەکا پاقژ هەوە پاقژ بکەت.

(٢) ئانکو: خەما من بەس زکێ من بوو و تێر ببیت بەسە و من چو خەمێت دی نەبوون و مژویلی چو کار و شۆل و بازرگانی و جۆت و مالدارییێ نەبووم.

## ٨. باب: مناقب الزبير بن العوام رضي الله عنه

## بابەتێ: نافدێرییێت زوبەیرێ كورێ عەوامی (رضي الله عنه).

٣٨٣١ - (ق) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: نَدَبَ النَّبِيُّ (ﷺ) النَّاسَ يَوْمَ الخَنْدَقِ، فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، قَالَ: النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا، وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ)**. [خ٢٩٩٧ (٢٨٤٦)/ م٢٤١٥]

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا خەندەكێ گازی خەلكی كر، زوبەیر رابوو، پاشی گازی وان كر، زوبەیر رابوو پاشی گازی وان كر، زوبەیر رابوو، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (هەر پێغەمبەركی هاریكار و پشتەڤانێ خۆ یێ هەی، و هاریكار و پشتەڤانێ من زوبەیرە).**

٣٨٣٢ - (خ) عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ: أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) قالُوا لِلزُّبَيْرِ يَوْمَ الْيَرْمُوكِ: أَلاَ تَشُدُّ فَنَشُدُّ مَعَكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي إِنْ شَدَدْتُ كَذَبْتُمْ، فَقَالُوا: لاَ نَفْعَلُ. فَحَمَلَ عَلَيْهِمْ حَتَّى شَقَّ صُفُوفَهُمْ، فَجَاوَزَهُمْ وَمَا مَعَهُ أَحَدٌ، ثُمَّ رَجَعَ مُقْبِلاً، فَأَخَذُوا بِلِجَامِهِ، فَضَرَبُوهُ ضَرْبَتَيْنِ عَلَى عاتِقِهِ، بَيْنَهُمَا ضَرْبَةٌ ضُرِبَهَا يَوْمَ بَدْرٍ.

قَالَ عُرْوَةُ: كُنْتُ أُدْخِلُ أَصَابِعِي فِي تِلْكَ الضَّرَبَاتِ أَلْعَبُ وَأَنَا صَغِيرٌ. قَالَ عُرْوَةُ: وَكَانَ مَعَهُ عَبْدُ اللهِ بْنُ الزُّبَيْرِ يَوْمَئِذٍ، وَهْوَ ابْنُ عَشْرِ سِنِينَ، فَحَمَلَهُ عَلَى فَرَسٍ، وَوَكَّلَ بِهِ رَجُلاً. [خ٣٩٧٥ (٣٧٢١)].

**ژ عوروەیێ كورێ زوبەیری (رضي الله عنه) گۆت: هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) رۆژا یەرمووكێ گۆتە زوبەیری، ما تو هێرشێ ناكەی دا ئەم ژی هێرشێ د گەل تە بكەین، ئینا گۆت: ئەز دترسم بچم و هوین ڤەمینن، گۆتن ئەم وەنا كەین، زوبەیری هێرش كرە وان هەتا رێزێت وان شەق كرین و ژ وان بۆری و ئێك ژ وان یێت ئاخفتن د گەل كرین د گەل وی نەبوو، پاشی ڤەگەریا رۆمییان لغاڤێ هەسپێ وی گرت، و دو درب ل ستۆیێ وی دان، د ناڤ هەردو درباندا جهێ دربەكی هەبوو، رۆژا بەدرێ ڤێ كەتبوو.**

**عورەیی گۆت: من تلێت خۆ دبرنە د برینا ویدا و من یاری پێ دكرن و ئەز یێ بچویك، و وێ رۆژێ عەبدوللایێ كورێ زوبەیری د گەل بوو، و ئەو كورێ دەھ سالی بوو، و ل هەسپەكی سویار كربوو، و زەلامەك دانابوو بەر بپارێزیت.**

٣٨٣٣ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) كَانَ عَلَى جَبَلِ حِرَاءٍ، فَتَحَرَّكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (اسْكُنْ حِرَاءُ، فَمَا عَلَيْكَ إِلاَّ نَبِيٌّ، أَوْ صِدِّيقٌ، أَوْ شَهِيدٌ). وعَلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنهم. [م٢٤١٧].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل سەر چیایێ حیرائێ بوو و چیا لڤلڤی، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (راوەستە ئەی حیراء، کەس ل سەر تە نینە پێغەمبەر نەبیت یان راستگۆ یان شەهید) و پێغەمبەر (ﷺ) ل سەر بوو و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و زوبەیر و سەعدێ کوڕێ ئەبی وەققاسی خودێ ژ وان رازی بیت).**

**٩. باب: مناقب طلحة بن عبيد الله رضي الله عنه**

**بابەتێ: نافدێرییێت تەلحەیێ کوڕێ عەبدوللایی (ﷺ).**

٣٨٣٤ - (ق) عَنْ أَبِي عُثمانَ النَّهْدِيِّ قالَ: لَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فِي بَعْضِ تِلْكَ الأَيَّامِ الَّتِي قاتَلَ فِيهِنَّ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، غَيْرُ طَلْحَةَ وَسَعْدٍ. عَنْ حَدِيثِهِمَا. [خ٣٧٢٢، ٣٧٢٣/ م٢٤١٤].

**ژ ئەبی عوسمانێ نەهدی (ﷺ) گۆت: د هندە رۆژێت پێغەمبەری (ﷺ) شەڕ تێدا کری کەس د گەل پێغەمبەری (ﷺ) نەما تەلحە و سەعد نەبن، وان ئەڤە بۆ من گۆت.**

٣٨٣٥ - (خ) عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حازِمٍ قالَ: رَأَيْتُ يَدَ طَلْحَةَ الَّتِي وَقَى بِهَا النَّبِيَّ (ﷺ) قَدْ شَلَّتْ. [خ٣٧٢٤].

- زاد في رواية: يَوْمَ أُحُدٍ. [خ٤٠٦٣].

**ژ قەیسێ کوڕێ ئەبی حازمی (ﷺ) گۆت: من دەستێ ئەبی تەلحەیی دیت ئەوێ پێغەمبەر (ﷺ) پێ دپاراست شەلەلێ گرتبوو.**

- **و د ڤەگێڕەکێدا زێدە کرییە: ل رۆژا ئوحودێ.**

## ١٠. باب: مناقب سعد بن أَبي وقاص رضي الله عنه

## بابەتێ: ناڤدێرییێت سەعدێ کورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه).

٣٨٣٦ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: أَرِقَ النَّبِيُّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقَالَ: (**لَيْتَ رَجُلاً صَالِحاً مِنْ أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اللَّيْلَةَ**) ! إِذْ سَمِعْنَا صَوْتَ السِّلاَحِ، قالَ: (**مَنْ هَذَا**) ؟ قالَ: سَعْدٌ يَا رَسُولَ اللهِ، جِئْتُ أَحْرُسُكَ، فَنَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى سَمِعْنَا غَطِيطَهُ. [خ٧٢٣١ (٢٨٨٥)/ م٢٤١٠].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: خەوا پێغەمبەری (ﷺ) د شەڤەکێدا نەهات، ئینا گۆت: (خۆزی زەلامەکێ باش ژ هەڤالێت من زێرەڤانییا من ئەڤ شەڤە کربا)، ئینا مە گوه ل دەنگێ چەکی بوو، گۆت: (ئەڤە کییە)؟ گۆت: سەعدە ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز یێ هاتیم زێرەڤانییێ ل تە بکەم، ئینا پێغەمبەر (ﷺ) نڤست هەتا مە گوه ل خرخرا وی بووی.**

٣٨٣٧ - (ق) عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قالَ: ما سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) جَمَعَ أَبَوَيْهِ لأَحَدٍ؛ إِلاَّ لِسَعْدِ بْنِ مالِكٍ، فَإِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ يَوْمَ أُحُدٍ: (**يَا سَعْدُ ارْمِ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي**).[خ٤٠٥٩ (٢٩٠٥)/ م٢٤١١],

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نەبوو یە دایك و بابێت خۆ بۆ ئێکی کۆم کربن بۆ سەعدێ کورێ مالکی نەبیت، ب راستی ل رۆژا ئوحودێ من گوه لێ بوو دگۆت: (ئەی سەعد تیران تێوەرکە بابێ من و دایکا من گۆری تە بن).**

٣٨٣٨ - (خ) عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ قالَ: ما أَسْلَمَ أَحَدٌ إِلاَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي أَسْلَمْتُ فِيهِ، وَلَقَدْ مَكَثْتُ سَبْعَةَ أَيَّامٍ، وَإِنِّي لَثُلُثُ الإِسْلاَمِ. [خ٣٧٢٧ (٣٧٢٦)].

**ژ سەعدێ کورێ ئەبی وەققاسی (رضي الله عنه) گۆت: کەس موسلمان نەببوو رۆژا ئەز تێدا موسلمان بوویم[1] و ئەز حەفت رۆژان مام و ئەز سێکا ئیسلامێ بووم[2].**

---

(١) زانا دبێژن: ئەو ڤێ ئاخفتنێ ل دویف هزرا خۆ دبێژیت، چونکی بەری وی موسلمان هەبوون ژ وان ئەبوبەکر و خەدیجا و عەلی.

(٢) ئانکو: ئەم موسلمان بەس سێ کەس بووین.

## ١١. باب: مناقب زيد بن حارثة وابنه أُسامة رضي الله عنهما

## بابەتێ: نافدێرییێت زەیدێ كورێ حاریسەیی و كورێ وی ئوسامەیی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت).

٣٨٣٩ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (ﷺ) بَعْثاً، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، فَطَعَنَ بَعْضُ النَّاسِ فِي إِمَارَتِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): (**إِنْ تَطْعُنُوا فِي إِمَارَتِهِ، فَقَدْ كُنْتُمْ تَطْعُنُونَ فِي إِمارَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلُ. وَايْمُ اللهِ إِنْ كانَ لَخَلِيقاً لِلإِمارَةِ، وَإِنْ كانَ لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، وَإِنَّ هَذَا لَمِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ بَعْدَهُ**). [خ٣٧٣٠/ م٢٤٢٦].

**ژ عەبدوللایێ كورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) لەشكەرەك هنارت و ئوسامەیێ كورێ زەیدی كرە سەرداریێ وان، ئینا هندەكان تانە ل سەرداریا وی دان، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەگەر هوین تانان ل سەرداریا وی بدەن ب راستی هەوە بەری نوكە تانە ل سەرداریا بابێ وی ژی دان، و سویند ب خودێ ئەو هەژی سەرداریێیە و سویند ب خودێ ئەو ژ هەمی خەلكی خۆشڤیتربوو ل دەڤ من و ئەڤە ژی[1] خۆشڤیترین خەلكە ل دەڤ من پشتی وی).**

٣٨٤٠ - (خ) عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما: حَدَّثَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ يَأْخُذُهُ وَالحَسَنَ، فَيَقُولُ: (**اللَّهُمَّ أَحِبَّهُمَا، فَإِنِّي أُحِبُّهُما**). [خ٣٧٣٥].

**ژ ئوسامەیێ كورێ زەیدی (خودێ ژ وان رازی بیت) ژ پێغەمبەری (ﷺ) ڤەدگێریت: وی ئەو و حەسەن هەلدگرتن و دگۆت: (ئەی خودا حەژ وان بكە، ب راستی ئەز حەژ وان دكەم).**

## ١٢. باب: مناقب عبد الله بن مسعود رضي الله عنه

## بابەتێ: نافدێرییێت عەبدوللایێ كورێ مەسعودی (رضي الله عنه).

٣٨٤١ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَدِمْتُ أَنَا وَأَخِي مِنَ الْيَمَنِ، فَمَكَثْنَا حِيناً، ما نُرَى إِلاَّ أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِ النَّبِيِّ (ﷺ)، لِمَا نَرَى مِنْ دُخُولِهِ وَدُخُولِ أُمِّهِ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ). [خ٣٧٦٣/ م٢٤٦٠].

---

(١) مەبەست كورێ وی ئوسامەیە.

**ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: ئەز و برایێ خۆ ژ یە مەنێ هاتین، و ئەم دەمەكی ماین، و مە عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی نەددیت ئەگەر زەلامەك ژ خەلكێ مالا پێغەمبەری (ﷺ) نەبیت، هند هند مە ددیت ئەو و دایكا خۆ د چۆنە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ).**

٣٨٤٢ - (ق) عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ رضي الله عنه: وَاللهِ الَّذِي لاَ إِلهَ غَيْرُهُ، ما أُنْزِلَتْ سُورَةٌ مِنْ كِتَابِ اللهِ؛ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ أَيْنَ أُنْزِلَتْ، وَلاَ أُنْزِلَتْ آيَةٌ مِنْ كِتَابِ اللهِ؛ إِلاَّ أَنَا أَعْلَمُ فِيمَا أُنْزِلَتْ، وَلَوْ أَعْلَمُ أَحَداً أَعْلَمَ مِنِّي بِكِتَابِ اللهِ، تُبَلِّغُهُ الإِبِلُ، لَرَكِبْتُ إِلَيْهِ. [خ٥٠٠٢/ م٢٤٦٣].

**ژ مەسرووقی (رحمه الله) گۆت: عەبدوللایێ كوڕێ مەسعودی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ب وی خودایی كەمە یێ چو پەرستییێت راست و دورست نەی ئەو نەبیت، سۆرەتك ژ قور ئانێ نەهاتی یە خوارێ ئە گەر ئەز نەزانم ل كیرێ هاتی یە خوارێ، و ئایە تەك ژ قور ئانێ نەهاتییە خوارێ ئەگەر ئەز نەزانم كا د چدا هاتییە خوارێ و ئە گەر من زانی با ئێكێ ژ من زاناتر ب قورئانێ هەیە و حێشتر بگەهنێ دا سویاربم و چمە دەڤ.**

٣٨٤٣ - (خ) عَنْ حذيفة رضي الله عنه قال: إِنَّ أَشْبَهَ النَّاسِ دَلاًّ وَسَمْتاً وَهَدْياً بِرَسُولِ اللهِ (ﷺ) لابْنُ أُمِّ عَبْدٍ، مِنْ حِينَ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ إِلَى أَنْ يَرْجِعَ إِلَيْهِ، لاَ نَدْرِي ما يَصْنَعُ فِي أَهْلِهِ إِذَا خَلاَ. [خ٦٠٩٧ (٣٧٦٢)].

**ژ حوزەیفەیی (رضي الله عنه) گۆت: ب راستی ژ خەلكێ یێ پتر هەمیان ب پێغەمبەری ڤە (ﷺ) دچۆ ب سەروسیما و سالۆخەت و راستەرێیی ئیبن ئوم عەبد بوو، ل دە مێ ئەو ژ مالا خۆ دەردكەفت هەتا دزڤریڤە مالا خۆ، و ئەم نوزانین كا د مالا خۆدا چ د كر دە مێ ب تنێ دما.**

## ١٣. باب: مناقب عبد الله بن عمر رضي الله عنهما

## بابەتێ: نافدێرییێت عەبدوللایێ كوڕێ عومەری (خودێ ژ هەردووان رازی بیت).

٣٨٤٤ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ فِي المَنَامِ كَأَنَّ فِي يَدِي سَرَقَةً مِنْ حَرِيرٍ، لاَ أَهْوِي بِهَا إِلَى مَكَانٍ فِي الجَنَّةِ؛ إِلاَّ طَارَتْ بِي إِلَيْهِ، فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: (إِنَّ أَخَاكِ رَجُلٌ صَالِحٌ ، أَوْ قَالَ: إِنَّ عَبْدَ اللهِ رَجُلٌ صَالِحٌ). [خ٧٠١٥، ٧٠١٦ (٤٤٠)/ م٢٤٧٨].

**ژ ئیبن عو مەری ( خودێ ژ وان رازی ب یت) گۆت: من د خەونێدا د یت پار چەكا ئارمویشی د دە ستێ مندا بوو، و من بەرێ وێ نەددا جهەكی ل بەحە شتێ ئە گەر ئەز**

**نەفراندبامە وی جهی، ئینا من بۆ حەفسایێ ڤەگێرا، و حەفسایێ بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ڤەگێرا، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (برایێ تە زەلامەكێ باشە، یان گۆت، عەبدوللاه زەلامەكێ باشە).**

٣٨٤٥ - (ق) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا، فَأَقُصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَكُنْتُ غُلاَماً شَابّاً، وَكُنْتُ أَنَامُ فِي المَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي، فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ ، وَإِذَا فِيهَا أُنَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ: أَعُوذ بِاللهِ مِنَ النَّارِ. قَالَ: فَلَقِيَنَا مَلَكٌ آخَرُ، فَقَالَ لِي: لَمْ تُرَعْ. فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَقَالَ: (**نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ! لَوْ كانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ**). فكانَ بَعْدُ لاَ يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلاَّ قَلِيلاً. [خ١١٢١ و١١٢٢ (٤٤٠)/ م٢٤٧٩].

**ژ ئیبن عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: د ژیانا پێغەمبەریدا (ﷺ) ئەگەر زەلامەكی خەونەك دیتبا بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەدگێرا، و من حەز كر من خەونەك دیتبا و من بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەگێرابا، و ئەز لاوەكێ گەنج بووم، و ل سەر دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز ل مزگەفتێ دنڤستم، من د خەونێدا دیت هەروەكی دو ملیاكەت یێ من دبەن، و ئەز برمە سەر ئاگری، من دیت وەكی بیرێ دۆرما ندۆر ئاڤاكرییە و دو شەقلك یێت هەین(١) و هندە مرۆڤ تێدا بوون من ئەو دنیاسین، ئینا من دەستهاڤێتێ من دگۆت: ئەز خۆ ب خودێ ژ ئاگری دپارێزم. گۆت: ملیاكەتەكێ دی گەهشتە مە، ئینا گۆتە من: نەترسە. ئینا من بۆ حەفسایێ ڤەگێرا و حەفسایێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ڤەگێرا، ئینا گۆت: (خۆش زەلامە عەبدوللاه ئەگەر ب شەڤ نڤێژان بكەت) پشتی ڤێ ب شەڤ نەدنڤست كێمەك ژێ نەبیت.**

---

(١) ئەو هەردو شەقلكێت داری ئەون یێت دكەڤنە رەخێت وێ و دارەكی ل سەر نیڤەكێ ددانن دۆلكی پێڤە گرێ ددەن.

## ١٤. باب: مناقب عبد الله بن عباس رضي الله عنهما

## بابەتێ: ناڤدێرییێت عەبدوللایێ كورێ عەباسی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت).

٣٨٤٦ - (ق) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ الْخَلاَءَ، فَوَضَعْتُ لَهُ وَضُوءاً، قَالَ: (**مَنْ وَضَعَ هذَا**) ؟ فَأُخْبِرَ، فَقَالَ: (**اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّينِ**). [خ١٤٣ (٧٥)/ م٢٤٧٧].

وفي رواية للبخاري: قَالَ: ضَمَّنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، وَقَالَ: (**اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْكِتَابَ**). [خ٧٥].

وفي رواية له: قَالَ: (**اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الحِكْمَةَ**). [خ٣٧٥٦].

**ژ ئیبن عەباسی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چۆ جهێ دەسئاڤێ، ئینا من ئامانێ دەستنڤێژشویشتنێ بۆ دانا گۆت: (كێ ئەڤە دانا یە)؟ بۆ هاتە گۆتن: ئینا گۆت: (ئەی خودا د دینیدا شارەزا بكە).**

**و د ڤەگێرەكا بوخاریدا: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز كێشامە بەر سینگێ خۆ ڤە و گۆت: (ئەی خودا فێری قورئانێ بكە)[1].**

**و د ڤەگێرەكا ویدا: (ئەی خودا فێری حیكمەتێ بكە)[2].**

٣٨٤٧ - (خ) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ عُمَرُ يُدْخِلُنِي مَعَ أَشْيَاخِ بَدْرٍ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لِمَ تُدْخِلُ هَذَا الْفَتَى مَعَنَا وَلَنَا أَبْنَاءٌ مِثْلُهُ؟ فَقَالَ: إِنَّهُ مِمَّنْ قَدْ عَلِمْتُمْ، قَالَ: فَدَعَاهُمْ ذَاتَ يَوْمٍ وَدَعَانِي مَعَهُمْ، قَالَ: وَمَا أُرِيتُهُ دَعانِي يَوْمَئِذٍ إِلاَّ لِيُرِيَهُمْ مِنِّي، فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا﴾ [النصر] حَتَّى خَتَمَ السُّورَةَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: أُمِرْنَا أَنْ نَحْمَدَ اللهَ وَنَسْتَغْفِرَهُ إِذَا نُصِرْنَا وَفُتِحَ عَلَيْنَا، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ نَدْرِي، أَوْ لَمْ يَقُلْ بَعْضُهُمْ شَيْئاً، فَقَالَ لِي: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، أَكَذَاكَ تَقُولُ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَمَا تَقُولُ؟ قُلْتُ: هُوَ أَجَلُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أَعْلَمَهُ اللهُ لَهُ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ﴾. فَتْحُ مَكَّةَ، فَذَاكَ عَلاَمَةُ أَجَلِكَ: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًا﴾ [النصر] . قَالَ عُمَرُ: مَا أَعْلَمُ مِنْهَا إِلاَّ مَا تَعْلَمُ. [خ٤٢٩٤ (٣٦٢٧)].

**ژ ئیبن عەباسی، خودێ ژ هەردووان رازی بیت، گۆت: عومەری (رضي الله عنه)، ئەز د گەل رویسپییێت بەدرێ دكرمە د ژۆرڤە، هندەكان چۆ دلێ وان، گۆتن: بۆ ڤی د گەل مە**

(١) تێگەهشتن و ژبەركرن و راڤەكرن.

(٢) حیكمەت: زێدە زانین و كاربنەجهییە.

**دكەتە د ژۆرڤە و مە ژی كورێت وەكی وی یێت هەین؟! عومەری گۆت: ب راستی ئەو یێ وەسایە وەكی هوین دزانن[1]، رۆژەكێ گازی من كر و ئەز ئێخستمە د گەل وان، من نەدیت وی وێ رۆژێ گازی من كر بۆ هندێ نەبیت، دا نیشا وان بدەت كا ئەز یێ چاوامە، گۆت: هوین چ د گۆتنا خودێدا دبێژن ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ هندەكان گۆت: ئەمرێ مە یێ هاتییە كرن ئەم شوكرا خودێ بكەین و داخوازا گونەهژێبرنێ ژێ بكەین، هەكە ئەم سەر ئێخستین. و هندەك بێ دەنگ بوون و چو نەگۆت. ئینا گۆتە من: تو ژی وەدبێژی یا ئیبن عەباس؟ من گۆت، نە، گۆت: پا تو چ دبێژی؟ من گۆت: ئەو دویماهییا پێغەمبەرییە (ﷺ) نیشادا گۆتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾ ئەگەر سەركەفتنا خودێ و ڤەكرنا مەكەهێ بۆ تە هات، ئەڤە نیشانا دویماهییا تەیە ﴿فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾ هینگێ خودێ ژ هەمی كێماسییان بشۆ، و شوكرا خۆ بۆ دیاركە، و داخوازا لێبۆرینێ ژێ بكە، چونكی بێ گۆمان ئەوە یێ هەر تەوبە وەرگر. ئینا عومەری گۆت: ئەز ژی هەر وێ ژێ دزانم یا تو دزانی.**

## ١٥. باب: مناقب أَبي ذر الغفاري رضي الله عنه

## بابەتێ: ناڤدێرییێت ئەبی زەڕی (رضي الله عنه).

٣٨٤٨ - (ق) عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى مَلإٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ خَشِنُ الشَّعَرِ وَالثِّيَابِ وَالْهَيْئَةِ، حَتَّى قامَ عَلَيْهِمْ، فَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: بَشِّرِ الْكَانِزِينَ بِرَضْفٍ يُحْمى عَلَيْهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، ثُمَّ يُوضَعُ عَلَى حَلَمَةِ ثَدْيِ أَحَدِهِمْ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ نُغْضِ كَتِفِهِ، وَيُوضَعُ عَلَى نُغْضِ كَتِفِهِ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ حَلَمَةِ ثَدْيِهِ، يَتَزَلْزَلُ. ثُمَّ وَلَّى فَجَلَسَ إِلَى سَارِيَةٍ، وَتَبِعْتُهُ وَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، وَأَنَا لاَ أَدْرِي مَنْ هُوَ، فَقُلْتُ لَهُ: لاَ أُرَى الْقَوْمَ إِلاَّ قَدْ كَرِهُوا الَّذِي قُلْتَ؟ قَالَ: إِنَّهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً.

قَالَ لِي خَلِيلِي، قَالَ: قُلْتُ: مَنْ خَلِيلُكَ؟ قَالَ: النَّبِيُّ (ﷺ): (**يَا أَبَا ذَرٍّ أَتُبْصِرُ أُحُداً**) ؟ قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَى الشَّمْسِ ما بَقِيَ مِنَ النَّهَارِ، وَأَنَا أُرَى أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يُرْسِلُنِي فِي حاجَةٍ لَهُ، قُلْتُ: نَعَمْ.

---

**(١) نیشانكرنە بۆ زانینا وی یان مرۆڤانییا وی د گەل پێغەمبەری (ﷺ).**

قَالَ: (ما أُحِبُّ أَنَّ لِي مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً، أُنْفِقُهُ كُلَّهُ، إِلاَّ ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ). وَإِنَّ هـؤُلاَءِ لاَ يَعْقِلُونَ، إِنَّمَا يَجْمَعُونَ الدُّنْيَا. لاَ وَاللهِ، لاَ أَسْأَلُهُمْ دُنْيَا، وَلاَ أَسْتَفْتِيهِمْ عَنْ دِينٍ، حَتَّى أَلْقَى اللهَ.[خ١٤٠٧و١٤٠٨/ م٩٩٢].

**ژ ئەحنەفێ كورێ قەیسی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز روینشتمە دەڤ كۆمەكا قورەیشییان، ئینا زەلامەكێ پرچ و جلك و سەروبەر زڤر هات هەتا هاتییە هنداڤ سەرێ وان، سلاڤ كرە وان و پاشی گۆت: مزگینییێ بدە وان یێت مالی ددانە سەرێك ب ببەرێت گەرم ل سەر ئاگرێ جەهنەمێ دهێنە گەرمكرن و دێ دانە سەر بشكۆژكا مەمكێ هەر ئێكی ژ وان هەتا ل هەستییێ ملێ وی دەرد كەڤیت، و دێ دانە سەر هەستییێ ملێ وی هەتا ل بشكۆژكا مەمكێ وی دەرد كەڤیت و دێ هەژیێت، پا شی پشتا خۆ دا وان چۆ ل دەڤ ستوینەكێ روینشت، و ئەز د دویڤ ویرا چۆم و ل دەڤ وی روینشتمە خوارێ و ئەز نوزانم كا ئەو كییە، ئینا من گۆتە وی: ئەز دبینم ئەو خەلك ب ئاخفتنا تە گۆتی نەخۆش بوون؟ گۆت: ب راستی ئەو چو تێناگەهن.**

**گۆت: هەڤالێ من گۆتە من: من گۆت: و هەڤالێ تە كییە؟ گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەی ئەبا زەرِ تو ئوحودێ دبینی)؟ گۆت: من بەرێ خۆ دا رۆژێ و كا چەند ژ رۆژێ مایە و من هزر دكر پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دێ من ڤرێكەتە هەوجەییەكێ، ئینا من گۆت: بەلێ، گۆت: (من نەڤێت من وەكی چیایێ ئوحودێ زێر هەبا و ئەز بهێلم و من دڤیا ئەز هەمییێ بكەمە خێر سێ دینار نەبن)، و ئەڤە تێناگەهن، ئەو بەس بۆ دنیایێ كۆم دكەن، نە ب خودێ ئەز داخوازا دنیایێ ژ وان ناكەم و پرسیارا دینی ژی ژ وان ناكەم هەتا دگەهمە خودایێ خۆ.**

٣٨٤٩ - (خ) عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: مَرَرْتُ بِالرَّبَذَةِ، فَإِذَا أَنَا بِأَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه، فَقُلْتُ لَهُ: ما أَنْزَلَكَ مَنْزِلكَ هَذَا؟ قَالَ: كُنْتُ بِالشَّامِ، فَاخْتَلَفْتُ أَنَا وَمُعَاوِيَةُ فِي: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة:٣٤] . قَالَ مُعَاوِيَةُ: نَزَلَتْ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ، فَقُلْتُ: نَزَلَتْ فِينَا وَفِيهِمْ، فَكَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ فِي ذاكَ، وَكَتَبَ إِلَى عُثْمانَ رضي الله عنه يَشْكُونِي، فَكَتَبَ إِلَيَّ عُثْمانُ أَنِ اقْدَمِ المدِينَةَ، فَقَدِمْتُهَا، فَكَثُرَ عَلَيَّ النَّاسُ، حَتَّى كَأَنَّهُمْ لَمْ يَرَوْنِي قَبْلَ ذلِكَ، فَذَكَرْتُ ذَاكَ

لِعُثْمانَ، فَقَالَ لِي: إِنْ شِئْتَ تَنَحَّيْتَ، فَكُنتَ قَرِيباً. فَذَاكَ الَّذي أَنْزَلَنِي هَذَا المَنْزِلَ، وَلَوْ أَمَّرُوا عَلَيَّ حَبَشِيّاً لَسَمِعْتُ وَأَطَعْتُ. [خ١٤٠٦].

**ژ زەیدێ كوڕێ وەهبی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز د رەبەزێرا بۆریم من ئەبو زەڕ ل وێرێ دیت، ئینا من گۆتە وی: چ تو ئینایە ڤی جهی؟ گۆت: ئەز ل شامێ بووم، ئەز و موعاویەیە د ڤێدا جودا چۆین ﴿وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ موعاویەیەی گۆت: ئەڤە د خودان كتێباندا یا هاتییە خوارێ، من گۆت: د مە و واندا یا هاتییە خوارێ، و ئەڤە د ناڤبەرا من و ویدا بوو، و نڤیسار بۆ عوسمانی نڤیسی سكالا ل من كر، ئینا عوسمانی بۆ من نڤیسی وەرە مەدینەیێ، ئەز هاتمە مەدینەیێ خەلك ل سەر من كۆم بوو هەروەكو وان بەری هینگێ ئەز نەدیتیمە، و من ئەو بەحس بۆ عوسمانی كر، ئینا گۆتە من، ئەگەر تە بڤێت خۆ ڤەدەركە و تو یێ نێزیك بی، ئەها ئەڤی ئەز ئینامە ڤی جهی و ئەگەر حەبەشییەكی ل سەر من بكەنە میر ئەز دێ گوهدارییێ كەم و گوهێ خۆ دەمێ.**

٣٨٥٠ - عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**مَا أَظَلَّتِ الْخَضْرَاءُ، وَلاَ أَقَلَّتِ الْغَبْرَاءُ، أَصْدَقَ مِنْ أَبِي ذَرٍّ**). [ت٣٨٠١/ جه١٥٦].

* صحيح.

**ژ عەبدوللایێ كوڕێ عەمری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: ( عەسمانی سیبەر ل كەسێ نەكریە، و عەردی كەس هەلنەگرتییە ژ ئەبی زەڕی راستگۆتر بیت).**

**١٦. باب: مناقب عمار رضي الله عنه**

**بابەتێ: نافدێرییێت عەمماری (رضي الله عنه).**

٣٨٥١ - (خ) عَنْ عِكْرِمَةَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ وَلاِبْنِهِ عَلِيٍّ: انْطَلِقَا إِلَى أَبِي سَعِيدٍ، فَاسْمَعَا مِنْ حَدِيثِهِ، فَانْطَلَقْنَا، فَإِذَا هُوَ فِي حَائِطٍ يُصْلِحُهُ، فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَاحْتَبَى، ثُمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّثُنَا، حتَّى أَتَى ذِكْرُ بِنَاءِ المَسْجِدِ، فَقَالَ: كُنَّا نَحْمِلُ لَبِنَةً لَبِنَةً، وَعَمَّارٌ لَبِنَتَيْنِ لَبِنَتَيْنِ، فَرَآهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَيَنْفُضُ التُّرَابَ عَنْهُ، وَيَقُولُ: (**وَيْحَ عَمَّارٍ! تَقْتُلُهُ الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ، يَدْعُوهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ، وَيَدْعُونَهُ إِلَى النَّارِ**). قَالَ: يَقُولُ عَمَّارٌ: أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الْفِتَنِ. [خ٤٤٧].

**ژ عیکریمەیی (رحمه الله) گۆت: ئیبن عەباسی گۆتە من و کورێ خۆ عەلی، هەر نە دەڤ ئەبی سەعیدی و گوهێ خۆ بدە نە ئاخفتنێت وی، ئەم چۆین، مە دیت یێ ل ناڤ بیستانەکی سەروبەر دکەت، ئینا عەبایێ خۆ ئێخستە پشت و چۆکێت خۆ و پاشی دەستهاڤێتێ بۆ مە ئاخفت هەتا هاتی بەحسێ ئاڤاکرنا مزگەفتێ کری، ئینا گۆت: مە لبنە لبنە هەلدگرت و عەمماری دو لبنە دو لبنە هەلدگرتن، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) ئەو دیت و تۆز ژ سەرێ وی داقوتا و گۆت: (وەی بۆ عەمماری کۆما ستەمکار دێ وی کوژن ئەو بۆ بەحەشتێ گازی وان دکەت و ئەو بۆ جەهنەمێ گازی وی دکەن).**

١٧. باب: مناقب بلال بن رباح رضي الله عنه

**بابەتێ: ناڤدێرییێت بیلالێ کورێ رەباحی (رضي الله عنه).**

٣٨٥٢ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ لِبِلاَلٍ عِنْدَ صَلاَةِ الْفَجْرِ: (**يَا بِلاَلُ! حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الجَنَّةِ**). قَالَ: مَا عَمِلْتُ عَمَلاً أَرْجى عِنْدِي: أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُوراً، فِي سَاعَةِ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ؛ إِلاَّ صَلَّيْتُ بِذلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ. [خ١١٤٩/ م٢٤٥٨].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە بیلالی: (یا بیلال بۆ من بێژە کارێ ژ هەمیان ب هیڤیتر تە د ئیسلامێدا کری چییە، ب راستی من ل پێشییا خۆ د بەحەشتێدا گوه ل تەپتەپا نەعالێت تە دبوو)، گۆت: من چو کار نەکرینە دەڤ من ب هیڤیتر ژ هندێ من دەستنڤێژا خۆ نەشویشتییە د هەر دەمەکیدا بیت ژ شەڤێ یان ژ رۆژێ هەکە من ب وێ دەستنڤێژێ هندی خودێ بۆ من نڤیسین نڤێژ نەکربن.**

٣٨٥٣ - (خ) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ عُمَرُ يَقُولُ: أَبُو بَكْرٍ سَيِّدُنَا، وَأَعْتَقَ سَيِّدَنَا. يعني: بِلاَلاً. [خ٣٧٥٤].

**ژ جابرێ کورێ عەبدوللایی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: عومەری دگۆت: ئەبوبەکر سەردارێ مەیە و سەردارێ مە ئازا کر، ئانکو: بیلال.**

## ١٨. باب: فضائل سلمان وصهيب رضي الله عنهما

## بابەتێ: باشییێت سەلمانی و سوهەیبی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت).

٣٨٥٤ - (م) عَنْ عَائِذِ بْنِ عَمْرٍو: أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَتَى على سَلْمَانَ وَصُهَيْبٍ وَبِلاَلٍ فِي نَفَرٍ، فَقَالُوا: وَاللهِ مَا أَخَذَتْ سُيُوفُ اللهِ مِنْ عُنُقِ عَدُوِّ اللهِ مَأْخَذَهَا. قَالَ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَتَقُولُونَ هَذَا لِشَيْخِ قُرَيْشٍ وَسَيِّدِهِمْ؟ فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرَهُ. فَقَالَ: **(يَا أَبَا بَكْرٍ لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ، لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لَقَدْ أَغْضَبْتَ رَبَّكَ)**.

فَأَتَاهُمْ أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ: يَا إِخْوَتَاهْ أَغْضَبْتُكُمْ؟ قَالوا: لاَ، يَغْفِرُ اللهُ لَكَ يَا أُخَيَّ. [م٢٥٠٤].

**ژ عائیزێ كورێ عەمری (رضي الله عنه)، گۆت: ئەبو سوفیان د گەل چەند مرۆڤەكان د بەر سەلمانی و سوهەیبی و بیلالیڕا بۆرین، گۆتن: ب خودێ شیرێت خودێ حەقێ خۆ ژ دژمنێ خودێ[1] نەوەرگرت: ئەبوبەكری (رضي الله عنه) گۆت: هوین ڤێ دبێژنە رویسپییێت قورەیشییان و سەرۆكێ وان؟ هات دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) گۆتێ: گۆت: ئەی ئەبا بەكر دترسم تە كەربێت وان ڤەكربن؟ هەكە تە كەربێت وان ڤەكربن ب راستی ئەڤە تە خودێ نەرازی كر؟ هاتە دەڤ وان و گۆت: برایێت من ما من كەربێت هەوە ڤەكرن؟ گۆتن: نەخێر، خودێ گونەهێت تە ژێ ببەت ئەی برا.**

## ١٩. باب: مناقب أَبي هريرة رضي الله عنه

## بابەتێ: ناڤدێرییێت ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه).

٣٨٥٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: يَقُولُونَ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ يُكْثِرُ الحَدِيثَ، وَاللهُ المَوْعِدُ. وَيَقُولُونَ: ما لِلْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ لاَ يُحَدِّثُونَ مِثْلَ أَحَادِيثِهِ؟ وإِنَّ إِخْوَتِي مِنَ المهَاجِرِينَ كانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ، وَإِنَّ إِخْوَتِي مِنَ الأَنْصَارِ كانَ يَشْغَلُهُمْ عَمَلُ أَمْوَالِهِمْ، وَكُنْتُ امْرَأً مِسْكِيناً، أَلْزَمُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَلَى مِلْءِ بَطْنِي، فَأَحْضَرُ حِينَ يَغِيبُونَ، وَأَعِي حِينَ يَنْسَوْنَ، وَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَوْماً: **(لَنْ يَبْسُطَ أَحَدٌ مِنْكُمْ ثَوْبَهُ حَتَّى أَقْضِيَ مَقَالَتِي هذِهِ، ثُمَّ يَجْمَعَهُ إِلَى صَدْرِهِ، فَيَنسى مِنْ مِقَالَتِي شَيْئاً أَبَداً)**. فَبَسَطْتُ نَمِرَةً لَيْسَ عَلَيَّ ثَوْبٌ غَيْرَهَا، حَتَّى قَضى النَّبِيُّ (ﷺ) مَقَالَتَهُ، ثُمَّ جَمَعْتُهَا إِلَى صَدْرِي، فَوَالَّذِي بَعَثَهُ بِالحَقِّ ما نَسِيتُ مِنْ مَقَالَتِهِ تِلْكَ إِلَى يَوْمِي هَذَا. وَاللهِ لَوْلاَ آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللهِ، ما حَدَّثْتُكُمْ شَيْئاً

---

(١) مەخسەدا وان ئەبو سوفیانە بەری موسلمان ببیت.

أَبَداً: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ ٱلرَّحِيمُ﴾ [البقرة: ١٥٩، ١٦٠]. [خ٢٣٥٠ (١١٨)/ م٢٤٩٢]

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: دبێژن ئەبو هورەیرە زێدە فەرمووودەیان دبێژیت، و ژڤانا مە و وان ل دەڤ خودێیە، و دبێژن بۆچی ئەنسار و مشەخت وەكی وی فەرمووودەیان نابێژن؟ و ب راستی برایێت من ژ مشەختان كڕین و فرۆتن و كاروبارێت بازاران ئەو مژویل دكرن، و ب راستی برایێت من ژ ئەنساران كارێ د مالێ واندا ئەو مژویل دكرن، و ئەز مرۆڤەكێ هەژار بووم، بۆ پڕكنا زكێ خۆ ئەز ب پێغەمبەریڤە (ﷺ) یێ گرێدای بووم، ڤێجا دەمێ ئەو نەدهاتن ئەز دهاتم و من ژ بەر دكر دەمێ وان ژ بیر دكر، و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رۆژەكێ گۆت: (نینە ئێك ژ هەوە جلكێ خۆ رائێخیت هەتا ئەز ئاخفتنا خۆ ڤێ تمام دكەم، پاشی بگەهینیتە ئێك و كۆمكەتە سینگێ خۆ ئەگەر ئەو تشتەكی ژ ئاخفتنا من ژبیر بكەت)، ئینا من كراسەكێ هرییێ رەنگ رەنگ رائێخست و ژ وی پێڤەتر ل بەر من نەبوو، هەتا پێغەمبەری (ﷺ) ئاخفتنا خۆ ب دویماهی ئینای، پاشی من كۆمكرە سەر سینگێ خۆ، ڤێجا ئەز ب وی كەمە یێ ب راستییێ هنارتی من چو ژ ئاخفتنا وی هەتا ئەڤرۆ ژبیر نەكرییە، ئەز ب خودێ كەمە ئەگەر ژ بەر دو ئایەتان نەبا د قورئانێدا من چو تشت چو جاران بۆ هەوە نەدگۆت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ هەتا گۆتنا خودێ ﴿ٱلرَّحِيمُ﴾[1].**

٣٨٥٦ - (خ) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثاً عَنْهُ مِنِّي، إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ. [خ١١٣].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: كەسێ ژ هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) پتر ژ من فەرمووودە نەبوون عەبدوللایێ كوڕێ عەمەری نەبیت، ئەو ژی چونكی وی دنڤیسین و من نەدنڤیسین.**

---

(١) كورتییا رامانا هەردو ئایەتان: ب راستی كەسێت نیشانێت ئاشكەراكەر و راستەڕێییا مە ئینایییە خوارێ، پشتی مە بۆ خەلكی د كتێباندا رۆن كری، ڤەدشێرن، خودێ لەعنەتێ ل ڤان دكەت، و لەعنەتكەر ژی لەعنەتان لێ دكەن. ژ بلی وان ئەوێت پشتی هینگێ تۆبە كرین و ڤەنجی كرین و تشتێ ڤەشارتی ئاشكەرا كرین، ئەڤێت هەنێ ئەز دێ تۆبەیێ دەمە سەر وان، و ئەزم تۆبەوەرگر و دلۆڤان.

٣٨٥٧ – (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ وَهِيَ مُشْرِكَةٌ، فَدَعَوْتُهَا يَوْماً فَأَسْمَعَتْنِي فِي رَسُولِ اللهِ (ﷺ) مَا أَكْرَهُ. فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَأَنَا أَبْكِي، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي كُنْتُ أَدْعُو أُمِّي إِلَى الإِسْلاَمِ، فَتَأْبَى عَلَيَّ، فَدَعَوْتُهَا الْيَوْمَ فَأَسْمَعَتْنِي فِيكَ مَا أَكْرَهُ، فَادْعُ اللهَ أَنْ يَهْدِيَ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ.

فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اللَّهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ**) ، فَخَرَجْتُ مُسْتَبْشِراً بِدَعْوَةِ نَبِيِّ اللهِ (ﷺ). فَلَمَّا جِئْتُ فَصِرْتُ إِلَى الْبَابِ، فَإِذَا هُوَ مُجَافٌ، فَسَمِعَتْ أُمِّي خَشْفَ قَدَمَيَّ، فَقَالَتْ: مَكَانَكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، وَسَمِعْتُ خَضْخَضَةَ الْمَاءِ. قَالَ: فَاغْتَسَلَتْ وَلَبِسَتْ دِرْعَهَا وَعَجِلَتْ عَنْ خِمَارِهَا، فَفَتَحَتِ الْبَابَ. ثُمَّ قَالَتْ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. قَالَ: فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَأَتَيْتُهُ وَأَنَا أَبْكِي مِنَ الْفَرَحِ. قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَبْشِرْ قَدِ اسْتَجَابَ اللهُ دَعْوَتَكَ وَهَدَى أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ خَيْراً.

قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، ادْعُ اللهَ أَنْ يُحَبِّبَنِي أَنَا وَأُمِّي إِلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ، وَيُحَبِّبَهُمْ إِلَيْنَا. قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اللَّهُمَّ حَبِّبْ عُبَيْدَكَ هَذَا** . يَعْنِي: أَبَا هُرَيْرَةَ . **وَأُمَّهُ إِلَى عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ، وَحَبِّبْ إِلَيْهِمُ الْمُؤْمِنِينَ**) فَمَا خُلِقَ مُؤْمِنٌ يَسْمَعُ بِي وَلاَ يَرَانِي إِلاَّ أَحَبَّنِي. [م٢٤٩١].

[وانظر: ٣٨٣٠] .

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: دایكا من ژ موشركان بوو و من داخواز دكرە ئیسلامێ، رۆژەكێ من گازیكرە ئیسلامێ و وێ تشتەك د راستا پێغەمبەریدا دا بەر گوهێ من ئەز پێ نەخۆش بووم، ئینا ئەز هاتمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و من دكرە گری، من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ب راستی من دایكا خۆ داخواز دكرە ئیسلامێ و رازی نەدبوو، و ئەڤرۆ من داخواز كر و وێ ئەو د راستا تەدا دا بەر گوهێ من یا من پێ نەخۆش بوویی، ڤێجا دوعا بكە خودێ دایكا ئەبو هورەیرە راستەرێ بكەت.**

**ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەی خودا دایكا ئەبو هورەیرە راستەرێ بكە)، ئەز ب دلخۆشی ب دوعایا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەركەفتم، ڤێجا دەمێ ئەز هاتیمە بەر دەرگەهی، من دیت یێ دایێخستییە، ئینا دایكا من خشخشا پێت من گوه لێ بوو، ئینا گۆت: ل جهێ خۆبە ئەی ئەبا هورەیرە، و من گوه ل شلقە شلقا ئاڤێ بوو، گۆت: خۆ شویشت و كراسێ خۆ كرە بەر خۆ و لەز ل دەرسۆكا خۆ كر، و دەرگەه ڤەكر پاشی گۆت: ئەی ئەبا هورەیرە ئەز شەهدە ددەم كو ب راستی چو پەرستی یێت راست و دورست نینن**

**خودێ نەبیت و ئەز شەهدەیێ ددەم موحەممەد بەندەیێ وییە و پێغەمبەرێ وییە، گۆت: ئەز زڤریمە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ئەز ژ دلخۆشییاندا دکەمە گری، گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ مزگینی بۆ تە خودێ دوعایا تە قەبویل کر و دایکا ئەبو هورەیرە راستەرێ کر، ئینا سوپاسیا خودێ کر و پەسنا وی کر و ئاخفتنا خیرێ گۆت:**

**گۆت: من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ دوعا ژ خودێ بکە دایکا من بۆ باوەریداران خۆشڤی بکەت و باوەریداران بۆ مە خۆشڤی بکەت، گۆت: ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (خودا، ڤی بەندەکۆکی ـ ئانکو ئەبو هورەیرە ـ و دایکا وی ل دەڤ بەندەیێت خۆ یێت باوەریدار خۆشڤی بکە و باوەریداران ل دەڤ وان خۆشڤی بکە)، ڤێجا نینە باوەریدارەکێ خودێ دابیت نافێ من گوه لێ ببیت و ئەز نەدیتم ئەگەر حەژ من نەکەت.**

**٢٠. باب: مناقب عبد الله بن الزبير رضي الله عنهما**

**بابەتێ: نافدێرییێت عەبدوللایێ کوڕێ زوبەیری (خودێ ژ هەردووان رازی بیت).**

٣٨٥٨ - (خ) عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّهُ قَالَ حِينَ وَقَعَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ ابْنِ الزُّبَيْرِ: قُلْتُ: أَبُوهُ الزُّبَيْرُ، وَأُمُّهُ أَسْمَاءُ، وَخالَتُهُ عائِشَةُ، وَجَدُّهُ أَبُو بَكْرٍ، وَجَدَّتُهُ صَفِيَّةُ.[خ٤٦٦٤].

وفي رواية: أَمَّا أَبُوهُ: فَحَوارِيُّ النَّبِيِّ (ﷺ)، يُرِيدُ: الزُّبَيْرَ، وَأَمَّا جَدُّهُ: فَصَاحِبُ الْغَارِ، يُرِيدُ: أَبَا بَكْرٍ، وَأَمَّا أُمُّهُ: فَذَاتُ النِّطَاقِ، يُرِيدُ: أَسْمَاءَ، وَأَمَّا خالَتُهُ: فَأُمُّ المؤْمِنِينَ، يُرِيدُ: عائِشَةَ، وَأَمَّا عَمَّتُهُ: فَزَوْجُ النَّبِيِّ (ﷺ)، يُرِيدُ: خَدِيجَةَ، وَأَمَّا عَمَّةُ النَّبِيِّ (ﷺ): فَجَدَّتُهُ، يُرِيدُ: صَفِيَّةَ، ثُمَّ عَفِيفٌ فِي الإِسْلَامِ، قارِئٌ لِلْقُرْآنِ. [خ٤٦٦٥].

**ژ ئیبن ئەبی مەلیکەیی (رحمه الله) ژ ئیبن عەباسی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمێ ئەوا د نافبەرا وی و کوڕێ زوبەیریدا رویدایی من گۆت: بابێ وی زوبەیرە، و دایکا وی ئەسمایە، و خالەتا وی عائیشایە، و باپیرێ وی ئەبوبەکرە، و داپیرا وی سەفییایە.**

**و د ڤەگێرەکێدا: هندیکە بابێ وییە: ئەو هاریکار و پشتەڤانێ پێغەمبەرییە (ﷺ)، و هندیکە باپیرێ وییە: هەڤالێ شکەفتێیە، مەبەستا وی ئەبوبەکرە، و هندیکە دایکا وییە، خودانا کەمەرێیە، مەبەستا وی ئەسمایە، و هندیکە خالەتا وییە، دایکا باوەریدارانە، و مەبەستا وی عائیشایە، و هندیکە مەتا وییە: ئەو هەڤژینا پێغەمبەرییە (ﷺ) و مەبەستا وی خەدیجەیە، و هندیکە مەتا پێغەمبەرییە (ﷺ) ئەو مەتا وییە مەبەستا وی سەفییایە، پاشی ئەو دەستپاکە د ئیسلامێدا و قورئان خوینە.**

## ٢١. باب: ما جاء في العشرة رضي الله عنهم

## بابەتێ: ئەوا د راستا دەھ كەساندا هاتى (خودێ ژ وان رازى بيت).

٣٨٥٩ - عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعِيدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ فِي الْجَنَّةِ)**. [ت٣٧٤٧].

* صحيح.

**ژ عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئەبو بەكر بەحەشتييە و عومەر بەحەشتييە و عوسمان بەحەشتييە و عەلى بەحەشتييە و تەلحە بەحەشتييە و زوبەير بەحەشتييە و عەبدولرەحمانێ كوڕێ عەوفى بەحەشتييە و سەعد بەحەشتييە و سەعيد بەحەشتييە و ئەبو عوبەيدەيێ كوڕێ جەڕاحى بەحەشتييە).**

## ٢٢. باب: خصائص بعض الصحابة

## بابەتێ: تايبەتمەندييێت هندە سەحابەيان.

٣٨٦٠ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهُمْ فِي أَمْرِ اللهِ عُمَرُ، وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ، وَأَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللهِ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَأَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالْحَلاَلِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِيناً، وَإِنَّ أَمِينَ هَذِهِ الأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ)**.

[ت٣٧٩٠/ جه١٥٤].

* صحيح.

[وانظر: ٤٤٨، ٤٥٣، ٥٢٧] .

- زاد ابن ماجه: (وَأَقْضَاهُمْ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ).

**ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكى (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (دلۆڤانترينێ ئو ممەتا من بۆ ئو ممەتا من ئەبو بەكرە، و تو ندترينێ وان بۆ فەرمانا خودێ عومەرە، و راستگۆترينێ وان د شەرمێدا عوسمانە، و خواندن باشترينێ وان بۆ قورئانێ ئوبەيێ كوڕێ كەعبيە، و زاناترينێ وان ب ميراتگرييێ زەيدێ كوڕێ سابتييە و زاناترينێ وان ب حەلالى و**

**حەرامی موعازێ كوڕێ جەبەلییە، و ب راستی هەر ئوممەتەكێ ئەمینەك یێ هەی[1] و ب راستی ئەمینێ ڤێ ئوممەتێ ئەبو عوبەیدەیێ كوڕێ جەڕاحییە).**

- **ئبن ماجە زێدە كرییە: و زاناترینێ وان ب دادگەرییێ عەلییە.**

## ٢٣. باب: فضل آخر هذه الأمة

## بابەتێ: باشییا دویماهیییێت ڤێ ئوممەتێ.

٣٨٦١ - عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي جُمُعَةَ - رَجُلٍ مِنَ الصَّحَابَةِ - حَدِّثْنَا حَدِيثاً سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). قَالَ: نَعَمْ، أُحَدِّثُكَ حَدِيثاً جَيِّداً: تَغَدَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَمَعَنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَحَدٌ خَيْرٌ مِنَّا؟ أَسْلَمْنَا وَجَاهَدْنَا مَعَكَ؟ قَالَ: **(نَعَمْ، قَوْمٌ يَكُونُونَ مِنْ بَعْدِكُمْ، يُؤْمِنُونَ بِي وَلَمْ يَرَوْنِي)**. [مي٢٧٤٤].

* إسناده صحيح.

ژ ئەبی موخەیرزی (رحمه الله) گۆت: من گۆ تە ئەبی جومعەیی - زەلامەكە ژ سەحابان - بۆ من فەرموودەكێ بێژە، تە ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوهـ لێ ببیت، گۆت: بەلێ ئەز دێ فەرموودەكا خۆش بۆ تە بێژم، مە فراڤین د گەل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خوار و ئەبو عوبەیدەیێ كوڕێ جەڕاحی د گەل مە بوو، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئێك هەیە ژ مە باشتر بیت؟ ئەم موسلمان بووین و مە جیهاد د گەل تە كر؟ گۆت: **(بەلێ، هندە مرۆڤن د دویڤ هەومڕا دێ هێن دێ باوەرییێ ب من ئینن و ئەز نەدیتیمە).**

٣٨٦٢ - عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(مَثَلُ أُمَّتِي مَثَلُ الْمَطَرِ، لاَ يُدْرَى أَوَّلُهُ خَيْرٌ أَمْ آخِرُهُ)**. [ت٢٨٦٩]

* حسن صحيح.

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نموو نەیا ئوممەتا من وەكی بارانێیە، ناهێتە زانین كا دەستپێكا وێ یا ب خێرە یان دویماهییا وێ).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

---

(١) ئەمین: پتر ژ رامانەكێ ددەت: ژ وان ئەوە یێ نەختوبار و یێ راستگو و جهێ باوەرییێ و ئەوە یێ دلسۆز و موخلس و ئەوە یێ ئەمانەتێ دپارێزیت.

## الفصل الرابع: ذكر فضائل بعض الأنصار

## پشكا چوارێ: بەحسكرنا باشييێت ئەنساران.

### ١. باب: مناقب سعد بن معاذ رضي الله عنه

### بابەتێ: ناڤدێرييێت سەعدێ كورێ مەعازى (رضي الله عنه).

٣٨٦٣ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عازِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِثَوْبٍ مِنْ حَرِيرٍ، فَجَعَلُوا يَعْجَبُونَ مِنْ حُسْنِهِ وَلِينِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لَمَنادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الجَنَّةِ، أَفْضَلُ مِنْ هَذَا**). [خ٣٢٤٩/ م٢٤٦٨].

**ژ بەرائێ كورێ عازبى ( خودێ ژ وان رازى ب يت) گۆت: كرا سەكێ ئارمويـ شى بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئينان، خەلكێ دەستهاڤێتێ ژ جوانى و نەرماتييا وى حێبەتى بوون، ئينا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستى كەفيكێت سەعدێ كورێ مەعازى ل بەحەشتى ژ ڤى باشترە).**

٣٨٦٤ - (ق) عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**اهْتَزَّ الْعَرْشُ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ معَاذٍ**). [خ٣٨٠٣/ م٢٤٦٦]

**ژ جابرى (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرى بوو (ﷺ) دگۆت: (عەرشێ خودێ بۆ مرنا سەعدێ كورێ مەعازى هژيا).**

### ٢. باب: مناقب سعد بن عبادة رضي الله عنه

### بابەتێ: ناڤدێرييێت سەعدێ كورێ عوبادەيى (رضي الله عنه).

٣٨٦٥ - (م) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَوْ وَجَدْتُ مَعَ أَهْلِي رَجُلاً، لَمْ أَمَسَّهُ حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**نَعَمْ**) قَالَ: كَلاَّ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ! إِنْ كُنْتُ لأُعَاجِلُهُ بِالسَّيْفِ قَبْلَ ذَلِكَ. قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**اسْمَعُوا إِلَى مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ، إِنَّهُ لَغَيُورٌ، وَأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ، وَاللهُ أَغْيَرُ مِنِّي**). [م١٤٩٨].

**ژ ئەبى هورەيرە (رضي الله عنه) گۆت: سەعدێ كورێ عوبادەيى گۆت: ئەى پێغەمبەرێ خودێ! ئەگەر من زەلامەك د گەل هەڤژينا خۆ ديت، ئەرێ ئەز دەست نەكەمێ هەتا ئەز**

**چوار شاهدان دئینم؟ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بەلێ) گۆت: نەخێر[1]، ئەز ب وی كەمە یێ تو ب راستییێ هنارتی، ئەز بەری ڤێ دێ بۆ لەزێ ل شیری كەم، پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (گوهێ خۆ بدەنە وێ یا سەرداری هەوە دبێژیت ئەو مرۆڤەكێ ب غیرەتە و ئەز ژ وی ب غیرەتترم و خودێ ژ من ب غیرەتترە)[2].**

٣. باب: مناقب أنس بن مالك رضي الله عنه

**بابەتێ: ناڤدێرییێت ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه).**

٣٨٦٦ - (ق) عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَنَسٌ خادِمُكَ، ادْعُ اللهَ لَهُ، قالَ: (**اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ**). [خ٦٣٧٩/ م٢٤٨٠].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه)، ژ ئوم سولەیمی وێ گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەنەس خزمەتكارێ تەیە، دوعا بۆ ژ خودێ بكە، گۆت: (ئەی خودا مال و زارۆكێت وی زێدە بكە، و بەرەكەتێ بۆ بێخە وێ یا تو ددەیە وی).**

٣٨٦٧ - (خ) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قالَ: لَمْ يَبْقَ مِمَّنْ صَلَّى الْقِبْلَتَيْنِ غَيْرِي. [خ٤٤٨٩].

**ژ ئەنەسی (رضي الله عنه) گۆت: كەس ژ وان كەسان نەمایە ئەوێت نڤێژ ل بەر دو قیبلەیان كری ئەز نەبم.**

٤. باب: مناقب حسان بن ثابت رضي الله عنه

**بابەتێ: ناڤدێرییێت حەسسانێ كورێ سابتی (رضي الله عنه).**

٣٨٦٨ - (ق) عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه قالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ) لِحَسَّانَ: (**اهْجُهُمْ . أَوْ هَاجِهِمْ . وَجِبْرِيلُ مَعَكَ**). [خ٣٢١٣/ م٢٤٨٦]

**ژ بەرائێ كورێ عازبی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە حەسسانی: (باڤێژە وان ـ یان هێرشا وان بكە ـ و جبریل یێ د گەل تە).**

---

(١) زانایێ نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: مەبەستا وی نەئەوە ئاخفتنا پێغەمبەری (ﷺ) ومرنەگریت، بەلێ وی سروشتێ خۆ یێ مرۆڤی دیار كر نەشێت خۆ بگریت و كارەكی نەكەت.

(٢) ئانكو: ب راستی كەس وەكی خودێ ب گونەهێ یێ پێ نەخۆش نینە و خودێ پێ نەخۆشە فەرمانێت وی ب جه نەهێن و بێنەمریيا وی بهێتە كرن و زنا نەگوهداری و بێنەمرییە و خودێ پتری هەمیا نەڤێت و پێنەخۆشە بەلێ ئەڤە فەرمانا وییە.

٣٨٦٩ - (م) عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (**اهْجُوا قُرَيْشاً، فَإِنَّهُ أَشَدُّ عَلَيْهَا مِنْ رَشْقٍ بِالنَّبْلِ**) فَأَرْسَلَ إِلَى ابْنِ رَوَاحَةَ فَقَالَ: (**اهْجُهُمْ**) فَهَجَاهُمْ فَلَمْ يُرْضِ. فَأَرْسَلَ إِلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ. فَلَما دَخَلَ عَلَيْهِ، قَالَ حَسَّانُ: قَدْ آنَ لَكُمْ أَنْ تُرْسِلُوا إِلَى هَذَا الأَسَدِ الضَّارِبِ بِذَنَبِهِ. ثُمَّ أَدْلَعَ لِسَانَهُ فَجَعَلَ يُحَرِّكُهُ. فَقَالَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَفْرِيَنَّهُمْ بِلِسَانِي فَرْيَ الأَدِيمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**لاَ تَعْجَلْ، فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ أَعْلَمُ قُرَيْشٍ بِأَنْسَابِهَا، وَإِنَّ لِي فِيهِمْ نَسَباً، حَتَّى يُلَخِّصَ لَكَ نَسَبِي**) فَأَتَاهُ حَسَّانُ. ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، قَدْ لَخَّصَ لِي نَسَبَكَ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لأَسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعَرَةُ مِنَ الْعَجِينِ.

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ لِحَسَّانٍ: (**إِنَّ رُوحَ الْقُدُسِ لاَ يَزَالُ يُؤَيِّدُكَ، مَا نَافَحْتَ عَنِ اللهِ وَرَسُولِهِ**).

وَقَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**هَجَاهُمْ حَسَّانُ فَشَفَى وَاشْتَفَى**).

قَالَ حَسَّانُ:

هَجَوْتَ مُحَمَّداً فَأَجَبْتُ عَنْهُ     وَعِنْدَ اللهِ فِي ذَاكَ الْجَزَاءُ

هَجَوْتَ مُحَمَّداً بَرّاً تَقِيّاً     رَسُولَ اللهِ شِيمَتُهُ الْوَفَاءُ

فَإِنَّ أَبِي وَوَالِدَهُ وَعِرْضِي     لِعِرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُمْ وِقَاءُ[م٢٤٩٠].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (بافێژە قورەیشییان، ب راستی ئەو هافێتن ل سەر وان ژ تیربارینێ دژوارترە)، و فرێكرە دویف ئیبن رەواحەیرا و گۆتی: (بافێژە وان)، بەلێ دلێ پێغەمبەری (ﷺ) هین نەكر، ئینا فرێكرە دویف كەعبێ كورێ مالكیرا و پاشی فرێكرە دویف حەسسانێ كورێ سابتیرا، ڤێجا دەمێ هاتیە دەڤ، حەسسانی گۆت: ب راستی ئەو دەم هات هوین بهنێرنە دویف وی شێرێ ب ئەزمانێ خۆ شكاندنێ دكەت[١]، پاشی ئەزمانێ خۆ د ناڤبەرا لێڤێت خۆدا دەرئێخست و ئینا و بر[٢] ئینا گۆت: ئەز ب وی كەمە یێ تو ب راستییێ هنارتی، ئەز دێ ب ئەزمانێ خۆ وان پارچە پارچەكەم كا چاوە كەڤلێ گەماركری دهێتە پار چە پار چەكرن، ئینا پێغەمبەرێ خودێ**

---

(١) مەخسەدا وی ئەوە ب خۆیە.

(٢) هەروەكی یێ بەرهەڤییا خۆ دكەت بۆ هۆزان گۆتنێ و هێرشكرنێ ب هۆزانێ.

**(ﷺ) گۆت: ( لەزێ نە کە، ب راستی ئەبو بەکر ب بابکێت قورەیشییان ژ وان هەمیان زاناترە، و ب راستی من ژی بابکەك یێ د گەل وان هەی، هەتا بابکێ من بۆ تە ئاشکرا دکەت)**، ئینا حەسسان هاتە دەڤ ئەبو بەکری و پاشی زڤریڤە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) و گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بێ گۆمان بابکێ تە بۆ من ئاشکەرا کر، ئەز ب وی کەمە یێ تو ب راستییێ هنارتی ئەز دێ تە ژ ناڤ وان ب سلامەت کێشم هەروەکی موی ژ ناڤ هەڤیری دهێتە کێشان.

عائیشایێ گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆتە حەسسانی: **(ب راستی جبریل بەردەوام پشتەڤانییا تە دکەت هندی تو بەرەڤانییێ ژ دینێ خودێ و پێغەمبەرێ وی بکەی)**.

وێ گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: **(حەسسانی هاڤێتە وان د لێ موسلمانان هین کر و دلێ خۆ ژی هین کر.**

حەسسانی گۆت:

تە هاڤێتە موحەممەدی و من بەرسڤ پێشڤە دا و خێرا ڤی کاری یا ل دەڤ خودێ

تە هاڤێتە موحەممەدێ چاك و پاك و پارێزکار پێغەمبەرێ خودێیە و رەوشتێ وی ئەختوبارییە

ب راستی بابێ من و باپیرێ من و حورمەتا من بۆ حورمەتا موحەممەدی ژ هێرشا هەوە پارێزەرە.

٥. باب: مناقب عبد الله بن سلام رضي الله عنه

## بابەتێ: ناڤدێرییێت عەبدوللایێ کورێ سەلامی (رضي الله عنه).

٣٨٧٠ - (ق) عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: كُنْتُ جالِساً فِي مَسْجِدِ المدِينَةِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ عَلَى وَجْهِهِ أَثَرُ الخُشُوعِ، فَقَالُوا: هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ تَجَوَّزَ فِيهِمَا، ثُمَّ خَرَجَ، وَتَبِعْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّكَ حِينَ دَخَلْتَ المسْجِدَ قالُوا: هَذَا رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، قالَ: وَاللهِ! ما يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَقُولَ ما لاَ يَعْلَمُ، وَسَأُحَدِّثُكَ لِمَ ذَاكَ: رَأَيْتُ رُؤْيَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَصَصْتُهَا عَلَيْهِ، وَرَأَيْتُ كَأَنِّي فِي رَوْضَةٍ. ذَكَرَ مِنْ سَعَتِهَا وَخُضْرَتِهَا. وَسْطَهَا عَمُودٌ مِنْ حَدِيدٍ، أَسْفَلُهُ فِي الأَرْضِ وَأَعْلاَهُ فِي السَّمَاءِ، فِي أَعْلاَهُ عُرْوَةٌ، فَقِيلَ لِي: ارْقَهْ، قُلْتُ: لاَ أَسْتَطِيعُ، فَأَتَانِي مِنْصَفٌ، فَرَفَعَ ثِيَابِي مِنْ خَلْفِي، فَرَقِيتُ حَتَّى كُنْتُ فِي أَعْلاَهَا،

فَأَخَذْتُ بِالْعُرْوَةِ، فَقِيلَ لِي: اسْتَمْسِكْ. فَاسْتَيْقَظْتُ وَإِنَّهَا لَفِي يَدِي، فَقَصَصْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، قَالَ: **(تِلْكَ الرَّوْضَةُ: الإِسْلاَمُ، وَذلِكَ الْعَمُودُ: عَمُودُ الإِسْلاَمِ، وَتِلْكَ الْعُرْوَةُ: عُرْوَةُ الْوُثْقى، فَأَنْتَ عَلَى الإِسْلاَمِ حَتَّى تَمُوتَ)**. وَذَاكَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ. [خ٣٨١٣/ م٢٤٨٤].

**ژ قەیسێ كورێ عوبادەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز ل مەدینەیێ ل مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) یێ روینشتی بووم، ئینا زەلام هاتە ژۆر و نیشانێت خودێ ترسییێ ل نافچاڤێت وی دیار بوون، ئینا گۆتن: ئەڤە زەلامەكێ خەلكێ بەحەشتێیە، دو ركعەت كرن و سڤك كرن، و پاشی دەركەفت، و ئەز د دویف ویرا چۆم، ئینا من گۆتێ: ب راستی دەمێ تو هاتییە د مزگەفتێڤە، گۆتن: ئەڤە زەلامەكە خەلكێ بەحەشتێیە، گۆت: ئەز ب خودێ كەمە بۆ كەسێ دورست نینە ئەو وێ بێژیت یا ئەو نەزانیت، و ئەز دێ بێژمە تە بۆچی؟ من خەونەك ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) دیت، و من بۆ وی ڤەگێرا، و من دیت هەروەكی ئەز یێ ل مێرگەكێ- بەحسێ بەرفرەهی و كەسكاتییا وێ كر- و ستوینەكا ئاسنی ل نیڤا وێ بوو، بنێ وێ ل عەردی بوو و سەرێ وێ ل عەسمانی، و سەرێ وێ چمبلەك هەبوو، و گۆتنە من: سەركەڤە، من گۆت: ئەز نەشێم، ئینا خزمەتكارەك هاتە دەڤ من و جلكێت من ژ پشت منڤە بلند كرن، و ئەز سەركەفتم هەتا گەهشتیمە سەرێ وی و من دەست هاڤێتە چمبلی، گۆتنە من: خۆ پێڤە بگرە، و ئەز هشیار بووم و ئەو یا د دەستێ مندا، ئینا من بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ڤەگێرا، ئینا گۆت: (ئەو مێرگ ئیسلامە، و ئەو ستوین ستوینا ئیسلامێیە، و ئەو چنبل چنبلێ موكمە رێكا سەرفەرازییێیە یا فەرمسیان بۆ نەی، و تو دێ ل ئیسلامێ بی هەتا دمری)، و ئەو زەلام عەبدوللایێ كورێ سەلامی بوو.**

٦. باب: مناقب أسيد وعباد رضي الله عنهما

## بابەتێ: نافدێرییێت ئوسەیدی و عەبادەی (خودێ ژ هەردووان رازی بیت).

٣٨٧١ - (خ) عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)، خَرَجَا مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ، وَمَعَهُمَا مِثْلُ الْمِصْبَاحَيْنِ، يُضِيئَانِ بَيْنَ أَيْدِيهِمَا، فَلَمَّا افْتَرَقَا صَارَ مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا وَاحِدٌ، حَتَّى أَتَى أَهْلَهُ. [خ٤٦٥].

- وفي رواية: كَانَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَعَبَّادُ بنُ بِشْرٍ عِنْدَ النَّبِي (ﷺ). [خ٣٨٠٥].

ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: دو هەڤالێت پێغەمبەری (ﷺ) ل شەڤەکا تاری ژ دەڤ دەرکەفتن، وەکی دو لاهێتا ل بەر سینگێ وان د گەل بوون، ڤێجا دەمێ ژێکڤە بووین هەر ئێکی ئێك د گەل بوو هەتا هاتییە مالا خۆ.

- و د ڤەگێڕەکێدا، ئوسەیدێ کوڕێ حوزەیری و عەبادەیێ کوڕێ بیشری ل دەڤ پێغەمبەری بوون (ﷺ).

٧. باب: مناقب البراء بن مالك رضي الله عنه

**بابەتێ: نافدێرییێت بەرائێ کوڕێ مالکی (ﷺ).**

٣٨٧٢ – عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (كَمْ مِنْ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ، لاَ يُؤْبَهُ لَهُ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ، مِنْهُمُ الْبَرَاءُ بْنُ مَالِكٍ). [ت٣٨٥٤].

* صحيح.

ژ ئەنەسێ کوڕێ مالکی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(چەند سەر ڤژەڤژێت تۆزکەیی و خودان دو کراسێت کەڤن هنە، کەس چو پویتەی نادەتێ و چو بۆ نادانیت، هەکە سویندێ ب سەر خودێ بخۆت[1] خودێ دێ سویندا وی ب جھ ئینیت[2] بەرائێ کوڕێ مالکی ژ وانایە).**

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ئانکو: بێژیت ب خودێ خودێ دێ هۆکەتەهە.

(٢) ئانکو: تشتێ سویند بۆ خواری خودێ دێ دەتێ.

## الفصل الخامس: فضل بعض الصحابيات

## پشكا پێنجێ: باشییا هندەك ژ سەحابییان.

### ١. باب: فضل فاطمة رضي الله عنها

### بابەتێ: باشییا فاتیمایێ (رضي الله عنها).

٣٨٧٣ – (ق) عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: إِنَّ عَلِيّاً خَطَبَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، فَسَمِعتْ بِذلِكَ فاطِمَةُ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَزْعُمُ قَوْمُكَ أَنَّكَ لاَ تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ، وَهَذَا عَلِيٌّ نَاكِحٌ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ. فَقَامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)، فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ يَقُولُ: (**أَمَّا بَعْدُ، أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ، فَحَدَّثَنِي وَصَدَقَنِي، وَإِنَّ فاطِمَةَ بَضْعَةٌ مِنِّي، وَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَسُوءَهَا، وَاللهِ! لاَ تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَبِنْتُ عَدُوِّ اللهِ عِنْدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ**). فَتَرَكَ عَلِيٌّ الْخِطْبَةَ [خ٣٧٢٩ (٩٢٦)/ م٢٤٤٩]

**ژ میسوەرێ كورێ مەخرەمەیی (رضي الله عنه) گۆت: عەلی كچا ئەبی جەهلی خواست، ئینا فاتیمایێ ئەڤە گوهـ لێ بوو، ئینا هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و گۆت: مرۆڤێت تە دبێژن: تو بۆ كچێت خۆ تۆرە نابی، و ئەڤە عەلییە دڤێت كچا ئەبی جەهلی مارە بكەت، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابوو و من گوهـ ل وی بوو دەمێ شەهدە دایی دگۆت: (پشتی ڤێ: من كچا خۆ دا ئەبو عاسێ كورێ رەبیعی و وی ئاخفتن دا من و راستی دگەل من گۆت، و ب راستی فاتیما پشكەكە ژ من، و من پێ نەخۆشە تشتەك وێ نەخۆش بكەت، ئەز ب خودێ كەمە كچا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و كچا دژمنێ خودێ ل دەڤ زەلامەكی كۆم نابن)، ئینا عەلی خواستن هێلا.**

٣٨٧٤ – (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: إِنَّا كُنَّا أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (ﷺ) عِنْدَهُ جَمِيعاً، لَمْ تُغَادِرْ مِنَّا وَاحِدَةٌ، فَأَقْبَلَتْ فاطِمَةُ عليها السلام تَمْشِي، وَلاَ وَاللهِ مَا تَخْفى مِشْيَتُهَا مِنْ مِشْيَةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، فَلَمَّا رَآهَا رَحَّبَ وَقالَ: (**مَرْحَباً بِابْنَتِي**). ثُمَّ أَجْلَسَهَا عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ شِمالِهِ، ثُمَّ سَارَّهَا، فَبَكَتْ بُكَاءً شَدِيداً. فَلَمَّا رَأَى حُزْنَهَا سَارَّهَا الثَّانِيَةَ، فَإِذَا هِيَ تَضْحَكُ، فَقُلْتُ لَهَا أَنَا مِنْ بَيْنِ نِسَائِهِ: خَصَّكِ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِالسِّرِّ مِنْ بَيْنِنَا، ثُمَّ أَنْتِ تَبْكِينَ! فَلَمَّا قامَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) سَأَلْتُهَا: عَمَّ سَارَّكِ؟ قالَتْ: ما كُنْتُ لأُفْشِيَ عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ) سِرَّهُ.

فَلَمَّا تُوُفِّيَ، قُلْتُ لَهَا: عَزَمْتُ عَلَيْكِ بِمَا لِي عَلَيْكِ مِنَ الحَقِّ لَمَّا أَخْبَرْتِنِي، قالَتْ: أَمَّا الآنَ فَنَعَمْ، فَأَخْبَرَتْنِي، قالَتْ: أَمَّا حِينَ سَارَّنِي في الأَمْرِ الأَوَّلِ، فَإِنَّهُ أَخْبَرَنِي: أَنَّ جِبْرِيلَ كانَ يُعَارِضُهُ بِالْقُرْآنِ كُلَّ سَنَةٍ مَرَّةً، (**وَإِنَّهُ قَدْ**

عارَضَنِي بِهِ الْعامَ مَرَّتَيْنِ، وَلاَ أَرَى الأَجَلَ إِلاَّ قَدِ اقْتَرَبَ، فَاتَّقِي اللهَ وَاصْبِرِي، فَإِنِّي نِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ). قالَتْ: فَبَكَيْتُ بُكائِي الَّذِي رَأَيْتِ، فَلَمَّا رَأَى جَزَعِي سَارَّنِي الثَّانِيَةَ، قَالَ: (يَا فَاطِمَةُ، أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ سَيِّدَةَ نِسَاءِ هذِهِ الأُمَّةِ). [خ٦٢٨٥ و٦٢٨٦ (٣٦٢٣، ٣٦٢٤)/ م٢٤٥٠].

ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەم ژنێت پێغەمبەری (ﷺ) ل دەڤ وی بووین، فاتیما (رضي الله عنها) ب بەر مەڤە دهات، رێڤەچۆنا وێ تشتەکی ژ رێڤەچۆنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خەلەت ناکەت، دەمێ دیتی خێرهاتن پێ کر، و گۆت: **(ب خێر هاتی کچا من)**. پاشی رەخێ خۆ یێ راستێ یان یێ چەپێ دانا، پاشی نهێنییەك بۆ کر، کرە گری گرییەکا حێل، دەمێ وەستیانا وێ (کەفتنا وێ ژبەر گرانییا وی بەحسی) دیتی بۆ جارا دووێ نهێنی بۆ کرەڤە، کرە کەنی، من گۆتێ: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) تو ب نهێنییان د ناڤ ژنێت خۆدا تایبەت کری پاشی تو دکەیە گری؟ و دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) رابووی، من پرسیارا وێ کر: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چ گۆتە تە؟ گۆت، ئەز نەئەوم نهێنییا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئاشکرا بکەم.

ڤێجا دەمێ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەمرێ خودێ کری، من گۆت: ئەز ب وی حەقێ من ل سەر تە هەی[1] تە ددەمە سویندێ هەکە تو بۆ من نەبێژی کا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چ گۆتە تە؟ گۆت: ڤێ گاڤێ بلا، دەمێ جارا ئێکێ نهێنی بۆ من کری گۆتە من: **(جبریلی هەرسال جارەکێ یان دو جاران قورئان د گەل دخواند، بەلێ ڤێ گاڤێ دو جاران د گەل یا خواندی، و ئەز دبینم دویماهییا من یا نێزیك بووی، ڤێجا تەقوا خودێ بکە و سەبرێ بکێشە ئەز باشترین پێشاییمە بۆ تە)**، من کرە گری ئەو گرییا تە دیتی، و دەمێ بێتاقەتییا من دیتی جارەکا دی نهێنییا من کر و گۆت: **(یا فاتیمە ما تو یا رازی نینی ببیە سەروەرا ژنێت موسلمانان، یان سەروەرا ژنێت ڤێ ئوممەتێ)**؟ من کرە کەنی کەنییا تە دیتی.

٣٨٧٥ - عَنْ عَائِشَةَ ـ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ـ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَشْبَهَ سَمْتاً وَدَلاًّ وَهَدْياً بِرَسُولِ اللهِ فِي قِيَامِهَا وَقُعُودِهَا مِنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [د٥٢١٧/ ت٣٨٧٢].

(١) ئەو حەق ئەڤەیە: جارەکێ ژنبابا وێیە و جارەکێ دایکا هەمی موسلمانایە.

* صحيح.

**ژ عائیشایێ دایكا باوەریداران (رضي الله عنها) گۆت: ب راستی من كەس نەدیتیە ب سەرو سیما و سالۆخەت و راستەرێییڤە ب پێغەمبەری ڤە (ﷺ) چۆبیت د رابوون و روینشتنا خۆدا وەكی فاتیمایێ كچا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ).**

**٢. باب: فضل خديجة رضي الله عنها**

**بابەتێ: باشییا خەدیجایێ (رضي الله عنها).**

٣٨٧٦ - (ق) عَنْ عليٍّ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: (**خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ**). [خ٣٤٣٢/ م٢٤٣٠].

**ژ عەلی (رضي الله عنه) گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەری بوو (ﷺ) دگۆت: (باشترین ژنا ل عەردی مەریەما كچا عیمرانییە و باشترین ژنا ل عەردی خەدیجایە).**

٣٨٧٧ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: أَتَى جِبْرِيلُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! هذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْ، مَعَهَا إِنَاءٌ فِيهِ إِدَامٌ أَوْ طَعَامٌ أَوْ شَرَابٌ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْكَ فَاقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنْ رَبِّهَا وَمِنِّي، وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لاَ صَخَبَ فِيهِ وَلاَ نَصَبَ. [خ٣٨٢٠/ م٢٤٣٢].

**ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: جبریل هاتە دەڤ پێغەمبەری (ﷺ) ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەڤە خەدیجە یە دهێت ئامانەك یێ ڤێ پێ خوارن یا خوران یان ڤەخوارنەك یا تێدا، ڤێجا ئەگەر هاتە دەڤ تە سلاڤان ژ لایێ خودایێ وێڤە و ژ لایێ منڤە لێ بكە، و مزگینیێ ب مالەكا ژ لوئلوئێ خلۆلە د بەحەشتێدا بدەیێ، نە ڤێژی و قەرەبالغ تێدایە نە وەستیان.**

٣٨٧٨ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: ما غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) ما غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ، هَلَكَتْ قَبْلَ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي، لِمَا كُنْتُ أَسْمَعُهُ يَذْكُرُهَا، وَأَمَرَهُ اللهُ أَنْ يُبَشِّرَهَا بِبَيْتٍ مِنْ قَصَبٍ، وَإِنْ كانَ لَيَذْبَحُ الشَّاةَ فَيُهْدِي فِي خَلاَئِلِهَا مِنْهَا ما يَسَعُهُنَّ. [خ٣٨١٦/ م٢٤٣٥].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: ئەز ل سەر چو هەڤسەرێت پێغەمبەری (ﷺ) غیرەت و گر نەچۆم وەكی ئەز ل سەر خەدیجایێ (رضي الله عنها) غیرەت چۆیم، ئەو مر بوو بەری من مارە بكەت، هندی من گوهـ لێ دبوو بەحسێ وێ دكر و خودێ فەرمانا وی كر ئەو**

**مزگینییێ ب مالەكا ژ لوئلوئێ خلۆلە د بەحەشتێدا بدەتێ، و پەز فەدكوشت و ژێ د كرە دیاری بۆ هەڤالێت وێ هندی تێرا وان كربا.**

## ٣. باب: فضل عائشة رضي الله عنها

## بابەتێ: باشییا عائیشایێ (رضي الله عنها).

٣٨٧٩ - (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قالَ لَهَا: (**يَا عائِشَةُ! هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلاَمَ**). فَقَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ، تَرَى ما لاَ أَرَى. تُرِيدُ النَّبِيَّ (ﷺ). [خ٣٢١٧/ م٢٤٤٧].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (ئەی عائیشا، ئەڤە جبریلە سلاڤان ل تە دكەت)، گۆت: من گۆت: سلاڤێت خودێ و دلۆڤانییا وی و بەرەكەت و زێدەیی و پیرۆزییا وی ل سەر بن. تشتێ تو دبینی ئەز نابینم مەبەستا وێ پێغەمبەرە (ﷺ).**

٣٨٨٠ - (ق) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ، كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ**). [خ٣٧٧٠/ م٢٤٤٦].

**ژ ئەنەسێ كورێ مالكی (رضي الله عنه) گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) د گۆت: (باشییا عائیشایێ ل سەر ژنان وەكی باشییا تەشریبێیە ل سەر هەمی خوارنێت دی).**

٣٨٨١ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها قالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنِّي لأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى**). قالَتْ: فَقُلْتُ: مِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذلِكَ؟ فَقَالَ: (**أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، فَإِنَّكِ تَقُولِينَ: لاَ وَرَبِّ مُحَمَّدٍ، وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى، قُلْتِ: لاَ وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ**). قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ وَاللهِ يَا رَسُولَ اللهِ، ما أَهْجُرُ إِلاَّ اسْمَكَ. [خ٥٢٢٨/ م٢٤٣٩].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆتە من: (ب راستی ئەز دزانم ئەگەر تو ژ من یا رازی بی و ئەگەر تو ژ من یا تۆڕەبی)، وێ گۆت: من گۆت: تو ژ چ دزانی؟ ئینا گۆت: (ئەگەر تو یا رازی بی تو دبێژی: نەخێر، ب خودایێ موحەممەد كەمە، و ئەگەر تو یا تۆڕەبی دبێژی: نەخێر، ب خودایێ ئیبراهیم كەمە) وێ گۆت: من گۆت: بەلێ ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز چو ناهێلم ناڤێ تە نەبیت.**

٣٨٨٢ - (ق) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّاسَ كانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عائِشَةَ، يَبْتَغُونَ بِهَا . أَوْ يَبْتَغُونَ بِذلِكَ . مَرْضَاةَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ). [خ٢٥٧٤/ م٢٤٤١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: خەلك ل رۆژا عائیشایێ د گەریان د یاری بۆ پێغەمبەری (ﷺ) دئینان و رازیبوونا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب ڤی كاری دخواست.**

٣٨٨٣ - (خ) عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ: أَنَّ عائِشَةَ اشْتَكَتْ، فَجَاءَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقَالَ: يَا أُمَّ المؤْمِنِينَ، تَقْدَمِينَ عَلَى فَرَطِ صِدْقٍ، عَلَى رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَعَلَى أَبِي بَكْرٍ. [خ٣٧٧١].

- وفي رواية قالَ: استَأْذَنَ ابْنُ عَبَّاسٍ ـ قَبْلَ مَوْتِهَا ـ عَلَى عائِشَةَ، وَهِيَ مَغْلُوبَةٌ، قالَتْ: أَخْشى أَنْ يُثْنِيَ عَلَيَّ، فَقِيلَ: ابْنُ عَمِّ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَمِنْ وُجُوهِ المسْلِمِينَ، قالَتْ: ائْذَنُوا لَهُ، فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدِينَكِ؟ قالَتْ: بِخَيْرٍ إِنِ اتَّقَيْتُ، قالَ: فَأَنْتِ بِخَيْرٍ إِنْ شَاءَ اللهُ، زَوْجَةُ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَلَمْ يَنْكِحْ بِكْراً غَيْرَكِ، وَنَزَلَ عُذْرُكِ مِنَ السَّمَاءِ.

وَدَخَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ خِلاَفَهُ، فَقَالَتْ: دَخَلَ ابْنُ عَبَّاسٍ، فَأَثْنَى عَلَيَّ، وَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ نِسْياً مَنْسِيّاً. [خ٤٧٥٣].

**ژ قاسمێ كورێ موحەممەدی (رحمه الله) گۆت: عائیشا نەساخ بوو، ئینا ئیبن عەباس هاتە دەڤ و گۆت: ئەی دایكا باوەریداران تو دێ چییە دەڤ پێشكەفتییێت راستگۆ ل دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و ل دەڤ ئەبوبەكری.**

- **و د ڤەگێرەكێدا گۆت: ئیبن عەباسی دەستویری خواست ـ بەری مرنا وێ ـ بچیتە دەڤ عائیشایێ و ئەو ژ نەساخییێ یا كەتی بوو ، گۆت ئەز دترسم مەدحێت من بكەت، گۆتنێ: كورێ مامێ پێغەمبەرێ خودێ یە و ئێك ژ رویسپییێت موسلمانانە، گۆت: دەستویرییێ بدەنێ، ئینا گۆت: تو چاوا خۆ دبینی؟ گۆت ئەز یا باشم ئەگەر تەقوا خودێ بكەم، گۆت: تو یا د خێرێدا ب ئانەهییا خودێ، تو هەڤژینا پێغەمبەرێ خودێیی و چو كچ ژ بلی تە مارە نەكرینە و بێگونەهییا تە ژ عەسمانا هاتە خوارێ.**

**و ئیبن زوبەیر د دویڤ ویرا هاتە دەڤ، ئینا وێ گۆت: ئیبن عەباس هاتە دەڤ من و مەدحێت من كرن، و من حەز دكر بەری ئەو مەدحێت من بكەت ئەز تشتەكێ بێ قیمەت و هاڤێتی بامە و هاتبامە ژبیركرن.**

٣٨٨٤ - (خ) عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّهَا أَوْصَتْ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما: لاَ تَدْفِنِّي مَعَهُمْ، وَادْفِنِّي مَعَ صَوَاحِبِي بِالْبَقِيعِ، لا أُزَكَّى بِهِ أَبَدا. [خ١٣٩١].

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها): وێ وەسیەت ل عەبدوللایێ کوڕێ زوبەیری[1] ( خودێ ژ وان رازی بیت) كر: من ل دەڤ وان نەڤەشێرە ـ ل دەڤ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) و ئەبو بەكر ـ و من ل دەڤ هەڤالێت من[2] ل بەقیعێ ڤەشێرە دا پەسنا من ل سەر وان نەهێتە كرن.**

٣٨٨٥ – عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: مَا أَشْكَلَ عَلَيْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) حَدِيثٌ قَطُّ، فَسَأَلْنَا عَائِشَةَ إِلاَّ وَجَدْنَا عِنْدَهَا مِنْهُ عِلْماً. [ت٣٨٨٣].

* صحيح.

**ژ ئەبی مووسایی (رضي الله عنه) گۆت: هیچ فەرموودەیەك ل سەر مە هەڤالێت پێغەمبەرێ خودێ (صلى الله عليه وسلم) ئالۆز نەبوویە و مە پرسیار ژ عائیشایێ كربیت ئەگەر مە زانین ژێ ل دەڤ وێ نەدیتبا.**

## ٤. باب: فضيلة زينب بنت جحش رضي الله عنها

## بابەتێ: باشییا زەینەبا كچا جەحشی (رضي الله عنها).

٣٨٨٦ – (ق) عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ بَعْضَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) قُلْنَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ): أَيُّنَا أَسْرَعُ بِكَ لُحُوقاً؟ قَالَ: (**أَطْوَلُكُنَّ يَداً**). فَأَخَذُوا قَصَبَةً يَذْرَعُونَهَا، فَكَانَتْ سَوْدَةُ أَطْوَلَهُنَّ يَداً، فَعَلِمْنَا بَعْدُ: أَنَّمَا كَانَتْ طُولَ يَدِهَا الصَّدَقَةُ، وَكَانَتْ أَسْرَعَنَا لُحُوقاً بِهِ، وَكَانَتْ تُحِبُّ الصَّدَقَةَ. [خ١٤٢٠/ م٢٤٥٢].

وفي رواية لمسلم: قَالَتْ: فَكَانَتْ أَطْوَلَنَا يداً زَيْنَبُ، لأَنَّهَا كَانَتْ تَعْمَلُ بِيَدِهَا وَتَصَدَّقُ.

**ژ عائیشایێ (رضي الله عنها) گۆت: هندە هەڤژینێت پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) گۆتنێ: كی ژ مە ب لەزتر دێ گەهیتە تە؟ گۆت: ( یا دەستدرێژتر ژ هەوە)، ڤێجا لەڤەنەك هەلگرتن و پێ دپیڤان، و دەستێ سەودەیێ ژ هەمیان درێژتر بوو، پاشی پشتی هینگێ مە زانی درێژییا دەستی ب سەدەقێیە و ئەو ژ مە ب لەزتر گەهشتە وی و وێ حەژ سەدەقەیێ دكر.**

**و د ڤەگێرا موسلمیدا: زینەب ژ هەمیان دەستدرێژتر بوو، چونكی وێ ب دەستێ خۆ شۆل دكر و خێر دكرن و دكرنە سەدەقە.**

(١) دبیتە خوارزایێ وێ، كوڕێ ئەسمائا كچا ئەبوبەكرییە خویشكا وێ.

(٢) مەبەستا وێ هەوییێت وێنە هەڤژینێت پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم).

## ٥. باب: فضيلة أسماء بنت أبي بكر رضي الله عنها

## بابەتێ: باشییا ئەسمائا کچا ئەبی بەکری (خودێ ژ هەردووان رازی بیت).

٣٨٨٧ - (ق) عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ، وَمَا لَهُ فِي الأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلاَ مَمْلُوكٍ، وَلاَ شَيْءٍ غَيْرَ نَاضِحٍ وَغَيْرَ فَرَسِهِ، فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ وَأَسْتَقِي الماءَ، وَأَخْرِزُ غَرْبَهُ وَأَعْجِنُ، وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ، وَكَانَ يَخْبِزُ جارَاتٌ لِي مِنَ الأَنْصَارِ، وَكُنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ، وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرضِ الزُّبَيْرِ . الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) . عَلَى رَأْسِي، وَهْيَ مِنِّي عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ.

فَجِئْتُ يَوْماً وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي، فَلَقِيتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَدَعَانِي ثُمَّ قَالَ: (إِخْ إِخْ). لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ، فاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسِيرَ مَعَ الرِّجالِ، وَذَكَرْتُ الزُّبَيْرَ وَغَيْرَتَهُ وَكَانَ أَغْيَرَ النَّاسِ، فَعَرَفَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أَنِّي قَدِ اسْتَحْيَيْتُ فَمَضى.

فَجِئْتُ الزُّبَيْرَ فَقُلْتُ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللهِ (ﷺ) وَعَلَى رَأْسِي النَّوَى، وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَأَنَاخَ لأَرْكَبَ، فَاسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ.

فَقَالَ: وَاللهِ لَحَمْلُكِ النَّوَى كانَ أَشَدَّ عَلَيَّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ ، قَالَتْ: حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ ذلِكَ بِخَادِمٍ يَكْفِينِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَنِي. [خ٥٢٢٤ (٣١٥١)/ م٢١٨٢].

**ژ ئەسمائا کچا ئەبو بەکری ( خودێ ژ هەردووان رازی ب یت) گۆت: زو بەیری ئەز مارەکرم، و وی چو عەرد و مال و چو خزمەتکار نەبوون، و چو تشت نەبوو، حێشترەکا ئاڤکێشانێ و هەسپێ خۆ نەبیت، و من ئالفێ هەسپی ددایێ و ئاڤ دئینا، و من دورینا کەڤلێ دۆلکێ ئاڤێ یێ مەزن دکر، و من هەڤیر دکر، و من نەدزانی باش نانی بپێژم، و هندە جیرانێت مە یێت ئەنساری نان بۆ مە دپات، و ئەو هندە ژنێت راستگۆ بوون، و من بەرکێت قەسپان ل عەردێ زو بەیری . ئەو پار چەیا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دایێ . ل سەر سەرێ خۆ ڤەدگوهاستن، و ئەو ژ مە دوسێکێت فەرسەخێ یا دویر بوو[1].**

**ئەز رۆژەکێ هاتم: و بەرکێت قەسپان ل سەر سەرێ من بوون، من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت و چەند کەس ژ ئەنساران د گەل بوون، گازی من کر و پاشی گۆت: (ئخ ئخ)[2]**

---

(١) هەر فەرسەخەك دبیتە (٦) کم، و دو سێکێت فەرسەخێ دبنە (٤) کم، ئانکو: ئەو عەرد چوار کیلومەتران ژ مالان دویر بوو.

(٢) ئاخفتنەك دهێتە گۆتن دا حێشتر بکەڤیتە سەر چۆکێت خۆ و روینیت.

**دا من ل پشت خۆ سویار بکەت، ئینا من شەرم کر، و زوبەیر هاتە بیرا من و غیرەتا وی و ئەو ژ هەمی خەلکی ب غیرەتر بوو، ئینا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) زانی من شەرم کر ئینا چۆ.**

**ئینا ئەز هاتمە دەڤ زوبەیری و من گۆتێ: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ئەز د یتم و بەرکێت قەسپان ل سەر سەرێ من بوون و هندەك ژ هەڤالێت وی د گەل بوون، حێشترا خۆ دانا دا سویاربم بەلێ من شەرم ژێ کر و ژبەر غیرەتا تە ئەز سویار نەبووم.**

**ئینا گۆت: ئەز ب خودێ کەمە هەلگرتنا تە بۆ بەرکێت قەسپان ل سەر من گرانترە تو د گەل وی سویار ببای، وێ گۆت: هەتا ئەبو بەکری پشتی هینگێ خزمەتکارەك بۆ من فرێکری سەخبێرییا هەسپی ژ من ڤەکەت هەروەکی وی ئەز ئازا کریم.**

٣٨٨٨ – (خ) عَنْ أَسْمَاءَ رضي الله عنها قَالَتْ: صَنَعْتُ سُفْرَةَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ، حِينَ أَرَادَ أَنْ يُهَاجِرَ إِلَى المدِينَةِ، قَالَتْ: فَلَمْ نَجِدْ لِسُفْرَتِهِ، وَلاَ لِسِقَائِهِ ما نَرْبِطُهُمَا بِهِ، فَقُلْتُ لأَبِي بَكْرٍ: وَاللهِ ما أَجِدُ شَيْئاً أَرْبِطُ بِهِ إِلاَّ نِطَاقِي، قَالَ: فَشُقِّيهِ بِاثْنَيْنِ فَارْبِطِيهِ: بِوَاحِدٍ السِّقَاءَ وَبِالآخَرِ السُّفْرَةَ، فَفَعَلْتُ، فَلِذلِكَ سُمِّيَتْ: ذَاتَ النِّطَاقَيْنِ. [خ٢٩٧٩].

**ژ ئەسمائێ (رضي الله عنها) گۆت: من خوارنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مالا ئەبو بەکری دورست کر دەمێ ڤیای مشەخت ببیتە مەدینەیێ، وێ گۆت: مە چو تشت نەدیت خوارنا وی و جەودکێ ئاڤا وی پێڤە گرێدەین، ئینا من گۆتە ئەبی بەکری: ئەز ب خودێ کەمە ئەز چو نابینم پێڤە گرێدەم ژ شویتکا خۆ پێڤەتر، گۆت: شویتکا خۆ بکە دو کەر، کەرەکی خوارنێ پێ گرێدە و کەرێ دی جەودکێ ئاڤێ پێ گرێدە، و من وەکر و ژ بەر هندێ ئەز ب خودانا دو شویتکان هاتمە نافکرن.**

٣٨٨٩ – (م) عَنْ أَبِي نَوْفَلٍ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ عَلَى عَقَبَةِ الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَجَعَلَتْ قُرَيْشٌ تَمُرُّ عَلَيْهِ وَالنَّاسُ، حَتَّى مَرَّ عَلَيْهِ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، فَوَقَفَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ، أَمَا وَاللهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا. أَمَا وَاللهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا. أَمَا وَاللهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا. أَمَا وَاللهِ إِنْ كُنْتَ، مَا عَلِمْتُ، صَوَّاماً، قَوَّاماً، وَصُولاً لِلرَّحِمِ. أَمَا وَاللهِ لأُمَّةٌ أَنْتَ أَشَرُّهَا لأُمَّةٌ خَيْرٌ.

ثُمَّ نَفَذَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ، فَبَلَغَ الْحَجَّاجَ مَوْقِفُ عَبْدِ اللهِ وَقَوْلُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَأُنْزِلَ عَنْ جِذْعِهِ، فَأُلْقِيَ فِي قُبُورِ الْيَهُودِ. ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى أُمِّهِ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ، فَأَبَتْ أَنْ تَأْتِيَهُ، فَأَعَادَ عَلَيْهَا الرَّسُولَ: لَتَأْتِيَنِّي أَوْ لأَبْعَثَنَّ إِلَيْكِ مَنْ يَسْحَبُكِ بِقُرُونِكِ. قَالَ: فَأَبَتْ وَقَالَتْ: وَاللهِ لاَ آتِيكَ حَتَّى تَبْعَثَ إِلَيَّ مَنْ يَسْحَبُنِي بِقُرُونِي.

قَالَ: فَقَالَ: أَرُونِي سِبْتَيَّ، فَأَخَذَ نَعْلَيْهِ. ثُمَّ انْطَلَقَ يَتَوَذَّفُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: كَيْفَ رَأَيْتِنِي صَنَعْتُ بِعَدُوِّ اللهِ؟ قَالَتْ: رَأَيْتُكَ أَفْسَدْتَ عَلَيْهِ دُنْيَاهُ، وَأَفْسَدَ عَلَيْكَ آخِرَتَكَ. بَلَغَنِي أَنَّكَ تَقُولُ لَهُ: يَا ابْنَ ذَاتِ النِّطَاقَيْنِ! أَنَا وَاللهِ ذَاتُ النِّطَاقَيْنِ. أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكُنْتُ أَرْفَعُ بِهِ طَعَامَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَطَعَامَ أَبِي بَكْرٍ مِنَ الدَّوَابِّ. وَأَمَّا الآخَرُ فِنِطَاقُ الْمَرْأَةِ الَّتِي لاَ تَسْتَغْنِي عَنْهُ. أَمَا إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَدَّثَنَا: **(أَنَّ فِي ثَقِيفَ كَذَّاباً وَمبِيراً)** فَأَمَّا الْكَذَّابُ فَرَأَيْنَاهُ. وَأَمَّا الْمُبِيرُ فَلاَ إِخَالُكَ إِلاَّ إِيَّاهُ. قَالَ: فَقَامَ عَنْهَا، وَلَمْ يُرَاجِعْهَا. [م٢٥٤٥].

**ژ ئەبی نەوفەلی (ﷺ) گۆت: من عەبدوللایێ كوڕێ زوبەیری دیت ب جهێ بلند و ل سەر رێ كا مەدینێ ب دارێ ڤە كر بوو[١] قورەیش و خەلك د بەرڕا د بۆرین، هەتا عەبدوللایێ كوڕێ عومەری د بەرڕا بۆری، ئینا ل دەڤ راوەستا و گۆت: سلاڤ ل سەر تە بن ئەی بابێ خوبەیبی، سلاڤ ل سەر تە بن ئەی بابێ خوبەیبی، سلاڤ ل سەر تە بن ئەی بابێ خوبەیبی، ئەز ب خودێ كەمە و ب راستی من تو ژ ڤێ ددایە پاش، ئەز ب خودێ كەمە و ب راستی من تو ژ ڤێ ددایە پاش، ئەز ب خودێ كەمە و ب راستی من تو ژ ڤێ ددایە پاش، ئەز ب خودێ كەمە من تو نەنیاسییە رۆژیگر و شەڤنڤێژكەر و باشیكەر د گەل مرۆڤێت خۆ نەبی، ئەز ب خودێ كەمە ئوممەتەكێ تو خرابێ وان بی ئەو ئوممەت یا ل سەر خێرێ[٢].**

---

(١) عەقەبە: جهێ بلندە و ل مەكەهێ هاتە داركرن و ل جهەكێ بلند و خەلكێ مەدینەیێ د وێرێڕا دهاتنە مەكەهێ لەوا دگۆتنێ عەقەبەیا مەدینەیێ.

(٢) ئەڤە ل دویڤ ئاخفتنا حەججاجی گۆت، وی ئەو خراب ددانا، لەوا گۆت: ئەگەر خراب وەكی تە بن ئەو ئوممەتا ل سەر خێرێ.

**پاشی عەبدوللایێ كورێ عومەری ژ وێرێ چۆ، و هەلویست و ئاخفتنا عەبدوللایی گەهشتە حەجاجی، ڤرێكرێ ژ وی قورمی ئینا خوارێ و هاڤێتە ناڤ گۆڕێت جوهیان[1] پاشی ڤرێكرە دویڤ دایكا ویرا ئەسمائا كچا ئەبی بەكری، نەڤیا بهێتە دەڤ وی، جارەكا دی قاسد هنارتەڤە دەڤ بێژیتێ: ب سویند ئان دێ هێیە دەڤ من یان ئەز دێ وی هنێرم تە ب كەزیێت تەڤە بكێشیت بینیتە دەڤ من، گۆت: هەر نەرازی بوو و گۆت: سویند ب خودێ ئەز ناهێم هەتا تو وی دهنێری یێ من ب كەزییێت منڤە بخرینیت.**

**گۆت: حەجاجی گۆت: كا شمكێت من بۆ من بینن، و شمكێت خۆ كرنە پێت خۆ و پاشی دەركەفت ب لەز و قەبە چۆ، هەتا هاتیە دەڤ ئەسمایێ، ئینا گۆت: تە چاوا ئەز دیتم من چ ب سەرێ دژمنێ خودێ[2] ئینا؟ ئینا وێ گۆت: تە دنیا وی ل سەر وی خراب كر، و وی ئاخرەتا تە ل سەر تە خراب كر، و گەهشتییە من تە دگۆتە وی: ئەی كورێ ژنا خودا نا دو شویتكان، هندیكە ب ئێك ژ وا نان من خوار نا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) و خوارنا ئەبو بەكری ب حێشترێڤە گرێدابوو، و یا دی شویتكا ژنێیە یا نە شێت بهێلیت، بەلێ بزانە ب راستی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دگۆتە مە: (ب راستی د سەقیفێدا دێ درەوینەك[3] و خرابكارەك دەركەڤن)، و هندیكە درەوینە مە دیت و بەلێ خرابكار ئەز تە نابینم ئەگەر تو ئەو نەبی، گۆت: ئینا حەجاج ژ دەڤ رابوو و بەرسڤا وێ نەدا.**

٦. باب: فضيلة أُم أَيمن رضي الله عنها

## بابەتێ: باشییا ئوم ئەیمەنی (رضي الله عنها).

٣٨٩٠ - (م) عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه . بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) . لِعُمَرَ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُهَا، كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَزُورُهَا. فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهَا بَكَتْ، فَقَالاَ لَهَا: مَا يُبْكِيكِ؟ مَا عِنْدَ اللهِ

---

(١) جوهی د بنیاتدا ل مەكەهێ نەبوون، بەلێ ئەگەر هاتبانە مەكەهێ و ل وێرێ مربان ل وێ گۆرستانێ دهاتنە ڤەشارتن.

(٢) مەبەستا وی عەبدوللایە كورێ وێ.

(٣) مەبەست پێ موختارێ سەقەفییە ئەوێ خۆ ب پێغەمبەر ددانا و هندەك ب دویڤ كەفتین هەتا خودێ ژ ناڤ بری.

خَيْرٌ لِرَسُولِهِ (ﷺ). فَقَالَتْ: مَا أَبْكِي أَنْ لاَ أَكُونَ أَعْلَمُ أَنَّ مَا عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ (ﷺ)، وَلَكِنْ أَبْكِي أَنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ. فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ، فَجَعَلاَ يَبْكِيَانِ مَعَهَا. [م٢٤٥٤].

**ژ ئەنەسی (ﷺ)، گۆت: ئەبوبەكری گۆتە عومەری (خودێ ژ هەردووان رازی بیت)، پشتی مرنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مە ببە دەڤ ئوم ئەیمەنێ (ﷺ)، سەرا وێ بدەین هەروەكی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) سەرا وێ ددا، ڤێجا وەختێ گەهشتینە دەڤ، كرە گری، گۆتنێ: چ تە دگرینیت، ما تو نوزانی ب راستی یا ل دەڤ خودێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چێترە؟ گۆت: ئەز ناكەمە گری ژبەر كو ئەز نوزانم یا ل دەڤ خودێ بۆ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) چێترە، بەلێ ئەز دكەمە گری چونكی ب راستی وەحی ژ عەسمانی هاتە برین، ئاراندن ل سەر گری، و هەردوكان د گەل وێ كرنە گری.**

٧. باب: فضيلة أُم سليم (أُم أنس) رضي الله عنها

**بابەتێ: باشییا ئوم سولەیمی (ئوم ئەنەسی) (ﷺ).**

٣٨٩١ – (ق) عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَكُنْ يَدْخُلُ بَيْتاً بِالمَدِينَةِ غَيْرَ بَيْتِ أُمِّ سُلَيْمٍ إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: (**إِنِّي أَرْحَمُهَا، قُتِلَ أَخُوهَا مَعِي**). [خ٢٨٤٤/ م٢٤٥٥].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل مەدینەیێ نەد چۆ د مالەكێڤە مالا ئوم سولەیم نەبیت و مالێت هەڤژینێت خۆ، د ڤێ چەندێدا پرسیار ژێ هاتە كرن، ئینا گۆت: (ب راستی ئەز دلۆڤانییێ پێ دبەم، برایێ وێ د گەل من هاتە كوشتن).**

٣٨٩٢ – (م) عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (**دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ خَشْفَةً. فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذِهِ الْغُمَيْصَاءُ بِنْتُ مِلْحَانَ، أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ**). [م٢٤٥٦].

**ژ ئەنەسی (ﷺ) ژ پێغەمبەری (ﷺ) گۆت: (ئەز چوومە بەحەشتێ من پێژنەكا پێیان گوه لێ بوو، ئینا من گۆت: ئەڤە كییە؟ گۆتن: ئەڤە غومەیسایا كچا میلحانییە دایكا ئەنەسێ كوڕێ مالكی).**

❋❋❋❋❋❋❋❋❋❋

## الفصل السادس: فضائل الأقوام والجماعات

## پشکا شەشێ: باشییێت هندە دەستە و کۆمان

### ١. باب: فضائل الأشعريين

### بابەتێ: باشییێت ئەشعەرییان.

٣٨٩٣ - (ق) عَنْ أَبِي مُوسى قالَ: قالَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(إِنَّ الأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ، أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ، جَمَعُوا ما كانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ، فَهُمْ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُمْ).** [خ٢٤٨٦/ م٢٥٠٠].

ژ ئەبی مووسایێ ئەشعەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(ب راستی ئەشعەری دەمێ خوارنا وان ل خەزایا نەدما یان نێزیکی نەمانێ دبوو، یان خوارنا عەیالێ وان ل جهێ خۆ کێم دبوو، چ ل دەڤ وان هەبوو د کراسەکێ ب تنێدا کۆم دکر، پاشی ب ئامانەکێ ب تنێ وەکی ئێك لێکڤە دکر، ئەو ژ منن و ئەز ژ وانم)**[1].

### ٢. باب: فضائل أهل اليمن

### بابەتێ: باشییێت خەلکێ یەمەنێ.

٣٨٩٤ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قالَ: **(أَتَاكُمْ أَهْلُ الْيَمَنِ، هُمْ أَرَقُّ أَفْئِدَةً وَأَلْيَنُ قُلُوباً، الإِيمَانُ يَمَانٍ وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ، وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلاَءُ فِي أَصْحَابِ الإِبِلِ، وَالسَّكِينَةُ وَالْوَقَارُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ).** [خ٤٣٨٨/ م٥٢].

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(خەلکێ یەمەنێ هاتنە دەڤ هەوە ئەو نازکترن و ب لەزترن بۆ وەرگرتنا شیرەتان، و دل نازکترن زوی باوەرییێ دئینن، و باوەری و کاربنەجهی یا یەمەنییە، و خۆ مەزنکرن و خۆ بادان یا د خودانێت حێشتراندا، و نەرم و حەلیمی و رێزداری یا د خودانێت پەزیدا).**

(١) ئانکو: رێکا مە زێدە ئێکە.

## ٣. باب: مناقب أويس القرني

## بابەتێ: ناڤدێرییێت ئوومەیسێ قەرەنی (رضي الله عنه).

٣٨٩٥ - (م) عَنْ أُسَيْرِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، إِذَا أَتَى عَلَيْهِ أَمْدَادُ أَهْلِ الْيَمَنِ، سَأَلَهُمْ: أَفِيكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ حَتَّى أَتَى عَلَى أُوَيْسٍ، فَقَالَ: أَنْتَ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: مِنْ مُرَادٍ ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَانَ بِكَ بَرَصٌ فَبَرَأْتَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: لَكَ وَالِدَةٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يقول: (**يَأْتِي عَلَيْكُمْ أُوَيْسُ بْنُ عَامِرٍ مَعَ أَمْدَادِ أَهْلِ الْيَمَنِ مِنْ مُرَادٍ، ثُمَّ مِنْ قَرَنٍ. كَانَ بِهِ بَرَصٌ، فَبَرَأَ مِنْهُ إِلاَّ مَوْضِعَ دِرْهَمٍ. له وَالِدَةٌ هُوَ بِهَا بَرٌّ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ، فَافْعَلْ**). فَاسْتَغْفِرْ لِي، فَاسْتَغْفَرَ لَهُ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: الْكُوفَةَ. قَالَ: أَلاَ أَكْتُبُ لَكَ إِلَى عَامِلِهَا؟ قَالَ: أَكُونُ فِي غَبْرَاءِ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيَّ. [م٢٥٤٢].

**ژ ئوسەیرێ كوڕێ جابری (رضي الله عنه) گۆت: وەختێ هێزێت یەمەنێ دهاتن عومەرێ كوڕێ خەتتابی (رضي الله عنه) پرسیار ژ وان دكر: ئوومەیسێ كوڕێ عامری د گەل هەوە هەیە؟ هەتا ب سەر ئوومەیسی هەلبووی (رضي الله عنه)، گۆتێ: تو ئوومەیسێ كوڕێ عامری: گۆت: بەلێ، گۆتێ: تو خەلكێ مورادی پاشی یێ قەرەنێ؟ گۆت: بەلێ، گۆتێ: بەلەكییەك ل تە بوو تو یێ ژێ ب سلامەت بووی تەمەت دەرهەمەكی تێ نەبیت؟ گۆت: بەلێ، گۆت: تە دایك هەیە؟ گۆت: بەلێ، گۆت: من گوه ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: (ئوومەیسێ كوڕێ عامری د گەل هێزێت یەمەنییان دێ هێتە دەڤ هەوە، بەلەكییەك لێ بوو یێ ژێ ب سلامەت بووی تەمەت دەرهەمەكی نەبیت، دایكەكا هەی یێ باش و گوهدارە بۆ دایكا خۆ، هەكە سویندێ ب سەر خودێ بخۆت[1] خودێ دێ سویندا وی ب جه ئینیت[2]، هەكە تو بشێی بۆ تە داخوازا گونەهژێبرنێ بكەت، بكە). داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ من بكە، داخوازا گونەهژێبرنێ بۆ كر. عومەری گۆتێ: دێ چییە كیرێ؟ گۆت: كووفە، گۆتێ: ئەز بۆ تە بۆ والییێ وێرێ نامەكێ نەنڤیسم؟ گۆت: ئەز پتر حەز دكەم د گەل خلكێ هەژار و نەنیاس بم.**

---

(١) ئانكو: ئەگەر بێژیت ب خودێ، خودێ دێ هۆكەتەهە.

(٢) تشتێ سویند بۆ خواری خودێ دێ دەتێ.

## ٤. باب: فضائل بني تميم

### بابەتێ: باشییێت تەمیمییان.

٣٨٩٦ – (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ما زِلْتُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ مُنْذُ ثَلاَثٍ، سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ فِيهِمْ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: (**هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ**). قَالَ: وَجاءَتْ صَدَقاتُهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**هذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَا**). وَكَانَتْ سَبِيَّةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ عائِشَةَ فَقَالَ: (**أَعْتِقِيهَا، فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ**). [خ٢٥٤٣/ م٢٥٢٥].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: ژ وی دەمێ سێ تشت من ژ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گوه لێ بووین د راستا تەمیمییاندا بەردەوام ئەز حەژ وان دكەم، من گوه لێ بوو د گۆت: ( ئەو تو ندترینێت ئو ممەتا منن ل سەر دە جالی)، گۆت: و زەكاتێت وان هاتن، ئی نا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ئە ڤە زەكاتێت مرۆڤێت مە نە)، و ئێخسیرەك ژ وان ل دەڤ عائیشایێ بوو ئینا گۆت: (ئازا بكە ئەو ژ دویندەها ئیسماعیلینە).**

## ٥. باب: فضل أهل الحجاز

### بابەتێ: باشییا خەلكێ حیجازێ.

٣٨٩٧ – (م) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**غِلَظُ الْقُلُوبِ، وَالْجَفَاءُ، فِي الْمَشْرِقِ. وَالإِيمَانُ فِي أَهْلِ الْحِجَازِ**). [م٥٣].

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ گۆت: (دلرەقی و هشكاتی یا د خەلكێ رۆژهەلاتێدا و باوەری یا د خەلكێ حیجازێدا).**

## ٦. باب: فضل الشام

### بابەتێ: باشییا خەلكێ شامێ.

٣٨٩٨ – عَنِ ابْنِ حَوَالَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**عَلَيْكَ بِالشَّامِ، فَإِنَّهَا خِيرَةُ اللهِ مِنْ أَرْضِهِ، يَجْتَبِي إِلَيْهَا خِيرَتَهُ مِنْ عِبَادِهِ، فَأَمَّا إِنْ أَبَيْتُمْ فَعَلَيْكُمْ بِيَمَنِكُمْ، وَاسْقُوا مِنْ غُدُرِكُمْ، فَإِنَّ اللهَ تَوَكَّلَ لِي بِالشَّامِ وَأَهْلِهِ**). [د٢٤٨٣].

[وانظر: ٢٠٨٣، ٢١٥٦، ٣٩١٧، ٣٩١٨] .

**ژ ئەبی حەوالەیی (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( شامێ هەلبژێرە، ب راستی ئەو باشترین عەردێ خودێیە، خودێ باشترین بەندەیێت خۆ ل وێرێ كۆم دكەت، و ئەگەر هەوە ئەو نەڤیا هەرنە یەمەنا خۆ و ژ بركێت خۆ ئاڤێ ڤەخۆن و بدەنە گیانەوەرێت خۆ، ب راستی خودێ پاراستنا شامێ و خەلكێ وێ بۆ من یا مسۆگەر كری)[1].**

٧. باب: فضائل غفار وأسلم وجهينة وغيرهم

**بابەتێ: باشییێت غیفار و ئەسلەم و جوهەینە و ئەوێت دی.**

٣٨٩٩ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (قُرَيْشٌ، وَالأَنْصَارُ، وَجُهَيْنَةُ، وَمُزَيْنَةُ، وَأَسْلَمُ، وَأَشْجَعُ، وَغِفَارُ، مَوَالِيَّ، لَيْسَ لَهُمْ مَوْلى دُونَ اللهِ وَرَسُولِهِ). [خ٣٥٠٤/ م٢٥٢٠].

**ژ ئەبی هورەیرە (ﷺ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: ( قورەیش و ئەنسار و جوهەینە و موزەینە و ئەسلەم و ئەشجەع و غیفار تایبەتمەند و پشتەڤانێت منن، و وان ژ بلی خودێ و پێغەمبەرێ وی پشتەڤان نینن).**

٨. باب: وصية النبي (ﷺ) بأهل مصر

**بابەتێ: فەرمانا پێغەمبەری (ﷺ) ب خەلكێ مسرێ.**

٣٩٠٠ - (م) عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): **(إِنَّكُمْ سَتَفْتَحُونَ مِصْرَ، وَهِيَ أَرْضٌ يُسَمَّى فِيهَا الْقِيرَاطُ، فَإِذَا فَتَحْتُمُوهَا، فَأَحْسِنُوا إِلَى أَهْلِهَا، فَإِنَّ لَهُمْ ذِمَّةً وَرَحِماً) أَوْ قَالَ: (ذِمَّةً وَصِهْراً، فَإِذَا رَأَيْتَ رَجُلَيْنِ يَخْتَصِمَانِ فِيهَا فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ، فَاخْرُج مِنْهَا)**. قَالَ: فَرَأَيْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ شُرَحْبِيلَ بْنِ حَسَنَةَ وَأَخَاهُ رَبِيعَةَ، يَخْتَصِمَانِ فِي مَوْضِعِ لَبِنَةٍ، فَخَرَجْتُ مِنْهَا. [م٢٥٤٣].

---

(١) ب راستی نەڤ فەرموودە ڤەدەر و جودا ژ ئەگەرێ هاتنا وێ تێگەهشتنا وێ یا ب زەحمەتە، لەوا پێدڤییە بژڤرینە تامامیا ڤەگێرێ د سونەنا ئەبی داوودیدا و ب ڤی رەنگییە: (عن بن حَوَالَةَ قال: قال رسول اللَّهِ (ﷺ) سَيَصِيرُ الْأَمْرُ إلى أَنْ تَكُونُوا جُنُودًا مُجَنَّدَةً جُنْدٌ بِالشَّامِ وَجُنْدٌ بِالْيَمَنِ وَجُنْدٌ بِالْعِرَاقِ قال بن حَوَالَةَ خِرْ لي يا رَسُولَ اللَّهِ إن أَدْرَكْتُ ذلك فقال عَلَيْكَ بِالشَّامِ فَإِنَّهَا خِيرَةُ اللَّهِ من أَرْضِهِ يَجْتَبِي إِلَيْهَا خِيرَتَهُ من عِبَادِهِ فَأَمَّا إن أَبَيْتُمْ فَعَلَيْكُمْ بِيَمَنِكُمْ وَاسْقُوا من غُدُرِكُمْ فإن اللَّهَ تَوَكَّلَ لي بِالشَّامِ وَأَهْلِهِ). ئانكو: كارێ ئیسلامێ یان كارێ شەری هوین دێ بنە سێ لەشكەر، لەشكەرێ شامێ و لەشكەرێ یەمەنێ و لەشكەرێ عیراقێ، ئیبن حەوالەیی گۆت: ئەگەر وەلێ هات ئەی پێغەمبەرێ خودێ بۆ من هەلبژێرە ئەز كیژكی ژ وان هەلبژێرم و خۆ بدەمە د گەل كێ و... تامامیا حەدیسێ.

ژ ئەبی زەڕی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **(هوین دێ مسرێ ڤەكەن، و ئەو عەردەكە نافێ قیراتێ تێدا دهێتە گۆتن**[1]**، ڤێجا ئەگەر هەوە ڤەكر باشییێ د گەل خەلكێ وێ بكەن، ب راستی وان حورمەت و ماف و مرۆڤانی یا د گەل مە هەی**[2]**)**، یان گۆت: **(وان حورمەت و ماف و خزمانی یا د گەل مە هەی، ڤێجا ئەگەر تە دو زەلام تێدا دیتن هەڤڕك چۆن ل سەر جهێ لبنەكی ژێ دەركەڤە)**، گۆت: من عەبدولرەحمانێ كوڕێ شورەحبیلێ كوڕێ حەسنایێ و برایێ وی رەبیعە دیتن ل سەر جهێ لبنەكی هەڤڕك چۆن، ئینا ئەز ژ وێرێ دەركەفتم.

❁❁❁❁❁❁❁❁❁❁

(١) ئەڤە مزگینییە ب ڤەكرنا مسرێ بەری مسر ڤەببیت، چونكی قیرات ل وێرێ گەلەك دهاتە گۆتن.

(٢) زانایێ نەوەوی (رحمه الله) دبێژیت: زانا دبێژن: وان مرۆڤانی یا هەی؛ چونكی هاجەر دەیكا ئیسماعیل پێغەمبەری (ﷺ) ژ وان بوو، وان خزمانی یا هەی، چونكی دەیكا ئیبراهیمی ـ كوڕێ پێغەمبەرێ مە (ﷺ) ـ ژ وان بوو.

## ١. باب: إخبار النبي (ﷺ) بما يكون إلى قيام الساعة

## بابەتێ. لێخەبەردانا پێغەمبەری (ﷺ) ب وی تشتێ دێ هەتا رۆژا قیامەتێ چێ بیت.

٣٩٠١ - (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه قَالَ: لَقَدْ خَطَبَنَا النَّبِيُّ (ﷺ) خُطْبَةً، ما تَرَكَ فِيهَا شَيْئاً إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ ذَكَرَهُ، عَلِمَهُ مَنْ عَلِمَهُ وَجَهِلَهُ مَنْ جَهِلَهُ، إِنْ كُنْتُ لأَرَى الشَّيْءَ قَدْ نَسِيتُهُ، فَأَعْرِفُهُ كَمَا يَعْرِفُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ، إِذَا غابَ عَنْهُ فَرَآهُ فَعَرَفَهُ. [خ٦٦٠٤/ م٢٨٩١].

**ژ حوزەیفەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) خوتبەك بۆ مە خواند تشتەك نەما هەتا رۆژا قیامەتێ نەگۆتی، یێ زانی زانی و یێ نەزانی نەزانی، و ئەز نەئەوم تشتی ببینم و ژبیر بکەم، ئەز وی دنیاسم هەروەکی زەلام زەلامەکی دنیاسیت، ئەگەر ژێ دویرکەفت و ببینیت و بنیاسیت.**

٣٩٠٢ - (م) عَنْ أَبِي زَيْدٍ، عَمْرِو بْنِ أَخْطَبَ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْفَجْرَ، وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ، فَنَزَلَ فَصَلَّى. ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ، ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى. ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ، فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ، فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا. [م٢٨٩٢].

**ژ ئەبی زەیدی، عەمرویێ کورێ ئەختەبی (رضي الله عنه)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) نڤێژا سپێدێ ل بەری مە کر و سەرکەفتە مینبەرێ، و گۆتار بۆ مە خواند هەتا نیڤرۆ بووی، هاتە خوار نڤێژ کر، پاشی سەرکەفتە مینبەرێ و گۆتار خواند هەتا ئێڤار بووی، پاشی هاتە خوار و نڤێژ کر پاشی سەرکەفتە مینبەرێ هەتا رۆژ ئاڤا بووی، و تشتێ هەی و یێ دێ بیت بۆ مە گۆت[1] زێدە مە زانی و زێدە مە ژبەر کر.**

(١) ئانکو: بەحسێ دەستپێکا ژیانێ کر هەتا دویماهییێ مرۆڤ دبنە دو جوین، پشکەك بۆ بەحەشتێ دچن و پشکەك بۆ جەهنەمێ.

## ٢. باب: الفتنة التي تموج كموج البحر

### بابەتێ: جەرباندن و بەلایێت پێلان ددەن وەکی پێلێت دەریای.

٣٩٠٣ - (ق) عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ عُمَرَ رضي الله عنه، فَقَالَ: أَيُّكُمْ يَحْفَظُ قَوْلَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) فِي الْفِتْنَةِ؟ قُلْتُ: أَنَا، كَمَا قَالَهُ. قَالَ: إِنَّكَ عَلَيْهِ . أَوْ عَلَيْهَا . لَجَرِيءٌ، قُلْتُ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ، تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالأَمْرُ وَالنَّهْيُ. قَالَ: لَيْسَ هَذَا أُرِيدُ، وَلكِنِ الْفِتْنَةُ الَّتِي تَمُوجُ كَمَا يَمُوجُ الْبَحْرُ، قَالَ: لَيْسَ عَلَيْكَ مِنْها بَأْسٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَاباً مُغْلَقاً، قَالَ: أَيُكْسَرُ أَمْ يُفْتَحُ؟ قَالَ: يُكْسَرُ، قَالَ: إِذاً لاَ يُغْلَقَ أَبَداً.

قُلْنَا: أَكَانَ عُمَرُ يَعْلَمُ الْبَابَ؟ قَالَ: نَعَمْ، كَمَا أَنَّ دُونَ الْغَدِ اللَّيْلَةَ، إِنِّي حَدَّثْتُهُ بِحَدِيثٍ لَيْسَ بِالأَغَالِيطِ. فَهِبْنَا أَنْ نَسْأَلَ حُذَيْفَةَ، فَأَمَرْنَا مَسْرُوقاً فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: الْبَابُ عُمَرُ.

[خ٥٢٥/ م: الإيمان ١٤٤ (٢٣١)، الفتن ١٤٤ (٢٦)].

- وزاد في رواية لمسلم: قَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**تُعْرَضُ الْفِتَنُ عَلَى الْقُلُوبِ كَالْحَصِيرِ عُوداً عُوداً، فَأَيُّ قَلْبٍ أُشْرِبَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، وَأَيُّ قَلْبٍ أَنْكَرَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ بَيْضَاءُ، حَتَّى تَصِيرَ عَلَى قَلْبَيْنِ، عَلَى أَبْيَضَ مِثْلِ الصَّفَا، فَلاَ تَضُرُّهُ فِتْنَةٌ مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ. وَالآخَرُ أَسْوَدُ مُرْبَادّاً، كَالْكُوزِ مُجَخِّياً لاَ يَعْرِفُ مَعْرُوفاً، وَلاَ يُنْكِرُ مُنْكَراً، إِلاَّ مَا أُشْرِبَ مِنْ هَوَاهُ**). [م١٤٤].

**ژ حوزەیفەیی (رضي الله عنه) گۆت: ئەم ل دەڤ عومەری (رضي الله عنه) د روینشتی بووین، ئینا گۆت: کێ ژ هەوە گۆتنا پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) د جەرباندن و بەلایاندا ژ بەرە؟ من گۆت: من، هەر وەکی گۆتی[1]، گۆت: ب راستی تو یێ پشتراستی و ب جەسارەتی، من گۆت: جەرباندن و بەلایا د کوڕی و مالی و عەیالی و جیراندا یدا نڤێژ و رۆژی و سەدقە و فەرمانکرن ب باشییێ و پاشڤەلێدان ژ خرابییێ وێ ژێ دبەن[2]، گۆت: نە، من ئەڤە نەڤێت بەلێ من ئەو جەرباندن و بەلایە دڤێت یا پێڵێ ددەت وەکی دەریا پێلان ددەت، گۆت: چو خرابییا وێ ل سەر تە نینە ئەی میرێ باوەرییداران، د ناڤبەرا تە و وێدا دەرگەهەکێ دائێخستی یێ هەی، عومەری گۆت: دێ هێتە شکاندن یان دێ هێتە ڤەکرن؟ حوزەیفەیی گۆت: دێ هێتە شکاندن، گۆت: ما دەم وەسایە پا قەت ناهێتە گرتنڤە.**

---

(١) ئانکو: بێ زێدکرن و کێمکرن.

(٢) ئانکو: ئەو مژویلییا ب ڤان تشتانڤە دهێتە برن رۆژی و نڤێژ وێ ژێ دبەن.

مە گۆت: ئەرێ عومەری دەرگەهـ دزانی؟ گۆت: بەلێ، هەروەکی پشتی رۆژێ شەڤە، من فەرموودەیەك بۆ گۆت یا تێکەلکری ژ تشتا نەبوو، ئینا مە سەهم ژ حوزەیفە کر ئەم پرسیارێ ژێ بکەین، مە فەرمان ل مەسروقی کر پرسیارا وی کر، ئینا گۆت: ئەو دەرگەهـ عومەرە.

- و موسلمی د ڤەگێرەکێدا زێدە کرییە: حوزەیفەیی گۆت: من گوهـ ل پێغەمبەرێ خودێ بوو (ﷺ) دگۆت: جەرباندن و بەلا دکەڤنە سەر دلان وەکی حێسیلان چیلك ل سەر چیلکیدا، هەر دلەکێ دویڤ چۆ و وەرگرت و ژێ ڤەخوار خالەکا رەش دێ ئێخیتە تێدا، و هەر دلەکێ دویڤ نەچۆ و نەوەرگرت و ژێ نەڤەخوار خالەکا سپی دێ ئێخیتە تێدا، هەتا دبنە دو دل، دلەکێ سپی وەکی بەرێ حولی حولی، ڤێجا چو جەرباندن و بەلا ژ یانێ ناگەهیننێ هندی عەرد و عەسمان هەبن، و یێ دی رەشەکێ تۆزەکییە وەکی گۆسکێ سەرنشیڤکری نە باشییێ ب باشی دزانیت و نە خرابییێ ب خرابی دزانیت، ئەو نەبیت ل دویڤ دلێ خۆ بچیت[1].

## ٣. باب: هلاك هذه الأُمة بعضهم ببعض

## بابەتێ: نەمانا ڤێ ئوممەتێ هندەکێ ب هندەکان.

٣٩٠٤ - (م) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (إِنَّ اللهَ زَوَى لِيَ الأَرْضَ، فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا، وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا، وَأُعْطِيتُ الْكَنْزَيْنِ: الأَحْمَرَ وَالأَبْيَضَ، وَإِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتِي أَنْ لاَ يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لاَ يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوّاً مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ. وَإِنَّ رَبِّي قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنِّي إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لاَ يُرَدُّ. وَإِنِّي أَعْطَيْتُكَ لأُمَّتِكَ أَنْ لاَ أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ عَامَّةٍ، وَأَنْ لاَ أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوّاً مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ، يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ، وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا ـ أَوْ قَالَ: مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا ـ حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضاً، وَيَسْبِي بَعْضُهُمْ بَعْضاً). [م٢٨٨٩].

---

(١) ئانکو: خرابییێ ل دویڤ دلێ خۆ ب باشی دانیت، یان باشییێ ب خرابی دانیت یان باشییێ ب باشی دانیت ژ بەر داخوازییا خۆ یان خرابییێ ب خرابی بزانیت هەر ژ بەر داخوازییا خۆ.

**ژ سەوبانی (ﺭﺿﯽ اﷲ ﻋﻨﻪ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (ب راستی خودێ عەرد بۆ من کۆم کر، و من رۆژهلات و رۆژئاڤا یا وی دیتن، و ب راستی ملکێ ئوممەتا من دێ گەهیتە وی جهێ بۆ من هاتییە کۆمکرن، و دو خزینە بێت داینە من یا سۆر و یا سپی[1]، و من داخواز ژ خودایێ خۆ بۆ ئوممەتا خۆ کر وان ب هشکەسالییەکا ب گشتی ژ ناڤ نەبەت و دژمنەکێ ژ بلی وان ل سەر وان زال نەکەت خوینرێژییا کۆما وان بکەت، و خودایێ من گۆت: ئەی موحەممەد ب راستی من فەرمانەك دا و ب راستی ئەو ناهێتە زڤرین، و من یا دایە تە بۆ ئوممەتا تە ئەز وان ب هشکەسالییەکا ب گشتی نەبەم و دژمنەکی ژ بلی وان ل سەر وان زال نەکەم خوینرێژییا کۆما وان بکەت، خۆ ئەگەر ل هەمی رەخێت عەردی یان گۆت د ناڤبەرا رەخێت وێدا ل سەر وان کۆم ببن هەتا هندەك ژ وان هندەکان ژ ناڤ دبەن و هندەك هندەکان ئێخسیر بکەن).**

٤. باب: هلاك الأُمة على يدي غلمة سفهاء

**بابەتێ: ژ ناڤچۆنا ئوممەتێ ل سەر دەستێ جەحێلۆکێت ساوێلکە.**

٣٩٠٥ - (ق) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُهْلِكُ النَّاسَ هَذَا الحَيُّ مِنْ قُرَيْشٍ**)، قالوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (**لَوْ أَنَّ النَّاسَ اعْتَزَلُوهُمْ**). [خ٣٦٠٤/ م٢٩١٧].

- وفي رواية للبخاري: عن عَمْرِو بْنِ يَحْيَى بْنِ سَعِيد بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَدِّي قال: كُنْتُ جَالِساً مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ (ﷺ) بِالمدِينَةِ، وَمَعَنَا مَرْوَانُ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: سَمِعْتُ الصَّادِقَ المصْدُوقَ يَقُولُ: (**هَلَكَةُ أُمَّتِي عَلَى يَدَيْ غِلْمَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ**). فَقَالَ مَرْوَانُ: لَعْنَةُ اللهِ عَلَيْهِمْ غِلْمَةً. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لَوْ شِئْتُ أَنْ أَقُولَ: بَنِي فُلاَنٍ وَبَنِي فُلاَنٍ لَفَعَلْتُ.

فَكُنْتُ أَخْرُجُ مَعَ جَدِّي إِلَى بَنِي مَرْوَانَ حِينَ مَلَكُوا بالشَّامِ، فَإِذَا رَآهُمْ غِلْمَاناً أَحْدَاثاً قَالَ لَنَا: عَسى هؤُلاَءِ أَنْ يَكُونُوا مِنْهُمْ؟ قُلْنَا: أَنْتَ أَعْلَمُ. [خ٧٠٥٨].

---

(١) خزینا سۆر نیشانە بۆ مولکێ کیسرای، چونکی پتریا دراڤێ وان زێر بوو و رەنگێ سۆربوو، و خزینا سپی نیشانە بۆ مولکێ قەیسەرین چونکی پتریا دراڤێ وان دەرهەمێ زیڤی بوو و یێ سپی بوو.

ژ ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **( ئەڤ تا خە ژ قورەیشییان دێ خەلکێ ژ ناڤ بەن)**، گۆتن: هینگێ چ فەرمانا مە دکەی؟ گۆت: **(ئەگەر خەلك بشێن خۆ ژێ ڤەدەر بکەن)**.

و د ڤەگێرەکا بوخاریدا: ژ عەمەرێ کورێ یەحیایێ کورێ سعیدێ کورێ عەمرێ کورێ سەعیدی گۆت: باپیرێ من بۆ من گۆت: ئەز ل مزگەفتا پێغەمبەری (ﷺ) ل دەڤ ئەبو هورەیرە یێ روینشتی بووم ل مەدینەیێ و مەروان د گەل مە بوو، ئەبو هورەیرە گۆت: (راستگۆیێ راستدەرئێخ (ژ لایێ وەحییێڤە) دگۆت: **(ژ ناڤچۆنا ئوممەتا من ل سەر دەستێ جەحێلۆکایە ژ قورەیشییان)**، ئینا مەروانی گۆت: لەعنەتێت خودێ ل سەر وان بن چ جەحێلۆکن، ئینا ئەبو هورەیرە گۆت: ئەگەر تە بڤێت ئەز بێژم: یێت فلان و فلان مالێنە دێ بێژم.

ڤێجا ئەز د گەل باپیرێ خۆ دچۆم دەڤ مەروانییان دەمێ شام کەفتیە بن دەستهەلاتا وانڤە، ڤێجا ئەگەر هندە جەحێلۆکێت کێم عەمر دیتبان دگۆتە مە: دبیت ئەڤە ژ وان بن؟ مە دگۆت: تو چێتر دزانی.

### ٥. باب: الفتن حيث يطلع قرن الشيطان

### بابەتێ: جەرباندن و بەلا ل جهێ هەڤالێت شەیتانی ژێ دەردکەڤن دێ هێن

٣٩٠٦ - (خ) عَنِ ابْنِ عُمَرَ قالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ (ﷺ): **(اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا)**. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَفِي نَجْدِنَا؟ قالَ: **(اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي شَامِنَا، اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي يَمَنِنَا)**. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، وَفِي نَجْدِنَا؟ فَأَظُنُّهُ قالَ فِي الثَّالِثَةِ: **(هُنَاكَ الزَّلَازِلُ وَالْفِتَنُ، وَبِهَا يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ)**.

[خ٧٠٩٤ (١٠٣٧)].

ژ ئیبن عومەری (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: **( ئەی خودا بۆ مە بەرەکەتێ بێخە شاما مە، ئەی خودا بۆ مە بەرەکەتێ بێخە یەمەنا مە)**، گۆتن ئەی پێغەمبەرێ خودێ و نەجدا مە؟ گۆت: **(ئەی خودا بۆ مە بەرەکەتێ بێخە شاما مە، ئەی خودا بۆ مە بەرەکەتێ بێخە یەمەنا مە)**، گۆتن ئەی پێغەمبەرێ خودێ و نەجدا مە؟ ئەز هزر دکەم جارا سێیێ گۆت: **(ل وێرێ بیڤە لەرز و بەلا نە و ل وێرێ لا یەنگر و هەڤالێت شەیتانی دەردکەڤن)**.

### ٦. باب: الفتنة من المشرق

### بابەتێ: جەرباندن و بەلا ل رۆژهەلاتێ دەردكەڤن.

٣٩٠٧ - (ق) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يُشِيرُ إِلَى المشْرِقِ، فَقَالَ: (**هَا إِنَّ الْفِتْنَةَ هَاهُنَا، إِنَّ الفِتْنَةَ هَاهُنَا، مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ**).

[خ٣٢٧٩ (٣١٠٤)/ م٢٩٠٥].

**ژ عەبدوللایێ کورێ عومەری (خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: من پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دیت نیشان دکرە رۆژهەلاتێ و دگۆت: (ب راستی جەرباندن و بەلا ئەها ل ڤێرێ یە، ب را ستی جەربا ندن و بەلا ئە ها ل ڤێرێ یە ل جهێ لا یەنگر و هەڤالێت شەیتانی دەردکەڤن).**

### ٧. باب: اقتراب الفتن، وفتح ردم يأجوج ومأجوج

### بابەتێ: نێزیکبوونا جەرباندن و بەلایان و ڤەبوونا سکرێ یەئجووج و مەئجووجان.

٣٩٠٨ - (ق) عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) دَخَلَ عَلَيْهَا فَزِعاً يَقُولُ: (**لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هذِهِ**). وَحَلَّقَ بِإِصْبَعِهِ الإِبْهَامِ وَالَّتِي تَلِيهَا، قالَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ جَحْشٍ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: (**نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الخُبْثُ**). [خ٣٣٤٦/ م٢٨٨٠].

**ژ زەینەبا کچا جەحشی (رضي الله عنها)، گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ب ترس هاتە دەڤ و دگۆت: (لا إله إلا الله، چو پەرستی یێت راست و دورست و هەژی پەرستن و عیبادەتێ نینن خودێ نەبیت، ئێزا و نەخۆشی ژ خرابییەکا نێزیك بووی بۆ عەرەبان، ئەڤرۆ هندی ڤێ یێ ژ سەد و سکرێ یەئجووج و مەئجووجان ڤەبووی، و تلا خۆ یا بەرانی و یا دویڤرا کرنە خەلەك). من گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەرێ ما ئەم دێ چینە هیلاکێ و چاك یێت د ناڤ مەدا؟! گۆت: (بەلێ، هەکە گونەه و خرابی و بێخێری زێدە بوون).**

## ٨. باب: نزول الفتن كمواقع القطر

### بابەتێ: رویدانا فتنەیان وەكی جهێت دلۆپان.

٣٩٠٩ - (م) عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ، أَلاَ ثُمَّ تَكُونُ فِتْنَةٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي فِيهَا، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي إِلَيْهَا. أَلاَ، فَإِذَا نَزَلَتْ أَوْ وَقَعَتْ، فَمَنْ كَانَ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ. وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ. وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ**) قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ مَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِبِلٌ وَلاَ غَنَمٌ وَلاَ أَرْضٌ؟ قَالَ: (**يَعْمِدُ إِلَى سَيْفِهِ فَيَدُقُّ عَلَى حَدِّهِ بِحَجَرٍ، ثُمَّ لِيَنْجُ إِنِ اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ. اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ اللَّهُمَّ! هَلْ بَلَّغْتُ؟**) قَالَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَرَأَيْتَ إِنْ أُكْرِهْتُ حَتَّى يُنْطَلَقَ بِي إِلَى أَحَدِ الصَّفَّيْنِ، أَوْ إِحْدَى الْفِئَتَيْنِ، فَضَرَبَنِي رَجُلٌ بِسَيْفِهِ، أَوْ يَجِيءُ سَهْمٌ فَيَقْتُلُنِي؟ قَالَ: (**يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ. وَيَكُونُ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ**). [م٢٨٨٧].

ژ ئەبی بەكرەیی (رضي الله عنه) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (**ب راستی دێ بەلا هەبن، ئاگەهدار بن پاشی ب راستی دێ بەلا هەبن، یێ رویندشتی تێدا باشترە ژ وی یێ تێدا دچیت، و یێ تێدا دچیت باشترە ژ وی یێ ڤەستا وێ دكەت و ب بەرڤە دچیت، ئاگەهدار بن، ئەگەر ئەو بەلا هاتن یان روی دان، هەر كەسێ حێشتر هەبن بلا بگەهیتە حێشترێت خۆ، و هەر كەسێ پەز هەبیت بلا بگەهیتە پەزێ خۆ، و هەر كەسێ عەرد هەبیت بلا بگەهیتە عەردێ خۆ**). گۆت: ئینا زەلامەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ تو چ دبێژی بۆ وی یێ نە حێشتر هەبن و نە پەز و نە عەرد، چ بكەت؟ گۆت: (**بلا شیرێ خۆ هەلگریت و لایێ وی یێ تیژ ل بەرەكی بدەت و پاشی بلا خۆ رزگار بكەت ئەگەر بشێت خۆ رزگار بكەت، ئەی خودا ئەرێ من گەهاند؟ ئەی خودا ئەرێ من گەهاند؟ ئەی خودا ئەرێ من گەهاند؟**)، گۆت: ئینا زەلامەكی گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ بێژە من ئەگەر خورتی ل من هاتە كرن و ئەز هاتمە درئێخستن بۆ ریزەك ژ دو ریزان یان بۆ كۆمەكێ ژ دو كۆمان، و زەلامەكی ب شیرێ خۆ دانا من یان تیرەك بهێت من بكوژیت؟ گۆت: (**دێ گونەها تە و گونەها خۆ هەلگریت و دێ ژ خەلكێ ئاگری بیت**).

### ٩. باب: الفرار من الفتن

### بابەتێ: رەڤین ژ بەلایا.

٣٩١٠ - (خ) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): (**يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ المُسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الجِبَالِ وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ**).[خ١٩].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) وی گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) گۆت: (نێزیکە باشترین مالێ موسلمانی پەز بیت، سەرێ چیا و جهێت چەرەی بینیت و ببەت، دینێ خۆ ژ بەلایا برەڤینیت).**

### ١٠. باب: إذا التقى المسلمان بسيفيهما

### بابەتێ: ئەگەر دو موسلمان ب شیرێت خۆ کەفتنە بەرێك.

٣٩١١ - (ق) عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: ذَهَبْتُ لأَنْصُرَ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أَنْصُرُ هَذَا الرَّجُلَ، قَالَ: ارْجِعْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ: (**إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا؛ فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ**). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: (إِنَّهُ كَانَ حَرِيصاً عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ). [خ٣١/ م٢٨٨٨].

**ژ ئەحنەفێ کورێ قەیسی (رضي الله عنه) گۆت: ئەز چۆم دا پشتەڤانییا ڤی زەلامی بکەم، ئەبو بەکرەیی ئەز دیتم، ئینا گۆت: تە کیرێ دڤێت؟ من گۆت: ئەز دێ چم ڤی زەلامی ب سەر ئێخم[1]. ئینا ئەبو بەکرەیی گۆتە من: بزڤرە، ب راستی من یا گوه ل پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) بووی دگۆت: (هەکە دو موسلمان ب شیرێت خۆ کەفتنە بەرێك، کوشتی و کوژەك هەردو د جەهنەمێدانە)، من گۆت: مە زانی ئەڤە کوژەکە و ما کوشتی چییە؟ گۆت: (چونکی ئەو ژی یێ هشیار و رژد بوو ل سەر کوشتنا هەڤالێ خۆ).**

### ١١. باب: إعلان النفاق والكفر

### بابەتێ: ئاشکراکرنا دوروییاتی و گاورییێ.

٣٩١٢ - (خ) عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمانِ قَالَ: إِنَّ المُنَافِقِينَ الْيَوْمَ شَرٌّ مِنْهُمْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ)، كَانُوا يَوْمَئِذٍ يُسِرُّونَ وَالْيَوْمَ يَجْهَرُونَ. [خ٧١١٣].

---

(١) مەبەستا وی عەلییێ کورێ ئەبی تالبییە ل رۆژا (جەمەلێ).

- وفي رواية: قَالَ: إِنَّمَا كَانَ النِّفَاقُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَأَمَّا الْيَوْمَ: فَإِنَّمَا هُوَ الْكُفْرُ بَعْدَ الإِيمَانِ. [خ٧١١٤].

**ژ حوزەیفەیێ یەمانی (رضي الله عنه) گۆت: ب راستی دوروییێت ئەڤرۆ خرابترن ژ وان یێت ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ)، وان ل وێ رۆژێ دورویياتی دڤەشارت، ئەڤرۆ یێ ئا شكەر دكەن.**

- **و د ڤەگێرەكێدا: ب راستی ئەوا ل سەر دەمێ پێغەمبەری (ﷺ) دورویياتی بوو، بەلێ ب راستی یا ئەڤرۆ گاورییە پشتی باوەرییێ.**

## ١٢. باب: ذكر الخوارج وصفاتهم

## بابەتێ: بەحسێ خەوارجا و سالۆخەتێت وان.

٣٩١٣ - (ق) عَنْ جابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنهما قَالَ: بَيْنَما رَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقْسِمُ غَنِيمَةً بِالْجِعْرَانَةِ، إِذْ قالَ لَهُ رَجُلٌ: اعْدِلْ، فَقَالَ لَهُ: **(لَقَدْ شَقِيتُ إِنْ لَمْ أَعْدِلْ)**.[خ٣١٣٨/ م١٠٦٣].

- ولفظ مسلم: قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) بِالْجِعْرَانَةِ، مُنْصَرَفَهُ مِنْ حُنَيْنٍ، وَفِي ثَوْبِ بِلاَلٍ فِضَّةٌ، وَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) يَقْبِضُ مِنْهَا، يُعْطِي النَّاسَ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اعْدِلْ! قَالَ: **(وَيْلَكَ! وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ؟ لَقَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ)**. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضي الله عنه: دَعْنِي، يَا رَسُولَ اللهِ فَأَقْتُلَ هَذَا الْمُنَافِقَ، فَقَالَ: **(مَعَاذَ اللهِ أَنْ يَتَحَدَّثَ النَّاسُ أَنِّي أَقْتُلُ أَصْحَابِي، إِنَّ هَذَا وَأَصْحَابَهُ يَقْرَؤُونَ الْقرْآنَ، لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنْهُ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ)**.

**ژ جابرێ كورێ عەبدوللایی ( خودێ ژ وان رازی بیت) گۆت: دەمەكی پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) ل جیعرانێ دەستكەفتەك لێكڤەدكر، زەلامەكی گۆتە وی: داد پەروەرییێ بكە، ئینا پێغەمبەری (ﷺ) گۆتە وی: (ب راستی ئەز بەرزەبووم ئەگەر داد پەروەرییێ نەكەم).**

- **و بێژەیا موسلمی: گۆت: زەلامەك ل جیعرانێ هاتە دەڤ پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) دەمێ ژ حونەینێ زڤری، و زیڤ د كۆشا بیلالیدا بوو و پێغەمبەرێ خودێ (ﷺ) مست لێدا و ژێ رادكر و ددا خەلكی، ئینا گۆت: ئەی موحەممەد داد پەروەرییێ بكە! گۆت: (ئێزا بۆ تە بیت پا كی دێ داد پەروەرییێ كەت ئەگەر ئەز داد پەروەرییێ نەكەم؟ ب راستی ئەز**

**بێهیڤی و خوسارەت بووم ئەگەر ئەز داد پەروەرییێ نەکەم)**، ئینا عومەری (رضي الله عنه) گۆت: بهێلە ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەز ڤی دوروی بکوژم، ئینا گۆت: **(ئەز خۆ ب خودێ دپارێزم خەلك بێژیت ئەز هەڤالێت خۆ دکوژم، ب راستی ئەڤە و هەڤالێت خۆ قورئانێ دخوینن و د گەریا واندا دەرباز نابیت[1] ژ قورئانێ دچنە دەرڤە هەروەکی تیر ژ نێچیرێ دەردکەڤیت)**.

٣٩١٤ - (ق) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: بَيْنَما نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) وَهْوَ يَقْسِمُ قَسْماً، أَتَاهُ ذُو الخُوَيْصِرَةِ، وَهْوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ اعْدِلْ، فَقَالَ: **(وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ، قَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ)**. فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ ائْذَنْ لِي فِيهِ، فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ؟ فَقَالَ: **(دَعْهُ، فَإِنَّ لَهُ أَصْحَاباً يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِمْ، وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كما يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يُنْظَرُ إِلَى نَصْلِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى رِصَافِهِ فَمَا يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى نَضِيِّهِ . وَهْوَ قِدْحُهُ . فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى قُذَذِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَيْءٌ، قَدْ سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ، آيَتُهُمْ رَجُلٌ أَسْوَدُ، إِحْدَى عَضُدَيْهِ مِثْلُ ثَدْيِ الْمَرْأَةِ، أَوْ مِثْلُ الْبَضْعَةِ تَدَرْدَرُ ، وَيَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ)**.

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ هَذَا الحَدِيثَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ)، وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ قَاتَلَهُمْ وَأَنَا مَعَهُ، فَأَمَرَ بِذلِكَ الرَّجُلِ فَالْتُمِسَ فَأُتِيَ بِهِ، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَيْهِ عَلَى نَعْتِ النَّبِيِّ (ﷺ) الَّذِي نَعَتَهُ. [خ٣٦١٠، م١٠٦٤].

**ژ ئەبی سەعیدێ خودری (رضي الله عنه) گۆت: دەمەکی ئەم د گەل پێغەمبەرێ خودێ بووین (ﷺ) و وی دەستکەفتەك لێکڤە دکر، زیلخوەیسیرە هاتە دەڤ، و ئەو زەلامەك بوو ژ تەمیمیان، ئینا گۆت: ئەی پێغەمبەرێ خودێ داد پەروەرییێ بکە، گۆت: (ڤێزا بۆ تە بیت پا کی دێ داد پەروەرییێ کەت ئەگەر ئەز داد پەروەرییێ نەکەم؟ ب راستی ئەز بێهیڤی و خوسارەت بووم ئەگەر ئەز داد پەروەرییێ نەکەم)، ئینا عومەری گۆت: دەستویرییێ بدە من ئەز شیرەکی ل ستۆیێ وی بدەم؟ ئینا گۆت: (بهێلە وی هندە هەڤال**

---

(١) ئانکو: ناگەهیتە دلێ وان تێ بگەهن و چاما ژێ وەرگرن و مفا ژێ ببینن و ب سەر سەرێ وان ژی ناکەڤیت بۆ عەسمانی بلند نابیت کو خودێ ژ وان قەبویل بکەت.

